# تيسير الكريم الرحمن

## في تفسير كلام المنان

به كوردی

نووسینی: العلامة عبد الرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

وه‌رگێڕانی: عباس محمد امين

به‌رگی سێیه‌م
سووره‌تی (الرّعد) تا سووره‌تی (الفُرقان)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ
# بە کوردی

## بەرگی سێیەم

## سوورەتی (الرعد) تا سوورەتی (الفرقان)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ

## به كوردى

نووسينى

العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

ناوی کتێب: تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ به کوردی (بەرگی سێیەم)
بابەت: تەفسیری قورئانی پیرۆز
ناوی نووسەر: العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (رحمه الله)
وەرگێڕانی: عباس محمد امين
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٤٩)ـی ساڵی (٢٠١٩)ـی پێ دراوە.



ناوەندی ڕێنوێن
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)


سورة الرعد
بسم الله الرحمن الرحيم
الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ
وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ① ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ
كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم
بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ② وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ
وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ
ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ③ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ
قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ
وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ
فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ④ ۞ وَإِن تَعۡجَبۡ
فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ
أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ⑤

## تەفسیری سوورەتی (الرعد)
## مەدەنییە[1] (٤٣) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ① ﴾

دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بێگومان ئەم قورئانە نیشانەو بەڵگەی روونن، لەسەر هەموو ئەوانەی کە بەندەکان پێویستیان پێیەتی لە بنەماو لقەکانی ئاین، وە ئەوەی لەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ هەر ئەوە ڕاستو ڕەوایە، چونکە هەواڵەکانی ڕاستن، وە فەرمانو قەدەغەکراوەکانی پڕ لە دادپەروەریو حیکمەتن، وە پشت ئەستوورن بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە، هەر کەسێک بە دەمیەوە بچێتو شوێنی زانستەکەی بکەوێ، ئەوە لە دەستەو کۆمەڵەی خاوەن زانستان بە هەق دەژمێردرێ، کە بە زانستەکەیان کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن بەو شێوەی کە خوا پێی خۆشە، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ (واتە: بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن) بەم قورئانە، یان بە نەفامیو پشت تێکردنو گرنگی پێنەدانی، یان بە کەللە ڕەقیو لووت بەرزیو ستەمکردن، لەبەر ئەوەیە زۆربەی خەڵکی سوودی لێوەرناگرن، بە هۆی نەبوونی هۆکاری سوود وەر گرتن لێی.

(٢-٣): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ② وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ③ ﴾

---
١) وتراویشە: مەککیە.

خـوا هـەواڵ دەدات بە تاک‌و تەنهایی لـە بەدیهێنان‌و بەڕێوەبردندا، وە گەورەیی‌و دەسـەڵاتی تـەواوی کـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی بە تـاک‌و تەنهایی بپەرسـترێ، بێگومان نابـێ‌و ناکرێ، بەندایەتـی بۆ غەیـری خـواو ڕەوا نیە، دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ ﴾ (ئـەو خوایە کـە ئاسـمانەکانی بـەرز کردۆتـەوەو ڕاگرتـووە)، بـە مەزنـی‌و بەرفراوانیـەوە، بـە توانـای مەزنـی خـۆی ﴿ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾ واتـە: هیـچ کۆڵەکـەو پایەیەکـی لـە ژێـردا نیـە، خۆ ئەگـەر هەیبووایە دەتانبینـی!! ﴿ ثُمَّ ﴾ پاش دروسـتکردنی ئاسـمانەکان‌و زەوی ﴿ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴾ (بـەرز بووەتـەوە بـۆ سـەر عـەرش) واتـە: بەرزبوونەوەیەک کە شایسـتەیە بە گەورەیـی خواو لەگـەڵ تەواویدا دەگونجـێ، ﴿ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ﴾ بـۆ بەرژەوەندی مرۆڤـەکان‌و ئـاژەڵ‌و بەرووبوومەکانیان ﴿ كُلٌّ ﴾ (هەر یەک) لـە خۆرو مانگ ﴿ يَجْرِي ﴾ بەڕێوەبردنێکـی زانـاو توانـا ﴿ لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ بـە شـێوەیەکی ڕێک‌و پێک لـە خولگەی خۆیانـدا دەسـوڕێنەوە، بۆ سـاتێکیش لـە کاری خۆیـان دواناکەون، تا کاتی دیـاری کراوی خۆیـان دێـت، ئەویش بریتیە لـە پێچانەوەی ئـەم جیهانە، وە گواسـتنەوەیان بـۆ ماڵی دوایی (دوارۆژ) کـە ماڵـی هەمیشـەییە، لەو کاتـەدا خوا ئاسـمان دەپێچێتەوەو دەیانگـۆڕێ، خۆرو مانـگ تاریـک دەبن‌و کۆدەکرێنەوە، پاشـان دەبرێن بـۆ ناو دۆزەخ، بۆ ئـەوەی ئەوانەی کە پەرسـتوونیانن بۆیـان دەربکـەوێ کە ئەوانە شایسـتەی پەرسـتن نین، وە لەبەر ئـەوەی ئاخ‌و حەسـرەت هەڵکێشـن بۆ ئەو کاروو کردەوانـەی ئەنجامیـان داوە، تا ئەوانەی بێبـڕوان بزانن درۆزنـن، جـا خـوا فەرموویەتـی: ﴿ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ ﴾ ئەمـە کۆکردنەوەیـە لە نێـوان بەدیهێنـان‌و کاروبارەکانـدا، واتە: خوا ﷻ لەسـەر جێگەی پاشـایەتیە، کاروبارەکان بەڕێـوە دەبات لە جیهانی سـەرەوەو خوارەوە، دروسـت دەکات‌و ڕۆزی دەدات، وە دەوڵەمەند دەکات‌و هەژاریـش دەکات، کۆمەڵـێ خەڵـک بـەرز دەکاتـەوەو کۆمەڵێکـی دیکـەش دادەبەزێنـێ، هەنـدێ سـەربەرز دەکاو هەندێکیش زەلیل دەکات، وە کـەم‌و کورتیش قبووڵ دەکات‌و دەرووی خێـر دەکاتـەوە لـە بـێ نـەواکان، قـەزاو قـەدەرەکان لـە کاتـی خۆیدا جێبەجـێ دەکات، کـە بە زانسـت‌و زانیاری پێشـیان کەوتـووە، وە قەڵەمی بەسـەردا هێناوە، فریشـتە بەڕێزەکانـی نـاردوە بۆ بەڕێوەبردنـی ئەوانەی کە ڕێکی خسـتووە، کتێبی ئاسـمانی داگرتـووە بەسـەر پێغەمبەرەکانیدا، ئەوەی پێویسـتە بۆ بەنـدەکان لە شـەریعەتدا دایگرتووە، لـە فەرمـان‌و قەدەغـە کـردن، وە بـە دوورو درێـژی باسـی کـردوە، ﴿ لَعَلَّكُم ﴾ واتە: بە هـۆی ئـەوەی بۆی دەرهێناون لـە بەڵگەی گەردوونـی، وە بەڵگـە قورئانیەکان ﴿ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ

﴿تُوقِنُونَ﴾ (واتــە: بەڵکــو بــە دیــداری پەروەردگارتان بگــەن بە یەقیــن‌و دڵنیایــی) بێگومان زۆری بەڵگــەکان‌و ڕوون کردنەوەو ئاشــکراکردنیان، لە هۆکارەکانی بەدەســتهێنانی دڵنیاین لــە هەموو کاروبارە پەرســتراویەکاندا، بــە تایبەتی لە مەســەلە ئیمانییە گــەورەو مەزنەکان، وەک زیندووکردنــەوەو دەرهێنان لــە گۆڕەکان.

وە هەروەهــا زانــراوە خــوا ﷻ دانــاو کاربەجێیــە، دروســتکراوی بەدینەهێناوە لە خــۆڕاو بە گۆتــرە، وە بێگومــان بــە گاڵتەجــاڕی بــە جێیان ناهێڵــێ، وەک چــۆن پێغەمبەرانــی ناردووەو کتێبەکانــی دابەزانــدوە، بە فەرمان کــردن بە بەندەکان بــۆ ئەنجامدانی کــردەوە چاکەکان‌و، قەدەغەکردنیــان لە شــتە ناپەســندەکان، بێگومــان دەبــێ بیانگوازێتەوە بۆ شــوێنێک کە تێیدا پاداشــت وەربگرن، چاکەکاران بە چاکترین شــێوە پاداشــت وەردەگــرن، وە خراپەکارانیش بــە هــۆی خراپەکانیانــەوە ســزا دەدرێــن ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ﴾ واتــە: بەدیهێنــاوە بۆ بەندەکانــی‌و بەرفراوانــی کــردووەو ڕایخســتووە بۆیــان، هەمــوو بەرژەوەندیەکانیانــی تێــدا دەســتەبەر کــردوە ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ﴾ واتــە: شــاخ‌و کێــوی مەزنــی دروســتکردوە لــە زەویــدا بــۆ ئــەوەی نەڕووخــێ بەســەر بەندەکانــدا، بێگومــان ئەگەر کێــوەکان نەبــن، ئەوە بەســەر خەڵکەکــەدا دەکــەوێ، چونکە لەســەر تەوژم‌و شــەپۆلی دەریایــە، بەو کێوانــە نەبێ جێگیــر نابــێ، کە خــوای گــەورە وەک مێخێــک دایناوە بۆیــان ﴿وَأَنْهَٰرًا﴾ ڕووباریشــی دروســت کردوە تا مرۆڤەکان ســوودی لــێ وەربگرن، بۆ خۆیــان‌و ئــاژەڵ‌و دانەوێڵەکانیان، بــە هۆی ئەو ئــاوەوە دارو درەخت‌و کشــتوکاڵ‌و خێــرو بێرێکــی زۆری دەرهێناوە ﴿وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ﴾ (لــە هەمــوو میوەکانــدا) دوو جووتــی جیــاوازی تێــدا دروســت کــردوون، بۆ ئــەوەی پێویســتی بەنــدەکان پــڕ بکاتــەوە ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ﴾ واتــە: بــە تاریکــی شــەو، ڕۆژ دادەپۆشــێ، هەمــوو گیانــدارەکان لــە شــوێنەکانی خۆیــان دەحەوێنــەوە، وە لــە ئــازارو ناڕەحەتــی ڕۆژگــار پشــوو دەدەن، پاشــان ئەگــەر پشــوویاندا جارێکــی تر دونیــا ڕوونــاک دەبێتەوەو بڵاودەبنــەوە بــۆ بەدەســتهێنانی بەرژەوەندیەکانیان، وەک خــوا دەفەرمــوێ: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾ القصص، (واتــە: لــە بەزەیــی ئــەو خوایــە ئەوەیــە کە شــەوو ڕۆژی بــۆ دروســت کــردوون بــۆ ئــەوەی ئــارام بگــرن لــە شــەوداو، وە بگەڕێن بــە دوای ڕۆزی‌و بژێــوو بەهــرەی خــوادا «لــە ڕۆژدا»، وە بــۆ ئەوەی سوپاســی خوا بکەن لەســەر ئەو نیعمەتانــەی پێی داون).

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ﴾ (واتــە: بەڕاســتی لەم ئایەتانەدا نیشــانە هەن) لە ســەر داواکاریەکانی بــە دیهێنــەر ﴿لِّقَوۡمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (واتــە: بــۆ گەلێــک کــە ڕادەمێنــنو بیــر دەکەنــەوە) تیایــدا، وە لێــی دەڕوانــن بــە ڕوانینی پەنــد وەرگرتن کــە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی بێگومان ئــەو کەســەی بەدیهێنــاوەو ڕێکــی خســتووە ئــەوە ئــەو خوایەیــە کــە هیچ کەس شــایەنی پەرســتن نیــە جگــە لــەو، زانایە بــە هەمــوو نهێنــیو ئاشــکراکان، میهرەبــانو بەخشــندەیە، توانــاو دەســەڵاتی هەیە بەســەر هەمــوو شــتێکدا، کاربەجێیە لــە هەمــوو کاروبارەکانیدا، وە ستایشــکراوە لەســەر ئەوەی دروســتی کــردووەو فەرمانــی پێــداوە، بەرزیو مەزنــی هەر بۆ ئەوە.

(٤): ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤﴾

لە نیشــانەکانی تەواوی قودرەتو دەســەڵاتی خــواو داهێنانی دروســتکردنی، ئەوەیە: ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ﴾ (واتــە: لــە زەویشــدا چەندیــن) جــۆری دارودرەخــت (گێڕاوەو دانــاوە، وەک) ﴿أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ﴾ وە جگــە لەوەش، هەندێک لە دارخورما ﴿صِنۡوَانٞ﴾ (بە دارخورمایــەک دەوتــرێ کــە لەگەڵ یەکێکــی دیکە، یاخــود لەگەڵ هەندێــک دارخورمای دیکــە پێکــەوە کۆبوونەتــەوە, وە بنکەکەیــان یەکێکــە) کۆمەڵــە دارێک یــەک بنەڕەتیان هەیــە، ﴿وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ﴾ بــەوەی هەمــوو دارێک لەســەر شــێوەی خۆیەتــی، وە هەموویان ﴿يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ﴾ بــە یــەک جــۆرو لە یــەک ئەرزدا ئــاو دەدرێــن ﴿وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِ﴾ واتــە: لە ڕووی ڕەنگو تامو ســوودو چێــژ وەرگرتنەوە، ئا ئەمە ئەرزێکــی بــە کەڵکــە، گژووگیایەکــی زۆر ســەوز دەکات، وە دارو درەختو کشــتوکاڵ، زەویەکــی دیکــەش لــە پاڵیدایــە گژووگیا ســەوز نــاکاو ئاو بــە خۆیــەوە ناگــرێ، وە ئەو زەویــەی تریــش ئــاو بە خۆیــەوە دەگــرێ، گژووگیا ســەوز نــاکات، ئەمەش کشــتوکاڵو دارو درەخــت ســەوز دەکات گیــاو لــەوەڕ ســەوز ناکات، ئــەم بەرهەمــە بە چێــژە، وە ئەو بەرهەمــەش تاڵــە، وە ئەوەش لــە نێوانی ئەمانــە دایە.

ئایــا ئەم جۆرە لەزەتانە لە سروشــتو خــودی خۆیانەوەیە؟ یان بە ئەندازەگیــری خوای زاڵو میهرەبانــە؟ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ واتــە: بــۆ گەلێک کــە عەقڵێکیان هەبێــت ڕێنماییــان بــکات بۆ لای ئەوەی ســوودیان پێدەگەیەنــێ، وە بیانگەیەنــێ بەوەی کە

ئامۆژگـاری کـردوون، وەسـیەتو فەرمـانو قەدەغەکراوەکانی خـوا ﷻ وەردەگرن، بەڵام ئەوانـەی پشـتیان تێکـردوەو بێ باکن ئەوانـە لە تاریکیو سـەرگەردانی خۆیانـدا دەمێننەوە، ناتوانـن رێگای راسـت بدۆزنەوە.

(٥): ﴿ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٥ ﴾:

دەکـرێ مانـای فەرمایشـتی خـوا: ﴿ وَإِن تَعۡجَبۡ ﴾ ئەوەبـێ (واتـە: جا ئەگەر تۆ سـەرت سـووڕدەمێنێ) لـە گەورەیـیو مەزنـی خـواو زۆری بەڵگەکانـی یەکتاپەرسـتی، بە ڕاسـتی نکوڵـی کردنـی درۆزنـەکان جێی سەرسـوڕمانە کـە زیندوو کردنەوە بـە درۆ دەزانن، وەک دەڵێـن: ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴾ واتـە: بـە گومانـی ئـەوان زیندووکردنەوە دوورە لـە ڕاسـتیەوە، ئـەوان پـاش ئـەوەی بـوون بـە خـۆڵ، خـوا جارێکـی تر دروسـتیان دەکاتـەوە، ئەوانـە بـە نەفامی خۆیان توانـای بەدیهێنـەرو توانـای بەدیهێنراوەکانیان قیاسـی سـەر یـەک کردوەو لـە یـەک ئاسـتیان داناون.

کاتێـک تەماشـایان کـردوەو بیریـان کردۆتـەوە کـە ئەمـە لـە توانـای مرۆڤـدا نیـە، بـە هەمـان شـێوە گومانیـان بـردوە کـە لـە تواناى خواشـدا نیـە، وە لە بیریـان چـووە کە خوا بەدیهێنەریانـە لـە یەکـەم جـارەوە، کاتـێ کـە هیـچ نەبـوون، هێنانیـە بوون.

وە دەگونجـێ ماناکـەی ئـەوە بـێ: ئەگـەر سـەرت سـووڕبمێنێ لـە وتەکانیـانو بـە درۆخسـتنەوەی زیندوبوونـەوە، بە ڕاسـتی ئەوە جێگای سەرسـووڕمانە، چونکە ئەو کەسـەی کـە نیشـانەو ئایەتەکانـی بـۆ ڕوون دەکەیتەوە، بـە چاوی خـۆی بەڵگـەی یەکلاکەرەوەی زۆر دەبینـێ لەسـەر زیندووکردنـەوە کـە گومـانو دوو دڵی هەڵناگـرێ، پاشـان نکوڵی لێ دەکات، بـە ڕاسـتی قسـەکەی جێگای سەرسـوورمانە.

بێگومـان ئـەوە دوور نیـە لـە ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ ﴾ (ئەوانـەی بێبروا بـوون) نکوڵی خـوا بـە یەکگرتنیـان دەکرد، ئـەوەش سـادەترینو دیارترین شـتە ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ ﴾ (واتـە: هـەر ئەمانـەش لـە ڕۆژی دواییـدا کـۆتو زنجیـر لـە گەردنیـان دایـە)، کاتێـک بانـگ دەکـران بـۆ بـڕوا هێنـان بڕوایـان نەدەهێنـا، وە هیدایەتیان بـۆ خرایـە ڕوو، وەریان نەگـرت، دڵو دەروونیـان گۆڕا، وەک سـزایەک لە بری ئـەوەی یەکەمجار بڕوایـان نەهێنا ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ بـۆ هەمیشـەیی لێـی دەرناچـن.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن
قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ
وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا
أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ
هَادٍ ﴿٧﴾ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ
وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ
وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ
أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ
بِالنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ
يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا
مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا
لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا
وَطَمَعًا وَيُنشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ
وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا
مَن يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ ﴿١٣﴾

(٦): ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ ﴾

ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ ﴾خوا هه‌واڵ ده‌دات ده‌رباره‌ی گه‌مژه‌یی‌و نه‌فامی به‌ درۆدانه‌رانی پێغه‌مبه‌رانی خوا، ئه‌وانه‌ی كه‌ هاوبه‌شیان بۆ داده‌نا، ئه‌وانه‌ی ئامۆژگاری كران، به‌ڵام وه‌ریان نه‌گرت، وه‌ به‌ڵگه‌یان به‌سه‌ردا ساغبوویه‌وه‌ ملكه‌چی نه‌بوون، به‌ڵكو به‌ ئاشكرا نكوڵیان ده‌كرد، نه‌رمونیانی‌و لێبورده‌یی خوایان به‌ به‌ڵگه‌ هێنایه‌وه‌، بێ ئه‌وه‌ی چاره‌سه‌ری تاوانه‌كانیان بكه‌ن، خۆیانیان زۆر به‌ ڕاست ده‌زانی‌و داوایان له‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌كرد سزایان بۆ پێش بخرێ، قسه‌كه‌رێكیان ده‌یوت: ﴿ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾الأنفال. (واته‌: بیر بكه‌ره‌وه‌ كاتێك (كافره‌كان) ده‌یانوت ئه‌ی په‌روه‌ردگار ئه‌گه‌ر ئه‌م قورئانه‌ ڕاسته‌و له‌ لایه‌ن تۆوه‌ هاتووه‌، ده‌ی به‌رد به‌سه‌رماندا ببارێنه‌ له‌ ئاسمانه‌وه‌، یان سزای سه‌ختی پڕ ئازارمان بۆ بنێره‌).

﴿ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ ﴾له‌ كاتێكدا پێش ئه‌وان گه‌لانێكی تر به‌ هۆی به‌درۆ خستنه‌وه‌ی ئایه‌ته‌كان، خوا له‌ ناوی بردن، ئایا بۆ بیر ناكه‌نه‌وه‌ له‌ بارودۆخی ئه‌وانو واز له‌ نه‌فامی ناهێنن؟ ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ﴾ واته‌: به‌رده‌وام چاكه‌و لێبوردنی داده‌بەزێنێ به‌سه‌ر به‌نده‌كانیدا، ئه‌وانیش به‌رده‌وام خراپه‌و سه‌رپێچیان بۆ لای ئه‌و به‌رز ده‌بێته‌وه‌، سه‌رپێچی ده‌كه‌ن ئه‌و بانگیان ده‌كات بۆ به‌رده‌م باره‌گای خۆی، خراپه‌كاری ده‌كه‌ن، به‌ڵام ئه‌و بێبه‌شیان ناكات له‌ خێرو چاكه‌ی خۆی، ئه‌گه‌ر داوای لێخۆشبونیان كرد ئه‌وه‌ خۆشی ده‌وێن، چونكه‌ ته‌وبه‌كارانو خۆ پاك

ڕاگرانـی خـۆش دەوێ، وە ئەگـەر داوای لێخۆشـبوون نەکـەن، ئـەوە ئـەو دکتۆریانـە، بـە بـەلاو نارەحەتـی پاکیـان دەکاتەوە لە کـەمو کورتـی، وەک دەفەرمـوێ:﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر، (واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ بڵـێ: ئەی بەندەکانـم! ئـەی ئەوانەی زۆر خۆتـان گوناهبـار کـردوە، نـا ئومێـد مەبـن لـە میهرەبانی خـوا، چونکـە بێگومان خـوا لە هەمـوو گوناهەکانتـان خـۆش دەبـێ، بە ڕاسـتی هـەر ئـەوە لێبـوردەی بەبەزەییە).

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ واتـە: لەسـەر ئەو کەسـەی بـەردەوام دەبێ لە سـەرپێچی کـردن، چونکـە ئـەو کەسـە یاخـی بـووە لـەوەی تەوبـە بـکاتو بگەڕێتـەوە لای خوای بەهێـزو بـە دەسـەڵات، بـا بەنـدەکان خۆیـان بپارێـزن لـە سـزای خوا بـۆ ئەوانـەی تاوان ئەنجـام دەدەن، بە ڕاسـتی سـزای بـە ئێشو سـەختە.

(٧): ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ﴾ :

﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ﴾ واتـە: بێبڕوایـان پێشـنیاری دابەزینـی نیشـانەت لـێ دەکـەنو دەڵێـن:﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ﴾ ئـەم قسـەیە بـۆ خۆیـان دەکەنە بیانـوو بـۆ بەدەمـەوە نەهاتنـی پەیامـی پێغەمبەر ﷺ، لـە کاتێکدا ئـەو تەنها ترسـێنەرە، هیچ دەسـەلاتێکی لـەو کاروبـارەدا نیـە، تەنهـا خوا خـۆی نیشـانەو ئایـەت دادەبەزێنێ.

خـوا پشـتیوانی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە بە بەڵگەی ڕوونو ئاشـکرا کـە لە لای خەڵکانی ژیـرو عاقڵ شـاراوە نیە، ئەوەی مەبەسـتی هەقو ڕاسـتی بێ بـەو نیشـانانە بڕوادەهێنێ، بەڵام کەسـی بێبـڕوا بە هۆی نەفامـیو نەزانینیەوە پێشـنیاری چەند نیشـانەیەکی پـووچو بێ ماناو درۆ دەکات، بەڕاسـتی ئـەو کەسـە ئەگـەر هەر نیشـانەیەکی بۆ بێـت، بڕوا ناهێنـێ، چونکە بـە هـۆی ئـەوەوە بـڕوای نەهێنـاوە کـە بەڵگـەو نیشـانەکە بەڕاسـت نازانـێ، بەڵکـو ئەوە بـە هۆی شـوێنکەوتنی هـەواو ئارەزووەوەیـە﴿ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴾ واتـە: ڕێ پێشـاندەرێک هەیـە بانگیـان دەکات بۆ ڕێنمایـی وەرگرتن لە پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانیان، وە بەڵگەو نیشـانەی ڕوونو ئاشـکرایان هەیـە، کە ئاماژەیە بۆ ڕاسـتیو دروسـتی ئـەو پەیامە.

(٨-١٠): ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُۖ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ ﴾ :

خـوا هـەواڵ دەدات بـە زانسـتی گشـتگیرو بەرفراوانـی، وە دەوردانـی هەمـوو شـتێک، فەرموویەتـی: ﴿ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ ﴾ لـە نەوەکانـی ئـادەمو غەیـری وانیـش ﴿ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ ﴾ واتـە: ئـەوەی ناتەواوە لە نـاو منداڵداندا، یـان تیادەچێو پەرش‌و بـڵاو دەبـێ لـە نـاو منداڵدانـدا ﴿ وَمَا تَزْدَادُ ﴾ (یـان زیـاد دەکات) لـە نـاو منداڵدانـداو منداڵەکـە گـەورە دەبـێ ﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴾ (واتـە: هەمـوو شـتێک لە لای خـوا ئەنـدازەی دیاریکـراوی هەیە) نـە پێش دەکەوێ بەسـەریداو نە دوا دەکـەوێو نە کەم دەکات، هەمـوو بـە حیکمەت‌و زانسـتی خـوا بەڕێـوە دەبرێ.

بێگومـان خوا ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ ﴾ لە ناوو سـیفاتەکانیدا ﴿ الْمُتَعَالِ ﴾ بەسـەر هەموو دروسـتکراوەکانیدا، بە زات‌و قودرەت‌و تواناو دەسـەڵاتی.

﴿ سَوَاءٌ مِّنكُم ﴾ لـە زانسـتی‌و بیسـتنی‌و بینینـی، ﴿ مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ ﴾ واتە: لە شـوێنێکی شـاراوەدا جێگیر بـێ، ﴿ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ ﴾ واتە: لە نـاو ئەو شـوێنەیدا لە ڕۆژدا، (السـرب) ئەو شـوێنەیە کـە مرۆڤ خۆی تیادا حەشـار دەدات، یـان لەنـاو ماڵەکەیدا، یان لە بـن ئەشـکەوتێ، یان هاوشـێوەی ئەوانە.

(١١): ﴿ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ (١١) ﴾

دەفەرمـوێ: ﴿ لَهُ ﴾ واتـە: مـرۆڤ ﴿ مُعَقِّبَاتٌ ﴾ لـە فریشـتە، دەتانپارێـزن بە شـەوو بە ڕۆژ ﴿ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ﴾ واتـە: جەسـتەو ڕووحـی لـە هەموو خراپەیـەک دەپارێـزن، وە کردەوەکانـی تۆمـار دەکـەن‌و دەیپارێـزن، ئـەوان بـەردەوام لەگەڵیـدان، وەک چـۆن زانسـتی خـوا دەوری داوە، بێگومـان فریشـتەی پارێـزەری ناردوە بـۆ بەنـدەکان، بـۆ ئـەوەی بـاروو دۆخ‌و کردەوەکانیـان بپارێـزن، وە هیچ شـتێکیان لە بیر ناچـی ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ ﴾ لـە نـازو نیعمـەت‌و ژیانـی خـۆش ﴿ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ بـەوەی لـە ئیمان‌و بـڕوا هەڵبگەڕێنـەوە بۆ کوفـرو بێبڕوایـی، لـە گوێڕایەڵیەوە بـۆ سـەرپێچی، لـە سوپاسـگوزاری نیعمەتەکانی خـواوە بۆ لووت بـەرزی‌و بـێ منەتی، ئەو کاتـە خـوا نیعمەتەکانـی خۆی لێیـان دەگرێتـەوە، بە هەمان شـێوە ئەگەر بەنـدەکان خۆیان بگـۆڕن لـە سـەرپێچیەوە بـۆ گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ، خوا ئـەو ناخۆشـیەی بەسـەریاندا هاتوە بۆیـان دەگۆڕێ بە خۆشـی‌و شـادی‌و میهرەبانی ﴿ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا ﴾ واتە: سـزاو نارەحەتـی، وە کارێـک پێیـان ناخۆش بـێ، بێگومان ئیرادەو ویسـتی خوا دەبێ بەسـەریاندا

جێبەجـێ ببـێ، ﴿ فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ﴾ هیچ کـەس ناتوانێ ڕەتی بکاتـەوە ﴿ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴾ کاروو باریـان بەڕێـوە بیات، ئـەوەی چاکە پێیان بـدات، ئەوەی خراپـە لێیان دوور بخاتـەوە، بـا خۆیـان بپارێـزن لـە ئەنجامدانی ئـەوەی خـوا پێی ناخۆشـە، لە ترسـی ئەوەی سـزایان لەسـەر پێویسـت نەبێ کـە ڕەتناکرێتـەوە بۆ گەلی ستەمکار.

(١٢-١٣): ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾ (واتـە: خـوا ئەو زاتەیـە کـە بروسـکە لـە نێـو هەورەکانـدا نیشـان دەدات) مەترسـی داڕووخـانو لـە بەین چوونـی لێدەکـرێ، وە جۆرەهـا زیانی دیکەی تریشـی لێ دەکـرێ لە هەنـدێ بەروبوومدا، وە لـە لایەکـی دیکـەوە دەبێتە مایـەی خێـرو قازانج بـۆ خاوەنەکەی ﴿ وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴾ بـە بارانـی پـڕ پیـتو بەرەکەت کە سـوودی بـۆ بەنـدەکانو وڵات هەیە.

﴿ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ ﴾ واتـە: بریتیـە لـە دەنگـی ئەو هـەورە گرمەی کـە بەندەکان پێـی نارەحـەت دەبـن، ئـەو ملکەچـی فەرمانـی پەروەردگاریەتـی، یـادی خـوا دەکات ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ ﴾ واتـە: لـە ترسـی پەروەدگاریاندا، دەترسـن لـە قامچی خوا ﷻ ﴿ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ ﴾ (هـەورە تریشـقە) ئەویـش ئـەو ئاگرەیـە کـە لـە نـاو هـەورەوە دەردەچـێ ﴿ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾ لـە بەندەکانـی بـە پێـی ویسـتو ئیـرادەی خۆی ﴿ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ ﴾ واتـە: لەگـەڵ ئـەو هەموو بەڵگەو نیشانانەیشـدا هێشـتا ئەوانە هـەر خەریکـی مشـتو مـڕن لـە بـارەی خـواوە، ﴿ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴾ واتـە: خـاوەن توانایـەو بەهێـزە، هەر شـتێکی بـوێ ئەنجامـی دەدات، وە هیچ شـتێکی لێی گیـر نابێ، هیچ کەسـێکیش ناتوانـێ لێی دەربـاز بێ.

جـا مـادام هـەر خـوا بـە تەنهـا بـارانو هـەورەکان بـۆ بەندەکانـی پەلکێـش دەکات کە سـەرچاوەی بژێـویو ڕزقو ڕۆزیانـە لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر، تەنها ئـەوە کارەکان بەڕێـوە دەبـات، وە سـەرجەم بوونـەوەرە گـەورەکان کـە مرۆڤ لێیـان دەترسـێ ملکەچی دەکـەن، دیـارە هـەر ئـەو شایسـتەی ئەوەیـە بەندایەتی بۆ بکـرێو هـاوەڵو هاوبەشـی بۆ دانەنـرێ، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا
كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ (١٤) وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا
وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ (١٥) قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ
لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ
تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ
ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ (١٦) أَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا
وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ
كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً
وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ
ٱلْأَمْثَالَ (١٧) لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟
لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ (١٨)

**(١٤):** ﴿ لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ (١٤) ﴾

**﴿ لَهُۥ ﴾واتە: تەنها بۆ خوای تاکو تەنهایە ﴿ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ﴾ئەویش بەندایەتی خوایە بە تاکو تەنهایی، هیچ هاوەڵو هاوبەشێکی نیە، وە دڵسۆزیو پاڕانەوەی عیبادەتو پاڕانەوەی داواکاری بۆ خوای بەرزە. واتە: ئەو خوایە شایستەی ئەوەیە ڕووی تێبکرێ بە پاڕانەوەو ترسو ئومێدو خۆشەویستیو حەزو ملکەچی، چونکە پەرستراوێکی هەقو ڕاستەو باتڵ نیە، ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾لە بتو هاوشێوەکانی کە کردوویانە بە هاوبەشی خوا ﴿ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم ﴾(وەڵامی) ئەو کەسە نادەنەوە کە هاواریان پێدەکاتو دەیانپەرستێ، نە بە کەمو نە بە زۆر، نە لە کاروباری دنیا، نە لە کاروباری دواڕۆژ ﴿ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ ﴾ئەوەی بە دەستی ناهێنێ، چونکە دوورە لێیەوە ﴿ لِيَبْلُغَ ﴾دەستەکانی درێژ دەکات بۆ ناو ئاوەکە ﴿ فَاهُ ﴾ بێگومان تینوویەتی، لە زۆری تینوێتیدا دەستەکانی دەخاتە ناو بیرەکەوە بۆ ئەوەی ئاو دەربێنێ، بەڵام دیارە دەستی ناگاتە ئاوەکە بۆیە ناتوانی ئاو دەربێنێ، بە هەمان شێوە بێبڕواکانیش ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا شتێکی تر دەپەرستن، بە هیچ شێوەیەک وەڵامیان نادەنەوە، لە نارەحەتترین کاتدا کە پێویستیان پێیان هەبێ نایەنە هانایانەوە، چونکە فەقیرو بێ دەسەڵاتن، وەک چۆن ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە وەک ئەوان هەژارن، بە قەد گەردیلەیەک دەسەڵاتیان نیە، نە لەسەر زەویدا، نە لە ئاسمانەکاندا، وە هیچ هاوبەشو سەرخەرێکیان نیە سەریان بخات، ﴿ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾ چونکە ئەوەی لێی دەپاڕێنەوە لە غەیری خوا بەتاڵو بێ مانایە، بۆیە پاڕانەوەکەیانو پەرستنەکانیان بێ سوودە، کاتێ کە خوا خۆی پادشای ڕاستەقینەیە، دیارە بەندایەتی بۆ**

کردنیشی هەقو تەواوە، خاوەنەکەی سوودی لێ وەردەگرێ لە دنیاو دوارۆژدا.
لێکچواندنی پاڕانەوەی بێبڕواکان بە غەیری خوا بەو کەسەی کە دەستی درێژ دەکات بۆ ناو بیرەکەو دەستی ناگاتە ئاوەکە لە جوانترینی نموونەکانە، بێگومان ئەوە لێکچواندنە بە کارێکی مەحاڵ، وەک چۆن ئەمە مەحاڵە، (مشبه به)یش ئەوەی پێی دەشوبهێنرێ مەحاڵە، وە خۆ هەڵواسین بە مەحاڵدا هەڵوەشاندنەوەی شتەکە دەگەیەنێ، وەک چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ ﴿٤٠﴾ ﴾ الأعراف. (واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی ئێمە، وە خۆیان بە گەورە دەزانن لە بەرانبەریاندا ئەوانە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێنەوەو ناچنە بەهەشتەوە، هەتا حوشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا).
(١٥): ﴿ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ ﴾:
﴿ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: هەموو ئەوانەی لە ناو ئاسمانو زەویدان لە ژێر فەرمانی پەروەردگاریاندان، سوژدەی بۆ دەبەن ﴿ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا ﴾ (الطوع) ئەوەیە کەسێک بە ویستو ئارەزووی خۆی سوژدە ببات وەک بڕواداران، (الكره) ئەوەی کە لووت بەرزی بنوێنی لە بەندایەتی کردنی پەروەردگاریدا، حاڵو سروشتی بە درۆی دەخەنەوە لەوەدا ﴿ وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴾ واتە: سێبەری بەدیهێنراوەکان لە سەرەتای ڕۆژو کۆتاییدا سوژدە بۆ خوا دەبەن، وە سوژدە بردنی هەموو شتێک بە پێی حاڵی خۆیەتی، وەک چۆن خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ ﴾ الإسراء. (واتە: هیچ شتێک نیە کە ستایشی خوا نەکات، بەڵام ئێوە تێناگەن لە تەسبیحاتەکانیان، بە ڕاستی خوا هەمیشە لەسەر خۆو لێبوردەیە).
جا ئەگەر دروستکراوەکان هەموویان سوژدە بۆ خوا ببەن بیانەوێ، یان نەیانەوێ، بێگومان ئەوە خوایە کە پەرستراوی ڕاستەقینەیە، پەرستنیشی بەتاڵو پووچ نیە، بۆیە باسی بەتاڵیان دەکاتو بەڵگە بۆ ئەو مەبەستە دەهێنێتەوە. بەو فەرمایشتەی:
(١٦): ﴿ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ لَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ نَفۡعٗا وَلَا ضَرّٗاۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ أَمۡ هَلۡ تَسۡتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُۗ أَمۡ جَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُواْ كَخَلۡقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلۡخَلۡقُ عَلَيۡهِمۡۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ ﴾:

خوادەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ﴾ واتـە: بەوانـە بڵـێ کـە هاوبەش بۆ خـوا دادەنێـنو، خۆشـیان دەوێـن وەک چۆن خوایـان خۆش دەوێ، لـە پێناویانـدا جۆرەهـا نزیکبوونـەوەو عیبادەتیان بۆ دەکـەن: ئایا عەقڵتـان تێکچووە تـا جگە لە خـوا بکەنە دۆسـتو پەرسـتراوو هەڵیبژێرن، لـە کاتێکدا ئەوانە شایسـتەی ئەوە نیـن؟ بێگومـان ئـەوان ﴿ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾ (واتـە: تەنانەت بۆ خۆشـیان هیچ سـوودو زیانێکیـان بـە دەسـت نیە)، ئێـوەش واز لە خـوا دێنن کە نـاوو سـیفاتەکانی تەواو کامڵـن، خاوەنـی زینـدووانو مردووانە، ئـەو خوایـەی بەدیهێنـاونو بەڕێوەتـان دەبات، وە سـوودو زیـان بە دەسـتی خۆیەتـی؟ چۆن یەکسـان دەبـێ عیبادەتـی خوای تـاکو تەنهاو عیبادەتـی هاوبـەش بۆ دانەرانی، وەک چۆن کوێرو چاوسـاغ یەکسـان نیـن، وە وەک چۆن تاریکـیو ڕووناکـی وەک یەک نین.

جـا ئەگـەر گومانیـان هەیـە، هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـاوە، وادەزانـن ئەوانـە بەدیهێنـەرن، وەک چـۆن خـوا بەدیهێنـەرە، وە دەتوانـن وەک خـوا کار بکەن، ئـەو هەمـوو گومانەیانی ڕەواندوەتـەوە، بـە بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە کـە بەڵگەیـە لەسـەر تـاکو تەنهایی خـوا، ئنجا دەفەرمـوێ پێیـان بڵـێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ (خـوا بەدیهێنـەری هەموو شـتێکە) بێگومان مەحاڵـە هیـچ شـتێک لەوانە خـۆی نەفسـی خـۆی بەدیهێنابێ.

بـە هەمان شـێوە مەحاڵە بەبێ دروسـتکران بێتـە بوون، بۆیە دەبـێ بەدیهێنەرێکـی هەبێ، کە ئـەو بەدیهێنـەرە هـاوەڵو شـەریکی نەبێ لـە دروسـتکراوەکانی، چونکە تەنهاو زاڵە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، بێگومان تـاکو تەنهاییو دەسـەڵات پێکەوە کـۆ نابێتەوە تەنهـا لە خوادا نەبـێ، دروسـتکراوەکان هەموو دروسـتکراوێک لەسـەرووی ئەویترەوەیە بە دەسـەڵاتو بە هێز، دەسـەڵاتی خۆی دەسـەپێنێ بەسەریدا.

پاشـان لـە سـەرووی ئـەو دەسـەڵاتدارەوە بەرزتریش هەیـە، تـا دەگاتە دەسـەڵاتی تاکو تەنهایـی زاڵو بـە توانـا، دەسـەڵاتو یەکتاپەرسـتی تەواوکـەری یەکتریـن، تایبـەت بـە خـوای تاکو تەنهـا، بە بەڵگـەی عەقڵی (القاهـر) زاڵو دەسـەڵاتدار ڕوون بوویـەوە، بەڵام ئـەوەی جگـە لە خوا دەپەرسـترێو هـاواری پێدەکـرێ، هیـچ توانایەکی نیە کە شـتێک بە دیبهێنـێ، بـەو شـێوەیەی پەرسـتنی پووچو بـێ مانایە.

(١٧): ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ

جُفَآءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾ ﴾:
خـوا ئـەو هیدایەتـەی کـە دایبەزانـدوە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی بـۆ ژیاندنـەوەی دڵو ڕووحـەکان، چوواندویەتـی بـەو ئاوەی کـە دایبەزاندوە بـۆ ژیانی مرۆڤـەکان، وە ئەوەی لە نـاو هیدایـەت دایە لە سـوودی گشـتی کە مـرۆڤ پێویسـتی پێیەتـی، چواندوویەتی بەوەی کـە لـە نـاو باراندایە لە سـوودی گشـتیو پێویسـت.
وە ئـەو دڵانـەی کـە هیدایـەت وەردەگرن شـوبهاندوویەتی، بـەو دۆڵو شـیوانەی کە ئاوی پێـدا تێپەڕ دەبێ، شـیوێکی گـەورە ئاوێکی زیاتر دەگـرێ، وەک دڵێکی گەورە زانسـتێکی زۆرتـر وەردەگـرێ، بـە هەمـان شـێوە، شـیوێکی بچـووک ئاوێکی کـەم دەگـرێ، وەک دڵێکـی بچـوک وایە زانسـتێکی کەم وەردەگـرێ، وە بەو شـێوەیە.
وە شـوبهاندوویەتی ئـەوەی لـە دڵەکاندایـە لـە شـەهوەتو گومـان، کاتـێ هەقو ڕاسـتی بـۆ دێـت، بـەو کەفـەی کـە دەکەوێتە سـەر ئـاو، وە ئـەو کانزایـە ئاگـر دەدرێتـە ژێری بـۆ جیاکردنـەوەی ئاڵتوونو هاوشـێوەکانی، خەڵتو پیسـیەکەی دەکەوێتە سـەرەوە، وەک کەفەکـە، هیـچ سـوودو قازانجێکی بـۆ مرۆڤەکان نابـێ، تـا دەڕواو پـەرشو بڵاودەبێتەوە، ئـەوە دەمێنێتـەوە کە سـوودی هەیـە بۆ خەڵکی، لـە ئاوی سـازگارو ئاڵتونێکـی پاڵفتە کراو.
بە هەمان شـێوەی گومانـەکانو ئارەزووبازیەکان، بەردەوام دڵ حـەزی پێی نیەو ڕووبەڕووی دەبێتـەوە بـە بەڵگەی ڕاسـتەقینەو حاشـا هەڵنەگر، وە ئیـرادەی تەواو، تـا دەڕواتو پەرشو بڵاودەبێتـەوە، وە دڵ بـە پاڵفەتەیـیو بـە پاکـی دەمێنێتـەوە، هیچـی تیـادا نامێنێتـەوە تەنها ئـەوە نەبـێ کە سـوودو قازانجی بـۆ خەڵکـی هەیە لە زانسـتی ڕاسـتەقینەو هاندانـی، ناهەق دەڕواو هـەقو ڕاسـتی لـە بەینـی دەبـات، وەک خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴿٨١﴾ ﴾الإسراء. (واتـە: بـە ڕاسـتی بەتاڵ هەمیشـە لەنـاو چووە).
وە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾ (واتـە: ئـا بـەو جۆرە خـوا ﷻ نموونەکان دەهێنێتـەوە). بـۆ ئـەوەی هـەقو ڕاسـتی دەرکـەوێ، لـە بەتـاڵو پـووچ، وە هیدایـەت لە گومڕایی.
(١٨): ﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٨﴾ ﴾:
کاتێـک کە خـوا ﷻ هەقو ڕاسـتی لە ناهـەق جیاکردەوە، باسـی ئەوەی کرد کـە خەڵکی

دەبـن بـە دوو دەسـتەوە: دەسـتەیەکیان وەڵامـی پەروەردگاریـان دەدەنـەوە، پاداشـتەکەی دیـاری کردوە، وە دەسـتەیەکیان وەڵامی نادەنەوە، باسـی سـزاکەی کردوە، جـا دەفەرموێ: ﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ﴾ واتـە: ئەوانـەی دڵیـان ملکـەچ بوو بـۆ زانسـتو بڕواهێنان، وە ئەندامانـی جەسـتەیان بـۆ فەرمـانو قەدەغە کـردن، پاشـان فەرمانەکانـی خوایـان جێبەجێ کـرد، ئـا ئەوانـە ﴿ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ واتـە: حاڵەتێکی بـاشو پاداشـتێکی چاکیان بـۆ هەیە. ئەوانـە خـاوەن بەرزتریـن سـیفەتو چاکترین ئـاکارو ڕەوشـتن، وە پاداشـت دەدرێنەوە بە پەلـەو لـە داهاتـوودا، (پاداشـتێک) کە چـاو نەیبینیوە، وە گـوێ نەیبیسـتوە، وە بەختورەش بـە دڵـی کەسـدا نەهاتـوە ﴿ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ ﴾ (ئەوانـەی کـە وەڵامـی بانگهێشـتەکەیان نەدایـەوە)، پاش ئـەوەی کە نموونەی ئاشـکراو جیاوازیان بـۆ هێنرایەوەو هەقیـان بـۆ ڕوونکرایـەوە، ئەوانـە لـە حاڵێکـی باشـدا نیـن، ﴿ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ﴾ لـە زێـڕو زیـوو هاوشـێوەکانی ﴿ وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ ﴾ واتـە: لە سـزای ڕۆژی دوایـی، لێیـان وەرناگیرێ، وە ئەوەش بۆ ئـەوان نیە؟! ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ ﴾ بریتیـە لـەو لێپرسـینەوەی کە لـە دوای هەمـوو کردەوەیەکی خراپـەوە دێ کـە ئەنجامیان داوە، وە ئـەوەی کـە لـە دەسـتیان داوە لـە مافەکانی خـواو مافی بەنـدەکان، بێگومـان ئەوە نووسـراوەو خەتی بەسـەردا هێنراوە، وتیان: ﴿ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴿٤٩﴾ ﴾الكهـف، (واتـە: ئـەی تیاچـوون بۆ خۆمـان، ئەمـە چ نامەیەکە؟ هەمـوو شـتێکی بچووکو گـەورەی لەخۆ گرتـووەو هەژمـاری کردوە؟! ئەوسـا پاداشـتی کارو کردەوەکانی خۆیان بـە ئامادەکراوی دەبینـنو وەری دەگـرن، پەروەردگاریـش سـتەم لـە هیچ کەسـێک ناکات).

﴿ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ ﴾ پـاش ئەو لێپرسـینەوە سـەختە دەخرێنـە دۆزەخەوە، کـە هەموو جۆرە سـزایەکی لـە خـۆ گرتـوە، لـە تینوێتـیو برسـێتی زۆر توونـد، ئاگـری زۆر بە ئێـش، وە خواردنـی زەقـوم، زەمهەریـر کـە جێگایەکـی زۆر سـاردە، وە کێمو زوخاوی پـاش ماوەی ئەهلـی دۆزەخ، هەمـوو ئەوانـەی کـە خوای زاناو شـارەزا باسـی کـردوون، لـە جۆرەکانی سـزایە ﴿ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾ واتـە: شـوێنو جێگایانە.

أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ
أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ
٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ
وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ٢١ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ
وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ
بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ٢٢ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا
وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ
عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ٢٣ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ٢٤
وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ
مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ
ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ
وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا
مَتَٰعٌ ٢٦ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ
إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ٢٧ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ٢٨

(١٩-٢٤): ﴿ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾

خوا ﷻ خاوەن زانستو کردەوە جیادەکاتەوە، لە پێچەوانەکەی (واتە: ئەوانەی خاوەن زانیاریو کردەوەی باش نین) دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ ﴾ لەوە تێگەیشتوەو کردەوەی پێکردوە ﴿ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ﴾ وەک کەسێک کە هەق نەناسێو کردەوەی پێنەکات، جیاوازی نێوانیان وەک جیاوازی نێوان ئاسمانو زەوی وایە، جا هەق وایە بەندە یادی خۆی بهێنێتەوەو بیر بکاتەوە، کە کام لەم دوو دەستەیە باشترو سەرەنجامی چاکترە لەوی تریان، ئەو کات شوێنی بکەوێو بە دوای ئەو دەستەدا بڕوات، بەڵام هەموو کەس ناتوانێ بیر بکاتەوەو باشو خراپ لە یەکتر جیابکاتەوە، ﴿ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ واتە: خاوەن عەقڵو ژیریەکی تەواوو بۆچوونی پەسند، بەڕاستی ئەوانە ناوەڕۆکو دڵی ئەم جیهانەن، وە نموونەی بەندە پاکەکانی نەوەی ئادەمن، ئەگەر حەز دەکەی وەسفەکانیان بناسی، ئەوە لەمە جوانتر وەسف نەکراوە کە خوا ﷻ دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەو پەیمانەی پێی داونو لێی وەرگرتوون)، لە بەجێهێنانی مافەکانی بە تەواوی، وەفابوون پێی تەواو کردنی مافەکانیەتی بە چاکترین شێوەو ئامۆژگاری کردنی تیایدا ﴿ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴾ واتە: ئەو پەیمانەی لە ئەستۆیاندایە لە لایەن خواوە، هەموو پەیمانو گرێبەستو نەزرو

سـوێندەکان لـە نێـوان بەندەکاندا دەچنە چـوار چێوەی ئـەوەوە، بەندە نایێتـە (أولی الألباب) خـاوەن عەقـڵو ژیـری کە پاداشـتی مـەزن وەردەگـرن، تا بـە چاکتریـن شـێوە جێبەجێ نـەکات، وە نەیشـکێنێو کـەمو کورتـی تیـادا نەکات.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾ ئەمـە گشـتگیرە بـۆ هەمـوو ئـەو فەرمانانـەی خـوا کردوویەتـی کـە بگەیەنـرێو جێبەجـێ بکـرێ، لە بـڕوا بـوون پێیو خۆشویسـتنی، وە خوشویسـتنی پێغەمبەرەکـەیو ملکەچبوونـی بەندایەتیکردنـی بـە تاکو تەنهـاو هاوەڵی بـۆ پەیـدا نەکـرێ، وە گوێڕایەڵـی پێغەمبەرەکـەی ﷺ، وە بەجێهێنانـی پەیوەنـدی چاکـە لەگـەڵ دایـکو باوکیـان، بـە چاکـە کردنو بە قسـەو بـە کـردەوە، ئازارنەدانیـان بە هیچ شـێوەیەک، پەیوەنـدی نزیـکو خزمـەکان گرێ بـدەن بە وتەو بـە کـردەوە، وە پەیوندی نێـوان خۆیـانو خێزانەکانو دۆسـتو خزمەتکارانیـان جێبەجێ بکەن، بە پێدانـی مافەکانیان بـە تـەواویو ڕێکـیو پێکی، لـە مافـە ئاینـیو دنیاییەکان.

هـۆکاری ئـەوەی وا لـە بەنـدە دەکات فەرمانەکانـی خـوا بگەیەنـێ بـە چاکتریـن شـێوە، کـە فەرمانـی پێکـردوون، ترسـانە لـە خـواو ڕۆژی دوایـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾ واتـە: لێـی دەترسـن، ترسـی خـوا ڕێگریان لێـدەکات لـەوە، لەوەی کـە ڕۆژی دوایـی دەچنە بەر دیوانـیو لێپرسـینەوەیان لەگەڵدا دەکات، لەبـەر ئەوانە ناتوانن بوێـری بکـەن لـە سـەرپێچی کردنـی خـوادا، یـان کەمتەرخەمـی بنوێنـن لـە شـتێک لـە فەرمانەکانـی، لـە ترسـی تۆڵـەو سـزادا، وە ئومێـد بوون بە پاداشـت.

﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ﴾ لەسـەر فەرمـان پێکراوەکان، وە لـە قەدەغە کـراوەکانو دوورکەوتنەوە لێیـان، لەسـەر قـەزاو قـەدەرە بـە ئێشـەکان بـە تـووڕە نەبوونـی، بـەڵام بـە مەرجـی ئـەو ئارامگرتنـە ﴿ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ ﴾ (بـۆ ڕەزامەنـدی پەروەردگاریـان بـێ) بـۆ هیچـی تـر نەبـێ لـە مەبەسـتە پووچـەکان، بە ڕاسـتی ئەمـە ئارامگرتنی بە سـوودە کە مـرۆڤ نەفسو دەروونـی دەبەسـتێتەوە لەبـەر ڕەزامەندی خـواو ئومێدی نزیـک بوونەوە لێیو گەیشـتن بە پاداشـتی نەبـڕاوە، ئەویـش ئەو ئـارام گرتنەیە کـە لـە تایبەتمەندیەکانی ئیمانە، بـەڵام ئارام گرتنـی هاوبـەش کـە ئامانج تیایدا بەسـتنەوە بێـت، کۆتایەکەیشـی شـانازیو فەخر کردن بێـت، ئـەم ئارامگرتنـە مرۆڤی چاکو خـراپو بـڕوادارو بێبڕوا تیادا بەشـدارە، لە ڕاسـتیدا ئـەوە وەسـف نەکـراوە ﴿ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ بـە پایـەو مـەرجو تەواوکاریەکانیـەوە، بـە ئاشـکراو نهێنی ﴿ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾ سـەرجەم بژێویو نەفەقە پێویسـتەکان

دەچنــە ئــەو چــوار چێوەیــەوە، وەک زەکات‌و کەفــارەت‌و ئــەو نەفەقانــەی کە پێویســتن، ئــەوان هەرکات پێویســت بە بەخشــین بکات دەبەخشــن بــە ئاشــکراو نهێنی ﴿ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾واتــە: هەرکەســێ بــێ ڕێزیان بەرانبەر بــکات بە وتە بێ، یــان بە کردەوە، ئــەوان وەک ئــەو ناکــەن، بەڵکــو چاکــەی لەگەڵدا دەکــەن، دەبەخشــن بەو کەســانەی کە بــێ بەشــیان کــردوون، وە دەبــوورن لەوانــەی ســتەمیان لێکــردوون، چاکە دەکــەن لەگەڵ ئەوانــەدا خراپەیــان بەرانبــەر کــردوون، جــا ئەگەر لــە بەرانبەر خراپــەی خراپــەکار چاکە بکــەن، دەی گومانــت چۆنــە بەرانبــەر کەســێک کــە خراپــەی لــە بەرانبــەر نەکــردوون؟!
﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ئەوانــەی بــەو شــێوە جــوان‌و چاکــە وەســف کــراون ﴿ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾ کە هــەر بــەم فەرمایشــتەی خۆی تەفســیری کــردوە ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ ﴾ واتــە: مانەوەیــەک تیایدا لاتابرێــن، حەزیــش ناکــەن جێگۆڕکێیان پێبکــەن، چونکە لەوە باشــترو چاکتــر نابینن، کە هەمــوو نیعمەت‌و خۆشــیەکی لەخــۆ گرتوە لــە ســەرووی داواکاری‌و خۆزگــەو ئاواتەکانی مرۆڤەوەیە.
وە لــە تــەواوی نــازو نیعمەتەکانیــان‌و بیلبیلەی چاوەکانیــان ئەوان دەچنــە ناویەوە ﴿ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ ﴾ لــە نێــرو مێیــەکان ﴿ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ ﴾ مێــرد یــان ژن، بــە هەمــان شــێوە هاوشــان‌و دۆســت‌و ڕەفیــق‌و خۆشەویســتان، بێگومــان ئەوان لــە خێــزان‌و نەوەیانن ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴾دێنــە لایــان پیرۆزباییــان لێدەکــەن بە ســەلامەتی‌و ڕێــزو حورمەتــی خوا بۆیــان، پێیــان دەڵێن: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم ﴾واتە: ســڵاوی خواتان لەســەر حــەڵاڵ بێ، ئــەوەش نەمانی ناخۆشــی لەخــۆ دەگــرێ، وە بەدەســتهێنانی هەموو ئــەوەی کە نەفســی مرۆڤ حــەزی پێــدەکات‌و دەیخــوازێ ﴿ بِمَا صَبَرۡتُمۡ ﴾واتــە: ئارامگرتنتــان ئێوەی گەیانــدە ئــەم پلەو پایە بــەرزەو بەهەشــتە بە نرخــە ﴿ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾(واتە: ئــای چەندە ســەرنجامێکی چاکتــان بوو).
هەقــی خۆیەتــی ئــەوەی ئامۆژگــاری دەروونــی دەکات، وە بە نرخــە لە لای کە لــە پێناویدا تێبکۆشــێ، بەڵکــو بەشــێک لــە وەســفی خــاوەن دڵ‌و ژیــرەکان وەربگــرێ، بەڵکــو بگاتە ئــەو ماڵــە کە ئاواتــی هەموو نەفــس‌و دەروونــەکان‌و خۆشــی ڕووحەکانە، هەمــوو لەزەت‌و خۆشــیەکانی لەخۆ گرتوە، با تێکۆشــەران بۆ پاشــەڕۆژی وا تێبکۆشــن، وە بۆ ئەوە پێشبڕکێ کەران پێشــبڕکێ بکەن.
(٢٥): ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ

فِي ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ﴾:

کاتێک کە خوا ﷻ باسـی دەسـتەو کۆمەڵی بەهەشـتیانی کرد، بەهەمان شـێوە باسی کۆمەڵی دۆزەخیشـی کـرد، بـە پێچەوانـەی وەسـفی بەهەشـتیەکان، جـا دەربارەیـان فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ ﴾ واتـە: پـاش ئـەوەی کـە جەختـی لەسـەریان کردۆتـەوە، لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەرانو نێردراوانـی، لـە بەرانبـەردا ئەوان ملکـەچو قایل نەبـوون، بەڵکـو بـە پشـتێکردنو بە ناتـەواو زانین ڕووبـەڕووی بوونـەوە، ﴿ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾ پەیوەنـدی نێوان خۆیـانو پەروەردگاریان بـە بڕواهێنانو کردەوەی چـاک نەگەیانـدو جێبەجـێ نەکـرد، وە پەیوەنـدی خزمایەتیـان دابـڕیو ئەنجامیـان نـەدا، بەهەمـان شـێوە ئـەو ئـەرکو مافانەی لەسـەر شـانیان بوو پێـی هەڵنەسـان، بەڵکو فەسـادو کوفـرو خراپەکاریـان لەسـەر سـەوزیدا بەرپـا کرد، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕێگریـان دەکرد لە بڕواهێنـان، وە کتێبـی خوایـان بە لارو چـەوت دەزانی ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ ﴾ واتـە: ئەوانە نەفریـنو دوورکەوتنـەوەو سەرزەنشـتیان بۆ بڕاوەتەوە، لـە لایەن خوا ﷻو فریشـتەو بەندە بڕوادارەکانـەوە ﴿ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾ ئەویـش دۆزەخە کە سـزای بە ئێشـی لە خـۆ گرتووە.

(٢٦): ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَفَرِحُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾ واتـە: خـوا هـەر خـۆی ڕزقو ڕۆزی بەرفـراوان دەکات، بـۆ هـەر کەسـێک کە بیـەوێو، پێی دەبەخشـێ، وە لە هەرکەسـێکیش خـۆی بیـەوێ دەیگرێتـەوە، ﴿ وَفَرِحُواْ ﴾ واتە: بێبـڕواکان ﴿ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ بـە ژیانی ئەم دنیایـە دڵخـۆش بـوون بە شـێوەیەک پێویسـتی کرد زیـاد لە ئەنـدازە دڵخۆش بـن پێی، وە لـە دوارۆژ بێئاگابـن، دیـارە ئەوەش بەهۆی ناتـەواوی عەقڵیانەوە بـوو، ﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴾ واتـە: شـتێکی زۆر بـێ نرخـە، چێژێکی کەمـی لێوەردەگـرێ، لەماڵو منـداڵو دۆسـتو خۆشەویسـتانیان جیادەبێتـەوە، بـە دوای ئـەوەدا سـزاو لـە ناوچوونێکی دوورو درێژیـان بـۆ پێویسـت دەبێ.

(٢٧-٢٩): ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون بـە ئایـەتو

نیشـانەکانی خـوا ﷻ، وە پێشـنیار بۆ پێغەمبـەری خوا ﷺ دەکـەنو دەڵێن: ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦٓ ﴾ بـە گومانی خۆیـان ئەگەر (ئایەتو نیشـانەیەک) دابەزێ بـروا دێنن، خوا وەڵامـی دانـەوەو فەرمـووی: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴾ (واتـە: بە ڕاسـتی خـوا هەر کەسـێکی بوێ گومـڕای دەکات) وە هەر کەسـێکیش بـەرەو لای ئەو بگەڕێتـەوە لـە کاری ناپەسـندو داوای ڕەزامەندی بـکات، ئەوە خوای پەروەردگـار ڕێنمایی دەکات، هیدایـەتو گومڕایـی بە دەسـتی ئـەوان نیە، تـا بڕواهێنانیان بەسـتنەوە بـە هێنانی ئـەو ئایەتانـەی کە پێشـنیاریان کردوە، لەگەڵ ئەوەشـدا ئـەوان درۆ دەکەن، ﴿ وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ الأنعام، (واتـە: بێگومـان ئەگـەر ئێمە فریشـتەمان بۆ لای ئـەو بێبڕوایانـە بناردایەو مـردووەکان قسـەیان لەگەڵـدا بکردنایەو هەموو شـتێکمان بۆ کۆ بکردبانـەوە، ڕووبـەڕوو بـە پێش چاویانـەوە بڕوایان نەدەهێنـا مەگەر خوا بیویسـتایە، بەڵام زۆربەیـان نـەزانو بـێ ئاگان. پێویسـت نیـە پێغەمبەر ﷺ ئـەو ئایـەتو نیشـانانە بهێنێتەوە کـە ئـەوان پشـتی پـێ دەبەسـتنو پێشـنیازی دەکـەن، بەڵکـو ئەگـەر ئایەتێکی بـۆ هێنان بـەو ئایەتـە هەقو ڕاسـتی دەرکەوت ئـەوە بەسـەو ئامانج بەدەسـت هاتـووە، بێگومان ئەوە باشـترە بۆیـان لـە داواکاریـان بـەو ئایەتانەی کـە خۆیـان دەیانـەوێو پێشـنیازی دەکەن، ئەگـەر ئـەوەی ئەوان داوای دەکـەن پڕاو پـڕ بێتـە دی، بڕواناهێننو ئیدی سـزایان بۆ پێش دێ.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ٢٩
كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ لِّتَتۡلُوَاْ
عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ قُلۡ هُوَ رَبِّي
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ٣٠ وَلَوۡ أَنَّ قُرۡءَانٗا
سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ ٱلۡأَرۡضُ أَوۡ كُلِّمَ بِهِ ٱلۡمَوۡتَىٰۗ
بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ
ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم
بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ
ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٣١ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن
قَبۡلِكَ فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ
عِقَابِ ٣٢ أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ
لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَم
بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ وَصُدُّواْ عَنِ
ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٣ لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ٣٤

پاشـان خوا ﷻ باسـی نیشـانەی بـڕواداران دەكات، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: خەمو دوو دڵـیو گومـانو بێزاریـان دەڕەوێتەوە، لـە جێگایـدا دڵخـۆشو ئـارام دەبـن ﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ واتـە: هەقی خۆیەتی كـە دڵ ئـارامو ئۆقرە نەگـرێ بـە زیكـرو یـادی خـوا نەبـێ، بێگومان هیچ شـتێك خۆشـترو بـە لەززەتر نیـە بـۆ دڵـەكان، وە چاكترو جوانتـر نیە لە خۆشویسـتنی بەدیهێنەرەكـەی، وە هۆگـر بـوون پێیو ناسـینی، یـادی خـوا دەكاتەوە بـە ئەنـدازەی ناسـینو خۆشویسـتنی، ئەمە لەسـەر قسـەی: بـەوەی كـە زیكـری خوا، زیكـری بەندەیـە بـۆ پەروەردگـاری، لـە تەسـبیحو تەهلیـلو تەكبیـر كردنو هاوشـێوەی ئەوانە.

وە وتـراوە: مەبەسـت لە زیكری خـوا قورئانی پیرۆزە كـە دایبەزاندووە تا ببێتـە یادكردنەوە بـۆ بـڕواداران، لەسـەر ئەمـە ئۆقـرە گرتنی دڵـەكان بە یـادی خوا: لـە كاتێكدا دەبـێ ماناو حوكمەكانـی قورئـان بزانـێ، بـەو شـێوەیە دڵـی ئۆقـرە دەگـرێ، بێگومـان دڵ ئارامـیو ئۆقرەیـی بـۆ نابـێ تەنهـا بە یەقینو زانسـتی تـەواو نەبـێ، ئەوەش لـە كتێبی خـوادا گرنتی پێـدراوە بـە چاكتریـنو تەواوتریـن شـێوە، بـەڵام غەیـری ئـەوە لـەو كتێبانەدا كـە بۆی ناگەڕێتـەوە دڵ پێـی ئـارام نابێـت، بەڵكـو بـەردەوام دوو دڵو ڕاڕایـە لە دژیەكـی بەڵگەو حوكـمو بڕیـارەكان، ﴿ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢ ﴾ النسـاء، (واتـە: خـۆ ئەگـەر ئـەم قورئانـە لـە لایەن جگـە لـە خـوا بووایـە، بێگومـان جیاوازیەكی زۆریـان تێـدا دەبینی).

ئـا ئەمـە ئـەو كەسـە دەیزانـێ كـە كتێبـی خـوا بخوێنێتـەوەو بیـری لێبكاتـەوە، وە بیـر كردنـەوە لـە هەمـوو جۆرە زانسـتەكانی تـر جگە لـە قورئان، ئـەوە جیاوازیەكـی گەورەو

مـەزن لە نێوانیانـدا دەبینێ، پاشـان فەرموویەتـی:﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە: لە دڵـەوە بڕوایـان هێنـاوە بە خـواو فریشـتەکانو کتێبـەکانو پێغەمبـەرانو ڕۆژی دوایـی، ئـەم بڕواهێنانەیـان بـە کردەوەی چـاک سـەلماندوە، لـە کردەوەکانـی دڵ، وەک خۆشویسـتنی خـواو ترسـان لێـیو ئومێـد بـوون پێـی، وە کردەوەکانـی ئەندامانی جەسـتە وەک نوێـژو هاوشـێوەکانی،﴿ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ﴾ واتـە: باروودۆخێکـی باشو گەڕانەوەیەکـی چاکیـان بـۆ هەیـە، لەبـەر ئـەوەی ڕەزامەنـدیو ڕێـزی خوایـان لـە دنیاو دوارۆژدا بـە دەسـت هێنـاوە، لە پاشـەڕۆژدا ئـەوان بە تـەواوی پشـوو دەدەنو لـە ئارامیدا دەبـن، وە لـە چوارچێوەی ئەوانەشـدا درەختی (طوبى) کە لەناو بەهەشـتدایە، ئـەو درەختەی کـە سـوار بە ژێری سـێبەرەکەیدا سـەد سـاڵ تێپەڕ دەبـێ هێشـتا نەیبڕیـوە، وەک چۆن لە فەرمـوودەی ڕاسـتدا ئامـاژەی پێکراوە.

(٣٠): ﴿ كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ لِّتَتۡلُوَاْ عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ قُلۡ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ٣٠ ﴾ :

خـوا بە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەفەرمـوێ:﴿ كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾ (واتە: بە هەمان شـێوە تۆمان نـارد) بـۆ لای گەلەکـەت بانگیـان بکەیت بـۆ هیدایـەتو ڕێنمایـی﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ ﴾ پێغەمبەرانمـان نـارد بـۆ نـاو (گەلەکان)یان، تۆ شـتێکی تازەت دانەهێنـاوە تا نکوڵی پەیامەکـەت بکـەن، وە لـە خۆتـەوە بە پێی هـەواو ئارەزووت قسـە ناکەیت، بەڵکـو ئایەتی خوایـان بەسـەردا دەخوێنیـەوە کە خـوا ﷻ ناردوویەتی بـۆت، بۆ پاککردنـەوەی دڵەکانو پاڵفتـەی دەروونەکان.

حـاڵ وایـە قـەومو گەلەکـەی تـۆ بێبڕوایـی دەکـەن بەرانبـەر بە خـوای میهرەبـان، بە دەم میهرەبانـیو چاکـەی خـواوە نەچـوون بـە وەرگرتـنو سوپاسـگوزاری، کـە مەزنترینیـان پێغەمبەرمـان بـۆ نـاردوونو کتێبمـان بـۆ دابەزانـدوون، بەڵکـو ڕووبـەڕووی بوونـەوە بـە نکوڵـیو ڕەتکردنـەوە، ئایـا پەندو وانـە وەرناگرن لەو گـەلو ئوممەتانەی پێـش خۆیان کە پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دەخسـتەوە، چۆن خوا بە هـۆی تاوانەکانیانەوە سـزای دان؟﴿ قُلۡ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ ئەمـەش یەکتاپەرسـتی لـە خۆ دەگرێ، یەکتاپەرسـتی پەرسـتراوێتیو یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتـی. ئـەو پەروەردگارمـە کـە پـەروەردەی کـردووم بـە نیعمەتەکانـی لـەو کاتەی بەدیهێناوم، ئەو پەرسـتراومە کـە﴿ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ ﴾ لە هەموو کاروبارەکانمـدا﴿ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ﴾ هەر بـۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە لە هەموو پێویسـتیەکانمدا.

(٣١): ﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ (٣١) ﴾:

خـوا ﷻ فـه‌زڵو چاکـه‌ی قورئـان ڕوون ده‌کاتـه‌وه به‌سـه‌ر سـه‌رجه‌م کتێبـه پیرۆزه‌کانداو ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا ﴾ لـه کتێبـی خوایـی ﴿ سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ ﴾ لـه جێگاکانـی خۆیـان ﴿ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ ﴾ (یـان زه‌وی پـێ له‌ت لـه‌ت کرابا) به بـاخو ده‌ریاکانه‌وه ﴿ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ (یـان مـردووی پـێ بهێنایه‌ته قسـه کـردن) ئه‌وه ئـه‌م قورئانه ﴿ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ﴾ ئـه‌و ئایه‌تانـه ده‌هێنـێ کـه حیکمـه‌تو دانایی خـۆی ده‌یخـوازێ، ئه‌وه کـه‌ی کاری بـه درۆ دانه‌رانه به ویسـتی خۆیان پێشـنیاری دابه‌زاندی ئایه‌تـه‌کان بکه‌ن؟ ئایا ئـه‌وان یان غه‌یری وان هیـچ کاروبارێکیان به ده‌سـته؟ ﴿ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾ بـا بزانـن خـوا بـه توانایه بۆ هیدایـه‌ت دانیان، بـه‌ڵام ئه‌وه نـاکات، به‌ڵکـو ڕێنمایی ئـه‌و که‌سـه ده‌کات که بیه‌وێت، وه ئه‌و که‌سـه‌ش گومـڕا ده‌کات کـه بیـه‌وێ ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ له‌سـه‌ر بێبڕواییـان ده‌مێننـه‌وه، په‌نـدو ئامۆژ گـاری وه‌رناگـرن، خـوا بـه‌ڵاو نه‌هامه‌تیه‌کـی سـه‌ختیان تـووش ده‌کات لـه وڵاتـی خۆیـان، یان هـه‌ر لـه په‌نای ماڵه‌کانـی خۆیاندا تووشـیان ده‌کات، له کاتێکدا سـوورن له‌سـه‌ر بێبڕواییان، ﴿ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ﴾ کـه خـوا ﷻ به‌ڵێنـی پێـداون پێـی، به دابه‌زاندنی سـزای بـه‌رده‌وام کـه هه‌ڵناگیرێ له‌سـه‌ریان ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴾ واتـه: ئه‌مه هه‌ڕه‌شـه‌یه‌که بۆ ئه‌وان، وه ترسـاندنه لـه دابه‌زاندنـی ئه‌وه‌ی کـه خوا به‌ڵێنـی پێداون له‌سـه‌ر بێبڕوایی‌و سه‌رکه‌شـی‌و سـته‌م کردنیان.

(٣٢): ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ (٣٢) ﴾:

خـوا دڵـی پێغه‌مبه‌ره‌کـه‌ی ﷺ ده‌داتـه‌وه‌و پێـی ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ واتـه: تـۆ یه‌کـه‌م پێغه‌مبه‌ر نیت که ئـازار درابـی، ﴿ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واته: ئنجـا منیـش بـۆ ماوه‌یـه‌ک وازم لێهێنـان‌و مۆڵه‌تـم پێـدان تـا وا گومـان ببه‌ن سـزا نادرێن ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ﴾ (واتـه: قـارم لێهه‌ڵگرتـن بـه جۆره‌ها سـزا سـزام دان) ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴾؟ سـزایه‌کی توونـدو بـه ئێـش بوو، بـا له خۆبایـی نه‌بن ئـه‌و بێبڕوایانه کـه تۆ به

درۆ دەخەنــەوەو گاڵتــەت پێدەکــەن، بەوەی کــە ئێمە دەرفەتمــان پێداون، ئەوان پێشــەنگی ئۆممەتەکانــی پێــش خۆیانــن، دەی بــا ئاگــادار بن، ســزایان بەســەردا بێ، وەک چۆن ســزا بەســەر پێشــینی ئەواندا هات.

(٣٣-٣٤): ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ ۗ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ ۚ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾ ﴾:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ بــە پاداشــت لــە ئێســتاو داهاتــوودا، وە بــە دادپــەروەری، ئــەو خــوای بەرزو مەزنــە، وەک ئــەوە وایە کە بەو شــێوە نەبــێ؟ لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ﴾ ئەویــش خوا ﷻ تــاکو تەنهاو بێنیــازە هیــچ هــاوەڵو هاوتــاو هاوشــانی نیــە ﴿ قُلْ ﴾ پێیــان بڵــێ: ئەگــەر ئەوان راســت دەکــەن: ﴿ سَمُّوهُمْ ﴾ تــا حاڵــی حەقیقیــان دەربکــەوێ ﴿ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بێگومــان ئــەو ئەگــەر زانای پەنهانو ئاشــکرا بــێ، وە هاوەڵی بۆ خــۆی دانە نابێ، دەزانــرێ بانگەشــە کردنــی هــاوەڵ بــۆ دانانی بــێ بنەمــاو بەتاڵە، ئێــوە وەک ئەو کەســەی بتانــەوێ خــوا فێر بکەن کــە هاوەڵی هەیــەو پێی نازانێ، ئــا ئەمەش پوچترینو بــێ ماناترین شــتە، لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ واتە: ئەمــە ئەوپــەڕی توانایانە لە هاوبــەش بــۆ دانــان بۆ خــوا، ئەمەش ڕووکەشــی قســەکانتانە، بەڵام لــە ڕاســتیدا هیچ کەس شایســتەی پەرســتن نیــە، جگــە لــە خــوا ﷻ نەبــێ، بــەڵام ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ ﴾ واتــە: بــۆ بێبڕوایــان ڕازێنرایەتەوە ئەو فــرتو فێڵەی کە ئەنجامیــان دەدا، ئەویــش بێبڕواییو هاوەڵدانــانو بــە درۆخســتنەوەیان بــوو بــۆ ئایەتەکانی خــوا ﷻ ﴿ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ واتــە: ڕێگــەی ڕاســتیان لێگیــرا ئــەو ڕێگەیــەی کــە دەیانگەیەنێتە لای خــواو ماڵــی ڕێزو بــەرزی ئــەو، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾ چونکە هیــچ کەس لــەو کاروبارانەدا هیچی بــە دەســت نیــە، ﴿ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ﴾ ســزای دواڕۆژیان لە ســزای دنیایان ســەخترو نارەحەتــرەو هەمیشــەییە ﴿ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾ بیانپارێزێ لــە ســزای خوا، بە ڕاســتی ســزای خــوا ڕووبــەڕووی هەر کەســێک ببێتــەوە بە ئێشــەو هیچ بەرگریــکاری نیە.

مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ
أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّعُقْبَى
ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ
بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ قُلْ إِنَّمَآ
أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ
﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ
مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ
أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ
لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾
يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا
نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ
وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا
مِنْ أَطْرَافِهَا وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ وَهُوَ سَرِيعُ
ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا
يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾

**(٣٥):** ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ ﴾

**خـــوا فەرموویەتـــی:** ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ **ئەوانــەی کــە وازیــان هێنــاوە لــەوەی خــوا لێیانــی قەدەغــە کــردوە، وە کەمتەرخەمیــان نەکــردوە لــە بەجــێ هێنانــی فەرمانەکاندا، (بەهەشــتیان بــۆ هەیــە) ئنجــا وەســفو وێنــای ئــەو بەهەشــتە** ﴿ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ **(ئەوەیــە کــە) ڕووبــاری هەنگویــن، ڕووبــاری شــەڕاب، وە ڕووبارێــک لــە شــیر، هەروەهــا ڕووبارێــک لــە ئــاوی خاوێــن، کــە لــە چەندیــن شــوێنی جیــا جیــاوە تێپــەڕ دەبــێ، بــە ژێــر درەخــتو باخەکانــدا، هەمــوو جــۆرە بەرووبومەکانــی تێدایــە،** ﴿ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ﴾ **بــە هەمــان شــێوە سێبەریشــی بەردەوامــە** ﴿ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ﴾ **ئــەو ســەرەنجامەی کــە بــۆی دەگەڕانــەوە** ﴿ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾ **چەندیــن جیــاوازی هەیــە لــە نێــوان ئــەم دوو دەســتەیە؟!**

**(٣٦):** ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ ﴾

**خــوا ﷻ دەفەرمــوێ:** ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ **منەتــی ئێمــە بەســەریانەوە بــە پێدانــی کتێبــی پیــرۆزو شــارەزابوون لێــی** ﴿ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ﴾ **بــڕوای پێدەهێنــنو بەڕاســتی دەزانــن، وە دڵیــان خۆشــە بــە گونجانــی هەنــدێ لــە کتێبەکەیــان بــە هەندێکــی دیکــەی، وە بــە ڕاســتدانەری هەندێکــی بــە هەندێکــی تــری، ئەمــە حاڵی ئــەو کەســەیە لــە خــاوەن (تــەوراتو ئینجیــل) بڕوایــان هێنابــوو** ﴿ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ﴾ **واتــە: لــە دەســتەو تاقمــی بێبــڕواو لادەرەکان لــە ڕاســتی، تیایاندایــە**

نکوڵی لەم قورئانە دەکاتو بەڕاستی نازانێ ﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ﴾ الزمر. (واتە: هەر کەسێک هیدایەتی وەرگرت بۆ قازانجی خۆیەتی، وە هەر کەسیش گومڕا بوو، بۆ خۆی گومڕا دەبێو بۆ خۆیشی زەرەر دەکات، خۆ تۆش کارپێ سپێردراوی ئەوان نیت). بە ڕاستی تۆ ئەی موحەممەد ﷺ ترسێنەری، بانگەواز دەکەی بۆ لای خوا ﷻ، ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ﴾ (بڵێ من فەرمانم پێکراوە تەنیا خوا بپەرستمو هاوبەشی بۆ بڕیار نادەم) واتە: تەنها ملکەچ بوون بۆ ئاینی خوای تاکو تەنها ﴿ إِلَيْهِ أَدْعُواْ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴾ (واتە: من هەر ئەو دەپەرستم بە تەنهاو) گەڕانەوەم بۆ لای ئەوە، پاداشتم دەداتەوە بەوەی پێی هەستاوم لە بانگەواز کردن بۆ لای ئاینەکەی، وە بەجێهێنانی ئەوەی فەرمانی پێکردووم.

(٣٧): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَـٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَـٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾ واتە: بێگومان قورئانی پیرۆزمان بە زمانی عەرەبی ناردۆتە خوارەوە، کە فەرمانێکی عەرەبییە، بە ڕوونترینو پاراوترین زمان، تا گومانو دوو دڵی تێدا دروست نەبێ، وە بە تەنها شوێنکەوتنی پێویست بێو شوێنی پێچەوانەی نەکەون، وە پێچەوانەی هەواو ئارەزووی ئەوانە بێ کە نایزانن، لەبەر ئەمە هەڕەشەی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە، لەگەڵ ئەوەی کە پارێزراوە، تا منەت بکات بەسەریدا بە پاراستنی، تا ئۆممەتەکەی ببێتە پێشەنگ، جا فەرموویەتی: ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾ زانستی ڕوون کە ڕێگریت لێدەکات لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو، ﴿ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ ﴾ پشتیوانێکت دەست ناکەوێت ئەوەی پێت خۆشە بۆت دەستەبەر بکات ﴿ وَلَا وَاقٍ ﴾ بتپارێزێ لە کاری خراپ.

(٣٨-٣٩): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿٣٩﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ واتە: تۆ ئەی موحەممەد ﷺ

یەکەم پێغەمبەر نیت نێردرابی بۆ لای خەڵکی، تا سەرسام بن بە پەیامەکەت، یا دوژمنانت کەموکورتیت لێدەر نەکەن، بەوەی کە ژنو منداڵت هەیە، وەک چۆن براکانت لە پێغەمبەران (علیهم السلام) پێش تۆ هەیانبوو، لە چ شتێک ڕەخنەت لێدەگرن لە کاتێکدا خۆیان باش دەزانن پێغەمبەرانی پێش تۆش بەو شێوەیە بوون، مەگەر ئەوە نەبێ مەبەستو ئارەزوویان پیسو بۆگەن بێ؟ خۆ ئەگەر داوای نیشانەیەکت لێبکەن کە پێشنیاریان کردوە، ئەوە تۆ هیچ شتێکت لەسەر نیە لەو کاروبارەدا ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ خوا ﷻ ڕێگەی پێنادات مەگەر لە کاتی خۆیدا نەبێ، بە قەزاو قەدەرێ کە ویستی لەسەر بووبێ ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ واتە: پێش ناکەوێ بەسەریداو دواناکەوێ لێی، پەلەکردنیان لە نیشانەکان یان سزا، نابێتە هۆی ئەوە سزایان بۆ پێش بخات، لە کاتێکدا ئەو بڕیاری دواخستنی دابێ، لەگەڵ ئەوەدا خوا هەر شتێکی بوێ دەیکات.

﴿يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ لە قەدەرەکان ﴿وَيُثْبِتُ﴾ لەوەی کە ویستی لەسەریەتی، ئەم سڕینەوەو گۆڕانە لە جگە لەوانە خوا بە زانستی پێشیکەوتووەو نووسیویەتی، بێگومان ئەمە گۆڕانو ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت، چونکە ئەوە مەحاڵە زانستی خوا کەموکوڕی تێبکەوێ، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ واتە: لە (لوح المحفوظ) کە هەموو شتەکان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، ئەو بنەڕەتو بنەمایانە، ئەویش لقو پۆپەکانیەتی.

گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕ لە لقو پۆپەکانی ڕوو دەدات، وەک کردەوەی شەوو ڕۆژ کە فریشتەکان دەینوسن، خوایش بۆ چەسپاندنو سڕینەوەی هۆکاری داناوە، ئەو هۆکارانە تێناپەڕن بەسەر (لوح المحفوظ)دا، وەک چۆن چاکە کردنو بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی لە هۆکارەکانی درێژ بوونی تەمەنو بەرفراوانی ڕزقو ڕۆزیە، وە وەک چۆن تاوانو سەرپێچی کردوەتە هۆکارێک بۆ نەمانی بەرەکەتو ڕزقو ڕۆزیو تەمەن، وە وەک چۆن هۆکارەکانی ڕزگاربوون لە ناخۆشیو نارەحەتیەکانی کردوەتە هۆکارێک بۆ سەلامەتیو خۆشبەختی، وە بەرەنگار بوونەوەی ئەوەی کردوەتە هۆکاری لەناوچوون، خوا خۆی کاروبارەکان بەڕێوە دەبات بەپێی قودرەتو ئیرادەی خۆی، ئەوەی بەڕێوەی

دەبـات لـە كاروبـارەكان پێچەوانـە نابێـت لـەوەی كـە زانیویەتـیو نووسـیویەتی لـە (لـوح المحفـوظ)دا.

(٤٠-٤١): ﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ ﴾

خـوا بـە پێغەمبەرەكـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: پەلەیـان لـێ مەكە بە تووشـبوونی ئـەو سـزایەی كـە بەڵێنیـان پێـدراوە، ئـەوان ئەگـەر بـەردەوام بـن لەسـەر لـە سـنوور دەرچـوونو بێبڕواییـان، ئـەوە دەبـێ تووشـیان بـێ ئـەو پەیمانـەی كـە پێیـان درابـوو ﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ ﴾ یـان لـە دنیـادا نیشـانتی دەدەیـن، (هەنـدێ لـە سـزادانی بێبڕوایـان)، چاوەكانـت پێـی ئۆقـرە دەگـرن ﴿ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾ پێـش ئـەوەی ئـەوان تـووش ببـن، ئـەوە كاری تـۆ نیـە ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ﴾ گەیانـدنو ڕوونكردنـەوە بـۆ مرۆڤـە ﴿ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴾ پرسـیار لـە بەدیهێنـراوەكان دەكەیـن لەسـەر ئـەوەی پێـی هەسـتاون، ئـەوەی لەسـەریانەو ئـەوەی لـە بیریـان كـردوە، جـا یـان پاداشـتیان دەدەینـەوە، یـان سـزایان دەدەیـن.

پاشـــان هەڕەشـــە لـــە درۆزنـــەكان دەكاتو دەفەرمـــوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ﴾ وتـراوە: بـە لـە ناوبردنـی بـە درۆخـەرانو لەڕیشـە دەرهێنانـی سـتەمكاران، وە وتـراوە: بـە فەتـح كـردنو ڕزگـار كردنـی وڵاتـی موشـریكانو كەمكردنـەوەی دارایـیو توانـای جەسـتەییان، وە شـتی تریـش لەوبـارەوە وتـراون. ئـەوەی ئاشـكرایە -خـوا زاناتـرە- مەبەسـت لـەوەدا، ئەوەیـە بێگومـان خـوا ﷻ زەوی كافـرەكان دەخاتـە ژێـر دەسـتی مسـوڵمانان بـە فەتـح كـردنو قەڵاچۆكردنیـان، بـە چـواردەوردا ڕایـان دەچڵەكێنـێ، تـا ئاگـادار ببنـەوە پێـش ئـەوەی قەڵاچـۆ بكرێـنو خـوا ڕایـان بچەڵەكێنێـت كـە هیـچ كـەس نەتوانـی ڕەتـی بكاتـەوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ﴾ (واتـە: هـەر حوكمێـك خـوا دەیـدا هیـچ كـەس توانـای نیـە ڕەتـی بكاتـەوە) كـە ئەمـە هـەر یـەك لـە حوكمـە شـەرعیو قـەدەریو جەزاییـەكان دەگرێتـەوە.

ئـەم حوكـمو بڕیارانـەی خـوا ﷻ بڕیـاری لەبـارەوە ئـەدات، هیـچ كـەمو كورتـیو ناڕێكـیو نـا تەواویەكـی تێـدا نیـە، بەڵكـو لەسـەر دادپـەروەری سـتایش كـردن

بونیـاد نـراوە، هیـچ کەسـێک چاودێـری نـاکاو ناتوانـێ ڕەخنـەی لێبگـرێ، بـە پێچەوانـەی بریـاری جگـە لـە خـوا ﷻ، بێگومـان دەگونجـێ بپێکـێ، وە دەشـگونجێ نەیپێکـێ ﴿وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾واتـە: پەلـە مەکـەن لـە سـزاداندا، هـەر شـتێک کـە بڕیـار بـوو ڕووبـدات ئـەوە نزیکـە.

(٤٢-٤٣): ﴿وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ۖ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾(واتـە: بـە ڕاسـتی کافرانـی پێـش وان پیلانـی زۆریـان دانـا دژ بـە) پێغەمبەرانیـان، وە بەرانبـەر بـەو ڕاسـتیەی کـە پێغەمبـەران هێنابوویـان، فڕوفێڵەکانیـان هیـچ سـوودی پـێ نەگەیانـدنو هیچیـان پـێ نەکـرا، بێگومـان ئـەوان بە ئاشـکرا دژایەتی خـوا ﷻ دەکـەن ﴿فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا﴾ واتـە: هیـچ کەسـێک ناتوانـێ نەخشـەو پیلانێـک دابنـێ تەنهـا بە ویسـتی خـواو قەزاو قـەدەری ئـەو نەبـێ، جـا ئەگـەر ئـەوان فـرتو فێـڵو پیـلان دادەنێـن بـۆ ئاینەکـەی، بـە دڵنیاییـەوە فڕوفێـڵو پلانەکانیـان بەسـەر خۆیانـدا دەشـکێتەوەو پەشـێمان دەبنـەوە، بـە ڕاسـتی خـوا ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾واتە: بـە کارو کردەوەو ئیرادەی ئاشـکراو نهێنـی هەمـوو کەسـێک دەزانـێ، نەخشـەو فڕوفێـڵ دەبـێ لـە بەدەسـتهێنانی نەفسـی بـێ، فـرتو فێڵـی ئـەوان لای خـوا ﷻ شـاراوە نیـە، کەواتـە: ڕێگریـان لێدەکـرێ کـە فـرتو فێـڵو پلانێـک دابنێـن زیـان بـە هـەقو شـوێنکەوتوانی بگەیەنـێ، ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾ واتـە: ئایـا بـۆ ئـەوان، یـان بـۆ پێغەمبەرەکـەی؟ بێگومـان زانـراوە سـەرەنجام بـۆ لـە خـوا ترسـانە، نـەک بـۆ بێبـڕواو کردەوەکانیـان

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ وَمَنۡ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡكِتَٰبِ ٤٣

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ﴾ واتە: بە درۆت دادەنێن‌و پەیامەکەشت بە درۆ دەزانن ﴿قُلۡ﴾ پێیان بڵێ، ئەگەر داوای شایەتێک دەکەن لەو بارەیەوە: ﴿كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ﴾ وە شایەتی دانی خوا ﷻ بە وتەو کردەوەو دانپێدانانی، بەڵام وتەی ئەوەیە کە خوا ﷻ وەحی کردوە بۆلای راستگۆترین بەدیهێنراوی، بەوەی کە پێغەمبەرایەتی پێ چەسپاندووە.

بەڵام بە کردەوەی بێگومان خوا پێغەمبەرەکەی سەرخستووە بە شێوەیەک کە لە توانای ئەوو هاوەڵانو شوێنکەوتووانیدا نەبووە، ئەمەش شایەتیدانی ئەوە بە کردەوەو پشتیوانی کردن.

بەڵام دان پێدانانی پێغەمبەر دەربارەی خوا ﷻ هەواڵی داوە کە ئەو پێغەمبەری خوایە، وە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە شوێنکەوتنی، هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، ئەوە خوا ﷻ لێ رازی دەبێ‌و رێزی لێ دەگیرێ، ئەوەی شوێنی نەکەوێ ئەوە ئاگری دۆزەخ‌و توورەیی بۆ ئەوە، ماڵ‌و خوێنی حەڵاڵ دەبێ، خوا ﷻ دان بەوەدا دەنێ، خۆ ئەگەر قسەیەک بە دەم خواوە بکات، ئەوە سزاو تۆڵەی بۆ پێش دێ، ﴿وَمَنۡ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو زانایانی خاوەن تەورات‌و ئینجیل، ئەوان شایەتی دەدەن بۆ پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێک بروا بهێنێ‌و شوێنی راستی بکەوێ، بە روونی ئەو شایەتیەی لەسەریەتی دەری ببرێ، وە هەرکەسێک ئەوە بشارێتەوە ئەوە خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە شایەتی خۆی لە هەواڵی ئەو بەهێزترە، ئەگەر شایەتی نەدا ئەوە بەبەڵگە شایەتی بۆ دەچەسپێ، بێدەنگی ئەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شایەتیەکی شاردوەتەوە.

لەبەر ئەوەی خوا خاوەن کتێبەکانی کردوە بە شایەت، چونکە ئەوان تایبەتن بەو بابەتە، وە هەموو کارێک دەبێ خەڵکی خۆی شایەتی بۆ بدات، هەر کەسێک گومان بیات کە شارەزاترە لەوان، بە پێچەوانەی نەخوێندەوارەکان لە بتپەرستانی عەرەبو غەیری وان، ئەوە شایەتی دانەکەیان هیچ سوودێکی نیە، چونکە ئەزموونو شارەزاییان نیە.

تەفسیری سوورەتی (الرعد) تەواو بوو
سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ
إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾
ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَوَيْلٌ
لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ
أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ
فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ
قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ
ٱللَّهِ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾

## تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)

## مەککیە (٥٢) ئایەتە

## بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ
لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ
رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾
ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى
ٱلْأَرْضِ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ
شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ
﴿٣﴾ ﴾

﴿ الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ خوا هەواڵ دەدات ئەو کتێبەکەی دابەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ بۆ قازانجی بەدیهێنراوەکانە، تا خەڵکی لە تاریکی نەزانیو کوفرو ڕەوشتی ناشرینو هەموو جۆرەکانی تاوانو سەرپێچی دەربێنێ بۆ ڕووناکی زانستو ئیمانو ڕەوشتی جوانو چاک، کە دەفەرموێ: ﴿ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾ واتە: ئەو مەبەستەی لای خوا ﷻ خۆشەویستە بە دەستی ناهێنن مەگەر بە ویستو پشتیوانی خوا نەبێ، بەڵگەی تێدایە بۆ هاندانی بەندەکان بە پشت بەستن بە پەروەردگاریان.

پاشان ئەو نوورو ڕوناکیە تەفسیر دەکات کە ئەم کتێبە ڕێنماییان پێدەکات، فەرموویەتی: ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ ئەو ڕێگایەی کە دەیگەیەنێت بە خواوماڵی ڕێزداری، کە زانست بە هەقو کردەوە پێکردنی لە خۆ دەگرێ، وە باسکردنی ﴿ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ پاش باسکردنی ئەو ڕێگایەی کە پێی دەگات، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەر کەسێ ئەو ڕێگایە بگرێتە بەر ئەوە زاڵو بە دەسەڵاتە بە عیززەتو توانای خوا ﷻ، ئەگەر هیچ پشتیوانێکیشی نەبێ جگە لە خوا، ستایش کراوە لە کاروبارەکانیدا، سەرەنجامی چاکیشی هەیە.

بە هەمان شێوە ڕێگای خوا ﷻ لە گەورەترین بەڵگەکانە لەسەر ئەوەی خوا خاوەن سیفاتی

تەواوو بەرزە، ئەوەی دایناوە بۆ بەندەکان بەهێزو بە توانایە، ستایش کراوە لە قسەو کردەوەو حوکمەکانیدا، بێگومان ئەو پەرستراوە بە عیبادەت کردن کە بریتیە لە پلەکانی ڕێگای ڕاست، وەک چۆن خوا خاوەن ئاسمانەکانو زەویە، بە دروستکردنو ڕزقو ڕۆزیو بەڕێوەبردن، بڕیارو حوکم تایبەتە بە ئەو بەسەر بەندەکانیەوە بە فەرمانو بڕیارە ئاینیەکان، چونکە هەمووان موڵکی ئەون، ناگونجێ هەر ئاواو بە هاوەنتە وازیان لێبهێنێ.

کاتێک کە ڕوونی کردەوە بە بەڵگەی ئاشکرا، هەڕەشەی کردوە لەو کەسەی کە ملکەچی نابن، فەرموویەتی: ﴿ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴾ سزایەک کەس ناتوانێ ئەندازەی بکات، فەرمانەکانیش وەسف ناکرێن، پاشان وەسفی کردوون بەوەی ﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ بە ژیانی دونیا ڕازی بوونو دڵنیابوون، وە بێ ئاگا بوون لە ڕۆژی دوایی ﴿ وَيَصُدُّونَ ﴾ ڕێگری خەڵک دەکەن ﴿ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ کە دایناوە بۆ بەندەکانیو لە کتێبەکەیدا ڕوونیکردوەتەوە، لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی، ئەوانە دژایەتی خوای پەروەردگاریان دەکرد ﴿ وَيَبۡغُونَهَا ﴾ واتە: ڕێگای خوا ﷻ ﴿ عِوَجًا ﴾ واتە: هەوڵیان دەدا ناشرینو نامۆی بکەن، تا خەڵکی لێی ڕابکەن، بەڵام خوا ئەیەوێ هەر ئەم نورو ڕووناکیەی ئاینی خۆی هەبێو سەری بخات، ئەگەر چی بێبڕواکانیش پێیان ناخۆش بێت.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی وەسفەکەیان باسکرا، ﴿ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴾ چونکە ئەوانە گومڕا بوونو خەڵکیان گومڕا کردو دژایەتی خواو پێغەمبەریان کرد، چی گومڕاییەک لەمە دوورترە؟! بەڵام بڕواداران بە پێچەوانەی ئەوانن، بڕوایان بە خوا ﷻو ئایەتەکانی هەیە، فەزڵی دوارۆژ دەدەن بەسەر دنیادا، وە ڕێگای خوا دەگرنە بەر بە چاکترین شێوە، ئەوەی لە توانایاندا بێت لە کاری چاک دریغی ناکەن، بەردەوام بوونی خۆیان ڕوون دەکەنەوە.

(٤): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٤ ﴾:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ ﴾ ئەمەش نەرمو نیانی خوایە بەرانبەر بەندەکانی کە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە ﴿ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾ ئەوەی کە ئەوان پێویستیان پێیەتی، تا بتوانن فێری ئەو بەرنامە ببن کە هێناویەتی، بە پێچەوانەی ئەوەی لەسەر زمانی خۆیان نەبێ، بێگومان ئەوان پێویستیان بەوە دەبێ فێری ئەو زمانە ببن کە قسەی پێدەکات، پاشان لێی تێبگەن، جا ئەگەر پێغەمبەرەکە ﷺ ئەوەی لە ئەستۆیدایە لە فەرمان پێکراوەکانو قەدەغە لێکراوەکان بۆی ڕوونکردنەوە، وە بیانووی بڕینو بەڵگەی لەسەر پێویست کردن ﴿ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ ﴾

لەوەی کە ملکەچی هیدایەت نەبوو، وە کێی بوێ بە ویستی خۆی هیدایەتی دەدات، ئەوەی تایبەتی کردوە بە ڕەحمەتی خۆی ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ کە لە عیززەتو دەسەڵاتی، تاکو تەنهایە لە هیدایەت دانو گومراکردندا، وە هەڵگەڕانەوەی دڵەکان چۆنی بوێ، لە دانایی‌و حیکمەتی خوا هیدایەتو گومرایی لە شوێنی شایستەدا دادەنێت.

ئەم دەقە پیرۆزە دەکرێتە بەڵگە کە زانستی عەرەبی دەیگەیەنێت بە ڕوونکردنەوەی دەقەکانو فەرمایشتی پێغەمبەرەکەی ﷺ کارێکی پێویستنو لە لای خوا خۆشەویستن، چونکە ناسینی خوا بە تەواوەتی نایەتەجێ بە فێربوونی نەبێ، مەگەر کەسەکان لە حاڵەتێکدا بوون پێویستیان پێی نەبوو، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ڕاهێنرابی لەسەر زمانی عەرەبی بە منداڵی لە ناو ئەواندا گەشەی کردبێ، ئەو کاتە ئەوە بەسیانە، دەتوانن لە خواو پێغەمبەرەکەی شتی سەرەتایی وەربگرن، وەک چۆن هاوەڵان وەریان گرت (خوا لێیان ڕازی بێ).

(٥-٨): ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٥﴾ وَإِذۡ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ أَنجَىٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ
سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن
رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ
إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ
﴿٨﴾ ﴾

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە ئەو مووسای ناردوە بە چەند نیشانەیەکی مەزن، بەڵگەن لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە هێناویەتی، فەرمانی پێکردوە وەک چۆن فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کردوە، وەک چۆن سەرجەم پێغەمبەران فەرمانیان بە گەلەکانی خۆیان کردوە، ﴿أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ واتە: تاریکی‌و نەفامی‌و کوفرو لقو پۆپەکانی، بۆ لای ڕووناکی زانستو ئیمانو تەواوکەریەکانیان ﴿وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ﴾ واتە: بە نازو نیعمەتو چاکەکانی خوا ﷻ بەسەریانەوە، وە ئەو ڕۆژە سەختو دژوارانەی کە بەسەر ئۆممەتانی بە درۆخەرەوانو بێبڕواکاندا هێنای، تا سوپاسگوزاری خوا بکەن لە سزای بترسن، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ واتە: بە ڕاستی لەوەبیرهێنانەوەی ڕۆژگارەکانی خوا بەسەر بەندەکاندا، ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ﴾ واتە: زۆر ئارامگرن لە ناڕەحەتی‌و ناخۆشی‌و تەنگە تاویەکاندا، سوپاسگوزارن لە کاتی خۆشی‌و نازو نیعمەتەکاندا.

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ
إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ
وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى
ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ
لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى
لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى
ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ
مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا
بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾
۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ
يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ
مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا
عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾

ڕۆژگارەکانی خـوا ﷻ دەبن بـە بەڵگە بۆ کەماڵی قودرەتو چاکـەی بەرفراوانی، وە تـەواوی دادپەروەریو حیکمـەتو دانایی، ئا لەبـەر ئەمە مووسا ؏ فەرمانبەرداریی خـوای کـرد، جـا نیعمەتەکانـی خـوا بەبیـر هێنانـەوە، وەک فەرموویەتـی: ﴿ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾ واتـە: بـە دڵو زمانتـان، ﴿ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ ﴾ واتـە: پشـتیان تێدەکـردن، ﴿ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: بە خراپترین شـێوە، ئەوەشـی تەفسـیر کـردوە بە وتـەی خـۆی: ﴿ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾ واتـە: ئافرەتەکانتانیـان دەهێشـتەوەو نەیاندەکوشـتن، ﴿ وَفِى ذَٰلِكُم ﴾ ڕزگـار بـوون، ﴿ بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ واتـە: نیعمەتێکـی گـەورە، یان: لـەو هەموو بـەڵاو نەهامەتیەدا کە تووشـتان بـوو لەلایەن فیرعـەونو دارودەسـتەکەیەوە تاقیکردنەوەیەکـی گـەورە بـوو لەلایەن خـواوە بۆتان، تا ببینـێ ئایـا ئـارام دەگـرن یـان نا؟

خـوا ﷻ هانیـان دەدات لەسـەر سوپاسـگوزاری نازونیعمەتەکانـیو پێـی فەرمـوون: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾ واتـە: پێـی ڕاگەیاندوونو پەیمانـی داوە ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ بۆتـان زیـاد دەکەم لـە نـازو نیعمەتەکانـم، ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ﴾ وە لەوانـەش نـازو نیعمەتەکانیـان لەسـەر هەڵدەگـرێ کـە پێـی بەخشـیون، وە (الشـکر) سوپاسـگوزاری: بریتیـە لـە دانپێدانانـی دڵ بـە نیعمەتەکانـی خـوا ﷻو پیاهەڵدانـی خـوای گـەورە، وە بەکارهێنانـی لـە ڕەزامەنـدی خـوادا، وە کوفـری نیعمەتیـش پێچەوانـەی ئەوەیـە، ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ هیـچ زیانێـک بـە خـوا ناگەیەنـن ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾ (واتـە: بێگومـان خـوا بێنیـازو سـتایش کـراوە).

عیبـادەت کـردن هیـچ لـە موڵکـی خـوا زیـاد نـاکات، وە سـەرپێچی کردنیـش هیچـی لـێ کـەم نـاکات، ئـەو تـەواو بێنیـازە، ستایشـکراوە لـە زاتو نـاوو سـیفەتو کردەوەکانیـدا، هیـچ سـیفەتێکی نیـە تەنهـا سـیفەتی ستایشـکراوو تـەواو نەبـێ، هیـچ ناوێکـی نیـە تەنهـا نـاوی جـوان نەبـێ، وە هیـچ کردارێکـی نیـە تەنهـا کـردەوەی چـاکو جـوان نەبـێ.

(٩-١٢): ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ باسـی ترسـاندنی بەندەکانـی دەکات بـەوەی هێناویەتـی بەسـەر ئـەو ئۆممەتـە بـە درۆخەرەوانـەدا، کاتـێ پێغەمبەرانیـان بـۆ هـات بـە درۆیـان زانیـن، جـا ئەویـش سـزای دان بـە سـزایەکی لـە پێـش، کـە خەڵکـی بینیـانو بیسـتیان- جـا فەرموویەتـی: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾ خـوا ﷻ باسـی چیرۆکەکانیانـی کـردوە لـە کتێبەکەیـدا بـە فراوانـی ﴿ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ لـە زۆریـان، وە هەواڵەکانیـان لەناوچـوونو سـڕانەوە، هەمـوو ئەوانـە ﴿ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ واتـە: بـە نیشـانەو موعجیـزەی ڕوونو ئاشـکرا کـە بەڵگەیـە لـە سـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی بۆیـان دابەزیـوو، خـوا ﷻ هیـچ پێغەمبەرێکـی نەنـاردووە، ئیـلا کۆمەڵـە بەڵگـەو نیشـانەیەکی پێـداوە ببێتـە مایـەی ئـەوەی مـرۆڤ بـڕوای پـێ بهێنـێ، جـا کاتـێ پێغەمبەرانیـان بـۆ هـات بـە بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرا گوێڕایەڵـی نەبـوون، بەڵکـو لـووت بەرزیـان نوانـد ﴿ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾ واتـە: بـە گژیانـدا چـوونو بڕوایـان پێنەهێنـان، شـتێک بـە زاریانـدا نەهـات کـە ئامـاژە بـێ بـۆ بڕواهێنـان، وەک فەرموویەتـی: ﴿ يَجْعَلُونَ

أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ ﴾البقرة. (واتـە: بـە جۆرێـک پەنجەکانیـان دەکـەن بـە گوێیانـدا لەبـەر گرمـەی هـەورە تریشـقە، بـۆ خۆپاراسـتن لـە مـردن، خـوا دەوری بێبڕوایانـی داوە).

﴿ وَقَالُوٓاْ ﴾ ڕاشـکاوانە بـە پێغەمبەرەکەیـان وت: ﴿ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴾ واتـە: زۆر لێـی بـە گومانیـن، بێگومـان لـەوەدا سـتەمو درۆیـان دەکـرد.

بۆیـە ﴿ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ ﴾ پەیامبەرانیـان وتیـان: ﴿ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ ﴾ واتـە: بێگومـان ئاشـکراترین شـتو ڕوونترینیانـە، هـەر کەسـێک گومانـی هەبـێ لـە خـوا ﷻ ﴿ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئـەو خوایـەی بوونـی شـتەکان پەیوەسـتە بـە بوونـی ئـەوەوە، هیـچ زانیاریـەک لـە لای خـوا نادیـار نیـە، تەنانـەت شـتە هەسـتیارەکانیش، لەبـەر ئەمـە پێغەمبەرانیـان دواندنیـان، بـە دواندنێـک کـە هیـچ گومانێکـی تێـدا نەبـێ، ﴿ يَدۡعُوكُمۡ ﴾ بـۆ سـوودو قازانجتـان ﴿ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ﴾ تـا پاداشـتتان بداتـەوە لەسـەر بـە دەمـەوە هاتنتـان بـۆ بانگەوازەکـەی، بـە پاداشـتی بـە پەلـە لـە ئێسـتاو داهاتـوودا، بانگـی نەکـردوون، تـا سـوود لـە بەندایەتیتـان وەربگـرێ، بەڵکـو سـوودەکەی هـەر بـۆ خۆتانـە.

پەیامـی پیغەمبەرانیـان ڕەتکـردەوە بـە ڕەتکردنـەوەی کـەم عەقڵانـەو نەفامانـە ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ وتیـان: ﴿ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾ واتـە: چـۆن فەزڵـی خۆتـان دەدەن بەسـەر ئێمـەدا بـە پێغەمبەرایەتـی یـان نێـردراوی ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾ چـۆن واز لـە بۆچـوونو ژیاننامـەی بـاوکو باپیرانمـان بهێنیـن لـە بـەر بۆچوونـی ئێـوە؟ وە چـۆن گوێڕایەڵیتـان بکەیـن لـە کاتێکـدا ئێـوەش وەک ئێمـە مرۆڤـن؟ ﴿ فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾ واتـە: بـە بەڵگەیەکـی ڕوونو ئاشـکرا، مەبەسـتیان پێشـنیار کردنـی بەڵگەیەکـە کـە خۆیـان دەیانـەوێ،

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم
بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ
﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ
عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ
﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ
أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ
ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُوا۟
وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ
مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ
ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ
عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ
كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ
مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾

﴿ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ ﴾ لە وەڵامی پێشنیارو پشت تێکردنیاندا: ﴿ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾ واتە: ڕاستەو گومانی تێدانیە، منیش مرۆڤم وەک ئێوە ﴿ وَلَٰكِنَّ ﴾ بەڵام ئەوە نابێتە بەربەست لە بەردەم ئەو پەیامە ڕاستەقینەی هێناومانە، بێگومان ﴿ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾ جا ئەگەر خوا ﷻ فەزڵو منەتی خۆی کرد بەسەرماندا بە سروش‌و پەیامەکەی، ئەوە لە فەزڵو چاکەی خۆیەتی، بۆ هیچ کەس نیە بەربەست لە ڕێی خوا دابنێت‌و ببێتە ڕێگر لە بەردەم فەزڵ چاکەی خوادا.

تەماشا بکەن ئەوەی ئێمە هێناومانە ئەگەر هەق بوو وەریبگرن، ئەگەر واش نەبوو ڕەتی بکەنەوە، حاڵی ئێمە کە مرۆڤین وەک ئێوە مەکەنە بەڵگە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەوەی هێناومانە، وە قسەکانتان کە دەڵێن: ﴿ فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾ بە ڕاستی ئەوە بە دەستی ئێمە نیە، ئێمە لەو کاروبارەدا هیچمان لە دەست نایێ، ﴿ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ خوا ئەگەر بیەوێ بەڵگەو نیشانەتان بۆ دەهێنێ، وە ئەگەر نەیەوێ نایهێنێ، بێگومان ئەو بە پێی داخوازیی دانایی‌و میهرەبانی خۆی کار دەکات ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ ﴾ نەک جگە لە خوا ﷻ ﴿ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ پشتی پێدەبەستن لە بە دەستهێنانی سوودەکانیانداو دوورخستنەوەی زیانەکانیان، چونکە دەزانن بە تەواوی قودرەت‌و فراوانی چاکەکانی، وە متمانەی پێدەکەن لە ئاسان کردنی کاروبارەکاندا، هێزی پشت بەستنیان بە پێی ئەو ئیمانەیە هەیانە.

بێگومان بەمە زانرا پێویستبوونی پشت بەستن، لە پێویستیەکانی بڕواو ئیمانە، وە لەو عیبادەتە گەورانەیە کە خوا ﷻ خۆشی دەوێ‌و پێی ڕازیە، چونکە هەموو عیبادەتەکان لەسەر ئەوە وەستاون ﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾ واتە:

چـی شـتێک ڕێگریمـان لێـدەکات لە پشتبەسـتن بەخـوای گـەورە، لەکاتێکدا ئێمە لەسـەر هـەقو هیدایەتیـن، بێگومـان هیدایەتـی خوا تـەواوی پشتبەسـتن واجـب دەکات، بەهەمان شـێوە ئـەوەی زانـراوە خـوا ﷻ پشـتیوانی ئـەو کەسـە دەکات کـە هیدایەتـی وەرگرتوە، بانگیـش دەکات بـۆ لای ئـەوە، بەپێچەوانـەی ئەو کەسـەی لەسـەر ڕاسـتیو هیدایـەت نیە، ئـەوە گرەنتـی پێنـەدراوە لە لایەن خـواوە، بێگومان حاڵـی پێچەوانەی حاڵی ئەو کەسـەیە کە پشـت بە خـوا ﷻ دەبەسـتێ.

لەمـەدا وەک ئاماژەیەکـە لـە لایـەن پێغەمبەرانـەوە (علیهـم السـلام) بـۆ قەومەکانیـان، بـە نیشـانەیەکی مـەزن، ئەویـش ئەوەیـە گەلەکانیـان -بـە زۆری- توانـاو دەسـەڵاتیان هەبوو بەسـەریانەوە، پێغەمبەرانیـان تەحەدایـان کـردن بـەوەی ئەوان پشـت بـە خوا دەبەسـتن، لە بەرپەرچدانـەوەی فـرو فێڵەکانیـان، وە سـوورن لەسـەر ئـەوەی تەنهـا خـوا بە بـەس بزانن، بێگومـان خـوا ﷻ لە شـەڕیان پاراسـتنی لەگەڵ سـووربونیان لەسـەر سـڕینەوە کوژانەوەی ئـەو پەیامـەی کـە لـە لایانـە لە هـەقو ڕاسـتی، ئەمـەش وەک وتـەی نـووح ﷺ کە بە گەلەکـەی وت: ﴿ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ٧١ ﴾ یونـس. (واتـە: ئـەی گەلەکەم! ئەگـەر بەلاتانەوە قـورسو گرانە مانەوەم لـە نێوتاندا ئامۆژگـاری کرنـم (بۆتـان) بـە ئایەتەکانی خـوا، ئەوە من پشـتم بە خـوا بەسـتووە ئێوەش کارو بڕیـاری خۆتـان کۆبکەنـەوە لەگـەڵ هاوبەشـەکانتاندا، پاشـان بـا کارو بڕیارەکانتان شـاراوە نەبـێ بـە لاتانـەوە، بەڵکو ئاشـکرا بێت، پاشـان پەلامارم بـدەنو چـاوەڕوان مەبن).

وە قسـەی هوود ﷺ کە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٥٤ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ٥٥ ﴾ هـود. (واتـە: بـە ڕاسـتی مـن خـوا دەکەم بە شـایەت، ئێـوەش شـایەت بـن، کـە بـە ڕاسـتی مـن بەریـمو دوورم، لـەوەی کـە دەیکەنە هاوبـەش بـۆ خـوا جگە لە خوا، جـا هەمووتان پیلانـم لێبگێڕن لە پاشـان مۆڵەتیشـم مەدەنو (لێم مەترسـن).

﴿ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ ﴾ واتـە: بـەردەوام دەبیـن لـە بانگـەوازو ئامۆژگـاری کردنتـانو یادخسـتنەوەتان، گـوێ بـەوە نادەین چـۆن ئازارمـان دەدەن، ئێمە ئـەوە لەناخی خۆمانـدا دەچەسـپێنین کە ئێـوە ئازارمان دەدەن، چاوەڕوانی پاداشـت دەکەیـنو ئامۆژگاری ئێـوەش دەکەیـن، بەڵکو خـوا هیدایەتتان بدات لەگـەڵ زۆر یادخسـتنەوەتان ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ ﴾

تـاکو تەنهـا نـەک بـۆ غەیـری خـوا ﴿ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ بێگومـان پشتبەسـتن پێـی دەرگـای هەمـوو خێرێکە.

بزانـە پێغەمبـەران (علیهم السلام) پشتبەسـتنیان لـە بەرزتریـن پلـەو پایەدا بـووە، ئەویش پشتبەسـتن بـووە بە خـوا لـە بەجێهێنانـی ئاینەکـەی‌و سەرخسـتنی‌و هیدایەتـی بەندەکانی‌و لابردنـی گومرایـی لەسـەریان، ئەمەش باشـترین جۆری پشـت بەسـتنە.

(١٣-١٧): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى
مِلَّتِنَا فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ
ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُواْ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾
مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ
ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ ﴾

کاتێـک باسـی بانگـەوازی پێغەمبەرانـی کرد بـۆ گەلەکەیان‌و بـەردەوام بوونیان لەسـەری، باسـی ئـەو دۆخـەی کرد کە لەگـەڵ گەلەکەیانـدا پێی گەیشـتن، جـا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ ﴾ واتـە: هەڕەشـەیان لێدەکردن: ﴿ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾ ئەمـە ئەوپـەڕی ڕەتکردنەوەیـە، لە پاش ئەمە هیچ خواسـتێکی تریان نیـە، چونکـە ئـەوان تەنها بەوەوە نەوەسـتان کـە دژایەتی ڕێگای ڕاسـت‌و هیدایـەت بکەن، بەڵکـو هەڕەشـەی ئەوەیـان دەکرد لـە وڵات بەدەریان نێن، پاشـان دایانە پاڵ خۆیـان، پێیان وابـوو پێغەمبـەران مافـی ئەوەیـان نیـە تیایـدا بژیـن، ئەمـەش گەورەترین سـتەمە، چونکە بێگومـان خـوا مرۆڤی هێناوەتە سـەر زەوی‌و فەرمانـی پێکردوون بە پەرسـتنی، وە زەوی بۆ ڕاخسـتوون بـۆ ئـەوەی بتوانـن بەندایەتـی خۆیانی تێـدا بکەن، هـەر کەسـێک زەوی بکاتە هۆکارێـک بـۆ عیبادەتـی خـوا، ئـەوەی بـۆ حـەڵاڵ دەبـێ‌و دەردەچێ لـە لاڕێـی، وە هەر کەسـێک بـە کاری بهێنـێ بـۆ کوفـرو جۆرەکانی سـەرپێچی ئەوە بـە تایبەت نیـە بە ئەوو بۆی حـەڵاڵ نیە.

کەواتـە: دەرکـەوت دوژمنانـی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە ڕاسـتیدا هیچ مافێکیان لەسـەر زەویـدا نیـە، کـە سـەرباری ئـەوە هەڕەشـەیان لـە پێغەمبـەران دەکـرد بـە دەرکردنیان لە شـوێنی بـاوکو باپیرانیـان، ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ داب‌و نەریـت، پێغەمبـەران خەڵکـی وڵاتـی خۆیـان بوون، بـە چ مافێـک ڕێگریـان لێ دەکـردن، ئاوا بـە ئاشـکراو بەڕوونی؟! ئایـا ئەمە لـە بێبڕوایـی‌و ناپیـاوی نیە؟!

کاتێـک کـە پـلانو فـڕو فێڵەکانیـان بەرانبـەر بە پێغەمبەران گەشـتە ئـەم حاڵـە، هیچی تر نەمـا جگـە لـەوە نەبێ کـە خوا فەرمـان بسـەپێنێو دۆسـتانی خۆی سـەربخات، ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ بە جۆرەها سـزا ﴿ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: سـەرەنجامێکی بـاش خـوا دایناوە بـۆ پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتوانی، وەک پاداشـتێک ﴿ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى ﴾ لـە دنیادا بە شـێوەیەک خوا ﷻ بپەرسـتێ وەک ئەوەی بزانـێ خـوا دەیبینـێ ﴿ وَخَافَ وَعِيدِ ﴾ واتـە: هەرەشـەم لەو کەسـە کردوە کە سـەرپێچیم دەکات، ئـەو کات پێویسـتە دوور بکەوێتـەوە لەوەی خوا پێی ناخۆشـە، وە دەستپێشـخەری بـکات بۆ ئـەوەی خوا ﷻ پێی خۆشـە ﴿ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ ﴾ واتـە: بێبڕواکان، واتـە: ئەوانەی داوایـان کـرد، وە پەلەیـان کـرد خـوا ﷻ جیایان بکاتـەوە لە نێـوان دۆسـتو دوژمنانیدا، جـا ئـەوەی پەلەیان بـۆی کرد هاتـە دی، ئەگەرنا خوا ﷻ زۆر لەسـەر خۆو بەبەزەییە، سـزا پێـش ناخـات بۆ ئـەو کەسـەی سـەرپێچی دەکات ﴿ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ واتە: لـە دنیـاو دوارۆژدا زەرەرمەنـد بوو ئەو کەسـەی لووت بـەرزی دەکات بەسـەر خواو هەقو بەندەکانیـدا، وە بەرانبـەر بە پێغەمبـەران کەللە ڕەقـەو دژایەتیان دەکات.

﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ ﴾ واتـە: دۆزەخ بـۆ ئـەم کەللەڕەقو سـەرپێچیکارە لە بۆسـەو کەمیندایە دەبـێ تێپەڕێ بەسـەریداو ئەو سـزا سـەختە بچێـژێ ﴿ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾ (لینجاوی دۆزەخیـەکان) لـە ڕەنـگو تـامو بۆنی پیسـیدا لـە ئەوپـەڕی گەرمیدایە ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ ﴾ (واتـە: بـە بێـزەوە قـوم قـوم دەیخواتـەوە) لـە تینوێتیەکـی زۆر توونـدا ﴿ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ ﴾ (بـە ئاسـانیش بـۆی قـووت نـادرێ) ئەگـەر نزیکی بکاتـەوە لـەدەمو چاوی دەیبرژێنـێ، وە ئەگـەر بگاتە نـاو زگی دای دەماڵێتە خـوارەوە ﴿ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو لایەکـەوە سـزای بـە ئێشـی بۆ دێـت بـە هەمـوو جۆرێک لە جـۆرەکان، هـەر جۆرێکیان ناخۆشـیەکەی دەیگەیەنـێ بە مردن، بەڵام خـوا ﷻ وادەخوازێ کـە نەمـرن، وەک فەرموویەتـی: ﴿ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا ﴿٣٧﴾ ﴾ فاطر. (واتـە: بڕیـاری مـردن نـادرێ بەسـەریاندا تـا بمـرن، هەروەها هەنـدێ لە سـزای دۆزەخیـان لێ سـووک ناکرێ، ئـا بـەو جۆرە تۆڵـە ئەسـێنین لە هەمـوو بێبڕوایـەک . ئەوانـە لـە دۆزەخدا هـاوار دەکەن) ﴿ وَمِن وَرَآئِهِۦ ﴾ واتـە: سەرسـەختو کەللـە ڕەق ﴿ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴾ واتـە: بەهێـزو توونـد، بـە هیـچ شـێوەیەک جگە لـە خوا ﷻ کـەس ناتوانێ وەسـفی ئـەو حاڵەتـە بکات.

(١٨): ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ لَّا يَقۡدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ١٨ ﴾:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ ﴾ واتـە: خوا هەواڵـدەدات دەربارەی کـردەوەی بێبڕواکان کە ئەنجامیـان داوە، یان مەبەسـتی پێـی ئـەو کردەوانەیە بۆ خـوا ﷻ ئەنجامیان داوە، بەو شـێوەی لە ڕۆیشـتن‌و بەتاڵ بـوون‌و بـڵاو بوونەوەیانـدا، هەروەک پـەرش‌و بڵاوبوونـی خۆڵەمێـش وایە، کـە بریتیە لە وردتریـن‌و شـاراوەترینی شـتەکان، کە لـە ڕۆژێکـی گەردەلوولاویـدا لە بەرانبـەر بایەکی توونـدا بێـت‌و بیبـات بە ئاسـماندا، بێگومـان هیچی لـێ نامێنێ، ئەویـش ناتوانـێ هیچی لێ بەدەسـت بخاتـەوە، بە هۆی ڕۆشـتن‌و پـەرش‌و بڵاو بوونەوەیـان بە هەمان شـێوە کردەوەی بێبـڕواکان ﴿ لَّا يَقۡدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ ﴾ تەنانـەت بـە قـەد گەردیلەیەکیـش چونکـە لەسـەر بێبڕوایی‌و بە درۆخسـتنەوە بونیاد نـراوە، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴾ لە کاتێکـدا هـەوڵ‌و کۆشـش‌و کردەوەکانیان بەتـاڵ‌و پەرش‌و بـڵاو بووەتەوە، یان مەبەسـت ئەوەیـە کـردەوەی بێبـڕواکان کـە ئەنجامیـان داوە، بۆ فرت‌و فێـڵ‌و دژایەتـی کردنی هەق بـێ، بێگومان ئـەوان هەوڵ دەدەن‌و لـەو پێناوەدا زەحمەت دەکێشـن، بەڵام فـڕو فێڵەکانیان بەسـەر خۆیانـدا دەشـکێتەوە، خواو پێغەمبـەر ﷺو سـەربازەکانی بە هیچ شـێوەیەک زیانیان پێنا گات.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ
يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ
﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟
إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ
مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ
أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا
قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ
فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ
أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ
مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ
بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ
تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ
فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً
كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾

(١٩-٢١): ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ ﴾ خـوا ﷻ بـۆ بەندەکانـی ڕوونـی دەکاتـەوە کـە بێگومـان ئـەو ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی بەدیهێنـراوەکان بیناسـنو بیپەرسـتن، وە فەرمانیـان پـێ بـکاو قەدەغەیـان لێـکات، تـا بەڵگەیـان پـێ بهێننـەوە، ئەوەیشـی تیایاندایـە، لەسـەر تـەواوی سـیفاتەکانی خـوا، وە تـا بزانـن ئـەو کەسـەی ئـەرزو ئاسـمانەکانی دروسـت کـردوە بـەو مەزنـیو بەرفراوانیـەوە، بـە تواناتـرە لـەوەی جارێکـی تـر بیانگێڕێتـەوەو دروسـتیان بکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی پاداشـتیان بداتـەوە بـە چاکـەو خراپەکانیـان، بێگومـان ویسـتو توانـای خـوا لـەوەدا کـورت ناکرێتـەوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ دەگونجـێ مانـای ئەوەبـێ: ئەگـەر بیـەوێ لـە ناوتـان ببـات، خەڵکێکـی تـازەو نـوێ بهێنێتـە شـوێنەکانتان، ئـەو خەڵکـە لـە ئێـوە باشـتر گوێڕایەڵـی خـوا بکـەن، وە دەشـگونجێ مەبەسـت ئەوەبـێ: ئەگـەر بیـەوێ لـە ناوتـان دەبـات، پاشـان دروسـتتان دەکاتـەوە، ئەم گونجانـەش مەبەسـتی پێـی ڕۆژی دواییـە، ﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾ واتـە: ئـەو کارە بـۆ خـوا قـورس نیـە، بەڵکـو زۆر ئاسـانە، (وەک دەفەرمـوێ:) ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴿٢٨﴾ ﴾لقمان. (واتـە: دروسـتکردنو زیندووکردنـەوەی هەمووتـان دوای مـردن وەکـو دروسـتکردنەوەی تاکـە کەسـێکە)، (یـان دەفەرمـوێ:) ﴿ وَهُوَ

﴿ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ ﴿٢٧﴾﴾الـروم. (واتـە: ئـەو خوایـەی لـە سـەرەتاوە گشـت ئـەو خەڵکـەی بەدیهێنـاوە، پاشـان دوای مـردن وەک خـۆی لێدەکاتـەوەو زینـدووی دەکاتـەوە، ئەویـش بـۆ ئـەو لـە جـاری یەکـەم ئاسـانترە).
﴿وَبَرَزُواْ﴾ واتـە: هەمـوو دروسـتکراوەکان ﴿لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾ کاتێـک کـە فـوو دەکـرێ بـە کەرنـادا، لـە گۆڕەکانیـان دەردەچـن بـەرەو لای پەروەردگاریـان، ڕادەوەسـتن لەسـەر زەویەکـی پـانو تەخـتو بەریـن هیـچ خـوارو خێچـیو بـەرزو نزمیەکـی تێدانیـە، لـە بـەردەم دەسـەڵاتی خـوادا دەردەکـەون، خـوا ﷻ هیـچ شـتێکی لـێ ون نابـێ دەربارەیـان، کاتێـک کـە دەهێنرێـن هەموویـان بیانـوو بەڵگـە بـۆ خۆیـان دەهێننـەوە، هـەر یەکـەو بەرگـری لـە نەفسـی خـۆی دەکات ئـەوەی لـە توانایـدا بـێ، بـەڵام ئـەوە چ سـوودێکی هەیـە بۆیـان، ئنجـا ﴿ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ﴾ واتـە: شـوێنکوتووانو پەیـرەوکاران دەڵێـن: ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ ئەوانـەی کـە شـوێنیان کەوتبـوون بـە دەسـەڵاتدارە گومراکـەرەکان دەڵێـن: ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا﴾ واتـە: لـە دنیـادا ئێـوە فەرمانتـان پێدەکردیـن بـە گومرایـیو شـتەکانتان لـە لا جـوان دەکردیـنو ئێمەتـان گومـڕا کـرد ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ﴾ واتـە: ئەگـەر ئەوەنـدەی مسـقاڵە زەڕەیەکیـش بێـت ﴿قَالُواْ﴾ واتـە: دەسـەڵاتدارو سـەرکردەکان وتیـان: ئێوەمـان گومـڕا کـرد هەروەکـو چـۆن خۆمـان گومـڕا بوویـن ﴿لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَـٰكُمۡ﴾ هیـچ کـەس سـوود بـەوی تـر ناگەیەنـێ ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ﴾ لـە سـزا ﴿أَمۡ صَبَرۡنَا﴾ لەسـەری ﴿مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ﴾ واتـە: هیچ دەرەتـانو پەنایەکمـان نیـە بـۆ ڕزگاربـوون لـە سـزای خـوا.

(٢٢-٢٣): ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّۖ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٢﴾ وَأُدۡخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡۖ تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾﴾.

﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ واتـە: شـەیتان هـۆکاری هەمـوو شـەڕو خراپەیەکـە ڕوودەدات لە جیهانـدا، لەگـەڵ دۆزەخیەکانـدا دەدوێ، خـۆی لێیـان بـەری دەکات لەسـەر ﴿لَمَّا قُضِيَ

ٱلۡأَمۡرُ ﴾ (واتــە: کاتــێ کار لــە کار تــرازاو هەمــوو شــتێک برایــەوە) بەهەشــتی بــۆ بەهەشــتو دۆزەخیــش بــۆ دۆزەخ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ ﴾ لەســەر زمانــی پێغەمبەرەکــەی، گوێڕایەڵیتــان نەکــرد، ئەگــەر گوێڕایەڵیتــان بکردایــە، ســەرکەوتنی مەزنتــان بەدەســت دەهێنــا ﴿ وَوَعَدتُّكُمۡ ﴾ (بەڵێنــی) چاکەمــدا ﴿ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡ ﴾ واتــە: بەڵێنەکــەی مــن هەرگیــزاو هەرگیــز نایەتــە جــێ، هەمــووی بەتــاڵو بــێ بنەمــا بــوو، ﴿ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ ﴾ واتــە: لــە بەڵگەیەکــی پشــتگیری زارەکــی ﴿ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ ﴾ واتــە: ئەمــە هەمــوو توانــای مــن بــوو، مــن گومانــم بــۆ دروســتکردنو بانگــم کــردنو بــۆم ڕازاندنــەوە، خێــرا ئێــوەش وەڵامتــان دایــەوە، بــە شــوێنکەوتنی هــەواو ئارەزووەکانتــان، جــا ئەگــەر بــەو وێنەیــە بــێ، ﴿ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ ﴾ ئێــوە هــۆکار بــوون، ئێــوە جەمســەر بــوون بــۆ پێویســتبوونی ســزا، ﴿ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ ﴾ واتــە: (ناتوانــم) فریاتــان بکــەوم لــەو نارەحەتیــەی کــە تیایــدان ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ ﴾ هەمــوو بەشــی خــۆی هەیــە لــە ســزاو تۆڵــەدا ﴿ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ ﴾ واتــە: مــن بەریــم لــەوەی کــە لــە دنیــادا منتــان کــردە شــەریکو هاوەڵــی خــوا ﷻ، مــن هــاوەڵو شــەریکی خــوا نیــم، گوێڕایەڵیــم پێویســت نیــە ﴿ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (واتــە: ئەوانــەی ســتەم لــە) نەفســی خۆیــان دەکــەن بــە گوێڕایەڵــی شــەیتان ﴿ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ بــۆ هەمیشــەیی تیایــدا دەمێننــەوە.

ئەمــەش لــە ســۆزو بەزەیــی خوایــە بەرانبــەر بەندەکانــی، کــە ئاگــاداری کردوونەتــەوە لــە گوێڕایەڵــی شــەیتان، وە هەواڵیــداوە بــەو ڕێگایانــەی کــە مرۆڤــی پــێ هەڵدەخەڵەتێنــی، تەنهــا مەبەســتی ئەوەیــە بیخاتــە نــاو دۆزەخــەوە، لێــرەدا ئــەوەی بۆمــان ڕوون کردوەتــەوە ئــەو ئەگــەر خــۆیو کۆمەڵەکــەی بچنــە دۆزەخــەوە، ئــەو خــۆی بــەری دەکات لێــان، هــەر وەکــو ئــەم خــۆ بــەری کردنــە، وە بێبروایــی دەکات بــە هاوەڵدانانتــان ﴿ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ ١٤ ﴾ فاطر. (واتــە: دڵنیابــە هیــچ کەســێک وەک خــوا کــە ئاگــاداری هەمــوو شــتێکە ناتوانــێ لەوکارانــە ئاگــادارت بــکات).

بزانــە خــوا ﷻ لــەم دەقــەدا فەرموویەتــی شــەیتان هیــچ توانایەکــی نیــە، وە لــە دەقێکــی تــردا فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ١٠٠ ﴾ النحل. (واتــە: بەڕاســتی هــەر تەنهــا بەســەر ئەوانــەدا دەســەڵاتی

هەیە کە ئەو دەکەنە پشتیوانو دۆستی خۆیانو گوێڕایەڵی دەکەن، وە هەروەها بەسەر ئەوانەیشدا کە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن)، جا ئەو دەسەڵاتەی کە نەفی کردوە لێی بریتیە لە دەسەڵاتی بەڵگەهێنانەوە، ئەو هیچ بەڵگەیەکی نیە لەسەر ئەوەی دەیهێنێتەوە، بەڵکو کۆتایی ئەوە ئەوەیە کە گومانیان بۆ دروست دەکاتو شتەکانیان بۆ دەرازێنێتەوە، ئەوانیش بە بوێریو چاوقایمیەوە سەرپێچی دەکەن. بەڵام ئەو دەسەڵاتەی کە جێگیری کردوە، دەسەڵاتی هاندانو فریودانە بۆ سەرپێچی کردنی دۆستەکانی، هانیان ئەدات بۆ گوناهو تاوان چۆن هاندانێک، ئا ئەوانە دەسەڵاتی شەیتانیان داوە بەسەر خۆیاندا بە دۆستایەتیو خۆدانەپاڵی حیزبو کۆمەڵەکەی، لەبەر ئەوە هیچ دەسەڵاتێکی نیە بەسەر بڕوادارانەدا ئەوانەی پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

کاتێک باسی سزای ستەمکارانی کرد، باسی پاداشتی گوێڕایەڵیکارانیشی کرد، جا فەرمووی: ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: ئاینیان بەجێهێنا، بە وتەو کردەوەو بیرو بڕوا ﴿ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ لە جۆرەها لەززەتو خۆشیو حەزو ئارەزووی تێدایە، کە چاو نەیبینیوە، گوێ نەیبیستوە، بە خەتورەش بە دڵی مرۆڤدا نەهاتوە، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾ نەک بە توانای خۆیان بەڵکو بەتواناو دەسەڵاتی خوا ﴿ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ واتە: هەندێکیان سڵاوو دروود لە هەندێکی دیکەیان دەکەن، وە قسەی جوانو چاکیش دەکەن.

(٢٤-٢٦): ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً ﴾ ئەویش شایەتی دانە بە (لا إله إلاّ الله) واتە: هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە جگە لە خوا ﷻ، وە لقو پۆکانی ﴿ كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ ﴾ ئەویش دارخورمایە ﴿ أَصْلُهَا ثَابِتٌ ﴾ لە زەویدا ﴿ وَفَرْعُهَا ﴾ لقو پۆکانیشی بڵاو بوویێتەوە ﴿ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ ئەویش بەردەوام سوودی زۆری هەیە

تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ
كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن
قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ
مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا
وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ
ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ۗ قُلْ
تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ
فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ
ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾

﴿ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا ﴾ واتە: بەرووبومی ﴿ كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾ بە هەمان شێوە درەختی ئیمانیش، ڕیشەو ڕەگی جێگیرە لە دڵی بڕواداردا بە زانستو کردەوە، وە لقو پۆپەکەیشی لە وتەی جوانو بە نرخە، وە کردەوەی چاکو ڕەوشتی بەرزە، بەردەوام لە ئاسمانە، ئەو کردەوەو وتانەی کە درەختی ئیمان بەرهەمی دێنێ، بەرز دەبێتەوە بۆ لای خوا ﷻ، سوودی بۆ بڕوادارو غەیری بڕواداریش هەیە ﴿ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ ئەوەی فەرمانی پێکردوونو قەدەغەی لێکردوون، بێگومان وێنەو نموونەی ورد ماناکان نزیک دەکاتەوە لە وێنە هەست پێکراوەکان، وە ئەو مانایەی خوا دەیەوێ دەردەکەوێ بە ئەوپەڕی ڕوونبوونەوە، ئەمەش لە میهرەبانیو جوانیو چاکی فێرکردنیەتی، ستایشی تەواوو گشتگیر تەنها بۆ خوای بالادەست، ئا ئەمە سیفەتی وشەی یەکتاپەرستیە، وە جێگیربوونیەتی لە دڵی بڕواداردا.

لە پاشان پێچەوانەکەی باس دەکات، ئەویش وشەی کوفرو لقو پۆکانیەتی، جا فەرمووی: ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ﴾ لە خواردندا، ئەویش داری گوژاڵکەو هاوشێوەکانیەتی ﴿ ٱجْتُثَّتْ ﴾ ئەم دارە ﴿ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴾ مانەوەو قەراری نیەو جێگیر نابێ، ڕیشەی نیە ڕایبگرێ، بەروبومێکی باشیشی نیە بەرهەمی بهێنێ، ئەوە دارێکی پیسە، بە هەمان شێوە وشەی کوفرو سەرپێچیش، جێگیربوونی بە سوودی نیە لە ناو دڵدا، هیچ بەرهەم ناهێنێ جگە لە وتەو کردەوەی پیس نەبێ، زیان بە هاوەڵەکەی دەگەیەنێ، کردەوەی چاکی بەرز نابێتەوە بۆ ئاسمان، سوودیشی نابێ بۆ نەفسو

دەروونـی، وە کەسـیش سـوودی لـێ وەرناگـرێ.
(٢٧): ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾:
کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بێگومـان بەنـدە بروادارەکانـی دامـەزراو دەکات، ئەوانـە ئـەو کارانەیـان ئەنجـام داوە کـە لەسـەریانە لـە بڕوابوونـی دڵ بـە تـەواوی، کـە دەبێتـە مایـەی پێویسـتبوونو بەرهـەم هێنانـی کـردەوەی ئەندامانـی جەسـتە، خـوا ﷻ لـە ژیانـی دنیـادا دایاندەمەزرێنـی، لـە کاتـی هاتنـی گومانەکانـدا، بـە هیدایـەتو ڕێنمایـی بـۆ دڵنیابـوون، وە لـە کاتـی خسـتنەڕووی ئارەزووەکانـدا، بـە ئیرادەیەکـی بەهێـز لەسـەر پێشخسـتنی ئـەوەی خـوا ﷻ پێـی خۆشـە، بەسـەر هـەواو ئـارەزوو ویسـتەکانیدا.

وە لـە دواڕۆژدا لـە کاتـی مردنـدا لە دامـەزراوی لەسـەر ئاینی ئیسـلامو سـەرەنجامێکی چـاک، وە لەنـاو گـۆڕدا لـە کاتـی پرسـیاری دوو فریشـتەکە، بـە وەڵامدانـەوەی ڕاسـتەقینە، کاتـێ بـە مـردوو دەوتـرێ: (کـێ پەروەردگارتـە؟ لەسـەر چ ئاینێکـی؟ کـێ پێغەمبەرتـە؟) بـڕوادار دەڵـێ: خـوا پەروەردگارمە، ئیسـلام ئاینمـە، موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمە.

﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ لـە ڕاسـتی لـە دنیـاو دواڕۆژدا، خـوا سـتەمی لـێ نەکـردوون، بەڵکـو خۆیـان سـتەمیان لـە دەروونـی خۆیـان کـردوە.

ئـەم دەقـە بەڵگەیە لەسـەر سـزای نـاو گـۆڕو نـازو نیعمەتـی، وەک چـۆن فەرموودەی زۆر لـە پێغەمبـەری خـواوە هاتـووە دەربـارەی فیتنـەو سـیفەتەکانی، وە خۆشـیو ناخۆشـیو سـزای نـاو گـۆڕ.
(٢٨-٣٠): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦ قُلْ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ ﴾:
خـوا ﷻ حاڵـی بـە درۆدانەرانـی پێغەمبەرەکـەی لـە بتپەرسـتانی قورەیـش ڕوون دەکاتـەوە، وە ئەوەیشـی بەسـەریاندا هـات ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا ﴾ نیعمەتـی خـوا ﷻ بریتـی بـوو لـە ناردنـی موحەممـەد ﷺ بـۆ لایـان، بانگیـان دەکات

بـۆ بەدەسـت هێنانـی خێـرو چاکـەکان، وە ڕزگاربـوون لـە ناخۆشـیەکانی دونیـاو دواڕۆژ، ئـەم نیعمەتەیـان گـۆڕی بـە کوفـر کـردنو دژایەتـی کردنـی بـە نەفسـی خۆیـان ﴿ وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴾ بـوون بـە مایـەی سەرلێشـێوانی هۆزەکەیـان، خسـتیانیانە نـاو ئاگـرەوە، ئـەوان هـۆکاری گومـڕا کـردنو ئـەو بـەلاو نارەحەتیـە بـوون کـە بەسـەر گەلەکەیانـدا هـات، لەوانـەش دەرچـوون بـۆ جەنگـی بەدریـان لـە پێـش چاویـان جـوان کـرد، بـۆ دژایەتـی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ، جـا ئـەوەی هـات بەسـەریاندا ڕوویـدا، زۆرێـک لـە سـەرکردەو دەسـەڵاتدارەکانیان لـەو جەنگـە کـوژران، ﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ﴾ واتـە: گەرمـی دۆزەخ لـە هەمـوو لایەکـەوە دەوریانـدەدا، ﴿ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴾ چ جێگایەکـی خراپـە بـۆ دۆزەخیـان.

﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا ﴾ واتـە: چەندیـن شـەریکو هاوبەشـیان بـۆ خـوا ﷻ دانـا ﴿ لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾ واتـە: تـا خەڵکی گومڕاو چەواشـە بکەنو لـە ڕێگای خوا ﷻ لایـان بـدەن، بـە هـۆی ئـەو هاوەڵدانانەیـان بـۆ خـوا ﷻ، وە بانـگ کردنیـان بـۆ لای عیبادەتکردنیـان ﴿ قُلْ ﴾ واتـە: پێیـان بڵـێ: بـە هەڕەشـە ئامێـزەوە ﴿ تَمَتَّعُواْ ﴾ بەهرەمەنـد بـن بـە بێبڕوایـیو گومراییتـان لـەم ژیانـە کەمـەدا، بێگومـان ئـەوە هیـچ سـوودێکی بـۆ ئێـوە نیـە ﴿ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾ واتـە: چارەنووسـی ئێـوە جێگایـەک دەبـێ لـە نـاو دۆزەخـدا، کـە خراپتریـن سـەرەنجامە.

(٣١): ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ﴾:

﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ بـە بەنـدە بڕوادارەکانـم بڵـێو فەرمانیـان پـێ بکـە بـەوەی لـە بەرژەوەندیـان دایـە، ئـەو هەلـە بقۆزنـەوە پێش ئـەوەی کـە نەتوانـن ئـەو کارە بکـەن: ﴿ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ بـە ئاشـکراو بـە شـاراوە ﴿ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ﴾ واتـە: لـەو نیعمەتانـەی کـە ڕشـتوومانە بەسـەریاندا کـەم بـێ یـان زۆر، ﴿ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾ ئەمـەش بژێـویو نەفەقـەی پێویسـت لـە خۆدەگرێ، وەک زەکاتو نەفەقـەی ئـەو کەسـەی کـە پێویسـتە بژێـوی دابیـن بکـرێ، وە بـە هەمـان شـێوە نەفەقـەی پەسـند کـراو دەگرێتـە خـۆی وەکـو خێـرو صەدەقـەو هاوشـێوەکانی.

﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴾ واتـە: لـە هیـچ شـتێکدا سـوودی نیـە

تێیدا، وە هیچ ڕێگایەک نیە بۆ پڕکردنەوەی ئەوانەی لە دەست چووە، نەبە گۆڕینەوەی کڕینو فرۆشتن، نە بە بەخشینی دۆستو خۆشەویست، هەموو کەس لەو ڕۆژەدا بەکاری خۆیەوە سەرقاڵە، دەی با ئینسان بۆ نەفسی خۆی پێش بخات، وە تەماشا بکات بزانێ چی بۆ سبەینێ ئامادە کردوە، وە با کردەوەکانی لەبەرچاو ون بکاتو لێپرسینەوە لەگەڵ نەفسی خۆیدا بکات پێش لێپرسینەوەی گەورە.

(٣٢-٣٤): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ﴾:

﴿ ٱللَّهُ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات: بە تاکو تەنها ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾ لەسەر بەر فراوانی مەزنی ﴿ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئەویش بارانە کە خوا ﷻ لە هەورەکانەوە دەیبارێنێ ﴿ فَأَخْرَجَ ﴾ بەو ئاوە ﴿ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ لە میوەجاتی جیاوازو جۆراو جۆر ﴿ رِزْقًا لَّكُمْ ﴾ ببێتە ڕزقو ڕۆزی بۆ خۆتانو بۆ ئاژەڵەکانتان ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ ﴾ واتە: کەشتیەکانی بۆ ژێر بار کردوون، ﴿ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ﴾ خوا بە تاکو تەنها دروستکردنی ئەو کەشتیانەی بۆ ئاسان کردوون، وە توانای داون بەسەریاندا تا بیانپارێزن لە شەپۆلی ئاوەکە، وە سەرجەم کەلو پەلەکانتان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر پێ بگوازنەوە ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴾ تا کێڵگەو دارو درەختەکانتانی پێ ئاو بدەنو لێی بخۆنەوە، ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ﴾ سارد نابنەوەو بۆ بەرژەوەندی ئێوە دێنو دەچن، بۆ ژماردنی کاتەکانتانو بەرژەوەندی خۆتانو ئاژەڵەکانتان، وە کشتوکاڵو بەرووبومەکانتان ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ ﴾ تا ئارام بگرن تیایدا ﴿ وَٱلنَّهَارَ ﴾ وە ڕۆژیش تا بە دوای کارو کەسابەتدا بگەڕێن،

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ
لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ٣٤ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ
رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ
ٱلْأَصْنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن
تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٦ رَّبَّنَآ
إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ
تَهْوِيٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ
٣٧ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
مِن شَيْءٖ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي
وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ
ٱلدُّعَآءِ ٣٩ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا
وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ٤٠ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ
يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ٤١ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ
ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٖ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ٤٢

﴿ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ﴾ واتە: هەر شتی داواتان کردبێ‌و پێویستی ژیانتان بێ پێی بەخشیون، لەوانەی کە بە زمانی حاڵ داوای دەکەن، یان بە زمانی قسە پێکردن، لە ئاژەڵەکان‌و کەرەستەو پیشەسازیەکان‌و جگە لە ئەوانەش. ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ ئەگەر چی شوکرانە بژێریشی بکەن ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ﴾ واتە: ئەمەش سروشتی مرۆڤە لەو رووەی کە ئەو ستەمکارەو چاونەترسە لەسەر سەرپێچی کردن، کەمتەرخەمە لە مافەکانی پەروەردگاریدا، بێبروایە بە نیعمەتەکانی خوا ﷻ، سوپاسگوزاری ناکات‌و دانیپێدا نانێت، مەگەر ئەو کەسە نەبێ کە خوا هیدایەتی دابێ‌و سوپاسگوزاری بکات، وە مافەکانی خوا ﷻ بزانێ پێی هەستێت.

لەم دەقانەدا باس کردنی جۆرەها نیعمەتی خوا ﷻ بەسەر بەندەکانەوە شتێکی مەزنە، بە کورتی‌و درێژی، خوا بەندەکان بانگ دەکات کە هەستن بە سوپاس کردن‌و یاد کردنی، وە هانیان دەدات لەسەر داواکردن‌و پارانەوە لێی بە درێژایی شەوو رۆژ، وەک چۆن نیعمەتەکانی دووبارە بووەتەوە بەسەریاندا لە هەموو کاتەکاندا.

(٣٥): ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ٣٥ ﴾

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنٗا ﴾ واتە: یاد بکەرەوە کاتێک ئیبراهیم عليه السلام لەم حاڵەتە جوانەدا، کە فەرمووی: ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ﴾ واتە: حەرەمی مەککە ﴿ ءَامِنٗا ﴾ (ئەمن‌و ئاسایشی تێدا جێگیر

بکـە) خـوا ﷻ پاڕانەوەکـەی وەرگـرت بـە شـەرعو بـە قـەزاو قـەدەر، خـوا لە شـەرعدا حەرامـی کـرد، وە هـۆکاری حـەرام بوونـی ئاسـان کـرد بـە قـەزاو قـەدر ئـەوەی کـە زانـراوە، تەنانـەت هـەر ستەمکارێک ویسـتبێتی زیانـی پێبگەیەنـێ ئەوە خـوا لـە نـاوی بـردووەو تەفـرو توونـای کـردوە، وەک ئـەوەی هێنـای بەسـەر خـاوەن فیلەکانـدا.

کاتێـک پاڕایـەوە بـۆ ئاسایشـی حەرەمـی مەککـە، بـە هەمـان شـێوە پاڕایـەوە بـۆ نەوەکانـی، جـا فەرمـووی: ﴿ وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾ واتـە: خوایـە خـۆمو نەوەکانـم دوور بخەیتـەوە لـە بتپەرسـتی، شـارەزایی لێیـان.

پاشـان باسـی هـۆکاری مەترسـی بتپەرسـتی دەکات لەسـەر خـۆیو نەوەکانـی، وەک خەڵکێکـی زۆر تووشـی فیتنـەی پەرسـتنیان بـوون، جـا فەرموویەتـی:

(٣٦): ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ ﴾ واتـە: بـە هۆیانـەوە گومـڕا بـوون ﴿ فَمَن تَبِعَنِي ﴾ (واتـە: ئـەوەی شـوێنم بکـەوێ) لـەوەی کـە هێناومـە لـە یەکتاپەرسـتیو دڵسـۆزی بـۆ خـوای پەروەردگـاری جیهانیـان ﴿ فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ ﴾ لەبـەر ئـەوە بـە تـەواوی پەسـەندی دەکـەن، هـەر کەسـێک گەلێکـی خـۆش بـوێو شـوێنیان بکـەوێ دەدرێتـە پاڵیـان ﴿ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ ئەمـە لە بەزەییو سـۆزی خۆشەویسـتە ﷺ کاتـێ پاڕایـەوە بـۆ سـەرپێچیکاران بـە پاڕانـەوەو داوای لێبـوردن، خـواش لـە بەندەکانی بـە بەزەیـی تـرە بـۆ بەندەکانـی، سـزا نـادات مەگـەر کەسـێ سـنوور ببەزێنێ.

(٣٧): ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧ ﴾

بـەو شـێوەی هاجـەرەی دایکـی ئیسـماعیلی هێنـا، لەگـەڵ منداڵەکـەی ئیسـماعیل ﷺ ەو شـیرەخۆرە بـوو، لـە شـامەوە بـۆ مەککـە، ئـەو کات مەککـە کەسـی تێـدا نیشـتەجێ نەبـوو، وە هیـچ کـەس بـۆ ئـەو شـوێنە نەدەرۆیشـت، کاتێـک لـەوێ داینـان لـە پەروەدگـاری پاڕایـەوە، بـەم پاڕانـەوە، بـە زەلیلـیو پشـت بەسـتن بـە پەروەردگـاری فەرمـووی: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي ﴾ واتـە: نـەک هەمـوو منداڵەکانـم، چونکـە ئیسـحاق لـە شـام بـوو، بـە هەمـان شـێوە منداڵەکانـی تریشـی، بـەڵام لـە مەککـەدا تەنهـا ئیسـماعیلو وەچەکانـی لـەوێ جێگیـر کـرد، وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ ﴾ واتـە: ئـەرزی مەککـە بـۆ کشـتووکاڵ ناشـێ، ﴿ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ خوایـە

بیانکــە بــە پەکتاپەرســت تــا بــە ڕێــکو پێکــی نوێژەکانیــان بکــەن، چونکــە بەجێهێنانی نوێــژەکان لــە تایبەتمەندتریــنو چاکتریــن پەرستشــە ئاینیەکانــە، هــەر کەســێک بەجێــی بهێنــێ ئــەوە ئاینەکــەی بەجێهێنــاوە، ﴿ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾ واتــە: خۆشــیان بوێــن، وە ئــەو شوێنەشــیان خــۆش بــوێ کــە ئــەوان تیایــدا جێگیــرن.

خــوا ﷻ نــزاو پاڕانەوەکــەی وەرگــرت لــە نــەوەی ئیســماعیل موحەممــەدی هێنایــە بــوون، تــا بانگــەوازی نەوەکانــی کــرد بــۆ ئاینــی ئیســلام، وە بــۆ میللەتــی باپیرەیــان ئیبراهیــم، ئەوانیــش وەڵامیــان دایــەوەو بــوون بــە بەجێهێنــەری نوێــژەکان، وە خــوای گــەورە حەجــی ئــەوماڵــە پیــرۆزەی فــەرز کــرد کــە وەچەکانــی ئیبراهیــم تێیــدا نیشــتەجێ بــوون، وە نهێنیەکــی سەرســووڕهێنەری تێیــدا دانــا بــۆ ئــەوەی دڵــەکان بــۆ لای خــۆی ڕابکێشــێ، بــەردەوام حــەزی پــێ بکــەن، بەڵکــو بەنــدە تــا زیاتــر ســەردانی بــکات، زیاتــر حــەزی پێــدەکات، ئەمــەش نهێنــی دانەپاڵــی ماڵــی حەرامــە بــۆ لای نەفســی پیــرۆزی خــۆی، ﴿ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴾ خــوا دوعاکــەی لێوەرگــرت، لــە هەمــوو لایەکــەوە بەروبوومــی بــۆ دەهــات، تــۆ دەبینــی لــە هەمــوو کاتێکــدا مەککــە میوەجاتــی زۆرو زەبەنــدی هەیــە، لــە هەمــوو لایەکــەوە بــۆی دێــت.

(٣٨): ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُ ﴾ واتــە: تــۆ لــە خۆمــان باشــتر دەماناســی، داوات لێدەکەیــن بــە بەڕێوەبــردنو پەروەردەکردنمــان، ئــەو کارانەمــان بــۆ ئاســان بکــەی کــە دەیزانیــن، ئەوانــەش کــە نایزانیــن، ئەوەشــی زانســتو بەزەیــی تــۆ دەیخــوازێ، ﴿ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ وە لەوانەشــدا ئــەم نزایــە کــە ئیبراهیــم کــردی تەنهــا مەبەســتی خێــرو چاکــەو سوپاســگوزاری خــوای پەروەردگــاری جیهانیــان بــوو.

(٣٩): ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٩ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ ﴾ خــوا ﷻ گەورەتریــن نیعمەتــی پێبەخشــی، بەخشــینی منــداڵ لــە تەمەنــی پیریــدا، لــە حاڵەتــی بــێ ئومێــد بــوون نیعمەتێکــی دیکەیــە، وە بوونیــان بــە پێغەمبەرانــی چاکــەکار گەورەتــرو

چاكتـره، ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ واتـە: زۆر نزیكـە لـەو كەسـەی لێـی دەپاڕێتـەوە، لێـی پاڕامـەوە بـێ ئومیـدی نەكـردم، پاشـان بـۆ خـۆیو منداڵەكانـی پاڕایـەوە، فەرمـووی:

(٤٠-٤١): ﴿رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾﴾:

خـوا هەمـوو ئەوانـەی لـێ وەرگـرت، تەنهـا پاڕانـەوە نەبـێ بـۆ باوكـی، ئەویـش تەنهـا لەبـەر وادەو بەڵێنێـك بـوو بـە باوكـی دابـوو (داوای لێبوردنـی بـۆ بـكات) جـا كاتـێ بـۆی دەركـەوت ئـەو دوژمنـی خوایـە خـۆی لـێ بـەری كـرد.

پاشان خوا ﷻ فەرمووی:

(٤٢-٤٣): ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەمـە هەڕەشـەیەكی تونـدە بـۆ سـتەمكارانو دڵدانەوەشـە بـۆ سـتەم لێكـراوان، كاتـێ مۆڵەتـی پێـداونو ڕزقو ڕۆزی دەڕێـژێ بەسـەریاندا، وە وازی لێهێنـاون لـە وڵاتـدا بـە ئارامـیو ئاسایشـەوە بژیـن، ئەمـە بەڵگـە نیـە لەسـەر چاكـی بـارو دۆخیـان، بێگومـان خـوا ﷻ ڕاسـت بـۆ سـتەمكار شـل دەكاتو مۆڵەتـی پێـدەدات تـا زیاتـر سـەرپێچی بـكات، تاكـو كاتـێ دەیگـرێ، ئیتـر ڕزگـاری نابێـت، وەك دەفەرمـوێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هـود. (واتـە: ئـا بـەو شـێوەیە سـزادانی پەروەردگـارت، كاتـێ خەڵكـی شـارەكان سـزا بـدات، لـە كاتێكـدا سـتەمكار بـوون، بەڕاسـتی تۆڵەسـەندنی ئـەو ئـازاردەرو بەتینـە).

لێـرەدا مەبەسـت لـە سـتەم هەمـوو ئـەو سـتەمانە دەگرێتـەوە كـە لـە نێـوان خـۆیو پەروەردگاریدایـە، وە سـتەمی لـە بەندەكانـی خـوا ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ واتـە: هیـچ زێدەڕۆییەكـی تێدانیـە لـە نارەحەتـی ئـەوەی كـە دەیبینـی لـەو مەترسـیانە، وە ئەوەشـی هەراسـانی دەكات لـە داترازانـەكان

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ
وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ
فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ
دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ
مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا
أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ
الْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ
وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا
تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ
ذُو انتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ
وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ
مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ
وُجُوهَهُمُ النَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ
إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا بِهِ
وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٥٢﴾

﴿ مُهْطِعِينَ ﴾ واتە: بە پەلەن بۆ وەڵامدانەوەی جارچی خوا ﷻ بۆ لێپرسینەوە، نە دەتوانن بەرگری بکەنو نە پەنهانێکیان هەیە خۆیان لەلا پەنا بدەن، ﴿ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴾ واتە: ملیان بەرزکردوەتەوە، وەک بڵێی ملیان رەق بووەو ناتوانن بیسوڕێننەوە ﴿ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ ﴾ واتە: دڵیان لە ناو سنگیان نەماوە، بەرز بووەتەوە بۆ لای قورگیان، بەڵکو پڕە لە هەموو خەمو خەفەتو بێزاریو بێتاقەتیەک.

(٤٤-٤٦): ﴿ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ الْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ ﴾:

خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ ﴾ واتە: وەسفی ئەو بارودۆخەیان بۆ بکە، بە ئاگایان بێنەرەوە لەو کردەوانەی دەبنە مایەی پێویست بوونی سزا، ئەوەی کاتێ بە نارەحەتیو بێتاقەتیەوە دێ ﴿ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا ﴾ بە بێبڕواییو بەدرۆخستنەوەو جۆرەها سەرپێچی، پەشێمانن لەوەی کردوویانە، داوای گەڕانەوە لە جگە لە کاتی خۆیدا: ﴿ رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ ﴾ واتە: بمانگەڕێنەوە بۆ دنیا، بەڕاستی بگەڕێنەوە ﴿ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ ﴾ خوا ﷻ بانگ دەکات بۆ ماڵی سەلامو ئاشتی، ﴿ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ ﴾ هەموو ئەمانە لە پێناو رزگاربوونە لە سزا، ئەگەرنا ئەوان درۆزنن لەم پەیمانەدا ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعام. واتە: (واتە: وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە بۆ دونیا بێگومان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان

قەدەغـە کرابـوو، وە بە ڕاسـتی ئـەوان درۆزنن).

﴿ أَوَلَمْ تَكُونُوٓاْ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾لـە دنیـادا، وە گواسـتنەوە بـۆ ڕۆژی دوایـی، ئەوەتا سـوێندەکەتان ڕوون بوویـەوە کەوتنە درۆوە لەوەی بانگەشـەتان بـۆ دەکـرد ﴿ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ﴾لـە جۆرەهـا تۆڵەکردنـەوە، وە چـۆن خـوا ﷻ سـزای بۆ حـەڵاڵ کردن، کاتـی نیشـانەو ئایەتـە ڕوونەکانیان بە درۆ دەخسـتەوە، وە نموونەی دیارمان بـۆ هێنانەوە کە کەمتریـن گومـانو دوودڵـی هەڵناگرێ، ئەو نیشـانانە سـوودی پێنەگەیاندن، بەڵکو پشـتتان تێکـرد، وە بـەردەوام بوون لەسـەر بەتاڵیو بـێ ماناییتان، تا ئـەوەی ڕوویدا کـە ڕوویدا، وە گەیشـتن بـەم ڕۆژەی کە بیانـووی بەتاڵ دادتـان نادات، ﴿ وَقَدْ مَكَرُواْ ﴾واتـە: ئەوانەی پێغەمبەرانیـان بـە درۆ زانـی، ﴿ مَكْرَهُمْ ﴾واتـە: درێغیان نەکـرد ئەوەی لـە توانایاندا بـوو لـە فـرتو فێـڵ کردیـان ﴿ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ ﴾واتـە: خـوا ﷻ بە زانسـتو توانا دەوری داوە، بێگومـان فرو فێڵەکەیان بەسـەر خۆیاندا دەشـکێتەوە، ﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ﴿٤٣﴾ ﴾فاطر. (واتـە: فـرو فێڵـی خراپ تەنهـا بەرۆکی خاوەنەکـەی دەگرێ).

﴿ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴾بێگومـان بێبڕوایـانو بە درۆخەرەوانی پێغەمبـەرانو ئـەوەی هێناویانـە کێـوە لەبـن نەهاتوەکانـی هەڵدەتەکاند لە شـوێنی خۆیاندا، واتـە: ﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ ﴾نـوح. (واتـە: پیـلانو فـرو فێڵێکـی زۆر گەورەیـان کـرد). کـەس توانای بەسـەر توانای خوادا نیـە، بەڵکو فێڵەکانیان بەسـەر خۆیاندا شـکایەوە. دەچێتـە ئـەم چوارچێوەیـەوە هەمـوو ئەوانـەی دژایەتـی پێغەمبەرانیـان کردبێ، بـۆ ئەوەی ناهەقـی سـەربخەن، یـان ڕاسـتی بەتـاڵ بکەنـەوە، مەبەسـتیش ئەوەیـە فێڵەکانیـان هیـچ سـوودێکی پێنەگەیانـدنو هیـچ زیانێکیشـیان بـە خـوا نەگەیاند، بەڵکـو زیانیان بە نەفسـی خۆیـان گەیاند.

(٤٧-٥٢): ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ﴾بـە ڕزگارکردنیـان، وە

ڕزگار کردنی شـوێنکەوتووانو خۆش بەختیـان، لەناو بردنی دوژمنانیانو سەرشـۆڕ کردنیان لـە دنیـاداو سـزادانیان لـە ڕۆژی دوایـیـدا، ئەمـە دەبـێ ڕووبـدات، چونکـە خـوا پەیمانـی پێـی داوە لەســەر زمانی ڕاسـتگۆترین دروسـتکراوانی خـۆی، ئەوانیـش پێغەمبەرانـن، ئەمە بەرزتریــنو ڕاســترین هەواڵــە، بــە تایبەت ئەوە پــڕاو پڕە لــە حیکمەتی خوایی‌و ســوننەتی پەروەردگـارو عەقڵـی تەواو، خوا ﷻ هیچ شـتێکی لێگیـر نابێ، بێگومـان ئەو ﴿ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾ واتــە: ئەگــەر بیــەوێ تۆڵە لە کەســێ بکاتــەوە، ئەوە دەربــاز نابێ لێی، بەو شـێوە لـە ڕۆژی دواییـدا ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴾ ئاسـمانەکانیش دەگۆڕێن جگـە لـەم ئاسـمانانە، ئەم گۆڕانەشـە گۆڕانی سـیفەتە، نـەک گۆڕانی خود، بە ڕاسـتی زەوی لـە ڕۆژی دواییـدا تەخــت دەبێ‌و دەکشــێ فــراوان دەبێتــەوە وەک پێســتو کــەوڵ، ئنجا ڕێــکو ســافو بــێ گژوو گیــا دەیهێڵێتــەوە، هیچ جـۆرە لاری‌و بــەرزی‌و نزمیەکـی تیادا نابینـی، ئاسـمانەکانیش وەک مســی تــواوەی لێدێت، لە نارەحەتی‌و ترسـناکی ئـەو ڕۆژەدا، پاشـان خوای گــەورە بە دەسـتی ڕاسـتی ئاسـمانەکان دەپێچێتەوە.

﴿ وَبَرَزُوا۟ ﴾ واتــە: هەموو دروســتکراوەکان دەردەکــەون لە گۆڕەکانیانەوە تـا ئەو ڕۆژەی زینــدوو دەکرێنەوە، لە شــوێنێکدا هیچیــان لە خوا ﷻ نادیــار نابن، ﴿ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ تــاکو تەنهــا بە مەزنــی‌و ناوو ســیفەتەکانو کــردەوە گەورەکانــی، وە زاڵە بەســەر هەموو جیهانــدا، هەموویــان لــە فەرمــانو کاروباری ئــەودان، هیچ خــاوەن جوڵەیــەک جوڵەو ورتە نــاکات، وە هیچ ڕاوەســتاوێکیش ناوەســتێت تەنها بە ویســتی ئــەو نەبێ.

﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی وەســفکراون بە تــاوانو گوناهی زۆر، لــەو ڕۆژەدا ﴿ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴾ واتــە: هەمــوو ئــەو تاوانبارانــە دەبەســترێنەوە بــە زنجیــری ئاگریــن، دەبرێــن بۆ ســزادان، بــە زەلیل تریــنو ناشــرینترینو ترســناکترین وێنەو شـێوە، ﴿ سَرَابِيلُهُم ﴾ واتــە: جـلو بەرگیان ﴿ مِّن قَطِرَانٍ ﴾ واتە: ڕەشــی قەترانــی، ئەویش بە هــۆی ئــەوەی ئاگــرو گەرمــی زۆر بەرکەوتوە، وە بۆنیشــی پیســە، ﴿ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ﴾ ڕوومەتیــان ئاگــر دایدەپۆشــێ کــە پیرۆزتریــن شــوێنی جەســتەیانە، ﴿ ٱلنَّارُ ﴾ واتــە: دایدەپۆشــێ لــە هەمــوو لایەکــەوە، جگە لە ڕووخســار لە پێشــترە، ئەمە ستەم نیــە لە لایەن خــواوە، بەڵکو ئەوە پاداشــتی ئەوەیە کە پێشــیان خســتوە (لە کردەوەی خــراپ) کردوویانە!

لەبــەر ئەمــە خوای بــەرز فەرمــووی: ﴿ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ﴾ لە خێرو شــەر، بــە دادپــەروەری کە هیچ زوڵــمو ســتەمێکی تێدانیە لە هیــچ ڕووێکــەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ

ٱلۡحِسَابِ ﴾ هـەر وەک خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ١ ﴾ الأنبیاء، واتـە: لێپرسـینەوەی خەڵکـی نزیـک بوەتـەوە، بـەڵام ئـەوان لە بێئاگایـیو غەفڵەتـدا پشـت تێکـەرو ڕوو وەرگێڕن (لـە ئاینی خوا).

وە دەگونجـی مانـای زۆر بە پەلە لێپرسـینەوە دەکات، لە یەک سـاتدا لێپرسینەوە لە خەڵکی دەکات، وەک چـۆن رزق ڕۆزیـان دەدات بـە جۆرەهـا شـێوە لە یەک سـاتدا، هیچ شـتێک لە شـتێکی تر سـەرقاڵی نـاکات، ئـەوەش بەلایەوە قورسو گـران نیە.

کاتـێ کـە ڕوونی کـردەوە ئەوەی کە ڕوونــە لە قورئاندا، لە وەسـف کردنیـدا فەرموویەتی: ﴿ هَٰذَا بَلَٰغٞ لِّلنَّاسِ ﴾ واتـە: پێـی ڕادەگەیەنـن، وە پێـی دەگـەن بـە بەرزترین پلـەو پایەو فـەزڵو ڕێـز، لەبـەر ئـەوەی هەمـوو بنەمـاو لـقو پۆکانـی لەخـۆ گرتـوە، وە هەمـوو ئەو زانسـتانەی کـە بەنـدە پێویسـتی پێیەتـی، ﴿ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ ﴾ لـەوەی کـە تیایدایـە لـە ترسـاندن لـە کـردەوە خراپـەکان، وە ئەوەشـی کـە خـوا ئامادەی کـردوە بـۆ خاوەنەکەی لـە تۆڵـەو سـزا، ﴿ وَلِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾ بـەو شـێوە ئەوەنـدە بەڵگـەی ڕوونو یەکلاکـەرەوەی هێناوە کـە ببێتە مایـەی دڵنیایـی، ﴿ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ واتە: عەقڵە تـەواوەکان، ئەوەی سـوودی هەیـە بۆیان ئەنجامـی دەدەن، ئەوەشـی زیانی هەیـە بۆیان لێی دووردەکەونـەوە، بـەو شـێوە بون بە خـاوەن ژیریو بەرچـاو ڕوونی، بە قورئـان زانیاریان زیـاد دەکاتو بۆچوونیـان بەهێـز دەبـێو ڕوونـاک دەبێتـەوە، بێگومان ئەو بانـگ ناکات تەنهـا بـۆ بەرزترین ڕەوشـتو کـردەوەو چاکترینیان نەبـێ، وە بەڵگـە ناهێنێتـەوە تەنها بە بەهێزتریـنو ڕوونترینیـان نەبـێ، ئـەم یاسـایە ئەگەر ئینسـانی زیـرەکو لێهاتـوو ڕاهێنانی لەسـەر بـکات، بـەردەوام لەبەرز بوونـەوە دایە لـە هەموو سـیفەتێکی ستایشـکراو.

سوورەتی (إبراهیم) تەواو بوو

ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان.


سورة الحجر
بسم الله الرحمن الرحيم
الر تلك آيات الكتاب وقرآن مبين ۝١ ربما يود
الذين كفروا لو كانوا مسلمين ۝٢ ذرهم يأكلوا
ويتمتعوا ويلههم الأمل فسوف يعلمون ۝٣ وما أهلكنا
من قرية إلا ولها كتاب معلوم ۝٤ ما تسبق من أمة
أجلها وما يستأخرون ۝٥ وقالوا يا أيها الذي نزل عليه
الذكر إنك لمجنون ۝٦ لو ما تأتينا بالملائكة إن كنت
من الصادقين ۝٧ ما ننزل الملائكة إلا بالحق وما كانوا
إذا منظرين ۝٨ إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون ۝٩
ولقد أرسلنا من قبلك في شيع الأولين ۝١٠ وما يأتيهم
من رسول إلا كانوا به يستهزئون ۝١١ كذلك نسلكه
في قلوب المجرمين ۝١٢ لا يؤمنون به وقد خلت سنة الأولين
۝١٣ ولو فتحنا عليهم بابا من السماء فظلوا فيه يعرجون ۝١٤
لقالوا إنما سكرت أبصارنا بل نحن قوم مسحورون ۝١٥

## تەفسیری سووڕەتی (الحجر)

## مەککیە (٩٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ (١) رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ (٢) ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ (٣) وَمَا أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ (٤) مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ (٥) ﴾:

خوا ﷻ کتێبەکەی خۆی بە گەورە دەگرێو وەسفی دەکات، دەفەرموێ:

﴿ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ ﴾ واتە: ئەو دەقانەی کە بەڵگەن لەسەر چاکترین ماناو باشترین داواکاری ﴿ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ ﴾ ڕوونکەرەوەی ڕاستیەکانە بە جوانترین وشەو ڕوونترینیان، وە دەیگەیەنێت بە مەبەست، پێویستە لەسەر بەدیهێنراو ملکەچی بن‌و خۆیان ڕادەستی بڕیارەکانی بکەن، وە بە دڵێکی خۆشەوە وەریبگرن.

بەڵام هەر کەسێک ڕووبەڕووی ئەم نیعمەتە گەورەیە ببێتەوە بە ڕەتکردنەوەی‌و کوفری پێکردبێ، ئەوە بێگومان لە درۆزانانو گومڕایانە ئەوانەی ڕۆژێ دێت بەسەریاندا ئاوات دەخوازن مسوڵمان بوایەن، ئەویش کاتێ کە پەردە ڕادەماڵرێو ئاشکرا دەبێ، وە سەرەتاکانی دواڕۆژو پێشەکیەکانی دەردەکەون، ئەوان لە دواڕۆژدا ئاوات دەخوازن مسوڵمان بوونایە، بێگومان کاتی بڕواهێنان بەسەر چوو، بەڵکو ئەوان لەم دنیایەدا سەرلێشێواو لە خۆ باین.

﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا ﴾ ڕابوێرن بە لەزەتەکانیان ﴿ وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ ﴾ واتە: ئومێدی مانەوە بخوازن لە دنیادا، تا دواڕۆژیان بیر بچێتەوە ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن بەتاڵو بێ مانایە، بێگومان کردەوەکانیان

دەرواو پـووچ دەبێتـەوە بەسـەریاندا، بـا لـە خـۆ بایـی نەبـن بـەوەی خـوا دەرفەتـی پێـداون، بەڕاسـتی ئـەوە ڕێبـازو سـوننەتیەتی لـە سـەرجەم ئوممەتەکانـدا ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ ﴾ کـە شایسـتەی سـزا بـێ، ﴿ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴾ کاتـی دیاریکـراو هەبـووە بـۆ لەنـاو چوونیـان، ﴿ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴾ ئەگەرنـا تـاوان دەبـێ شـوێنەواری دەرکـەوێ، ئەگـەر چـی دواش بکـەوێ.

(٦-٩):﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ٦ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٧ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ٨ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ ﴾ بـە درۆخـەرەوان بـە گاڵتەجاریـەوە بـە موحەممـەد ﷺیـان وت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ ﴾ بـە گومانـی خـۆت! ﴿ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴾ وا گومـان دەبـەی ئێمـە شـوێنی تـۆ دەکەویـن‌و واز لـە شـوێنکەوتنی بـاوکـو باپیرەمـان دەهێنیـن، تەنهـا لەبـەر قسـەی تـۆ؟ ﴿ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ شـایەتیت بـۆ بـدەن لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی کـە هێناوتـە، ﴿ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ ئەگـەر نەتهێنـا ئـەوە تـۆ ڕاسـتگۆ نیـت، ئەمـەش لـە گەورەتریـن سـتەم‌و نەفامیـە.

بـەڵام سـتەم ئـەوە ئاشـکرایە، بەڕاسـتی ئەمـە بوێریـە بەسـەر خـواوەو کەللەڕەقیـە بـە دیاریکردنـی نیشـانەو ئایەتـەکان، کـە بێگومـان ئـەو هەڵینەبـژاردوە، وە مەبەسـت‌و بەڵگـەکان دەسـتەبەر بـوو بەبـێ ئایـەت‌و نیشـانە زۆرەکان، کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی کـە هێناویەتـی، بـەڵام نەفامـی: بێگومـان ئـەوان بەرژەوەنـدی‌و زیانـی خۆیـان لـە یەکتـر جیـا نەدەکـردەوە، دابەزینـی فریشـتە هیـچ خێرێکـی تێـدا نەبـوو بـۆ ئـەوان، بەڵکـو خـوا ﷻ فریشـتە دانابەزێنـی ئیلـلا بـە هـەق نەبـێ، کـە موڵـەت نـادرێ بـەو کەسـەی شـوێنی نەکـەوێ‌و ڕەخنـەی لێبگـرێ، ﴿ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا ﴾ واتـە: کاتـێ فریشـتە دادەبـەزێ، ئەگـەر بـڕوا نەهێنـن ﴿ مُّنظَرِينَ ﴾ واتـە: مۆڵەتیـان پێنـادرێ‌و گـورج لـە نـاو دەبرێـن، ئـەو کات داواکاریەکانیـان بـە دابەزاندنـی فریشـتە دەبێتـە مایـەی پەلـە کردنـی نەفسـیان بـە لەنـاو چـوون‌و خەشـم‌و قینـی خـوا ﷻ، بێگومـان ئیمـان بـە دەسـتی ئـەوان نیـە، بەڵکـو تەنهـا بـە دەسـتی خوایـە، ﴿ وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ ١١١ ﴾ الأنعـام. (واتـە: بێگومـان ئەگـەر ئێمـە فریشـتەمان بـۆ لای

ئـەو (بێبڕوایانـە) بناردایـەو مـردوەکان قسـەیان لەگـەڵ بکردنایـەو هەمـوو شـتێکمان بـۆ کۆبکردنایەتـەوە، ڕوو بـەڕوو بـە پێـش چاویانـەوە، بڕوایـان نەدەهێنـا، مەگـەر خـوا بیویسـتایە، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن و بـێ ئاگـان).

ئـەم دەقانەیـان بەسـە ئەگـەر ئـەوان ڕاسـت بکـەن، ئەمـە قورئانـی مەزنـە لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ ﴾ ئـەو قورئانـەی کـە باسـی هەموو شـتێکی تێدایـە لـە بابەتـەکان و بەڵگـە ڕوونکـراوەکان، وە یادکردنەوەیشـی تێدایـە بـۆ ئـەو کەسـەی دەیـەوێ یـادی بکاتـەوە ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ واتـە: لـە کاتـی دابەزینیـدا، وە دوای دابەزینیشـی، جـا لـە کاتـی دابەزینیـدا پاراسـتوومانە لـەوەی شـەیتانەکان گوێـی بـۆ هـەڵ بخـەن، وە پـاش دابەزاندنـی خـوا ﷻ خسـتوویەتیە دڵـی پێغەمبەرەکەیـەوە ﷺ، پاشـان لـە دڵـی ئوممەتەکـەی، وشـەکانی لـە هەمـوو گـۆڕان و زیـادەو ناتەواویـەک پاراسـتووە، بـە هەمـان شـێوە ماناکانیشـی لـە گـۆڕان پاراسـتوە، هیـچ کەس دەسـتکاری مانایـەک لـە ماناکانـی نـاکات، بێگومـان خـوا ﷻ کەسـێک دەنێـرێ هـەق و ڕاسـتی ڕوون بکاتـەوە، ئەمـەش لـە مەزنتریـن ئایـەت و نیعمەتەکانـی خوایـە بەسـەر بەنـدە بڕواداره‌کانیـەوە، وە لـە پاراسـتنی: خـوا ﷻ خەڵکەکـەی دەپارێـزێ لـە دوژمنەکانیـان، وە دوژمنیـان بەسـەردا زاڵ نـاکات، تـا لـە ناویـان ببـات.

(١٠-١٣): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ ﴾:

خـوا بـە پێغەمبەرەکـەی دەفەرمـوێ: کاتـێ بتپەرسـتان بـە درۆیـان خسـتەوە: بـەردەوام ئەمـە پیشـەی ئوممـەت و سـەدەکانی پێشـوو بـوو ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: دەسـتەو کۆمەڵەکانیـان پێغەمبەرمـان بـۆ نـاردن ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ ﴾ بانگەوازیـان دەکـردن بـە هـەق و ڕێنمایـی ﴿ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ (واتـە: ئیـلا گاڵتەیـان پێدەکـرد)، ﴿ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ ﴾ واتـە: بـە درۆ خسـتنەوە دەخەینـە ﴿ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە وەسـفی کـردوون بـە سـتەمکارو بوختـان کـردن، سـزامانداون، بـە هـۆی ئـەوەی دڵەکانیـان گـۆڕاوە بـە کوفـرو بـە درۆخسـتنەوە، بـە هەمـان شـێوە مامەڵەکردنیشـیان گـۆڕاوە بەرانبـەر بـە پێغەمبـەران بـە ڕابـواردن و گاڵتـە پێکـردن و بـێ بڕوایـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ

﴿وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ واتـە: نەریتـی خـوا ﷻ وایـە دەربارەیـان، هـەر کەسـێک بـڕوا بــە ئایــەتو نیشــانەکانی نەهێنــی لەنــاوی ببــات.

(١٤-١٥): ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ١٤ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ١٥﴾:

ئەگـەر هـەر نیشـانەیەکی مەزنیـان بـۆ بـێ بـڕوای پـێ ناهێنـنو لووت بـەرزی بەسـەردا دەکـەن، ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ پاشـان لەوێـوە سـەربکەون بـە چـاوی خۆیـان ببینـن، ئـەو کات لـە سـتەمکاریو کەللەڕەقـیو نکوڵـی کردنیانـدا بـۆ ئـەم ئایەتـە وتیـان: ﴿إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا﴾ واتـە: چاومـان تێکـدراوەو پـەردەی بەسـەردا دراوە هـەقو ڕاسـتیەکان نابینـێ، تەنانـەت ئەگـەر بیشـی بینیـن وەک ئـەوە وایـە نەمـان بینیبـێ، ﴿بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ﴾ واتـە: ئەمـە حەقیقـەتو ڕاسـتی نیـە، بەڵکـو سـیحرو جادوومـان لێکـراوە. گەلێـک حاڵیـان بگاتـە ئەمـە لـە نکوڵـی کردنـدا، بـە ڕاسـتی هیـچ هیـوای خێریـان لێناکرێـت.

وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ١٦
وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ١٧ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ
فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ١٨ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا
رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ١٩ وَجَعَلْنَا لَكُمْ
فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ٢٠ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا
عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ٢١ وَأَرْسَلْنَا
ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ
لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ٢٢ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ٢٣
وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ
٢٤ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ٢٥ وَلَقَدْ خَلَقْنَا
ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ٢٦ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن
قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا
مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ٢٨ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ
مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٢٩ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ
أَجْمَعُونَ ٣٠ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣١

پاشان باسی ئەو نیشانانە دەکات کە دەبنە بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامی پێغەمبەران، دەفەرمووێ:

(١٦-٢٠): ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾:

خوا ڕوونی دەکاتەوە تەواوی دەسەڵاتو میهرەبانی خۆی بە دروستکراوەکانیو دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا ﴾ واتە: ئەستێرەکان وەکو بورجەکان ئەوانەی کە ڕوونو دیارن، ڕێنمایی پێ دەکرێ لە تاریکایی دەشتو دەریادا، ﴿ وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ بێگومان ئەگەر ئەستێرەکان نەبووایە ئەوە ئاسمان ئەو جوانیە سەرسامەی بە خۆیەوە نەدەبینی، ئەمە وا لە بینەرانی دەکات کە لێی ورد بینەوەو تەماشای ماناکانی بکەن، وە بیکەن بە بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خوا ﷻ، ﴿ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴾ کاتێک گوێ هەڵدەخەن شوڵێکی ئاگرینی تیژ شوێنیان دەکەوێ، ئەگەر بەریان بکەوێ دەیانسووتێنێ، ڕووکەشی ئاسمان بە جوانی خۆی دەمێنێتەوە، وە ناوەڕۆکیشی پارێزراو دەبێ لە هەموو بەڵاو ئافاتێ، ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴾ واتە: لە هەندێ کاتدا، بێگومان هەندێ لە شەیتانەکان گوێ هەڵدەخەن بە نهێنییەوە، ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: ڕوونو ئاشکرایە دەیکوژێ، یان وری دەکات، وەختە شوڵە ئاگرینەکە لێی بدات پێش ئەوەی (هەواڵەکە) بیات بۆ دۆستەکەی، هەواڵی ئاسمان لە زەوی دابڕێ، دەگونجێ بیگەیەنێت بە دۆستەکەی پێش ئەوەی شوڵە ئاگرەکە بەری بکەوێ، ئەویش لە لای خۆی دایبنێتو تێکەڵی سەد درۆی

بـــکات، تەنهـــا ئـــەو وشـــەیە بـــە بەڵگـــە بهێنێتـــەوە کـــە لـــە ئاســـمانەوە بیســـتویەتی.
﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا ﴾ واتـــە: بـــە جـــۆرێ بەرفراوانمـــان کـــردوە مـــرۆڤو گیانـــداران دەتوانـــن بـــە پانتاییـــدا هاتووچـــۆی ژیانیـــان بکـــەن، وە ڕزقو ڕۆزی تیـــادا بـــە دەســـت بهێنـــنو لـــە دەوروبەریـــدا جێگیـــر ببـــن، ﴿ وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ ﴾ واتـــە: کێـــوی گەورە، زەوی دەپارێـــزێ بـــە ویســـتی خـــوا تـــا هەڵنەگەڕێتـــەوەو جێگیـــر بـــێ، ﴿ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ ﴾ واتـــە: ڕووەکـــی بـــە ســـوود بـــۆ بژێـــوی، مرۆڤـــەکان پێـــی ناچـــارن، لـــە نێـــوان خورمـــاو ترێـــدا، وە جۆرەهـــا درەخـــتو ڕووەکـــی تـــر ﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ ﴾ لـــە کێڵگـــەو لـــە ئـــاژەڵ، وە لـــە جۆرەهـــا کارو کەســـابەتو پیشـــە ﴿ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴾ واتـــە: نـــازو نیعمەتـــم ڕشـــتوە بەســـەرتاندا لـــە کۆیلـــەو خزمەتـــکارو ئاژەڵـــەکان، لەبـــەر قازانـــجو بەرژەوەندیتـــان، وە ڕزقو ڕۆزی لەســـەر ئێـــوە نیـــە، بەڵکـــو خـــوا ﷻ ژێـــر بـــاری ئێـــوەی خســـتوە، وە کەفالەتـــی بژێویشـــی کـــردوون.

(٢١): ﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ ﴾:

دەفەرمـــوێ: ﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ ﴾ واتـــە: هەمـــوو بژێویـــەکانو جۆرەهـــا بەشـــەکانی تـــر، جگـــە لـــە خـــوا ﷻ کـــەس خاوەنـــی نیـــە، گەنجینەکانیـــان بـــە دەســـتێتی، بـــە هـــەر کەســـێ بیـــەوێ دەیبەخشـــێ، وە بیـــەوێ دەیگرێتـــەوە، بـــە پێـــی دانایـــیو میهرەبانـــی بەرفراوانـــی ﴿ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ ﴾ ئەنـــدازە کـــراوە لـــە هەمـــوو شـــتێکدا، لـــە بـــارانو جگـــە لـــە ئەویـــش ﴿ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴾ جگـــە لـــەو ئەنـــدازەی خـــوا ﷻ دیـــاری کـــردوە نـــە زیـــاد دەکاتو نـــە کـــەم.

(٢٢): ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾:

خـــوا ﷻ دەفەرمـــوێ: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ ﴾ واتـــە: باکانمـــان ڕامکـــردوە، شـــنەبای ڕەحمـــەت هـــەورەکان دەپیتێنـــێ، وەک چـــۆن نێـــر مـــێ دەپیتێنـــێ، لـــەوەوە بەویســـتی خـــوا ﷻ ئـــاو دێتـــە بەرهـــەم، خـــوا ﷻ بەندەکانـــی پـــێ ئـــاو دەدات، وە ئـــاژەڵو زەویەکانیـــان، ئەویشـــی دەمێنێتـــەوە لەنـــاو زەویـــدا کـــۆی دەکاتـــەوەو پاشـــەکەوتی دەکات بـــۆ پێویســـتی کاتـــی ناچـــاری، ئـــەوەش توانـــای میهرەبانـــی خـــوا ﷻ دەخـــوازێ، ﴿ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴾ واتـــە: ئێـــوە ناتوانـــن هەڵیبگـــرنو کـــۆی بکەنـــەوە، بـــەڵام خـــوا ﷻ بۆتـــان هەڵدەگـــرێ، وە کانیـــاوی زۆرتـــان

بـۆ فەراهـەم دێنــێ وەک میهرەبانــیو چاکەیــەک بۆتــان.

(٢٣-٢٥): ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ تــاکو تەنهایــە هیــچ هاوەڵێکــی نیــە، بەدیهێنــراو دروســت دەکات لــە نەبوونــەوە، پــاش ئــەوەی شــتێک نەبــوون لــە باســکراوەکاندا، وە دەیانمرێنــێ لــە کاتــی ئەجەلەکانیــدا کــە بــۆی دیــاری کــردوون ﴿ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴾ هــەروەک دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾مریـم. (واتــە: بەڕاســتی ئێمــە دەبینــە میراتگــری زەویو ئــەوەی لەســەریەتی، وە هــەر بــۆ لای ئێمــە دەگەڕێنــەوە).

ئــەوە لــە لای خــوا ﷻ گــەورەو گــران نیــە، بێگومــان خــوا دەزانــێ بــە پێشــینی بەدیهێنــراوەکان، وە ئەوانەشــی لــە پــاش ئەوانــەوە دێــن، وە دەزانــی زەوی چەندیــان لــێ کەمدەکاتــەوەو بــەش بەشــیان دەکات، هیــچ هێزێــک ناتوانــی ڕێگــری لــێ بــکات، بەندەکانــی جارێکــی تــر دروســت دەکاتــەوەو کۆیــان دەکاتــەوە بــۆ لێپرســینەوەو پاداشــت، ﴿ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾ شــتەکان لەجێگــای خۆیانــدا دادەنــێ، بــە پێــی پلــەو پایەیــان، پاداشــتی هەمــوو کارکەرێــک دەداتــەوە، ئەگــەر چــاک بــێ بــە چاکــە، ئەگــەر خراپیــش بــێ بــە خراپــە.

(٢٦-٤٤): ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ باسـی نیعمـەتو چاکەکانـی خـۆی دەکات بەسـەر باوکـە ئادەمـەوە ﷺ، وە ئـەوەی ڕوویـدا لـە لایـەن دوژمنەکەیـەوە ئیبلیـس، لـە چـوار چێـوەی ئـەوەدا ئاگـادار کردنەوەمـان لـە شـەڕو فیتنـەی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ ﴾ واتـە: ئـادەم ﷺ ﴿ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾ واتـە: لـە قوڕێکـی وشـک بـوو، پـاش ئـەوەی ترشـاوە تـا بـووە بـە قوڕێکـی وشـکو دەنـگ، وەک دەنگـی سـواڵەت، ﴿ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾ واتـە: قوڕێکـی گـۆڕاو ڕەنـگو بۆنـی گۆڕابـێ، لـە زۆری مانەوەیـدا ﴿ وَٱلۡجَآنَّ ﴾ ئەویـش باوکـی جنۆکەیـە، واتـە: ئیبلیـس ﴿ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ ﴾ لـە پێـش دروسـتکردنی ئـادەم ﴿ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾ لـە ئاگرێکـی زۆر بـە تیـن، کاتـێ خـوا ﷻ ویسـتی ئـادەم دروسـت بـکات، بـە فریشـتەکانی فەرمـوو: ﴿ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ ﴾ جەسـتەیەکی تەواو ﴿ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ فەرمانـی پەروەردگارتـان جێبەجـێ بکـەن ﴿ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴾ جەختکردنـەوە پـاش جەختکردنـەوە، تـا بیێتـە بەڵگـە کـە هیـچ یەکێـک لـە فریشـتەکان دوانەکەوتـوە، ئەویـش بـە مـەزن تەماشـا کردنـی فەرمانـی خوایـەو ڕێزگرتنـە لـە ئـادەم، لـەو ڕووەی ئـەوەی ئـەو دەیزانـیو ئـەوان نایزانـن ﴿ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ ئەمـە یەکـەم دوژمنایەتـی بـوو بەرانبـەر ئـادەم،

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣٢ قَالَ لَمۡ أَكُن
لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٣٣
قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلدِّينِ ٣٥ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ٣٦ قَالَ فَإِنَّكَ
مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٣٧ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٣٨ قَالَ رَبِّ بِمَآ
أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ
٣٩ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٤٠ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ
مُسۡتَقِيمٌ ٤١ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ
ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ٤٢ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٤٣
لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ٤٤ إِنَّ
ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ٤٥ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ٤٦
وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ
٤٧ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ٤٨
۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٤٩ وَأَنَّ عَذَابِي
هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ٥٠ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٥١

خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣٢ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾ لووت بەرزی نواند بەرانبەر بە فەرمانی خوا ﷻ، دژایەتی خۆی ئاشکرا کرد بۆ ئادەمو نەوەکانی، وە سەرسام بوو بە پێکهاتەی خۆیو وتی: من باشترم لە ئادەم ﴿ قَالَ ﴾ خوا ﷻ وەک سزایەک لە سەر کوفرو لووت بەرزیەکەی پێی فەرموو: ﴿ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾ واتە: بە ڕاستی نەفرین لێکراویو دوورخراویتەوە لە هەموو خێرێک ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ ﴾ واتە: زەمو سەرزەنشتو دوورکەوتنەوە لە میهرەبانی خوا ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ئەم دەقەو هاوشێوەکانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بەردەوام دەبێ لەسەر بێبڕوایی، وە دوورکەوتنەوەی لە خێرو چاکە تا ڕۆژیی دوایی، ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ ﴾ واتە: (وتی: پەروەردگارم) مۆڵەتم بدەرێ، ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ٣٦ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٣٧ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴾ (تا ڕۆژی زیندووبوونەوە) وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکەی ئیبلیس لەلایەن خوا ﷻ لەبەر ڕێزو شکۆداری نەبوو، بەڵکو ئەوە تاقیکردنەوەو بەڵایەکە لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی، تا ئەو کەسەی بە ڕاستی خوا دەپەرستێ دەربکەوێ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە نایپەرستێ، بۆیە ئاگاداری کردووینەتەوە بە ئەوپەڕی ئاگادارکردنەوە، وە بۆی شیکردووینەتەوە ئەوەی کە دەیەوێ، ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: دنیایان لەلا شیرین بکەم، وە بانگیان بکەم بۆ گرنگی پێدانی دونیا بەسەر دواڕۆژدا، تا ملکەچ دەبن بۆ هەموو سەرپێچیەک، ﴿ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ واتە: گشتیان لە ڕێگای ڕاست گومرا بکەم ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴾ واتە: جگە لەوانەی کە

هەڵتبــژاردوون بــە هــۆی دڵســۆزیو بــڕواو پشــت بەســتنیانەوەیە.
خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴾ ڕێگایەکــی ڕاســتە دەیگەیەنــێ بــە مــنو ماڵــی ڕێــزدارم، ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾ بــە مەیلــی خــۆت چۆنــت بوێــت بــە جۆرەهــا شــێوە گومڕایــان بکەیــت، بــە هــۆی بەندایەتیانــەوە بــۆ پەروەردگاریــانو ملکــەچ کردنــی فەرمانەکانــی، خــوا ﷻ پشــتیوانی کــردوون پاراســتوونی لــە شــەیتان ﴿ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ ﴾ ڕازی بــووە شــوێنت بکــەویو گوێڕایەڵیــت بــکات، لەبــەری گوێڕایەڵــی خــوای میهرەبــان ﴿ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴾ (الغــاوي): پێچەوانــەی ژیرییــە، ئــەو کەســەیە هــەق دەناســێو وازی لێهێنــاوە، (الضــال): ئــەو کەســەیە کــە وازی لێهێنــاوە، بەبــێ ئــەوەی زانیاریــی دەربــارەی هەبــێ.
﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ ئیبلیــسو شــوێنکەوتووانی ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ ﴾ هەمــوو دەرگایەکــی لــە خــواری ئــەوی ترەوەیــە، ﴿ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ ﴾ واتــە: لــە شــوێنکەوتووانی ئیبلیــس ﴿ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴾ بــە پێــی کردەوەکانیــان، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾الشــعراء. (واتــە: ئنجــا هەمــوو ئەوانــە (پەرســتراوان)و گومــڕاکان ســەربەرەو خــوار فــڕێ دەدرێنــە دۆزەخــەوە، هەروەهــا هەمــوو ســەربازانی شــەیتان).
کاتێــک خــوای بــەرز باســی ئــەوەی کــرد چــی ئامــادە کــردوە بــۆ دوژمنەکانــی، شــوێنکەوتووانی ئیبلیــس لــە تۆڵــەو ســزای تونــد، باســی ئەوەشــی کــردوە چــی بــۆ دۆســتەکانی ئامــادە کــردوە لــە فــەزڵو چاکــەی مــەزنو نــازو نیعمەتــی بــەردەوام، فەرموویەتــی:
(٤٥-٥٠): ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾:
خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ئەوانــەی خۆیــان دەپارێــزن لــە گوێڕایەڵــی شــەیتانو ئەوەشــی کــە بانگەشــەیان بــۆ دەکات، لــە هەمــوو گوناهــو ســەرپێچیەکان، ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ واتــە: بێگومــان پارێــزکاران ﴿ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾ لــە کانیاوەکانــی نــاو بەهەشــت دان، کــە دەوری هەمــوو درەختەکانیــان داوە، وە هەمــوو میوەجاتــی خــۆشو بــە لەزەتــی

تێدایـە لـە هەمـوو کاتێـدا، کاتـێ کـە دەچنـە نێویـەوە پێیـان دەوتـرێ: ﴿ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴾ دوور لـە مـردنو خەوتـنو مانـدوو بـوون، وە لـە دەسـت دانـی هەنـدێ نـازو نیعمـەت، یـان ناتـەواوی، وە لـە نەخۆشـیو بێتاقەتـیو خـەمو خەفـەتو هەمـوو ناخۆشـیەکان، ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ ﴾ دڵیـان پاکـە لـە هەمـوو ڕقو کینـەو ئێرەییـەک، پاکـەو یەکتریـان خۆشـدەوێ، ﴿ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر سـەردانیو میوانـداری یەکتـرو کۆبوونەوەیـان پێکـەوە، وە جوانـی ئـاکارو ڕەوشـتیان لـە نـاو یەکتـردا، هەریەکەیـان بەرانبـەر ئـەوی دیکەیـە پشـت لـە یەکتـر نیـن، لەسـەر ئـەو قەنەفـەو کورسـیانەی کـە ڕازاونەتـەوە بـە گەوهـەرو مـرواری ڕاخـراون ﴿ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ ﴾ مانـدوو نابـن، نـە بـە دیـارو نـە بـە نادیـار، چونکـە خـوا ﷻ جارێکـی تـر بـە دیاندەهێنێتـەوە بـە ژیانێکـی تـەواو، کـە هیـچ ناخۆشـیەک وەرناگـرێ ﴿ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴾ (ناتوانـن لێـی دەربچیـن) لـە هیـچ کاتێکـدا.

کاتـێ باسـی پێویسـت بوونـی تـرسو هاندانـی کـرد لـە کردارەکانـی خـوادا، لـە بەهەشـتو دۆزەخ، پاشـان باسـی وەسـفی خـۆی کـرد دەربـارەی (بەهەشـتو دۆزەخ) فەرمـووی: ﴿ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ ﴾ واتـە: هەواڵیـان بـدەرێ بـە هەواڵێکـی ڕاسـتیو بێگومـان بـە بەڵگـەوە ﴿ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئـەوان ئەگـەر تـەواوی میهرەبانـیو لێبوردەیی خـوا ﷻ بزانـن، هەوڵـدەدەن لـەو هۆکارانـەی دەیانگەیەنێـت بـە میهرەبانـی خـوا ﷻ، وە خۆیـان لـە تـاوان دادەڕنـنو تەوبـە دەکـەن تـا لێخۆشـبوونی بەدەسـت بهێنـن.

لەگـەڵ ئەمـەدا، نابـێ ئومێـد بـوون پەلکێشـیان بـکات بـۆ ئەمـنو ئاسـایشو بـێ ئاگایـی، هەواڵیـان بـدەرێ: ﴿ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴾ واتـە: لـە ڕاسـتیدا سـزا نیـە جگـە لـە سـزای خـوا نەبـێ، کـە ئەنـدازە ناکـرێ، وە کـەس ناتوانـێ ئاگادار بـێ بـە ناوەڕۆکـی، پەنامـان بـە خـوا لـە سـزای، بەڕاسـتی ئـەوان ئەگـەر بزانـن کـە ئـەو ﴿ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ٢٥ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ٢٦ ﴾ الفجـر، (واتـە: کـەس سـزای کـەس نـادات وەک سـزای خـوا، وە کـەس کەلەپچـەی کـەس نـاکات وەک کەلەپچـە کردنـی خـوا بـۆ بێبڕوایـان)، خۆتـان بپارێـزنو خۆتـان بـە دوور بگـرن لـە هەمـوو هۆکارێـک کـە سـزای خـوا پێویسـت بـکات، بەنـدە پێویسـتە بـەردەوام دڵـی لـە نێـوان تـرسو ئومێـد بوونـدا بێـت، ئەگـەر تەماشـای میهرەبانـیو بەخشـندەییو

چاکـەی خـوا ﷻ بـکات، ئومێـدی حـەزی بـۆ دروسـت بـێ، وە ئەگـەر تەماشـای تـاوانو کەمتەرخـی بـکات لـە مافەکانـی پەروەردگاریـدا ترسـی لـێ بنیشـێت.

(٥١-٥٦): ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ ﴾:

خـوا بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ واتـە: دەربـارەی ئـەو چیرۆکـە مەزنـە، بـە ڕاسـتی ئـەو بەسـەرهاتانەی کـە هەواڵـی پێغەمبەرانـی لـە خـۆ گرتـوەو ئـەوەی بەسـەریاندا هاتـووە، بۆیـان بـاس دەکـەی، پێویسـتە ئـەوان پەنـدو وانـەی لێوەربگـرن، بـە تایبـەت ئیبراهیـم ﷺ کـە خـوا ﷻ فەرمانـی پێکردوویـن شـوێنی میللـەتو ڕێگاکـەی ئـەو بکەویـن، وە هەواڵـی ئـەو فریشـتە بەڕێزانـەی کـە خـوا ﷻ کردیانـی بـە میوانـی ئـەو.

إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا
لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن
مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ
فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ
رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ
﴿٥٧﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا آلَ لُوطٍ
إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا امْرَأَتَهُ قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ
الْغَابِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَاءَ آلَ لُوطٍ الْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ
إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا بَلْ جِئْنَاكَ بِمَا كَانُوا فِيهِ
يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَاكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ
بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ
وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَا إِلَيْهِ ذَٰلِكَ الْأَمْرَ أَنَّ
دَابِرَ هَٰؤُلَاءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ
يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾
وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٧٠﴾

﴿ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا ﴾ واتە: سڵاویان لێکرد، ئەویش وەڵامی دانەوە ﴿ قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴾ واتە: دەترسین، چونکە ئەوان چوونە ژوورەوە بۆ لای، وای زانی میوانن، بە پەلە ڕۆیشتەماڵەوە، گوێرەکەیەکی بۆ سەربڕینو ئامادەی کرد بۆیان، پاشان پێشکەشی کردن، کاتێ بینی دەست درێژ ناکەن بۆ خواردنەکە، لێیان ترسا نەوەک دزو پیاو خراپ بن، ﴿ قَالُوا ﴾ پێیان وت: ﴿ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴾ ئەویش ئیسحاق ﷺ بوو، ئەم مژدەیە ئەوەی لەخۆ گرتبوو، بەوەی نێرینەیەو مێینە نیە، زۆر شارەزایە، وە لە ئایەتێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾ الصافات. (واتە: مژدەی ئیسحاقمان پێدا کە پێغەمبەرێکە لە چاکان). بەسەر سوڕمانەوە لەم مژدەیەی پێی وتن: ﴿ أَبَشَّرْتُمُونِي ﴾ (ئایا مژدەم پێ دەدەن) بە منداڵ؟! ﴿ عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ ﴾ جۆرێ لە بێئومێدی تووش بوو بوو، ﴿ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴾ لەسەر چ شتێک مژدە دەدەن لە کاتێکدا هۆکارەکان (ی منداڵ بوون) نەماون؟

﴿ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ ﴾ کە هیچ گومانێکی تێدا نیە، چونکە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا، وە ئێوە بەتایبەت، ئەی ئەهلیماڵی حەرام ڕەحمەتو بەرکەتی خوا ﷻ لەسەرتان، فەزڵو چاکەی خوا بۆ ئێوە سەیر نیە ﴿ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴾ ئەوانەی بوونی خێر بەدور دەزانن، بەڵکو بەردەوام هیوات بە فەزڵو چاکەو منەتی خوا هەبێ، ئیبراهیم وەڵامی دانەوە بە وتەی: ﴿ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ﴾ ئەوانەی هیچ زانیاریەکیان نیە دەربارەی پەروەردگاریانو تەواوی توانای، بەڵام هەر کەسێ خوا ﷻ نیعمەتی ڕێنمایی و

زانستی مەزنی پێبەخشی بێ، ئەوە بێ ئومێد نابێ، چونکە دەزانێ هۆکارو وەسیلەو رێگاکان بۆ رەحمەتی خوا زۆر زۆرن، پاشان کاتێ ئەو مژدەیانە پێیدا، بۆی دەرکەوت ئەوانە نێردراون بۆ کارێکی گرنگ.

(٥٧-٧٧): ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾

﴿ قَالَ ﴾ ئیبراهیم عليه السلام بە فریشتەکانی وت: ﴿ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ واتە: کارتان چیەو بۆ چی نێردراون؟ ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴾ واتە: تاوانو خراپەیان زۆر بووە، بۆیە سزایان دەدەینو تۆڵەیان لێدەکەینەوە، ﴿ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ﴾ واتە: لووطو خاوو خێزانەکەی نەبێ، بێگومان ئەوانە هەموویان رزگار دەکەین ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾ واتە: جگە لە ژنەکەی نەبێ لە ریزی تیاچوونەکاندا بوو، سزادرا، بەڵام لووط و خاوو خێزانەکەی رزگار دەکەین، ئیبراهیم عليه السلام مشتو مڕی لەگەڵ نێردراوەکاندا کرد سەبارەت بە لە ناو بردنیان، داوای کرد کە بە بڕیارەکەدا بچنەوە، پێی وترا: ﴿ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾هود. (واتە: ئەی ئیبراهیم واز لەم کارە بهێنە بێگومان بڕیاری پەروەردگارت بڕاوەتەوەو هاتووە بۆ لەناو بردنیان، وە بە تەئکید سزایەکی نەگێردراوەیان بۆ هەیە).

ئنجا لایان بەجێهێشت ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ ﴾ لووط پێی وتن: ﴿ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾ واتە: نازانم ئێوە کێنو ناتانناسم ﴿ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾ واتە: هاتووین سزایەکمان هێناوە بۆیان کە گومانیان لە

هاتنی هەیە، بە درۆت دەخەنەوە کاتێ پەیمانیان پێدەدەی ﴿ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ کە گاڵتەو گەپ نیە ﴿ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴾ ئەوەی کە پێمان وتی: ﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴾ لەو کاتەی چاوەکان خەویان لێ دەکەوێ، وە کەس نەزانێ بە شەورۆییەکەت ﴿ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ ﴾ واتە: بەڵکو پەلە بکەن ﴿ وَٱمْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴾ وەک ئەوە وایە ڕێنیشاندەرێکیان لەگەڵدا بووبێ ڕێیان نیشان بدات کە ڕوودەکەنە کوێ.

﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ﴾ واتە: هەواڵمان پێدا ﴿ أَنَّ دَابِرَ هَـٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴾ واتە: بە ڕاستی لەبەرە بەیاندا ڕەگو ڕیشەی لەبن دێنین، ﴿ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ ﴾ واتە: ئەو شارەی لووط تیادا نیشتەجێ بوو ﴿ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ واتە: هەندێکیان مژدەیان بە هەندێکی دیکە دەدا، بە هاتنی میوانەکانی لووط، دەمو چاویان لە خۆشیدا دەگەشایەوە، ئەویش بە مەبەستی کاری فاحیشە، هاتن تا گەیشتنە ماڵی لووط، ئنجا قسەیان لەگەڵ لووط دا دەکرد بۆ کاری فاحیشە دەربارەی میوانەکانی، لووط ﷺیش پەنای بە خوا دەگرت لێیانو دەیفەرموو: ﴿ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ۝٦٨ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴾ واتە: سەرەتا لە خوا بترسن، جا ئەگەر لە خوا ناترسن، من ڕوو زەرد مەکەنو ئابڕوم مەبەن لە لای میوانەکانم، بەوەی کاری ناشرینو نابەجێیان بەرانبەر بکەن ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ پێیان وت -لە وەڵامی ئەوەی: کە گوتی: سەرشۆڕم مەکەن-: ﴿ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ واتە: پێمان نەوتی نابێ کەس میوانداریت بکات، ئێمە ئاگادارمان کردیتەوە، ئەوەی ئاگادار کراوەتەوە عوزرو بیانووی نەماوە،

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ
يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا
سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾
فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ
﴿٨١﴾ وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ
ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٤﴾
وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي
وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا
مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلۡ
إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾

﴿ قَالَ ﴾ لووط (عليه السلام) لە نارەحەتیدا پێی وتن: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴾ گوێیان نەدا بە وتەکەی، لەبەر ئەمەیە خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ ئەم مەستیو بێ هۆشیە (السكرة)، بریتیە لە مەستی حەز کردن لە کاری فاحیشە کە لۆمەو سەرکۆنە کردن بە خیاڵیاندا نەدەهات.

بەڵام کاتێ کە نێردراوەکان باسی خۆیانیان بۆ لووط (عليه السلام) کرد، ئەم خەمو پەژارەی لەسەر لاچوو، کە بەدەستیەوە تەنگەتاوو خەمبار بوو، فەرمانی پەروەرگاری بەجێهێنا بەشەو خانەوادەکەی دەرکرد لەو شارەو رزگاریان بوو، بەڵام خەڵکی شارەکە ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴾ واتە: لەگەڵ گزنگی خۆردا، توندترین سزایان بۆ دابەزی، ﴿ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾ واتە: شارەکەمان ژێرو ژوور کرد ﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴾.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی ورد دەبنەوەو ئامۆژگاری وەردەگرن، تێدەگەن لە مەبەستیو چی لێیان دەوێ، لەوەی کە بوێری بکات لە سەرپێچی کردنی خوا، بە تایبەت ئەم فاحیشە مەزنە، بێگومان خوا لە داهاتوویەکی نزیکدا بە توندترین شێوە سزایان دەدات، وەک چۆن بوێریان کرد لەسەر ناشرینترین تاوان.

﴿ وَإِنَّهَا ﴾ واتە: شاری قەومەکەی لووط (عليه السلام) ﴿ لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴾ لە ڕێگای کاروانیدایە ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی لەوەدا بەڵگەی گرنگ هەیە بۆ بڕواداران).

لەم چیرۆکەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە: گرنگی دانی خوا بە خۆشەویستی ئیبراهیم (عليه السلام)،

بێگومـان لـووط ﷺ لـە شـوێنکەوتوانی بـوو، لەوانـەی کـە بڕوایـان پێـی هێنابـوو، وەک ئـەوە وایـە خوێنـدکاری بێـت، کاتـێ خـوا ویسـتی قەومـی لـووط ﷺ لەنـاو بەرێـت، کـە شایسـتەی ئـەوە بـوون، فەرمانـی کـرد بـە نێردراوەکانـی تێپـەڕن بـە لای ئیبراهیمـدا ﷺ تـا مـژدەی بدەنـێ بـە منـداڵ، وە هەواڵـی پێبـدەن بـەوەی کـە بـۆی نێـردراون، تـا ئـەو ﷺ مشـتو مـڕی لەگەڵـدا کـردن دەربـارەی لەنـاو بردنیـان، تـا ڕازیـان کـرد، ئنجـا نەفسـی ئـارام بوویـەوە.

بـە هەمـان شـێوە گەلـی لـووط ﷺ کاتـێ کـە خەڵکـی ولاتەکـەی بـوون، دەکـرێ نـەرمو نیانـی سـۆزی بەرانبەریـان جولاَبـێ، خـوا ﷻ چەنـد هۆکارێکـی دیاریکـرد، بـە هـۆی ئـەوەوە توورەیـیو ڕقو کینـەی بەرانبەریـان هەسـتا، تـا داوای کرد لەنـاو چوونیان دوابخـرێ، وەک پێـی وتـراوە: ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ٨١﴾هـود. (واتـە: بێگومـان کاتـی سـزاکەیان دەمـی بەیانـە، مەگـەر دەمـی بەیانـی نزیـک نیـە؟). لەوانـە: خـوا ﷻ ئەگـەر بیـەوێ شـارێک لەنـاو ببـات، شـەڕو خراپەیـان زیـاد دەکات، کاتـێ کـە کۆتایـی هـات، سـزایەکیان تـووش دەکات کـە شایسـتەیان بێـت.

(٧٨-٧٩): ﴿وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ٧٨ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ٧٩﴾:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ﴾ ئەوانـە گەلەکـەی شـوعەیب بـوون، وەسـفیان دەکاتو دەیانداتـە پـاڵ (الأيكة) واتـە: دارو درەختـی چـڕو پـڕ، لەبـەر ئـەوە باسـی نیعمەتەکانـی بـکات بەسـەریاندا، بێگومـان ئـەوان بـەو نیعمەتانـە هەڵنەسـان، بەڵکـو پێغەمبەرەکەیـان شـوعەیب ﷺ بانگـی کـردن بـۆ یەکتاپەرسـتی، وە واز هێنـان لـە سـتەم کـردن لـە تـەرازو بازیـدا، وە لەسـەر ئـەوە چـارەی کـردن توونددتریـن چـارە کـردن، ئـەوان بـەردەوام بـوون لەسـەر سـتەم کـردن لـە مافـی بەدیهێنـەرو لـە مافـی خەڵکیشـدا، ئـا لەبـەر ئەمـە وەسـفی کـردوون بـە سـتەمکار، ﴿فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ سـزای ڕۆژی هـەور گرتنـی، بـە ڕاسـتی ئـەو سـزایە سـزای ڕۆژێکـی مـەزن بـوو ﴿وَإِنَّهُمَا﴾ ولاتـی گەلـی لـووطو خـاوەن دارو درەختـەکان ﴿لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ واتـە: لەسـەر ڕێگایەکـی ئاشـکراو ڕوونـن، هەمـوو کاتـێ گەشـتیاران تێدەپـەڕن بەلایانـدا، لـە شـوێنەوارەکەیاندا وا دەردەکـەوێ وەک ئـەوەی بەچـاو بینرابـێ، ئەوانـەی خـاوەن دڵو ژیریـن پەنـدو ئامۆژگـاری لێوەردەگـرن.

(٨٠-٨٤): ﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾

﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات دەربـارەی خەڵکـی شـاری حیجـر، ئەوانیـش گەلەکـەی صاڵـح بـوون ﷺ لـە شـاخو کێوەکانـی زەوی حیجـاز نیشـتەجێ بـوون، ئـەوان پێغەمبەرانـی خۆیـان بـە درۆ دەخسـتەوە، بـە تایبـەت پێغەمبـەر صاڵـح، هـەر کەسـێک پێغەمبەرێـک بـە درۆ بخاتـەوە، ئـەوە سـەرجەم پێغەمبەرانـی بـە درۆ خسـتۆتەوە، چونکـە یـەک پەیـامو بانگەوازیـان هەیـە، بـە درۆزانینـی هەندێکیـان بۆ خـودی پێغەمبەرەکـە نەبـووە، بەڵکـو بـۆ ئـەو پەیامـە هەقەیـە کـە سـەرجەم پێغەمبـەران هێناویانـە، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا ﴾ واتـە: چەندیـن ئایـەتو نیشـانەمان بـۆ هێنـان کـە بەڵگـە بـوون لەسـەر ڕاسـتیو دروسـتی پەیامەکـەی صاڵـح، کـە لـە نێویانـدا وشـترەکە بـوو، یەکێـک بـوو لـە نیشـانە هـەرە مەزنەکانـی خـوا ﴿ فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾ بـە لـووت بـەرزیو خۆبـەزل زانینـەوە بەرانبـەر بـە خـوای مـەزن ﴿ وَكَانُوا۟ ﴾ لـە زۆری نـازو نیعمەتەکانـی خـوا ﷻ بەسـەریاندا ﴿ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴾ لـە مەترسـیەکان، بـە ئارامـی دەژیـان لـە وڵاتەکـەی خۆیانـدا، جـا ئەگـەر سوپاسـگوزاری نـازو نیعمەتەکانیـان بکردایـەو پێغەمبەرەکەیـان صاڵـح ﷺ بـە ڕاسـت بزانیایـە، ئـەوە خـوا ﷻ ڕزقو ڕۆزیو بەخشـندەیی خـۆی دەڕژانـد بەسـەریاندا، بـە جۆرەهـا پاداشـت لـە ئێسـتاو لـە داهاتـوودا، بـەڵام ئـەوان بـە درۆیـان خسـتەوەو وشـترەکەیان پـەل پـەل کـردو کوشـتیان، وە لـە فەرمانـی پەروەردگاریـان یاخـی بـوونو دەرچـوون، وتیـان: ﴿ فَعَقَرُوا۟ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾الأعـراف، واتـە: ئـەی صاڵـح! ئەگـەر ڕاسـتە تـۆ پێغەمبەریـت ئـەوە بـەڵاو سـزامان بـۆ بنێرە کـە هەڕەشـەت دەکـرد لێمـان ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴾ (واتـە: ئەوسـا کتووپـڕ لەبـەرە بەیانـدا بوومەلـەرزە لـە نـاوی بـردن)، دڵەکانیـان لـەت لـەت بـوو لـە نێـو سـینگیانداو هەموویـان لـە ماڵەکانیـان بـە دەمـا کەوتـنو مـردن، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو هەمـوو سەرشـۆڕیو ڕیسـواییەی بـەردەوام دەبـێ تـا ڕۆژی دوایـی ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ چونکـە فەرمانـی خـوا ﷻ ئەگـەر هـات هیـچ شـتێ ناتوانـێ ڕەتـی بکاتـەوە، نـە زۆری سـەرباز، نـە توانـاو دەسـەڵات، نـە مـاڵو سـامان.

(٨٥-٨٦): ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ ﴾:

﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴾ واتــە: بــە گاڵتــەو گــەپ دروســتمان نەکــردوە، وەک دوژمنانــی خــوا وا گومــان دەبــەن، بەڵکــو بەدیمانهێنــاون ﴿ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ (واتــە: بــە هــەقو ڕاســتی) کــە ئــەوەی تیایاندایــە دەبــن بــە بەڵگــە لەســەر تــەواوی بەدیهێنەرەکــەی، وە توانــاو بەرفراوانــی حیکمــەتو زانســتی، بێگومــان خــوا ئــەو خوایەیە کــە نابــێ بەندایەتــی کــەس بکرێــت جگە لــەو، تــاکو تەنهایــەو هاوەڵــی نیە، ﴿ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ﴾ هیــچ گومانێکــی تێــدا نیــە ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ ﴿٥٧﴾ ﴾غافــر. (واتــە: بــە ڕاســتی دروســتکردنی ئاســمانەکانو زەوی، لــە دروســتکردنی خەڵــکو دوای مــردن گەورەتــرە)، ﴿ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴾ ئەویــش چاوپۆشــیەکە ئــازارو ســزای تێــدا نەبــێ، بەڵکــو لــە بەرانبــەر خراپــەی خراپــەکاردا بــە جوانــی مامەڵــەی لەگەڵــدا بکــە، لــە هەڵــەو پەڵــەی ببــورە، تــا لــە لای خــوا چاکتریــن پاداشــت وەربگــری، بێگومــان هــەر شــتێ بێــت ڕووبــدات ئــەوە نزیکــە.

لــە ڕاســتیدا مانایەکــی دیکــەم بــۆ دەرکــەوت چاکتــر لــەوەی کــە لێــرەدا باســم کــرد، ئەویــش: فەرمــان پێکــراو بریتیــە لــە چاوپۆشــی کــردن بــە جوانتریــن شــێوە، واتــە: چاوپۆشــیەک پارێــزراو بــێ لــە کینــەو غــەرەزو ئازاردانــی گوفتــاریو کــرداری، جگــە لــەو چاوپۆشــیەی کــە لــە جێگــای خۆیــدا نیــە، بــا چاوپۆشــی نــەکات کــە جێگاکــە وابخــوازێ تۆڵــەی لێبکرێتــەوە، وەک ســزادانی دەســتدرێژی کاران، ئەوانــەی جگــە لــە ســزا هیچــی تــر شایســتەیان نیــە، ئەمــەش ماناکەیەتــی.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ﴾ بــۆ هەمــوو دروســتکراوێ ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ بــە هەمــوو شــتێ، هیــچ کەســێکی لــێ گیــر نابــێ لــە هەمــوو ئەوانــەی بــە زانســتی دەوری داون، لــە ســەرجەم بوونەوەرانــدا.

(٨٧-٩٣): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾:

خــوا ﷻ منــەت دەکات بەســەر پێغەمبەرەکەیــداو دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ

﴿ٱلۡمَثَانِي﴾ ئەوانیش بریتین لە حەوت سوورەتە گەورەکە «لەسەر بۆچوونی ڕاست» (البقرة، آل عمران، النساء، المائدة، الأنعام، الأعراف، الأنفال، والتوبة) پێکەوە. یان فاتیحەی کتێبە، چونکە حەوت ئایەتە، ئەو کات ﴿وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ﴾ دەکرێتە سەری، لە بەشی (عطف) گشتی لەسەر تایبەتی، لەبەر زۆری (بابەتی) یەکتاپەرستی تیایدا، وە زانستی پەنهانو حوکمو بڕیارە پیرۆزەکان، وە لەبەر دووبارە کردنەوەیان.

لەسەر وتەی ئەوانەی کە بۆچوونیان وایە فاتیحە بریتیە لە (سبع المثاني)، مانای ئەوەیە ئەوە حەوت ئایەتە لە هەموو ڕکاتێکدا (لە نوێژدا) دووبارە دەبنەوە، ئەگەر خوا قورئانی پیرۆزی پێ بەخشیبێ لەگەڵ حەوت ئایەتە دووبارە بووەکەدا، ئەوە باشترین شتی پێ بەخشیوە کە شایستەی ئەوەیە کێبڕکێکاران کێبڕکێی لەسەر بکەن، وە مەزنترینیانە کە بڕواداران پێی دڵخۆش بن، ﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨﴾ یونس. (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هەر بە هۆی چاکەو میهرەبانی خواوەیە، جا کەواتە با بەوە دڵخۆش بن ئەوە چاکترە بۆیان لەوەی کۆی دەکەنەوە لە شتی ئەم دنیایە) لەبەر ئەوەیە بە دوایدا دەفەرموێ: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ﴾ واتە: با سەرت سووڕ نەمێنێ بە شێوەیەک بیرو هۆشت سەرقاڵ بکات بە حەزوو ئارەزووەکانی دونیا، کە زێدەڕۆیان چێژی لێوەردەگرنو نەفامان پێی سەرسامن، ئەوەی خوا پێی بەخشیوی لە فاتیحەو قورئانی مەزن، بێ نیازت دەکات لە هەموو شتێکی دیکە ﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەوانە ئومێدی هیچ سوودو قازانجێکیان لێناکرێ، بڕواداران بۆ تۆ باشترین جێگرەوەن ﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: باڵی بەزەیی بۆ بڕواداران ڕابخە، خوورەوشتت لەگەڵیاندا جوان بکە بە خۆشویستنو ڕێزگرتنو نەرمو نیانی ﴿وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ﴾ واتە: هەستە بەوەی کە لەسەر شانتە لە ئاگادارکردنەوەو ترساندنو گەیاندنی پەیامەکەت بۆ دوورو نزیک، وە دۆستو دوژمن، بێگومان ئەگەر تۆ بەو کارە هەستای ئەوە هیچ کارت بە کاری ئەوانەوە نیە، وە ئەوانیش هیچ کارێکیان بە تۆوە نیە.

وە وتەی خوا ﷻ: ﴿كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ﴾ واتە: وەک چۆن سزامان دابەزاندوە بەسەر دابەش کاراندا ئەوانەی پەیامەکەی تۆیان بەتاڵ دەکردەوەو خەڵکیان لە ڕێگای خوادا دوور دەخستەوە،

ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ
عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ
يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ
أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن
مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی قورئانیان بەش بەش و لەت و پەت کرد بەپێی هەواو ئارەزووی خۆیان لێکیان دەدایەوە، هەندێکیان دەیانوت: سیحرو جادوە، وە هەندێکیان دەیانوت: فاڵگرە، هەندێکی تر دەیانوت: درۆو هەڵبەستراوە، جگە لە وتەی کافرە بە درۆدانەرەکان، ئەوانەی فاڵیان دەگرتەوە تا خەڵکی لە ڕێنمایی خوا دووربخەنەوە ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ واتە: هەموو ئەوانەی کە لەکەدارو عەیبداریان کردوە، وە جێگۆڕکێ و شوێن گۆڕکێیان پێکردوە، ﴿ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ لەمەدا مەزنترین ترساندن و سەرکۆنەکردن بە دیدەکرێ لەسەر ئەوەی ئەوان لەسەری ڕۆشتوون.

(٩٤-٩٥): ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾:

﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ ﴾ پاشان خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردوە کە گوێ بە بێباوەڕان و جگە لە ئەوانیش نەدات، تەنها فەرمانی پەروەردگاری ڕابگەیەنێ، بۆ هەموو کەسێکی ئاشکرا بکات، با هیچ ڕێگریەک ڕێی لێنەگرێ، وە با وتەی دوژمنان کاری تێنەکات ﴿ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ واتە: گوێ بە هاوەڵدانەران مەدە، واز لە قسە ناشرینەکان و سەرکۆنەکردنەکانیان بهێنە، ڕووبکە کاروباری خۆت ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾ (بەڕاستی ئێمە گاڵتەکانمان) لە کۆڵ تۆو ئەو پەیامەی هێناوتە دورخستەوە، ئەمەش پەیمانێکە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کە گاڵتەجاران زیانی پێنەگەیەنن، وە خوا بیپارێزێ لێیان بەوەی ویستی لەسەرە لە جۆرەها سزاو تۆڵە.

(٩٦): ﴿ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾:

﴿ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ ﴾ بێگومان هەرکەسێ بە ئاشکرا گاڵتەی بە پێغەمبەرو پەیامەکەی کردبێ، خوا لەناوی بردوەو بە ناشرینترین شێوە کوشتویەتی، پاشان وەسفی

کـردون، ئـەوان وەک چـۆن ئـازارت دەدەن ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بەهەمـان شـێوە ئـەوان ئـازاری خـوا دەدەن، وە لەگەڵیـدا ﴿ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾ لـە کاتێکـدا ئـەو پەروەردگارو بەدیهێنەریانـەو کاروبارەکانیـان بەرێـوە دەبـات ﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾ لـە ڕۆژی دواییـدا بۆیـان دەردەکـەوێ کردەوەکانیـان چەنـدە خراپە.

(٩٧): ﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ٩٧ ﴾:

﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمـە دەزانین کە بە ڕاسـتی دڵـت تەنـگ دەبێـت، بـەوەی ئەوانـە دەیڵێـن) بەرانبـەرت لـە بـە درۆخسـتنەوەو گاڵتـە پێکـردن، ئێمـە لـە تواناماندایە سـزایان بدەین‌و لە بنـج‌و بنەوانـە دەریان بێنین‌و سـزایان بۆ پێـش بخەیـن بەوەی کە شایسـتەیانە، بـەڵام خوا مۆڵەتیـان دەدات، بـێ ئاگاش نابـێ لێیان.

(٩٨): ﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٩٨ ﴾:

تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ ﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ واتـە: زۆر یـادی خوا بکـە، خـوا بـە پـاک بگرەو ستایشـی بکـەو نوێژی بـۆ بکە، بە ڕاسـتی ئـەوە دڵـت فراوان دەکات‌و هاوکاریـت دەکات لـە کاروبارەکانت.

(٩٩): ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ٩٩ ﴾:

﴿ ٱلۡيَقِينُ ﴾ واتـە: مـردن، لە هەمـوو کاتەکانـدا بەردەوام بـە لە خۆ نزیـک کردنەوە لە خـوا ﷻ، بـە هەموو جۆرە پەرستشـەکان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پەروەردگـاری بەجێهێنا، بـەردەوام بەندایەتـی خـوای دەکـرد، تا کۆچی کـرد، صەڵـەوات دروودو میهرەبانـی بڕژێ بەسـەریدا، درووددێکـی زۆرو بێ پایان.

سوورەتی (الحجر) تەواوو بوو

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١ يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ٢ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ٤ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ٦

## تەفسیری سوورەتی (النحل)

## مەککیە (١٢٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١ يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ٢ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ٤ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ٦ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨﴾:

خوا ﷻ -دەربارەی نزیکبوونەوەی ئەو پەیمانەی کە داویەتی، دەبێ هەر ڕوودات- دەفەرموێ: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ﴾ واتە: بێگومان دێت، وە هاتنیشی نزیکە ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ لە دانە پاڵی شەریکو منداڵو هاوشان، جگە لەوانەی کە بتپەرستان داویانەتە پاڵی، کە شایستەی گەورەیی ئەو نیە، یان لەگەڵ کەماڵی ئەودا ناگونجێن.

کاتێک کە نەفسی خۆی پاک ڕاگرتووە لەوەی کە دوژمنانی داویانەتە پاڵیو بەو شێوە خراپە وەسفیان کردوە، باسی وەحی کردوە کە دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکانی، وا پێویست دەکات شوێنی بکەون لە باسکردنی ئەوەی دەدرێتە پاڵ خوا ﷻ لە سیفەتە تەواوەکانی، جا فەرموویەتی: ﴿يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ﴾ واتە: بەو وەحیەی کە ژیانی ڕووحەکانە، ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ﴾ لەوانەی کە دەزانێ چاکن تا

پەیامەکەی هەڵبگرن، وە پاڵفتەی بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەران لەم وتەیەی خوادایە کە فەرموویەتی: ﴿ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴾ واتە: لەسەر ناسینی خوای بەرز، وە یەکتاناسی لە سیفەتە مەزنەکانیدا، کە ئەویش سیفەتەکانی یەکتاپەرستیە، وە بەندایەتی کردنی بە تاکو تەنهاو هاوەڵی بۆ بڕیار نەدرێ، خوا لەبەر ئەوە کتێبەکانی دابەزاندوەو کتێبەکانی ناردوە، وە سەرجەم شەریعەتەکانی بە بانگەشەکردن داناوە بۆ ئەو یەکتاپەرستیە، هانی داون جیهادی ئەو کەسانە بکەن کە بەرهەڵستی دەکەنو لە دژی دەوەستنەوە. پاشان باسی بەڵگەکانی (یەکتاپەرستی خۆی) کردوە لەو بارەوە، فەرموویەتی:

(٣-٩): ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ
ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَـٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ
وَمَنَـٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾
وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَـٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ
رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى
ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ۚ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾ ﴾:

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾ ئەم سوورەتە ناونراوە بە سوورەتی نازو نیعمەت، چونکە خوا ﷻ لە سەرەتادا باسی بنەمای نازو نیعمەتەکانی کردوە، وە لە کۆتاییدا باسی تەواوکاریەکانی کردوە، جا هەواڵیداوە ئەو (واتە: خوا) بە هەق ئەرزو ئاسمانی بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی گەورەییو مەزنی بەدیهێنەر ببێت بە بەڵگە بەسەر بەندەکانیەوە، بە هەمان شێوە سیفەتە بەرزو تەواوەکانی، تا بزانن خوا زەویو ئاسمانی دروست کردوە، بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا ﷻ تێیدا بحەسێنەوە، ئەوانەی کە دەیپەرستن، بەوەی فەرمانی پێکردوون بەو شەریعەتو یاسایانەی دایبەزاندوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی، ئا لەبەر ئەمە خۆی بە پاک ڕاگرتووە لە هاوەڵ بۆ دانانی موشریکەکان، ﴿ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ واتە: پاکو خاوێنیو بەرزو بڵندی هەمیشەیی بۆ خوا لە هاوبەش دانانیان، بە ڕاستی ئەو پەرستراوی ڕاستەقینەیە کە پێویستە تەنها عیبادەتو خۆشویستنو زەلیلی بۆ خوای بەرز ئەنجام بدرێ.

کاتێک باسی بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی کرد، باسی دروستکردنی ناویانی کرد، بە بەڕێزترینیان دەستی پێکرد کە مرۆڤە، فەرمووی: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ ﴾

بـەردەوام کاروبـاری (مرۆڤ) بەڕێوەدەباتو گەشـەی پـێ دەکات، هەتا بوو بـە مرۆڤێکی تـەواو لـە ڕوو کەشو نـاوەوە، بـە نیعمەتێکی زۆر داپۆشـیوە، تـا تەواوی کـردوە، ئەویش شـانازی بە خۆیەوە دەکاتو سەری پێی سووردەمێنێ، ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴾ مەبەستی پێـی (مرۆڤـە): کە ئەو دوژمنێکـی ئاشـکرای پەروەردگارێتی، بێبڕوایی پێدەکاو مشـتومڕ لەگـەڵ پێغەمبەراندا دەکاتو نیشـانەکانیان بە درۆ دەخاتەوە، سـەرەتای دروسـتکردنی خۆی بیرچـووە، لەگـەڵ ئەو هەمـوو نـازو نیعمەتەی خـوا دایباراندوە بەسـەریدا، هەمـوو ئەوانەی بەکارهێنـاوە بۆ سـەرپێچی کـردن (ی خوا)!

وە دەگونجـێ ماناکـەی (ئـەوە بـێ): خـوا ﷻ مرۆڤـی دروسـت کردوە لـە دڵۆپێـک ئاو، پاشـان بـەردەوامو قۆناغ بـە قۆناغ دەیگوازێتـەوە تا دەبێتـە مرۆڤێکی تەواو و ژیـرو عاقڵو خـاوەن بیـرو بۆچـوون، دژایەتـی دەکاو مشـتو مـڕ دەکا، دەی بـا بەندە سوپاسـگوزاری پەروەردگـاری بـکات کە گەیاندوویەتـی بەو قۆناغە، کە هیچ شـتێک لەوانە لە دەسـەڵاتی خۆیـدا نەبووە.

﴿ وَٱلْأَنْعَـٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ ﴾ واتـە: لەبەر خاتـری ئێوە، وە لەبەر سـوودو بەرژەوەندیتان، لـە کـۆی سـوودە مەزنەکانـی کـە تێیدایە بۆتـان: ﴿ فِيهَا دِفْءٌ ﴾ خـووری مـەڕەکانو کوورکـی وشـترەکانو مـووی بزنـەکان، کـە ڕایـەخو جـلو بـەرگو کاڵای ناومالـی لـێ دەسـت دەخـەن، ﴿ وَمَنَـٰفِعُ ﴾ وە جگـە لەوانـەش سـوودی تـری تێدایە بۆتـان (لە شـیرو دۆو سـەرجەم بەرهەمـە شـیرەمەنیەکان)، ﴿ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ (واتـە: سـوود لە گۆشـتەکانیان وەردەگـرن)، ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾ واتـە: لە کاتـی پشـوودانیاندا، وە لە کاتی جووڵـەو ڕادانیاندا، جوانیـان بۆ خودی خۆیـان ناگەڕێتەوە، بەڵکـو ئێـوە جوانیـان دەکەن، وەک چۆن جـلو بەرگ مـاڵو منداڵەکانتان جـوان دەکەنو پێـی سەرسـام دەبن،

وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ
الْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ٧ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ
وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ٨
وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ ۚ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ
أَجْمَعِينَ ٩ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً ۖ لَّكُم
مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنبِتُ لَكُم
بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِن كُلِّ
الثَّمَرَاتِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ
١١ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ
وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ ١٢ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا
أَلْوَانُهُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ١٣
وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا
وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ
فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ١٤

﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ﴾ واتە: لە کەل‌و پەلە قورسەکان، تەنانەت هەڵگرتنی خۆشتان، ﴿إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ الْأَنفُسِ﴾ بەڵکو خوا ﷻ بۆتانی ڕام کردوون، جا هەندێکیان سواریان دەبن، وە هەندێکیان باری قورسیان لێدەنێن بۆ شارو ناوچە دوور لە دەستەکان، ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: کە ژێرباری کردوە بۆتان ئەوانەی کە ناچارن‌و پێویستان پێیەتی، ستایشی تەواو بۆ ئەو خوایە وەک چۆن پێویستە ستایشی گەورەیی‌و مەزنی دەسەڵاتی بکرێ، وە بەرفراوانی بەخشندەیی‌و چاکەکانی، ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ﴾ هەموو ئەوانەی ژێر بار کردوون ﴿لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ واتە: جارێک بەکاریان بهێنن بۆ سوار بوون، وە جارێکیش بۆ جوانی، باسی خواردنی نەکردوە، لەبەر ئەوەی هێسترو گوێدرێژ گۆشتیان حەرامە، بە زۆریش ئەسپ بەکارناهێنن بۆ خواردن، بەڵکو نەهی کراوە لە سەربڕینی لەبەر خواردن، لە ترسی ئەوەی نەمێنێ‌و کۆتایی پێ بێت، ئەگەرنا ئەوە لە فەرموودەی ڕاستدا جێگیر بووە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە خواردنی گۆشتی ئەسپ.

﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ لەوانەی کە پاش دابەزینی قورئان دێن لە شتەکان کە مرۆڤەکان سواریان دەبن لە دەشت‌و دەریاو ئاسماندا، وە بەکاریان دەهێنن بۆ سوودو بەرژەوەندیەکانیان، چونکە خوا ﷻ بە دیاریکراوی باسی نەکردوە، لەبەر ئەوە لە کتێبەکەیدا هیچ شتێک باس ناکات تەنها ئەوە نەبێ کە بەندەکان بیزانن، یان هاوشانەکەی بناسن، بەڵام ئەوەی هاوشان‌و وێنەی نیە ئەگەر باسیشی بکات ئەوان نایزانن‌و لە مەبەستیشی تێناگەن، بۆیە بنەمایەک باس دەکات دەچێتە چوارچێوەیەوە هەموو ئەوانەی دەیزانن‌و ئەوانیشی کە نایزانن،

هـەروەک باسـی نـازو نیعمەتـی بەهەشـتی کـردوە، وە نـاوی ئـەوەی هێنـاوە کـە ئێمـە دەیزانیـن وەک: دارخورمـاو تـرێو هەنـار، ئەوەیشـی هاووێنـەی نیـەو نایزانیـن لـەم دەقـە پیـرۆزەدا باسـی کـردوە: ﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ۝٥٢ ﴾الرحمن. (واتـە: لـە نێویانـدا لـە هەمـوو جـۆرە میوەیـەک دوو جـۆری تێدایـە).
بـە هەمان شـێوە لێرەدا، باسـی ئەوەی کـردوە کە دەیزانین‌و دەیناسـین، لەوانـەی (مرۆڤ) سـواری دەبـن، وەک: ئەسـپ‌و هێسـترو گوێدرێـژو وشـترو کەشـتی، وە ئـەوەی کـە ماوەتـەوە لەم دەقەدا بە جوانـی هێناویەتـی وەک فەرموویەتی: ﴿ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ (واتـە: شـتی وا دروسـت دەکات کـە تـا ئێسـتا ئێوە پێیتـان نەزانیـوە)، کاتێـک خوا ﷻ باسـی ڕێگای هەسـتی (الحسـی) کردوە، بێگومـان خوا بـۆ بەندەکانی داناوە بـۆ بڕینی ئەو ڕێگـا دوورانـە لـە وشـترو هاوشـێوەکانی، ئنجا باسـی ڕێگـای مەعنەویی کـردوە کە پێی دەگـات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ ﴾ واتـە: ڕێگای ڕاسـت کـە نزیکترین‌و کورتترینیانـە بـۆ لای خوا، بـەڵام ڕێگای لارو چـەوت لە عەقیدەو کارو کـردەوەدا بریتیە: لـە هەمـوو ئەوانـەی پێچەوانـەی ڕێگـای ڕاسـت دەکەن، ئـەو ڕێگایـە ناگاتـە لای خواو براوەیـە، بەڵکـو دەگاتە شـوێنی بەدبەختـی، جا هیدایـەت دراوان بە ئیزنـی پەروەردگاریان ڕێگـای ڕاسـتیان گرتۆتـە بـەر، گومراکانیـش ئـەو ڕێگایەیـان ون کـردوەو ڕێگایەکـی خراپیـان گرتۆتـە بـەر، ﴿ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ بـەڵام هەندێکـی هیدایـەت داوە وەک ڕێـزو چاکەیـەک، وە کۆمەڵێکیشـی هیدایـەت نـەداوە بە حیکمـەت‌و دانایی‌و دادپـەروەری خۆی.

(١٠-١١): ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ۝١٠ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ۝١١ ﴾:

بیـر لەوانـە بکەنـەوە لەسـەر تـەواوی دەسـەڵاتی خـوا ﷻ کـە ئـەم ئـاوەی دابەزانـدوە لـە نـاو ئـەو هـەورە تەنـک‌و سـووکە لـە سـەرخۆیانە، ئاوێکـی سـازگاری تێـدا بـۆ دانـاوە تـا لێـی بخۆنـەوەو ئـاژەڵ‌و کێڵگەکانیانـی پـێ تێـر ئـاو بکـەن، پاشـان بـەرو بوومـی بـە لەززەتـی زۆریـان بـۆ دەربێنـێ.

(١٢): ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ۝١٢ ﴾:

واتـــە: هەمـــوو ئەمانـــەی ڕام هێنـــاوە بۆتـــان لەبـــەر ســـوودو قازانجتـــان، وە جۆرەهـــا بەرژەوەنـــدی دیکەتـــان، بـــە شـــێوەیەک بـــێ نیـــاز نابـــن لێیـــان، لـــە شـــەو پشـــوو دەدەنو دەخـــەونو دەحەســـێنەوە، بـــە ڕۆژیـــش بڵاودەبنـــەوە بـــۆ بژێـــوی ژیانتـــان، وە بـــە ســـوودی دیـــنو دونیاتـــان، وە بـــە خـــۆرو مانـــگ، لـــە نـــوورو ڕۆشـــناییو چاکبوونـــی دارو درەختـــەکانو بەرهەمـــەکانو گـــژو گیـــاو وشـــک بوونـــەوەی شـــێی تـــەڕیو لابردنـــی ســـەرمای زیانبەخـــش بـــۆ زەویو جەســـتەکانو، جگـــە لەوانـــەش لـــە ســـوودو کەڵکـــەکان کـــە تایبەتـــن بـــە خـــۆرو مانگـــەوە.

وە لـــە ناویانـــداو لـــە نـــاو ئەســـتێرەکاندا جوانـــی هەیـــە بـــۆ ئاســـمانەکانو ڕێنمایـــی بـــۆ تاریکیەکانـــی دەشـــتو دەریـــا، وە زانینـــی کاتـــەکانو ژماردنـــی ڕۆژەکان، کـــە ئاماژەکانیـــان جـــۆراو جـــۆرەو نیشانەکانیشـــیان دەگـــۆڕێ، لەبـــەر ئەمـــە لـــە فەرمایشـــتی خۆیـــدا کـــۆی کردوەتـــەوە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتـــە: بـــۆ ئەوانـــەی عەقڵیـــان هەیـــە بـــەکاری دەهێنـــن بـــۆ بیـــر کردنـــەوەو تێرامـــان، ئـــەو عەقڵـــەی کـــە ئامـــادە کـــراوە، بـــۆ ئـــەوەی هـــەر شـــتێ ببینـــێ بیـــری لـــێ بکاتـــەوە، نـــەک وەک بینینـــی بێئاگـــاکان ئەوانـــەی لـــە بینینـــدا بەشـــیان وەک بەشـــی ئـــاژەڵ وایـــە کـــە هیـــچ عەقڵێکـــی نیـــە.

(١٣): ﴿وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾:

واتـــە: لـــەوەی دەریهێنـــاوەو بـــڵاوی کردۆتـــەوە بـــۆ بەنـــدەکان، لـــە هەمـــوو ئەوانـــەی لەســـەر زەویـــە، لـــە ئـــاژەڵو دارو درەخـــتو گـــژو گیـــاو جگـــە لەوانـــەش، لـــە چەندیـــن شـــتی تـــری جـــۆراو جـــۆرو ڕەنگـــاو ڕەنـــگ، نیشـــانەو بەڵگـــەن لەســـەر تـــەواوی توانـــای خـــواو گشـــتگیریو بەرفراوانـــی چاکەکانـــی، بێگومـــان خـــوا ئـــەو پەروەردگارەیـــە، بەندایەتـــی بـــۆ غەیـــری ئـــەو ڕەوا نیـــە، تـــاکو تەنهایـــەو هیـــچ هاوەڵێکـــی نیـــە، ﴿لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ واتـــە: بیـــرو هۆشـــیان ئامـــادە دەکـــەن بـــۆ ئـــەوەی کـــە ســـوودی هەیـــە بۆیـــان لـــە زانســـتی بـــە ســـوود، وە ئـــەوەی خـــوا ﷻ بانگـــی بـــۆ کـــردوون لێـــی ڕادەمێننو بیـــری لێدەکەنـــەوە، هەتـــا بـــەوە یـــادی بکەنـــەوە کـــە بەڵگەیـــە لەســـەر (تـــاکو تەنهایـــی خـــوا).

(١٤): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ ﴾ واتــە: ئــەو زاتــە تــاکو تەنهایــەو هاوەڵــی نیــە، ﴿ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا ﴾ ئەویــش ماســیو نەهەنگــی نــاو دەریایــە کــە ڕاوەکرێــن، ﴿ وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ﴾ بــۆ ئــەوەی خۆتانــی پــێ جــوان بکــەن، جوانیــەک لەســەر جوانیتــان، ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ ﴾ کەشــتیو بارهەڵگــر، ﴿ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾ واتــە: ئــەو دەریــا زەبەلاحــە بــە ســنگیان لــەتو پــەت دەکــەن، هەتا لــە شــوێنێکەوە بــۆ شــوێنێکی دیکــە گەشــتیاران دەگوازنــەوە، بــە ســەرجەم کــەلو پــەلو خــۆراکو ماڵــی بازرگانیــان کــە مەبەســتیان پێــی بەدەســتهێنانی ڕزقو ڕۆزیو فــەزڵو چاکــەی خوایــە.

﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ ئــەو زاتــەی هەمــوو ئــەم شــتانەی بــۆ ئاســانو دەســتەبەر کــردوون، ئێــوەش لــە بەرانبــەردا وەســفو سوپاســگوزاری دەکــەن لــەوەی کــە منەتــی کــردوە بەســەرتاندا، ســتایش بــۆ ئــەو خوایــەی کــە ئەوەنــدەی بەخشــیوە بــە بەنــدەکان لەســەرووی بەرژەوەنــدیو ســوودو قازانــجو داواکاریەکانیانەوەیــە، وە هەمــوو ئەوانــەی پێبەخشــیون کــە داوایــان لێکــردوە، ناتوانیــن وەســفی بژمێریــن، بەڵکــو تەنهــا خــۆی دەتوانــی وەســفی زاتــی خــۆی بــکات.

(١٥-١٦): ﴿ وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَامَاتٍ ۚ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

﴿ وَأَلْقَىٰ ﴾ خوا لەبەر بەندەکانی ﴿ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ ﴾ ئەویش بریتیە لە کێوە گەورەکان، وەک مێخ دایکوتاوە تا نەیان لەرزێنیو تێکیان نەدات، جا بەو هۆیەوە دەتوانن زەوی بکێڵنو خانووی لەسەر دروست بکەنو بەسەریدا بگەڕێن، وە لە میهرەبانیەکانی ئەوەیە ئاوی تێدا داناوە، دەیگوازێتەوە لە زەویەکی گەورەوە بۆ زەویەکی دوور، بۆ ئەوەی خۆیانو ئاژەڵو کێڵگەکانیان ئاو بدات، زەریایەک لەسەر زەویو زەریایەک لە ناویدا، بە چاڵ کردنی دەریدەهێنن، بەوەی خوا ﷻ ئەو کەرستانەی ژێربار کردوە کە ئاوی پێ دەردەهێنن، وە لە میهرەبانی ئەو زاتە ئەوەیە کە ڕێگاکانی پێ پیشانداون بۆ ئەوەی بگەن بە شارو وڵاتەکانو ئەو شوێنانەی کە ئاوەدان نیە، ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ (بەڵکو ڕێگای) ژیان بدۆزنەوە، هەتا تۆ دەبینی زەویەک پڕە لە شاخو کێو کاتێ تەماشا دەکەی دەبینی خەڵکێکی زۆری تێدا دەژیو دەرچەی ڕێگاو بانیشیان هەیە!

﴿ وَعَلَامَاتٍ ﴾ واتە: چەندین نیشانەی تریشی بۆ دانان، وەکو کێوو گردۆڵکەو ئاوو هاوشێوەی ئەوانە لە ڕۆژدا، بۆ ئەوەی ڕێبواران لە وشکانی دەریادا ڕێیان پێ دەربکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجو مەبەستەکانیان، ﴿ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ (واتە: ئەوان بە ئەستێرەکانیش ڕێیان دەردەکرد لە تاریکی شەودا)[٢].

وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا
لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَامَاتٍ ۚ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ
﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن
تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾
وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ
مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَاتٌ
غَيْرُ أَحْيَاءٍ ۖ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ
وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم
مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا
يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم
مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوا
أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم
بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ
فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ
مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾

(١٧-٢٣): ﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ

---

٢ - ئایەتی ژمارە: (١٦) ڕاڤە نەکراوە لەسەرەوە بە کورتی مانامان کردوە. وەرگێڕ.

وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم
مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ
الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾

کاتێ خوا ﷻ باسی بەدیهێنانی دروستکراوە مەزنەکانی کرد، وە ئەو نیعمەتە گشتگیرو بەرفراوانانە، ئنجا باسی ئەوەی کرد کە هیچ کەسێک لەو ناچێ‌و کەس هاوشان‌و هاوبەشیشی نیە، فەرموویەتی:

﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ ﴾ هەموو دروستکراوەکان، هەر شتێکی بوێ دەیکات، ﴿ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ﴾ (وەک ئەوە وایە نەتوانێ) شتێک دروست بکات، کەم بێ، یان زۆر، ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ تا بزانن ئەو بە تەنها بەدیهێنەرە، شایستەو لە پێشترە بۆ بەندایەتی، وەک چۆن تاکە لە دروستکردن‌و بەڕێوەبردندا، بێگومان تاکە لە پەرستراوێتیدا، وە لە یەکتاپەرستی‌و عیبادەتیشدا.
هەروەکو هاوبەشی نیە کاتێ دروستی کردوون‌و جگە لە ئێوەشی دروستکردوە، دەی کەوابوو ئێوەش بت‌و هاوبەشی بۆ دامەنێن لە عیبادەتدا، بەڵکو بە دڵسۆزی دینداریی بۆ ئەنجام بدەن، ﴿ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ ﴾ بتانەوێ بیژمێرن، ﴿ لَا تُحْصُوهَا ﴾ ناتوانن بیژمێرن، چونکە نیعمەتە دیارو شاراوەکان بەسەر بەندەکانەوە بە ژمارەی هەناسەدان‌و چرکەکانی تەمەنە لە هەموو جۆرە نیعمەتەکان، لەوەی بەندەکان دەیزانن‌و لەوانەشی کە نایزانن، وە ئەوەی لە بەڵاو ناڕەحەتی لێیان دوور دەخرێتەوە زۆرترە لە ژماردن‌و ناژمێردرێ، ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ڕازی دەبێ لێتان بە کەمترین سوپاسگوزاری لەگەڵ (ئەو) نازو نیعمەتە زۆرەی (کە پێیداون)، هەروەکو چۆن ڕەحمەتی بەرفراوانەو بەخشندەیی گشتگیرەو لێبووردنی هەموو بەندەکانی دەگرێتەوە، بە هەمان زانستی دەوری داون، ﴿ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾ بە پێچەوانەی ئەو بتانەی لە جیاتی خوا دەپەرسترێن ﴿ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا ﴾ هیچ شتێکیان پێ دروست ناکرێ نە کەم، نە زۆر ﴿ وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾ چۆن شتێک دروست دەکەن لە کاتێکدا ناتوانن خۆیان دروست بکەن‌و پێویستیان بە خوا ﷻ هەیە دروستیان بکات؟!
لەگەڵ ئەمەدا هیچ وەسفێکی تەواویان تێدا نیە، نە زانست، نە جگە لەویش، ﴿ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ ﴾ نابیستن‌و نابینن‌و عەقڵیان نیە، ئایا ئەمە دەکرێتە پەرستراو لە جێگەی پەروەردگاری جیهانییان؟! تووڕەیی‌و بێزاری بۆ عەقڵی هاوبەش دانەران، ئای چەندە گومڕاو سەرلێشێواون، کاتێ لە ئاشکراترین شتدا ون بوو ون، وە یەکسانیان کردوە لە نێوان ناتەواو لە هەموو ڕووەکانەوە کە هیچ وەسفێکی تەواوی تێدا نیە، وە هیچ کردەوەیەکیشی نیە، لەگەڵ

تەواو لە هەموو ڕووەکانەوە کە خاوەن هەموو سیفەتێکی تەواوە، خاوەن زانستێکە دەوری هەموو شتەکانی داوەو خاوەن توانای لە ڕادە بە دەرو گشتگیرە، وە ڕەحمەتو میهرەبانی هەموو جیهانی داپۆشیوە، خاوەن ستایشو گەورەییو مەزنیە، کە هیچ دروستکراوێک لە دروستکراوەکان ناتوانێ هەندێکی کەم لەو وەسفانە دەور بکات، ئا لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾ ئەو زاتەش خوای تاکو تەنهاو بێ نیازە، کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووەو هەرگیز هیچ کەسێک هاوشێوەو هاوتای نەبووە، خاوەن ئیمانو ژیرەکان، دڵیان بە گەورەو مەزنی دەزانێ، وە زۆر زۆریان خۆش دەوێ، ئەوەی هەیانە لە پێناو نزیکبوونەوەیدا دەیبەخشن، بە کردەوەکانی دڵو جەستەیانیش، وەسفی دەکەن بە ناووسیفەتە جوانو بەرزەکانیو کردەوە گەورەکانیشی، ﴿ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ ﴾ (واتە: ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژ نیە دڵیان نکووڵی تەنیایی خوا دەکات)، نکووڵی لە یەکتاپەرستی خوا دەکات، کە هیچ کەس نکووڵی لێناکات مەگەر نەزانترینو کەللەڕەقترین دروستکراو بێ، ﴿ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾ (واتە: لەگەڵ ئەوەشدا لووت بەرزی دەنوێنن) لە عیبادەت کردندا. ﴿ لَا جَرَمَ ﴾ واتە: هەقەو دەبێ ببێ، ﴿ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ لە کردەوە قێزەونەکان ﴿ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴾ بەڵکو ڕقی لێیانە بەوپەڕی ڕق لێبوونەوە، سزایان دەدات بە پێی کردەوەکانیان، ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر، (واتە: بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن لە ئاستی پەرستنمدا، بە دڵنیایی بە زەلیلی دەچنە دۆزەخەوە).

(٢٤-٢٩): ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٢٧﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ ۚ بَلَىٰ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی توندیو بە درۆدانانی هاوبەش دانەران بە نیشانەو ئایەتەکانی خوا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ﴾ واتە: ئەگەر پرسیاری قورئانو وەحی

بكرێ كە ئەوە گەورەترین نیعمەتە خوا ﷻ دایبەزاندوە بەسەر بەندەكاندا، ئەی قسەی ئێوە چیە دەربارەی؟ ئایا سوپاسگوزاری ئەم نیعمەتە دەكەنو دانی پێدا دەنێن، یان بێبڕوایی‌و عینادی دەكەن؟ بێگومان وەڵامەكەیان خراپترین‌و ناشرینترین وەڵام دەبێ، دەربارەی دەڵێن: بە ڕاستی ئەوە ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ە، واتە: درۆیە موحەممەد خۆی هەڵیبەستوە بە دەم خواوە، ئەوە تەنها ئەفسانەو قسەی پێشینە كە نەوە دوای نەوە هاتووە، تیایاندایە ڕاستەو تیاشیاندایە درۆیە، ئەم قسەیان كرد، تا بە تەواوی تاوانی خۆیان هەڵبگرن.

وە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ﴾ واتە: وە گوناهی ئەو كەسانەش هەڵگرن كە بە نەزانی‌و گێلانە ئەوان گومڕایان دەكەن، بەڵام ئەوانەی دەیزانن، تاوانیان لە ئەستۆی خۆیاندایە، چونكە وەک ئەوان زانیویانە، ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ واتە: ئای چ بارێكی قورس‌و گرانیان خستە ئەستۆی خۆیان، لە گوناهی خۆیان‌و گوناهی ئەوانەی كە گومڕایان كردوون.

﴿قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ فرت‌و فێڵیان لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا كرد، جۆرەها فرت‌و فێڵیان بەكارهێنا بۆ ڕەتكردنەوەی پەیامەكانیان، وە بە فێڵەكانیان كۆشكی بەرزیان دروستكرد، ﴿فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ﴾ واتە: ماڵ‌و خانوویانی لە بنج‌و بنەوانەوە دەرهێنا، ﴿فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ﴾ ئەوەی كە دروستیان كرد، بوو بە سزایەک بۆیان، پێی سزادران، ﴿وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ ئەوان وایانزانی ئەو كۆشک‌و خانووانە سوودیان پێدەگەیەنن‌و لە سزا بە دووریان دەخەنەوە، بەڵام بوو بە مایەی سزای سەخت بۆیان.

ئەمە باشترین وێنایە بۆ بە پووچەڵ كردنەوەی فێڵی دوژمنان، ئەوان بیریان كردەوەو پیلانیان دانا چۆن پێغەمبەران بە درۆ بخەنەوە، وە بنەماو یاسای بەتاڵ بۆ خۆیان دابنێن، وەک سەرچاوە بۆی بگەڕێنەوە، لە كاتی پێویستدا ڕەدی پێغەمبەرانی پێبدەنەوە، بە هەمان شێوە پەنایان بردە بەر زیانگەیاندن بە پێغەمبەران‌و شوێنكەتووانیان، فێڵەكەیان بەسەر خۆیاندا هەڵگەڕایەوە، پلانیان بوویە مایەی ڕووخانیان، چونكە فێڵەكەیان خراپ بوو، ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ ﴿٤٣﴾﴾فاطر. (واتە: دەرەنجامی فرت‌و فێڵ بەسەر خاوەنەكەیدا دەشكێتەوە)، ئەمە لە دنیادا، سزای دواڕۆژ ڕیسواكەرترە، بۆیە فەرموویەتی:

ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ
ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ۚ بَلَىٰٓ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ
لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا۟ خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى
هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ
﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ
لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِى ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾
ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ
ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن
تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾
فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾

﴿ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُخْزِيهِمْ ﴾ واتـە: لـە پێـش چـاوی هەمـوو خەڵكـی ڕیسـواو شـەرمەزاریان دەكات، وە درۆكانیـان ئاشـكرا دەكات، وە ئـەو درۆیانـەش كـە بـەدەم خـواوە هەڵیانبەسـتوە. ﴿ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمْ ﴾ واتـە: دەجەنگـانو دژایەتـی خـواو حیزبەكەیتـان دەكـرد لـە پێناویانـدا، واتـان دەزانی ئەوانە شـەریكو هاوبەشـی خـوان، ئەگەر ئـەم پرسـیارەیان لـێ بـكات، وەلامیـان بۆ نابـێ تەنهـا ئەوە نەبـێ داندەنێـن بـە گومراییانـداو ئیعتراف دەكـەن بـە كەللەرەقیـانو دەڵێـن: ﴿ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾الأعـراف. (واتـە: لێمـان بـزر بـوون وازیـان لێهێنایـنو بەتـاڵو پووچ دەرچـوون، ئـەو كاتە شـایەتی لـە دژی خۆیـان دەدەنو دەڵێن: بـەڵێ لە دونیـادا كافرو خوا نەناسـبووین).

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ واتـە: زانـا بـەرزو خواناسـەكان، ﴿ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ ﴾ واتە: ڕۆژی قیامـەت ﴿ وَٱلسُّوٓءَ ﴾ واتە: سـزاو تۆڵـە ﴿ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾.

لەمـەدا چاكـەی خـاوەن زانسـتان دەردەكـەوێ، ئـەوان لـەم دونیایەدا ڕاسـت بێـژن، وە لە ڕۆژی دواییشـدا، بێگومـان وتەكانیـان شـوێنو پێگەیەكـی تایبەتـی هەیـە لـە لای خـواو بەدیهێنراوەكانـی.

پاشـان باسـی ئەوە دەكات كە لە ڕۆژی دواییو لەسـەرە مەرگدا چیان بەسـەر دێ، ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ واتـە: لە كاتێكدا گیانیان دەكێشـن كە سـتەمو تاوانو سـەرپێچیان زۆر بووبـێ، بێگومـان زانـراوە سـتەمكاران لـەم كاتـەدا چیـان بەسـەر دێ، بە جۆرەهـا سـزاو سەرشـۆڕی ﴿ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ ﴾ واتە: بـە ناچاری مسـوڵمان بـوون، نكووڵی لەوانـە دەكـەن كـە پێشـتر پەرسـتوویانن، وتیـان: ﴿ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ﴾ پێیـان

دەوترێ: ﴿ بَلَىٰٓ ﴾ بەڵکو ئێـوە کاری خراپتان دەکرد، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ جـا کەللەڕەقی هیچ سـوودێکتان پـێ ناگەیەنێ، ئەمە لـە هەندێ هەڵوێسـتی ڕۆژی دوایدایە، نکووڵـی ئـەوە دەکـەن کە لـە دونیادا لەسـەری ڕۆیشـتوون، وا گومان دەبەن ئەوە سـوودی هەیـە بۆیان، جـا کاتێ ئەندامانی جەسـتەیان شـایەتیان لەسـەر دەدەن، دەردەکـەوێ ئەوەی کـە پێشـتر لەسـەری بـوون، دانـی پێدادەنێـن‌و ئیعتـراف دەکـەن، لەبـەر ئەمەیـە ناخرێنە دۆزەخـەوە هەتـا خۆیان دان بـە تاوانەکانی خۆیاندا نەنێـن، ﴿ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ ﴾ هەر دەسـتەو کۆمەڵێـک لـە دەرگای شایسـتە بە خۆیانـەوە دەچنە نـاو دۆزەخەوە، هەر کەسـەو بـە پێی کـردەوەی خـۆی، دوایی دەڵێـن: ﴿ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴾ ئاگـری دۆزەخ، بێگومـان جێگـای پەشـێمان بوونەوەو ئاخ هەڵکێشـانە، وە شـوێنێکی ناخۆش‌و پـڕ لە ئازارە، پـڕە لـە خـەم‌و خەفەت، ئـەو جێگایەیـە کە خـوای زینـدوو لێی تووڕەیە، سـزایان لەسـەر کـەم ناکرێتەوەو لەسـەریان لاناچـێ، تەنانەت بۆ یـەک ڕۆژیش، بێگومان خوا ﷻ پشـتیان تێدەکاو سـزای بە ئێشـیان بۆ ئامـادە دەکات.

(٣٠-٣٢): ﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡۚ قَالُواْ خَيۡرٗاۗ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۚ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞۚ وَلَنِعۡمَ دَارُ ٱلۡمُتَّقِينَ ٣٠ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ لَهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ كَذَٰلِكَ يَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلۡمُتَّقِينَ ٣١ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٣٢ ﴾

﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡۚ قَالُواْ خَيۡرٗا ﴾ واتـە: کاتـێ خـوا باسـی قسـەی بەدرۆدانەرانـی کتێبـی خـوای کـرد، وە باسـی قسـەی پارێزکارانی کـرد، بێگومـان ئەوان دانیـان پێدانـاو ئیعترافیـان کـرد ئـەوەی خـوا دایبەزانـدوە نیعمەتێکـی مەزنـەو خێرێکـی گەورەیـە خـوا منەتـی پێکـردوە بەسـەر بەندەکانـدا، ئەوانیش ئـەو نیعمەتەیـان وەرگرت‌و ملکەچـی بـوون، وە سوپاسـی خوایـان کـرد لەسـەری، جـا زانیـان‌و کاریـان پێکـرد، ﴿ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ﴾ لـە بەندایەتـی خـوادا، وە چاکەخوازیـش بـوون لەگـەڵ بەندەکانیدا، بـۆ ئـەوان هەیـە ﴿ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞ ﴾ ڕزق‌و ڕۆزیەکی بەرفـراوان‌و ژیانێکی خۆش‌و ئارامـی دڵ‌و ئاسـایش‌و دڵخۆشـی، ﴿ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ ﴾ واتـە: بە ڕاسـتی ماڵـی دواڕۆژ باشـترە لـە ماڵی ئـەم دونیایە، وە ئەوەیشـی تیایدایـە لە جۆرەهـا لەززەتی جیاجیـا، بێگومان چێـژی ئـەم دونیایە زۆر کەمـەو دەور دراوە بـە بەڵاو ناخۆشـی‌و دەبڕێتەوە، بـە پێچەوانەی نـازو نیعمەتـی دواڕۆژ، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَنِعۡمَ دَارُ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾

﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ لَهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ ﴾ واتە: ئەوەی نەفس‌و ئارەزوویــان داوای بــکات‌و ئیرادەیــان بــۆی هەبێ، بۆیــان دەســتەبەر دەبێ بــە تەواوترین‌و چاکتریــن شــێوە، ناکــرێ داوای هەر جۆرێ لــە نازو نیعمەتــەکان بکەن کــە لەززەتی تیابێ بــۆ دڵ، وە خۆشــی‌و بۆ ڕووح ئیــلا لەبەر دەســتیاندا ئامادەیە، ئەوەی بەهەشــتیەکان ئاواتی بۆ دەخــوازن خــوا پێیــان دەبەخشــێ، هەتا خۆی هەنــدێ نازو نیعمــەت دەخاتەوە یادیــان کە بە ختــورەش بەســەر دڵیانــدا نەهاتــوە، پاکی بۆ ئــەو خوایەی ڕێــزو بەخشــندەیی کۆتایی نایەو هیــچ ســنوورێکی نیــە ئەو خوایــەی کە هیچ شــتێک هــاو وێنەی نیــە لە ســیفەت‌و کردارە بەرزەکانیــدا، ﴿ كَذَٰلِكَ يَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ (واتــە: خوا پاداشــتی پارێــزکاران دەداتەوە)، دووریــان دەخاتــەوە لــە توورەیی‌و ســزای خــۆی، چونکــە ئەوان ئەرکەکانی ســەر شــانیان جێبەجــێ کــردوە لــە فەرزو پێویســتیەکان کــە پەیوەندیان بە دڵ‌و جەســتەو زمانــەوە هەیە، وە مافەکانــی خوایان پاراســتوە، بە هەمان شــێوە مافی بەندەکانیشــی، وازیان لــەوە هێناوە کە خــوا لێــی قەدەغــە کــردوون، ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ بەردەوامن لەســەر پارێزکاری‌و لــە خواترســان، ﴿ طَيِّبِينَ ﴾ واتــە: پــاک‌و خاوێــنن لــە هەمــوو ناتــەواوی‌و پیســیەک کە تووشــیان ببــێ‌و ئیمانیان لەکــەدار بکات، بۆیە دڵیان خۆشــە بە ناســینی خواو خۆشویســتنی، زمــان پــاراون بە زیکــرو پیاهەڵدانی، بە هەمان شــێوە ئەندامانی جەستەیشــیان بــە گوێڕایەڵی کــردن‌و ڕوو تێکردنی.

﴿ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمُ ﴾ واتە: ســڵاوتان لەســەر بێ، ســەلامەت بن لــە هەموو بەڵایەک، بێگومــان پارێــزراو بــوون لــە هەموو ئەوانــەی لێــی دەترســان، ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ لــە بڕوابــوون بــە خــواو گوێڕایەڵــی فەرمانەکانــی، بێگومان کــردەوە هۆکاری ڕاســتەقینەیە بــۆ چوونــە نــاو بەهەشــت‌و ڕزگار بــوون لــە دۆزەخ، ئــەو کــردەوەش بۆیان دەســتەبەر بــوو بــە میهرەبانی‌و منەتــی خوا ﷻ بەســەریانەوە نەک بــە هێزو توانــای خۆیان.

(٣٣-٣٤): ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٣٣ فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٣٤ ﴾:

﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ ﴾ واتــە: خــوا دەفەرمــوێ: ئایــا چــاوەڕوان دەبــن ئەوانــەی ئایــەت‌و نیشــانەکانیان بــۆ دابەزیــوە بڕوانەهێنــن، وە یادبخرێنــەوەو کەڵکــی لێوەرنەگــرن؟! ﴿ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ تــا فریشــتەکان بێنــە لایــان بــۆ ڕووح کێشــانیان، ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَ

أَمۡرُ رَبِّكَ ﴾ یـان سـزای خوایـان لەسـەر پێویسـت بـێ، بێگومـان ئـەوان شایسـتەی ئەو سـزایەن ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ درۆیـان کـردو بێبرواییان کرد، پاشـان بروایان کـرد تـا سـزای خوایـان بەسـەر دابـەزی ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ کاتێـک کە سـزای داون، ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ بێگومـان ئـەو نەفسـە بـۆ بەندایەتـی خـوا ﷻ بەدیهێنـراوە، بۆیـە دەبـێ بگەڕێتـەوە بـۆ لای بەخشـندەیی پەروەردگـاری، بـەڵام ئـەوان سـتەمیان لەوە کـردوە، وازیان لـەوە هێناوە کـە بۆی دروسـتکراوە، وە رووبـەرووی لۆمەو سەرزەنشـتی هەمیشـەیی کراونەتەوە، هەروەهـا بەدبەختـی لێدانەبڕاو ﴿فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ ﴾ واتـە: سـزاو شـوێنەواری کردەوەکانیان ﴿وَحَاقَ بِهِم ﴾ واتـە: دابەزی، ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ بێگومـان ئـەوان ئەگـەر پێغەمبەرانیان هەواڵی سـزایان پـێ بدانایە گاڵتەیـان پێدەکـردن، جـا ئـەوەی گاڵتەیـان پێدەکرد بەسـەریاندا هـاتو پێویسـت بوو.

وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن
شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ
فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ
٣٥ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ
وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ
حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ
كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ٣٦ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَاهُمْ
فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ٣٧
وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ
وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ٣٨
لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا
أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ ٣٩ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ
لَهُ كُن فَيَكُونُ ٤٠ وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا
لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا
يَعْلَمُونَ ٤١ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ٤٢

(٣٥): ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾:

واتە: بتپەرستان مەشیئەتو ویستی خوایان كـردە بەڵگە لەسـەر بتپەرستیەكەیان، خوا ئەگـەر بیویستایە ئـەوان هاوەڵیـان بۆ خوا دانەدەنـا، وە هیـچ شـتێكیان لـە ئاژەڵەكان قەدەغـە نەدەكـرد كـە حەڵاڵـی كردبـوو، وەك: (البحیرة): وشـترێك بـوو پێنـج سـكی بكردایـەو پێنجـەم نێـر بووایـە، ئەو كات گوێیـان لـەت دەكـردو بەرەڵایـان دەكـرد، وە (الوصیلة): (واتـە: وشـترێك بـوو یەكـەمو دووەم سـكی مێینـە بووایە) وە (حـام): (وشـترێكی نێر بوو كە لە پشـتی ئەو دە سـك پەیـدا ببووایـە)، وە هـاو وێنەیان، ئـەم بەڵگەیـەش بەتاڵو بـێ بنەمایـە، بێگومان ئەگـەر هەقو ڕاسـت بووایە سـزای ئەوانـەی پێش ئەوانـی نەدەدا، كاتـێ هاوەڵیـان بۆ دانا، سـزای دان بـە توونترین سـزا، جـا ئەگەر ئـەوەی پێ خـۆش بووایە ئەوانی سـزا نـەدەدا، مەبەسـتیان لـەوەدا تەنها ڕەتكردنەوەی ئەو ڕاسـتیە بوو كـە پێغەمبـەران هێنابوویان، ئەگەرنا ئـەوان دەزانـن لـەوەدا هیـچ بەڵگەیەكیـان بە دەسـتەوە نیە لەسـەر خـوا، بێگومـان خوا ﷻ فەرمانـی پێكـردوونو قەدەغـەی لێكـردوون، وە توانـای پێـداون بـەوەی پێی سـپاردوون، هێـزو تواناو ویستیشـی پێبەخشـیوون بـەو كردەوانەی ئەنجامـی دەدەن، بەڵگـە هێنانەوەیان بـە قـەزاو قـەدەر لـە بەتـاڵ ترینـی بەتاڵەكانـە، هەمـوو كەسـێك بـە هەسـت (الحس) توانـای مـرۆڤ دەزانێ لەسـەر هەمـوو كارێ بیـەوێ، بەبێ ئـەوەی كەسـێك ڕووبەڕووی ببێتـەوە، جـا كۆیـان كردەوە لـە نێوانی بـە درۆ دانانی خـواو بـە درۆ دانانـی پێغەمبەرانیو كاروبـارە عەقڵیەكانو هەسـت پێكـراوەكان، ﴿ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾ واتە: ڕوونو ئاشـكرا كـە بـە دڵەكان دەگـات، وە هیچ كـەس بەڵگـەو حوجەی نامێنی بەسـەر

خـوادا، جـا ئەگـەر پێغەمبـەران پەیامـی پەروەردگاریـان پێ گەیانـدن لە فەرمـانو قەدەغە کراوەکانـی، وە بەڵگـەی قەزاو قەدەریشـیان بـۆ هێنانەوە، ئـەوە هیچ لەسـەر پێغەمبەران نیە لـەو کاروبـارەدا، بەڵکو لێپرسـینەوەیان لـە لای خـوای گەورەیە.

(٣٦-٣٧): ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَاهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا ﴾ خوا ﷻ هـەواڵ دەدات بێگومان بەڵگەی بەجێهێناوە لەسـەر هەمـوو خەڵکـی، هیچ ئوممەتێـک نیە لە پێشـین، یان لە پاشـین، ئیلـلا پێغەمبەرێکی بـۆ نـاردوە، هەموویـان یەک دەنگن لەسـەر یەک بانگـەوازو یەک ئاین، ئەویش پەرسـتنی خـوای تـاکو تەنهایـە، ﴿ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ ئوممەتـەکان بـە پێی بەدەمـەوە هاتـنو بـە دەمـەوە نەهاتن بـوون بـە دوو بەشـەوە: ﴿ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ ﴾ هەندێکیـان خـوا ﷻ هیدایەتـی دان بـە زانسـتو کـردەوە، ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ﴾ وە هەندێکیـان شـوێنی ڕێگـای گومڕایـی کەوتـن، ﴿ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ ﴾ بـە جەسـتەو دڵەکانتـان، ﴿ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ بێگومـان ئێـوە شـتی سەرسـوڕهێنەر دەبینـن، هیچ بـە درۆخەرێک نابینن ئیللا سـەرەنجامی تیاچـوون بووە، ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَاهُمْ ﴾ توانـای خـۆت لـەو بـوارەدا بەکاربێنێـت ﴿ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ ﴾ ئەگـەر هەمـوو هۆکارەکانیش بـەکار بهێنی خوا ﷻ هیدایەتـی نادات، ﴿ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ هیـچ پشتیوانێکیشـیان بـۆ نابـێ لە سـزای خـوا ڕزگاریـان بکاتو بیانپارێزێ.

(٣٨-٤٠): ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی موشـریکەکان، ئەوانـەی پێغەمبەرەکـەی بـە درۆ دەزانـن، بـە ڕاسـتی ئـەوان ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ﴾ واتـە: هەرچـی لـە توانایانـدا هەبـوو سـوێندیان دەخـوارد لەسـەر بـە درۆخسـتنەوەی خـوای مـەزن، کە خـوا ﷻ مـردووەکان زینـدوو ناکاتـەوە، لـە توانایـدا نیـە زیندوویان بکاتـەوە، پاش

ئـەوەی بـوون بە خـۆڵ، خوا ﷻ بـە درۆیان دەخاتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ بَلَىٰ ﴾ (نەخێر وانیـە) بەڵكـو زیندوویـان دەكاتـەوەو كۆیـان دەكاتـەوە لـە ڕۆژێكـدا هیـچ گومانی تێدانیـە، ﴿ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا ﴾ (چونكـە بەڵێنی لەسـەر داوە)و بەڵێنـی خۆی دواناخاتو نایگـۆڕێ)، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ گەورەتریـن نەفامیـان نكوولـی كردنـی زیندووكردنەوەو پاداشـتە.

پاشـان باسـی حیكمەتـی پاداشـتو زیندووبوونەوەی كـردوە، ﴿ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ ﴾ لـە بابەتـە گـەورەو بچووكـەكان، حەقیقەتەكانـی ڕوون دەكاتـەوەو ئاشـكرای دەكات، ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ﴾ كاتـێ كردەوەكانیـان دەبینـن ئاخو حەسـرەت هەڵدەكێشـن، سـوودی پێنەگەیاندن ئەو پەرسـتراوانەی كە دەیانپەرسـتنو هاواریـان پـێ دەكردن، كاتـێ فەرمانـی پەروەردگارت هـات، دەبینن ئەوەی دەیپەرسـتن سـوتەمەنی نـاو دۆزەخـە، مانـگو خـۆر دەكوژێنـەوەو تاریک دەبـن، وە ئەسـتێرەكانیش پـەرشو بڵاودەبـنو هەڵدەوەریـن، وە ئەوەی دەیپەرسـتێ بـۆی ڕوون دەبێتـەوە كە ئەوەش بەنـدەی ژێربـاری خوایـەو هیـچ دەسـەڵاتو توانایەكـی نیـە، لـە هەمـوو بارودۆخەكاندا پێویسـتی بـە خـوا هەیـە، ئـەوەش لە لای خـوا گـرانو قـورس نیـە، بێگومان ئـەو ئەگەر بیـەوێ شـتێ بـكات پێـی دەفەرمـوێ: ببـە، دەسـت بەجـێ ئەویش دەبـێ، بەبـێ بەرگری، بەڵكـو پـڕاو پڕ بـە پێی ویسـتو ئیـرادەی خـوا دەبێت.

(٤١-٤٢): ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾:

خـوا هـەواڵ دەدات بـە فـەزڵو چاكـەی تاقیكـەرەوان، ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ ﴾ واتە: لـە پێناوی خـواداو لەبـەر ڕەزامەندی ئـەو، ﴿ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ ﴾ بـە ئازار مەینەتـی لە لایەن گەلەكانیانـەوە، ئەوانـەی زۆریـان لێدەكـردن بیانگێڕنەوە بـۆ كوفرو هاوبەشـدانان، وڵاتو خۆشەویسـتانیان بەجێهێشـت، وە لێـی گوازرانـەوە، لـە پێنـاو گوێڕایەڵی خـوای میهرەباندا، باسـی دوو پاداشـتی بۆ كردوون:

پاداشـتێک لـە دونیـادا لـە ڕزقی بەرفـراوانو ژیانی پـڕ ئارامی، ئـەوە بوو بە چـاوی خۆیان بینیـان، پـاش ئەوەی كۆچیان كردو سـەركەوتن بەسـەر دوژمنەكانیانـداو وڵاتەكانیان ئازاد كـرد، وە دەسـتكەوتی مەزنیـان بـە دەسـت هێنـا تا پـڕ بـوون، وە لـە دونیادا چاكـەی پێ بەخشین.

﴿ وَلَأَجْرُ ٱلْآخِرَةِ ﴾ ئەوەی خوا ﷻ پەیمانی پێدان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﴿ أَكْبَرُ ﴾ لە پاداشتی دونیا، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾التوبة. (واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە ڕێی خوادا بە ماڵو گیانیان پلەیان بەرزترە لای خوا، وە هەر ئەوانە سەرکەوتوون * پەروەردگاریان مژدەیان دەداتێ بە میهرەبانیو ڕەزامەندی لە لایەن خۆیەوە، هەروەها بەهەشتانێکیان بۆ هەیە نازو نیعمەتی بەردەوامو هەمیشەیی تێدایە * دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی بە ڕاستی خوا پاداشتی هەرە گەورەی لە لایە *).

وە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: ئەگەر زانستو دڵنیاییان هەبووایە بەوەی چ پاداشتێکی گەورە لای خوا هەیە بۆ ئەو کەسەی بڕوای هێناوەو کۆچی کردوە لە پێناو خوادا، هیچ کەس دوا نەدەکەوت.

پاشان وەسفی ئەولیاو دۆستانی کرد جا فەرمووی: ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾ واتە: لەسەر فەرمانو قەدەغە کراوەکانی، وە لەسەر قەزاو قەدەرە بە ئێشەکانو لەسەر ئەزیەتو ناخۆشیەکان تیایدا ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ واتە: پشتی پێدەبەستن لە جێبەجێ کردنی ئەوەی پێی خۆشە، نەک لەبەر خۆیان، بەو شێوەیە کارەکانیان سەرکەوتوو دەبێو بارودۆخیشیان چاک دەبێ، بێگومان ئارامگرتنو پشت بەستن هەوێنی کارەکانن، هەر کەس خێرێکی لە دەست چووبێ تەنها بە هۆی نەبوونی ئارامیو هەوڵنەدانەوە بووە، یان نەبوونی پشت بەستنی بە خوای مەزن.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ
ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ
ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤
أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ
أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ٤٥ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ
فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ٤٦ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ
رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ٤٧ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ
يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ
٤٨ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٩ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ
وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۩ ٥٠ ۞وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ
ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ٥١ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ٥٢ وَمَا بِكُم مِّن
نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ٥٣ ثُمَّ إِذَا
كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ٥٤

**(٤٣-٤٤):** ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا﴾ واتە: تۆ یەکەم کەس نیت لە پێغەمبەران، پێش تۆ فریشتەمان نەناردوە، بەڵکو پیاوانی تەواومان ناردوە نەک ئافرەتان، ﴿نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ لە شەریعەتو یاساو بڕیارەکان، ئەوەش لە فەزڵو چاکەکانێتی بەسەر بەندەکانەوە، بەبێ ئەوەی شتێ بهێنن لە لایەن خۆیانەوە، ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ﴾ خاوەن کتێبەکانی پێشوو، ﴿إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ هەواڵی پێشین، وە گومانتان هەیە: ئایا خوا پیاوی ناردوە؟

پرسیار لە زانایان بکەن لەوبارەیەوە، ئەوانەی زەبوورو چەندین کتێبی ئاسمانیان بۆ دابەزیوە، شارەزای بوونو لێی تێگەیشتوون، بێگومان هەموویان لایان چەسپیوە خوای مەزن ڕەوانەی نەکردوە جگە لە پیاوانێ کە نیگای بۆ ناردوون لە خەڵکی شار، ئەم دەقە بە گشتی بەڵگەی تێدایە بۆ پیاهەڵدانی خاوەن زانست، بەرزترین جۆریشیان شارەزاییە لە کتێبی خوا ﷻ، بێگومان خوا فەرمانی کردوە بەو کەسەی کە نایزانێ لە هەموو کاروبارەکاندا بگەڕێتەوە بۆ لای زانایان، لەو چوار چێوەیدا دادپەروەری دەداتە پاڵ خاوەن زانستو پاک ڕایدەگرێ، بەو شێوەی فەرمانی کردوە لە پرسیارەکاندا بۆ لای ئەوان بگەڕێنەوە، بێگومان بەو جۆرە نەفام ڕزگاری دەبێ لە شوێنکەوتنی ڕێگای خراپ، جا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ئەمینی کردوون لەسەر سرووشو نیگای خۆی، وە ئەوان فەرمانیان پێکراوە نەفسو دەروونی خۆیان پاک ڕابگرنو خۆیان بە سیفەتە تەواوەکان برازێننەوە.

بەڕێزترینی خاوەن زیکر خاوەنو شوێنکەوتەی ئەم قورئانە مەزنەیە، بە ڕاستی ئەوان خاوەن یادو زیکری ڕاستەقینەن، لە پێشترن لە غەیری خۆیان بەم ناوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ ﴾ واتە: ئەو قورئانەی کە باسی هەموو پێویستی بەندەکانی تێدایە لە کاروباری دونیاو دواڕۆژیان، وە دیارو نادیارەکان، ﴿ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ﴾ ئەمە گشتگیرە ڕوون کردنەوەی وشەکانو ئاشکرا کردنی ماناکان لە خۆ دەگرێ، ﴿ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ تیایدا، پاشان دەریبهێنن لە گەنجینەو زانستەکەی، بە پێی خۆ ئامادە کردنو ڕوو تێکردنیان.

(٤٥-٤٧): ﴿ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ ﴾:

ئەمە ترساندنێکە لەلایەن خوای بەرزەوە بۆ بێبڕوایانو بە درۆدانەران، بە جۆرەها سزا بەوەی لە لایەکەوە سزایان تووش بکات کە ئەوان هەستی پێ نەکەن، یان سزا لە سەرەوە بۆیان دابەزێنێ، یان لە ژێر پێیانەوە بە نووقم کردنو لە ناوبردن (وەک قارونو هاوشێوەکانی) یان لە ڕێی سەرقاڵ بوونو گەشت کردنیان بۆ بازرگانی کە هەرگیز سزا بە خەیاڵیاندا نەیەت، یان لە کاتی ترسو چاوەڕوانی کردنی سزادا قار بیان گرێو لە ناویان ببات، ئەوان ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن لە حاڵەتێ لەو حاڵەتانەدا، وەکو ئەوان لە ژێر مشتی خوادان، وە پێشە سەریان بە دەستیەتی، خوا ﷻ بە سۆزو میهرەبانە سزا پێش ناخات بۆ سەرپێچیکاران، بەڵکو مۆڵەتیان پێدەداتو لێیان دەبوورێو رزقو ڕۆزیان دەدات، ئەوانیش سەرپێچیی دەکەنو دۆستەکانیشی نارەحەت دەکەن، لەگەڵ ئەمەدا دەرگای تەوبەو لێخۆشبوونیان بۆ دەکاتەوە، بانگیان دەکات بۆ خۆدارنین لە تاوانو گوناه کە زیانی هەیە بۆیان، وە پەیمانیان پێدەدات بە میهرەبانیو لێبوردن لەو گوناهانەی کە کردوویانە، دەی با سەرکێشو کەللەڕەق شەرم بکات لە پەروەردگاری، کە نازونیعمەتەکانی خوا لە هەموو چرکەو ساتێکدا دادەبەزێ بەسەریدا، لە بەرانبەردا گوناهی ئەویش لە هەموو کاتەکاندا بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان، وە با بزانێ بە ڕاستی خوای زاڵ مۆڵەتی دەداو پشت گوێی ناخات، بێگومان ئەگەر سەرپێچیکار بگرێ دەیگرێ بە گرتنی خاوەن هێزێ بە توانا، جا با داوای لێبوردنی لێبکات، وە لە هەموو کاروبارەکانیدا بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، چونکە بە ڕاستی ئەو لێبوردەو بە بەزەییە.

پەلــە بکەن بــۆ بەدەســتهێنانی ڕەحمەتو بەزەیــی بەرفراوانــی خوا، وە چاکەی گشــتگیری، تەنهــا ئــەو ڕێگایــە بگرێتــە بەر کــە دەیگەیەنێ بــە فەزڵــی پەروەردگاری بە ســۆز، ئەویش تەقــواو خۆپارێزیــە، وە ئــەو کردەوەیەیە کە خۆشــی دەوێو پێــی ڕازیە.

(٤٨-٥٠): ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

خوا دەفەرمــوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ ﴾ واتە: ئەوانەی گومانیان لە یەکتاپەرســتیو مەزنیو تەواوی پەروەردگاریــان هەیــە، ﴿ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ ﴾ واتــە: بۆ ســەرجەم دروســتکراوەکانی، وە چــۆن ســێبەرەکەی دەگــۆڕێ، ﴿ عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴾ لە ڕاســتەوە بۆ (چــەپ)، ﴿ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ ﴾ واتــە: هەموویــان ســوژدە بــۆ پەروەردگاریــان دەبــەن، ملکەچــی مەزنــیو گەورەیــی ئــەون، ﴿ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴾ واتــە: زەلیلــن لە ژێــر ڕامکردنــی بەڕێوەبردنــی خوادا، هیچ کەســێکیان نیە ئیــلا نێو چاوانی بە دەســتی خوایــە، ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ ﴾ واتــە: لــە گیاندارە قســەکەرەکانو بێدەنگــەکان، ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ وە فریشــتە بەڕێــزەکان، تایبەتــی کــردوون پاش بە گشــتی بــوون لە بەر ڕێــزو کەرامەتو زۆری بەندایەتــی کردنیان.

بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ لــە زۆری عیبــادەت کردنــدا، وە مەزنــی ڕەوشــتو هێزو توانایــان، وەک خوا دەفەرمــوێ: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ النســاء، (واتــە: هەرگیــز مەســیح لاری نیە لەوەی بەنــدەی خــوا بــێ، هەروەهــا فریشــتە نزیکەکانیش).

﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾ کاتــێ وەســفو پیاهەڵدانــی کــردن بە گوێڕایەڵــیو ملکەچی، وەســفی کــردن بــە ترســان لــەو خوایــەی لەســەریانەوەیە بــە خــودای زاڵ، وە تــەواوی وەســفەکان، ئــەوان زەلیلن لــە ژێر دەســەڵاتی زاڵی ئــەودان، ﴿ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ واتە: هەر شــتێکیان پێ بســپێردرێ بە ویســتو حــەزی خۆیــان جێبەجێی دەکەن. ســوژدە بردنی دروســتکراوەکان بــۆ خــوا دوو جۆرە:

ســوژدە بردنــی ناچــاری، ئەمــە بەڵگەیــە لەســەر تەواوێتــی ســیفەتەکانی خــوا ﷻ، ئەمــە گشــتگیرە بــۆ هەمــوو بەدیهێنــراوەکان لــە بــڕوادارو بێبــڕواو چــاکو خــراپو گیانداری قســەکەرو جگــە لەوانیــش.

سـوژدە بردنی ویسـتو ئـارەزوو: تایبەتە بە ئەولیاو دۆسـتو بەنـدە بڕوادارەکانـی خواوە، لە فریشـتەو جگـە لەوانیش لە دروسـتکراوەکان.

(٥١-٥٥): ﴿ وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ۚ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾:

﴿ وَقَالَ اللَّهُ ﴾ خوا ﷻ فەرمان دەکات بە عیبادەت کردنی بە تاکو تەنها، وە بەڵگە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە بە تاکو تەنهایی بە نازو نیعمەتەکانیو یەکتاناسی، جا فەرموویەتی: ﴿ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ﴾ واتە: شەریک بۆ خوا دادەنێن لە پەرستراوێتیدا، وە ئەو (واتە: خوا) ﴿ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾ تاکو تەنهایە لە وەسفە مەزنەکاندا، تاکە لە هەموو کردەوەکانیدا. هەر وەکو چۆن تاکە لە زاتو ناوو سیفەتو کردەوەیدا، با لە بەندایەتیشدا بە تاک بپەرسترێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴾ واتە: لە من بترسنو فەرمانەکانی من بەجێ بهێننو دوور بکەونەوە لە قەدەغەکراوەکانم، بەبێ ئەوەی هاوەڵم بۆ دابنێن لە دروستکراوەکاندا، بێگومان هەموو ئەوانە موڵکو ژێر دەستەی خوان.

﴿ وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ﴾ واتـە: ئاییـنو بەندایەتـیو زەلیلـی لە هەموو کاتەکانـدا، بـۆ خـوای تـاکو تەنها، لەسـەر خەڵکی پێویسـتە بە دڵسـۆزی خوا بپەرسـتنو خۆیـان برازێننـەوە بـە عیبـادەت کردنـی، ﴿ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ﴾ (واتـە: ئایا ئێـوە غەیری خـوا دەپەرسـتن) لـە خەڵکـی سـەر زەویو ئاسـمانەکان، بێگومـان ئـەوان هیـچ سـوودو زیانێکیـان بە دەسـت نیە، تەنهـا خوا لە بەخشـینو چاکە تەنیایـە، ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ ﴾ ئاشـکراو نادیـار ﴿ فَمِنَ اللَّهِ ﴾ هیـچ کەس بەشـدار نابێ تیایـدا ﴿ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ ﴾ لـە هـەژاریو نەخۆشـیو ناڕەحەتـی ﴿ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴾ واتە: پەناو هـاوارو پاڕانـەوە هەر بـۆ لای ئـەو دەبـەن، چونکـە کـەس ناتوانـێ زیـانو ناڕەحەتی لاببـات جگە لە خـوا نەبێ، ئـەو کەسـە تـاکو تەنهایـە بـە پێدانو بەخشـینی ئـەوەی حـەزی لێدەکـەن، وە ئەوەشـی حـەزی لێناکـەن لێتانـی دوورخسـتوەتەوە، عیبـادەتو بەندایەتـی نادروسـتە تەنهـا بۆ خوا نەبـێ، بەڵکـو زۆری لـە خەڵکـی سـتەم خۆیـان دەکـەنو ئینـکاری چاکەکانـی خـوا ﷻ دەکـەن بەسـەریانەوە، کاتـێ ڕزگـاری کـردن لـە ناڕەحەتـی، دوایی لـە حاڵەتی خۆشـیدا هەنـدێ لـە بەدیهێنـراوە هەژارەکانـی دەکـەن بە هـاوەڵ، بۆیـە فەرموویەتی:

لِيَكْفُرُوا بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (٥٥) وَيَجْعَلُونَ
لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ تَاللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ
تَفْتَرُونَ (٥٦) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ
(٥٧) وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨)
يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ
أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ (٥٩) لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ
بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
(٦٠) وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ
وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ
سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ (٦١) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ
أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ
وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ (٦٢) تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ
فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ (٦٣) وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ
ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٦٤)

﴿لِيَكْفُرُوا بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ (واتـە: لەبـەر ئەوە ناشـكوری) ئـەو نـازو نیعمەتانە بکەن پێمانـداون، کاتێـک ڕزگارمـان کـردن لە نارەحەتیو ناسـۆریو لە کۆڵمـان کردنەوە ﴿فَتَمَتَّعُوا﴾ بـۆ خۆتـان لەم دونیـا کەمەدا ڕابوێـرن ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (واتـە: جـا دوایـی دەزانـن) سـەرەنجامی بێبڕواییتان.

(٥٦-٦٠): ﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ تَاللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ (٥٦) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ (٥٧) وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨) يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ (٥٩) لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (٦٠)﴾

﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ تَاللَّهِ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی نەفامـی هاوبەش دانەرانو سـتەم کردنیـانو درۆ هەڵبەسـتنیان بە دەم خـوای مەزنەوە، ئەوان بەشـێکیان لـە ڕزقو ڕۆزی خـوا ﷻ کە پێـی دابوون دادەنا بـۆ بتەکانیان کە هیـچ نازاننو سـوودو زیانیـان نیـە، بە ڕزقو بژێـوی خوا هاوەڵیـان بۆ خـوا دادەنا، وە خۆیـان پێ نزیک دەکـردەوە کـە تاشـراون، هـەروەک خـوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُوا هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ (١٣٦)﴾ الأنعام.

﴿لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ﴾ واتـە: (سـوێند بـە خـوا بەرانبـەر ئـەو درۆ هەڵبەسـتانە پرسـیارتان لێدەکـرێ)، وە پێتـان دەوتـرێ: ﴿ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ (٥٩) وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ (٦٠)﴾ یونس.(واتـە: ئایا خـوا مۆڵەتی ئـەوەی پێـداون یـان درۆ دەکـەن بـە نـاوی خـواوە * وە گومانـی ئەوانـە چیـە کـە درۆ هەڵدەبەسـتن بـە دەمـی خـواوە لـە ڕۆژی دوایدا).

جـا خـوا لەسـەر ئـەوە توندترین سـزایان دەدات، ﴿ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ ﴾ کاتێک کە دەربـارەی ئـەو فریشـتانەی بەندایەتـی خـوا دەکەنو لێیـەوە نزیکـن وتیان: ئەوانـە کچانی خـوان ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ ﴾ پاکـیو بێگـەردی بـۆ خـوا ﴿ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ ﴾ واتە: ئـەوەی بۆ خۆیـان پێیـان خۆش بوو لـە نێرینە دەیـان داوە پـاڵ خۆیان، تەنانـەت بە توندترین شـێوە رقیـان لـە ئانـرەت دەبوویەوە، جـا کەسـێکیان دەیـوت: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا ﴾ لـەو خـەمو خەفەتەی تووشـی دەبـوو، ﴿ وَهُوَ كَظِيمٞ ﴾ دەروونـی بەرانبەر بـە خـوا پڕ بوو لـە بێتاقەتـیو تووڕەیی، کاتێک کـە مژدەی بـە مێینە پێ بدرایـە، تەنانەت ئـەو ڕیسـوا دەبـوو لـە لای هاوشـانەکانی، لـە ناخۆشـیو خراپی ئـەو مژدەیەدا لـە خەڵک خـۆی دەشـاردەوە حـەزی نەدەکـرد بیبینـن، پاشـان بـە بۆچوونـی خـراپو بۆگەنی خۆی ئـەو کچـەی کە مـژدەی پێـدراوە بەسـەریدا دەهێنـا، ﴿ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ ﴾ واتـە: وازی لێبهێنـێو نەیکـوژێ، بە سـووکیو شـەرمەزاری بە خێوی بـکات، ﴿ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِ ﴾ واتـە: زینـدە بـە چاڵی بـکات، ئـەوەش بریتیە لە (الـوأد) زینـدە بە چاڵ کـردن کە خوا ﷻ سەرزەنشـتی بتپەرسـتانی لەسـەر کـردوە ﴿ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴾ بـە شـێوەیەک وەسـفی خوایـان کـرد شایسـتەی ئەو نیـە لـەوەی منداڵیـان دایـە پاڵی.

پاشـان بەوەشـەوە نەوەسـتان، تا خراپترینی ئـەو دوو ڕەگەزەیان داوە پاڵـی، ئەویش مێینەیە، ئەوانـەی بـە بوونی خۆیـان بە شـەرمەزار دەزانیو حەزیان لـێ نەدەکرد، جا چـۆن دەیانداوە پـاڵ خوای بـەرز؟! خراپتریـن حوکم حوکمی ئـەوان بوو.

لـە کاتێکـدا ئەمەش هاو وێنەی ئـەو خراپانە بـوو دوژمنە هاوبەش دانـەرەکان دەیانداوە پاڵـی، خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوۡءِ ﴾ وێنـەی ناتەواوو عەیبـی تەواویـان تێدایـە، ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾ بریتیە لـە هەموو سـیفەتێکی کەماڵو تـەواو، هەمـوو تەواویەک لـە بوونـەوەردا شایسـتەیە بە خوا، بەبـێ هیـچ ناتەواویەک، وەسـفی بـەرزو بڵنـد تەنهـا هـەر بـۆ خوایە لـە دڵـی دۆسـتو ئەولیاکانیـدا، بە ڕاسـتی ئـەوە بـە مەزندانـانو بەرزدانانـە، وە خۆشویسـتنو ملکـەچ بـوونو ناسـینە، ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ کـە باڵادەسـتە بەسـەر هەمـوو شـتەکاندا، هەمـوو بەدیهێنـراوەکان ملکەچی ئـەون ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ ئـەوەی شـتەکان لە جێگـای خۆیدا دادەنـێ، هیچ فەرمـانو قەدەغە کردنـێ نـاکات ئیللا سـوپاسو سـتایش دەکرێ لەسـەری، وە وەسـفی دەکرێ لەسـەر تـەواوی تیایدا.

(٦١): ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾:

کاتێ باسی درۆ هەڵبەستنی ستەمکارانی کرد، باسی تەواوی لەسەر خۆیی‌و ئارامگرتنی کرد، جا فەرمووی: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم ﴾ بێ زیادو کەم، ﴿ مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾ واتە: ئەوانەی کە سەرپێچیان دەکردو غەیری وانیش لە ناو دەچوون، لە جۆرەها گیانداری تر، چونکە غەرایی‌و شوومی گوناە کێڵگەو وەچە لە ناو دەبات، ﴿ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ ﴾ لە پێش خستنی سزا بەسەریاندا تا ئاکامی دیاری کراو، ئەویش رۆژی دواییە، ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾ با ئاگاداربن، چونکە لە کاتی مۆڵەت پێدانـدا، پێش ئەوەی ئەو کاتە بێت هیچ مۆڵەتێک نامێنێ.

(٦٢-٦٣): ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات بێگومان هاوبەش دانەران ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ ﴾ لە کچان، وە لەو وەسفە ناشرینانە کە بریتیە لە شەریک دانان، وەک ئەوەی شەریکی بۆ دادەنێن کەچی خۆیان لە شەریک رادەکەن، -لە کاتێکدا ئەوانەش دروستکراون لە رەگەزی خۆیان، دەی چۆن بەندەکانی دەکەن بە شەریک بۆ خوا ﷻ؟!- لەگەڵ ئەو هەموو خراپەکاریی‌و هەڵسوکەوتە ناشرینەیاندا، ﴿ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ ﴾ واتە: بێگومان پاشەڕۆژی چاک لە دونیاو دوارۆژدا بۆ ئەوان هەیە، خواش وەڵامی داونەوە بە فەرمایشتی خۆی، دەفەرموێ: ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴾ (واتە: بێگومان ئەو قسەیان راست نیە)، لە پێش هەموانەوە پێش دەخرێن بۆ دۆزەخو تیایدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

خوا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ روونکردۆتەوە کە ئەو یەکەم پێغەمبەر نیە بە درۆ دانرابێ، جا فەرموویەتی: ﴿ تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ واتە: پێغەمبەرانێک بانگیان دەکردن بۆ یەکتاپەرستی ﴿ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾ (واتە: شەیتانەکان کردەوە خراپەکانیانی لە لا شیرین کردن)، ئنجا پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، وایان دەزانی ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن رزگاریان دەکات لە هەموو ناخۆشیەک، وە ئەوەی پێغەمبەران بانگەشەی بۆ دەکەن پێچەوانەی ئەوەیە، کاتێ کە شەیتان کارو کردەوەکانی لە لا

شـیرین كـردن، بوو به دۆسـتو پشـتیوانیان لـه دونیادا، جـا ئه‌وانیـش گوێرایه‌ڵیـان كردو شـوێنی كه‌وتـنو پشـتیوانیان لێكـرد، (وه‌ك خـوا ده‌فه‌رمـوێ:) ﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف. (واتـه: ئایـا ئێـوه ئـه‌ی ئاده‌میـزاد شـه‌یتانو نه‌وه‌كانـی ده‌كه‌نه دۆسـتو پشـتیوانی خۆتـان له‌ جیاتـی من، له‌ كاتێكـدا ئـه‌وان دوژمنی ئێـوه‌ن، ئـای چ گۆڕینه‌وه‌یه‌كـی خراپه‌ بۆ سـته‌مكاران).

﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ واتـه: لـه‌ دواڕۆژدا كاتـێ كه‌ پشـتیان كـرد لـه‌ په‌روه‌ردگاری به‌زه‌ییان، وه‌ ڕازی بوون به‌ پشـتیوانی شـه‌یتان، ئه‌وسـا شایسـته‌ی ئه‌وه‌ بوون سـزای به‌ ئێش بدرێن.

(٦٤): ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾:

(واتـه: وه‌ ئێمـه‌ قورئانمـان نه‌ناردۆته‌ خـواره‌وه‌ بۆت مه‌گه‌ر بـۆ ئه‌وه‌ی ڕوونـی بكه‌یته‌وه‌ بۆ خه‌ڵكـی، ئـه‌وه‌ی كه‌ تێیدا جیـاواز بوون، وه‌ تـا ڕێنمایـیو میهره‌بانیش دێت بۆ كه‌سـانێك كه‌ بـڕوا بێنن)[٣].

---

٣- ئه‌م ده‌قه‌ ڕاڤه‌ نه‌كراوه‌ به‌ كورتی ئاماژه‌مان پێكردوه‌. وه‌رگێڕ.

وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٍ يَسۡمَعُونَ ٦٥ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةًۖ نُّسۡقِيكُم
مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ
٦٦ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرًا وَرِزۡقًا
حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٍ يَعۡقِلُونَ ٦٧ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ
أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ٦٨ ثُمَّ
كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا
شَرَابٌ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٍ
يَتَفَكَّرُونَ ٦٩ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ
أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٖ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ٧٠
وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلرِّزۡقِۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ
بِرَآدِّي رِزۡقِهِمۡ عَلَىٰ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَهُمۡ فِيهِ سَوَآءٌۚ أَفَبِنِعۡمَةِ
ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٧١ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا
وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ٧٢

**(٦٥):** ﴿ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٍ يَسۡمَعُونَ ٦٥ ﴾:

**(واتـە: بـۆ خەڵکانـێ کـە گـوێ بـۆ) ئامۆژگـاریو یادخسـتنەوەکانی خـوا ﷻ دەگـرن، جـا ئـەوە دەکـەن بـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی خـوا ﷻ تـاکو تەنهایـە لـە پەرسـتندا، وە بەندایەتـی هیـچ کـەس دروسـت نیـە تەنهـا ئـەو نەبـێ، چونکـە هــەر ئــەو ڕزقو ڕۆزی دەبەخشــێ بــە دابارینـی بـاران، وە سـەوز کردنـی هەموو جــۆرە گژووگیــاکان، لەبــەر ئــەوەی خــوا دەســەڵاتی تــەواوی هەیــە بەســەر هەمــوو شــتەکاندا، وەک چــۆن زەوی زینـدوو دەکاتـەوە پـاش مردنـی، بـە توانایـە لەسـەر زیندووکردنـەوەی مـردووەکان، وە ئـەو کەسـەی ئـەم چاکەیـەی بـڵاو کردۆتـەوە خـاوەن بەزەییەکـی بەرفـراوانو بەخشـندەییەکی مەزنـە.**

**(٦٦-٦٧):** ﴿ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةًۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ٦٦ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرًا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٍ يَعۡقِلُونَ ٦٧ ﴾:

**﴿ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾ واتـە: کـە ژێـر بـاری کـردوون بـۆ سـوودو قازانجتـان، ﴿ لَعِبۡرَةً ﴾ دەیکـەن بـە بەڵگـە بەسـەر تـەواوی دەسـەڵاتی خـواو بەرفراوانـی چاکەکانـی، لـەوەی لـە نـاو سـکیدایە لـە نێـوانو نـاو سـکیو خوێنـدا شـیرێکی پاکو خاوێنتـان پـێ دەنۆشـی کـە زۆر بـە چێـژوو بەتامـە، سـوود بەخشـە بـۆ جەسـتە، ئەمـە توانـاو دەسـەڵاتی خوایـەو شـتێکی ئاسـاییو سروشـتی نیـە، چ شـتێک لـە سروشـتدا دەتوانـێ ئـەو پـووشو پەڵاشـەی ئـاژەڵ دەیخـوات لەگـەڵ ئـەو ئـاوە سـوێرەدا بیـکات بـە شـیرێکی پـاکو خاوێـن بـۆ خواردنـەوە؟**

خـوا ﷻ دایناوە بـۆ بەندەکانـی لـە بەرووبومـی میـوەی دار خورمـاو تـرێ کـە سـوودو بەرژەوەنـدی مرۆڤەکانـی تێدایـە بـە جۆرەهـا شـێوە دەیخـۆنو دەیخۆنـەوە، بـە تـەڕیو بـە وشـکی بـە حـازرو هەڵگیراوەیـی، بـە خـواردنو خواردنـەوە کـە ئاوەکـەی دەگرنـەوە، وە ئەرەقـی لێدەگرنـەوە کـە لـە پێشـدا حـەڵاڵ بـوو، دواتـر ئاینـی پیـرۆزی ئیسـلام حەرامـی کـردو وە لـە جیاتیـدا شـتە پاکەکانـی لـە شـوێن دانـا، وەک: سـرکەو مێـوژو جۆرەهـا خواردنـەوەی بـە تـامو بەلـەززەت، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ (واتـە: بێگومـان لـەوەدا بەڵگـەو نیشـانە هەیـە بـۆ خەڵکێـک کـە تێبگـات) لە تـەواوی توانـای خـوا ﷻ کاتـێ کـە لـەو دارانـەی دەشـوبهێن بـە سـووتەمەنی میوەیەکـی پـاکو خاوێـنو بـە لەززەتـی دەرهێنـاوە، لـە بەرفراوانـی ڕەحمەتـی خـوا ئەوەیـە کـە گشـتگیری کـردوە بـۆ بەندەکانـیو ئاسـانی کـردوە بۆیـان، بـە ڕاسـتی ئەو پەرسـتراوی تـاکو تەنهایـەو هاوبـەشو هاوشـانی نیـە لـە بەدیهێنانـدا.

(٦٨-٦٩): ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾:

لـە دروسـتکردنی ئـەم مێـش هەنگـە بچووکـەدا کـە خـوا هیدایەتـی داوە بـەم هیدایەتـە سەرسـووڕ هێنـەرە، وە لەوەڕگـای بـۆ ئاسـان کـردوە، پاشـان گەڕانـەوەی بـۆ ماڵەکـەی، دیـارە ئـەوەش بـە فێـر کـردنو ڕێنمایـی خواییـە بـۆی، پاشـان ئـەم هەنگوینـە بـە چێـژوو بـە تامـە لـە سـکی ئـەو هەنگانـە دێتـە دەر، کـە ڕەنگەکانـی جیـاوازن بـە پێـی جیـاوازی ئـەرزو لەوەڕگاکـەی، شـیفای تێدایـە بـۆ خەڵکـی لـە جۆرەها نەخۆشـی، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر تـەواویو چاودێـری خـوای گـەورە، وە تـەواوی بەزەیـی بـە بەندەکانـی، ئـەو خوایـەی کـە نابـێ جگـە لـەو کەسـیتر خـۆش بویسـترێ، وە جگـە لەویـش هـاواری پـێ بکـرێ.

(٧٠): ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ ﴾:

﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ وَمِنكُم مَّن ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات بێگومـان ئـەو بەندەکانـی بەدیهێنـاوەو گواسـتویانیەتەوە قۆنـاغ لـە دوای قۆنـاغ، پاشـان دوای ئـەوەی ئاکامیـان تـەواو دەبـێ دەیانمرێنـێ، هەیانـە تەمەنـی درێـژ دەکات هەتـا ﴿ يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ ﴾

بۆ تەمەنی پیریی، مرۆڤ لەو تەمەنەدا تووشی لاوازی دەبێ لە دەرەوەو ناوەوە، تەنانەت عەقڵیشی کە جەوهەری مرۆڤە لاواز دەبێ، تەنانەت ئەوانەی بیر دەچێتەوە کە پێشتر زانیویەتی، عەقڵو هۆشی وەک عەقڵی منداڵی لێدێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ واتە: زانستو توانای دەوری هەموو شتەکانی داوە، لەوانەش گواستنەوەی مرۆڤ لە قۆناغەکانی دروستکردندا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾﴾الروم، (واتە: خوا زاتێکە ئێوەی دروستکردوە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو منداڵی)، پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردوون (بوون بە لاو) لە دوای بەهێز کردنتان لاوازو پیری کردن، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات، وە هەر ئەوە زاناو بە توانایە).

(٧١): ﴿وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾﴾:

﴿وَٱللَّهُ﴾ ئەمەش لە بەڵگەکانی یەکتاپەرستیەتیو، ناشرین کردنی هاوبەش دانانە بۆی، خوا ﷻ دەفەرموێ: وەک چۆن ئێوە شەریکن بەوەی دروستکراونو ڕزقو ڕۆزی دراون، بەلام خوای بەرز ﴿فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ﴾ هەندێکتانی بە ئازاد داناوە خاوەن ماڵو موڵکو سەروەتن، وە هەندێکی دیکە کۆیلەو ژێر دەستەی ئەوانن، لە دونیادا هیچ شک نابەن، وەک چۆن گەورەکانیان ئەوانەی خوا ﷻ فەزڵی داون بەسەریاندا بە ڕزقو ڕۆزی ﴿بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾ (واتە: گەورەکانیان) ئامادە نین بەشی کۆیلەکانیانی لێ بدەنو شەریکیان بکەنەوە، جا ئیتر چۆن دەبێ ئەوان بتەکانو هاوبەشەکان بکەنە شەریکی خوا؟! ئایا ئەمە مەزنترین ستەم نیە، وە ئینکاری نیە لە نیعمەتەکانی خوا؟!! بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾، ئەگەر دانیان بە نیعمەتەکاندا بنایەو بیاندایەتە پاڵ خوا، هەرگیز هاوبەشیان بۆی دانەدەنا.

(٧٢): ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَـٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾﴾:

﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً

﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات لـە منەتی گەورەکانـی بەسـەر بەندەکانیەوە، کاتـێ هاوسـەری پێـداون تـا لـە پاڵیـدا بحەسـێنەوە، وە لـە هاوسـەرەکانیان منداڵـی بـۆ دانـاون کـە چاوەکانیـان پێـی بگەشـێتەوەو خزمەتیـان بکـەنو ناتەواویەکانیـان پـڕ بکەنـەوە، وە لـە زۆر لایەنـی تـرەوە سـوودیان لـێ ببینـن، ڕزقو ڕۆزی داون لـە خواردەمەنیـە پاکـەکان، ئـەو نیعمەتـە دیارانـەی کـە لـە توانـای مرۆڤـدا نیـە بیانژمێرێ، ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتـە: ئایـا بتپەرسـتان (دوای ئـەو هەمـوو نیعمەتانـە) بـە بەتـاڵو پـڕو پـووچ بـڕوا دەکـەن کـە نـاوی لـە ناوانـدا نەبـووە، پاشـان خـوا هێناویەتیـە بـوون، نەدەتوانـێ دروسـت بـکات، نەدەتوانـێ ڕزقو ڕۆزی بـدات، وە نـە دەتوانـێ هیـچ کاروبارێـک بەڕێـوە ببـات، ئەمـە گشـتگیرە لـە هەمـوو ئەوانـەی کـە دەپەرسـترێن جگـە لـە خـوای بـەرز، هەمـوو ئەوانـە پووچـن، جـا چـۆن هاوبـەش دانـەران جگـە لـە خـوا دەیانپەرسـتن؟!!

﴿ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴾ نکوولـی دەکەن، وە پشـتی پێدەبەسـتن لەسـەر سـەرپێچیو بێبڕوایـی پێـی، ئایـا ئەمـە ئەوپـەڕی سـتەمو تـاوان نیـە، وە ئەوپـەڕی گەمژەیـی نیە؟!

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ
إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا
مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا
فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا هَلْ يَسْتَوُۥنَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ
أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ
أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ
بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ
ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾
وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا
وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ
مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾

**(٧٣-٧٦):** ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا هَلْ يَسْتَوُۥنَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی نەفامی هاوبەش دانەرانو ستەم کردنیان، ئەوان جگە لە خوا پەرستراوی دیکە دەکەن بە شەریکو هاوبەش، لە کاتێکدا ئەوانە خاوەنی هیچ نین لە ئاسمانەکانو زەوی، ناتوانن باران ببارێننو ڕزقو ڕۆزی بدەن، وە ناتوانن گژوو گیای سەر زەوی سەوز بکەن، ئەگەر بیانەوێو ئیرادەی بکەن ناتوانن، بێگومان ئەگەر کەسێک خاوەن موڵکیش نەبێ، هەندێ جار دەکرێ کەسێ داوای شتێکی لێ بکات بە پێی توانای خۆی پێی ببەخشێ، بەڵام ئەوانەی کە دەپەرسترێن هیچیان بەدەست نیەو هیچیشیان لە توانادا نیە، ئەمە سیفەتی پەرستراوەکانیانە، چۆن لەگەڵ خوادا دایاناون وەک یەک، وە لێکیان چواندوە بە خاوەنی زەویو ئاسمانەکان، کە خاوەن هەموو موڵکو دەسەڵاتێکو، هەموو ستایشێکو هێزو توانایەکە؟!

بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ﴾ (واتە: جا ئیتر ئێوە نموونەو شەریک بۆ خوا مەهێننە ئاراوە) کە یەکسانی نێوان ئەوو دروستکراوی لە خۆ بگرێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: بێگومان خوا دەزانێو ئێوە نازانن) پێویستە لەسەرمان قسەی لەسەر نەکەین بەبێ زانیاریی، وە گوێبگرین لەو نموونانەی کە خوای زانا بۆمان دەهێنێتەوە، لەبەر ئەمە خوا ﷻ دوو نموونە دەهێنێتەوە بۆ خۆیو بۆ ئەوەی کە دەپەرسترێ غەیری ئەو.

یەکەمینیان: بەندەیەک توانای هیچ شتێکی نەبێ، واتە: کۆیلەیەو خاوەنی خۆی نیە، لەم دونیایەدا هیچ موڵکو ماڵێکی نەبێ.
دووەمینیان: ئازادو دەوڵەمەندە، خوا ڕزقو ڕۆزیەکی چاکی پێداوە لە هەموو جۆرەکانی سەروەتو سامان، ئەو بەخشندەیەو حەزی لە چاکەیە، بە ئاشکراو نهێنی لێی دەبەخشێ، ئایا ئەمەو ئەوە دەبن بە یەک؟ بە هیچ شێوەیەک نابن بە یەک، لەگەڵ ئەوەدا هەردووکیان دروستکراون مەحاڵو ئەستەمە وەک یەکتر وابن.
ئەگەر ئەو دووانە یەکسان نین، چۆن دروستکراوێکی بەندە کە هیچ موڵکو هێزو توانایەکی نیە، بەڵکو هەژارە لە هەموو ڕووەکانەوە، بە پەروەردگاری بەدیهێنەری خاوەن موڵکو دەسەڵاتی ڕەها بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکاندا، بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، ئا لەبەر ئەمە ستایشی خۆی کردوە، وە ستایشکراوە بە هەموو جۆرەکانیەوە، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ وەک ئەوە وایە بوترێ: ئەگەر بەو شێوەیەیە ئەی بۆ بتپەرستان پەرستراوەکانیان لەگەڵ خوادا یەکسان کرد؟ فەرمووی: ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئەگەر ئەوان حەقیقەتی زانستیان بزانیبایە، ئەوە هاوبەشیان بۆ خوا دانەدەنا.
نموونەی دووەم: نموونەی ﴿ رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ ﴾ (دوو پیاو، یەکێکیان) لاڵە نە دەبیستێو نە قسە دەکات، ﴿ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾ نە زۆرو نە کەم، ﴿ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ ﴾ بووەتە بار بەسەر خاوەنەکەیەوە، ئەو ناتوانێ خزمەتی خۆی بکات، ئەو ناتەواوە لە هەموو ڕوویێکەوە، ئایا ئەمە لەگەڵ ئەو کەسەدا یەکسانە کە فەرمان بە دادپەروەری دەکاتو لەسەر ڕێگای ڕاستە، وە قسەکانی دادپەروەیەو کردەوەکانی ڕێکو پێکە، وەک چۆن ئەو دووانە یەکسان نین، بە هەمان شێوە یەکسان نیە ئەو بەندایەتیەی دەکرێ بۆ جگە لە خوا، لە کاتێکدا ئەو دەسەڵاتی بەسەر بەرژەوەندی خۆیدا ناشکێتەوە، ئەگەر خوا یارمەتی نەدات ئەو ناتوانێت بە بەرژەوەندی خۆی هەستێ، هاوشانی ئەو کەسە نیە کە تەنها هەقو ڕاستی دەڵێ، وە هیچ کارێک ناکات مەگەر لەسەر ئەو کارە ستایش دەکرێ.
(٧٧): ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ ﴾:
﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ واتە: خوای بەرز تاکە لە پەنهانیەکانی ئاسمانو زەوی، هیچ کەس لە شاراوەو نهێنیەکان نازانێ بێجگە لەو، لە چوارچێوەی ئەوانەشدا هاتنی ڕۆژی دوایی، کە هیچ کەس نازانێ کەی دێ جگە لە خوا ﷻ، ئەگەر هاتوو ئاشکرابێو

دەربکەویٚ، کە دەرناکەویٚ ﴿ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ﴾ (واتە: ئەوەندە خێرایە بە قەد چاوتروکانێکە، یان لە خێراییدا لەویش نزیکترە)، خەڵکی لە گۆڕەکانیان هەڵدەستنەوە بۆ لێپرسینەوە، وە هەموو ئەو هەڵو فرستانە لە دەست دەچن بۆ ئەو کەسانەی کە کەمتەرخەمیان نواندووە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ زیندوو کردنەوەی مردوو شتێکی (ئاساییەو) سەرسوورهێنەر نیە لە تواناو دەسەڵاتی خوادا.

(٧٨): ﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾:

﴿ وَٱللَّهُ ﴾ واتە: تاکو تەنهایە بەم نیعمەتانە، کاتێ، ﴿ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴾ (واتە: لە منداڵدانی دایکتاندا دەری هێناون، ئەوکات هیچ شتێکتان نەدەزانی)، وە دەسەڵاتتان بەسەر هیچ شتێکدا نەبوو، پاشان ئەو ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ﴾ ئەم سێ ئەندامەی تایبەت کردوە، لەبەر شەرەفو ڕێزیان چونکە کلیلی هەموو زانستێکن، زانست ناگات بە مرۆڤ تەنها بە یەکێک لەم سێ دەرگایە نەبێ، ئەگەرنا سەرجەم ئەندامانی جەستە، وە هێزی ئاشکراو ناوەوە خوا پێی بەخشیون، وە هەر ئەو نەشو نمای پێدەکات، قۆناغ بە قۆناغ تا دەگەن بەو حاڵەتە شایستەیە بۆیان، دیارە ئەویش لەبەر ئەوەیە شوکرانە بژێری خوا بکەن، بە بەکارهێنانی ئەو ئەندامانەی خوا پێی داون لە گوێڕایەڵی ئەودا، هەر کەسێ بەکاری بهێنێ لە غەیری ئەوەدا ئەوە دەبێتە حوججەو بەڵگە بەسەریەوە، وە بە ناشرینترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ نیعمەتەکاندا کردوە.

(٧٩): ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾:

واتە: چونکە ئەوان سوودیان لە ئایەتو نیشانەکانی خوا وەرگرتوە، وە بیریان لێدەکەنەوە، بەڵام جگە لەوان بێگومان تێڕوانینیان تێڕوانینێکی گاڵتەجاڕیو بێ ئاگاییە، وەک لە ئایەتەکە دایە.

بێگومان خوای مەزن باڵندەکانی دروستکردوە بۆ فڕین بشێن، پاشان ئەم هەوا سازگارەی بۆ ڕامکردوون، وە هێزێکی پێداون کە جووڵەی پێ بکەن، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی دانایيو زانستی بەرفراوانی، وە گرنگی دانی بە سەرجەم دروست کراوەکانی، وە تەواوی هێزو تواناو دەسەڵاتی، بەرزيو بڵندی بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ
ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتًا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ
وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ
٨٠ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ
ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ
ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ٨١ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٨٢ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٣ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ
٨٤ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ
يُنظَرُونَ ٨٥ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ قَالُواْ
رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ
فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٨٦ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى
ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٨٧

(٨٠-٨٣): ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتًا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ (٨٠) وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ (٨١) فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ (٨٢) يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨٣)﴾

خوا ﷻ یادی نیعمەتەکانی بە بیری بەندەکانی دێنێتەوە، بانگیان دەکات بۆ شوکرانە بژێریو دان پێدانانی، جا فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا﴾ لە دەشتو لە کۆشکو ماڵەکانو هاو وێنەیاندا، دەتان پارێزێ لە گەرمای هاوینو سەرمای زستان، وە خۆتانو ماڵو منداڵتانو کەرەستەکانتان دادەپۆشێ، ماڵی پێ دروست دەکەن کە ئەو ماڵانە سەرجەم بەرژەوەندیەکانتانی تێدا کۆدەکەنەوە، هەروەها دەبێتە مایەی پاراستنی ماڵو حەرەمتان، جگە لەوانەش لەو سوودو قازانجانەی کە دەیبینن: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ یان لە خودی پێستەکە، یان ئەوەی لەسەر پێستەکە سەوز دەبێ، لە خوریو موو و کورکی وشترەکان، ﴿بُيُوتًا تَسۡتَخِفُّونَهَا﴾ واتە: هەڵگرتنیان ئاسانە لە گەشتو ماڵەکانی خۆتاندا، جا دەتان پارێزێ لە گەرماو سەرماو باران، هەروەها شمەکو کەلو پەلەکانتان دەپارێزێ لە باران، ﴿وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا﴾ وە دایناوە بۆتان لە خوری ئاژەڵەکان ﴿وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثًا﴾ ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو ئەوانەی بەکاردەهێنرێ لە قاپو قاچاخو ڕایەخو جلو بەرگو سەرجەم پێویستیەکانی تر، ﴿وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ﴾ واتە: لەم دونیایەدا کەڵکی لێ وەردەگرن، ئەمەش لەوانەیە کە بۆ بەندەکانی ژێر بار کردوە لە دروستکردنیو پیشەو کاردا.

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ﴾ واتـە: لەو دروسـتکراوانەی کە دەسـتی کەسـانی پێش ئێـوەی تێدانیـە ﴿ ظِلَٰلًا ﴾ وەک سـێبەری دارو درەختو بـاخو باخاتـەکانو کێوەکانو هـاو وێنەیان، ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا ﴾ واتە: پەناگەو ئەشـکەوت، دەتان پارێـزێ لە سـەرماو گەرماو دوژمن ﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ ﴾ واتە: جلو بەرگـو پۆشـین ﴿ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ ﴾ دیـارە خـوا لێـرەدا باسـی سـەرمای نەکـردوە، چونکـە لە سـەرەتا باسـکرا ئەم سـوورەتە سـەرەتاکەی باس لە بنەماکانـی نیعمەت دەکات، کۆتایەکەشـی باس لـە تـەواو کاریەکانـی دەکات، خۆ پاراسـتن لە سـەرما لـە بنەماکانـی نیعمەتـە، بێگومان لە سـەرەتادا باسـی کردوە کە دەفەرمـوێ: ﴿ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ ﴾ وە دەفەرموێ: ﴿ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾ واتـە: جـلو زرێو قەڵغانـی جەنگـی دەتانپارێـزی لە دوژمـن، بەو شـێوەیە خوا نیعمەتەکانـی تەواو دەکات بەسـەرتانەوە کە لە ژمـاردن نایەتو دەور نـادرێ، ﴿ لَعَلَّكُمْ ﴾ کاتـێ یـادی نیعمەتـی خواتـان کـردەوە، وە بینیتـان داباریـوە بەسـەرتاندا لە هەمـوو ڕووێکـەوە، ﴿ تُسْلِمُونَ ﴾ ملکەچی مەزنـیو فەرمانەکانی بن، لە گوێڕایەڵـی خـوادا بـەکاری بێنن، جـا زۆری نازو نیعمەتـەکان لە هۆکارەکانـی گەڕانەوەی بەندەکانـە، تـا زیاتر شـوکرانە بژێری بکـەنو وەسـفو پیاهەڵدانی خوای پـێ بکەن، بەڵام سـتەمکاران تەنهـا سەرکەشـیو ئینکاریـان هەڵبـژارد، بۆیە خـوا دەربارەیـان فەرموویەتی: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ ﴾ (واتـە: ئەگـەر ڕوویـان وەرگێـڕا) لـە خـواو گوێڕایەڵـی کردنـی، پـاش ئـەوەی بیریان خرایـەوەو نیعمەتەکانیـان بۆ ڕوون کرایـەوە ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾ واتـە: لەسـەر تۆ نیـە هیدایەتو سـەرکەوتنیان، بەڵکـو تۆ فەرمانـت پێکراوە بـە گەیاندنو ئامۆژگـاریو ئاگادارکردنـەوەو ترسـاندن، ئەگـەر ئـەوەی لـە تواناتـدا بـوو ئەنجامـت دا، ئـەوە ئەوان لێپرسـینەوەیان لـە لای خوایـە، بێگومان ئەوان چاکـەکان دەبینـن، وە نیعمەتی خـوا دەناسـن، بـەڵام نکوولیو عینادیـان دەکـەن، ﴿ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ هیچ خێرێکیـان تێـدا نیـە، وە سـوودیان پێناگەیەنـێ ئـەو ئایـەتو نیشـانانەی بـە دوای یەکـدا هاتـن، چونکـە هەسـتو هۆشو نیەتیـان خراپە، لـە داهاتوویەکـی نزیکدا سـزای خوا ﷻ دەبینـن بـۆ هەمـوو کەللەڕەقێکی خۆ بـەزل زان، وە کوفرکـەر بە نیعمەتـەکانو دەرچوو لە فەرمانـی خـواو پێغەمبەرەکەی.

(٨٤-٨٧): ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ

أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی بێبڕواكان لە ڕۆژی دواییدا، ئەوان هیچ بیانوویەكیان لێ وەرناگیرێ، سزاشیان لەسەر هەڵناگیرێ، شەریكو هاوبەشەكانیان لێیان بەری دەبن، وە دان بە بێبڕوایی خۆیاندا دەنێن بە درۆ هەڵبەستنیان بەدەم خواوە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ﴾ شایەتی لەسەر كردەوەكانیان دەدات، وە چۆن وەڵامی بانگەواز كارەكەیان دایەوە، ئەو شایەتەی خوا دەینێرێ پاكترینو دادپەروەرترین شایەتە، ئەوانیش پێغەمبەرانن (علیهم السلام) ئەوانەی ئەگەر شایەتی بدەن ئەوە بڕیارەكە دەچەسپێ، ﴿ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ (مۆڵەت بە بێبڕوایان نادرێ) بە بیانوو هێنانەوە، چونكە بیانوو هێنانەوەیان لە كاتێكدایە بە یەقینەوە بۆیان دەركەوتووە ئەوەی لەسەری بوون بەتاڵو پووچە، بیانوویەكی درۆینەیە، هیچ سوودێكی بۆیان نابێ، وە ئەگەر داوای گەڕانەوە بكەن بۆ دونیا، تا گوێڕایەڵی بكەن، وەڵام نادرێنەوەو داوای بیانوو هێنانەوەشیان لێناكرێ، چونكە دیارە كە درۆ دەكەن، بەڵكو بە سزای بە ئێش دەستپێشخەریان بۆ دەكرێ، كە لەسەریان سووك نابێ، لەبەر ئەوەی ئەوان لێپرسینەوەیان لەسەر نیە، چونكە چاكەیان نیە، بەڵكو كردەوەكانیان دەژمێردرێ، وە لەسەری دەوستێنرێنو دانی پێدا دەنێنو ڕیسوا دەكرێن.

﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ ﴾ لە ڕۆژی دواییدا، بەتاڵیو پووچیان بۆ دەردەكەوێ، ناشتوانن نكوڵی لێبكەن ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ﴾ هیچ سوودو تكایەكیان بۆ ئێمە نیە، بە نەفسی خۆیان دان بە بەتاڵیدا دەنێنو بێبڕوایی پێدەكەن، ڕقو كینەو دژایەتی دەكەوێتە نێوانیان ﴿ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ ﴾ واتە: پەرستراوەكانیان وتەكانیان ڕەت دەكەنەوە، جا پێیان دەڵێن: ﴿ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ (بەڕاستی ئێوە درۆ دەكەن) كاتێ ئێمەتان كردوەتە هاوبەش بۆ خواو ئێمەتان پەرستوە لە گەڵیدا، ئێمە فەرمانمان پێ نەكردوون بەوە، وامان نەزانیوە ئێمە شایستەی ئەوەین بپەرسترێین، دەك شەرمەزار بن، لە ڕۆژی دواییدا ملكەچو تەسلیمی خوا ﷻ دەبنو دەچنە ژێر بڕیارەكانی، بۆیان دەردەكەوێ ئەوان شایستەی سزادانن ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾ واتە: جا چوونە دۆزەخەوە، دڵیان پڕ بوو لە تووڕەیی لە خۆیان، وە لە ستایش كردنی پەروەردگاریان، تەنها بە هۆی كردەوە خراپەكانیانەوە سزای داون.

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا
فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ٨٨ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي
كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ
شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ
شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩ ۞إِنَّ ٱللَّهَ
يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ
ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ
٩٠ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ
بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ
ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ٩١ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ
غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا
بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ
بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ
٩٢ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن
يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٩٣

**(٨٨):** ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ٨٨ ﴾:

**کاتێ بێبڕواییان کرد بەرانبەر نەفس‌و دەروونیان، وە ئایەت‌و نیشانەکانی خوایان بە درۆدادەناو دژایەتی پێغەمبەرەکەیان دەکردو لەگەڵیدا دەجەنگان، خەڵکیشیان لە ڕێی خوا دەگێڕایەوە، بوون بە بانگەوازکارێک بۆ ڕێگای گومڕایی، بۆیە شایستەی ئەوە بوون لە بەرانبەر ئەو فەسادوو ناپاکیەیاندا سزا لەسەر سزا بدرێن، وەک چۆن تاوان‌و گوناهەکانیان چەند بارە بوویەوەو فەسادو خراپەکاریان لەسەر زەویدا بڵاو کردەوە.**

**(٨٩):** ﴿ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩ ﴾:

﴿ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ ﴾ **کاتێک لە سەرەتادا باسی کرد کە ئەو وریایان دەکاتەوە،** ﴿ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا ﴾ **بە هەمان شێوە لێرەدا دووبارەی کردۆتەوە، ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیەشی لە ناو ئەواندا تایبەت کردوە، جا فەرموویەتی:** ﴿ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ **واتە: لەسەر ئۆممەت‌و گەلەکەت شایەتیان لەسەر دەدەیت بە چاکەو خراپەیانەوە.**

**ئەمە لە تەواوی دادپەروەری خوای بەرزە، کە هەموو پێغەمبەرێک شایەتی لەسەر ئۆممەتەکەی دەدات، چونکە ئەو شارەزاترە لە کردەوەکانی ئۆممەتەکەی، وە دادپەروەرترو نەرمونیاترە لەوەی کە شایەتیەکیان لەسەر بدات شایستەی ئەوان نەبێ.**

**ئەمەش وەک ئەم فەرموودەی خوایە، کە دەفەرموێ:** ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا ١٤٣ ﴾ **البقرة، (واتە: هەروەها کردمانن بە بەڵگەیەکی میانڕەوی (هەڵبژێردراو) تا ببنە چاودێر بەسەر خەڵکیەوە، وە پێغەمبەر ﷺ چاودێرە بەسەر ئێوەوە)، وە فەرموویەتی:** ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ

بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ ﴿٤٢﴾ ﴾النساء (واتە: ئنجا حاڵی کافران چۆن بێت، کاتێک لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێک (کە پێغەمبەرەکەیانە) هێنامان، وە تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بە شایەت بەسەر ئەوانەوە * لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کافربوونو سەرپێچی پێغەمبەرەکەیان کرد ئاوات دەخوازن، زەویان بەسەردا تەخت بکرێت).

وە کە دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾ واتە: لە بنەماکانی ئایینو لقو پۆکانی، وە لە حوکمی هەردوو دونیا، هەموو ئەوانەی کە بەندە پێویستی پێیەتی ئەوە تێیدا (واتە: لە قورئاندا) ڕوونکراوەتەوە بە باشترین شێوە، بە وشەی ڕوونو مانای دیار، تەنانەت خوای بەرز وەسفی ئەو کارە گەورانە دەکات کە دڵ پێویستی پێیەتی لە هەموو کاتێکدا بەسەریا تێپەڕێ، هەموو ساتێ دووبارەی بکاتەوە بە وشەی جیاوازو مانای جۆراو جۆر، تا لە دڵدا جێگیر بێو خێرو چاکە بەرهەم بێنێت، ئەویش بە پێی جێگیر بوونی دەبێت لە ناو دڵدا.

هەتا خوای گەورە لە وشەیەکی کەمی ڕووندا مانایەکی زۆر کۆدەکاتەوە، ئەو وشەیە وەکو یاسایەکی لێدێ بۆی، ئەمە ئیعتیبار دەکرێ بەو ئایەتەی کە دوای ئەم ئایەتە دێت، وە ئەوەیشی تیایدایە لە جۆرەها فەرمانو قەدەغە کراو لە ژماردن نایەن.

کاتێ ئەم قورئانە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێ، ئەمە دەبێتە بەڵگەی خوا بەسەر هەموو بەندەکانەوە بە گشتی، جا بەو شێوەیە بەڵگەو بیانووی ستەمکاران دەبڕێ، خۆ مسوڵمانانیش سوودی لێ وەردەگرنو دەبێتە ڕێنمایی بۆیان، دەبێتە مایەی هیدایەت بۆیان لە کاروباری دینو دونیایاندا، وە ڕەحمەتێک هەموو خێرو بێری دونیاو دوارۆژی پێ بە دەست دێنن، جا هیدایەت ئەوەیە کە بە دەستیان هێناوە لە زانیاری سوودبەخشو کردەوەی چاک، وە ڕەحمەتیش پاداشتی دونیاو دوارۆژی لەسەر ڕێک دەخرێ وەک چاک بوونی دڵو ئارامی، وە عەقڵ تەواو نابێ تەنها بە پەروەردە کردن نەبێ لەسەر ماناکانی قورئان، کە گەورەترینو بەرزترینی ماناکان، بەهەمان شێوە کردەوە چاکەکانو ڕەوشتە بەرزەکان، وە ڕزقو ڕۆزی بەرفراوان، وە سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بە وتەو کردەوە، وە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، وە ڕێزی مەزنی کە کەس نازانێ چی تێدایە لە نازو نیعمەتو ژیانی هەمیشەیی جگە لە پەروەردگاری بەبەزەیی نەبێ.

(٩٠): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ واتــە: ئــەو دادپەروەریــەی کــە خــوا فەرمانــی پێکــردوە، دادپــەروەری لــە مافــی خــۆیو لــە مافــی بەندەکانــی دەگرێتەوە، جــا دادپــەروەری لــەوەدا پێدانــی مافەکانــە بــە تەواویــیو بێ کــەمو کــوڕی، بــەوەی بەندە ئــەو مافانــەی کــە خــوا لەســەر شــانی پێویســتی کــردوە لــە مافــە دارایــیو جەســتەییەکان ئەنجامــی بــدات، لــەوەی کە پەیوەســتە لە مافی خــواو مافــی بەندەکانــی، لەگــەڵ خەڵکیدا بە دادپــەروەری مامەڵــە بــکات، هەموو دەســەڵاتدارێک ئــەوەی لە ژێر دەســتی دایە بــە ڕێکو پێکــی هەڵســوکەوتی لەگــەڵ بکات، جا یەکســانە ئەگــەر ئەو دەســەڵاتە، دەســەڵاتی گەورە بــێ، یان دەســەڵاتی جێگــرەوەی خەلیفــەو جێگرەوەی دادوەر بــێ، دادپەروەریــش ئەوەیە کە خــوا ﷻ لــە کتێبەکەیدا فــەرزی کردوە، وە لەســەر زمانی پێغەمبەرەکــەیو فەرمانی کردوە بە گرتنــە بــەری، دادپەروەری لــە مامەڵەکاندا ئەوەیــە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن لە گرێبەســتەکانی کڕیــنو فرۆشــتنو وێنەکانیــدا بــە بەجێهێنانی هەموو ئەوانەی لەســەر شــانیەتی، بــا مافی هیچ کەســێک نەخــۆن، وە غەشو فرتو فێڵو ســتەمیان لــێ نەکەن، جا دادپەروەری پێویســتە، وە چاکــەش فەزیلــەتو ڕەوایــە، وەک ســوود گەیاندن بــە خەڵکی بە مــاڵو جەســتەو زانیاریی، وە جگــە لەوانــەش لــە جۆرەکانــی ســوود گەیانــدن، تەنانــەت دەچێتــە چوارچێــوەی ئەوەوە چــاک بــوون لەگەڵ ئــەو ئاژەڵانەی گۆشــتیان دەخــورێو جگــە لەوانەش.

خــوا ﷻ هاوکاریو یارمەتیدانی خزمو نزیکی پێویســت کردوە، ئەگەرچــی لە چوارچێوەی گشــتی دایــە جــا جەخت بکاتەوە لــە مافەکانیــانو بەهێز کردنــی پەیوەندیانو ســوور بوون لەســەر ئــەوە، وە هەمــوو خزمەکان نزیک بــن، یان دوور دەچنــە ئەو چوارچێوەیــەوە، بەڵام ئــەوەی نزیکتــرە مافــی لە پێشــترە، وە خــوا ﷻ کە دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ ﴾ بریتیــە لــە هەمــوو تاوانێکــی مــەزن کــە شــەریعەتەکانو سروشــتی مــرۆڤ بــە خراپــی بزانــن، وەک هاوبــەش دانــان بــۆ خــوا، کوشــتن بــە ناهــەق، زینــاو داوێن پیســی، دزیو چەتەیــی، سەرســام بــوونو خۆبــەزل زانیــنو بــە کــەم زانینــی خەڵــک، وە جگــە لەوانە لە ڕەوشــتە خراپــەکان، وە دەچێتە چوارچێــوەی (المنکر) کاری دزێوو خــراپ، هەموو تاوانو ســەرپێچەک پەیوەنــدی هەبێت بــە مافی خوای گــەورەوە، وە (البغي) لە ســنوور دەرچوون، هەمــوو دوژمنکاریــەک بەرانبەر بــە خەڵک.

ئـەم دەقـە پیرۆزە کۆکـەرەوەی هەمـوو فەرمـان پێکـراوو قەدەغەکراوەکانە، هیچ شـتێک نەمـاوە ئیلا لە چوارچێوەی ئەمە دایە، ئەمە یاسـایەکە سـەرجەم وردەکاریـەکان دەگەڕێنەوە بـۆ لای، هەمـوو باس‌و خواسـێک دادپـەروەری، یـان چاکە، یـان فەرمان بە سـیلەی ڕەحم لـە خۆبگرێـت ئەوە خـوا فەرمانی پێکردوە، وە هەر مەسـەلەیەک فاحیشـە، یـان گوناه، یان لـە سـنوور دەرچـوون لە خـۆ بگرێت ئـەوە خـوا نەهی لێکـردوە، وە بـەوە دەزانـێ چاکی ئـەوەی خـوا فەرمانـی پێکردوە، وە ناشـرینی ئـەوەی خوا قەدەغـەی کردوە، بەوانـە تەعبیر بـە وتـەی خەڵکـی دەکرێ، وە سـەرجەم کاروبـارەکان بـۆ لای دەگەڕێتەوە، پاکـی بۆ ئەو خوایـەی لـە وتەکانیـدا هیدایەت‌و شـیفاو نـووری دانـاوە، بە هەمـان شـێوە جیاکردنەوە لە نێوان هەموو شـتەکاندا.

لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿يَعِظُكُمْ﴾ واتـە: ئامۆژگاریتـان پێـدەکات بـەوەی لـە کتێبەکەیـدا ڕوونـی کردۆتەوە، فەرمانتان پێـدەکات بەوەی کە ئەوپـەڕی قازانجتانی تێدایە، وە قەدەغـەی دەکات ئـەوەی زیانتـان پێدەگەیەنـێ، ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (واتـە: بەڵکـو بیـر بکەنـەوە) بەوەی ئامۆژگـاری کـردوون، تێبگەن‌و عاقـڵ بن، بێگومـان ئەگەر ئێـوە بیـر بکەنـەوەو عاقڵ ببـن‌و کار بکـەن بـە ناوەڕۆکی، ئـەوە بە جۆرێک خۆشـبەخت دەبـن کە ناخۆشـی لەگەڵـدا نیە.

دوای ئـەوەی فەرمانـی کـرد بـەوەی پێویسـتە لـە بنەمـای شـەرع، وە فەرمانـی کـرد بـە بەجێهێنانـی ئـەوەی بەنـدە لەسـەری پێویسـتە، جـا فەرموویەتـی:

(٩١-٩٢): ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ
جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ
غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَـٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ
مِنْ أُمَّةٍ ۚ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ ۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾

﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ ﴾ ئەمـە هەمـوو ئـەو پەیمانانـە دەگرێتـەوە کـە خوا لـە بەندەکـەی وەریگرتـوە، لە عیبـادەت‌و نەزرو ئـەو سـوێندانەی کە خواردوویەتـی، دەبێ بـە جوانتریـن شـێوە بەجێیـان بێنـێ، وە بە هەمان شـێوە ئـەو گرێبەسـتە دەگرێتـەوە کە لە نێـوان دوو کەسـدایە، هـەروەک پەیمانیش لـە نێوان دوو کەسـدا، وە وەک ئـەو پەیمانەی کـە بەنـدە دەیـدات بـە کەسـێکی دیکەو جەختـی لەسـەر دەکاتەوە، پێویسـتە لەسـەری لە هەمـوو ئەوانـەدا بـە وەفا بـێ، بە پێـی توانا بـۆی تەواو بـکات، لەبـەر ئەمە خـوا قەدەغەی

بەجێ نەهێنانی کردوە، جا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ (سوێندەکانتان مەشکێنن لە پاش بەهێز کردنیان) بە بەستنەوەی لەسەر ناوی خوای بەرز، ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی ئەو دووانەی گرێبەستتان کردوە، ﴿كَفِيلًا﴾ واتە:حەلاڵ نیە بۆتان حوکمو فەرمان بە کارێک نەکەن کە خوای مەزنتان لەسەری کردوە بە شایەت، ئەوە دەبێتە واز هێنان لە بە گەورە دانانی خواو گاڵتە پێ کردنی، بێگومان کەسێک ڕازی بووە بەوەی سوێندی بۆ بخۆی، وە جەخت بکەیەوە خوا ﷻ بکەی بە شایەت، وەک چۆن متمانەی پێکردیو گومانی باشی پێ بردی، تۆش بە وەفابە بەرانبەر سوێندو جەخت کردنەوەکەت، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (بێگومان خوا) پاداشتی هەموو کەسێک دەداتەوە بە پێی کردەوەو نیەتی.

﴿وَلَا تَكُونُوا۟﴾ لە شکاندنو هەڵوەشانەوەی پەیمانەکانتان بە ناشرینترین وێنەو خراپترینیان، کە بەڵگەیە لەسەر گەمژەیی کەسەکە، بەو شێوەی ﴿كَٱلَّتِى﴾ وەک ئەو ئافرەتەی خوریەکی جوان دەڕێسێ، کاتێ کە تەواو دەبێ شی دەکاتەوەو دەیکاتەوە بە خوری ﴿أَنكَٰثًا﴾ ماندوو بووە لە ڕستنیدا، پاشان لەسەر هەڵوەشاندنەوەی، هیچ سوودی وەرنەگرت جگە لە بێ ئومێدیو ماندووبوونو کەم عەقڵیو بۆچوونی لاواز نەبێ، ئەو کەسەی پەیمان دەداتو دەیشکێنێت، ئەوە ستەمکارو نەفامو گەمژەیە، دینداریيو پیاوەتیەکەی ناتەواوە.

وتەی خوا ﷻ: ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ﴾ واتە: با ئەم حاڵەتە لە ئێوە نەوەشێتەوە، پەیمانی بەهێز دەبەستنو چاوەڕوانی هەلو فرسەتێک بکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی، ئەگەر ئەوەی پەیمان دەبەستێ لاواز بوو، وە توانای نەبوو بەسەر ئەویتردا بەجێی دەهێنێ، نەک لەبەر گەورەیی پەیمانەکە، بەڵکو لەبەر بێ توانایی خۆی، وە ئەگەر بەهێز بێ، تەماشای بەرژەوەندی دونیایی دەکات لە هەڵوەشانەوەیدا، هەڵیدەوەشێنێتەوە بێ ئەوەی گوێ بداتە پەیمانی خواو سوێند خواردنەکەی.

هەموو ئەوانە بە پێی هەواو ئارەزوو دەخولێنەوە، وە پێشی دەخەن بەسەر داواکاری خوادا، وە بەسەر پیاوەتی مرۆڤایەتیو ڕەوشتو ئاکارە بەرزەکاندا، لەبەر ئەوەی گەلو ئوممەت بەهێزترو زیاتر بن لە ئوممەتێکی دیکە، ئەمەش بەڵایەکە لە لایەن خواوەو تاقی کردنەوەیەکە خوا پێی تاقیتان دەکاتەوە، بە شێوەیەک خوا هۆکاری ناڕەحەتی

دیـاری كـردوە، تا راسـتگۆی بـە وەفاو فاجـرو خراپـەكاری پێ تاقـی بكاتەوە ﴿ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ پاداشـتی هەمـووی بداتـەوە بـە پێـی كـردەوەی خـۆی، وە سـزای ناپـاكو فێڵبـاز بداتەوە.

(٩٣): ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَـٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾:

﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ ﴾ هەمـوو خەڵكـی لەسـەر هیدایـەت كـۆ دەكـردەوەو دەیكـردن بـە ﴿ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ بـەڵام خـوا تاكـەو تەنهایـە بە هیدایـەتو گومـڕا كردن، هیدایـەتو گومـڕا كـردن لـەو كردەوانەیە كـە شـوێنی زانسـتو دانایی خـوا كەوتوون، هەر كەسـێك شایسـتەی بـێ بە فـەزڵو چاكەی خـۆی هیدایەتی دەدات، وە هەر كەسـێك شایسـتە نەبێ بـە دادپەروەری خـۆی رێگریی لێـدەكات ﴿ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ لە خێـرو شـەڕ، پاداشـتتان دەداتەوە لەسـەری، بـە تەواوتریـنو دادپەروەرترین پاداشـت.

وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ
ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ
عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ
يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم
بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا
مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ
وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾
فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ٱلرَّجِيمِ
﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَـٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَـٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ
هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ
وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ
لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾

**(٩٤):** ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾﴾:

﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَكُمْ﴾ (واتە: سوێندو پەیمانەکانتان با بە پێی هەواو ئارەزووتان نەبێ، هەر کاتێ ویستتان بە وەفا بن، وە هەر کاتێ ویستتان هەڵیوەشێننەوە، بێگومان ئێوە ئەگەر ئەوەتان کرد، پێیەکانتان هەڵ دەخلیسکێ، پاش جێگیر بوونی لەسەر ڕێگای ڕاست، ﴿وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ﴾ سزایەک کە ئازارتان بداتو ریسواتان بکات ﴿بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کاتێ گومرا بوونو، وە غەیری خۆشتان گومرا کرد ﴿وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ چەند بارە.

**(٩٥-٩٧):** ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾﴾:

خوا ﷻ بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لە شکاندنی پەیمانو سوێندەکانیاندا، لەبەر خۆشی دونیای لە دەست چوو، ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ (بە نرخێکی کەم) هەڵیدەوەشێننەوەو وەفاتان بۆی نیە، ﴿إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ (ئەوەی لای خوا هەیە) لە پاداشتی بەپەلە لە ئێستاو داهاتوودا، بۆ ئەو کەسەیە ڕەزامەندی هەڵبژێریو بە وەفا بێ بەرانبەر پەیمانی خوا ﴿هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ (باشترە بۆتان) لە سوتەمەنی دونیای بەسەرچوو، ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾.

دەی ئەوەی کە دەمێنێ هەڵیبژێرن بەسەر ئەوەی کە نامێنێ، ئەوەی لە لاتانە هەر چەندە زۆر بێ، هەر دەبێ ﴿يَنفَدُ﴾ دەڕواو نامێنێ ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ﴾

دەمێنــێ‌و کۆتایــی پێنایــەت‌و نافەوتــێ، عاقــڵ نیــە ئــەو کەســەی بەســەر چــوو فەوتــاو هەڵدەبژێــرێ بەســەر ئــەوەی دەمێنــێ‌و قــەت نافەوتــێ، ئەمــەش وەک ئــەو فەرمــوودەی خوایــە: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ١٦ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ١٧﴾الأعلى، (واتــە: بەڵکــو ئێــوە ژیانــی دونیــا هەڵدەبژێــرن * کەچــی دواڕۆژ باشــترو پایەدارتــرە)، وە (دەفەرموێ:) ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ١٩٨﴾آل عمــران، (واتــە: ئــەوەی کــە لــە لای خوایــە چاکترە بــۆ چاکانتــان).

لەمــەدا، هاندان هەیە لەســەر زوهدو خۆنەویســتی لە دونیــادا، بە تایبەت زوهــدی دیاریکراو، ئەویــش وازهێنانــە لــەوەی زیانــی هەیە بۆ بەنــدە، پێویســتە ســەرقاڵ بێت بــەوەی کە خوا پێویســتی کردوە لەســەری، ئەمــەش زوهدی واجب‌و پێویســتە.

لــە هۆکارەکانــی زوهــد ئەوەیــە، بەنــدە لــەززەت‌و خۆشــیەکانی دونیــا بــەراورد بــکات بە خێــرو پاداشــتەکانی دواڕۆژ، بێگومــان جیــاوازی لە نێوانیانــدا دەبینێ، کە بانگــی دەکات بۆ هەڵبژاردنــی باشــترینی ئــەو دووانە.

زوهــدی وەســفکراو تەنهــا بریتی نیە لــە عیبادەتــە کورتــەکان وەک نوێــژو ڕۆژوو زیکر کــردن‌و هاوشــێوەکانی، بەڵکــو بەنــدە نابێتە خۆنەویســت‌و زاهیدی ڕاســتەقینە، تــا ئەوانە بە جێنەهێنــێ کە توانای بەســەریاندا هەیە لە فەرمانە شــەرعیە دیارو نادیــارەکان، وە لە بانگەواز کــردن بــۆ لای خواو بــۆ لای ئاینەکەی بــە گوفتارو کردار، جــا زوهدی ڕاســتەقینە، ئەوەیە ســوودی بــۆ دونیــاو دواڕۆژ هەبــێ، وە حەزی بجوڵێ‌و کۆشــش بــکات بۆ هەمــوو ئەوانەی کە ســوودیان هەیە.

﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟﴾ لەســەر گوێڕایەڵــی خــواو ســەرپێچی کردنــی، وە خۆیــان دەپارێــزن لــە ئارەزووەکانــی دونیــا کــە زیانــی هەیــە بــۆ ئاینەکەیــان، ﴿أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ چاکــە بەرانبــەرە بــە دەقــات، هەتــا حــەود ســەت ئەوەنــدە، بــۆ زیاتریــش لەوانــە، بــە ڕاســتی خوا ﷻ پاداشــتی چاکــەکاران ون نــاکات، لەبەر ئەمە باســی پاداشــتی چاکەکارانــی کردوە لە دونیــاو دواڕۆژدا، فەرموویەتــی: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ بــە ڕاســتی ئیمــان مەرجــە بۆ ڕاســتی‌و دروســتی کــردەوەی چــاک‌و وەرگرتنــی، بەڵکــو پێیــان ناوتــرێ کــردوەی چاک تەنهــا لەگــەڵ ئیمانــدا نەبێ، ئیمــان کــردەوەی چاکــە پێویســت دەکات، ئەوە بە ڕاســت دانانی تــەواو، بەرهــەم هێنەری کــردەوەی ئەندامەکانــی جەســتەیە لە فــەرزو ســونەتەکان.

هەر کەس ئیمانو کردەوەی چاک پێکەوە کۆبکاتەوە ﴿ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗ ﴾ وەک ئارام کردنەوەی دڵو دەروونی، وە ئاوڕنەدانەوە لەوەی کە دڵی دەشێوێنێ، وە خوا ڕزقو ڕۆزیەکی حەڵاڵی پاکی پێ دەبەخشێ لە ڕوویەکەوە کە هەر هەستیشی پێ نەکات، ﴿ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ ﴾ لە دوارۆژدا ﴿ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ لە جۆرەها لەززەت، کە چاو هەرگیز نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە ختورەش بە دڵی کەسدا نەهاتووە، وە لە دوارۆژی چاکدا.

(٩٨-١٠٠): ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٩٨ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٩٩ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ١٠٠ ﴾:

﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ واتە: ئەگەر ویستت کتێبی خوا بخوێنیەوە کە پیرۆزترین کتێبە، چارەسەری دڵەکانەو زانستێکی زۆرو زەوەندیشی تێدایە، شەیتان زۆر سوورە لەسەر ئەوەی کاتێ دەبینێ بەندە سەرقاڵە بەو کارە پیرۆزانەوە، هەوڵ دەدات لە کاتی خوێندنی قورئاندا لە ماناو مەبەستەکەی دووری بخاتەوە، باشترین ڕێگا بۆ سەلامەتی لە شەڕو خراپەی شەیتان پەنا گرتنە بە خوای مەزن، جا خوێنەر دەڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) (واتە: پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو) بە بیر کردنەوە لە ماناکانی، بە دڵی پشت دەبەستێ بە خوا، لە دوور خستنەوە لێی، کۆشش دەکات بە بەکارهێنانی بەهێزترین هۆکار لە ڕەتکردنەوەی، ئەویش خۆ ڕازاندنەوەیە بە جوانی ئیمانو پشتبەستن، بێگومان شەیتان، ﴿ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ ﴾ دەسەڵات ﴿ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾ تاکو تەنهاو هاوبەشو هاوشانی نیە ﴿ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ (پشت بە خوا دەبەستن)، ئەو بڕوادارانەی پشت بە خوا دەبەستن، خوا ﷻ شەڕی شەیتانیان لێ دوور دەخاتەوە، هیچ ڕێگایەک نامێنێ بەسەریانەوە زەفەریان پێ بیات.

﴿ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ ﴾ واتە: دەسەڵاتی ﴿ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ ﴾ واتە: دەیکەنە دۆستو پشتیوانی خۆیان، ئەویش بە وازهێنانیان لە پشت بەستن بە خوا ﷻو گوێڕایەڵی کردنی شەیتانو خۆ دانەپاڵ حیزبو گروپی ئەو، ئەوان خۆیان کردیان بە سەردارو دەسەڵاتدار بەسەر نەفسی خۆیانەوە، ئەویش چاک هانیان دەدات بۆ گوناهو سەرپێچی، وە پێشەوایەتیان دەکات بۆ ئاگرو دۆزەخ.

(١٠١-١٠٢): ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾

﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات کـە بـە درۆدانەرانـی قورئـان شـوێنی ئـەوە دەکـەون وادەزانـن بەڵگەیـە بۆیـان، ئەویش ئەوەیـە بێگومـان خـوا دەسـەڵاتدارو لێزانە، یاسـاو ڕێسـاکان دادەنـێ، یاسـایەک دەگۆڕێ لـە جێـی یاسـایەکی تـر، لەبـەر حیکمـەتو میهرەبانی خـۆی، جا ئەگـەر بینیان بەو شـێوە تانەو تەشـەر لـە پێغەمبەر دەدەنو ئەو پەیامەشـی بۆی هاتـوە، ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ﴾ (دەڵێـن: ئەمـە تەنها هەڵبەسـتراوە) خـوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئەوانـە گەمـژەو نەفامن نە زانسـتیان دەربـارەی پەروەردگاریـان هەیە، نە دەربارەی شـەرعو یاساکانی.

بێگومـان زانـراوە سـەر زەنشـتو لەکـەدار کردنـی نەفـام بەبێ زانسـت هیـچ پەندێکی لێ وەرناگیـرێ، بـە ڕاسـتی لەکـەدار کردن لە شـتێکدا بەشـێکە لە شـارەزایی لێی، لەبـەر ئەمە خـوای بەرز باسـی دانایـیو حیکمەتی خـۆی دەکات لـەوەداو فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ ﴾ ئەویـش جبریـل ﷺ (المقـدس) پـاکو بێگـەرد لـە هەمـوو عەیبو خیانـەت دەردێـک ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: دابەزینـی بـە هەقـە، ئەویش هـەقو ڕاسـتی لە خۆ دەگـرێ لـە هـەواڵو فەرمـانو قەدەغـە کراوەکانیـدا، ڕێگـا چارەیـەک نیە بۆ کەسـێک ڕەخنەیەکـی تەندروسـتی لـێ بگـری، چونکـە ئەگەر زانـی ئەوە ڕاسـتە، دەزانـێ دژەکەی ناڕاسـتە ﴿ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ لـە کاتـی دابەزاندنـی دەقەکانیـدا خوێندنـەوەی بەسـەریاندا، کات لـە دوای کات، بـەردەوام هەقو ڕاسـتی دەگاتە دڵەکانیان قۆنـاغ بە قۆناغ تـا ئیمانەکەیـان جێگیـرو بەهێزتر دەبـێ لە کێـوە داکوتـراوەکان، هەروەها ئـەوان دەزانن ئـەوە هەقە.

جـا ئەگـەر بڕیارێک لە بڕیارەکان بچەسـپێنێ، پاشـان هەڵیبوەشـێنێتەوە (نسـخ)ی بکاتەوە، دەزانـن ئـەوە گۆڕیویەتـی بـە هاوشـێوەی خـۆی، یـان چاکتـر لـەوە بۆیـان، بێگومـان هەڵوەشـاندنەوەی گونجاوتـرە لەبەر حیکمەتی پەروەردگاری، وە لەگەڵ عەقڵیشـدا دەگونجێ. ﴿ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ واتـە: هیدایەتیـان دەدات بـۆ حەقیقەتـی شـتەکان، وە هـەقو ناهەقیـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، وە هیدایـەت لە گومڕایـی، مژدەیـان دەداتی کە

بێگومـان ئـەوان پاداشـتێكی چاكیـان بـۆ هەیە، بـۆ هەمیشـەیی تیـادا دەمێننەوە، بـە هەمان شـێوە، هـەر كاتێـك كـە تـۆزە تـۆزە داببـەزێ، ئـەوە مەزنتریـن هیدایـەتو گەورەترین مژدەیـە بـۆ ئەوان، لـە جیاتی ئەوەی بـە یەكجـار داببـەزێ، وە بۆچوونەكان لـە بەرانبەریدا پـەرش‌و بـڵاو دەبـن، بەڵكـو خـوا حوكـم‌و مـژدەی زیاتـر دادەبەزێنـی، جـا ئەگـەر لـە مەبەسـتەكانی تێبگـەن، ئـەوە خـوا هاوشـێوەی دادەبەزێنـێ، وە بەو شـێوەیە.

لەبـەر ئـەوە هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) گەیشـتنە قۆناغێكی مـەزن، خوو ڕەوشـتیان گۆڕا، گواسـترانەوە بۆ ڕەوشـت‌و كردەوەیەكی دیكە، پێشـكەوتن بەسەر پێشـین‌و دواییندا. بێگومـان چاكتر وایە بۆ دوای ئەوان، خۆیان پەروەردە بكەن بە زانسـتەكانی‌و ڕەوشـتەكانیان لـەوەوە وەربگـرن، وە ڕووناكـی لێوەربگـرن لـە تاریكی نەفامیـی‌و گومڕاییـەوە ڕزگاریان بـكات، وە بیكـەن بـە پێشـەنگی خۆیـان لـە هەمـوو دۆخەكانـدا، بـەو شـێوەیە كاروباری ئاینـی‌و دونیاییان ڕێـك دەبێ.

وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ
ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ
﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾
مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ
مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ
صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ
﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى
ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿١٠٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ
وَأَبْصَٰرِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ
أَنَّهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ
لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟
وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾

(١٠٣-١٠٥): ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾﴾:

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات دەربارەی بەدرۆدانەرانـی پێغەمبەرەکەی ﷺ، دەفەرمـوێ: ﴿أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ﴾ ئـەم کتێبـەی کـە هێناویەتـی ﴿بَشَرٌ﴾ ئـەو مرۆڤـەش کە ئامـاژەی بۆ دەکـەن زمانـی عەجەمیـەو عەرەبـی نازانێ ﴿وَهَٰذَا﴾ ئـەم قورئانـە، ﴿لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾ (واتـە: بـە زمانـی عەرەبـی پاراو دابەزیـوە)، ئایـا ئـەم وتەیە دەکرێ ڕاسـت بێ؟ یـان گومانی ئـەوەی لێدەکـرێ بگونجێ؟ بـەڵام درۆزن کاتـێ قسـە دەکات بیـر لـەوە ناکاتـەوە لێکدانـەوە بـۆ درۆکـەی دەکرێ، جـا قسـەکەی جۆرێ لـە دژ یـەکو پڕو پووچـی تێدایـە، کـە وا دەخـوازێ، وەڵامی ئەو بیرۆکەیـە بدرێتـەوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کـە بەڵگەیـە لەسـەر هەقـی ڕوون کـراوە، ئـەوان ڕەتـی دەکەنـەوەو وەرینـاگرن ﴿لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ﴾ کاتـێ هیدایەتو ڕێنماییـان بۆ دێ ڕەتی دەکەنەوە، سـزا دەدرێـن بە بێبەش بوونی، خـوا ﷻ زەلیلو ڕیسـوایان دەکات ﴿وَلَهُمْ﴾ لـە دوارۆژدا ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (واتـە: سـزایەکی زۆر بە ئێش).

﴿إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ﴾ واتـە: ئەوانـە درۆ تەنهـا هەڵدەبەسـتن، ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ وەک ئەوانـەی نکوولـیو دژایەتـی پێغەمبەرەکـەی دەکـەن، پـاش ئـەوەی نیشـانەی ڕوونو دیاریـان بـۆ هاتـوە، ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾ واتـە: درۆ لەوانـەدا کـورت کراوەتـەوە، ئـەوان لە هەموو کـەس لە پێشـترن درۆ بدرێتـە پاڵیان، بەڵام

موحەممەد ﷺی بڕوادار بە نیشانەکانی خوا ملکەچی پەروەردگاری، ئەستەمە درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستێ، وە قسەیەک بداتە پاڵی ئەو نەیوتبێ، دوژمنەکانی تۆمەتباریان کرد بە درۆ کردن، کە لە ڕاستیدا ئەوە وەسفی ئەوانە، خوا ڕیسواییانی دەرخستو فەزیحەتەکانیانی ئاشکرا کرد، ستایش بۆ خوای بەرز.

(١٠٦-١٠٩): ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی خراپی حاڵی (بێبڕوایان دەفەرموێ:) ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ ﴾ کوێر بووە پاش ئەوەی بینایی هەبووە، گەڕاوەتەوە بۆ گومڕایی پاش ئەوەی هیدایەت دراوە، دڵی کراوەتەوە بۆ کوفرو پێی ڕازیەو ئاسوودەیە، ئەمانە غەزەبو قاری خوای میهرەبانیان بۆ حەڵاڵ دەبێ، ئەگەر خەشمو قینیان لێبگرێ کەس ناتوانێ بەربەستی بکات، ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ واتە: لەوپەڕی توونديدايە لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامە ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ کاتێ هەڵگەڕانەوە بەرەو دواوە، لەبەر هەندێ لەززەتی دونیای بەسەرچوو، خۆیان بە دوور گرت لە خێری دواڕۆژ، کاتێ کوفریان هەڵبژارد بەسەر ئیماندا، ڕێگری هیدایەتی لێکردن، هیدایەتی نەدان، چونکە کوفر بووەتە بەشێک لەوان، مۆر دراوە بەسەر دڵیاندا خێرو چاکە وەرناگرێ، وە بەسەر گوێو بیناییاندا، ئەوەی سوودی هەبێ بۆیان وەریناگرنو ناگاتە دڵەکانیان، بێئاگایی داپۆشیونو سەرشۆڕی دەوری داون، بێبەش بوون لە ڕەحمەتو میهرەبانی خوا کە هەموو شتێکی گرتوەتەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی پەیامیان بۆ هات ڕەتیان کردەوە، وە خراوە ڕوو بۆیان وەریان نەگرت، ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ ئەوانەی نەفسو دەروونو ماڵو منداڵی خۆیانیان دۆڕاند لە ڕۆژی دواییدا، نازو نیعمەتی هەمیشەییان لە دەستچوو، وە سزای بە ئێشیان بەدەستهێنا.

ئەمــە بــە پێچەوانەی کەسـێک کە زۆری لـێ بکرێو ناچار بکـرێ لەسـەر بێبڕوایی، وە دڵی پـڕ بـێ لـە دڵنیایـیو ئیمان حـەزی پێ بـکات، ئـەوە گوناهـو تاوانی لەسـەر نیە، دروسـتە بـۆی وشـەی کوفر بـە دەمیـدا بێت لە کاتـی زۆر لـێ کردندا.

ئـەوە دەبێتـە بەڵگە کەسـێک بە زۆر ژنەکەی پێ تـەڵاق بدرێ، یان بەندەکـەی ئازاد بکات، یـان کڕیـنو فرۆشـتن، یان سـەرجەم گرێبەسـتەکانی دیکـە، ئـەوە پەنـدی لێوەرناگیرێو هیـچ حوکمێکـی شـەرعی لەسـەر دانامـەزرێ، چونکـە ئەگـەر سـزا نەدرا لەسـەر وشـەی کوفـر، جگە لەوە لـە پێشـترە کاری پـێ نەکرێ.

(١١٠-١١١): ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾:

واتــە: پاشــان پەروەردگارت کە بەندە دڵسـۆزەکانی پـەروەردە کردوە بـە بەزەییو چاکەی خـۆی، بێگومـان لێبـوردەو میهرەبانـە بـۆ ئەو کەسـەی لـە پێناویـدا کۆچی کـردوە، ماڵو منداڵـی جـێ هێشـتووە، تەنهـا لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوا ﷻ، لەسـەر ئاینەکـەی جەزرەبەی زۆریـان داوە تـا بگەڕێتـەوە بـۆ کوفـرو بێبڕوایـی، جـا ئـەو جێگیـر بـووە لەسـەر ئیمان، دڵسـۆز بـووە بـە هۆی ئـەو دڵنیاییـەی هەیبووە، پاشـان جیهـادی دوژمنانی خـوای کردوە، تـا بیانهێنێتـە نێـو ئاینی ئیسـلامەوە، بـە زمـانو دەسـتەکانی، وە ئارامی گرتووە لەسـەر ئەم پەرستشـە قـورسو گرانانـە کـە زۆرێک لـە خەڵکـی ناتوانـن ئارامی لەسـەر بگرن.

ئەمانــە گەورەتریــن هــۆکارن کــە بــە هۆیانــەوە گەورەتریــن دیــاری بەدەســت دەهێنــێ، ئەویــش لێ خۆشــبوونی خوایــە لە تاوانەکانــی بە بچووکو گــەورەوە، هەموو ناخۆشــیەک لەبیــر دەباتــەوە، وە ڕەحمەتی مەزنــی کە بە هۆیەوە حاڵیــان چاک دەبــێ، وە کاروبارەکانی دونیــاو دوارۆژیان ڕێــک دەبێ.

يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا
قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن
كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ
ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ
رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ
﴿١١٣﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟
نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ
عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ
ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ
هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ
مِن قَبْلُ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾

میهرەبانی خوا بۆ ئەوان لە ڕۆژی دواییدا کاتێکە ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا ﴾ هەمووی دەڵێ: نەفسم نەفسم، کەس جگە لە خۆی بە بای خەیاڵیدا نایەت، لەو ڕۆژەدا بەندە پێویستی بە بەدەستهێنانی خێرو چاکە هەیە بە قەد گەردیلەکیش بێت، ﴿ وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾ لە خێرو شەڕ، ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ زیاد ناکرێ لە گوناهەکانی، لە خێرەکانیشی کەم ناکرێتەوە، (وەک خوا دەفەرموێ:) ﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ یس، (واتە: ئەمڕۆش هیچ جۆرە ستەمێک لە کەس ناکرێ، وە جگە لەوەی کە دەتان کرد پاداشتو سزا نادرێنەوە).

(١١٢-١١٣): ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾:

ئەم شارەی مەککە پیرۆز کراو بوو، ژیانیان پڕ بوو لە ئارامیو ئاسوودەیی، هیچ کەس ستەمی لێنەدەکرا تیایدا، نەفامەکانیش ڕێزیان لێدەگرت، تەنانەت ئەگەر یەکێکیان بکوژری باوکی لەوێ ببینایە، دەستدرێژی نەدەکردە سەری، لەگەڵ ئەو هەموو هۆزگەرایی‌و دەمارگیرییەی لە ناخیاندا بوو، ئارامی تەواو باڵی بەسەر ئەو شارەدا کێشا بوو، کە بۆ جگە لەو دەستەبەر نەبوو، بە هەمان شێوە ڕزقو ڕۆزی زۆرو بەرفراوان، ئەو شارە وشک بوو کشتو کاڵو دارو درەختی تێدا نەبوو، بەڵام خوا ئاسانی کرد لە هەموو لایەکەوە ڕزقو ڕۆزی بۆ دەهات، جا پێغەمبەرێکیان بۆ هات، دەستپاکی‌و ڕاستگۆییان دەناسی، بانگی دەکردن بۆ تەواوترین کاروبارەکان، وە

قەدەغەی لێ دەکردن لە کارە خراپەکان، بە درۆیان خستەوەو بێبڕواییان کرد بەرانبەر نیعمەتەکانی خوا بەسەریانەوە، خواش پێچەوانەی ئەوەی پێدان کە لەسەری بوون، جلو بەرگی برسێتی لەبەر کردن کە پێچەوانەی هەرزانیو خۆشگوزەرانیە، بە هەمان شێوە ترسیش کە پێچەوانەی ئەمنو ئاسایشە، ئەویش بە هۆی بێبڕوایيو شوکرانە نەکردنیان، ﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾النحل. (واتە: بێگومان خوا ستەمی لێنەکردوون، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە).

(١١٤-١١٨): ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾:

﴿ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾ خوا فەرمان بە بەندەکانی دەکات لەو ڕزقو ڕۆزیە بخۆن کە پێی بەخشیون لە گیاندارەکانو دانەوێڵەو بەروبوومەکانو جگە لەوانەش، ﴿ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ﴾ (حەڵاڵو پاک) بەم دوو شێوەیە وەسف کرابێ، نەک ئەوانەی خوا حەرامی کردوون، یان لە ڕێگای داگیر کردنو هاووێنەیەوە دەستی کەوتبێ، چێژ لەوە وەربگرن کە خوا ﷻ بۆی دروستکردوون بێ زێدەڕۆییو ستەم کردن، ﴿ وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ﴾ (سوپاسگوزاری کردنی نیعمەتەکان) بە دانپێدانانی دڵ، وە وەسفی خوا ﷻ لەسەریو بەکارهێنانی لە گوێڕایەڵی کردنی خوادا، ﴿ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە دڵسۆزن بۆ خوا لە پەرستندا، سوپاسی کەس مەکەن جگە لە خوا، وە بیرتان نەچێ تەنها ئەو بژێوی دەرە.

﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ﴾ ئەو شتانەی زیانبەخشن وەک پاکو خاوێنیەک بۆتان، ئەویش وەک: ﴿ ٱلۡمَيۡتَةَ ﴾ هەموو مردار بووەکان بەبێ سەربڕینێکی شەرعی دەچنە ئەو چوار چێوەیەوە، بەڵام مردارەوە بووی کوللەو ماسی جیادەکرێنەوە، ﴿ وَٱلدَّمَ ﴾ خوێنی ڕژێنراو، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە لە ناو پێستو گۆشتدا هیچ زیانێکی نیە، ﴿ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ ﴾ بە هۆی قێزەونیو پیسیەوە، ئەوەش هەموو گۆشتو بەزو سەرجەم بەشەکانی تر دەگرێتەوە، ﴿ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾ وەک ئەوەی بۆ بتو گۆڕەکان

سـەر ببـڕدرێ، وە هاووێنـەی ئەوانیـش، چونکـە مەبەسـت پێـی شـیرکو هاوبـەش دانانە ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ ﴾ (واتـە: بـەڵام هـەر کەسـێک ناچـار بـوو) بەشـێک لـەو حەرامکراوانە بخـوات -ناچـاری وایلێکـرد، وە لـەوە ترسـا ئەگەر نەیخـوا لە ناو بچـێ- ئەوە هیـچ تاوانی لەسـەر نیـە، بـە مەرجێـک زێدەڕۆیی نـەکات، یان لـە ئەنـدازە بـەدەر لێی نەخـوات، ئەمە ئەوانەیـە کـە خـوا ﷻ حەرامی کـردوە، ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ ﴾ واتـە: لـە خۆتانـەوەو بـە ئـارەزووی خۆتان شـتێک حـەڵاڵ مەکەنو شـتێک حـەرام بکـەن، چونکـە ئـەوە درۆ کردنـە بـە دەم خـواوەو قسـە کردنـە بەسـەر قسـەکانیەوە، ﴿ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴾ نـە لـە دونیـاو نـە لـە دواڕۆژدا، بێگومـان هـەر دەبـێ خوا ڕیسـواییان ئاشـکرا بـکات، ئەگەر لـە دونیـادا چێژ وەربگـرن ئـەوە بێگومـان ﴿ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ﴾ وە سـەرەنجامیان بـۆ دۆزەخە، ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ (واتـە: سـزایەکی سـەختو بـە ئێشـیان بـۆ هەیە).

خـوا حەرامی نەکردوە لەسـەرمان جگە لە شـتە پیسـەکان، ئەمەش وەک فـەزڵو چاکەیەکە لـە لایـەن ئەوەوە پاراسـتنیان لـە هەموو شـتێکی پیس، بـەڵام جوولەکەکان خـوا قەدەغەی کـرد لەسـەریان چەندیـن شـتی پـاک کـە پێشـتر حـەڵاڵ بـوو بۆیـان، ئەویـش وەک سـزایەک بۆیـان لـە بەرانبـەر سـتەمو زوڵـم کردنیاندا، هـەروەک لـە سـوورەتی (الأنعام) دا باسـی کـردوە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾، (واتـە: تەنها لەسـەر ئەوانەی بوونەتـە جولەکـە، حەراممـان کرد هەمـوو چرنـووک دارێک (باڵـدار بێ یان ئـاژەڵ)، وە لـە (گۆشـتی) ڕەشـە وڵاخو مـەڕو بزنیـش، پیوەکانیانمان لێ حـەرام کردن مەگـەر ئەوەی کـە بەسـەر پشـتیانەوە بـێ، یان ئـەوەی بـە ڕیخۆڵەکانیانـەوە بێ، یـان تێکەڵ بووبـێو لکا بـێ بە ئێسـکەوە، بە هۆی سەرکێشـیانەوە ئـەو سـزایەمان دا، وە بێگومان ئێمە ڕاسـتگۆین).

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا السُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُوا مِنۢ بَعۡدِ
ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓا إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ إِنَّ
إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ
﴿١٢٠﴾ شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
﴿١٢١﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ
فِيهِۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا
كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ
وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ
رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ
﴿١٢٥﴾ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن
صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ
إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ
﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

(١١٩): ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ ﴾:

ئەمە هاندانێکە لە لایەن خوا ﷻ بۆ بەندەکانی، وە بانگەشە کردنیانە بۆ ملکەچیو داوای لێخۆشبوون، جا هەواڵی داوە هەر کەسێک تاوانێ ئەنجام بدات بە نەفامی ئەگەرچی بە ئەنقەستیش بێ، ئەوە بێگومان زانست لە دڵیدا کەم دەبێ، ئەو کاتەی کە گوناهەکە ئەنجام دەدات، جا ئەگەر تەوبەی کردو خۆی چاک کرد بەوەی لە تاوانەکە پەشێمان بوویەوەو کردەوەی باشی ئەنجامدا، ئەوە بێگومان لێی خۆش دەبێو میهرەبانی خۆی دادەبارێنێ بەسەریدا، وە تەوبەیشی لێ قبووڵ دەکاو دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخی سەرەتای، یان بەرزتر.

(١٢٠-١٢٢): ﴿ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنۡعُمِهِ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسۡتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی ئەو فەزڵو چاکەی کە بەخشیویەتی بە خۆشەویستی خۆی ئیبراهیم ﷺ، وە تایبەتی کردوە بە فەزڵو چاکەی تەواو، کە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً ﴾ واتە: پێشەوایەک بووە سەرجەم سیفەتەکانی خێرو چاکەی تێدا بووەو ڕێنمایی کار بووە، ﴿ قَانِتًا لِّلَّهِ ﴾ واتە: بەردەوام بووە لە گوێڕایەڵی پەروەردگاری، بە دڵسۆزی خوای پەرستوە، ﴿ حَنِيفًا ﴾ ڕووی کردۆتە خوا ﷻ بەوپەڕی خۆشەویستیو ملکەچیو بەندایەتیەوە، پشتی کردۆتە غەیری ئەو، ﴿ وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ لە وتەو کردەوەو هەموو حاڵەکانیدا، چونکە پێشەوای یەکتاپەرستان بوو.

﴿ شَاكِرًا لِّأَنۡعُمِهِ ﴾ واتە: خوا ﷻ لە دونیادا ناوو ناوبانگی باشی پێداوە، وە

سەرجەم نازو نیعمەتەکانی خۆی ڕشتووە بەسەریدا، ئەویش لە بەرانبەردا سوپاس گوزار بووە، جا دەرەنجامی ئەم سیفەتە بەرزانە ئەوەیە کە ﴿ ٱجۡتَبَىٰهُ ﴾ هەڵیبژاردووەو تایبەتی کردوە بە خۆشەویستی خۆی، وە کردوویەتیە پاکترین بەدیهێنراوەکانیو باشترین بەندە نزیکەکانی.

﴿ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ لە زانستو کردەوەیدا هەقو ڕاستی ناسیوەو پێشیخستووە بەسەر غەیری خۆیدا، ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ ﴾ ڕزقو ڕۆزیەکی بەرفراوانو خورەوشتی بەرز، ﴿ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ئەوانەی خاوەن پلەو پایەی بەرزن، وە نزیکن لە خوای بەرزەوە، لە گەورەترین فەزیڵەتو چاکەکانی ئەوەیە خوا ﷻ نیگای کردوە بۆ گەورەی دروست کراوەکانو تەواوترینیان کە شوێنی میللەتی ئیبراهیم بکەویو خۆیو ئوممەتەکەی پەیرەوی بکەن.

(١٢٤): ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ ﴾ واتە: فەرز کرا، ﴿ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ ﴾ واتە: ون بوون لە ڕۆژی هەینی، ئەوانیش جوولەکەکان بوون، ناکۆکیو جیاوازیان هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی پێویست بێ لەسەریان ڕێزی بگرنو بە گەورەی بزانن، ئەگەرنا فەزیلەتی ڕاستەقینە بۆ ڕۆژی هەینیە کە هیدایەتی ئەم ئوممەتە دراوە بۆ لای، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾ هەقو بەتاڵیان بۆ روون دەکاتەوە، وە کێ شایستەی پاداشتەو کێ شایستەی سزایە.

(١٢٥): ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴾ واتە: بانگەوازی خەڵکی بکە بە مسوڵمانو کافریانەوە بۆ ڕێبازی ڕاستو دروست، کە زانستی بە سوودو کردەوەی چاک لە خۆ دەگرێ، ﴿ بِٱلۡحِكۡمَةِ ﴾ واتە: هەر کەسێک بە پێی بارودۆخو تێگەیشتنی، وە وەرگرتنو ملکەچ بوونی بۆی، لە حیکمەتو دانایی ئەوەیە کە پێویستە بانگەواز کردن بە زانست بێ، نەک بە نەفامیو نەزانی، لە گرنگترینەوە بۆ گرنگ دەست پێبکات، چ شتێک نزیکترە بۆ تێگەیشتن بەوە دەست پێ بکات، وە بەوەی کە وەربگیرێ، بە نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی، جا ئەگەر بە حیکمەت ملکەچ بوو ئەوە چاکە، ئەگەرنا ئنجا ئامۆژگاری

لەگەڵیدا دەگوازرێتەوە بۆ ئامۆژگاری کردن بە شێوەیەکی جوان، ئەویش بریتیە لە فەرمانکردنو قەدەغەکردن کە بە هاندانو ترساندن بەستراوەتەوە، یان ئەو فەرمانانە دەگرێتەوە کە بەرژەوەندی تێدایە بۆی دەژمێردرێ، وە ئەو قەدەغەکراوانەش کە زیانی هەیە بە هەمان شێوە بۆی دەژمێردرێ، یان بە باسی ڕێزگرتن لەوانەی ئاین جێبەجێ دەکەن، وە سەرزەنشت کردنی ئەوانەی جێبەجێی ناکەن، یان بە باس کردنی ئەوەی خوا ﷻ دایناوە بۆ گوێڕایەڵان لە پاداشتی بە پەلە لە ئێستاو داهاتوودا، ئەوەی خوا ﷻ ئامادەی کردوە بۆ سەرپێچی کاران لە سزای بە پەلە لە ئێستاو داهاتوودا، ئەگەر بانگ کراو بینی ئەوەی ئەو لەسەری دەڕوا هەقو ڕاستە، یان بانگخواز بوو بۆ باتڵ، ئەوە مشتو مڕی لەگەڵدا دەکرێ بە چاکترین شێوە، ئەوە باشترین ڕێگایە کە دەبێتە مایەی بەدەمەوە هاتن بە عەقڵو نەقڵ، لەوانەش ئەو بەڵگانەی بۆ دەهێنرێتەوە کە بڕوای پێیەتی، بێگومان ئەوە نزیکترە بۆ بەدەستهێنانی مەبەست، وە نابێ ئەو مشتومڕە بگاتە ئاستی تۆمەتو قسەی ناشرینو لەکەدار کردنو ئامانجەکەی لە دەست بداتو هیچ سوودێک بە دەست نەیەت، بەڵکو پێویستە مەبەست تیایدا هیدایەتدانی خەڵکی بێت، نەک سەرکەوتن بەسەریدا!

وە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ (واتە: تۆ بەم شێوەیە مشتومڕیان لەگەڵ بکە پەروەردگارت باشتر بە حاڵی ئەوە دەزانێ کە لە ڕێی ئەو لایداوە) ئەو هۆکارە دەزانێ کە گومڕای کردوە، وە بە کردەوەکانی دەزانێ کە جێگیرن لەسەر گومڕایی، لە داهاتوویەکی نزیکدا لەسەریان پاداشت دەدرێتەوە، ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ دەزانێ ئەوان شایستەی هیدایەتن، ڕێنماییان دەکات پاشان منەت دەکات بەسەریانداو هەڵیاندەبژێرێت.

(۱۲۶-۱۲۸): ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾﴾

خوا ﷻ بە ڕاشکاوی باسی ڕەوایی دادپەروەریو کاری چاکە دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ﴾ ئەوەی خراپەتان لەگەڵدا دەکات بە گوفتارو کردار، ﴿فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾ (بە ئەندازەی ئەو ستەمە تۆڵە بکەنەوە) بە بێ زیادو کەم، لەسەر ئەوەی لەگەڵتاندا کردوویەتی، ﴿وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ﴾ لە تۆڵە کردنەوە، وە خۆشبوون

لـە تاوانەکەیـان، ﴿ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴾ لە تۆڵـە کردنەوە، ئەوەی لای خوایە باشـترە بۆتـانو چاکتریـن دەرەنجامی هەیە، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴿٤٠﴾ ﴾ الشـوری. (واتـە: هـەر کەسـێک ببـورێو چاکە بکات پاداشـتی لە لای خوایە).

پاشـان فەرمانی بـە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە بە ئارامگرتن لەسـەر بانگـەواز کردنی خەڵک بـۆ لای خـوا ﷻ، وە پشـت بەسـتن پێـی لەسـەر ئـەوە، وە خـۆی نەداتـە دەسـتی نەفسو ئـارەزوو، جا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾ خوا پشـتوانیت لێ دەکاتو جێگیـرت دەکات، ﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ﴾ (خەمیـان بـۆ مەخـۆ) کاتێ بانگیـان دەکەیت بـۆ لای ئـەم ئاینە وەڵامـت نادەنـەوەو وەریناگرن، بە ڕاسـتی خـەمو خەفەت هیـچ بەرهەم ناهێنـێ ﴿ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ ﴾ واتـە: دەڵتەنـگ مەبـە ﴿ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴾ بێگومان فـرو فێڵیان بەسـەر خۆیاندا دەشـکێتەوە، تۆ لە پارێـزکارانو چاکەکارانـی، بێگومان خواش لەگـەڵ پارێـزکارانو چاکـەکاران دایە، بە پشـتیوانیو یارمەتـی ئەوان خۆیـان دەپارێزن لە بێبڕوایـیو سـەرپێچی، چاکەخـوازن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، بە شـێوەیەک خوا دەپەرسـتن وەک ئـەوەی ببینـن، ئەگـەر ئـەوان نەیبینـن، بێگومـان ئـەو دەیانبینـێ، وە چاکەخـوازی لەگـەڵ خەڵکـدا بـە سـوود پێگەیاندنیـان لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە، داوا دەکەیـن لـە خـوا بمانگێڕی لـە پارێـزکارانو چاکەخوازان.

سوپاسو ستایش بۆ خوا

سوورەتی (النحل) تەواو بوو.


سورة الإسراء
بسم الله الرحمن الرحيم
سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَآتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِبَنِي إِسْرَائِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا مِنْ دُونِي وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولَاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلَالَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَاكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنْتُمْ أَحْسَنْتُمْ لِأَنْفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ لِيَسُوءُوا وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيرًا ﴿٧﴾

## تەفسیری سوورەتی (الإسراء)
## مەککیە (١١١) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١) ﴾

﴿ سُبْحَانَ الَّذِي ﴾ خوا ﷻ نەفسی پیرۆزی خۆی پاک ڕادەگرێو بە مەزنی باسی دەکات، چونکە خاوەن کردەوەی مەزنو منەتی گەورەیە کە لە کۆی ئەوانەدا ﴿ أَسْرَى بِعَبْدِهِ ﴾ (شەوڕۆیی کرد بە بەندەی خۆی) پێغەمبەرەکەی موحەممەد، ﴿ مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ کە ئەوە گەورەترین مزگەوتە بە ڕەهایی، ﴿ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى ﴾ یەکێکە لە مزگەوتە بەرێزەکان، شوێنی پێغەمبەرانە.

لە یەک شەودا شەوڕۆیی پێکراوە بۆ مەودایەکی دوور، لە هەمان شەودا گەڕاوەتەوە، خوا ﷻ هەندێ لە نیشانەو ئایەتەکانی خۆی پێشاندا، تا هیدایەتو بینایی پێ بەهێزو جێگیر بکات، ئەمەش لە گرنگیدانو سۆزو بەزەیی خوای بەرزە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کاتێ کاری بۆ ئاسان کردوە لە هەموو کاروبارەکاندا، وە نازو نیعمەتێکی پێبەخشیوە پێشی پێشینو پاشینیشی داوەتەوە.

ڕووکەشی دەقەکە ئەوە دەگەیەنێ شەوڕۆیی لە یەکەم شەودا بووە، وە لە نەفسی مزگەوتی حەرامەوە بووە، بەڵام لە فەرموودەی صەحیحدا جێگیر بووە، کە ئەم شەوڕۆیی پێکراوە لە ماڵی (أم هانيء)وە بووە، لەسەر ئەمە فەزڵی مزگەوتی حەرام دەدرێت بەسەر هەموو مزگەوتەکاندا، هەموویان خەڵکیان لێ کۆدەبێتەوە، وەک کۆبوونەوەیان لە هەمان مزگەوتدا، شەوڕۆییەکە بە ڕووحو جەستە بوو پێکەوە، ئەگەر

بـەو شـێوە نەبـێ نایێتـە نیشـانەیەکی مـەزنو چاکەیەکـی گەورە.
بێگومـان فەرموودەیەکـی زۆری جێگیـر لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ هاتووە دەربارەی شـەوڕۆیی، بـە دوورو درێـژی باسـی ئەوەی کـردوە کـە بینیویەتی.
پێغەمبـەر ﷺ شـەوڕۆیی پێکرا بـۆ (بیت المقدس)، پاشـان لەوێوە بەرز کرایەوە بۆ سـەرووی ئاسـمانەکان، بەهەشـتو دۆزەخـی بینـی، وە پێغەمبەرانیـش (علیهـم السـلام) بـە پێی پلەو پایەکانیـان، خـوا ﷻ پەنجا نوێژی فەرز کرد، پاشـان بـەردەوام دەگەڕێنرایـەوە بە ئاماژەی مووسـای کەلیـم ﷺ، هەتـا بـوو بە پێنـج نوێژ بە کـردەوە، لە بری پاداشـتی پەنجـا نوێژ، لـەو شـەوەدا خـۆیو ئۆممەتەکـەی ڕێـزو شـکۆیەکی گەورەیـان بەدەسـتهێنا، کـە کەس ناتوانـێ ئەندازەی بـکات جگە لـە خوا ﷻ.
وە بـاس کردنـی ئەمە لێـرەدا، وە لە پلەو پایـەی دابەزاندنـی قورئاندا، وە تەحـەددی کردنی دوژمنـان بـە سـیفەتی بەندایەتـی بـۆ خـوا، لەبـەر ئـەوە ئـەم هەمـوو پلـەو پایە بـەرزەی بەدەسـتهێنا، چونکـە بەندایەتـیو خواپەرسـتی بە تـەواوی بـۆ پەروەردگـاری بەجێهێنا.
کـە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ﴾ بە زۆری دارو درەخـتو ڕووبارو بارانی ڕەحمەتو هەرزانـی لـە پیـتو بەرەکەتەکانـی، فـەزڵو چاکـەی بەسـەر هەمـوو مزگەوتەکانەوەیـە، جگـە لـە مزگەوتی حـەرامو مزگەوتـی مەدینـە، بێگومان دروسـتە ڕێگا ببردرێو گەشـت بکـرێ بـۆ عیبـادەتو نوێژ کـردن تیایدا، خـوا ﷻ تایبەتی کـردوە بە شـوێنی زۆرێک لە پێغەمبەران (علیهم السـلام).

(٢-٨): ﴿وَءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي
وَكِيلٗا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ﴿٣﴾ وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ
إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ
أُولَىٰهُمَا بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا
﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَا لَكُمُ ٱلۡكَرَّةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَمۡدَدۡنَٰكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ أَكۡثَرَ نَفِيرًا
﴿٦﴾ إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ
وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾
عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يَرۡحَمَكُمۡۚ وَإِنۡ عُدتُّمۡ عُدۡنَاۚ وَجَعَلۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾﴾

زۆرجار خوا بەراورد دەکات لە نێوان پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺو پێغەمبەرایەتی مووسـا ﷺ، وە لـە نێـوان کتێبەکەیانـداو لـە نێـوان شـەریعەتەکەیاندا، چونکـە کتێبەکەیـان باشـترینی

کتێبەکانــو شــەریعەتەکەیان تەواوترینــی شــەریعەتەکانە، وە پێغەمبەرایەتیــان بەرزترینــی پێغەمبەرایەتیــو شــوێنکەوتووانیان زۆرترینــی بڕوادارانــن، بۆیــە لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ کــە بریتیــە لــە تــەورات ﴿ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ ڕێنمایــی پــێ وەردەگــرن لــە تاریکــی نەفامــی بۆ زانســت بە هــەقو ڕاســتی، ﴿ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴾ پێمــان وتــن (بێجگــە لــە مــن کــەس مەکەنــە پشــتیوان) تەنهــا لەبەر ئــەوەش کتێبمــان بــۆ دابەزانــدن، بەندایەتــی خــوا ﷻ بکــەن بــە تــاکو تەنهــاو ملکەچی بۆ بنوێنــن، تەنهــا ئەو بکەنە پشــتیوان لــە کاروباری دیــنو دونیایانــدا، خۆیان پەیوەســت نەکەن بــە دروســتکراوەکاندا، ئەوانــەی کــە هیچیــان بەدەســت نیــەو هیــچ ســوودێکیان پێناگەیەنن، ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴾ واتــە: ئــەی نــەوەی ئەو کەســانەی لەگــەڵ نووحــدا منەتمان کــرد بەســەریاندا لــە کەشــتیەکە هەڵمانگرتــن، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴾ ئەمە وەســفو پیاهەڵدانــی تێدایە لەســەر نووح عليه السلام بە بەجێهێنانی سوپاســگوزاری کردنی خــوا ﷻ، وە هاندانە بــۆ نەوەکانــی کە پەیــڕەوی بکــەن لە سوپاســگوزاریو شــوێنی بکــەون، یــادی نیعمەتەکانی خــوا بکەنــەوە بەســەریاندا، کاتێ کە هێشــتنیەوەو جێنشــینی کردن لەســەر زەویــدا، وە غەیری ئەوانــی نغــرۆ کرد.

﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتــە: ئاگادارمــان کردنــەوەو هەواڵمــان پێــدان لــە کتێبەکەیانــدا، ئــەوان دووجــار خراپــەکاری لەســەر زەویــدا بڵاودەکەنــەوە بە کــردەوەی خــراپو ســەرپێچیو لــووت بــەرزی بەســەر نیعمەتەکانــی خــوادا، وە زاڵبوونیــان بەســەر زەویو خۆبــەزل زانیــن تیایــدا، جــا کاتــێ یەکێــک لــەو دوو بەڵێنــە هاتــە دی، خــوا ﷻ دوژمــن زاڵ دەکات بەســەریانداو تۆڵەیــان لــێ دەســەنرێتەوە، ئەمــەش ئاگــادار کردنــەوەو ترســاندنێکە بەڵکــو بگەڕێنــەوەو بیــر بکەنــەوە.

﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا ﴾ واتە: یەکێک لەو دوو بەڵێنەی کە خراپەکاری تێدا دەکەن هاتەجێ ﴿ بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ ﴾ (دەینێرینە سەرتان) ناردنێکی قەدەری، وە زاڵی دەکەین بەسەرتاندا دەسەڵاتێکی گەردوونی وەک پاداشتێک، ﴿ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾ واتە: بەهێزو بە توانا، لە ڕووی ژمارەو خۆ ئامادەکردنەوە، خوا سەریان دەخات بەسەرتاندا، دەتانکوژنو ماڵو منداڵتان دەکەن بە کۆیلەو ماڵەکانتان تاڵان دەکەن، ئەوانە دەگەڕێن بە ناو وڵاتەکەتاندا ناشرینتان دەکەن، دەچنە مزگەوتی حەرامەوەو تێکی دەدەن، ﴿ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴾ ئەوە بەڵێنێکە دەبێ هەر ڕوو بدات، بە هۆی بوونی هۆکارەکەی تیایاندا.

شـیکەرەوانی مانـای قورئـان لـە دیـاری کردنـی ئەوانـەی زاڵ دەبـن جیاوازییـان هەیـە، بـەڵام یەکدەنگـن کـە ئەوانـە گەلێکـی بێبـڕوان، یـان لە خەڵکـی عێـراق، یـان جەزیرە، یـان غەیـری ئەوانـە، خـوا ﷻ زاڵیـان دەکات بەسـەر نەوەکانـی ئیسـرائیلدا کاتـێ تاوانو سـەرپێچیان زۆر دەبـێ، واز لـە زۆرێ لـە شـەریعەتەکەیان دەهێنـنو فەسـادو خراپەکاریی لەسـەر زەویـدا بڵاودەکەنـەوە ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ ﴾ واتـە: بەسـەر ئەوانەی زاڵبـوون بەسـەرتاندا، دەریـان دەکـەن لـە وڵاتەکەتـان، ﴿ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ ﴾ واتـە: ماڵو دارایی زۆرتان پێدەبەخشـینو زۆرتـان دەکەینو بەهێزتان دەکەین بەسـەریاندا، ﴿ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾ (لەشـکرتان لـە) ئـەوان (زیاتـر دەکەیـن)، ئەویـش بە هۆی چاکەکاریـیو ملکەچیتـان بـۆ خـوا ﷻ، ﴿ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ﴾ چونکـە چاکە کـە بـۆ خۆتـان دەگەڕێتـەوە، تەنانـەت لە دونیـادا، وەک چـۆن سـەرکەوتنی خۆتان بینـی بەسـەر دوژمنـدا ﴿ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ﴾ واتـە: ئـەوە زیانەکـەی هـەر بـۆ خۆتانـە، هـەروەک خـوا ﷻ پێی پیشـاندان لـە سەرخسـتنی دوژمنـدا ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ واتـە: بەڵێنـی دوایـن هـات کـە خراپـە دەکـەن لە زەویـدا، بـە هەمـان شـێوە جارێکی تر دوژمن زاڵ دەکەین بەسـەرتاندا ﴿ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ ﴾ بە سـەرکەوتنیان بەسـەرتانداو بـە کۆیلەکردنتـان، بچنـە ناو مزگەوتـی حەرامەوە، وەک چـۆن یەکەمجار چوونـە ناویەوە، مەبەسـتی لـە مزگـەوت، مزگەوتی (بیت المقـدس)ە، ﴿ وَلِيُتَبِّرُوا۟ ﴾ واتـە: وێرانی بکەنو بیروخێنـن، ﴿ مَا عَلَوْا۟ ﴾ لەسـەری ﴿ تَتْبِيرًا ﴾ مـاڵو مزگـەوتو دانەوێڵەتـان تێکبدەن،

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ
حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ
الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾
وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾
وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾
وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ
النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ
السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ
إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا
يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا
﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ
عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ
رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا
فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ
مِن بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾

﴿ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ﴾ جارێكی تر زاڵتان بكات بەسەریانداو ڕەحمتان پێبكات، نەتانكات بە سەرمایە، وە هەڕەشەی لێكردوون لەسەر سەرپێچی كردنو، فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ عُدتُّمْ ﴾ بۆ خراپەكاریی لەسەر زەویدا ﴿ عُدْنَا ﴾ (دەگەڕێینەوە) بۆ سزادانتان، جا بۆ گەڕانەوە بۆ ئەوە خوا ﷻ پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ زاڵ كرد بەسەریاندا، خوا بە پێغەمبەر تۆڵەی لێكردنەوە، ئەمە سزای دونیایان بوو، ئەوەیشی لەلای خوایە لە ڕیسوایی‌و تۆڵەكردنەوە مەزنترو خراپترە (لە دوارۆژ)، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴾ پێدەگەن‌و تیایدا دەمێننەوەو دەرناچن بۆ هەمیشەیی.

ئەم ئایەتانە ئاگادار كردنەوەیە بۆ ئەم ئوممەتە لە ئەنجامدانی گوناهو سەرپێچی، لەبەر ئەوەی وەك نەوەكانی ئیسرائیلیان لێ نەیەت، سوننەتی خوا یەكەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، هەر كەسێك تەماشای زاڵ بوونی كوفرو ستەمكاران بكات بەسەر مسوڵمانانەوە، بۆی دەردەكەوێ ئەوە بە هۆی گوناهەكانیانەوەیە سزا دەدرێن، ئەوان ئەگەر دەست بگرن بە كتێبی خوا ﷻو سوننەتی پێغەمبەرەكەی، لەسەر زەویدا جێگیریان دەكات‌و سەریان دەخات بەسەر دوژمنەكانیاندا.

(٩-١٠): ﴿ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕێزو گەورەیی قورئان، بێگومان ئەو ﴿ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ ﴾ واتە: دادوەرترین‌و بەرزترینە، لە عەقیدەو بیروبڕوا، لە كردەوەو ڕەوشت، هەر كەسێ ڕێنمایی لە قورئانەوە وەربگرێ، تەواوترینی مرۆڤەكانەو بەهێزترینیانە، وە ڕێنمایی كراوترینیانە لە هەموو كاروبارەكانیدا، ﴿ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ ﴾ لە فەرزو سوننەتەكان، ﴿ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾ خوا لەماڵی ڕێزی خۆیدا بۆی ئامادە كردوون، كە هیچ كەس لە وەسفی نازانێ جگە لە خۆی، ﴿ وَأَنَّ الَّذِينَ لَا

يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾ قورئان گشتگیرە لەسەر مژدەو ئاگادار کردنەوە، ئەو هۆکارانەی باس کردوە کە مژدەکە دەیانگرێتەوە، ئەویش بڕواهێنانو کردەوەی چاکەیە، وە ئەوەشی شایستەی هەڕەشەیە، پێچەوانەی ئەمەیە.

(١١): ﴿ وَيَدۡعُ ٱلۡإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلۡخَيۡرِۖ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولٗا ﴿١١﴾ ﴾:

ئەمەش لە نەفامیو پەلە کردنی مرۆڤە، کاتێ کە تووڕە دەبێ دوعای خراپ لە خۆیوماڵو منداڵی دەکات، ئەوەندە دەستپێشخەری لەو دوعایەدا دەکات، هەروەکو چۆن دەستپێشخەری لە دوعای خێردا دەکات، بەڵام خوا ﷻ بە بەزەیی خۆی، وەڵامی دوعای چاکە دەداتەوە، وەڵامی دوعای خراپە ناداتەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡ ﴿١١﴾ ﴾یونس، (واتە: وە ئەگەر خوا پەلەی بکردایە (لە وەرگرتنی دوعای) خراپەدا بۆ خەڵکی، وەک پەلە کردنی (لە قبوڵ کردنی دوعای) خێرو خۆشی، ئەوە ماوەکەیان کۆتایی پێ دەهێنرا.

(١٢): ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةٗ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ﴿١٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِ ﴾ واتە: بەڵگەن لەسەر تەواوی دەسەڵاتی بەرفراوانی خوا، ئەو خوایەی کە نابێ بەندایەتی بکرێ بۆ ئەو غەیری ئەو، ﴿ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ ﴾ واتە: نیشانەی شەومان تاریک کرد بۆ پشوودانو حەسانەوە، ﴿ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةٗ ﴾ واتە: ڕووناکمان کردەوە، ﴿ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾ لە کاروکاسبیو پیشەو بازرگانیو گەشتەکانتاندا ﴿ وَلِتَعۡلَمُواْ ﴾ بە هاتنی شەوو ڕۆژو گۆڕانی مانگ، ﴿ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَ ﴾ جا هەرچی بەرژەوەندیتان هەیە لەسەری بوونیادی دەنێن، ﴿ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ﴾ واتە: هەموو نیشانەکانمان بە ڕوونو ڕەوانی باس کردوە، هەتا شتەکان لە یەکتر جیابینەوە، وە هەق لە ڕاستی دەربکەوێ هەروەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾الأنعام، (واتە: هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردوە لەم کتێبەدا).

(١٣-١٤): ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦ ﴾ ئەمە هەواڵێکە دەربارەی تەواوی دادپەروەری خوا، بێگومان هەموو مرۆڤێک لە ڕۆژی دواییدا کردەوەی خۆی لە گەردنیدایە، واتە: هەر

کردەوەیەکی چاک‌و خراپ لەگەڵ خاوەنەکەیدایەو نادرێ بەسەر کەسێکی تردا، لێ پرسینەوەی لێناکرێ لەسەر کردەوەی غەیری خۆی، ﴿ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ كِتَـٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴾ هەموو کردەوەکانی تێدایە لە چاکەو خراپەو لە بچووک‌و گەورەش، پێی دەوترێ: ﴿ ٱقْرَأْ كِتَـٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾ (پێی دەوترێ: نامەکەت بخوێنەرەوە، ئەمڕۆ خۆت بەسە بە حیساب کەر بە سەر خۆتەوە) بە ڕاستی ئەمە لە مەزنترین ویژدان‌و دادپەروەریە بە بەندەیەک بوترێ: لێ پرسینەوەی خۆت بکە، تا دانی پێدا بنێ کە شایستەی سزایە.

(١٥): ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾:

واتە: ڕێنمایی هەموو کەسێک‌و گومڕابوونی تەنها بۆ خۆیەتی، هیچ کەس تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ، بە قەد گەردیلەیەک خراپەی لەسەر لانابرێت، خوای بەرز دادپەروەرترینی دادپەروەرانە، هیچ کەس سزا نادات تا بەڵگەو حوججەی لەسەر پێویست نەکات بە پەیامێک، پاشان نکوڵی لە حوججەو بەڵگەکە بکات، بەڵام هەر کەسێک ملکەچی بەڵگە بێت، یان بەڵگەی پێ نەگەیشتبێ لە لایەن خواوە، ئەوە ئەم ئایەتە دەکرێت بەبەڵگە ئەوانەی کە لە نێوان دوو سەردەمدا ژیاون‌و پەیامی پێغەمبەرایەتیان پێ نەگەیشتوە، هەروەها منداڵی هاوبەش دانەران خوا ﷻ سزایان نادات، هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ، چونکە پاک‌و پاڵفتەیە لە ستەم.

(١٦-١٧): ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَـٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿١٧﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کاتێ بیەوێ دانیشتوانی شارو وڵاتێک لە ناو ببات لەو شارە ستەمکارانە، وە لە بنج‌و بنەوانە دەری بێنێ، فەرمانیان پێدەدات بە گوێڕایەڵی‌و کردەوەی چاک بە دەوڵەمەندە خراپەکارو زۆردارەکانیانەوە، جا ئەوان لە فەرمان دەردەچن‌و یاخی دەبن ﴿ فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ ﴾ واتە: سزایەک پێویست دەبێ لەسەریان گەڕانەوەی بۆ نیە، ﴿ فَدَمَّرْنَـٰهَا تَدْمِيرًا ﴾ (واتە: جا ئەو شارانە وێران دەکەین بە وێران کردنێکی تەواو).

ئەو گەل‌و نەتەوانە زۆر بوون کە خوا ﷻ بە سزا لە ناوی بردن لە پاش گەلی نووح، وەک عادو سەموود، گەلی لووط، وە جگە لەوانیش لەوانەی کە سزا دران کاتێ کە زۆر گومڕاو بێبڕوا بوون، خوای گەورەش سزای مەزنی بۆ دابەزاندن ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾ جا زوڵم‌و ستەم دەکەن‌و لە خوا ﷻ ناترسن، بێگومان سزایان دەدا لەسەر ئەو کردارانەیان.

مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ
جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ
ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ
سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ
عَطَآءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ
فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ
تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا
﴿٢٢﴾ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا
يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ
أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا
جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى
صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ
فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ
وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ
كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾

**(١٨-٢١):** ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەوەی ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ﴾ ژیانی دونیا، ﴿ ٱلْعَاجِلَةَ ﴾ بە سەرچوو فەوتاو، کارو کۆششی بۆ بکات، سەرەتاو کۆتایی بیر بچێتەوە، بێگومان خوا ﷻ زوو پێی دەدات بە ویستی خۆی، لەوەی خوا ﷻ بۆی نوسیووە لە (لوح المحفوظ)، بەڵام چێژو لەزەتێکی کاتی بێ سوودەو بەردەوام نیە، پاشان لە دوارۆژدا بۆی داناوە ﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا ﴾ واتە: دەچێتە ناویەوەو سزا دەدرێ، ﴿ مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴾ واتە: لە حاڵەتێکی لۆمەکراویو ڕیسوایی دا، وە سەرزەنشت کردن لە لایەن خواو دروستکراوەکانی، وە لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە میهرەبانی خوا ﷻ، خوا سزاو ڕیسوایی پێکەوە بۆ کۆ دەکاتەوە، ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾ پێی ڕازیەو فەزڵی دەدات بەسەر دونیادا ﴿ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا ﴾ ئەوەی کە کتێبە ئاسمانیەکان بانگەشەیان بۆ کردوە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ جا بە پێی توانا کاری بۆ دەکات ﴿ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾ (بڕواداریش بێ) بە خواو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دوایی ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾ واتە: وەردەگیرێو زیاد دەکات، پاداشتیان لە لای پەروەردگاریانە، لەگەڵ ئەمەدا، لە دونیادا بێبەش نابن، دەبەخشین بە بڕوادارو بێبڕوا، چونکە بەخشینو چاکەی ﴿ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾ واتە: بەخششی پەروەردگارت لە کەس قەدەغە نەکراوە، بەڵکو هەموو خەڵکی لە نازو نیعمەتی خوا ﷻ بەهرەمەندن ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ لە دونیادا، بە بەرفراوانی ڕزقو ڕۆزیو کەم بوونی، وە بە نارەحەتیو ئاسانکاری، بە زانستو نەفامی، بە عەقڵو

گەمژەیی، جگە لەوانەش لەو کاروبارانەی کە خوا ﷻ فەزڵی هەندێ لە بەندەکانی داوە بەسەر هەندێکی دیکەدا، ﴿ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴾ نازو نیعمەتی دونیاو لەزەتەکانی بە دوارۆژ هاوتا ناکرێن، بە هیچ جۆرێ لە جۆرەکان، چەندە دوورە نێوان ئەو کەسەی لە ناو کۆشکی بەرزو ژیانێکی خۆش‌و خێرێکی زۆرو زەبەند دایە، لەگەڵ ئەوەی لەناو دۆزەخدا پێچ دەخوات‌و سزای بە ئێش دەدرێت، هەموو خەڵکی ئەو دوو جێگایە جیاوازیەکی زۆریان لە نێواندا هەیە کە لە ژماردن نایەت.

(٢٢): ﴿ لَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾:

واتە: پێت وانەبێ کە هیچ یەکێک لە دروستکراوەکان شایستەی شتێکە لە پەرستن، وە یەکێک لەوانە مەکە هاوبەش بۆ خوا ﷻ لە پەرستشدا، بێگومان ئەوە دەبێتە مایەی سەرزەنشت‌و لۆمە کردن، خوای مەزن‌و فریشتەکان‌و پێغەمبەرەکانی، هاوبەش دانانیان قەدەغە کردوە، ئەو کردەوەیان شەرمەزارو سەرکۆنە کردوە، (مرۆڤ) بە پێی دوور کەوتنەوەو وازهێنانی لە پەروەردگاری تووشی ڕیسوایی‌و سەرشۆڕی دەبێ، جا هەر کەسێ خۆی هەڵبواسێ بە غەیری خوادا، ئەوە زەلیل‌و ڕیسوا دەبێ، هیچ یەکێک لە بەدیهێنراوەکان سوود بە یەکێکی تر ناگەیەنێ بە ویستی خوا ﷻ نەبێ، هەروەکو چۆن هەر کەسێ لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر دابنێ، سەرشۆڕی‌و ڕیسوایی بۆ هەیە، جا هەر کەسێ بە تەنها بیپەرستێ‌و دڵسۆز بێ بۆ ئاینی خوا ﷻ‌و تەنها خۆی هەڵبواسێ بە خواوە، بێگومان ئەوە ستایش کراوە لە هەموو رووەکانەوە.

(٢٣-٢٤): ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾:

کاتێ کە خوا ﷻ هاوبەش دانانی قەدەغە کرد فەرمانی بە یەکتاپەرستی کرد، جا فەرمووی: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ ﴾ (کە) فەرمانێکی ئاینی‌و بڕیارێکی شەرعی (یە)، ﴿ أَلَّا تَعْبُدُوا ﴾ (هیچ) کەسێک لە خەڵکی ئاسمانەکان‌و زەوی، وە زیندوو مردوو نەپەرستن ﴿ إِلَّا إِيَّاهُ ﴾ (جگە لە خوا)، چونکە تاک‌و تەنهاو بێ نیازە، کە خاوەن سیفەتی تەواوە، وە لەو سیفەتانەشدا مەزنترینیان بە شێوەیەک لە هیچ شتێ ناچێت لە دروست کراوەکانی، ئەو خاوەنی نیعمەتە دیارو نادیارەکانە، کە ڕێگرە لە هەموو ڕق‌و کینەکان، بەدیهێنەرە، ڕۆزیدەرە، ڕێکخەری هەموو کاروبارەکانە، ئەو تاک‌و تەنهایە لە هەموو ئەوانە، غەیری ئەو (هیچ کەس) خاوەنی هیچ شتێک نیە لە ئەوانە (ی باس کران).

پاشان دوای مافی خۆی، باسی بەجێهێنانی مافی دایکو باوکی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ واتە: چاکە لەگەڵ دایکو باوکدا بکەن بە هەموو ماناکانی چاکە لەگەکردن، بە زارەکیو کرداری، چونکە ئەوان هۆکاری بوونی بەندەن، ئەوەندە خۆشەویستیان هەیە بۆ منداڵو چاکەخوازن لەگەڵیداو نزیکن لێیەوە ئەوە پێویست دەکات چاک بن لەگەڵیاندا ﴿ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا ﴾ واتە: ئەگەر گەیشتنە ئەو تەمەنە تواناو هێزیان لاواز دەبێو پێویستیان بە نەرمو نیانیو چاکە دەبێ، ﴿ فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ ﴾ ئەمە کەمترین پلەکانی ئازارو زیان پێگەیاندنە، بەوە ئاگاداری کردۆتەوە لەسەر ئەوانی تر، مانای ئەوەیە بە کەمترین شێوە ئازاریان نەدەن، ﴿ وَلَا تَنْهَرْهُمَا ﴾ واتە: تێیان مەخورنو سەرزەنشتیان مەکەن، وشەی زبریان بەرانبەر بەکارمەهێنن ﴿ وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾ بە وشەیەک پێیان خۆش بێ، وە بە ئاکاری جوانو قسەکردن بە نەرمو نیانی لەگەڵیاندا، تا ئارامی بە سەر دەروونیان دابێ، ئەویش دەگۆڕێ بە پێی کاتو شوێنو بارودۆخەکان، ﴿ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ ﴾ واتە: باڵی خۆ بە کەم زانینو زەلیلیو میهرەبانیان بۆ ڕابخە، لە پێناو وەرگرتنی پاداشتدا، نەک لەبەر ئەوەی دەترسن لێیان، یان بە ئومێدی ئەوەی شتێکیان لێ بە دەست بێنن، وە هاوشێوەی ئەم مەبەستانە بەندە هیچ پاداشتێکی لەسەر وەرناگرێ، ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا ﴾ واتە: داوای ڕەحمەتو میهرەبانیان بۆ بکە، بە زیندوویيو بە مردوویی، لە پاداشتی پەروەردەکردنیان کاتێ کە منداڵ بووی، لەمەشدا ئەوە وەردەگیرێ هەتا پەروەردە باشترو زیاتر بێ، هەقو مافیش زیاتر دەبێ، بە هەمان شێوە هەرکەسێکیش مرۆڤێ پەروەردە بکات لە دینو دونیایدا پەروەردەیەکی چاکو تەندروست جگە لە دایکو باوک، ئەوە بێگومان لەسەری پێویستە مافی ئەو کەسە بدات کە پەروەردەی کردوە.

(٢٥): ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ ﴾.

﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ﴾ پەروەردگاری بەرزتان ئاگادارە چی لە دڵو دەروونتاندا هەیە لە خێرو شەڕ، ئەو تەماشای کردەوەو جەستەتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات لەوەی کە تیایدایە لە خێرو شەڕ، ﴿ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ ﴾ بەو شێوەی کە ویستو ئیرادەتان لەسەر ڕەزامەندی خوا ﷻ بێ، وە حەز بکەن لێی نزیک ببنەوە لە دڵەکانتاندا هیچ ئیرادەیەکی جێگیر نەبێ بۆ غەیری خوا ﷻ، ﴿ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ لای لە هەموو کاتەکاندا داوای لێخۆش بوون دەکەن، ﴿ غَفُورًا ﴾ ئەوەی خوا ﷻ ئاگاداربێ بەسەر دڵیەوە، وە بزانی هیچی تێدا نیە جگە لە ملکەچ بوونو خۆشویستنو نزیک بوونەوە نەبێ، ئەگەرچی هەندێ جار وەک سروشتی مرۆڤ هەڵەو تاوان بکات، ئەوە بێگومان خوا لێی خۆش دەبێ، وە لەو

گوناهەش خۆش دەبێ کە هاتۆتە ڕێگەی بێ ئەوەی بەردەوام بێ لە سەری.
(٢٦-٣٠): ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ (مافی خزمانت بدە) لە چاکە کردن لەگەڵیانداو ڕێزگرتنیان، لە واجبو سوننەت، وە ئەو مافەش دەگۆڕێ بە پێی گۆڕینی بارودۆخەکان، وە خزمان، وە بە پێی پێویستیو نەبوونی پێویستی، ﴿ وَٱلْمِسْكِينَ ﴾ مافی خۆی پێبدە لە زەکاتو غەیری زەکات، تا پێویستیەکانی پڕ بکاتەوە، ﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ئەویش ڕێبوارێکە دابڕابێ لە وڵاتو شارەکەی، پێی دەدرێ لەماڵو سامان بە شێوەیەک زیان لە خاوەن ماڵو سامان نەدات، وە زیاتریش نەبێ لە ئەندازەی پێویست، بە ڕاستی ئەوە دەبێتە زێدەڕۆیی، خوا ﷻ نەهی لێکردوە.
وە خوای بەرز هەواڵیداوە: ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴾ چونکە شەیتان بانگەشە ناکات تەنها بۆ سیفەتی خراپو قێزەون نەبێ، مرۆڤ بانگ دەکات بۆ ڕەزیلیو خۆ گرتنەوە، ئەگەر گوێڕایەڵی نەکرد بانگی دەکات بۆ ئیسرافو زێدەڕۆییو دەست بڵاوی، بێگومان خوای مەزنیش فەرمان دەکات بە دادپەروەرترینی شتو کاروبارەکان، وەک سیفەتی خۆی، وەک لە فەرموودەی خۆی دەربارەی بەندە چاکەکانی ڕەحمان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾ الفرقان، (واتە: وە کەسانێکن کاتێ ماڵو سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیانو خێزانیان) زێدەڕۆییو ڕەزیلیو دەست نوقاوی (تێدا) ناکەن، (بەڵکو) مام ناوەندینو لەو نێوانەدا.
لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ﴾ (دەستت مەکە کۆتو بەند لە گەردنتدا) ئەمە کینایەیە لە توندی خۆگرتنەوەو ڕەزیلیو چرووکی، ﴿ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ ﴾ (وە دەستت کراوەش مەکە بە تەواوی) ببەخشی بە کەسێ کە پێویستی بە بەخشین نەبێ، یان زیاد لە پێویست ببەخشی، ﴿ فَتَقْعُدَ ﴾ (دەکەوی) ئەگەر وا بکەی ﴿ مَلُومًا ﴾ واتە: لۆمەو سەرزەنشت دەکرێی لەسەر ئەو کارە، ﴿ مَّحْسُورًا ﴾ واتە: دەستت بەتاڵ دەبێو هیچ بە دەستتەوە نامێنێ لە سەروەتو سامانو کەسیش مەدحو پیاهەڵدانت ناکات.

وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا
مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا
كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ
لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟
أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ
خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ
سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ
وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى
ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى
هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ
مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ
ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ
ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾
وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ
ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾

ئەم پێدانە بەسەر خزمو کەسدا لە کاتی دەوڵەمەندیو هەبوونیو توانادا، بەڵام لەگەڵ نەداریدا، یان دەست کورتی خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە قسەی شرینو جوان وەڵام دانەوەیان، جا فەرموویەتی: ﴿ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا ﴾ واتە: ڕووت لەو خزمانە وەرگێرا چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا ﷻ بوویت کارت بۆ ئاسان بکات، ﴿ فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴾ واتە: قسەی جوانو نەرمو پەیمانی چاک، لە کاتی بوونی هەلێکدا، وە عوزری بۆ بهێنەوە بەوەی کە لە ئێستادا لە تواناتدا نیە، هەتا دڵیان ئارام بێتەوە، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ﴿٢٦٣﴾ ﴾ البقرة، (واتە: قسەیەکی خۆشو چاوپۆشی (لە هەڵەدا) چاکترە لە خێرێک کە ئازارو دڵ ئێشانی بە دواوە بێ).

ئەمەش بە هەمان شێوە لە نەرمو نیانیو میهرەبانی خوایە، فەرمانی پێکردوون بە چاوەڕوانی دەرگای ڕەحمەتو ڕزقو ڕۆزی لە لایەن ئەوەوە، چونکە چاوەڕوانی ئەوە عیبادەتە، بە هەمان شێوە پەیمان پێدانیان بە چاکە لەگەڵ کردن لە کاتی کردنەوەی دەرگای خێردا، چونکە نیەتی کاری چاکە بە چاکە حیساب دەکرێ، لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەوەی لە توانادایە خێرو چاکە بکات، وە نیەت بهێنێ لەوەی کە لە توانایدا نیە، تا پاداشتی لەسەر وەربگرێ، بەڵکو خوا ﷻ بە هۆی ئومێد بوونی بۆی ئاسان بکات.

پاشان خوا ﷻ هەواڵ دەدات تەنها ئەو ڕزقو ڕۆزی بەرفراوان دەکات بۆ هەر کەسێ بیەوێ لە بەندەکانی، وە تەنگی دەکاتەوە بۆ هەر کەسێ کە بیەوێ، بە دانایيو حیکمەتی خۆی، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾ پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەوەی کە دەیزانێو چاک بێ بۆیان، وە کاروباریان بەڕێوە دەبات بە سۆزو میهرەبانيو ڕێزو بەخشندەیی خۆی.

(٣١): ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾:

ئەمەش لە میهرەبانی خوایە بەرانبەر بە بەندەکانی، کاتێ کە بە بەزەییترە لە دایکو باوکیان، قەدەغەی کردوە لەسەر دایکو باوک منداڵەکانیان لە ترسی هەژاریو نەبوونیدا بکوژن، ڕزقو ڕۆزی هەمووی لە ئەستۆ گرتوە، وە هەواڵی داوە کە بە ڕاستی کوشتنیان هەڵەو تاوانێکی گەورەیە، واتە: لە تاوانە هەرە گەورەکانە، چونکە میهرەبانی لە دڵدا نامێنێو سەرپێچیەکی گەورەیە، بوێریە بەسەر کوشتنی منداڵەوە ئەوانەی کە هیچ تاوانو سەرپێچیەکیان نەکردوە.

(٣٢): ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾ قەدەغە کردن لە نزیک بوونەوەی ڕەوانبێژ تر (بەهێزتر)ە لە قەدەغە کردن لە ئەنجامدانی، چونکە بە ڕاستی ئەوە قەدەغەکردنە لە پێشهاتو هۆکارەکانی، بێگومان: (من حام حول الحمى، يوشك أن يقع فيه) (واتە: ئەوەی بە دەوری شتێکی پارێزراودا بسوڕێتەوە، نزیکە بکەوێتە ناوی)، بە تایبەت ئەم کارە کە لە زۆر نەفسو دەرووندا زۆرترین حەز بۆ لای دەجوڵا، خوا ﷻ وەسفی زینای کردوە، ناشیرینو قێزەونی کردوە بەوەی کە ﴿ كَانَ فَٰحِشَةً ﴾ واتە: بە ڕاستی گوناهێکی زۆر قێزەونە لە شەرعو عەقڵو سروشتدا، لەبەر ئەوەی بوێری لە خۆدە گرێ بەرانبەر بە مافی خوا ﷻ، وە مافی ئافرەت، مافی خانەوادەی، یان مافی مێرد، وە تێکدانی جێ نوێنو تێکەڵ بوونی ڕەچەڵەک، وە جگە لەوانەش لە خراپەکاریەکان، وە فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿ وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ واتە: ڕێگەیەکی پیسو خراپە، ڕێگەی ئەو کەسەی کە جورئەت دەکات لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە مەزنە.

(٣٣): ﴿ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي ﴾ واتە: ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو نەفسو دەروونێک، ﴿ حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴾ خوا ﷻ کوشتنی ئەو نەفسەی حەرام کردوە، بچووکو گەورە، نێرو مێ، ئازادو کۆیلە، مسوڵمانو کافرێک گرێبەستی لەگەڵدا کرابێ ﴿ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ وەکو کوشتنی نەفس بە نەفس، وە زیناکاری خاوەن خێزانو ئەو کەسەی وازی لە ئاینەکەی هێناوە لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابووەتەوە، وە سنوور بەزێن لەو ماوەی سنوور بەزاندنیدا، ئەگەر چارە نەکرێ تەنها بە کوشتن نەبێ ﴿ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا ﴾ واتە: بە ناهەق، ﴿ فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ ﴾ واتە: ئەویش نزیکترین کەس دەگرێتەوە لە کوژراوەکە ﴿ سُلْطَٰنًا ﴾ واتە: بەڵگەیەکی ڕوونو

ئاشکرا لەسەر تۆڵە کردنەوە لە بکوژ، بە هەمان شێوە دەسەڵاتی داوە بەو کەسە لەسەر ئەو کارە، ئەویش بە شێوەیەک کاتێ هەموو مەرجە پێویستەکان لە خۆ دەگرێ کە پێویستە بۆ تۆڵە کردنەوە، وەک کوشتنی بە ئەنقەستو دژایەتی، وە هاوشانبوون، ﴿ فَلَا يُسْرِف ﴾ (با زێدەڕۆیی نەکات) خاوەنەکەی ﴿ فِّي ٱلْقَتْلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴾ ئیسرافو زێدەڕۆیی: بریتیە لە سنوور بەزاندن، یان بکوژ دەشێوێنی، یان دەیکوژی لەسەر شتێکی دیکە نەک لەسەر کوشتنەکە، یان کەسێکی تری غەیری بکوژ دەکوژێ.

ئەم ئایەتە دەبێتە بەڵگەی ئەوە کە هەقو ماف لە کوشتندا لە دەستی خاوەنەکەی دایە، تۆڵەی لێناکرێتەوە تەنها بە ویستی ئەو نەبێ، ئەگەر لێی خۆش بوو کوشتنەکە هەڵدەگیرێ، بێگومان خاوەنی کوژراو خوا ﷻ خۆی پشتیوانی دەکات لەسەر بکوژ، وە ئەوەشی کە پشتیوانی دەکات هەتا دەگات بە کوشتنی.

(٣٤): ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ ﴾.

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ ﴾ ئەمەش لە سۆزو بەزەییو میهرەبانی خوایە بەرانبەر بە هەتیو کە باوکی لە دەستداوە، لە کاتێکدا کە منداڵە، بەرژەوەندی خۆی نازانێو ناتوانێ پێی هەستێ، فەرمانی کردوە بە خاوەنەکانی بە پاراستنیو پارێزگاری لە ماڵەکەیو چاکەکردن لەگەڵیدا، وە نزیکی نەکەونەوە، ﴿ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾ لە بازرگانی کردن پێیو نەخرێتە مەترسیەوە، وە دڵنیابوون لە پێگەیشتنی، ئەویش درێژ دەبێتەوە تا: ﴿ يَبْلُغَ ﴾ هەتیوەکە دەگاتە ﴿ أَشُدَّهُۥ ﴾ واتە: کەماڵی ژیریو عاقڵی، جا ئەگەر گەیشتە تەواوی ژیری، خاوەندارێتی لەسەر لادەچێو خۆی دەبێتە خاوەنی خۆیو ماڵەی پێ دەدرێتەوە، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾النساء.(واتە: جا ئەگەر هەستتان کرد لەوانەدا ژیریو پێگەیشتن هەیە ئەوە سامانو ماڵەکانیان پێبدەنەوە).

﴿ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ﴾ (وەفا بکەن بە پەیمانەکانتان) کە پەیمانتان داوە بە خوا ﷻ لەسەری، وە لەوەشی کە داوتانە بە خەڵکی، ﴿ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾ واتە: بەرپرسیارن لەسەر وەفابوون پێیو نەبوونی، جا ئەگەر بە وەفا بوون، ئەوە پاداشتی بێ پایانتان بۆ هەیە، وە ئەگەر بەجێتان نەهێنا، ئەوە تووشی گوناهی مەزن بوون.

(٣٥): ﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ ﴾.

﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴾ ئەمە فەرمانە بە دادپەروەریو بە ڕێکو

پێکی کێشانەو پێوانە کردن، بە بێ کەم کردنەوەو فێڵ کردنو لێ دەرکردن، مانای گشتی دەقەکە قەدەغە کردنی غەش کردن لە نرخو شمەکو هاوشێوەکانی دەگرێتەوە، وە هەروەها فەرمان کردن بە ئامۆژگاریو ڕاستگۆیی لە مامەڵەکردندا ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ لە نەبوونی ﴿وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ واتە: چاکترین دەرەنجامی هەیە، بەو شێوەیە بەندە سەلامەت دەبێ لە گوناه، وە بەوە بەرەکەت دادەبەزێ بەسەریدا.

(٣٦): ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ٣٦﴾

﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ واتە: شوێنی شتێک مەکەوە کە هیچ زانیاریەکت دەربارەی نیە، بەڵکو تەئکید بکە لەوەی کە دەیڵێیتو دەیکەیت، وا گومان مەبە ئەوە بۆت دەچێتە سەر، ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ هەقی خۆیەتی بەندە کە دەزانێ ئەو بەرپرسیارە لەوەی کە دەیڵێو دەیکات، وە لەوەی کە ئەندامەکانی جەستەی ئەنجامی دەدات کە خوا ﷻ بۆ بەندایەتی خۆی دروستی کردوە، وەڵامێک بۆ ئەو پرسیارە دیاری بکات، ئەوەش نابێ تەنها بە بەندایەتیو دڵسۆزی نەبێ بۆ خوا ﷻ، وە دەست هەڵبگرێ لەوەی خوا ﷻ پێی ناخۆشە.

(٣٧-٣٩): ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ٣٧ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ٣٨ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ٣٩﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ بە لووت بەرزیو کەشو فشەوە، لووت بەرزی لە بەرانبەر هەق، خۆبەزل زانین بەسەر خەڵکەوە ﴿إِنَّكَ﴾ تۆ لەو کارەتدا ﴿لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ لە لووت بەرزیتدا، بەڵکو بەو ڕەفتارەت بێ نرخ دەبی لە لای خوا ﷻ، بە هەمان شێوە لە لای خەڵکیش، خوێن تاڵو ڕەزا قورس دەبی، بێگومان خراپترین ڕەوشتت بەدەستهێناوە، وە خۆت بە ناشرینترین شت پۆشیوە، بێ ئەوەی هەست بکەیت بەوەی کەناگیر کەوتووی ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ﴾ ئەو باسکراوانەی کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ (واتە: هیچ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا مەپەرستە)، وە قەدەغەی سەرپێچی کردنی دایکو باوکو ئەوەشی (عطف) دەکرێ بەسەر ئەوەدا، ﴿كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ واتە: هەموو ئەوانە زیان بە ئەنجامدەرانی دەگەیەنێو خوای بەرزیش ڕقی لێ دەبێتەوەو دەیبوغزێنی،

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم
بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾
وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِيَذَّكَّرُواْ وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورٗا ﴿٤١﴾
قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا
﴿٤٢﴾ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن
لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قَرَأۡتَ
ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا
مَّسۡتُورٗا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ
وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴿٤٦﴾
نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ
إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرۡ
كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾
وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەوەی کـە باسـمان کـردو روونمـان کـردەوە لـەو حوکـمو بریـارە گەورانـە ﴿ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ﴾ بـە ڕاسـتی حیکمـەت، فەرمان کردنـە بـە کارو کـردەوە جوانـەکانو ڕەوشـتە بـەرزەکان، وە قەدەغـە کردنـە لـە ڕەوشـتە ناشـرینەکانو کـردەوە خراپـەکان.

وە ئـەم کردەوانـەی بـاس کـراون، لـەم دەقانـەدا پـڕن لـە حیکمەتـی بـەرز، کـە پەروەردگـاری جیهانیـان نیگـای کـردوە بـۆ پێشـەوای پێغەمبـەران، لـە بەڕێزتریـن کتێبـدا، بـۆ ئـەوەی فەرمانـی پێبـکات بە باشـترین ئۆممـەت لـە باشـترین کتێبـدا، ئەمـە لـەو حیکمەتانەیـە کـە هـەر کەسـێ پێـی درابـێ ئـەوە خێرێکـی زۆری پێـدراوە.

پاشـان بـە قەدەغەکردنـی عیبادەتـی غەیـری خـوا ﷻ کۆتایـی پێدێنـێ، وەک چـۆن بـەوە دەسـتی پێکـرد، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ ﴾ واتـە: بـۆ هەمیشـەیی، بێگومـان هـەر کەسـێک هـاوەڵ بـۆ خـوا دابنـێ، ئـەوە خـوا ﷻ بەهەشـتی لـێ قەدەغـە کـردوە، وە بـۆ هەمیشـەیی لـە نـاو ئاگـردا دەمێنێتـەوە، ﴿ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴾ واتـە: لۆمـەو نەفریـنو سەرزەنشـت دەکـرێ لـە لایـەن خـواو فریشـتەکانو سـەرجەم مرۆڤەکانـەوە.

(٤٠): ﴿ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ ﴾:
ئەمـە نکووڵـی کردنێکـی توونـدە لەسـەر ئـەو کەسـانەی وا دەزانـن خـوا ﷻ لـە دروسـتکراوەکانی کچانـی بـۆ خـۆی دانـاوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ ﴾ واتـە: کوڕانـی بـۆ ئێـوە هەڵبـژادووەو بـە تـەواوی دابەشـی کـردوە، وە لـە فریشـتە مێینەکانیشـدا کچانـی بـۆ خـۆی هەڵبـژاردوە، کاتـێ ئـەوان وایـان دەزانـی فریشـتەکان کچـی خـوای مەزنـن ﴿ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ﴾ گەورتریـن

کەللـە ڕەقـیو بوێـری تێدایـە بەرانبـەر بـە خـوا ﷻ، کاتـێ منداڵتـان داوە پاڵـی بـۆ پێویسـتیەکانی، وە بـێ نیـازی هەنـدێ لـە دروسـت کـراوەکان لێـی، وە حوکمیـان بـۆ دا بـە خراپترینـی ئـەو دوو بەشـە، ئەوانـەش مێینـەکان بـوون، ئـەو خوایـەی دروسـتی کـردوون نێرینەکانـی هەڵبـژاردوە، بـەرزی بـۆ خـوا ﷻ لـەوەی سـتەمکاران دەیڵێـن بـە بەرزیەکـی گـەورەو بـێ وێنـە.

(٤١-٤٢): ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّابْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِي الْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بێگومـان بـە چەندەهـا جۆر بـۆ بەندەکانـی هێنـاوە لـەم قورئانـەداو ڕوونـی کردوەتەوە، وە بەڵگەیەکـی زۆری بـۆ هێناونەتـەوە لەسـەر ئـەوەی بانگـی بـۆ کـردوون، وە ئامۆژگـاری کـردوەو یـادی خسـتوەتەوە، بـۆ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە، ئـەوەی سـوودی هەیـە بۆیـان ئەنجامـی بـدەن، ئەوەشـی زیانـی هەیـە وازی لـێ بێنـن، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی پشـتیان کـرد لـە ئایـەتو نیشـانەکانی خـوا، بـە هـۆی ئـەوەی ڕقیـان لـە هـەق بـوو، وە حەزیـان لـەو بەتـاڵو بـێ بنامەیـە بـوو کـە لەسـەری بـوون، تەنانـەت دەمارگیریـان دەکـرد لەسـەر بەتاڵـی پڕوپووچیـان، گوێیـان نەگـرت لـە نیشـانەکانی خـوا، بەڵکـو هـەر بـە خەیاڵیشـیاندا نەهـات.

لـە مەزنترینـی ئـەو نیشـانەو بەڵگانـەی بـۆ بەنـدەکان هێنایتیـەوە، بریتیـە لـە یەکتاپەرسـتی کـە بنچینـەی هەمـوو بنەماکانـە، فەرمانـی پێکـردوە، وە پێچەوانەکەشـی قەدەغـە کـردوە، وە بەڵگـەی عەقڵـیو نەقڵـی زۆری بـۆ ئـەو مەبەسـتە هێناوەتـەوە، بـە شـێوەیەک هـەر کەسـێ گـوێ بـۆ هەندێکـی بگـرێ، گومـان لـە دڵـدا نامێنـێ.

لـەو بەڵگانـەی لەسـەر ئـەوەی باسـکرا، ئـەم بەڵگـە عەقڵیەیـە کـە لێـرەدا باسـی کـردوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ قُل ﴾ بـەو هاوەڵدانەرانـەی لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوێکی تـر دەپەرسـتن: ﴿ لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ ﴾ (ئەگـەر لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی تر هەبووایـە، وەک هاوبـەش دانـەران دەیڵێـن) بـە پێـی بۆچـوونو درۆ هەڵبەسـتنی ئەوان، ﴿ إِذًا لَّابْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِي الْعَرْشِ سَبِيلًا ﴾ واتـە: ڕێگایەکیـان دەگرتـە بـەر بـۆ لای خـوا ﷻ، بـە عیبـادەت کـردنو ملکەچـی بـۆی، وە خـۆ نزیـک کردنـەوەو پشـت بەسـتن پێـی، چـۆن بەندەیەکـی هـەژارو بـێ دەرەتـان لەگـەڵ خـوادا دەکاتـە شـەریکو هاوبـەش؟!

ئایـا ئەمـە گەورەتریـن زوڵـمو گەمژەیـی نیـە؟! جـا لەسـەر ئـەم واتایـە، ئـەم دەقـە وەک ئــەم ئایەتەیــە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ ﴿٥٧﴾ ﴾الإسراء، (واتــە: ئەوانــەی کــە ئــەو نەفامانــە هاواریــان لێدەکــەن، بــە دوای هۆکارێکــدا دەگەڕێــن کــە نزیکیــان بکاتــەوە لــە پەروەردگاریــان، کامیــان نزیکتــرە (لــە خــواوەو پلــەو پایــەی بەرزتــر بــێ).

ئەمــە وەک ئــەو ئایەتەیــە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمۡ أَضۡلَلۡتُمۡ عِبَادِي هَٰٓؤُلَآءِ أَمۡ هُمۡ ضَلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِي لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ﴿١٨﴾ ﴾الفرقـان، (واتـە: وە لـەو ڕۆژەدا خـوا ئـەو بتپەرسـتانە کۆدەکاتـەوە لەگـەڵ ئـەو پەرسـتراوانەی کـە پەرسـتوویانن جگـە لـە خـوا (بـە پەرسـتراوەکان)، دەڵـێ: ئایـا ئـەو بەندانـەی منتـان گومـڕا کـرد، یـان خۆیـان ڕێگـای ڕاسـتیان ون کـردو گومـڕا بـوو * پەرسـتراوەکان دەڵێـن: پـاکو بێگـەردی بـۆ تـۆ، بـۆ ئێمـە شایسـتە نەبـووە کـە بێجگـە لـە تـۆ پەرسـتراوێک بـۆ خۆمـان دابنێیــن).

وە دەگونجــێ مەبەســتیش لــە ئایەتــی: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ﴾ ئــەوە بــێ: ڕێگایــان دەبــڕیو هەوڵیــان دەدا ســەرکەون بەســەر خــوادا، لــە کاتێکــدا ئــەو پەروەردگــاری پەرســتراوە، بێگومــان ئــەوان بــاش دەیانزانــیو دانیــان پێــدا دەنــا ئــەو پەرســتراوانەی کــە دەیانپەرســتن غەیــری خــوا ﷻ بــێ توانــاو بــێ دەســەڵاتنو هیــچ شــتێکیان لــەو کاروبــارەدا نیــە، جــا ئەگــەر دەیانزانــی حاڵیــان وایــە بــۆ دەیانپەرســتن؟ ئەمــەش وەک فەرمــوودەی خــوای بــەرزە: ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٖ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍۚ إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ ﴿٩١﴾ ﴾المؤمنـون، (واتــە: خــوا هیــچ ڕۆڵەیەکــی بــۆ خــۆی بڕیــار نــەداوە، وە هیــچ پەرســتراوێکی تــری لەگەڵــدا نەبــووە (ئەگــەر پەرســتراوی تــری لەگەڵــدا بووایــە، ئەوکاتــە هــەر پەرســتراوێک چــی دروســت کــردوە (بــۆ خــۆی) دەبــرد، وە هەندێکیــان زاڵ دەبــوون بەســەر هەندێکــی تریانــدا).

﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ ﴾ واتــە: پاکــیو بــەرزو بڵنــدیو گەورەیــی بــۆ خــوا ﷻ، ﴿ عَمَّا يَقُولُونَ ﴾ لــە هاوبــەش بــۆ خــوا دانــانو دانانــی بــت لەگەڵیــدا، ﴿ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴾ بــەرزیو مەزنــی بــۆ ئــەو خوایــەی کــە هیــچ پەرســتراوێک توانــای ئــەوەی نیــە هاوشــانی بــێ،

بـە ڕاسـتی ئـەو کەسـەی ئـەو قسـانەی وت گومـڕا بـوو بـە گومڕابوونێکـی ڕوونو ئاشـکرا، وە سـتەمێکی گـەورەی کـرد، بێگومـان هەمـوو بەدیهێنـراوە مەزنـەکان مـل بۆ مەزنـی خـوا ﷻ دادەنوێنـنو ستایشـی دەکـەن، لـە ئاسـمانەکانو ئـەوەی لـە ناویانـدا هەیـە، وە حـەوت چینـی زەویو ئەوەیشـی تیایدایـە، ﴿ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ﴿٦٧﴾ ﴾الزمـر، (واتـە: هەمـوو زەوی لـە چنگـی ئـەو دایـە، وە هەمـوو ئاسـمانەکانیش بـە دەسـتی ڕاسـتی ئـەو پێچراونـەوە).

جیهانـی سـەرو خـوارەوە پێویسـتیان پێیەتـی پێویسـتیەکی خودیـی، لـە هیـچ تاکێکیـان جیـا نابێتـەوە لـە کاتێکـدا، ئەمـە هەژاریـە لـە گشـت ڕووەکانیـەوە، هەژاریـەک لـە ڕووی دروسـتکردنو ڕزقو ڕۆزیو بەڕێوەبردنـدا، وە هەژاریەک لـە ڕووی ناچاربوونەوە، بـۆ ئـەوەی پەرسـتراوو خۆشەویسـتیان بـێ، کـە بـەو دەتوانـن نزیـک ببنـەوە، وە لـە هەمـوو حاڵێکـدا لـەو دەترسـن، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَىْءٍ ﴾ لـە گیانـداری قسـەکەرو قسـەنەکەر، وە لـە داروو درەخـتو زینـدوو مـردوو، ﴿ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ ﴾ بـە زمانـی قسـە کـردن ﴿ وَلَـٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾ واتـە: زیکـرو تەسـبیحاتی بەدیهێنراوەکانـی تـر کـە لەسـەر زمانـی ئێـوە نیـن، بەڵکـو خـوای زانـای پەنهـان دەوری داون، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ کاتـێ کـە سـزای پێـش نەخسـت بـۆ ئەوانـەی کـە قسـەیەکیان کـرد، خەریـک بـوو ئاسـمانەکان دەکەوتـنو کێوەکانیـش لـە شـوێنی خۆیانـدا دەڕووخـان، بەڵکـو مۆڵەتـی پێـدانو نـازو نیعمەتـی ڕشـت بەسـەریاندا، وە لێیـان خـۆش بـوو ڕزقو ڕۆزی دابارانـد بـە سـەریاندا، بانگـی کـردن بـۆ داوای لـێ خۆشـبوون لـەو تـاوانو گوناهـە مەزنـە، تـا پاداشـتی بـێ پایانیـان بداتـەوەو لـە گوناهەکانیـان خـۆش بێـ، جـا ئەگـەر لەسـەرخۆیی‌و لێبوردەیـی ئـەو نەبووایـە ئاسـمانو زەوی دەکەوتـن بەسـەر یەکـدا، ئـەو کات هیـچ بەدیهێنراوێـک لەسـەر زەویـدا نەدەژیـا.

(٤٥-٤٨): ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾ ﴾

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی ســزای بــە درۆ دانەرانــی هــەق، ئەوانــەی ڕەتیــان کــردەوەو پشــتیان تێکــرد، خــوا ﷻ بــەر بەســتێک دروســت دەکات لــە نێــوان ئــەوانو ئیمانــدا، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴾ کــە ئامۆژگــاریو یادخســتنەوەو ڕێنمایــیو ئیمــانو خێــرو زانســتێکی زۆری تێدایــە، ﴿ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا مَّسۡتُورٗا ﴾ دایــان دەپۆشــێ بــە تێگەیشــتنی حەقیقــی، وە لــە تێگەیشــتنی ڕاســتیەکانی، وە ملکــەچ بــوون بــەوەی کــە بانگــی دەکات بــۆ خێــرو چاکــە، ﴿ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً ﴾ واتــە: چەنــد پەردەیەکــی زۆر ئەســتوور، بۆیــە ناتوانــن ســوود لــە قورئــان وەربگــرن، بەڵکــو بــە شــێوەیەک دەیبیســتن تــا لەســەریان ببێتــە حوججــەو بەڵگــە ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ ﴾ واتــە: گوێیــان کــەڕ دەکەیــن لــە ئاســت بیســتنیدا ﴿ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾ بانگەشــە بــۆ یەکتاپەرســتی دەکــەی، نەهــی دەکــەی لــە هاوبــەش بــۆ دانانــی ﴿ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴾ لەبــەر ئــەوەی زۆر ڕقیــان لێیەتــیو خۆشەویســتیان بــۆ ئــەوە هەیــە کــە پــووچو باتڵــە، هەروەکــو خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾الزمر، (واتــە: وە کاتێــک یــادی خوا ﷻ بکــرێ بــە تــاکو تەنهــا تێکدەچــێ، وە بێــزار دەبــێ دڵــی کەســانێ کــە بڕوایــان بــە ڕۆژی دوایــی نیــە، کەچــی کاتــێ نــاوی پەرســتراوەکانی بێجگــە لــە خــوا ببــرێ یەکســەر شــادو ڕووخــۆش دەبــن).

﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ ﴾ واتــە: لەبــەر ئــەوەی ڕێگریمــان لێکــردوون ســوود نەبینــن لــە بیســتنی قورئــان، چونکــە ئێمــە دەزانیــن مەبەســتەکانیان خراپــە، دەیانــەوێ بچووکتریــن شــت بدۆزنــەوەو تانــەو تەشــەری لێ بــدەن، لەبــەر ئــەوەی گــوێ گرتنیان بــۆ وەرگرتنــی ڕێنمایــیو وەرگرتنــی هــەق نیــە، بەڵکــو ئــەوان بــە ئەنقەســت دەیانەوێ شــوێنی نەکــەون، هــەر کەســێ حاڵــی وابــێ، گــوێ گرتــن هیــچ ســوودێکی بــۆی نیــە، لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ ﴾ واتــە: پێکــەوە چپــە دەکــەن، ﴿ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ لــە چپــە چپەکانیانــدا ﴿ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴾ جــا ئەگــەر ئەمــە چپــە چپــی نێــوان خۆیــان بــێ کــە پــڕە لــە ستەمو بوونیادیــان نــاوە لەســەر ئــەوەی موحەممــەد ﷺ جــادوو لێکــراوە، ئــەوان ســوورن لەســەر ئــەوەی کــە هیــچ نرخــێ بــۆ قســەکانی ئــەو دانانێــن، ئــەو لێــی تێکــەڵ بــووە، نازانــێ چــی ئێــژێ.

خـوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ ٱنظُرۡ ﴾ واتــە: بــە سەرســووڕمانەوە ســەرنج بــدە، ﴿ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾ کــە خراپتریــن نموونــەن، وە دوورترینیــان لــە ڕاستیەوە، ﴿ فَضَلُّواْ ﴾ گومــڕا بــوون لــە ئــەوەدا، یــان هــۆکاری گومــڕا بوونیــان بــوو، چونکــە کاروبارەکەیــان لەســەر ئــەوە بوونیادنــا، هــەر شــتێ لەســەر پــووچ بنیــاد بنــرێ بێگومــان پووچــە، ﴿ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴾ واتــە: بــە هیــچ شــێوەیەک ڕێگای ڕاســت نادۆزنــەوە، بەشــیان تەنهــا گومڕایــی تــەواو ســتەمە.

(٤٩-٥٢): ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ
حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ
مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا ﴿٥١﴾ يَوۡمَ
يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٥٢﴾ ﴾

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی قســەی ئەوانــەی نکوولــی لــە زینــدوو بوونــەوە دەکــەنو بــە درۆی دەخەنــەوەو بــە دووری دەزانــن، بــە وتەکانیــان ﴿ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا ﴾ واتــە: ئێســکێکی پتــورکاو ﴿ أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴾ واتــە ئــەوە نابــێ، بــە بۆچوونــی ئــەوان ئــەوە ئەســتەمەو مەحاڵــە، جــا نەفامیــان کــرد بەوپــەڕی نەفامــی، کاتــێ پێغەمبەرەکانیــان بــە درۆ خســتەوەو ئینــکاری ئایەتەکانــی خوایــان کــرد، توانــای بەدیهێنــەری ئاســمانەکانو زەویــان ئەنــدازە کــرد بــە توانــای لاوازی خۆیــان، کاتــێ کــە بینیــان خۆیــان ناتوانــنو لــە تواناکانیانــدا نیــە ئــەو کارە بکــەن، بــە هەمــان شــێوەش تەماشــای توانــاو دەســەڵاتی خوایــان کــرد، پاکــی بــۆ ئــەو خوایــەی بەدیهێنراوێکــی لــە نــاو دروســتکراوەکانیدا بەدیهێنــاوە، وا دەزانــن ئــەوان خــاوەن عەقــڵو ژیریــن، نموونەیــە لــە نەفامــی بەرانبــەر ئاشــکراترین شــتو دیارترینیانــدا، تــا نیشــانی بەندەکانی بــدات، ئــەوە هیــچ نیــە جگــە لــە یارمەتــیو پشــتیوانی ئــەو نەبــێ، یــان لــە ناو بــردنو گومــڕا کــردن.

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾آل عمــران، (واتــە: پەروەردگارمــان دوای ئــەوە کــە ڕێنماییــت کردوویــن دڵمــان لامــەدە، وە لەلایــەن خۆتــەوە بەزەییمــان پــێ ببەخشــە، بــە ڕاســتی تــۆ زۆر بەخشــەری)، لەبــەر ئەمــە فەرمانــی بــە پێغەمبەرەکــەی ﷺ کــردوە بەوانــە بڵــێ کــە نکوولــی هاتنــی ڕۆژی دوایــی دەکــەنو بــە دووری دەزانــن:

﴿قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾

﴿قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ﴾ واتـە: مەزنتـر بـێ، ﴿فِى صُدُورِكُمْ﴾ تا ملکـەچو تەسـلیمی ببن -بە بڕوای خۆتان- لەوەی کە دەسەڵاتی خوا ﷻ پێتـان نەگـات، یـان ویسـتی بەسـەرتاندا جێبەجـێ نەبـێ، بێگومـان ئێـوە لـە ژێـر دەسـتی خـوا ﷻ دەرناچـن، جـا لـە هـەر حاڵەتێکـدا بـن، وە لەسـەر هەر وەسـفێک بـن، ئێوە دەسـەڵاتی خـۆ بەڕێوەبردنتان نیە، نە لـە حاڵەتی ژیانـدا، نە لە حاڵەتـی مردندا، بەڕێوەبـردنو گۆڕانـکاری بـە دەسـتی ئەو خوایەیـە کە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا زاڵە، وە دەوری هەمـوو شـتێکی داوە.

﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ کاتـێ بەڵگەیـان لەسـەر پێویسـت دەکـەی دەربـارەی زیندووبوونـەوە ﴿مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هـەروەک چـۆن یەکەمجار دروسـتی کـردن، کە شـتێکی باسـکراویش نەبـوون، بێگومان جارێکـی تـر بەدیتـان دێنێتـەوە، ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾﴾الأنبياء. (واتـە: وەک یەکـەم جـار چـۆن دروسـتمان کرد (بـە ڕووتو قوتی پـاش مردنیش ئەو دروسـت کردنـە) دووبـارە دەکەینەوە).

﴿فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ﴾ واتـە: بە گاڵتەجاریو سەرسـوڕمانەوە سـەرت بـۆ دەلەقێنن لـەوەی کە دەیفەرمـووی، ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ﴾ واتە: کەی کاتـی زیندووبونەوە دێت بە بـڕوای تۆ؟ ئـەوان دانیان نەناوە بـە زیندوو بوونـەوەدا، بەڵکو بـە گاڵتەجـاریو بێبڕواییەوە وا دەڵێـن، ﴿قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا﴾ واتـە: لـە دیـاری کردنـی کاتەکەیـدا هیـچ سـوودێک نیـە، بەڵام سـوود لـە دانپێدانـانو چەسـپاندنی دایە، ئەگـەر هەر شـتێ ڕووبدات ئـەوە نزیکـە، ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ﴾ بـۆ زینـدوو بوونـەوەو دەرچوونتـان لـە گـۆڕەکان، فوو دەکـرێ بە کەڕەنـادا (الصـور) ﴿فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ﴾ واتە: ملکەچـی فەرمانەکانی دەبـنو لێی یاخـی نابن.

وە دەفەرمـوێ: ﴿ بِحَمْدِهِۦ ﴾ واتـە: خـوا سـتایش کراوە لەسـەر ئـەوەی ئەنجامـی دەدات، وە بەندەکانـی پـێ پاداشـت دەداتـەوە کاتـێ کۆیـان دەکاتـەوە لـەو ڕۆژەی بانـگ لـە یەکتـری دەکـەن، ﴿ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ لـەوەی چەنـدە بـە پەلـە ڕوویـداوە، وە ئـەوەی تێپـەڕی بەسـەرتاندا لـە نـازو نیعمەتـەکان دەڵێی هـەر ڕووی نـەداوە، ئەمـە ئەوەیە کە نکوولی کاران قسـەی لەسـەر دەکـەن: ﴿ مَتَىٰ هُوَ ﴾ (کـەی دێت؟) پەشـێمان دەبنەوە ئەوپـەڕی پەشـێمان بوونـەوە کاتـی کـە ڕوودەدات، وە پێیان دەوتـرێ: ﴿ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾المطففين. (واتـە: ئەمـە ئەوەیـە کـە بڕواتان پـێ نەدەکرد).

(٥٣-٥٥): ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا۟ ٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّۦنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾:

ئەمـەش لە نـەرمو نیانـی پەروەردگارە بەرانبـەر بە بەندەکانـی کاتێ فەرمانـی پێکردوون بە جوانتریـن ڕەوشـتو کـردەوە، وە وتەیـەک بێێتـە مایەی خۆشـبەختی دونیـاو دوارۆژ، جا فەرموویەتـی: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا۟ ٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ ئەمـە فەرمانێکـە بە هەمـوو وتەیەک لـە خـوا ﷻ نزیکـی بکاتـەوە، لـە خوێندنـی قورئـانو یادکردنـەوەو زانسـتو فەرمان بە چاکـەو قەدەغـە کردنی خراپە، وە قسـەی جوانو شـرین لەگـەڵ خەڵکیدا، لەسـەر جیاوازی پلـەو پایەیـان، ئەگەر کەوتـە نێـوان دوو کاری چاکـەوە، بێگومـان فەرمانـی پێدەکرێ بە بەجێهێنانـی چاکترینیـان، ئەگـەر نەتوانرێ لەگـەڵ یەکتردا کـۆ بکرێتەوە.

وتـەی جوانو شـرین هۆکارە بۆ هەموو ڕەوشـتێکی جوانو کردەوەی چـاک، بێگومان هەر کەسـێک زمانـی بگرێ، زاڵ دەبێ بەسـەر هەمـوو کاروبارەکانیدا، وە فەرمـوودەی خوا ﷻ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾ واتـە: هـەوڵ دەدات ناکۆکـی بخاتـە نێـوان بەنـدەکان، بـۆ ئـەوەی دیـنو دونیایـان لـێ تێـک بـداتو پووچـی بکاتـەوە، جـا چـارەی ئەمـە ئەوەیە، بـە گوێـی نەکـەن لـە وتـە خراپەکانـدا کـە بانگیـان دەکات بـۆ لای، لـە نێوانـی خۆیاندا نـەرمو نیـان بن، تـا شـەیتان بپروکێ کە دەیـەوێ ناکۆکـی بخاتـە نێوانیان، بە ڕاسـتی ئەو دوژمنـی ڕاسـتەقینەی ئەوانە، کە پێویسـتە لەسـەریان دژایەتـی بکەن، بێگومان ئـەو بانگیان دەکات، ﴿ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾فاطر. (واتـە: بـۆ ئەوەی ببنـە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرسـاوی دۆزەخ).

بـەڵام براکانیـان، بێگومـان ئەگـەر شـەیتان ناکۆکـی خسـتە نێوانیـان، وە هەوڵـی دوژمنایەتـی دا، بـە ڕاسـتی دەبـێ ورەیـان بـەرز بـێ، هەوڵبـدەن دژی دوژمنەکەیـان بجوڵێنـەوە، دەبـێ نەفـسو دەروونـی فەرمانـکار بـە خراپـە دابمرکێننـەوە، کـە شـەیتان لەوێـوە دەچێتـە ژوورەوە، بـەو شـێوەیە گوێڕایەڵـی پەروەردگاریـان دەبـنو کاروباریـان بـە ڕێـکو پێکـی بەڕێـوە دەچـێ، وە دەگەڕێنـەوە بـۆ ڕێنمایـی خۆیـان ﴿ رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِكُمۡ ﴾ (واتـە: پەروەردگارتـان زاناتـرە) لـە خۆتـان، جـا هیچـی لـە ئێـوە نـاوێ جگـە لـە خێـرو چاکـە نەبـێ، وە فەرمانتـان پێنـاکات تەنهـا بـەوە نەبـێ کـە بەرژەوەنـدی ئێـوەی تێدایـە، هەنـدێ جـار ئێـوە شـتێکتان دەوێ خێـر لـە پێچەوانەکـەی دایـە، ﴿ إِن يَشَأۡ يَرۡحَمۡكُمۡ أَوۡ إِن يَشَأۡ يُعَذِّبۡكُمۡ ﴾ ئەگـەر بیەوێـت سـەرکەوتوی دەکات بـۆ هۆکارەکانـی ڕەحمـەت، وە ئەگـەر بیـەوێ ڕیسـواو زەلیلـی دەکات، ڕێـی لـێ وێـڵ دەکات، ئەوجـا شایسـتەی سـزا دەبـێ، ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴾ (ئێمـە تۆمـان نەنـاردوە بـە چاودێـرو پارێـزەر بەسـەریانەوە) کاروباریـان ڕێـک بخـەی، وە هەسـتیت بـە پاداشـت دانەوەیـان، بەڵکـو خـوا ﷻ خـۆی سەرپەرشـتیارە، تـۆ ڕاگەیەنـەرو ڕێنمایـی کاری بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت، ﴿ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ بـە هەمـوو جۆرەکانـی بەدیهێنـراوەکان، جـا دەیبەخشـێ بـە هەمـوو یەکێـک لەوانـەی کـە شایسـتەیەتی، وە حیکمەتـی خـۆی وا دەخـوازێ، فـەزڵ چاکـەی هەندێکیـان دەدات بەسـەر هەندێکـی تـردا لـە هەمـوو نیشـانەو تایبەتمەندیـە هەسـتیاریو مەعنەویـەکان، هەروەکـو چـۆن فـەزڵو چاکـەی هەنـدێ لـە پێغەمبەرانـی بەشـدار بـوو لـە نیگـای خۆیـدا بەسـەر هەندێکـی ترەوەیـە، بـە چاکـەو تایبەتمەندیـەکان کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی خـوا ﷻ منەتـی کـردوە بەسـەریدا، لـە وەسـفە جوانـەکانو ڕەوشـتە بـەرزەکانو کـردەوە چاکـەکان، وە زۆری شـوێنکەوتوان، وە دابەزاندنـی کتێبـەکان بـۆ هەندێکیـان، کـە حوکـمو بڕیـارە شـەرعیەکانی لـە خـۆ گرتـووە، لەگـەڵ بیروبـڕوا پاکـەکان، وەک چـۆن زەبـووری بـۆ داوود علیه السلام دابەزانـد، ئەویـش کتێبێکـی ناسـراوە، جـا بێگومـان خـوا ﷻ فـەزڵو چاکـەی هەندێکیانـی داوە بەسـەر هەندێکـی تـردا، وە کتێبـی بـە هەندێکیـان بەخشـیوە، بـە درۆ دانـەران نکوڵیـان لـە موحەممەدیـان ﷺ لـەو پەیامـەی کـە خـوا بـۆی دابەزاندبـوو، وە بـە هەمـان شـێوە ئـەو فـەزڵو پلـەو پایـەش کـە پێـی بەخشـیوە لـە پێغەمبەرایەتـیو دابەزاندنـی کتێـب.

(٥٦-٥٧): ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا ٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورًا ٥٧ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ ﴾ بـە هاوبـەش دانـەران بـۆ خـوا، بڵـێ: ئەوانـەی کـە بت‌و هاوشـێوەکانیان داتاشـیوە، جگـە لە خـوا دەیانپەرسـتن وەک چۆن خوا دەپەرسـتن، وە لێیان دەپاڕێنـەوە وەک چـۆن لـە خوا ﷻ دەپاڕێنـەوە، ناچاریان بکە بە حەقیقەتی ئـەوەی بڕوایان پێیەتـی، ئەگەر ئەوان ڕاسـت دەکـەن: ﴿ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم ﴾ (هاوار بکەنـە ئەوانەی کە) بـە خواتـان دەزانیـن بێجگـە لـە خـوا ﷻ تەماشـا بکـەن ئایـا سـوودیان هەیە بۆتـان، یان دەتوانـن زیانتان لـێ دوور بخەنەوە، بێگومان ئـەوان ﴿ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ ﴾ لـە نەخۆشـی، یـان هـەژاری، یـان ناڕەحەتـی‌و وێنـەی ئەوانـە، بـە گشـتی ناتوانـن ڕەتی بکەنەوە ﴿ وَلَا ﴾ بە هەمان شـێوە دەسـەڵاتی گۆڕینیشـیان نیە لە کەسـێکەوە بۆ کەسـێکی تـر، وە لـە ناخۆشـی‌و گرانەوە بـۆ ئاسـانکردن، جا ئەگـەر پەرسـتراوەکانیان بـەم جۆرەن، ئیتـر بە چـی هۆکارێکـەوە داوایـان لێدەکـەن بێجگە لـە خـوا ﷻ؟ بێگومان ئـەوان تەواو نیـن‌و کـردەوەی چاکیشـیان نیە، جـا دانانیان (بـەو کارەیان) نـا تەواویە لە ئایـن‌و عەقڵدا، وە گەمژەییـە لە بیـرو بۆچووندا.

لـە شـتە سەرسـوڕهێنەرەکان ئەوەیـە: گەمژەیـی بە بـەردەوام بـوون‌و ڕاهاتـن لەگەڵیدا، وە وەرگرتنـی لـە باو باپیـرە گومڕاکانـەوە، خاوەنەکەی وا بزانـێ بۆچوونێکی تـەواوو چاکەو عەقڵێکـی باشـە، وە دڵسـۆزی بـۆ دین خـوای تـاک‌و تەنهاو تەواو لـە هەمـوو ڕووەکانەوە بـە ئاشـکراو نهێنـی، گەمژەییـە، وە لـەوەش سەرسـوڕهێنەرتر ئەوەیە وەکو چـۆن هاوبەش دانـەران دەیانـوت: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ ﴾ص. (واتـە: ئایـا (موحەممـەد ﷺ) هەمـوو پەرسـتراوەکانی کردوەتـە یـەک پەرسـتراو، بـە ڕاسـتی ئەمـە شتێکی زۆر سەرسـوڕهێنەرە).

پاشـان بـە هەمان شـێوە خـوا ﷻ هەواڵـی داوە، ئەوانەی دەیانپەرسـتن‌و هاواریـان پێدەکەن جگـە لـە خـوا ﷻ، (بـۆ نموونـە: جوولەکە بـۆ عوزەیـر، گـاور بۆ عیسـا، موشـریکەکان بـۆ فریشـتە)، ئـەوان بـێ ئاگان لەوانـەی هاواریـان پێدەکـەن، ئەوانیـش هـەژارن بەرانبەر بـە خـوا ﷻ‌و بـە دوای هۆکارێکـدا دەگەڕێـن خـوا لێیـان خـۆش بـێ، جـا فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ ﴾ لـە پێغەمبـەران‌و پیاوچـاکان‌و فریشـتەکان، ﴿ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ

رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ ﴾ کێبڕکێ دەکەن بۆ نزیک بوونەوە لە خوا ﷻ، وە ئەوەی لە توانایان دایە لە کردەوەی چاک بەکاری دەهێنن، کە نزیک کەرەوەیە لە خوای مەزن و لە میهرەبانی، وە لە سزای دەترسن، خۆیان بە دوور دەگرن لە هەموو ئەوانەی دەیانگەیەنێت بە سزا، ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴾ بە ڕاستی پێویستە زۆر خۆپارێز بێ لە سزای خوا، وە لە هۆکارەکانیشی، ئەم سێ شتە، ترس و ئومێدو خۆشەویستی، کە خوا ﷻ وەسفی ئەو بەندە نزیکانەی پێکردوە لە خۆیەوە ئەمانە بنەمان، وە سەرچاوەی هەموو خێرێکن، هەر کەسی ئەوانەی بۆ تەواو بووبێ، سەرجەم کارەکانی بۆ تەواو بووە، وە ئەگەر بەتاڵ بوو لێیان، ئەوە خێرو چاکەکان لای نامێنن و خراپەو تاوان ڕووی تێدەکەن و دەوری دەگرن.

نیشانەی خۆشەویستی ئەوەیە کە خوا باسی کردوە، ئەوەیە کە بەندە تێبکۆشی لە کارێکدا لە خوا ﷻ نزیکی بکاتەوە، وە کێبڕکێ بۆ نزیک بوونەوەی بە دڵسۆزی کارەکانی هەمووی بۆ خوا بێ، وە ئامۆژگاریشی تێدا بکات، وە بە جوانترین و تەواوترین شێوە ئەنجامی بدات، هەر کەسی وا بزانی خوای خۆش دەوێ بە بێ ئەوە، ئەوە درۆ دەکات.

(٥٨): ﴿ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾ ﴾:

واتە: خەڵکی هیچ شارو دێیەک نیە لەو شارو دێیانەی کە پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، ئیلا خوا ﷻ پێش هاتنی ڕۆژی دوایی لە ناوی بردوون، یان سزایەکی سەختی داون، ئەوە کتێبێکە لەلایەن خواوە نووسراوەو بڕیارێکیشە لە لایەن ئەوەوە دراوە هەر دەبێ ڕووبدات، دەی با بە درۆخەرەوان پەلە بکەن لە گەڕانەوەیان بۆ لای خواو بە ڕاست دانانی پێغەمبەرانیان، پێش ئەوەی سزایان لەسەر پێویست بێ و قسەیان بەسەردا بسەپێ.

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ
وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ
إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا
ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ
فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾
وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ
قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى
كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ
ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ
جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ
مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ
فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا
غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ
بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى
ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾

**(٥٩-٦٠):** ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾ ﴾:

﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ﴾ **خوا ﷻ باس لە میهرەبانی خۆی دەکات بە دانەبەزاندنی ئەو ئایەتو نیشانانەی بە درۆدانەران پێشنیاریان کرد بوو، بێگومان هیچ ڕێگریەک نەبوو ئەو پێشنیارانە بنێرێ تەنها مەترسی ئەوە نەبێ بە درۆی بخەنەوە، جا ئەگەر بە درۆیان خستەوە سزایان بۆ پێش دێ، هەروەکو چۆن سزای پێشینی دا لەسەر بە درۆ دانانیان.**

**وە لــە گەورەترینــی ئایــەتو نیشــانەکان ئــەو ئایەتــە بــوو کــە خــوا ﷻ ناردی بــۆ گەلی ســەموود، ئەویــش بریتــی بــوو لــە حوشــترێکی مــەزن کە ســەرجەم ئــەو هۆزە ســوودیان لێوەردە گــرت، وە لەگــەڵ ئەوەشــدا بــە درۆیــان زانــی، ئەوانــەش بــە هەمــان شــێوە ئەگەر ئایــەتو نیشــانە گەورەکانیــان بــۆ بێت هەرگیز بــڕوای پێ ناهێنــن، بێگومان ئــەوە ڕێگری لــێ نەکــردوون لــە بڕواهێنــان، بــە کــەم نەزانینی ئــەوەی کــە پێغەمبــەر ﷺ هێناویەتی، وە گومــان بوونــی ئایــا ڕاســتە یان ناڕاســتە؟ چونکــە بێگومــان ئەو چەندیــن بەڵگــەی ڕوونو ئاشــکرای بــۆ هێنانــەوە، کــە دەبنــە بەڵگە بــۆ ڕاســتی ئــەو پەیامــەی هێناویەتــی، ڕێنمایی پێویســت دەکات بــۆ ئــەو کەســەی دەیــەوێ ئیمــان بێنــێ، غەیــری ئــەوەش هاوشــێوەی ئەوەیــە، هــەر دەبێ شــوێنی بکــەون هەروەکو شــوێنی غەیری ئــەو کەوتن، بۆیە ســزای بۆ پێــش نەخســتوون، وە ئەم حاڵەتەش باشــترو بە ســوودترە بۆیــان،** ﴿ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴾ **مەبەســت تێیــدا ئــەوە نەبــووە کــە ببێتــە هۆکارێک بۆ پێویســت بوونــی ئیمان،**

کە دەستەبەر نابێ بەوە نەبێ، بەڵکو مەبەست تێیدا ترساندنو تۆقاندنە، تا ڕابچەڵەکێنو واز لەوە بهێنن کە لە سەری دەڕۆن، ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ﴾ واتە: بە زانستو توانای خۆی هیچ پەنایەکیان نیە پەنای بۆ بەرن، ئەمە بەسە بۆ کەسێک عەقڵی هەبێ لە دەست هەڵگرتن لەوەی کە خوا پێی ناخۆشە، ئەو خوایەی کە دەوری هەموو شتێکی داوە.

﴿ وَمَا جَعَلْنَا الرُّءْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً ﴾ زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان بۆچوونیان وایە ئەم دەقە لە شەوی ئیسرائدا دابەزیوە ﴿ وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ ﴾ کە باسکراوە ﴿ فِي الْقُرْءَانِ ﴾ ئەویش داری زەقومە کە لە ناوەڕاستی دۆزەخدا سەوز دەبێ.

مانای ئەوەیە ئەگەر ئەم دوو فەرمانە (شەوڕۆیی‌و درەختی نەفرین لێکراو) ببن بە فیتنە بۆ خەڵکی، هەتا بێبڕوایان سوورتر بن لەسەر بێبڕوایانو شەڕو خراپەیان زیاتر بێ، وە هەندێ لەوانەی کە بڕوایان لاوازە گەڕانەوە بۆ سەر بێبڕوایی، بە هۆی ئەو هەواڵەی کە پێیداون -لەو کاروبارانەی لە شەوی ئیسرائدا ڕوویدا لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا- ئەمە لە دەرەوەی سروشتو نەریتە (خارق للعادة) وە هەواڵ دان بە بوونی دارێک لە ناو جەرگەی دۆزەخدا، بە هەمان شێوە لە دەرەوەی سروشتە، ئەمە وای کرد کە ئەوان بە درۆی بزانن، جا ئەگەر نیشانە مەزنو گەورەکانی تر ببینن لە دەرەوەی سروشت؟! ئایا ئەوە نابێتە مایەی ئەوەی شەڕو خراپەکاریان زیاتر بێ، لەبەر ئەوە خوا ﷻ میهرەبانی بەسەرا ڕشتنو لێی دوورخستنەوە.

لێرەوە بۆت دەردەکەوێ باس نەکردنی ئەو کارە مەزنانە کە ڕوویاندا لەم دواییانەدا لە قورئانو سووننەتدا بە ڕوونی باس نەکراون، چاکترو لە پێشترن، چونکە ئەو کارانەی کە خەڵکی هاوشێوەیانی نەبینیوە، لەوانەیە عەقڵیان وەری نەگرێ ئەگەر هەواڵیان پێبدرێ پێش ڕوودانی، بێگومان ئەوە دەبێتە گومانێک لە دڵی هەندێ لە بڕوادارانداو، وە بەربەستێ لە بەردەم نەهاتنە ناو ئیسلامەوە، وە خەڵکی لێ دوور دەخاتەوە، بەڵکو خوا دەستەواژەی گشتی بەکارهێناوە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

﴿ وَنُخَوِّفُهُمْ ﴾ بە ئایەتو نیشانەکان دەیانترسێنین، ﴿ فَمَا يَزِيدُهُمْ ﴾ ئەو ترساندنە (هیچیان بۆ زیاد ناکات)، ﴿ إِلَّا طُغْيَانًا كَبِيرًا ﴾ (واتە: جگە لە یاخی بوون نەبێ) ئەمە ڕەوانبێژترە لە حەزو چێژ وەرگرتنیان لە شەڕو خراپەو خۆشویستنی، وە ڕقبوون لە خێرو چاکەو ملکەچ نەبوونی.

(٦١-٦٥): ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ ﴾ خـوا ﷻ بەندەکانـی ئاگادار دەکاتـەوە لـە توونـدی دوژمنایەتـی شـەیتانو سـوور بوونـی لەسـەر گومـڕا کردنیـان، بێگومـان کاتـێ خـوا ﷻ ئادەمی دروسـت کـرد، لووت بـەرزی نوانـد لە بەرانبەر سـوژدە بـردن بـۆی، وە ﴿ قَالَ ﴾ بە خۆبەزل زانینـەوە وتـی: ﴿ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾ واتە: لـە قوڕ دروسـتت کـردوە، بـە گومانی خـۆی وایدەزانی ئـەو لە ئـادەم چاکتـرە، چونکە لە ئاگـر دروسـت کـراوە، لە پێشـەوە باسـی ئەم پێـوەرە خـراپو پووچانەی کـردوە لە چەند ڕووێکـەوە، کاتـێ بـۆ ئیبلیس دەرکەوت خـوا ﷻ فەزڵی ئادەمی داوە بەسـەریدا ﴿ قَالَ ﴾ بـە دوانـدن لەگەڵ خـوا ﷻ وتـی: ﴿ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ ﴾ واتـە: بنەبریـان دەکـەمو زاڵ دەبـم بەسـەریانداو گومرایان دەکـەمو سـەریان لـێ دەشـێوێنم، ﴿ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (مەگـەر ئەوانـە نەبـێ کـە ئـەو) پیسـە دەناسـن، بـە ڕاسـتی هەر دەبـێ تیایانـدا هەبێ دژایەتـیو سـەرپێچی بکات.

جـا خـوا ﷻ پێـی فەرمـوو: ﴿ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ ﴾ (هـەر کـەس لـەوان) تـۆی هەڵبـژارد بەسـەر پەروەردگاریەوە، وە پشـتیوانی ڕاسـتەقینەی ﴿ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴾ (دۆزەختـان) بـۆ ئامـادە کـراوە، پڕاوپـڕ پاداشـتی کردەوەکانتانـە.

پاشـان خـوا ﷻ (بـە ئیبلیسـی فەرمـووە) هەرچـی لـە توانایدایـە بـەکاری بهێنـی بـۆ گومڕاکردنیـانو درێغی نـەکات، فەرموویەتـی: ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ ﴾ (واتـە: وە هـەر کـەس لەوانـە کە دەتوانـی گومـڕای بکە بە دەنگـت) هەموو هـۆکاری بۆ سـەرپێچی دەچێتـە ئەم چوار چێوەیـەوە، ﴿ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ﴾ (واتە: وە بدە بەسـەریاندا تێیـان خـوڕە بە سـوارو پیـادەی لەشـکرتەوە) دەچێتە چـوار چێوەیـەوە هەموو سـوارو پیادەیـەک بۆ سـەرپێچی خـوا ﷻ، ئـەوە لە سـوارو پیادەی شـەیتانە.

مەبەسـت ئەوەیە خـوا ﷻ بەندەکانی تاقی دەکاتـەوە بەم دوژمنە ڕوونو ئاشـکرایە، بانگیان

دەکات بـۆ سـەرپێچی خـوا بـە گوفتـارو کـرداری، ﴿ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ ﴾ (واتە: هاوبەشـییان بکە لە ماڵو سـامانو منداڵیاندا) ئەوەش هەموو سـەرپێچیەک دەگرێتەوە پەیوەنـدی هەبـێ بە مـاڵو منداڵیانـەوە، لە رێگـری کردنـی زەکاتو کەفارەتـەکانو مافە پێویسـتەکان، وە پـەروەردە نەکردنـی منـداڵ بـۆ خێـرو چاکـەو واز هێنـان لـە خراپـە، وە وەرگرتنـی مـاڵ بـە ناهـەق، یـان دانانـی، یـان بەکارهێنانـی لـە شـتی خراپدا، یـان بە دەسـتهێنانی کەسـابەتی ناپەسند.

بەڵکـو زۆرێـک لـە توێژەرەوانـی قورئان باسـیان کردوە وازهێنـان لە ناوی خوا (بسـم الله) لـە کاتـی خـواردنو خواردنـەوەو سـەرجێی دا دەچێتە چـوار چێوەی بەشـداری شـەیتانەوە لـە مـاڵو منداڵـدا، لـە کاتێکـدا ئەگەر نـاوی خـوا نەهێنێ لـەوەدا، ئـەوە شـەیتان لەگەڵیدا بەشـدار دەبێ، هـەروەک لە فەرمـوودەی پێغەمبەردا هاتـوە. ﴿ وَعِدْهُمْ ﴾ پەیمانـی رازاوە کـە هیـچ راسـتیەکی نیە، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴾ واتـە: بەڵێنـی بەتاڵو پـەرشو بـڵاو، وەک ئەوەی تـاوانو گوناهـو بیرو بـروای پووچیان لـەلا جـوان بـکات، وە بەڵێنی پاداشـتیان پێبـدات، چونکـە ئـەوان وا گومان دەبەن لەسـەر هەقـن، وە خوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ﴿٢٦٨﴾ ﴾البقـرة. (واتە: شـەیتان دەتان ترسـێنێ بە هەژاریو فەرمانتـان پێـدەکات بە خراپـە، وە خـوا ﷻ بەڵێنی لێخۆشـبوونو چاکەتـان پێدەدات).

کاتـێ کـە هەواڵیدا لـەوەی کە شـەیتان دەیـەوێ چی بەسـەر بەندەکانـدا بهێنێ، وە باسـی ئەوەشـی کـرد چـۆن خـۆی لـە فیتنـەی دەپارێـزێ، ئەویـش بەندایەتـی خـواو بەجێهێنانی داخوازیەکانـی ئیمانو پشـت بەسـتنە بـە خوا، جـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾ واتە: دەسـەڵاتت بەسـەریاندا نیەو ناتوانی فریویان بـدەی، بەڵکو خوا ﷻ بەرگریـان لـێ دەکات -بـە بەندایەتـی کردنیـان- لـە هەموو خراپەیـەک، وە لە شـەیتانی نەفریـن لێکـراو دەیانپارێـزێ، وە تەنهـا خوایـان بەسـە ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾ بـۆ کەسـێک کە پشـتی پـێ ببەسـتێت، ئـەوەی لەسـەر شـانیەتی جێبەجێـی بکات.

(٦٦-٦٩): ﴿ رَّبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ الْإِنسَانُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ الْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ الرِّيحِ

فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ﴾
﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا
﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ
كَفُورًا ﴾ خـوا ﷻ باسـی نیعمەتەکانی دەکات بەسـەر بەندەکانیداو یادیـان دەخاتەوە، بەوەی کەشـتی لـە دەریادا ڕامکـردوە بۆیان، ئیلهامی بۆ کـردوون لە چۆنیەتی دروسـت کردنی، وە ئـەو دەریـا زەبەلاحەی بۆ ڕامکـردوون، هەمووی بخەنە سـەر شـانی، تا بەندەکانی سـوودی لێوەربگـرن لـە سـواربوونو باری قـورس بۆ بازرگانـی لە گەشـت کردندا، بە ڕاسـتی ئەمە لـە میهرەبانـی خوایـە بـۆ بەندەکانـی، بێگومان ئـەو بـەردەوام بە بەزەیـیو بەسـۆزە بۆیان، پێیـان دەبەخشـێ لە هەمـوو ئەوانەی پەیوەسـتە بە ویسـتو ئیـرادەو قازانجیانەوە.

لـە میهرەبانیەکانـی خـوا ﷻ کە بەڵگەیە لەسـەر تاکو تەنهایـی لە پەرسـتندا ئەوەیە، ئەوان ئەگـەر تووشـی بـەڵاو زیانێـک بین لە دەریـاداو ترسـان لە لەناوچـوون، بە هۆی شـەپۆلی گـەورەو ترسـناکەوە، هەموو ئەو پەرسـتراوانەیان لێ ون دەبێ لە مـردوو زیندووەکان کە لە کاتـی خۆشـیدا هاواریان پێ دەکـردن، هەروەکو ئـەوە وایە سـاتێک لە ژیانیانـدا هاواریان پـێ نەکردبـن، چونکـە دەزانـن ئەوانـە لاوازن، بێتوانـان لـە لابردنـی زیـانو ناڕەحەتی، بە دەنگـی بەرز هاوار دەکەنە دروسـتکەری ئاسـمانەکانو زەوی، کە هەموو دروسـتکراوەکان لـە کاتـی ناڕەحەتیەکانـدا هـاواری پێدەکـەن، بـە دڵسـۆزیەوە لێـی دەپاڕێنـەوەو مل کەچ دەبـن بـۆی لـەم حاڵەتەدا، کاتـێ خـوا ڕزگاریـان دەکاتو بـەڵاو ناڕەحەتیەکانیان لەسـەر لادەبـات، دەگەنە وشـکانی، بیریـان دەچێتەوە کە پێشـتر هاواریـان پێکردوە، ئنجـا هاوەڵی بـۆ دادەنێـن کـە نە سـوودی هەیـەو نـە زیـان لادەبـات، وە نەدەبەخشـێو نـە دەگرێتەوە، پشـت لە دڵسـۆزی لە دڵسـۆزبون لـە پەروەردگاریان دەکـەن، ئەمەش لـە نەفامی مرۆڤو بێبڕواییەتـی، بێگومـان مـرۆڤ بەرانبـەر بـە نیعمەتەکانـی زۆر بێبڕوایـە جگـە لـەوە نەبێ خـوا ﷻ ڕێنمایـی کردبـێ، منەتی کردوە بەسـەریدا بـە عەقڵێکـی بێگەردو تەندروسـتو، هیدایەتـی داوە بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت، بـە ڕاسـتی ئـەو بەنـدە دەزانـێ، ئـەو کەسـەی زیانو ناخۆشـی لادەبـاتو ڕزگـاری دەکات لـە بـەڵاکان، تەنهـا ئەو شایسـتەی ئەوەیـە بەتاکو تەنهـا بپەرسـترێو بـە دڵسـۆزی کـردەوەی بـۆ ئەنجـام بـدرێ، لـە تەنگانەو خۆشـیداو لە ناڕەحەتیو ئاسـانیدا.


وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا
نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ
أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ
لَا تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً
أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ
ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ
ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا
كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ
فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن
كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ
عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ
لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ
ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾

بەڵام ئەوەی کە زلیل بووە، خۆی داوەتە دەستی عەقڵی لاوازەوە، بێگومان ئەوە تێبینی کاتی نارەحەتی ناکات، تەنها بۆ بەرژەوەندیەکی کاتی نەبێ، وە ڕزگار بوونی لەو کاتەدا، کاتێ کە ڕزگاری بوو مەترسی لەسەر نەما، بە نەفامی خۆی وا گومان دەبات، کە خوا ﷻ بێتوانایە بەرانبەری، هەرگیز شتێ بە خەیاڵیدا نایەت لە سزایی دونیایی، دیارە ڕۆژی دوایی لە پێشترە.

بۆیە خوا ﷻ باسی ئەوەی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ﴾ واتە: خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەگەر بیەوێ سزاتان بۆ دادەبەزێنێ لە ژێر پێتانەوە بە بوومەلەرزە، یان لە سەرتانەوە بە وردە زیخ، ئەویش ئەو سزایەیە وردو خاشیان دەکاتو لە ناویان دەبات، وا مەزانن لە ناوچوون تەنها لە دەریا دایە.

ئەگەر ئێوە بەو شێوە گومانتان برد، ئەوە ئێوە بێباکن لە ﴿ أَن يُعِيدَكُمْ ﴾ لە دەریا ﴿ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ ﴾ واتە: بایەکی توندوو تیژ هەڵبکات هەرچی هەیە وێرانی بکات، ﴿ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴾ واتە: لە دەریاکەدا لە ناوتان ببات، بێگومان خوا ﷻ بە قەد گەردیلەیەک ستەمتان لێ ناکات.

(٧٠): ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ ئەمەش لە ڕێزو چاکەی خوایە لەسەر نەوەکانی ئادەم، کە کەس ناتوانێ ئەندازەی بکات، بە شێوەیەک ڕێزی لە نەوەکانی ئادەم گرتووە لە هەموو ڕووەکانەوە، ڕێزی لێ گرتوون بە زانستو عەقڵو ناردنی پێغەمبەرانو

دابەزاندنـی کتێبـەکان، وە لـە ناویانـدا پیاوچاکانـی دانـاوەو نـازو نیعمەتـی ئاشـکراو نادیـاری پێبەخشـیون ﴿ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ ﴾ بـە سـواری حوشـترو هێسـترو کەرو سـەرجەم کەرەسـتەکانی گواسـتنەوە لـە وشـکانیدا ﴿ وَٱلْبَحْرِ ﴾ لـە کەشـتیدا ﴿ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ لـە خـواردنو خواردنـەوەو جلو بـەرگو هاوسـەرگیری کردن، هەر شـتێکی چـاک پەیوەنـدی بـە پێویسـتیەکانیانەوە هەبێـت، بێگومـان خوا پێـی ڕێـزداری کردوون، وە بـۆی ئاسـان کـردوون بەوپەڕی ئاسـان کـردن، ﴿ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ بـەوەی کـە تایبەتـی کـردوون لە فـەزڵو ڕێـزو چاکەی بـێ ئەنـدازە، کە بە هیـچ یەکێـک لـە بەدیهێنـراوەکان نەبەخشـراوە، ئایا سوپاسـگوزاری ئەو کەسـە ناکەن کە ئەو هەموو نازو نیعمەتەی ڕشتوە بەسـەریانداو بەڵاو نارەحەتیەکانی لێ دوورخسـتوونەتەوە، وە نـازو نیعمەتەکانـی لێ نەشـاردونەوە تا ئەوەندە سـەرقاڵ بـن پێیەوە، لە جیاتـی بەندایەتی پەروەردگاریـان، بەڵکـو ئـەوان هەندێ جار نـازو نیعمەتەکانیـان بەکارهێناوە لە سـەرپێچی کردنیدا؟!

(٧١-٧٢): ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ۖ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِى هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ ﴾:

﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی حاڵـی خەڵکـی لە ڕۆژی دوایيـدا، ئـەو ڕۆژە هەمـوو مرۆڤـەکان بانگ دەکاتو پێشـەواکانیان لـە گەڵیاندان، کـە ڕێنماییـان کـردوون ئەوانیـش پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانیان، هەمـوو ئۆممەتەکان دەخرێنـە ڕوو، وە پێغەمبەرانیـان کـە بانگەشـەیان کـردوون ئامـادە دەبـن، کردەوەکانیـان دەخرێتـە ڕوو لەسـەر ئـەو کتێبـەی کـە پێغەمبەران بانگەشـەیان بۆ کـردوە، ئایـا لەگەڵیدا دەگونجـێ یـان نا؟ ئنجـا دەبن بـە دوو بەشـەوە: ﴿ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾ چونکە شـوێنی پێشـەواکەی کەوتـووە، کـە هیدایەتـدەرە بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت، وە بـە کتێبەکەی ڕێنمایـی وەرگرتـوە، تا کردەوەکانـی زۆر بوونو خراپەکانی کـەم بوونەوە، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ ﴾ خوێندنەوەیـەک بـە دڵێکـی خـۆشو ڕوویەکی گەشـەوە، بە هۆی ئـەوەی کـە دەیبینن لـە ناویـدا دڵخۆش دەبـنو بەختەوەر دەبـن ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴾ لـەو کـردەوە چاکانـەی ئەنجامیـان داوە ﴿ وَمَن كَانَ فِى هَٰذِهِۦٓ ﴾ لە دونیـادا ﴿ أَعْمَىٰ ﴾ کوێـر بـێ لە ئاسـتی هـەقو وەری نەگرتبـێو ملکەچـی نەبووبـێ، بەڵکو شـوێن گومڕایی

کەوتبــی ﴿ فَهُوَ فِى ٱلْأَخِـرَةِ أَعْمَىٰ ﴾(ئــەوە لــە ڕۆژی دوایشــدا کوێــرە) لــە گرتنەبــەری ڕێگــەی بەهەشــت، وەک چــۆن لــە دونیــادا نەیگرتۆتــە بــەر ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ بێگومــان پاداشــت لــە جنســی کردەوەیــە، هەروەکــو چۆن قــەرز بکەی قــەرزت لــێ دەکرێ.

لــەم ئایەتــەدا بەڵگــە هەیــە کــە هەمــوو ئوممەتێــک بانگ دەکــرێ بــۆ لای ئایــنو کتێبی خــۆی، ئایــا کــردەوەی پێکــردوە یــان نــا؟ بێگومــان ئەوان ســزا نادرێــن بە شــەرعی هیچ پێغەمبــەرێ کــە فەرمانیــان پێ نەکرابێ بە شــوێنکەوتنی، وە خوا ﷻ ســزای هیچ کەســێک نــادات مەگــەر پــاش بەجێهێنانــی بەڵگە لەســەری (إقامة الحجة)، وە ســەرپێچی کردنی.

خــاوەن خێرو چاکە کتێبەکانیان بە دەســتی ڕاســتیان پــێ دەدرێ، وە خۆشــیەکی زۆر مەزن روویــان تێــدەکات، خــاوەن کــردەوەی خراپ بــە پێچەوانــەی ئەوەوەیــە، بێگومــان ئەوان ناتوانــن کتێبەکەیــان بخوێننــەوە بە هۆی زۆری خــەمو خەفەتو حەســرەتو بەدبەختیانەوە.

(٧٣-٧٧): ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَـٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَـٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾.

خــوا ﷻ باســی منەتــی خــۆی دەکات بەســەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە پاراســتنی لــەو ناحەزو دوژمنانــەی ســوور بــوون لەســەر ئــەوەی تووشــی فیتنەی بکــەن بــە هەمــوو جۆرێک، جا فەرموویەتــی: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا ﴾ واتــە: بــە ڕاســتی نزیــک بــوو ئەوانــە لابــدەنو فێڵت لێبکــەن، بۆ ئــەوەی شــتێک بــە دەم خواوە هەڵبەســتی جگــە لــەوەی بــۆت دابەزیــوە، جا بــە پێی ویســتو هــەواو ئــارەزووی ئەوان بــێو واز لــەوە بهێنــی کــە خــوا بــۆ تــۆی دابەزانــدوە ﴿ وَإِذًا ﴾ ئەگــەر بــە پێــی هەواو ئــارەزووی ئــەوان ڕەفتــارت بکردایــە ﴿ لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾ واتــە: هەڵیــان دەبژاردیو دەیــان کــردی بــە خۆشەویســتی خۆیان، لــەوەی کە خــوا ﷻ ڕایهێنــاوی لە خووڕەوشــتی بــەرزو ڕێــزو ئەدەبــی جوان کــە خۆشەویســتە لــە لای دوورو نزیکو دۆســتو دوژمنەوە، پێویســتە بزانــی ئــەوان دوژمنایەتی تۆیــان نەکــردوە، بەڵکو تەنهــا دژایەتی ئــەو پەیامەیان کــردوە کە بۆ تــۆ هاتــوە، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الأنعام.(واتــە: بــە ڕاســتی

ئێمـە دەزانیـن كـە بێگومان ئـەوەی ئـەوان دەیڵێـن خەمبـارت دەكات، بەڵام ئـەوان تۆ بە درۆزن دانانێـن، بەڵكـو ئـەو سـتەمكارانە ئینـكاری ئایەتەكانی خـوا دەكەن).
﴿ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ ﴾(خـۆ ئەگـەر ئێمـە تۆمـان دامـەزراو نەكردایـە) لەسـەر ڕاسـتی، وە منەتـی خۆمـان بەسـەرتدا نەكردایە بـە وەڵام نەدانـەوەی داواكاریەكانیـان، ﴿ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴾(بـە ڕاسـتی نزیک بـوو كەمێک بە لایاندا بچـی) لە زۆری هەوڵـدانو حـەز كردن بـە هیدایـەت دانیـان، ﴿ إِذٗا ﴾ئەگەر بەلایانـدا بچووبایـە بە پێی هـەواو ئـارەزووی ئـەوان ﴿ لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ﴾ (واتـە: دوو بەرانبـەر لـە دونیاو دوارۆژدا سـزامان دەدای) ئەویش بـە هۆی تـەواوی نیعمەتەكانی خوایە بەسـەرتەوە، وە تـەواوی شـارەزای‌و هەبوونـی زانسـتو زانیاریـی خۆتـە، ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا ﴾ڕزگـارت بـكات لەو سـزایەی خـوا ﷻ بە سـەرتا دەیهێنێ، بـەڵام خوای بـەرز پارێزگـاری لێكردی لە شـەڕو خراپـەو هۆكارەكانـی، دامەزراوی كـردی، وە هیداتی دای بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت، بە هیچ جۆرێ لـە جۆرەكان مەیلـت بۆ لایان نەكـرد، جا خوا ﷻ تەواوی نیعمەتو بەخششەكانی ڕشتوە بەسەر تۆدا.

وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ٧٦ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ٧٧ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ٧٨ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ٧٩ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ٨٠ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ٨١ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ٨٢ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ٨٣ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ٨٤ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ٨٥ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ٨٦

﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾ لە ڕق لێبوونەوەیان لە پلەو پایەت لە ناویاندا، بە ڕاستی نزیک بوو ئەو بێبڕوایانە لەسەر زەوی مەککە دەرت بکەن، ئەگەر ئەوەیان بکردایە لە پاش تۆ نەدەمانەوە کاتێکی کەم نەبێ، هەتا سزایان لەسەر پێویست دەبوو، وەک چۆن ئەوە سوننەتێکی خواییەو گۆڕانی بەسەردا نایە لە هەموو ئۆممەتەکاندا، هەر ئۆممەتێ پێغەمبەرەکەی بە درۆ دانابێو شار بەدەری کرد بێ، سزای خوای بۆ پێشهاتوە، وە کاتێ بێبڕوایان فرتو فێڵیان بەرانبەری بەکارهێناو لە مەککە دەریان کرد نەمانەوە ماوەیەکی کەم نەبێ، هەتا خوا ﷻ لە ڕۆژی (بدر)دا سەرگەورەو دەسەڵاتدارەکانی لە ناوبردو سپایەتیانی لە ناوبرد.

جا سوپاسو ستایش بۆ خوا، ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ زۆر پێویستی بەوەیە خوای گەورە جێگیرو دامەزراوی بکات، پێویستە لەسەری بە بەردەوام پەیوەست بێ بە پەروەردگاریەوە، تا جێگیری بکات لەسەر ئیمان، هەموو هۆکارەکان بگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە دامەزراندنی، چونکە پێغەمبەر ﷺ تەواوترینی خەڵک بوو، خوا ﷻ پێی فەرمووە: ﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾ جا دەبێ (حاڵی کەسانی دی) غەیری ئەو چۆن بێ.

هەروەها یادکردنەوەی منەتی خوای تیایە بۆ پێغەمبەرەکەی، وە پاراستنی لە شەڕوو خراپە، ئەوەش بەڵگەیە کە بێگومان خوا ﷻ حەز دەکات بەندەکان تێبگەن لە نازو نیعمەتەکانی کە ڕشتویەتی بەسەریاندا -لە کاتی بوونی هۆکاری شەڕو خراپە- بە پاراستن لێیو بەردەوام بوون لەسەر ئیمان.

هەروەها بەڵگەی تێدایە بە پێی بەرزی پلەو پایەی ئینسانو دابەزاندنی نیعمەتەکان

بەســەریدا، گوناهــی بــە مــەزن لــە قەڵــەم دەدرێو سزایشــی چەنــد بــارە دەبێتــەوە، ئەگەر کارێکــی خــراپ ئەنجــام بدات، چونکــە خوا ﷻ یــادی پێغەمبەرەکــەی هێناوەتــەوە ئەگەر ئــەو کارە بــکات -خوانــەکا- بــە فەرمــوودەی خــوا ﷻ: ﴿ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾.

هەروەهــا بەڵگــەی تێدایــە، خــوای گــەورە ئەگــەر بیــەوێ گەلێــک لە نــاو ببــات، تاوانو ســەرپێچی چەنــد بارە دەکەنــەوە تا تەواو ڕۆ دەچن تیایدا، ئەوجا ســزایان لەســەر پێویســت دەبــێ بەو شــێوە ســزا دەدرێــن، وەک چۆن ئەوە ســوننەتی خوایە لــە هەمــوو ئوممەتەکاندا، کاتــێ پێغەمبەرەکانیان شــار بــەدەر کردوە.

(٧٨-٨١): ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾:

﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ خــوا ﷻ فەرمان بــە پێغەمبەرەکەی موحەممــەد ﷺ دەکات بە بەجێهێنانی نوێــژ بــە ڕێکــیو پێکیو بە ئاشــکراو نهێنی لــە کاتی خۆیــدا، ﴿ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾ لادانی لــە ناوەڕاســتی بەرەو لای خــۆر ئاوا، کــە نوێژی نیوەڕۆو عەســر دەگرێتــەوە، ﴿ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ ﴾ واتــە: تاریکــی شــەو، بــەو شــێوە نوێــژی ئێــوارەو خەوتنانیــش دەچێتــە ناویــەوە، ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾ واتــە: نوێــژی بەیانی، ناونــراوە بە قورئــان، لەبەر ڕێگــە پێدانی درێژ کردنــەوەی قورئــان خوێنــدن تیایــدا درێژتر لــە نوێژەکانی دیکــە، لەبەر فــەزڵو گەورەیی قورئــان خوێندن، چونکە فریشــتەی شــەوو فریشــتەی ڕۆژ شــایەتی بۆ دەدەن.

## ئەم دەقە کۆمەڵە خاڵێك لە خۆ دەگرێ:

یەکــەم: لــەم ئایەتەدا باســی کاتی هــەر پێنج نوێژەکــەی کــراوە، وە ئەو نوێژانــەی کە لەو کاتانــەدا دەکــرێ نوێــژە فەرزەکانە، چونکــە تایبەت کراوە بــە فەرمان.

دووەم: بێگومــان کات مەرجــە بۆ ڕاســتو ڕەوانی نوێژ، وە هۆکاریشــە بۆ پێویســت بوونی، چونکــە خــوا ﷻ فەرمانــی بــە بەجێهێنانی کردوە لــەم کاتانــەدا، نوێژی نیوەڕۆو عەســر کۆ دەکرێنــەوە، وە ئێــوارەو خەوتنــان بە هەمان شــێوە، ئەگەر عــوزرو بیانووی هەبــوو، چونکە خــوا ﷻ کاتەکەیانی کــۆ کردۆتەوە.

سـێیەم: گرنگـیو چاکی نوێـژی بەیانیو چاکـی قورئان خوێنـدن تیایدا، بێگومـان قورئان خوێنـدن تیایـدا پایەیـە (ركـن)، چونکـە عیبـادەت ئەگەر بـە هەنـدێ لە بەشـەکانی ناوی هێنـرا، بەڵگەیە لەسـەر فـەرز بوونی ئەو بەشـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو کاتەکانیـدا نوێـژ بکـە ﴿ نَافِلَةً لَّكَ ﴾ واتـە: تـا شـەونوێژ، ببێتە زیاتـر بەرز بوونـەوەی پلەو پایەت، بـە پێچەوانەی جگـە لـە تـۆ، بێگومان شـەونوێژ بۆ کەسـێکی تـر دەبێتـە کەفارەتـی گوناهەکان.

وە دەگونجێ ماناکەی ئەوە بێ: پێنج نوێژەکە فەرزە لەسەر تۆو لەسەر هەموو بڕواداران، بە پێچەوانەی شەونوێژ، ئەوە بە تایبەتی فەرزە لەسەر تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ)، لەبەر ڕێزداریت لە لای خوا ﷻ ئەرکو پیشەی تۆی زیاتر کردوە بەسەر خەڵکیدا، بۆ ئەوەی پاداشتت زیاتر بێ، بەو شێوەیە مەقامی مەحمود بەدەست بێنی، ئەویش ئەو پلەو پایەیە کە یەکەمینو دوایین ستایشی دەکەن، پلەو پایەی تکاو شەفاعەتی مەزنە، کاتێ خەڵکی داوای تکا لە ئادەم دەکەن، پاشان نووح، پاشان ئیبراهیم، پاشان موسا، دوای عیسا، هەموو بیانوو دەهێننەوەو خۆیان دوادەخەن، تا داوای تکا لە گەورەی نەوەی ئادەم دەکەن، بۆ ئەوەی خوا ﷻ ڕزگاریان بکات لەو دۆخە ناخۆشە، ئنجا لە لای پەروەردگاری تکا دەکات، ئەویش تکاکەی لێوەردەگرێو پلەیەکی پێدەدات هەموو مرۆڤەکان لە یەکەمینەوە بۆ دواییەمین خۆزگەی پێ دەخوازن، وە منەتی دەبێ بەسەر هەموو خەڵکیدا.

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ ﴾ واتە: چوونە ژوورەوەو دەرچوونـم تەنهـا لـە گوێڕایەڵـی تۆ دابێو لەسـەر ڕەزامەندی تۆ بـێ، ئەویش بۆ ئـەوەی بـە دڵسـۆزیو بە پێـی فەرمـان بـێ، ﴿ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴾ واتە: بەڵگەیەکـی ئاشـکراو یەکلاکـەرەوە بـۆ هەموو ئەوانـەی کـە ئەنجامی دەدەمو وازی لـێ دێنـم، ئەمـە بەرزتریـن پلەو پایەیە خوا ﷻ دەیبەخشـێ بە مـرۆڤ، هەموو بـارو دۆخەکانی پـڕن لـە خێـرو چاکـەو نزیکـی دەکەنـەوە لـە پەروەردگـاری، وە لـە هەمـوو دۆخێکـدا بەڵگەیەکـی ئاشـکرای هەیە، ئەویش زانسـتی بە سـوودو کـردەوەی چاک لە خـۆ دەگرێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ ﴾ (الحق): بریتیە لـەوەی کە خوا ﷻ بە نیگـا ناردوویەتـی بـۆ موحەممەد ﷺ، پاشـان فەرمانی پێکردوە کە بە ئاشـکرا باسـی بکات، بێگومـان ئاینـی ڕاسـت کە هـات هیچ شـتێ ناتوانی بەرگری لـێ بکات، وە ئاینـی بەتاڵیش پەرتـەوازەو پەرشـو بڵاوبوویـەوە، ﴿ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴾ واتـە: ئەمـە وەسـفی پووچە،

بـەڵام هەنـدێ جار بـە جوانی دەردەکـەوێو گرنگـی پێـدەدرێ، ئەگەر هـەق ڕووبەڕووی نەبێتـەوە، جـا بـە هاتنی هـەق لـە جووڵە دەکـەوێ، لەبـەر ئەمە بەتـاڵ تەنها لەو سـەردەمو شـوێنانەدا بایەخـی پێدەدرێ کە زانسـتو زانیـاری تێدانیە بـە ئایەتو نیشـانەکانی خوا.

(٨٢): ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ قورئـان گشـتگیرە لەسـەر شـیفاو ڕەحمەت، ئـەوەش بۆ هەموو کـەس نیە، بەڵکـو تەنهـا بـۆ بڕوادارانـە، ئەوانـەی ئایەتەکانی خـوا ﷻ بە ڕاسـت دادەنێنو زانـان پێی، بـەڵام سـتەمکاران ئەوانـەی دانیپێـدا نانێـن، یان کـردەوەی پێناکـەن، بێگومـان هیچیان بۆ زیـاد نـاکات جگە لـە خەسـارەتمەندی، هەر بـەوەش بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت دەبێ.

جـا ئـەو شـیفایە قورئـان لـە خۆی گرتـووە گشـتگیرە بـۆ شـیفای دڵـەکان، لـە گومانو دوودڵـیو نەفامـیو بۆچوونـی خـراپو لادانـی نابەجـێو مەبەسـتە خراپـەکان، بێگومـان زانسـتی دڵنیاکـەرەوەی تێدایـە کـە هەموو گومـانو نەفامیـەک لادەبـات، وە ئامۆژگاریو یادکردنـەوەی تێدایـە کـە هەمـوو هـەواو ئارەزوویـەک پێچەوانـەی فەرمانی خـوا ﷻ بێ لای دەبـات، وە چارەسـەری جەسـتەی تێدایـە لە ئـازارو نەخۆشـیەکان.

بـەڵام ڕەحمـەت، بێگومان چەندیـن هۆکارو کەرەسـتەی تێدایـە کە هانی مـرۆڤ دەدات، هـەر کاتـێ بەنـدە ئەنجامیـدا سـەرکەوتوو دەبـێ بـە ڕەحمەتو خۆشـبەختی هەمیشـەییو پاداشـتی بـە پەلە لـە ئێسـتاو لـە داهاتوودا.

(٨٣): ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾ ئەمـە سروشـتی مرۆڤـە، جگـە لەو کەسـەی خـوا ﷻ هیدایەتـی داوە، بێگومـان مـرۆڤ -کاتێ خـوا نازو نیعمـەت دەڕێژێ بەسـەریدا- دڵـی خـۆش دەبـێو پێـی لـووت بـەرز دەبـێ، وە لـە پەروەردگـاری دوور دەکەوێتـەوە، سوپاسـگوزاری ناکاتو یادی ناکات، ﴿ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ ﴾ وەک نەخۆشـیو هاوشـێوەکانی ﴿ كَانَ يَـُٔوسًا ﴾ (زۆر نائومێـد دەبـێ) لـە خێرو چاکـە، ئومێد بـڕاو دەبێ لـە پەروەردگاری، وا گومـان دەبـات بـۆ هەمیشـە لـەو حاڵەتـەدا دەمێنێتـەوە کە تیایدایـە، بەڵام ئەو کەسـەی خـوا هیدایەتـی دابـێ بێگومـان -لە کاتـی نیعمەتەکانـدا- ملکەچـی پەروەردگـاری دەبێو سوپاسـگوزاری دەکات، وە لـە کاتـی ناخۆشـیو تەنگانـەدا لـە خـوا دەپاڕێتـەوە، ئومێدی

کردنــەوەی دەرگــای خێــری زۆرە، بــەو شــێوە بەلاّی لەســەر ســووک دەبیّ.
(٨٤): ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ ﴾:
﴿ قُلْ كُلٌّ ﴾ (بلّیّ هەر یەک) لە خەڵکی ﴿ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴾ کار لەسەر ئەوە دەکات کە شایستەیەتی، جا ئەگەر پیاو چاک بیّ ئەوە تەنها بۆ خوا ﷻ کار دەکات، وە ئەگەر جگە لەوان بیّ لە سەرشۆڕکراوەکان ئەوە تەنها ئەوەی لیّ دەوەشێتەوە کار بۆ بەدیهێنراوەکان بکات، هەر شتێک لەگەڵ هەواو ئارەزوویدا نەگونجیّ لەگەڵیدا نابیّ، ﴿ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴾ (پەروەردگارتان) دەزانیّ هەر کەس شایستەی ڕێنمایی بیّ هیدایەتی دەدات، وە هەر کەس شایستە نیە ڕیسوای دەکاتو ڕێنمایی ناکات.
(٨٥): ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾:
﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ ئەمــە دامرکاندنــەوەی ئــەو کەســە لە خۆ دەگریّ کە پرســیار دەربــارەی شــتیّ دەکات هیــچ مەبەســتێکی نیە جگە لــە کەللەڕەقــیو بێزار کــردن نەبیّ، وە واز لە پرســیاری گرنگ دێنیّ، جا پرســیار دەربارەی ڕووح دەکەن کە لە شــتە شــاراوەکانە، کــەس ناتوانیّ وەســفی بــکاتو لــە چۆنیەتی بزانــیّ، بە ڕاســتی بەنــدەکان زانســتیان کەمو کورتــە دەربــارەی پێویســتیەکانی مــرۆڤ، لەبــەر ئەمە خــوا ﷻ فەرمانی بــە پێغەمبەرەکەی کــردوە وەلاّمی پرســیارەکەیان بداتەوە بــە فەرمــوودەی: ﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ واتە: لــە کۆی دروســتکراوەکانیەتی کــە فەرمانی پێکــردوە ببە ئەویــش بووە، پرســیار دەربارەی ئــەوە ســوودێکی گەورەی نیــە، لەگەڵ ئــەوەدا شــارەزاییان بە غەیری ئــەوە نیە.
ئــەم دەقــە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی پرســیار لێکــراو ئەگەر پرســیاری لێکــرا، وا باشــتر بوو پرســیار لــە جگــە لەو بکــریّ، بــا وەلاّم نەداتــەوە، ئەو کەســەی پێشــان بدات کــە وەلاّمی پرســیارەکەی ئــەو دەداتــەوە، وە ئامۆژگــاری بــکات لــەوەی کە ســوودی هەیــە بۆی.
(٨٦-٨٧): ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ ﴾
خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات بــە ڕاســتی قورئــانو وەحی، کــە ناردوویەتــی بــۆ پێغەمبەرەکەی، ڕەحمەتێکــە لــە لایــن ئــەوەوە بەســەریەوە، وە بەســەر بەندەکانیــەوە، ئــەوە گەورەتریــن نیعمەتێکــە بــە ڕەهایــی بــۆ ســەر پێغەمبەرەکــەی، بــە ڕاســتی فــەزڵو چاکــەی خــوا ﷻ بەســەریەوە زۆر گەورەیــە، هیــچ کــەس ناتوانــیّ ئەنــدازەی بــکات.

إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرٗا (٨٧) قُل
لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ
لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا (٨٨)
وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ
ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا (٨٩) وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ
لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا (٩٠) أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ
وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا (٩١) أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ
كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
قَبِيلًا (٩٢) أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ
وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ
سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا (٩٣) وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ
أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا
رَّسُولٗا (٩٤) قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ
لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا (٩٥) قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا (٩٦)

ئـەو كەسـەی بـە هـۆی قورئانەوە فـەزڵو چاكـەی كـردوە بەسـەرتەوە، بـە توانایـە لێـت وەربگرێتـەوە، پاشـان لـە بەرانبەریدا كەسـێک نیە بتوانـێ بۆتـی ڕەتبكاتەوە، وە كەسـێكیش نەبـێ داوا بكات لە خـوا بۆتی بگەڕێنیتـەوە، دەی شـانازی پێـوە بكـەو بیكـە بـە بیلبیلـەی چاوەكانـت، بـا بێزارت نـەكات بە درۆخسـتنەوەی بـە درۆدانەران، وە گاڵتـە پێكردنـی گومـڕاكان، بە ڕاسـتی تـۆ گەورەتریـن نیعمەتـت خسـتوەتە ڕوو، ئەوانیـش ڕەتیـان كردوەتـەوە، لەبـەر ئەوە خوا ڕیسـواو سەرشـۆڕی كـردوون.

(٨٨): ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا (٨٨) ﴾

ئەمە بەڵگەیەكی یەكلاكەرەوەو سـەلماندنێكی درەوشـایەوەیە لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامەی پێغەمبـەر هێناویەتـی، كاتـێ خـوا ﷻ تەحـەددای مـرۆڤو جنۆكـەی كـرد وێنـەی ئـەم قورئانـە بهێننـەوە، هەواڵیدا كـە ئەوان ناتوانـن وێنەی ئـەوە بهێننەوە، هەرچەنـدە هاوكاری یەكتـر بكەن لەسـەر ئـەو كارە ناتوانـنو دەسـەڵاتیان نیە بەسـەریدا، وەک چـۆن خوا ﷻ هەواڵـی دا ئـەوە ڕوویـدا، بێگومـان هۆكارەكانـی دوژمنە بـە درۆخەرەكان بەردەسـت بوو لەسـەر ڕەتكردنـەوەی ئەو پەیامـەی هێناویەتی، ئەوان خـاوەن زمانو ڕەوانبێـژی بوون، جا ئەگـەر كەمتریـن توانـاو دەسـەڵاتیان هەبووایە ئـەو كارەیان دەكـرد، بێگومان بـەوە زانرا ئـەوان ملكـەچ بـوون بەوپـەڕی ملكـەچ بـوون بە ویسـتی خۆیـان بێت، یـان بـە زۆر، وە بێتوانـا بـوون لە خسـتنەڕووی هـاو وێنەی ئـەو قورئانە.

چـۆن بەدیهێنراوێكـی لـە خـۆڵ دروسـتكراوە ناتـەواو لـە هەمـوو ڕووەكانەوە، ئـەو بەندە كـە نـە زانسـتی هەیە نـە توانا، نە ئیـرادەی هەیـە نە ویسـت، نە قسـەی هەیەو نە تـەواوە، جگـە لـەوە نەبـێ كـە پەروەردگاری پێـی داوە، بەرهەڵسـتی قسـەی پەروەردگـاری ئەرزو

ئاسـمانەكان بـكات، ئاگـادارە بە هەمـوو پەنهـانو نهێنیەكان، ئـەوەی كە خـاوەن تەواوی رەهـاو ستایشـی ڕاسـتەقینەو گەورەو مەزنـە، بێگومان ئەگـەر دەریا ببێتـە مرەكەب لە پاش ئـەوە حـەوت دەریـای تـر ببێتـە مرەكـەب، وە هەمـوو دارەكان ببن بـە قەڵـەمو پێنووس، هەمـوو مرەكەبـەكان تـەواو دەبـنو قەڵەكانیـش نامێنـن، بـەڵام وتەكانی خوا ﷻ هێشـتا دواییـان نەهاتـووەو تـەواو نەبـوون، جا هەروەكـو چۆن هیچ كەسـێك لـە بەدیهێنراوەكان هاووێنـە نیـە لەگـەڵ خـوادا لـە وەسـفەكانیدا، جـا قسـەكانی لـە وەسـفەكانێتی، كـە هیچ كەسـێك ناتوانـێ هـاو وێنـەی بـێ، بێگومـان هاووێنـەی نیـە لـە زاتو نـاوو سـیفاتو كردەوەیـدا (بـەرزیو بڵنـدی بـۆ خـوا) تووڕەیـی بـڕژێ بەسـەر ئەو كەسـەدا كە قسـەی بەدیهێنـەرو قسـەی بەدیهێنراوەكانـی لـە لا تێكـەڵ دەبـێ، بـڕوای وایە كـە موحەممەد ﷺ درۆی بـە دەم خـوا ﷻ كـردوە، خـۆی بۆ خـۆی ئـەو قسـەیەی بەدیهێناوە.

(٨٩-٩٦): ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِي ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾ واتە: جۆرەها ئامۆژگارییو نموونەمان تیایدا هێناوەتەوە، وە ماناكانیمان دووبارە كردوەتەوە كە مرۆڤ پێویستی پێیەتی، لەبەر ئەوەی بیر بكەنەوەو خۆیان بپارێزن، بیریان نەكردەوە جگە لە هەندێكی كەمیان نەبێ، ئەوانەی كە لە لایەن خواوە خۆشبەختیان بۆ پێشخراوە، خوا ﷻ پشتیوانی لێكردوون، بەڵام زۆربەی خەڵكی هیچیان هەڵنەبژارد بێبڕوایی نەبێ بەرانبەر ئەم نیعمەتە، كە گەورەترینی ناو هەموو نیعمەتەكانە، لە پاشان كەللەڕەقیان دەكرد بەسەریەوە بە پێشنیار كردنی كۆمەڵە ئایەتو نیشانەیەك جگە لە ئایەتو نیشانەكانی، لە نەفسی ستەمكارو نەفامی خۆیانەوە دایدەهێنا، بە پێغەمبەری خوایان ﷺ دەوت ئەم قورئانەی هێناوە كە گشتگیرە

بۆ هەموو سەلماندنو نیشانەیەک: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا﴾ ڕووبارێکی هەڵقوڵاو ﴿أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ﴾ پێویستیت بەوە نەبێ بچی بۆ بازارو هاتنو چوون ﴿أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا﴾ واتە: پارچەیەک لە سزا، ﴿أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾ واتە: هەموویان، یان ڕووبەڕوو بە چاوی خۆمان بیانبینین، شایەتیت بۆ بدەن بەو پەیامەی کە هێناوتە.

﴿أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ﴾ واتە: ڕازاوە بە زێڕو هاوشێوەی، ﴿أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ بەرز بوونەوەیەک بە چاوی خۆمان ببینین، ﴿وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ﴾ لەگەڵ ئەمەشدا (بڕوات پێناهێنین هەتا کتێبێک دانەبەزێنی بخوێنینەوە).

بــە ڕاستی ئەمــە سەرکەشــیو بێــزار کردنــە، ئەمــە قســەی گێلتریــنو ســتەمکارترینیانە، ڕەتکردنــەوەی هەقو ڕاســتی لــە خۆ دەگــرێ، وە بێ ئەدەبیە لەگــەڵ خــوادا، بێگومان تەنها پێغەمبــەر ﷺ خــۆی ئایــەتو نیشــانەکان دەهێنێــت، خــوا ﷻ فەرمانــی پێکــردوە بە پاک ڕایبگــرێ: جــا فەرموویەتــی: ﴿قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى﴾ (پاکــیو بێگەردی بــۆ پەروەردگارم) لــەوەی کــە دەیڵێــن، پەروەردگــاری بــەرزو بڵنــدا، وە پاکــی بــۆ خــوا ﷻ کــە بڕیــارو نیشــانەکانی شــوێنی هەواو ئــارەزووە فاســیدو بۆچوونە بۆگەنەکانیــان بکەوێ ﴿هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا﴾ مــن هیــچ شــتێکم بە دەســت نیــە لــە کارو فەرمانی خــوادا، ئــەم هۆکارە ڕێگــری لــە زۆرێ لــە خەڵکــی کرد کە بــڕوا بهێنــن، چونکە کاتــێ پێغەمبــەران دەنێردران بــۆ ناویــان مــرۆڤ بــوو هەروەکــو خۆیــان، ئەمــەش لــە ڕەحمــەتو میهرەبانــی ئــەو بوو بۆیــان، کــە پێغەمبەرێکیــان بــۆ ڕەوانــە بــکات وەک خۆیــان مرۆڤ بــێ، بێگومــان ئەوان ناتوانــن گفتوگــۆ لەگــەڵ فریشــتەدا بکەن.

جــا ئەگــەر ﴿كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ﴾ بــە وێنــەی ئادەمــی فریشــتەیان ببینایــەو قســەیان لەگــەڵ کردبایــە، ﴿لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا﴾ تا بتوانن شــتی لێوەربگــرن ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ (واتــە: پێیــان بڵــێ: خــوا بەســە کــە شــایەت بێ لە نێــوان منو ئێــوەدا، بــە ڕاســتی خوا هەمیشــە بــە ئاگــای بینایە بــە بەندەکانــی)، ئەگــەر بــە دەم ئێمەوە هەنــدێ قســەی هەڵبەســتایە بێگومــان ئێمە بە دەســتی ڕاســتمان تۆڵەمان لێدەســەند، پاشــان ڕەگــی دڵیمــان دەبڕی)، بە ڕاســتی زۆر شــارەزای بــە ئاگایە، هیــچ نهێنیەک لــە بارودۆخی بەنــدەکان لێی ناشــاردرێتەوە.

وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ
مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا
وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾
ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا
وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ
وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾
قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ
ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ
ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ
إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ
هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ
يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾

**(٩٧-١٠٠):** ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ ﴾:

﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کـە بێگومـان ئـەو تـاکو تەنهایـە بـە ڕێنمایـی کـردنو گومراکـردن، جـا ڕێنمایـی هەرکەسێ بـکات یارمەتـی دەدات بـۆ ڕێـی ئاسـان، وە دووری دەخاتـەوە لـە ڕێگـای دژوارو سـەخت، بە ڕاسـتی تەنهـا ئـەو ڕێنمایـی کارە، هەرکەسـێ گومـڕا بـکات ئەوە سـەری شـۆڕدەکات، وە دەیداتـە دەسـتی هـەواو ئارەزوویـەوە، هیـچ ڕێنمایـی کارێکـی نیـە جگـە لـە خـوا ﷻ، هیـچ دۆسـتو پشتیوانێکیشـی نیـە ڕزگـاری بـکات لـە سـزای خـوا ﷻ، کاتـێ کـە خـوا حەشـریان دەکات بەسـەر ڕوومـەتو دەمو چاویانـدا بەسەرزەنشـت کـردنو ڕیسـوایيو کـەرو کوێـری، نـە دەبینـنو نە قسـە دەکـەن، ﴿ مَّأْوَىٰهُمْ ﴾ واتە: شـوێنو جێگایـان ﴿ جَهَنَّمُ ﴾ کـە هەمـوو خـەمو بـێ تاقەتـيو سـزایەکی تێـدا کۆبوەتـەوە ﴿ كُلَّمَا خَبَتْ ﴾ هـەر کاتـێ بڵێسـەی ئاگـری دابمرکێتـەوە ﴿ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴾ واتـە: بڵێسـەی ئاگرەکەیـان بـۆ زیـاد دەکەیـن، سـزایان لـێ دانابڕێـت، کۆتاییشـیان پـێ ناهێنـرێو بمـرن، سزاشـیان لەسـەر سـووک ناکـرێ، بێگومـان خـوا ﷻ سـتەمی لێنەکـردوون، بەڵکـو پاداشـتی بـە درۆخسـتنەوەو بێبڕوایيانـی داوەتـەوە

بــە ئایەتەکانــی، وە ئینــکارو نکوڵــی زینــدوو بوونەوەیــان کــردوە کــە پێغەمبــەران هەواڵیــان پێــی داوەو لــە کتێبــە پیرۆزەکانــدا باســکراوە، وە بەبــێ توانــا تەماشــای پەروەردگاریــان کــردوەو ئینــکاری تــەواوی دەسەڵاتیشــیان کــردوە، ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا ﴾ واتــە: ئەمــە ڕوونــادات، چونکــە بــە پێــی عەقڵــە لاوازەکانــی ئــەوان زینــدوو بوونــەوە زۆر دوورە، ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ (واتــە: ئایــا ئەوانــە نەیانزانیــوە بێگومــان ئــەو خوایــەی کــە ئاســمانەکانو زەوی دروســت کــردوە)، گەورەتــرە لــە دروســتکردنی مرۆڤــەکان، ﴿ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ ﴾ (واتــە: دەســەڵاتدارو بــە توانایــە کــە وێنــەی ئەوانــە دروســت بــکات)، بەڵــێ بێگومــان ئــەو بــە توانایــە لــە دروســتکردنی هەمــوو ئەوانــەدا ﴿ وَجَعَلَ ﴾ بەڵکــو بێگومــان داینــاوە بــۆ ئــەوە، ﴿ أَجَلًا لَّا رَيۡبَ فِيهِ ﴾ گومانــی تێدانیە، دەنــا ئەگــەر بیــەوێ لــە پرێکــدا دەیهێنــێ، وە بەڵگــە هێنانــەوەی لەســەر زینــدوو کردنــەوە، ﴿ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴾ (واتــە: بێبڕوایــان هیچیــان نــاوێ جگــە لــە بێبڕوایــیو) ســتەمو درۆهەڵبەســتن نەبــێ، ﴿ قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ ﴾ کــە کۆتایــی ئایــەت ﴿ إِذًا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِ ﴾ واتــە: لــە ترســی تەواوبــوون خەرجتــان نەدەکــرد، لەگــەڵ ئــەوەدا مەحاڵــە گەنجینــەی تــەواو بــێ، بــەڵام سروشــتی مــرۆڤ لەســەر خۆگرتنــەوەو ڕەزیلیــە.

(١٠١-١٠٤): ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسۡتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ فَأَغۡرَقۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعٗا ﴿١٠٣﴾ وَقُلۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ لِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱسۡكُنُواْ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ﴿١٠٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ ﴾ واتــە: ئــەی پێغەمبــەر (موحەممــەد) ﷺ تــۆ پشــتیوان لێکراویــت بــە ئایــەتو نیشــانەکان، وە تــۆ یەکــەم پێغەمبــەر نیــت کــە گەلەکــەی بــە درۆی زانیبــێ، دڵنیابــە ئێمــە پێــش تــۆ مووســای کــوڕی عیمرانمــان نــارد بــۆ لای فیرعــەونو گەلەکــەی، وە پێمانــدا ﴿ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴾ هــەر یەکــێ لــەو نیشــانانە بــەس بــوو بــۆ بڕواهێنانــی کەســێ کــە بیــەوێ شــوێنی ڕاســتی بکەوێــت، وەک: مــار، گۆچــان، لافــاو، کوللــە، ئەســپێ، بــۆق، ســزا، لــەت بوونــی دەریــا، ئەگــەر گومانــت

هەبوو لە شتێ لەوانە ﴿ فَسْـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ ﴾ لەگەڵ ئەم نیشانانەدا ﴿ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ﴾

جا ﴿ قَالَ ﴾ مووسا پێی وت: ﴿ لَقَدۡ عَلِمۡتَ ﴾ ئەی فیرعەون ﴿ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ نیشانەکان ﴿ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ ﴾ ڕوونکەرەوەن بۆ بەندەکانی، ئەمە قسەی تۆ نیە لە حەقیقەتدا، بەڵکو دەتەوێ گەلەکەتی پێ هەڵبخەڵەتێنی ﴿ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا ﴾ واتە: لەناو دەچیو سزادەدرێیت، دەک ڕێسواو سەرشۆڕو نەفرین لێکراو بی ﴿ فَأَرَادَ ﴾ واتە: فیرعەون ویستی ﴿ أَن يَسۡتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (واتە: مووساو گەلەکەی لە میسر) دەربکات ﴿ فَأَغۡرَقۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعٗا ﴾ نەوەکانی ئیسرائیلمان کردە خاوەنی زەوی‌و وڵاتی خۆیان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَقُلۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ لِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱسۡكُنُواْ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ﴾ واتە: هەمووتان تا پاداشتی هەر کەسێک بداتەوە بە پێی کردەوەی خۆی.

وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (١٠٥)
وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا (١٠٦)
قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَىٰ
عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ
وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا (١٠٨) وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ
خُشُوعًا (١٠٩) قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ
الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ
بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا (١١٠) وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن
لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا (١١١)

(١٠٥): ﴿وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (١٠٥)﴾

﴿وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ﴾ واتــە: بە هەقو ڕاسـتی ئەم قورئانە پیرۆزەمــان ناردوەتە خوارەوە بۆ کاروبــاری بەنــدەکان، وە قەدەغەکردنیانو پاداشــت دانەوەیــانو ســزادانیان ﴿وَبِالْحَقِّ نَزَلَ﴾ واتــە: بــە ڕاســتیو دادپــەروەری پارێــزراوە لە هەمــوو شــەیتانێکی دەرکراو لە بەزەیی خــوا ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا﴾ بــۆ ئــەوە گوێڕایەڵــی خــوا ﷻ بــکات پاداشــتی بــە پەلــەی پێــدەدرێ لــە ئێســتاو لــە داهاتــوودا ﴿وَنَذِيرًا﴾ واتــە: بــۆ ئــەو کەســەی ســەرپێچی خــوای کردبــێ، بــە ســزایەک لە ئێســتاو لــە داهاتــوودا، لەمەدا مــژدە دانو ئاگــادار کردنەوەمــان بــۆ روون دەبێتــەوە.

(١٠٦-١٠٩): ﴿وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا (١٠٦) قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا (١٠٨) وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا (١٠٩)﴾

﴿وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ﴾ واتــە: ئــەم قورئانەمــان دابەزانــدوە جیاکەرەوەیــە لــە نێــوان هیدایــەو گومڕاییــدا، وە هــەقو باتڵ، ﴿لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ﴾ واتە: بە لەســەر خۆو هێواشــی، تــا لێــی ورد ببنــەوەو بیــر لــە واتاکانــی بکەنــەوە، وە زانســتی لێــدەر بهێنــن ﴿وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا﴾ تــۆزە تــۆزە، جیــا جیا، لــە ماوەی بیســتو ســێ ســاڵدا، ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا (٣٣)﴾ الفرقــان، (واتــە: هــەر نموونــەو مەســەلێکت بــۆ بێنن ئێمــە وەڵامەکەیمــان بــۆ تۆ هێنــاوە، بە ڕاســتیو جوانتریــن ڕوون کردنەوە) جــا کە ڕوون بوویــەوە قورئــان هەقــەو گومانی تێدانیە بــە جۆرێ لە جــۆرەکان، ئــەو کات ﴿قُلْ﴾ بڵێ: بــەو کەســانەی بــە درۆی دادەنێــنو پشــتی تێدەکــەن، ﴿آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا﴾ خــوا ﷻ هیــچ پێویســتیەکی بــە ئێــوە نیــە، ئێــوە زیانــی پێناگەیەنن، بــەڵام زیانی ئــەوە لەســەرتانە،

بـە ڕاسـتی خـوا ﷻ کۆمەڵـە بەندەیەکـی دیکـەی هەیە جگە لـە ئێـوە، زانسـتو زانیاری بـە سـوودی پێبەخشـیوون، ﴿ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴾ واتـە: کاریگەریـان لێـدەکات بـە ئەوپـەڕی کاریگەریو ملکەچـی دەبـن ﴿ وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا ﴾ ئەوەی کە شایسـتەی گەورەیـی ئەو نیـە، لەوەی کـە هاوەڵدانـەران دایانەتە پاڵـی ﴿ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا ﴾ بـە زینـدوو کردنـەوەو پاداشـت بـە کـردەوەکان ﴿ لَمَفْعُولًا ﴾ بەڵێن شـکاندنی تێـدا نیە هەروەهـا گومانیش ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ ﴾ واتە: دەکەون بەسـەر ڕوودداو (سـوژدە دەبەن) ﴿ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ ﴾ قورئـان (هەمیشـە ملکەچیـان بـۆ زیـاد دەکات) ﴿ خُشُوعًا ﴾ ئەو کەسـانەش وەک ئەوانـەن کـە خـوا ﷻ منەتی کـردوە بەسـەریاندا لـە بڕوادارانـی خاوەن کتێـب وەک عەبدوڵـلای کـوڕی سـەلامو غەیـری ویـش لەوانـەی کـە بڕوایـان هێناوە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ، وە پـاش ئەویش.

(١١٠-١١١): ﴿ قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا (١١٠) وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا (١١١) ﴾:

خـوا ﷻ بە بەندەکانـی دەفەرمـوێ: ﴿ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ﴾ بە ویسـتی خۆتان هاوار لـە هەرکامیـان دەکـەن بیکـەن ﴿ أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ﴾ واتـە: نـاوی جگە لە چاکـی نیە، هەتـا قەدەغەی بـکات هاواری پێبکـەن، بەڵکو بەهـەر ناوێکی پیـرۆزی داوای لێبکـەن، مەبەسـتەکە بەدەسـت دێت، ئـەوەی کە پێویسـتە: داوا بکات بـۆ داواکاریەک بەو ناوەی کـە گونجاوە.

﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴾ (واتـە: لـە نوێژەکانتـدا دەنـگ بـەرز مەکـەرەوە بـە قورئـان) خویندنـەوەت ﴿ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴾ (وە بـە نهێنیـش مەیخوێنـە) بێگومـان ئـەم دوو حاڵەتـە وریایـیو ئاگادارکردنـەوەی تێدایـە.

دەنـگ بـەرزی: هاوەڵدانـەران ئەوانـەی کە بـە درۆیان دادەنـا، ئەگـەر گوێیان لێـی ببوایە تانـەو تەشـەریان لێـدەداو جنێویـان بـەو کەسـە دەدا کـە هێناویەتی، بـەڵام بەنهێنـی، ئەوە مەبەسـت بەدەسـت نەدەهـات بـۆ هەر کەسـێ کە بیـەوێ گـوێ بگرێ.

﴿ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: لـە نێـوان دەنـگ بـەرزیو شـاردنەوە، ﴿ سَبِيلًا ﴾ واتـە: ڕێگایەکـی ناوەنـد لـە نێوانیانـدا ﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ کـە خـاوەن تـەواویو وەسـفو سـتایشو گەورەییـە لە هەمـوو ڕوویەک لـە ڕووەکانەوە، کـە پاکە لە هەمـوو نارەحەتیو

ناتەواویەک، ﴿ ٱلَّذِى لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِى ٱلۡمُلۡكِ ﴾ بەڵکو موڵکو خاوەندارێتی هەمووی بۆ خوای تاکو تەنهاو زاڵە، جا جیهانی سەرەوەو جیهانی خوارەوە هەموویان کۆیلەی ژێر دەستی خوای مەزنن، هیچ کەس موڵکو دەسەڵاتی نیە ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾ واتە: پشت بە هیچ کەسێک لە دروستکراوەکانی نابەستێت، تا باڵادەستی پێیەوە بکاو هاوکاری بکات، بێگومان ئەو بێنیازو ستایشکراوە پێویستی بە هیچ یەکێک نیە لە بەدیهێنراوەکانی نە لە زەوی نە لە ئاسمانەکان، بەڵکو دۆستانێک هەڵدەبژێرێت تا هاوکاریان بکاتو میهرەبانیان بەسەردا دابارێنێ، ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ ﴿٢٥٧﴾ ﴾ البقرة، (واتە: خوا ﷻ دۆستو کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێ لە تاریکستانی بێبڕوایی بۆ ڕووناکی ئیمانو ڕێنمایی).

﴿ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ﴾ واتە: بە گەورەو مەزنی بزانە، بە هەواڵەکانو بە وەسفە مەزنەکانی، بە پیاهەڵدانی بە ناوە جوانەکانی، وە بە گەورە دانانی کردەوە پیرۆزەکانی، بە مەزندانانی لە بەندایەتی کردنیدا بەتاکو تەنهایی، هیچ هاوەڵێکی نیە، وە بە دڵسۆزی بەندایەتی بۆ کردنی.

تەفسیری سووڕەتی (الإسراء) تەواو بوو.

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.



سُورَةُ الكَهۡفِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ٢ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ٣ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ٤

## تەفسیری سوورەتی (الكهف)

## مەككیە (١١٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ٢ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ٣ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ٤ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٖ وَلَا لِأٓبَآئِهِمۡۚ كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا ٥ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ٦ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا ﴾ ئەمـە سـوپاس‌و سـتایش‌و پیاهەڵدانـە بـۆ خـوا ﷻ بـەو سـیفەتانەی کـە هەموویـان تـەواوو بێ کـەم‌و کوڕیـن، وە ستایشـی خوایـە لەسـەر نیعمەتـە ئاشـکراو پەنهانە‌کانـی، وە ئاینـی‌و دونیاییە‌کانیـش، گەورەتریـن نیعمەتە‌کانـی بـە ڕەهایـی: دابەزاندنی کتێبـە مەزنە‌کەیەتی بۆ سـەر بەنـدەو پێغەمبەرە کـەی موحەممـەد ﷺ، جـا ستایشـی خۆی کـردوە، لەو نێوەندەشـدا ڕێنمایـی بەندە‌کانـی کـردوە بۆ ئەوەی ستایشـی بکەن لەسـەر ڕەوانـە کردنـی پێغەمبەر بۆ ناویـان‌و دابەزاندنـی کتێـب بۆ سـەریان.

پاشـان وەسـفی ئـەم کتێبەی کردوە بە دوو وەسـفی گشـتگیر لەسـەر ئەوەی کە تـەواوە لە هەمـوو ڕووە‌کانـەوە، ئەو دوانەیـش بریتین لە: ڕەتکردنـەوەو نەفی کردنی کـەم‌و کورتی‌و ناتەواوی، وە چەسـپاندنی ئـەوەی ئەم کتێبە ڕاسـتەو پایەدارە.

جـا نەفی کـردن‌و ڕەتکردنـەوەی ناتـەواوی ئەوە دەخـوازێ کـە هەواڵە‌کانی درۆیـان تێدا نیـە، وە لـە فەرمـان‌و قەدەغە‌کراوە‌کانیشـیدا سـتەم هاوەنتەو بـێ ئەنجام نیە.

چەسـپاندنی ڕاسـتیو پایـەداری (الإسـتقامة) ئـەوە دەخـوازی کە خـوا ﷻ هـەواڵ نادات‌و فەرمـان ناکات بـە گەورەترینی هەواڵـەکان نەبێت، ئەویـش ئەو هەواڵانەیە کـە دڵەکان پڕ دەکـەن لە ناسـین‌و ئیمان‌و عەقـڵ، وەکو هـەواڵ دان دەربارەی ناوو سـیفەت‌و کردارەکانی خـوا، وە ئـەو هەواڵانـەی پەنهانن کە هێشـتا ڕوویـان نـەداوەو ئەوانەش کە پێشـتر ڕوویان داوە، بێگومـان فەرمـان‌و قەدەغەکراوەکانی قورئـان نەفس‌و دەروونەکان پـاک دەکەنەوەو گەشـە دەکەن‌و کامڵ دەبن، چونکە گشـتگیرە لەسـەر تـەواوی‌و دادپەروەری‌و دڵسـۆزی‌و بەندایەتـی کردن بـۆ پەروەردگـاری جیهانیان کە تـاک‌و تەنهاو بـێ هاوەڵە.

کتێبـێ بەم شـێوەیە وەسـف کرابـێ، هەقـی خۆیەتی خـوا ﷻ لەسـەر دابەزاندنی ستایشـی خـۆی بـکات، وە بـەم قورئانـەوە لە لای بەندەکانیشـی ستایشـی خـۆی کردوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ﴾ واتـە: تا بەم قورئانە پیـرۆزە (بەدکاران‌و بێبڕوایـان) بێـدار بکاتـەوەو بیانترسـێنی لـەو سـزاو تۆڵـەی کـە لە لایەتـی، بە پێـی قەزاو قـەدەری، بـۆ هـەر کەسـی سـەرپێچی فەرمانەکانـی بـکات، ئەمـە سـزاو تۆڵـەی دونیـاو دواڕۆژ دەگرێتـەوە، هەروەهـا ئەمـەش (یەکێکی ترە) لە نـازو نیعمەتەکانی کـە بەندەکانی ترسـاندوەو ئاگـاداری کردوونەتـەوە لـەوەی زیانـی هەیـە بۆیـان دەبێتـە مایـەی لەنـاو چـوون‌و ملشـکاندیان، هـەر وەکو چۆن کاتێ لەم قورئانەدا باسـی وەسـفی ئاگـری کردوە، فەرموویەتـی: ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ١٦﴾ الزمر، (واتـە: ئەو سـزایە خوا بەندەکانـی خـۆی پێدەترسـێنێ، ئـەی بەندەکانـم خۆتـان بپارێـزن) لـە سـۆزو میهرەبانـی خـوا بـە بەندەکانـی، ئەوەیـە کە سـزای زۆر قورسـی بـۆ ئەوانـە براندوەتەوە وا سـەرپێچی فەرمانەکانـی دەکـەن، وە بـۆی ڕوون کردوونەتـەوە، بـە هەمـان شـێوە ئەو هۆکارانەشـی ڕوون کردونەتـەوە کـە پەلکێشـیان دەکات بـۆ ئەو سـزا قورسـە.

﴿وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا﴾ واتـە: خـوا ﷻ کتێبـی بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی ﷺ دابەزانـدووە، تا بـەو کتێبە مژدە بـدات بە بـڕواداران، وە بـە پێغەمبەرانـی‌و کتێبەکانـی بـە گشـتی مـژدە بـدات بـە بـڕواداران، ئەوانـەی کـە بە ڕاسـتی‌و تـەواوی بڕوایـان هێنـاوە، جـا کـردەوەی چاکـە لەسـەریان پێویسـت دەبـێ، لە فـەرزو سـوننەت کـە دڵسـۆزی‌و شـوێنکەوتن کۆیـان دەکاتەوە.

﴿أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا﴾ ئەویـش ئەو پاداشـتەیە کە خوا ﷻ لەسـەر بڕواهێنـان‌و کردەوەی چـاک داینـاوە، مەزنتریـن‌و گەورەترینیان سـەرکەوتنە بـە بەدەسـتهێنانی ڕەزامەندی خواو

چوونـە بەهەشـت، کـە تیایدایـە چـاو نەیبینیوە، گـوێ نەیبیسـتووە، بـە خـتورەش بـە دڵی ئادەمیـزاددا نەهاتووە.

وە لـە وەسـف کردنیـدا بـە چـاک (حَسناً) بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە ئـەم قورئانـە هیچ ناتـەواوی‌و کـەم‌و کورتیەکـی تێدانیە بە هیـچ جۆرێک، جا ئەگەر شـتێکی لەو جـۆرە تێدا بووایـە، ئـەوە چاکێتی تـەواوو کامـڵ نەدەبوو.

﴿ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴾ (لـە بەهەشـتدا دەمێننـەوە بۆ هەتـا هەتایی) لانادرێ لەسـەریان‌و ئەوانیـش تێیـدا لانادرێـن، بەڵکو نـازو نیعمەتەکانـی هەموو کاتێ لـە زیادبووندایـە، لەباس کردنـی ئـەو مژدەدانـەدا ئەنجامدانی ئـەو کردەوانـە پێویسـت دەکات، ئەویـش ئەوەیە کە ئـەم قورئانـە هەمـوو کردەوەیەکـی چاکـی تێـدا باسـکراوە، ئادەمیـزاد دەگەیەنێـت بـەو بەهەشـتەی مـژدەی پێدراوە، وە رووحیشـی پـێ ئاسـوودە دەبێت.

﴿ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴾ (واتـە: بەتایبەتـی ئەوانە بترسـێنێ کـە دەڵێن: خـوا ﷻ کـوڕی بـۆ خـۆی دانـاوە) لـە جوولەکـەو گـاورو بتپەرسـتان، ئەوانـە کـە ئـەم قسـە ناشـرینەیان ووت، ئـەوان ئـەم قسـەیان لـە سـەرچاوەی زانسـت‌و دڵنیاییـەوە نەوت، ئەوانـە نەخۆیـان شـتێکیان زانیـوە، نـە باووباپیرانیـان کـە ئـەوان پەیڕەویـان دەکـردن‌و شـوێنیان کەوتبـوون، بەڵکـو ئەوەی شـوێنی کەوتبـوون تەنها گومـان‌و تێر کردنـی هەواو ئارەزووەکانیـان بوو.

﴿ كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ ﴾ واتـە: قسـەیەکی زۆر ناقۆڵاو ناشـرین‌و گەورەیە، سزاکەشـی سـەخت‌و بـە ئێشـە، چ ناقۆڵایـی‌و ناشـرینیەک لـەوە مەزنتـرە منـداڵ بدرێتـە لای خـوا، کـە ناتـەوای خـوا ﷻ دەخـوازێ، وە یەکێکـی دیکـە بکاتـە هاوبـەش لەگـەڵ خـوا ﷻ لـە پەروەردگارێـتی‌و پەرسـتراوێتییدا، وە چ لـەوە خراپتـرە درۆ بە نـاوی خواوە دەکات؟! ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٤٤﴾ ﴾الأنعـام، (واتـە: کـێ لـەو کەسـە سـتەمکارترە کە درۆ بە نـاوی خواوە هەڵبەسـتێ)، بۆیـە لێـرەدا فەرموویەتی: ﴿ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا ﴾ واتـە: (ئـەوەی دەیڵێـن) تەنها درۆیەو بـەس، هیچ ڕاسـتیەکی تێدانیە، سـەرنج بـدەو بزانە خـوا چۆن ئەم قسـەیەی بەتاڵ کـردەوە بـە پلەبەنـدی دەیانگوازێتەوە لە شـتێکەوە بـۆ شـتێکی دیکـەی پووچ تر لـە ئەو، جـا هەواڵـی داوە:

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَائِهِمْ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ
أَفْوَاهِهِمْ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ٥ فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ
عَلَىٰٓ آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ٦ إِنَّا
جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا
٧ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ٨ أَمْ حَسِبْتَ
أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ٩
إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ
رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ١٠ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ
فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ١١ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ
ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ١٢ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم
بِٱلْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ١٣
وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ١٤
هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم
بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ١٥

یەکەم: ئەوان ﴿ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَائِهِمْ ﴾ (واتە: نە خۆیان دەیانزانیو نە باپیرانیان) قسەیان بە ناوەی خواوە دەکرد بە بێ زانست، گومان نیە لە ڕێگریکردنو بەتاڵی قسەکانیان.

دووەم: بە ڕاستی ئەوە قسەیەکی ناشرینو ناقۆڵایە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ ﴾ (واتە: چ قسەو بوختانێکی گەورەیە کە لە دەمیان دەردەچێ).

سێیەم: پلەو پێگەی لە ناشرینیدا گەیشتووەتە درۆ کردن، کە ڕاستی ڕەتدەکاتەوە.

کاتێ پێغەمبەر ﷺ سوور بوو لەسەر هیدایەتدانی خەڵکی، لەو پێناوەدا هەرچی لە توانایدا بوو درێغی نەکرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵخۆشو ئاسوودە دەبوو بەوانە هیدایەتو ڕێنماییان وەردەگرت، وە تووشی خەمو پەژارە دەبوو لەسەر ئەو کەسانەی بە درۆیان دادەناو گومرا بوون، وەکو بەزەییو ڕەحمو سۆزێک، خوا بەرچاو ڕوونی پێدا چیتر خۆی سەرقاڵ نەکات بە خەم خواردن بۆ ئەو کەسانەی بروا بەم قورئانە ناهێنن، هەر وەکو چۆن خوا ﷻ لە دەقێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ٣ ﴾الشعراء، (واتە: خەریکە خۆت لە ناو دەبەی بە خەفەت، لەبەر ئەوەی ئەوان بڕواناهێنن)، وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ٨ ﴾فاطر، (واتە: دەی کەواتە بە خەفەت خواردن لەبەر ئەوان خۆت مەفەوتێنە).

لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ ﴾ واتە: خۆت لە ناو مەبە بە هۆی خەمو خەفەتو حەسرەت بۆیان، بێگومان پاداشتی تۆ پێویست بووە لە لای خوا، ئەوانە ئەگەر خوا خەیرو چاکەی تیایاندا ببینایەت هیدایەتی دەدان، بەڵام دەزانی ئەوانە تەنها شایستەی دۆزەخن، بۆیە سەرشۆڕو ڕیسوای کردوون، هەرگیز هیدایەت وەرناگرن،

جـا سـەرقاڵکردنی نەفسـی خـۆت بەخەم بۆخـواردنو بـە حەسـرەت بوونی ئەوانـەوە، هیچ سـوودێکی نیـە بۆت.

لـەم دەقـەو وێنـەی ئەمە پەندو وانـەی تێدایـە، چونکە بێگومـان فەرمان پێکراو بـە بانگەواز کردنـی خەڵکـی بۆ لای خـوا ﷻ، تەنها گەیاندنـی پەیامەکەی لەسـەر پێویسـتە، وە هەموو هەوڵێـک بگرێتـە بـەر بـۆ هیدایەتدانـی خەڵکـی، وە داخسـتنی ڕێگەکانـی گومرایـیو سەرلێشـێواوی، بەوپـەڕی توانـای، لەگـەڵ پشـت بەسـتن بە خـوا، جـا ئەگـەر هیدایەتیان وەرگـرت ئـەوە چاکتـرە، ئەگەرنـا با خەمبـار نەبێو ئـاخ هەڵنەکێشـی، چونکە ئـەو خەمو پەژارەیـە نەفـسو دەروون لاواز دەکات، هێـزو توانـاش دەڕوخێنێ، هیچ سوودێکیشـی نیە، بەڵکـو بـا بـەردەوام بێ لەسـەر کارەکەی، ئـەو کارە کـە پێی سـپێردراوەو ئاراسـتە کراوە، جگـە لـە ئـەوە، لـە دەرەوەی توانـای ئـەوە، وە ئەگـەر پێغەمبەر خـوا ﷻ پێـی فەرمووبێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾القصص، (واتـە: بـە ڕاسـتی تـۆ ناتوانی ئەو کەسـەی خۆشـت دەوێ هیدایەتـی بدەیـت)، وە مووسـا ﷺ دەڵـێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي ﴿٢٥﴾ ﴾المائدة، (واتـە: مووسـا ﷺ وتـی: ئـەی پەروەردگـارم بە ڕاسـتی من خاوەنـی هیـچ کەسـێک نیم، بێجگە لـە خۆمو براکـەم نەبێـت)، بێگومان کەسـانی تر جگە لـە ئەوان لە پێشـترن بەمە، خوا فەرموویەتـی: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾الغاشیة، (واتـە: کەوابـوو ئامۆژگاری بکـە، تۆ هـەر ئامۆژگاریکاریت * تۆ دەسـەڵاتدار نیت بەسـەریاندا).

(٧-٨): ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات، کـە هەموو ئەوانەی لەسـەر زەویدایە لە: خـواردنو خواردنەوەکان، شـوێنی نیشـتەجێ بوونـی چـاک، وە دارو درەختەکانو ڕووبـارەکانو، کشـتو کاڵەکان، میـوەو بەرووبوومەکان، دیمەنـە ڕازاوەو دڵڕفێنـەکان، باخچە ڕازاوەکان، دەنگە خۆشـەکان، وێنـە سـەرنج ڕاکێشـەکان، وە زێـڕو زیـوو، ئەسـپو حوشـترو وێنـەی ئەوانـەش، هەموو ئەوانـە خـوا ﷻ هەمـوو کردوویەتـی بـە جوانیـەک بـۆ ژیانـی ئـەم دونیایە، بە مەبەسـتی فیتنـەو تاقیکردنەوە.

﴿ لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ واتە: بە دڵسۆزیو شوێنکەوتنەوە، وە لەگەڵ ئەمەدا خوا ﷻ هەموو ئەوانەی کە باسی کردوە لە ناویان دەباو پەرشو بڵاویان دەکات، وە جارێکی تر

زەوی دەبێ بە تەختاییەکی وشک، کە خۆشیو لەزەتەکانی نامێنێ، ڕووبارەکانی لە یەک دەپچڕێنو شوێنەواریان نامێنێ، وە خۆشیەکانی لە ناو دەچن، ئەمەیە حەقیقەتی دونیا، خوا ﷻ بۆی وەسف کردووین وەکو ئەوەی بە چاوی خۆمان ببینین، وە ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی پێی هەڵنەخەڵەتێین، وە هانی داوین بۆ ماڵا کە خۆشیەکانی نەبڕاوەو لەبن نەهاتوون، وە نیشتەجێ بووانیشی خۆشبەختن، هەموو ئەوانە ڕەحمەتن بۆ ئێمە، جا ئەو کەسەی هەڵدەخەڵەتێ بە جوانیەکانی دونیا تەنها تەماشای ڕواڵەتی دونیا دەکەن بەبێ سەرنجدان بە ناوەڕۆکی، دەبنە هاوەڵی دونیا وەکو ئاژەڵ، وە چێژی لێوەردەگرن وەکو ئاژەڵی ماڵی، تەماشای مافی پەروەردگاریان ناکەن بەسەریانەوە، گرنگیش بە ناسینی نادەن، بەڵکو هەموو غەمێکیان تێر کردنی ئارەزووەکانیانە بە هەر جۆرێ بە دەست بێو بە هەر ڕێگایەک ڕێک بکەوێ، ئا ئەوانە ئەگەر کەسێکیان کەوتە سەرەمەرگو کاتی مردنی هات، خەمباردەبن لەبەر لە نێوچوونی لەزەتو تامو چێژی دونیا، نەک لەبەر ئەوەی چی پێشخستووە لە گوناهو تاوانو سەرپێچیەکان. بەڵام ئەو کەسەی تەماشای ناوەڕۆکو ناخی دونیا دەکاو بیری لێدەکاتەوەو لە مەبەستەکانی خۆیو دونیا تێدەگا، ئەوەندە لە دونیا بەکاردێنێو دەیبات بۆ ئەوەی پشتی پێ ببەستێ بۆ ئەنجامدانی ئەوەی لە پێناویدا دروست بووە، هەلو فرسەتەکان دەقۆزێتەوە لە تەمەنە بەرێزەکەی، دونیا دەکاتە شوێنی پەڕینەوە، نەک شوێنی مانەوە، وەکو ڕێگای سەفەر سەیری دەکات نەک ماڵی مانەوە، بۆیە هەموو تواناکانی بەکاردەهێنێ لە ناسینی پەروەردگاریداو جێبەجێکردنی فەرمانەکانیو ئەنجامدانی کردەوەی چاک، ئەمە بە چاکترین پلەوپایە دەژمێردرێ لە لای خوا ﷻ، ئەو کەسە شایستەی هەموو ڕێزو نازونیعمەتو دڵخۆشیەکە، چونکە تەماشای ناوەڕۆکی دونیای کردوە، لە کاتێکدا کەسی یاخی بوو تەماشای ڕووکەشەکەی دەکات، وە کاری کردوە بۆ دوارۆژی، لە کاتێکدا کەسی بەتاڵ کاری بۆ دونیای کردوە، ئای نێوانی ئەم دوو دەستەیە چەندە جیاوازە!؟

(٩-١٢): ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ ﴾:

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾ ئەم پرسیارە ئیستفهامە

بە مانای (نەفی)و قەدەغە کردن دێ، واتە: وا گومان مەبە کە چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتو ئەوەی بەسەریان هاتوە شتێکی نامۆیە بە ئایەتو نیشانەکانی خوا ﷻ، وە داهێنراوە لە حیکمەتی ئەودا، هاوشێوەو هاوشانی نیە، بەڵکو خوا ﷻ نیشانەی زۆر لەوە مەزنترو سەرسوورهێنەرتری هەیە لە شێوەی ئەو ئایەتانەی هاوەڵانی ئەشکەوت، بەڵکو مەزنتریش لەوانە، بەردەوام خوا ﷻ نیشانەو بەڵگەمانی بۆ بەندەکانی دەخاتە ڕوو، هەم لە گەردوونو هەم لە نەفسی خۆیاندا، بۆ ئەوەی هەق لە ناهەقی پێ ڕوون بکاتەوە، وە هیدایەت لە گومڕایی، جا مەبەست لەم نەفییو ڕەتکردنەوەیە ئەوە نیە کە چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت یەکێکە لە سەرسوورهێنەرەکان، بەڵکو لە بەڵگەو نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانی خوان، مەبەست تێیدا ئەوەیە شێوەی ئەم بەسەرهاتانە زۆرە، تەنها وەستان لەگەڵ ئەمەداو تەماشا کردنی بە چاوی سەرسووڕمان ناتەواویە لە زانستو عەقڵدا، بەڵکو پیشەی بڕوادار بیرکردنەوەیە لە هەموو نیشانەکانی خوا ﷻ، کە خوا بەندەکانی بانگ کردوە بۆ بیرکردنەوە تیایدا، چونکە ئەوانە کلیلی بڕواهێنانو ڕێگای زانستو دڵنیایین.
یارانـی ئەشـکەوتی داوەتـە پـاڵ ئـەو ئەشـکەوتەی لـە نـاو چیاکەدایـە، وە (رقیـم) واتـە: بریتیـە لـەو کتێبـەی کـە نـاوو بەسـەرهاتیانی تێـدا تۆمـار کـراوە، لەبـەر مانەوەیـان لەو شـوێنە بـۆ سـەردەمانێکی دوورو درێژ، پاشـان بـە کورتی باسـی چیرۆکەکەیانـی کردوە، لـە دوای ئـەوە درێژەی پـێ داوە، جـا فەرموویەتی: ﴿إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ﴾ واتـە: گەنجەکان پەنـا دەبەنـە ﴿إِلَى ٱلۡكَهۡفِ﴾ (بـەر ئەشـکەوت) مەبەسـتیان ئـەوە بـوو خۆیـان بپارێزن لـە فیتنـەو نارەحەتـی گەلەکەیـان ﴿فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةً﴾ واتـە: پابەندمـان بکـەو بمانپارێـزە لـە هەمـوو شـەڕو خراپەیـەکو سـەرکەوتوومان بکـە بۆ هەمـوو خێرو چاکەیـەک ﴿وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا﴾ واتـە: هەمـوو هۆکارێکمان بۆ ئاسـان بکە کە بمانگەیەنـێ بـە ڕێگەی ڕاسـتو ڕزگـاری، وە کاروبـاری دیـنو دونیامان بـۆ چاکە بکە، کۆیـان کـردەوە لە نێوان کۆشـشو هەڵهاتن لـە فیتنە، بۆ لای شـوێنێ خۆیانی تێدا حەشـار بـدەن، وە لە نێوانـی ملکەچـیو پاڕانەوەیان لە خوا ﷻ بـۆ ئاسـانکردنی کاروبارەکانیان، وە پشـت نەبەسـتنیان بە هەمـی نەفسـی خۆیانو هەمی دروسـت کـراوەکان.
لەبـەر ئەوە خـوا ﷻ نـزاو پاڕانەوەکەیانـی لێوەرگرت، وە شـتێکی بۆ دەسـتەبەر کردن کە هەرگیـز بـە بیریاندا نەدەهـات ﴿فَضَرَبۡنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمۡ فِي ٱلۡكَهۡفِ﴾ (واتـە: پەردەماندا بەسـەر گوێیانـداو خەومـان لێخسـتن)، ﴿سِنِينَ عَدَدٗا﴾ واتـە: ئەویـش بریتیە لە سـێ سـەدو نـۆ سـاڵ، لـەو خـەوەی کـە باسـکراوە دڵەکانیانی پاراسـت لـە تـرسو دڵەڕاوکێ،

وە پاراسـتنی لـە گەلەكەیـان، لەبـەر ئـەوەی بین بـە ئایـەتو نیشـانەیەكی ڕوون، ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ ﴾ واتـە: (پاشـان خەبەرمـان كردنەوە) لـە خەوەكەیـان، ﴿ لِنَعْلَمَ أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی بزانیـن كامەیـان ئـەو ماوەیـەی كـە تێیـدا خەوتوونە سـەرژمێر دەكات، وەك خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيْنَهُمْ ﴿١٩﴾ ﴾الكهف (واتـە: ئـا بەو شـێوەیە لە خەو خەبەرمـان كردنەوە بۆ ئەوەی پرسـیار لـە یەكتـر بكەن)، وە بۆ ئـەوەی بزانن بە ئەنـدازەی مانەوەیـانو لەگەڵ مـاوەی مانەوەیاندا، وە زانینـی تـەواوی دەسـەڵاتو حیكمەتـی خـوا ﷻ، جـا ئەگەر نووسـتنەكەیان بـەردەوام بووایـە، ئـەوە هیچ شـتێك لە مانـەی كە باسـكرا دەسـتەبەر نەدەبـوو لـە چیرۆكەكەیاندا.

(١٣-١٤): ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾ ئەمـە دەسـپێكە لە درێژەپێدانی ئـەم چیرۆكە، خوا ﷻ ئـەم بەسـەرهاتە بـۆ پێغەمبەرە كـەی دەگێڕێتـەوە بـە هـەقو ڕاسـتی، كـە هیـچ گومـانو دوودڵیەكـی تێدانیـە بە جـۆرێ لە جـۆرەكان، ﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ ﴾ (بە ڕاسـتی ئەوانـە كۆمەڵـە لاوێـك بـوون)، بڕوایـان بـە پەروەردگاریان هێنابـوو، ئەمەش لـە جەمعی (القلة)یـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی كە ئەوان دە كـەس كەمتر بـوون، ﴿ ءَامَنُواْ ﴾ بڕوایان هێنـا بە خـوای تاكو تەنها كە هاوەڵو هاوبەشـی نیە، بـە پێچەوانـەی گەلەكەیان، خوا ﷻ سوپاسـی كردن لەسـەر ئەو بڕواهێنانەیـان، هیدایـەتو ڕێنمایی بۆ زیاد كـردن، وە زیاتری پـێ بەخشـین، واتـە: بە هـۆی بنچینـەو بنەمـای بڕواهێنانیانەوە خـوا ﷻ هیدایەتـی بۆ زیاد كـردن، ئەویـش بریتیـە لە: زانسـتی بە سـوودو كردەوەی چـاك، وەك خـوا فەرموویەتی: ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ﴿٧٦﴾ ﴾مریم (واتە: ئەوانەی لەسـەر ڕێبازی هیدایەت بـوون خـوا هیدایەتیـان بـۆ زیـاد دەكات)، ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ واتـە: خۆڕاگـرو چەسـپاومان كـردن، وە ئارامیمـان بـە دڵەكانیان بەخشـی لەو دۆخـە ناخۆشـەدا، ئەمەش لە لووتـفو بەزەیـیو چاكـەی خـوای بـەرزوو مەزنـە بۆیـان، كـە سـەركەوتووی كردوون بـۆ بڕواهێنـانو وەرگرتنـی هیدایـەتو ڕێنمایـیو ئارامگرتـنو پابەنـد بـوونو دڵنیایـی، ﴿ إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: ئـەو خوایـەی بەدیهێناویـنو ڕزقو ڕۆزی پێداویـن، وە كاروبارەكانـی بەڕێخسـتووینو پـەروەردەی كردووین، ئەویش

بەدیهێنـەری ئاسـمانەکانو زەویـە، کـە تـاکو تەنهایە بـە دروسـتکردنی ئـەم بەدیهێنراوە مەزنانـە، نـەک ئـەو بتانەی کە نەدەتوانن دروسـت بکـەن وە نەدەتوانـن رزقو ڕۆزی بدەن، وە نەسـوودیان بەدەسـتەو نـە زیـان، هەروەهـا نـە ژیانو نـە مردنو نـە زینـدوو بوونەوە، ئـەوان یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتیـان کـرد بـە بەڵگە بـۆ یەکتاپەرسـتی پەرسـتراوێتی، لەبـەر ئەمەیـە وتیـان: ﴿ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ ﴾ واتـە: (ئێمـە هەرگیز بێجگـە لە خوا پەرسـتراوێکی دیکـە ناپەرسـتین) لـە سـەرجەم بەدیهێنراوەکانـدا، ﴿ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا ﴾ واتە: ئەگـەر جگـە لـە خـوا ﷻ شـتێ بپەرسـتین دوای ئـەوەی زانیمـان تەنهـا ئەو پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەیە، دروسـت نیـە نابـێ پەرسـتش بکـرێ تەنها بۆ ئـەو نەبـێ، ﴿ شَطَطًا ﴾ واتە: بـە لادانێکـی زۆر گـەورە لامـان داوە لە هـەق، وە ڕێگایەکمـان گرتۆتە بەر کـە دوورە لە ڕێگای ڕاسـت، جا دان نان بە یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتیو یەکتاپەرسـتی پەرسـتروێتیان پێکـەوە کـۆ کردوەتـەوە، وە پابەنـد بـوون پێیـەوە، وە ئاشـکراکردنی ئـەوەی کـە هەقەو جگـە لـە ئەویش بەتـاڵو پووچە، ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر تـەواوی ناسـینی پەروەردگاریان، وە هیدایەتـی زیاتـر لـە لایەن خـواوە بۆیان.

(١٥): ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ ﴾ کاتـێ باسـی منـەتو فـەزڵ چاکـەی خوایـان کرد بەسـەریان لـە بڕواهێنـانو ڕێنمایی، ڕوویان کـردە گەلەکەیان لـەوەی بێجگە لـە خـوا ﷻ پەرسـتراوی تریـان بـۆ خۆیـان هەڵبـژاردوە، سـەرکۆنەیان کـردنو بۆیانیان ڕوون کـردەوە کـە ئەوان لەسـەر هـەقو ڕاسـتیو دڵنیایی نین لـە کاروبارەکانیانـدا، بەڵکو لـە ئەوپـەڕی نەفامـیو گێلیو گومڕاییـدان، جا وتیـان: ﴿ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ ﴾ واتـە: (دەی بۆیـان بهێنینـەوە) بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرا، لەسـەر ئـەو پووچـیو بەتاڵیـەی ئـەوان لەسـەری دەڕۆن، نەیاندەتوانـی هیـچ ڕێگایـەک بدۆزنەوە بۆ ئـەو کارەی کـە دەیانکـرد، بەڵکـو ئـەوە تەنهـا درۆ کـردنو بۆختانێک بوو بە نـاوەی خـواوە، ئەمەش مەزنتریـن سـتەمە، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴾ (واتـە: ئایـا کـێ سـتەمکارترە لەو کەسـەی درۆ بۆ خـوا هەڵدەبەسـتێ)؟!

وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ
يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا
(١٦) وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ
ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ
مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن
يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا (١٧) وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا
وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ
فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا (١٨) وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ
لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا
يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ
أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ
طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ
بِكُمۡ أَحَدًا (١٩) إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ
أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا (٢٠)

(١٦): ﴿ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا (١٦) ﴾:

دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ ئەوجا هەندێ لە یارانی ئەشكەوت بەوانی تریان وت: ئەگەر ئێوە دورە پەرێز بوون لە گەلەكەتان بەجەستەو ئاینەكەتان، هیچ شتێكی دیكە نەماوە تەنها ڕزگار بوون نەبێ لە شەڕو خراپەكانیان، وە گرتنە بەری ئەو هۆكارانەش كە دەبنە مایەی دوورەپەرێزی لێیان، چونكە هیچ ڕێگایەك نیە بۆ كوشتار كردن لەگەڵیانو مانەوەش لە نێوانیاندا، لەكاتێكدا ئەوان لەسەر ئاینێكی دیكەن ﴿ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ ﴾ واتە: پەنا ببەن بۆ ئەشكەوتەكەو خۆتانی تێدا حەشار بدەن ﴿ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴾ (واتە: پەروەردگاریش میهرەبانی خۆیتان بۆ پەخش دەكاتو دەرووی خێرتان لێدەكاتەوە).

ئەوەی لە پێشتر باسمان كرد، خوا ﷻ هەواڵی داوە ئەوان پاڕانەوەو وتیان: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا (١٠) ﴾ (واتە: ئەی پەروەردگارمان لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەتێكمان پێببەخشە)، دوو شتیان پێكەوە گرێدا: خۆیان بەری كرد لە هێزو توانایانو پەنایان بردە لای هێزو توانای خوا بۆ چاككردنی كاروباری ئاینیان، وە بەو جۆرەش لێی پاڕانەوەی بە تەواوی متمانەبوونەوە، بەڕاستی خوا بەزەیی خۆی بۆیان بڵاو كردەوە، وە كاروباری كۆچكردنەكەیانی بۆ ئاسانكردن، ئاینو جەستەیانی پاراست، وە كردنی بە یەكێك لە ئایەتو نیشانەكانی بۆ دروستكراوەكانی، ناوبانگی چاكی بڵاو كردنەوە لەناو خەڵكیدا، ئەوەش لە میهرەبانی خوایە بۆیان، هەموو هۆكارەكانی بۆ فەراهەم هێنان، تەنانەت ئەو شوێنەیشی تیایدا دەحەسانەوە، بە چاكترین شێوە پاراستنی،

بۆیــە فەرموویەتی:

(١٧-١٨): ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ١٧ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ١٨ ﴾:

﴿ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾ واتــە: خــوا ئەوانی پاراســت لە تیشــکی خــۆرو ئەشــکەوتێکی بۆ ئامــادە کردن، کاتــێ خــۆری بەیانیــان هەڵدەهــات لــە لای ڕاســتی ئەشــکەوتەکەی دەدا، وە لــە کاتــی ئاوابوونیشــدا لای دەدا لێیــان بــە لای چەپــدا، گەرمــی خــۆر بەریــان نەدەکەوت بــۆ ئەوەی جەســتەیان تێــک نەچێت.

﴿ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ﴾ واتــە: (لە کاتێکدا ئەوان لە بۆشــایی) و فراوانی ئەشــکەوتەکەدان، ئەویــش بــۆ ئــەوەی بای شــەماڵو ســروەی بەرە بەیــان لێیــان بدات، وە زیانیشــیان لەســەر لابــات، وە لەبــەر ئــەوەی ئــازار نەچێــژن لــە شــوێنکی تەنگــدا، بــە تایبــەت لەگــەڵ زۆر مانــەوەدا، ئەویــش یەکێکــە لــە نیشــانەکانی خــوا کــە بەڵگەیــە لەســەر تواناو دەســەڵاتو ڕەحمەتــی بۆیــان، وە وەڵامدانــەوەی دوعــاو پاڕانــەوەکانو هیدایەتدانیانــە، تەنانــەت لــەم کارانــەدا، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ ﴾ واتــە: هیچ ڕێگایــەک نیە بۆ بەدەســتهێنانی هیدایــەت تەنهــا لــە لایەن خــواوە نەبێ، هــەر ئــەو هیدایەتدەرو ڕێنشــاندەرە بــۆ بەرژەوەندیەکانــی دونیــاو دواڕۆژ، ﴿ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴾ واتــە: (ئــەوەی گومڕابــێ) نابینی کەســێ پشــتیوانیو هــاوکاری بکات بــۆ چاکەخــوازی، چونکە خــوا ﷻ بڕیــاری گومڕایــی داوە بەســەریدا، حوکمو بڕیاری خــواش ڕەتکردنــەوەی بۆ نیە.

﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ ﴾ واتــە: ئەگــەر بیانبینیــی وا دەزانــی بــە خەبــەرن، لــە کاتێکــدا ئــەوان خەوتــوون، ڕاڤەزانانی قوڕئــان وتوویانە: ئەمــەش لەبەر ئەوەیــە چاوەکانیان کرابوویــەوە بــۆ ئــەوەی تێــک نەچێ، جــا ئەو کەســەی تەماشــای دەکــردن وای دەزانی بە خەبــەرن، کەچی لــە واقیعــدا خەوتبوون.

﴿ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ ﴾ (ئــەو خەوتووانــە ئەمدیوو ئەو دیوویان پێدەکەین بــە لای ڕاســتو چەپــدا) ئەمــەش بــۆ پارێزگــاری کــردن لــە جەســتەو لاشــەیان، چونکە

سروشـتی زەوی وایـە بـە تێپـەڕ بوونی کات ئەو لاشـەیە دەڕزێ بەسـەریەوە، لـە قودرەتو توانـای خـوا ﷻ ئەوەیە خوا ﷻ ڕاسـتو چەپی پێدە کـردن، بەو ئەندازەیەی جەسـتەکانیان زەوی نەیخـواو نـەڕزێ، بێگومـان خـوا ﷻ بە توانایـە لـە زەوی بیانپارێزێ بەبـێ ئەم دیوو ئەودیـوو پێکـردن، بـەلام ئـەو کارلەجێیـە، دەیـەوێ بە پێـی سـوننەتو نەریتـی خۆی لە گەردوونـدا کارەکانـی ئەنجام بـدات، وە هـۆکارەکان بە یەکدی ببەسـتێتەوە.

﴿ وَكَلْبُهُم بَـٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ﴾ واتـە: ئەو سـەگەی لەگـەڵ یارانی ئەشـکەوتدا بوو، بـە هەمـان شـێوە لـە کاتی چاودێـری کردنیـدا خـەو بردبوویەوە، هـەر دوو دەسـتی خۆی درێـژ کردبـوو لەبـەر دەرگای ئەشـکەوتەکەدا، ئەمە پاراسـتنیان بـوو لە زەوی.

بـەلام پاراسـتنیان لـە دەسـتی مـرۆڤ، خـوا هەواڵـمـان پـێ دەدا کـە ئـەو پاراسـتوونی لە خەڵکـی بـە هـۆی ترسـەوە، جـا ئەگـەر کەسـێ بچووبایـە بۆ لایـانو بـەو شـێوەیە بیانی بینیایـە دڵـی پڕ دەبوو لە تـرس بە ڕاکردن بـەرەو دوا دەگەڕایـەوەو هەڵدەهـات، ئەمە بووە مایـەی ئـەوەی ئـەو مـاوە زۆرە بمێننـەوە، وە کـەس نەیانی دۆزیـەوە، لەگەڵ ئـەوەی زۆر نزیـک بـوون لـە شـارەکە، بەڵگـە لەسـەر ئەوەی کـە نزیـک بوون ئـەوان کات لـە خەو هەسـتان یەکێکیانیـان لـە نێـو خۆیاندا نـارد بۆ ئـەوەی خواردنیان بـۆ بکڕێ لەو شـارە، وە ئەوانیـش لـە چاوەڕوانیـدا بـوون، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی ئـەو شـارە زۆر نزیک بووە لێیانەوە.

(١٩-٢٠): ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَـٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَـٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَـٰهُمْ ﴾ لەو خەوە دوورو درێژەیان، ﴿ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ﴾ بـۆ ئەوەی پرسـیار لـە یەکتر بکەن لە سـەر حەقیقەتـی مـاوەی مانەوەیان، ﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ﴾ (واتـە: یەکێکیـان وتـی: چەنـد ماونەتـەوە؟ وتیـان: ڕۆژێـک، یـان کەمتـر مانیـەوە) ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ قسـەکەر لە گومانـدا بـووە، وەکـو ئـەوەی گومانێکیان بۆ دروسـت بووبێ لە مـاوەی مانەوەیانـدا، لەبەر ئەمەیـە وتیـان: ﴿ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ﴾ (واتـە: پەروەردگارتـان بـە ئەنـدازەی

مانەوەتـان زاناتـرە) زانیاریـان گەڕاندەوە بۆ لای ئەو کەسـەی کە بە زانسـتی دەوری هەموو شـتێکی داوە بـە دوورو درێژی.
پێدەچـێ خـوا ﷻ دوای ئـەوە ئاگـاداری کردبێتنەوە لە درێـژی ماوەی مانەوەیـان، چونکە بێـداری کردنـەوە بۆ ئەوەی پرسـیار لە یەکتری بکەن، وە هەواڵیشـی داوە ئەوان پرسـیاریان کـردوە لە نێوان یەکترداو قسـەیان کـردوە دەربارەی مـاوەی مانەوەیان، بەڵام لـە کۆتاییدا نەگەیشـتوونەتە هیچ دەرەنجامێک.
هـەر دەبێ بـە دڵنیاییـەوە خوا هەواڵـی پێدابن، ئەمەشـمان لـە حیکمەتی بێـدار کردنەوەیان بـۆ دەردەکـەوێ، بێگومان خـوا ﷻ ئەمـەی بەهەوەنتەو گۆتـرە نەکردوە.
وە لـە بەزەیـی خـوا ﷻ بـۆ ئـەو کەسـەی کە بـە ڕاسـتی بـە دوای زانیاریـدا دەگـەڕێو هەرچـی لـە توانایـدا هەبێ بۆ ئەو مەبەسـتە بـە کاری دێنێ، ئـەوە بێگومان خـوا بۆی روون دەکاتـەوە (و پێی دەبەخشـێ)، هەروەکـو فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ ﴾ (واتـە: ئـا بەو شـێوەیە خەڵکمـان ئاگادار کـرد بەسـەریاندا بۆ ئـەوەی بزانن کـە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاسـتە، وە دڵنیابـن ڕۆژی دوایی گومانـی تێدانیـە)، بـە پێچەوانەوە ئەگـەر نەیانزانی بێ چەنـد ماونەتەوە ئـەوە ئایەتەکە نابێتە بەڵگە لەسـەر مەبەسـتی بە ئاگـا هێنانەوەیان.
پاشـان ئـەوان کاتـێ لـە نـاو یەکتریـدا پرسـیاریان کـرد وەکـو چـۆن خـوا ﷻ هەواڵی دەربارەیـان داوە، یەکێکیـان لـە خۆیان نـارد بەو دراوەی لـە لایانە بۆ ئـەوەی خواردنیان بۆ بکـڕێ لەو شـارەی کـە لێی دەرکرابـوون، وە فەرمانیـان پێکرد خواردنێکـی پاکو چاکو بـە لـەززەت هەڵبژێـرێ، وە لـە کاتی کڕیـنو فرۆشـتنو ڕۆیشـتنیدا لە سـەرخۆو نەرمو نیـان بـێ، وە زۆر بـە نهێنـی ئـەو کارە ئەنجام بـداو حـاڵو بارودۆخی براکانـی لای کەس بـاس نەکات، وە کەسـیان لـێ ئاگـادار نەکاتەوە.
باسـی ئـەوەی کردوە کـەس بە حاڵیـان نەزانـێو ئاگاداریان نەبـێ، چونکە ئەوان لـە نێوانی دوو فەرمانـدان: یـان ڕەجـمو بەردبـاران کـردن بـە ناشـرینترین شـێوە بکوژرێـن، چونکە گاڵتەیـان بـەوانو ئاینەکەیـان کـردوە، یان ئەوەیە تووشـی فیتنەیـان بکەن لـە ئاینەکەیاندا بیانگەڕێننـەوە بـۆ ئاینـی بـاوکو باپیرانیـان، جا لـەم حاڵەتـەدا هەرگیز سـەرکەوتوو نابن، بەڵکـو زەرەرمەنـدی دیـنو دونیاو دوارۆژیـان دەبن.

## ئەم دوو دەقە چەند سوودێكیان لێ وەردەگیرێ:

یەكـەم: هانـدان لەسـەر زانسـتو لێكۆڵینەوەكردن لەسـەری، چونكـە خوا ﷻ لەبـەر ئەوە ناردنی.

دووەم: ئـاكارو ئەدەبـی جـوان ئەوەیـە ئەگەر كەسـێ لـە زانیاریەكـدا گومانی بۆ دروسـت بـوو بیگەڕێنێتـەوە بـۆ لای كەسـی زانا، وە لەسـەر ناسـینی ئەو شـتە هەڵوەسـتە بكات.

سێیەم: ڕاستیو دروستی وەكیلی لە كڕینو فرۆشتندا، وە ڕاستیو دروستی شەریكیش.

چـوارەم: ڕەوایەتـی خواردنـی بەتـامو بەچێـژ بـە مەرجـێ لـە سـنوور تێنەپـەڕێو، نەگاتە ئـەو سـنوورەی كـە شـەریعەت قەدەغەی كـردوە، بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴾ بـە تایبـەت ئەگـەر مرۆڤ لەسـەر ئەو جۆرە خواردنـە ڕاهاتبـوو، پێدەچـێ ئەمە قسـەی زۆرێ لـە زانایان بێ كـە وتوویانـە ئەوانە نەوەی دەسـەڵاتدارو پاشـاكان بوویێتـن، لەبـەر ئەوەیـە فەرمانیان بـە خواردنی خۆشو بـە لەززەت كـردوە، چونكـە عـادەتو نەریتی دەوڵەمەنـدو پیاوە گـەورەكان ئـەوە دەخوازێ.

پێنجەم: سـوور بوون لەسـەر خۆپاراسـتنو خۆ حەشـاردان، وە دوور كەوتنەوە لەو شوێنانەی دەبنـە مایـەی فیتنە لـە ئاینـدا، وە بەكارهێنانی شـێوازی داپۆشـینو كەتم كـردن بۆ خۆیو بـۆ براكانی لـە ئایندا.

شەشـەم: توونـدی حـەزوو ئارەزووی ئـەو گەنجانە لـە پەیڕەو كردنـی ئاینـدا، هەڵاتنیان لە هەمـوو ئەو فیتنەو مەترسـیانەی لەسـەر ئاینەكەیان هەبـوو، هەروەها وازهێنانیـان لە خاكو وڵاتیان لەبـەر خوا.

حەوتـەم: بـاس كردنی ئەوانەی كە شـەڕی لە خۆ گرتووە، لەو شـتە خراپو زیانبەخشـانەی كـە دەبنەمایـەی ڕق لێبـوونو وازهێنـان لێـی، بێگومان ئـەم ڕێگایـە ڕێگەی ڕاسـتەقینەی بڕوادارانی پێشـینو دواینـە، چونكە ئەوان وتوویانـە: ﴿ وَلَن تُفْلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدًا ﴾

وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟
ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ
أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ
رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ
رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ
أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً
ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَا۟ىْءٍ
إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ
إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا
﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا
﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ
أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ
فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ
رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾

(٢١): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـە ئاگـادار كردنـەوەی خەڵكـی لـە حاڵـی یارانـی ئەشـكەوت ئەویـش -خـوا زاناتـرە- دوای ئـەوە بـوو كـە بێـدار بوونـەوەو یەكێـك لـە هاوەڵانیان نـارد بـۆ ئـەوەی خواردنیان بۆ بكـڕێ، وە فەرمانیـان پێكرد بـە نهێنیو شـاراوەیی ئەو كارە ئەنجام بـدات، خوا ﷻ شـتێكی دیكـەی ویسـت كـە بەرژەوەندی خەڵكـی تێدایـە، وە بۆ ئەوەی ببێتە پاداشـتێكی زیاتـر بۆ یارانی ئەشـكەوت، ئەویش: ئەوەیە كـە خەڵكـی ئایـەتو نیشـانەی مەزنیـان لە ئـەوان بینی كـە بە چـاو بینیان، لەسـەر ئەوەی پەیمانـی ڕاسـتەو هیـچ گومانێكـی تێدانیەو دووریش نیە، پاشـان ئـەو خەڵكە لە نـاو یەكدا جیاوازیـان هەبوو دەربـارەی زیندووكردنـەوە، تیایاندا بوو بـڕوای بـە ڕۆژی دوایی هەبوو، تیایشـیاندابوو ڕەتـی دەكردەوە، خوا ﷻ بەسـەرهاتو سەرگوزەشـتەی ئەوانـی كردە مایەی زیاتـر بەرچـاوو ڕوونـیو دڵنیایی بـۆ بـڕواداران، وە بەڵگەشـە لەسـەر ئینـكاریو نكوڵی كاران، تـا هەر كەسـەی پاداشـتی خۆی لەسـەر ئـەم بڕوابوونو بـڕوا نەبوون بـەم چیرۆكە وەربگرێ.

خـوا ﷻ كارەكەیانـی ئاشـكرا كـردو بـڵاوەی پێكـرد، وە پلـەو پایەیانـی بەرز كـردەوە، تەنانـەت لـە لای ئەوانـەش مەزنی كردن كـە پێیانیان زانـیو، ﴿ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ﴾ (واتـە: هەندێكیـان وتیان چەنـد خانوویەكیان بەسـەرەوە دروسـت بكـەن) پەروەردگاریان زاناترە بـە حاڵو چارەنووسـیان.

ئەوانـەی كـە زاڵ بوونو خاوەن دەسـەڵات بوون، وتیـان: ﴿ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾

واتــە: (مزگەوتێكیــان لەســەر دروســت دەكەین) خــوای تێدا دەپەرســتین، وە یــادی ئەوانی تێــدا دەكەین.

بــە ڕاســتی ئــەم حاڵەتــە ڕێگــە پێنــەدراوە، پێغەمبــەر ﷺ قەدەغــەی كــردووەو سەرزەنشــتی بكەرەكــەی كــردوە، هێنانو باســكردنی ئــەم كارە لەم شــوێنەدا بۆ ئەوە نیە كە سەرزەنشــت نەكــرێ، بەڵكو ســیاقی دەقەكە بۆ بــە مەزندانــانو پیاهەڵدانی هاوەڵانی ئەشــكەوتە، بێگومان ئەوانــە حاڵیــان گەیشــتە ئەوەی تــا وتیان: چەند خانوویەك لەســەر ئەشــكەوتەكە دروســت بكــەن، دوای ئــەوەی هاوەڵانــی ئەشــكەوت لە زوڵــمو ســتەمی گەلەكەیان دەترســان، حاڵ گەیشــتە ئەوەی كــە دەیبینی.

ئــەم چیــرۆكو سەرگوزشــتەیە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی هەركەســێ لــە پێنــاو ســەلامەتی ئاینەكەیــدا هەڵبــێ لــە فیتنــەو خراپــەكاری، خــوا ﷻ دەیپارێــزی.

وە هەر كەســێ ســوور بێت لەســەر ئەوەی پارێــزراو بێ لە دینەكەیدا خــوا ﷻ دینداریەكەی دەپارێــزی، هەركەســێ داوای پەنــا بــكا لــە خــوا، خــوا پەنــای دەداتو دەیكاتــە مایــەی هیدایــەت بــۆ غەیــری خۆی، وە هەركەســێ بەرگــەی نارەحەتــیو زەلیلی بگرێ لــە پێناوی ڕەزامەنــدی خــوادا، ئەوە ســەرەنجام ســەربەرزو گەورەو مەزن دەبێ، بە شــێوەیەك بیریشــی لێنەكردبێتــەوە ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨﴾آل عمــران. (واتــە: وە ئەوەی لەلای خوایە بۆ چاكــەكاران چاكترە).

(٢٢): ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ٢٢﴾

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات لــە جیــاوازی خــاوەن كتێبــەكان لــە ژمــارەی یارانی ئەشــكەوت، جیاوازیــەك لەســەر بنەمــای نەبوونــی بەڵگەو قســە كــردن بە ناوەی خــواوە بەبــێ زانیاری ســەرچاوەی گرتــووە، ئــەوان لــەو بارەیەوە ســێ قســەیان هەبوو:

یەكەم: سێ كەسنو چوارەمیان سەگەكەیانە.

دووەم: پێنــج كەســنو شەشــەمیان ســەگەكەیانە، لە دوای ئەم دوو قســەیە، خــوا دەفەرموێ: بەڕاســتی ئەوانە قســەی بــێ بەڵگەنو قســەكردنە لــە كاری نادیــار، ئەوەش بەڵگەیە لەســەر بەتاڵی قســەكەیان.

ســێیەم: حــەوت كەســن هەشــتەمیان ســەگەكەیانە، ئەمــە بۆچوونی ڕاســتو دروســتە خوا

زاناتـره- چونکـه خـوا ﷻ ئـەو دوو قسـەیەی پێشـووی پـووچ کـردەوە، بـەڵام ئەمـەی پـووچ نەکـردەوە، ئـەوەش بەڵگەیە لەسـەر ڕاسـتی قسـەکە، ئەمـەش لـەو جیاوازیانەیە کە هیـچ سـوودێکی نیـە، بەزانینی ژمارەیـان هیـچ بەرژەوەندیەکـی خەڵکی بەدەسـت نایەت، نـە دینیو نـە دونیایـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞ ﴾ (واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: پەروەردگارم زاناتـرە بە ژمارەیـان کەمێ نەبێ لـە خەڵکـی ژمارەیـان نازانـی) ئەوانەش، ئەوانـەن کە بۆ چوونیـان تەواوە، وە دەشـزانن کە پێکاویانـەو ڕاسـتن ﴿ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ ﴾ واتە: مشـتومڕو دەمـە قاڵێ مەکـە (لەبارەیانەوە) ﴿ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا ﴾ واتـە: (مشـتو مڕێـک) لەسـەر بنەمـای زانسـتو دڵنیایـی بـێ، بەڵام ئـەو مشـتومڕەی لەسـەر بناغەی نەفامیو قسـە کردن بـێ لە غەیـبو نادیار بەبـێ بەڵگە، یـان ئەوانـەی هیـچ سـوودێکی تێـدا نیە -یـان ئەوەیـە بەرانبەر عینـادەو نکوولـی دەکات، یـان بابەتەکـە هیـچ گرنگیەکـی نیـە، بە زانینـی هیـچ زانیاریەکی دینـی بەدەسـت نایەت، وەکـو ژمـارەی یارانـی ئەشـکەوتو وێنـەی ئەوانـەش، بێگومـان زۆر مشـتو مڕکردنو لێکۆڵینـەوەی یـەک لـە دوای یەک دەربارەیـان تەنها کات کوشـتنە، وە ئەو مشـتو مڕانە کاریگـەری دروسـت دەکەن لەسـەر خۆشویسـتنی نێوان دڵـەکانو هیچ سوودێکیشـیان نیە ﴿ وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم ﴾ واتـە: دەربـارەی هاوەڵانـی ئەشـکەوت ﴿ مِّنۡهُمۡ ﴾ واتـە: خاوەن کتێبـە ئاسـمانیەکان ﴿ أَحَدٗا ﴾ ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە بناغـەی قسـەکانیان دەربـارەی خـاوەن یارانـی ئەشـکەوت لەسـەر نەبوونی بەڵگە سـەرچاوەی گرتـووە، وە لەسـەر گومان کـە لە ئاسـت هەقدا هیـچ سـوودێک بـە خاوەنەکـەی ناگەیەنێت، ئـەم دەقە دەبێتـە بەڵگە لـە ڕێگـری کردن لە کەسـێک شایسـتەی فتـوا نەبێ، یان بە هـۆی کەمتەرخەمـی لە کاری فتـوا بـۆ دراودا، یـان لەبـەر ئـەوەی بەخەیاڵیدا نایەت چۆن قسـە بـکاتو چـی بڵێت، هیچ وەرعو خۆپارێزیەکـی نەبێـت ڕێگـری لـێ بکات، جـا ئەگەر ڕێگـری بکرێ لـە فتوادانی ئـەم ڕەگـەزە، ئـەوە قەدەغە لە فتـوادان لە پێشـترە.

هەروەهـا ئـەم دەقـە دەبێتـە بەڵگـە، دەگونجـێ کەسـێک ڕێگـری بکـرێ لـە فتـوادان لە بوارێکـدا کـە شـارەزایی لێـی نیە، بەڵام لـە بوارێکـی دیکەدا کە شـارەزایی هەیـە ڕێگری لـێ ناکـرێ، چونکـە خـوا ﷻ بـە ڕەهـا فتوادانـی قەدەغـە نەکـردوە، بەڵکو لـە چیرۆکی یارانـی ئاشـکەوتو هاوشـێوەی ئـەو بەسـەرهاتە قەدەغـەی کردوە.

(٢٣-٢٤): ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ

إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ ﴾(واتــە: بــۆ كردنی هیچ شــتێک مەڵــێ)، ئەم قەدەغــە كردنە وەكو ئەوانــی دیكــە وایــە، ئەگــەر چــی بــۆ هۆكارێكــی تایبــەت دابەزیــوە، وە ڕووی كردوەتە پێغەمبــەر ﷺ بێگومــان دواندنەكــە گشــتیە بــۆ هەمــوو ئــەرك پێســپێردراوەكان، خوا ﷻ قەدەغــەی كــردوە دەربــارەی كاروبارەكانی داهاتوو بڵــێ: ﴿ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴾(واتە: مــن ســبەینێ ئــەو شــتە دەكــەم) بــێ ئــەوەی پەیوەســتی بكات بــە ویســتی خــوا، ئەمەش لەبــەر ئــەو وریــا كردنــەوەی كــە تیایدایە، كــە قســەكردنە دەربــارەی غەیــبو پەنهان لە داهاتــوودا كــە نازانــی ئایــا ئــەو كارە دەكات یــان نا؟ ئــەم دەقە ئــەوە ڕەتدەكاتــەوە بەندە ویســتی ســەربەخۆیی خۆی هەبــێ لە كارەكانــدا، بێگومان ئــەوە قەدەغەو ترســناكە، چونكە ویســتەكان هەموویــان بۆ خــوای بــەرزن، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾التكویــر، (واتــە: ئێوە ئــارەزووی ڕێی ڕاســت ناكەن مەگــەر كاتێک كــە پەروەردگــاری هەمــووان بیەوێــت)، بێگومان باســكردنی ویســتو مەشــیئەتی خوا لە كاروبارەكانــدا (وەک بێــژێ: إن شــاء الله) هۆكارێكــە بــۆ ئاســان كردنو ســووک كردنی كاروبارەكانو فەڕو بەرەكەتیشــی تێدەكەوێ، وە پشــت بەســتنی بەندەشــە بە پەروەردگاری.
لەبــەر ئــەوەی بەنــدە مرۆڤــە هــەر دەبــێ هەڵــە بــكات، هەنــدێ جــار لە قســەكانیدا باســی ویســتو مەشــیئەتی بیر دەچــێ، خوا ﷻ فەرمانــی پێكردوە ئەگــەر كەوتە بیری با (إن شــاء اللــە) بــكات، بــۆ ئــەوەی داواكراوەكــەی بۆ بەدەســت بێــتو ترســناکو قەدەغەكراویش لێــی بــە دوور بێ.

بــە گشــتی فەرمــوودەی خــوا ﷻ: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ فەرمــان كردن بــە زیكرو یــادی خــوای لــێ وەردەگیــرێ لــە كاتــی بیــر چوونــەوەی (إن شــاء اللــە)، چونكــە یادی خــوا خراپەكــە لادەبــات، ئەوەیشــی كــە بەنــدە بیــری چــووە دەیخاتــەوە بیری، بــە هەمان شــێوە فەرمــان كــراوە بــەوەی بیــری دەچــێ، یــان هەڵــە دەكات یادی خــوا بــكات، نەبێتە یەكێــک لەوانــەی غافــڵو بێئاگــان، لــە حەقیقەتــدا بەنــدە هــەژارەو پێویســتی بــە خوا ﷻ هەیــە بــۆ ئــەوەی ســەربخاتو بیپێــكێو تووشــی هەڵە نەبــێ، لــە گوفتــارو كردارەكانیدا، خــوا ﷻ فەرمانی پێكــردوە بڵــێ: ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴾ (واتە: بڵێ: ئومێــدەوارم پەروەردگــارم ڕێنماییــم بــكات، بــۆ ڕێگایەكــی نزیكتــر لەمە)، خــوا فەرمانی پێكــردوە لێــی بپاڕێتــەوەو ئومێدی پێــی هەبێ، وە متمانەیشــی پێی هەبــێ هیدایەتی بدات بۆ

نزیکترینـی ڕێگاکان کـە دەیگەیەنێ بە ژیـریو بەرچاوو ڕوونی، شایسـتەی خۆیەتی بەندە حاڵـی بـەم شـێوەیە بێـت، پاشـان کۆشـشو تواناکانی بەتـاڵ بکاتـەوەو بەکاریـان بێنێ بۆ گـەڕان بـە دوای هیدایـەتو ژیریدا، بۆ ئـەوەی سـەرکەوتوو بێو پشـتیوانی پەروەردگاری بـە دەسـت بێنێ، وە لـە سـەرجەم کاروبارەکانیـدا بیپێکێ.

(٢٥-٢٦): ﴿ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

﴿ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ دوای ئـەوەی خـوا ﷻ قەدەغـەی فتـوا وەرگرتنـی خـاوەن کتێبەکانـی کـرد دەربارەی یارانی ئەشـکەوت، بە هـۆی نەبوونی زانیاریـان دەربارەی ئەوان، بێگومـان خـوا زانـای پەنهـانو ئاشـکرایە، زانایە بـە هەموو شـتێ، هەواڵـی پێدا بـە ماوەی مانەوەیـان، وە زانیاریـی مـاوەی مانەوەیان تەنها لـە لای خوای تاکو تەنهایـە، بە حەقیقەت ئـەوە لـە پەنهانەکانـی ئاسـمانەکانو زەویـە، پەنهانی ئـەوەش تایبەتـە بە خواوە، هەر شـتێ هەواڵـی پێدابـێ لەسـەر زاری پێغەمبەرەکانی ئـەوە هەقو ڕاسـتەو هیچ گومانێکـی تێدا نیە، ئەوەیشـی پێغەمبەرانـی پەی پێنابـەن، بێگومـان هیچ یەکێک لـە دروسـتکراوەکان نایزانێ.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ ﴾ (واتـە: ئـای خوا چ بینای بیسـەرە!) سـەرت سـوورمێنێ لـە تەواویی بیسـتنو بینینـیو دەورەدانـی هەموو بیسـتراوو بینـراوەکان، دوای ئـەوەی هەواڵیشـی پێدایـن کە بـە زانسـتەکەی دەوری هەموو زانراوەکانیشـی داوە، پاشـان هەواڵـی داوە بـەوەی تـاکو تەنهایـە لـە سەرپەرشـتی کردنـی گشـتیو تایبەتـی، هـەر خـۆی سەرپەرشـتیارە کـە سەرپەرشـتی هەمـوو گـەردوون دەکات، وە پشـتیوانی بەنـدە برواداره‌کانێتـی، لـە تاریکـی دەریـان دێنێ بۆ ڕۆشـنایی، یارمەتیـان دەدات بۆ ڕێی ئاسـان، وە دوریـان دەخاتـەوە لـە ڕێگـای سـەخت، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ مَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ ﴾ واتـە: هـەر خوا خـۆی پشـتیوانی یارانی ئەشـکەوتی کـرد، بە نـەرمو نیانیو بەخشـندەیی، نەیدانە دەسـتی دروسـتکراوەکان.

﴿ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا ﴾ (واتـە: کەسـیش ناکات بە هاوبەشـی خۆی لـە فەرمانیدا) ئەمـەش حوکمـی گەردوونـی قـەدەریو حوکمـی شـەرعی دینـی دەگرێتـەوە، بە ڕاسـتی خـوا دادوەرە لـە نێـو دروسـتکراوەکانیدا بە قەزاو قەدەریـش، لەوەی کە دروسـتی دەکاتو

بەڕێـوەی دەبـات، دادوەرە لـە نێویـان بـە هۆی فەرمـانو قەدەغـە كراوەكانـی، وە بە هۆی پاداشـتو سزاكانی.
وە كاتـێ هەواڵـی دا كـە پەنهانەكانـی ئاسـمانەكانو زەوی هـەر لای ئـەوە، بـۆ هیـچ بەدیهێنراوێـك نیـە بیانزانێـت، تەنهـا لـەو ڕێگـە نەبـێ كە خـۆی هەواڵیـان پێـدەدا -ئەم قورئانـە پەنهانـی زۆری تێدایـە- خـوا فەرمانی كـردوە بـە بەنـدەكان ڕووی تێبكەن، وەك فەرموویەتـی:
(٢٧): ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ٢٧ ﴾:
خوێندنـەوە: بریتیـە لـە شـوێنكەوتن، واتە: شـوێن ئـەو وەحـیو نیگایەی خـوا ﷻ بكەوە كـە خـوا بۆی نـاردووی، بـە فێربـوونو زانینـی ماناكانـیو تێگەیشـتن لێیان، وە بەڕاسـت دانانـی هەواڵەكانـیو جێبەجـێ كردنـی فەرمانـەكانو قەدەغـە كراوەكانی، بێگومـان ئەوە كتێبێكـی گەورەیـە، كـە گـۆڕان بەسـەر وشـەكانیدا نایـەت، چونكـە پـڕە لـە ڕاسـتیو دادپـەروەری، وە لەجوانـیو ڕێكو پێكیدا گەیشـتۆتە ئەوپەڕی، ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ١١٥ ﴾الأنعام، (واتـە: وە فەرمـانو وتـەی پەروەردگـارت تـەواو بووەو بـە ئەنجام گەیشـت بە ڕاسـتیو دروسـتی) بە هۆی تەواویـەوە گۆڕانو شـوێن گرەوەی ئەسـتەمە، جا ئەگـەر ناتـەواو بووایـە ئەوە شـتێكی لەو جۆرە دەخسـتەڕوو، لـەم دەقەدا گەورەیـی قورئان دەردەكـەوێ، وە لە نێویشـیدا هانـدان بـۆ ڕووتێكردنی.
﴿ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴾ واتـە: هەرگیـز پەنایەكت دەسـت ناكـەوێ بێجگە لە پەنای پەروەردگـارت كـە پەنـای بـۆ ببـەی، جـا ئەگـەر زانـرا خـوا تـاكو تەنهایـە لـە پەنا بۆ بردنـدا لـە هەمـوو كاروبـارەكان، پێویسـت دەكـرێ تەنهـا ئـەو بپەرسـترێ، لە خۆشـیو ناخۆشـیەكاندا، لـە هەمـوو بارودۆخێكـدا بەنـدەكان پێویسـتییان پێیەتی، وە خـوا هەر خۆی بەرپرسـیارە لـە هەمـوو داواكاریەكان.

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ
يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ
أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن
شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ
وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ
ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ
لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ
مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ
فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ۞ وَٱضۡرِبۡ
لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا
بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ
تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ
لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾

(٢٨): ﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ ﴾.

﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ﴾ خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺو ئەوانەش دەکات کە پێغەمبەریان ﷺ کردۆتە پێشەنگی خۆیان لە فەرمانو قەدەغە کراوەکاندا، کە خۆی رابگرێ لەگەڵ ئیمانداراندا ئەوانەی خواناسن، ﴿ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ ﴾ واتە: (ئەوانەی لە خوا دەپاڕێنەوە) لە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژ، مەبەستیان تەنها ڕەزامەندی خوایە، وەسفی کردوون بە بەندایەتیو دڵسۆزی تیایدا، ئەمە فەرمان کردنی تێدایە بە هاوڕێیەتی پیاوچاکان، وە جیهاد کردن لەگەڵ نەفسو دەروونندا بۆ هاوڕێیەتیو تێکەڵاو بوونیان، ئەگەرچی هەژاریش بن، چونکە لە هاوڕێیەتی کردنیاندا سوودێکی ئەوەندە زۆر هەیە لە ژماردن نایەت.

﴿ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ ﴾ واتە: چاوەکانت لەوان لامەدەو وەرمەگێڕە (بۆ کەسانی بێبڕوای دەوڵەمەند) وە بەرزیش مەڕوانە. ﴿ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ (واتە: جوانیو ڕازاوەییو ژیانی ئەم دونیایەت دەوێ) بە ڕاستی ئەمە زیانی هەیەو سوودی نیە، بەرژەوەندیەکانی دونیا دەبڕێتەوە، وە دەبێتە مایەی ئەوەی دڵ پەیوەست بکات بە دونیاوە، تا فکرو هەستو بیرو هۆشەکان وایان لێدێ هەر لە خەمی دونیادا بن، دڵیش حەزی لە دوارۆژ نامێنێ، چونکە جوانیەکانی دونیا بۆ تەماشاکەر ڕازاوەتەوەو جادوو لە عەقڵی دەکات، بۆیە دڵیش لە یادی خوا ﷻ بێئاگا دەبێو ڕوودەکاتە حەزوو ئارەزوو خۆشیەکان، بۆیە هەموو کاتی بە فیڕۆ دەڕواو زێدەڕۆیی لە کارەکانی دەکات، تووشی خەسارەت مەندییو پەشیمانی هەمیشەیی دەبێ، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ ﴾ (واتە: بە گوێی کەسێک مەکە کە دڵیمان لە یادی خوا) بێئاگا کردوە، (خوا) سزای داوە بەوەی بێئاگای کردوە لە یادی خۆی.

﴿ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾ واتە: شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە، هەرچی نەفسیو دەروونی حەزی پێبکا دەیکا، وە هەوڵیش دەدا بۆ بەدەستهێنانی، ئەگەر چی زەرەرو زیانیشی هەبێ بۆی، ئا ئەو کەسە نەفسو دەروونی خۆی کردوە بە پەرستراو، هەروەکو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴿٢٣﴾ ﴾الجاثية، (واتە: ئایا ئەو کەسەت نەبینیوە ئارەزووی خۆی کردوەتە پەرستراو)، ﴿ وَكَانَ أَمْرُهُۥ ﴾ واتە: بەرژەوەندییە دینیو دونیایی ﴿ فُرُطًا ﴾ واتە: (لە دەست چووە) ئەمە خوا ﷻ قەدەغەی گوێڕایەڵی کردنی کردوە، چونکە گوێڕایەڵی کردنی دەبێتە مایەی پەیڕەوی کردنی، وە لەبەر ئەوەی بانگی کەس ناکات تەنها بەو شتانە نەبێ کە پێی وەسف کرا.

ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە کە ئەو کەسەی پێویستە گوێڕایەڵی بکرێو ببێتە پێشەوای خەڵکی ئەوەیە دڵی پڕ بێ لە خۆشەویستی خوا ﷻ، ئەمەش بگوازرێتەوە بۆ سەر زمانیو یادی خوای پێبکا، شوێنی ئەو شتانە بکەوێ کە خوا ﷻ پێ ڕازیە، پێشیان بخات بەسەر هەواو ئارەزوویدا، بۆ پاراستنی ئەو خۆشەویستیە کە بۆ خوا هەیەتی سوود لە کاتەکانی وەردەگرێو باروودۆخی چاک دەکاو بەردەوام دەبێ لەسەر کردەوە چاکەکانی، وە خەڵکی بانگ دەکات بۆ ئەو فەزڵو منەتەی خوا ﷻ کردوویەتی بەسەریدا، بە ڕاستی هەقی خۆیەتی بکرێ بە پێشەواو سەرمەشق.

ئەو ئارامیەش کە لە ئایەتەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە بریتیە لە ئارام گرتن لەسەر گوێڕایەڵی خوا، ئەم جۆرە ئارام گرتنەش بەرزترین جۆرەکانی ئارامگرتنە، بە لە خۆدا بەرجەستە کردنی ئەو جۆرە ئارام گرتنە لە خۆدا بەرجەستە کردنی جۆرەکانی دیکەی ئارامگرتن دێتە دی.

وە ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە کە زیکرو یادی خواو لە بەیانیانو ئێواراندا کارێکی پەسندو باشە، چونکە خوا ﷻ وەسفی کردوون بەو کارە، هەموو کارێ خوا ﷻ ستایشی ئەنجامدەرەکەی بکات، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا خۆشیدەوێ، وە ئەگەر خۆشیشی بوێ ئەوە فەرمانی پێدەکاو هانی بۆ دەدا.

(٢٩-٣١): ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ﴾:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾ واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بە خەڵکی بڵێ: ئەم قورئانە هەقە لە لایەن پەروەردگارتەوە، واتە: بە ڕاستی هیدایەتی لە گومڕایی جیاکردۆتەوە، وە بەرچاوڕوونی لە لێڵیو سەرلێشێواوی جیا کراوەتەوەو ڕوون بۆتەوە، وە سیفاتی ئەوانەی بەختەوەرو ئەوانەی بەدبەختن، هەروەکو چۆن ڕوونی کردۆتەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی، جا ئەگەر ڕوون بوویەوەو ئاشکرا بوو وە هیچ گومانێکی تێدا نەما: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ (واتە: هەر کەسێک دەیەوێ با بڕوابێنێ وە هەر کەسیش دەیەوێ با کافر بێت)، هیچ نەماوەتەوە تەنها گرتنەبەری یەکێک لەم دوو ڕێگایە نەبێ ئەویش بەپێی یارمەتیو سەرکەوتنی بەندەو سەرنەکەوتنی، خوا ﷻ ویستو ئارەزووی داوە بە بەندەکان بەو ویستو ئارەزووە دەتوانن کوفروو ئیمانو خێرو شەڕ لە یەکتر جیابکەنەوە.

جا هەر کەسێک بڕوابێنێ ئەوە یارمەتی دراوە بۆ هەقو ڕاستی، وە هەر کەس بێبڕوایی هەڵبژێرێ ئەوە بەڵگەو حوججەی لەسەر پێویست بووەو بیانوویشی نەماوە، هیچ کەس زۆری لێناکرێ لە بڕواهێناندا، هەروەکو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾البقرة، (تۆبزی کردن لە ئاییندا نیە، سەر ڕاستیو گومڕایی لە یەکدی جیابوونەتەوە).

کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ مۆڵەتدانو سەرپشک کردن نیە لە یەکێک لەو دوو کارە، بەڵکو ئەمە هەڕەشەو ترساندنە بۆ ئەو کەسانەی کوفر هەڵدەبژێرن، پاش ئەوەی کە بە تەواوەتی بۆی ڕوون دەبێتەوە، هەروەکو چۆن وازهێنان لە کوشتاری بێبڕوایانی تێدانیە.

پاشان خوا ﷻ چارەنووسی ئەو دوو دەستەیەی باسکردوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ ﴾ (بە ڕاستی ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ ستەمکاران) بە هۆی کوفرو لەڕێ لادانو سەرپێچی کردنیان، ﴿ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَا ﴾ واتە: (ئاگرێک وەکو بلێسەی) ڕەشماڵ دەوریان دەدا، هیچ دەرچەو ڕێگاو دەرباز بوونێکیان بۆ نیە، دەچنە نێو ئاگری زۆر گەرمەوە.

﴿ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ ﴾ واتە: ئەگەر لە تینوان داوای ئاو بکەن، بۆ ئەوەی ئەو تینوێتییە زۆرەیان دابمکرێتەوە، ﴿ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلۡمُهۡلِ ﴾ واتە: (ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ) وەک مسی تواوە وایە، یان وەک چڵکو چەپەڵی ڕۆنی زەیت وایە لە تووندی گەرمییدا، ﴿ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَ ﴾ واتە: (دەمو چاوەکان دەبرژێنێ)، چ جای هەناوو ناوسک! وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يُصۡهَرُ بِهِۦ مَا فِي بُطُونِهِمۡ وَٱلۡجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴿٢١﴾ ﴾الحج، (واتە: دەتوێنرێتەوە بەو

ئاوە گەرمە ئەوەی لە ناو سكیاندایەو پێستەكانیشیان * وە بۆیان ئامادەیە گورزی ئاسنی).
﴿ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ ﴾ (ئای چ خواردنەوەیەكی پیسو خراپە) كە دەیانەوێ تینوێتیی بشكێنن، هەندێ لەو سزایە لاببات، بەڵام ئەوە دەبێتە سزایەكی زیاتر بۆیان وە ئەشكەنجەیەكی توندتر ﴿ وَسَآءَتْ ﴾ ئاگر ﴿ مُرْتَفَقًا ﴾ جێگایەكی خراپ، ئەمە زەمكردنی حاڵی ئاگرە، كە ئەو شوێنە خراپترین جێگایە دەبێتە هاودەمی، چونكە بێگومان هیچ هاودەمیەک لەوەدا نیە، بەڵكو سزایەكی بە ئێشی ئازاربەخشی تێدایە كە تەنها بۆ ساتێكیش لەسەریان لانابرێت، ئەوان تیاید بێ ئومێد بوون لە هەموو خێرێ، خوای بە بەزەیی ئەوانی لە بیر كردوە، هەروەكو چۆن ئەوان لە دونیادا خوایان لە بیر كردبوو.
پاشان باسی دەستەی دووەم دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: كۆیان كردۆتەوە لە نێوان بڕواهێنان بە خواو فریشتەكانو كتێبە پیرۆزەكانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر بە خێرو شەڕیەوە، لەگەڵ كردەوە چاكەكان لە فەرزو سوننەتەكان، ﴿ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴾ (واتە: بێگومان ئێمە پاداشتی ئەوانە ون ناكەین كە كردەوەی چاكیان كردوە)، كردەوەی چاكە (أحسان العمل): ئەو كردەوەیە بەندە لە ئەنجامدانیدا تەنها مەبەستی خوا بێ.
لەوەدا شوێنی شەریعەتی خوا ﷻ كەوتبێ، جا ئەم كردەوەیە خوا ونی ناكات، بەڵكو دەیپارێزێ بۆ خاوەنەكانیان، وە پاداشتیان دەداتەوە بە پێی كردەوەكانیان وە بە فەزڵو چاكەی خۆی، پاشان باسی پاداشتیانی كردوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ﴾ واتە: ئەوانەی وەسف كراون بە ئیمانو كردەوەی چاک، ئەوانە بەهەشتانێكی بەرزی هەمیشەییان بۆ هەیە، كە دارو درەختەكانی زۆر چڕوپڕن، وە ڕووبارەكان بە ژێریاندا دێنو دەڕۆن، وە كۆشکو تەلارەكانیان بەرزو بڵندە، وە دەڕازێنرێنەوە بە بازنی زۆری زێڕ، پۆشەكەكانیان قوماشی حەریری ڕەنگ سەوزە، كە پێكهاتووە لە ئاوریشمی تەنکو ئەستوور، پاڵدەدەنەوە لەو بەهەشتەدا بەسەر سیسەمی خۆشەوە ئەویش سیسەمی جوانو ڕازاوەیەو زۆر نایابە، چونكە پێی ناوترێ: (أریكە) هەتا بەو شێوەیە نەبێ لە جوانیدا، وە پاڵدانەوەیان بەسەر سیسەمەكانەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی پشوودانو نەمانی ناخۆشیو تەنگەبەری، وە خزمەتكارەكان بە دەوریاندا دێنو دەڕۆن ئارەزووی هەرچی بكەن بۆیان دێنن، لە هەموو ئەوانەش باشترو تەواوتر مانەوەی هەمیشەییە لەم بەهەشتەو نیشتەجێ بوونی تاهەتاییە تێیدا.

ئەوە بە ڕاستی ماڵێکی بەرزو بە نرخەو ﴿ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ ﴾ (باشترین پاداشتە) بۆ ئەوانەی کردەوەی چاک دەکەن، ﴿ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴾ (جێگایەکی خۆشە) بە خۆشی تێیدا دەمێننەوە، تامو لەززەت وەردەگرن لە هەموو ئەو شتانەی لە ناویدایە، لە هەموو ئەوانەش نەفسیان حەزی پێدەکاتو چاویان چێژی لـێ وەردەگری، لە خۆشی دڵخۆشیو ئاسوودەیی بەردەوامو چێژو لەززەتی یەک لە دوای یەک دان، چ ماڵێک چاکترە لەو ماڵە، نزمترین پلەو پایەی خەڵکەکەی ڕووبەری مولکەکەیو خۆشی کۆشکو تەلارو باخو باخاتەکەی (٢٠٠٠) ساڵ پێدا بڕوا تەواو نابێ، کەس نابینێ لە سەرووی خۆیەوە ئەوەندەی ئەو نازو نیعمەتی پێدرا بێ، بێگومان هەموو ئاواتو داواکاریەکانی بۆ دەستبەر بووە، لەگەڵ ئەمەدا نازو نیعمەتەکانیان بەردەوام لە زیاد بووندایە لە وەسفو تامو چێژە جۆراو جۆرەکانی.

داوا دەکەین لە خوای بەخشندە بێبەشمان نەکات لە پاداشتو چاکەی خۆی، بە هۆی ئەو شەڕو خراپەی ئێمە دەیکەین لە کەمتەرخەمیو سەرپێچی کردندا.

ئەم دەقە پیرۆزەو وێنەی ئەمەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی، ڕازاندنەوە گشتگیرە بۆ نێرو بۆ مێ، هەروەکو چۆن فەرموودە ڕاستەکان لەو بارەوە هاتوون، چونکە خوا بە ڕەهایی هێناویەتی لە وتەکەیدا: ﴿ يُحَلَّوۡنَ ﴾ بە هەمان شێوە حەریرو هاوشێوەکانی دەگرێتەوە (بۆ هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ).

(٣٢-٣٤): ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ ﴾:

﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ ﴾ خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: نموونەی ئەم دوو پیاوە بۆ خەڵکی بهێنەوە، یەکێکیان سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خوا بوو، ئەوی تریان بێبڕوا بوو پێی، وە ئەوەشیان بۆ باس بکە سەرەنجامی ئەو قسەو کردەوانەی هەریەکەیان کە خوا بۆی پێشیهێنان لە سزاو پاداشتی پێشوەخت، بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری وەر بگرن لەوەی بەسەریاندا هات، ناسینی ئەو دوو کەسە لە چ سەردەمێکو چ شوێنێکدا بوون هیچ سوودو دەرنجامێکی نیە، دەرەنجامو پەند لە چیرۆکو بەسەرهاتەکەیاندا وەردەگیرێ، ڕۆچوون لە غەیری ئەوەی باسکراوە ئەرکێکی زیادەیە.

یەکێک لەم دوو پیاوە بە نیعمەتەکانی خوا کافر بوو، خوا دوو باخو بیستانی پێدا لە ترێ ﴿ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ ﴾ واتە: (دەورماندا بوو بە دارخورما) لە ناو ئەو دوو باخەدا هەموو

بەروبوومێكی تێدا بوو، بە تایبەت بەڕێزترینی دارەكان: ترێو دارخورما.
جا ترێكان لە نێویاندا بوون، دارخورماكانیش بە دەوریان دابوو، دیارە ئەوە دیمەنێكی سەرنجڕاكێش‌و دڵڕفێنە، وە دارەكانو خورماكان بە شێوەیەک بوون بە بەر تیشكی ڕۆژو (با)وە بوون، ئەوە وای لێكردبوون بەروبوومیان كامل بێ، بەروبوومەكەی پێ ڕابگاو بگەیە، لەگەڵ ئەوەشدا، لە نێوانی ئەو دوو باخەدا كشتوكاڵی بۆی فەراهەم هێنابوو، هیچ نەمابوو بوترێ تەنها ئەوە نەبێ: ئاخۆ بەروبوومی ئەم دوو باخە چۆن بێ؟ ئایا ئەوەندە ئاویان هەیە بەشیان بكات؟ خوا ﷻ هەواڵ دەدا كە هەردوو باخەكە ﴿ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا ﴾(بەری چاكیان گرتبوو)، واتە: بەرووبوومو كشتوكاڵەكەیان دوو هێندە بوو، ﴿ وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ ﴾ واتە: (ئەم دوو باخە) هیچیان لێ خەسار نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا كانیاوی زۆر هەڵقوڵا بوون لە دەورو بەریاندا.
﴿ وَكَانَ لَهُۥ ﴾ واتە: بۆ ئەو پیاوە (خاوەنی ئەو دوو باخە) ﴿ ثَمَرٞ ﴾ واتە: (بەروبوومێكی) مەزنی هەبوو، بە نە ناسراوی (التنكير) هێناویەتی، واتە: باخەكەی بەرووبوومێكی ئێجگار زۆری هەبوو، تووشی هیچ ئافاتو نەخۆشیو كەمكردنەوەیەک نەبوو، ئەمەش ئەو پەڕی جوانیەكانی دونیایە لە كێڵگەو كشت‌و كاڵ كردندا، بۆیە ئەم پیاوە لە خۆی بایی بوو، شانازی دەكردو دوارۆژی بیر چووبوویەوە.
(٣٤-٣٦): ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ٣٤ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ٣٥ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ٣٦ ﴾:
﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ ﴾ واتە: خاوەنی ئەو دوو باخەكە بە هاوەڵە بڕوادارەكەی وت: لەو كاتەی كە بەیەكەوە گفتوگۆیان دەكرد، واتە: دەربارەی ئەو شتانەی نەریت‌و باوە لە باسكردندا، فەخرو شانازی بەسەریەوە كردوو، وتی: ﴿ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴾ شانازی كرد بە زۆری ماڵو سامانەكەیو دەست‌و پێوەندەكانی لە كۆیلەو خزمەتكارو خزم‌و كەسەكان، ئەمەش نەفامیەک بوو لە لایەن ئەوەوە، ئەگەرنا چۆن دەبێ شانازی بە شتێكەوە بكا كە هی ئەو نیە، بە هەمان شێوە سیفەتێكی مەعنەویشی تێدانیە شانازی پێوە بكات، بەڵكو وەک منداڵێک وایە شانازی بەو ئاواتانەوە بكا كە هیچ حەقیقەتێكیان نیە.


وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ
أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ
خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ
بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾
لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ
جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ
مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ
عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ
مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ
فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ
عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ
فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ
لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ
فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾

پاشان بەم شانازی بەخۆكردنەی نەوەستا بەسەر هاوەڵەكەیەوە، هەتا بە نەفامیو ستەمكردنی خۆیەوە بڕیاریدا، وە كاتێ چووە نێو باخەكەی وای گومان برد: ﴿قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ﴾ واتە: (گوتی: هەرگیز باوەڕ ناكەم) ئەم باخو باخاتە تیابچێ ﴿هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾ (بۆ هەتا هەتایی) پاڵی دایە ئەم دونیایەو پێی ڕازی بوو، وە نكوولّی زیندوو بوونەوەی كردو وتی: ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى﴾ (واتە: باوەڕناكەم قیامەتیش هەرگیز بەرپابێت) وەكو نموونە هێنانەوەیەك ﴿لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾ واتە: لەو دوو باخەی خۆم باشترم پێ دەدرێ، ئەمە تێناپەڕێ لە دوو شت:

یەكەم: یان ئەوەیە بە حەقیقەتی دواڕۆژی زانیوە، ئەوكات وەكو گاڵتەجاڕیو قەشمەری كردن ئەو قسەی كردوە، ئەویش دەبێتە مایەی كوفرێكی زیاتر بەسەر كوفرەكەیەوە.

دووەم: یان گومانی وابووە لە حەقیقەتدا بەو شێوەیەیە، ئەو كات بە نەفامترینو كەم عەقڵترین كەس دادەنرێ، چ پەیوەندییەك هەیە لە نێوان بەخشینی دونیاو بەخشینی دواڕۆژ؟ هەتا بە نەفامی خۆی وا گومان ببات مادام خوا ﷻ لە دونیا پێیدا لە دواڕۆژیشدا پێی دەدا.

بەڵكو خوا ﷻ زۆر جار خۆشیەكانی دونیا لە دۆستو خۆشەویستانی دەگرێتەوەو دەیبەخشێتە دوژمنەكانی، ئەوانەی لە دواڕۆژدا هیچ بەشێكیان نیە.

ئەوەی ڕوونو ئاشكرایە ئەو حەقیقەتی ڕۆژی دوایی زانیوە، بەڵام ئەو قسەی تەنها بۆ گاڵتەجاڕیو قەشمەری كردوە، بە بەڵگەی فەرموودەی خوا: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ جێگیر بووە ئەو كەسەی لەوكاتەی ڕۆشتۆتە ناو باخەكەی ستەمی كردوە لەو قسەی كە كردوویەتی، كە بەڵگەیە لەسەر هەڵگەڕانەوەو نكوڵیكردن بەرانبەر زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی.

(٣٧-٣٨): ﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ... ﴾:

﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ ﴾ واتە: هاوەڵە ئیماندارەكەی پێی وت وەك ئامۆژگاری كردنێك بۆیو یادخستنەوەی سەرەتای بەدیهێنانی، كە خوا ﷻ لەم دونیایەدا هێنایەتیە بوون: ﴿ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴾ (واتە: دروستی كردووی لە خۆڵ پاشان لە تنۆكێ ئاو ئەوجا قۆناغ بە قۆناغ كردیتی بە پیاوێكی تەواو) خوا ئەو زاتەیە كە نیعمەتی بوونو بەهاناوە هاتنی پێبەخشیوی، وە بەردەوامی كردوە بۆت، وە تۆی گواستۆتەوە لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكی دیكە هەتا بووی بە پیاوێكی تەواو، لە ڕووی جەستەو عەقڵەوە، ئا بەو شێوە هۆكارەكانیشی بۆ ئاسان كردووی، وە نازونیعمەتی دونیای بۆ فەراهەم هێناوی، هەرگیز دونیات بۆ دەستەبەر نەبووە بە هێزو توانای خۆت، بەڵكو بە فەزڵو چاكەی خوا، چۆن لێت دەوەشێتەوە كوفر بەو خوایە بكەی كە لە خۆڵ دروستی كردووی، پاشان لە تنۆكێ ئاو، پاشان تۆی كردۆتە پیاوێكی تەواو لە بەرانبەر ئەو هەموو نازونیعمەتەدا ئینكاریو كەللەڕەقی دەكەی، وە پێت وایە ئەو زیندووت ناكاتەوە، ئەگەر زیندوویشت بكاتەوە لە باخو بەهەشتەكەی خۆت زیاترت پێدەدا؟! بە ڕاستی ئا ئەمە نەدەبێو نە دەگونجێ.

بۆیە كاتێ هاوەڵە بڕوادارەكەی بینی كە ئەو پیاوە خاوەن دوو باخە هەر بەردەوامە لە كوفرو زێدەڕۆیی كردنی، لە سۆنگەی شوكرانە بژێری پەروەردگارو گەیاندنی دین، هەواڵی دەربارەی خۆی پێدا لە كاتی هاتنی گفتوو گۆو گوماندا، وتی: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴾ (واتە: بەڵام من هەر ئەو خوایە پەروەردگارمە هیچ كەسیش ناكەم بە هاوبەشی) دانی نا بە پەروەردگاریێتی پەروەردگاریو بە تاكو تەنها گرتنی لە پەرەووەردگارێتیدا، وە پابەند بوو بە گوێڕایەڵیو پەرستنی خوا ﷻ، وە ئەو هەرگیز كەسێك لە بەدیهێنراوەكان ناكات بە هاوەڵو هاوبەشی.

پاشان هەواڵی بە هاوەڵەكەی دا كە ئەو نازونیعمەتەی خوا پێی بەخشیوە ئەگەرچیماڵو سامانو منداڵیشی كەمە بەڵام ئەوە نیعمەتێكی ڕاستەقینەیە، وە جگە لە نازونیعمەتی ئیمان هەموو نازونیعمەتەكانی دیكە مەترسی لە ناوچوونیان لێدەكرێو لە داهاتوویشدا خاوەنەكەی لەسەری سزا دەدرێ.

(٣٩-٤٤): ﴿إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾﴾

﴿إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا﴾ واتە: پیاوە ئیماندارەکە بە هاوەڵە بێبڕوایەکەی وت: تۆ ئەگەرچی فەخرو شانازییم بەسەرەوە دەکەی بە زۆریی ماڵو موڵکو منداڵت، وە من وادەبینی کە ماڵو دارایی‌و منداڵم لە تۆ کەمترە، بێگومان بە ئەوەی لە لایەن خواوە دێ باشترەو دەمێنێ، وە داواکردنی خێروو چاکە لە خوا ﷻ باشترە لە هەموو دونیا، کە کێبرکێ کاران کێبرکێی لەسەر دەکەن. ﴿فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا﴾ واتە: (ئومێد وایە لە پەروەردگارم چاکتر لە باخەکەی تۆم پێ بدا وە بەڵاو برووسکەیەکیش لە ئاسمانەوە بنێرێ بۆ باخەکەی تۆ) لەسەر ئەو باخەی کە تۆ شانازی پێوەدەکەیت‌و یاخی بووی ﴿حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: سزایەک، بە بارانێکی گەورە یان غەیری ئەوە (بنێرێت بۆ باخەکەی تۆ) ﴿فَتُصۡبِحَ﴾ بە هۆی ئەوەوە ﴿صَعِيدٗا زَلَقًا﴾ واتە: دارەکانی لە ڕەگ هەڵکەنرێ‌و بەرووبوومەکانی لە ناو بچێت، کشت‌و کاڵەکەشی پێ نغرۆ بکات، وە هیچ سوودێکی نەهێڵێ.

﴿أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا﴾ کە هەموو بەرهەمەکان لەو ئاوەن ﴿غَوۡرٗا﴾ ئەو ئاوە بە ناخی زەویدا ڕۆبچێ، ﴿فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا﴾ واتە: نەتوانرێ دەربهێنرێ نە بە هاوکاری‌و نە بە ئامێرو جگە لەوانیش.

بروادارەکە لەبەر ئەوە دوعای تیاچوونی باخەکەی ئەو هاوەڵەی کرد، بە هۆی تووڕە بوونی لە پێناو خوادا، وە لەبەر ئەوەی ئەو ماڵو سامانە یاخی‌و گومڕای کردبوو، وە وایدەزانی نابڕێتەوە، بەڵکو ئەوە ببێتە مایەی بیرکردنەوەو گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگاری‌و تەماشای کاروبارەکانی بکات.

خوا ﷻ نزاکەی گیرا کرد ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾ واتە: تووشی سزا بوو، ئەو سزایە لە هەموو لایەکەوە دەوری داو لە ناوی برد، هیچی بۆ نەمایەوە، (الإحاطة بالثمر) بریتیە لە فەوتانی هەموو دارو درەخت‌و بەربووم‌و کشتوکاڵەکەی، پەشیمان بوویەوە بەوپەڕی پەشیمان بوونەوە، پەشیمان بوونەوەکەی زۆری بۆ هێنا ﴿فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ

﴿فِيهَا﴾ (واتە: ئنجا كابراش لە داخا دەستەكانی دەپرواندو ئەم دیو ئەو دیوی پێ ئەكردن) لە داخی ئەو هەموو سامانەی تێدا بەخت كردبوو بۆ ئاوەدان كردنەوەی، كاتێ كە پەرش‌و بڵاو بوویەوەو لەناوچوو، هیچ دەستمایەیەكیشی بۆ نەمایەوە، وە هەروەها پەشیمان بوویەوە لە هاوەڵدانانی، بۆیە دەڵا: ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾ (واتە: خۆزگە هیچ كەسێكم نەكردایەتە هاوبەش بۆ پەروەردگارم).

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا﴾ واتە: كاتێ خوا ﷻ سزای دابەزاند بۆ باخەكەی، هەموو ئەوانەی لە دەست چوو كە شانازی پێوە دەكردن، لە قسەكردنی لەگەڵ هاوەڵەكەیدا: ﴿أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا﴾ نەیانتوانی هیچ سزایەكی لەسەر لابەن، تەنانەت بە قەد ئەوەی خۆیان پێویستیان پێیەتی، وە خۆیشی نەیتوانی نەفسی خۆی سەربخات، چۆن دەتوانی سەربكەوێ بەسەر قەزاو قەدەری خوادا ئەگەر ویستی‌و بڕیاری لە سەریدا: ئەگەر هەموو ئاسمانەكان زەوی كۆ ببنەوە لەسەر لابردنی شتێكی كەم لە قەزاو قەدەری ناتوانن؟!!

دوور نیە لە بەزەیی‌و ڕەحمەتی خوا ﷻ، خاوەنی ئەو باخەی كە باخەكەی تیاچوو، تەوبەی كردبێ‌و حاڵی باش بووبێ‌و گەڕابێتەوە بۆ لای خوا، وە وازی لە سەركێشی‌و كەللەڕەقی هێنابێ‌و گەڕابوبێتەوە بۆ سەر ژیری‌و عەقڵی خۆی، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو پەشیمان بوویەوە لەسەر ئەوەی هاوەڵی بۆ پەروەردگاری دانابوو، خواش ئەوماڵەی لێوەرگرتەوە كە دەبووە مایەی گومڕا بوونی، وە لە دونیادا تۆڵەی لێ سەندەوە، جا ئەگەر خێرو چاكەی كەسێكی بوێ سزای بۆ پێش دەخات لە دونیادا، وە فەزڵ‌و چاكەی خوا خەیاڵ‌و عەقڵەكان ناتوانن پەی پێ ببن، كەسیش نكوولی لێ ناكات مەگەر زاڵمی ستەمكار نەبێ.

﴿هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا﴾ واتە: (ئا لەوكاتەدا یارمەتی‌و كۆمەك هەر بۆ خوای هەقە بە تەنها، وە ئەو خۆی بۆ بەندەی ئیماندار باشترین كەسێكە پاداشتی بداتەوە، وە باشترین كەسێكە پاشە ڕۆژی بۆ چاك بكات)، لەو حاڵەتەدا -كە خوا ﷻ سزای داناوە بۆ ئەو كەسەی زێدەڕۆیی دەكاو شوێنی دونیا دەكەوێ، ڕێزو كەرامەتی خۆی دەبەخشێ بەو كەسەی بڕوادەهێنێ‌و كردەوەی چاك دەكاو سوپاسگوزاری خوا ﷻ دەكات، وە خەڵكیش بانگ دەكات بۆ ئەو ڕێگایە- ڕوون بوویەوەو ئاشكرابوو كە پشتیوانی ڕاستەقینە تەنها لەلای خوایە، جا هەر كەسێك بڕوابهێنێ‌و لێی بترسێ ئەوە وەلی‌و دۆستی ئەوە، ڕێزی لێدەگرێ بە جۆرەها ڕێزگرتن وە شەڕو خراپەیشی لەسەر لادەبات،

هەر کەسێک بڕوا بە پەروەردگاری نەهێنێ‌و پشتی تێبکات زەرەرمەندی دونیاو دوارۆژە، جا پاداشتی دونیاو دوارۆژی خوا ﷻ باشترین پاداشتە مرۆڤ ئومێدی بۆ هەڵچنێ.

لەم چیرۆکە مەزنەدا حاڵی ئەو کەسەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خوا نازونیعمەتی دونیایی پێبەخشیوە، ئەو نازونیعمەتە دەبێتە مایەی دوورکەوتنەوەو گومرابوون‌و سەرپێچی کردنی خوا ﷻ، بێگومان چارەنووسی ئەو ماڵە نەمان‌و لە ناوچوونە، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کەمیش لەزەت‌و خۆشی لێ ببینێ، ئەوە لە داهاتوودا بۆ ماوەیەکی زۆر لێی قەدەغە دەکرێ.

پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کاتێ کە سەرسام دەبێ بە ماڵ‌و سامانەکەی یان منداڵەکەی بڵێ: «ما شاء الله، لا قوة إلا بالله» بۆ ئەوەی شوکرانە بژێری خوابێ، ببێتە هۆکارێک بۆ مانەوەی ئەو نازونیعمەتە لەسەری، لەبەر فەرموودەی خوا: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾.

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە ڕێنیشاندان بۆ دڵدانەوەی لەزەت‌و خۆشیەکانی دونیا چەندە کەم بێ، یان زۆربێ دەبڕێتەوەو کۆتایی پێ دێ، بەڵام ئەوەی لای خوایە چاکترەو دەمێنێتەوە، ﴿ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ ﴾ لێی وەردەگیرێ ماڵ‌و سامان‌و منداڵ هیچ سوودێکیان نیە ئەگەر یارمەتیدەر نەبوون بۆ گوێڕایەڵی خوا، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴿٣٧﴾ ﴾سبأ.

وە لێی وەردەگیرێ پاڕانەوەو نزاکردن بۆ لە ناوبردنی ماڵ‌و سامانی ئەو کەسەی دەبێتە مایەی کوفرو سەرپێچی‌و خەسارتمەندی، بە تایبەت ئەگەر خاوەنەکەی بە هۆی ئەو ماڵەوە فەزڵ‌و چاکەی خۆی دا بەسەر بڕواداراندا، وە شانازی بکات بەسەریانەوە.

وە لێی وەردەگیرێ بوون‌و نەبوونی پشتیوانی خوا ئەو کاتە ئەنجامەکەی ڕوون دەبێتەوە، کە تەم‌و مژ لاچوو پاداشتەکان درانەوە، وە خاوەن کارەکان پاداشتی کارەکانیان وەرگرت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴾ واتە: سەرەنجام‌و چارەنووس.

(٤٥-٤٦): ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ، هەروەها بەو کەسانەش کە شوێنی کەوتوون‌و

میراتگری ئەون: نموونەی ژیانی دونیا بۆ خەڵكی بهێنەوە بۆ ئەوەی بەرجەستەی بكەن‌و شارەزایی دیوی ئاشكراو پەنهانەكانی بن، ئنجا لەگەڵ ژیانی دوارۆژدا بەراوردی بكەن، بزان كامیان شایستەترن بۆ هەوڵ بۆ دان، نموونەی ژیانی دونیا وەكو بارانێك وایە ببارێتە سەر زەوی لەگەڵ تۆیەكاندا تێكەڵ ببێ، هەموو جۆرە ڕوەكێكی جووت‌و قەشەنگ بروێنی، جوانی‌و ڕازاوەیی ئەو ڕووەكانە سەرنجی بینەران بەلای خۆیدا ڕابكێشی‌و دڵی گەشتیاران خۆش بكات‌و چاوی بێناگاكان بەلای خۆیدا ڕابكێشێ، كەچی دوای ماوەیەك ببێتە پۆش‌و پەڵاش با پەرش‌و بڵاوی بكاتەوە، ئەو ڕووەكە سەرنج ڕاكێشە، ئەو دیمەنە جوانانە هیچی نەمێنێ‌و كۆتاییان پێبێت، زەوی بە تەپ‌و تۆزاوی بمێنێتەوە، بینینی لەسەر نەمێنی، چاو حەزی پێ نەكات‌و دڵیش هەست بە تەنهایی بكات.

بە هەمان شێوە ئەم دونیایەش هەر بەو شێوەیە، كاتێ ئادەمیزاد سەرسامە بە گەنجێتیەكەی، تەماشا دەكات پێش كەوتووە بەسەر هاوتەمەن‌و هاوشانەكانیدا، چەند دینارو پارەو پوولێكی هەیەو لەززەت لە خۆشیەكانی وەردەگرێ‌و ڕۆ ئەچێت لە ئارەزوو بازیدا لە هەموو ڕۆژگارەكانی تەمەنیدا، لە ناكاو مردن یەخەی پێدەگرێ، یان ماڵ‌و سەروەتەكەی لە دەستت دەدات، هەرچی خۆشی هەبوو ڕۆیشت، دڵی بە تەنهاو پڕ لە خەم‌و پەژارە دەمێنێتەوە، كە تەماشا دەكات گەنجی‌و هێزو ماڵ‌و سەروەتی كۆتایی پێهاتووە، بە تەنها خۆی‌و كردەوە چاكەكانی، یان كردەوە خراپەكانی دەمێنێتەوە، ئەوكاتە كەسی ستەمكار دەستی پەشیمانی دەگەزێ، كاتێ كە حەقیقەتی ئەوە دەزانێ كە لەسەریەتی، ئنجا ئاوات دەخوازێ بگەڕێتەوە بۆ دونیا، نەك بۆ ئەوەی حەزو ئارەزووەكان تەواو بكات، بەڵكو بۆ ئەوە بگەڕێتەوە ئەوەی لە دەستی چووە لە خواپەرستی ئەنجامی بدات‌و تەوبەو داوای لێخۆش بوون بكات‌و كردەوەی چاك ئەنجام بدات.

مرۆڤی عاقڵ‌و تێگەیشتوو سەركەوتوو، ئەم حاڵەتە دەخاتە ڕوو بۆ نەفس‌و دەروونی، پێی دەڵێ: وا دابنێ تۆ مردوویت، وە هەر دەبێ بمرێ، كام لەم دوو حاڵەتە هەڵدەبژێری؟ مەغرور بوون بە جوانیەكانی دونیاو ڕابواردن تیایدا، وەكو ڕابواردنی ئاژەڵی مەڕو ماڵات، یان كار كردن بۆ ماڵێك خواردن‌و خواردنەوەو سێبەری بەردەوام بێت، ئەوەی نەفس‌و دەروون حەزی لێ بكات‌و چاو لەززەتی لێوەر بگرێ تیادا هەبێ؟ ئا بەمە سەركەوتنی بەندەو ڕیسوایی دەزانرێ، وە قازانجی لە زەرەرو زیانی.

ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ
خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى
ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟
عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ
أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ
مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ
لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟
حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟
لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ
أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ
بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا
﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ
فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ
ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾

لەبەر ئەمە خوا ﷻ هەواڵیداوە ماڵو منداڵ زینەتو جوانی ژیانی دونیان، واتە: لە پشتی ئەوەوە هیچی دیكە نیە، ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئادەمیزادو سوودی هەیە بۆیو دڵی خۆش دەكات كردەوە چاكەكانە، پاداشتیان دەمێننەوە، ئەمەش هەموو گوێڕایەڵیەكان دەگرێتەوە ئەوانەی فەرزو ئەوانەی سوننەتن: لە مافەكانی خواو مافی بەندەكانی، لە نوێژو زەكاتو خێرو حەجو عومرەو زیكر كردنو خوێندنی قورئانو گەڕان بە دوای زانستی بە سوودda، فەرمان بە چاكەو ڕێگری لە خراپە، گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیو چاكە كردن لەگەڵ دایكو باوكدا، وە هەستان بە مافی ژنەكان، خزمەتكارەكان، ئاژەڵەكان، وە هەموو جۆرەكانی چاكە كردن لەگەڵ دروستكراوەكاندا، هەموو ئەمانە لەو چاكانەن كە دەمێننەوە (الباقیات الصالحات) ئەمانە پاداشتیان چاكترە لای پەروەردگارتو زیاتر جێگەی ئومێدن، پاداشتەكانیان دەمێنێتەوە، بۆ هەتا هەتایە زیاد دەكات، وە چاوەڕوانی ئەجرو چاكەو سوودیان دەكرێ لە كاتی پێویستیدا، ئا ئەمە شایستەی ئەوەیە كێبڕكێكاران لە پێناویدا كێبڕكێ بكەنو دڵسۆزانیش پێشبڕكێی بۆ بكەن، وە كۆشش كارانیش هەموو تواناكانیان بخەنەكار بۆ بە دەستهێنانی، بەم شێوەیە سەركەوتن، یان خەسارەتمەندیو زەرەر، یان قازانجی بەندە دەردەكەوێ.

سەرنج بدە، چۆن كاتێ خوا ﷻ نموونەی ژیانی دونیاو نەمانی هێناوەتەوە، باسی كردوە ئەوەی تیایدایە دوو جۆرە: جۆرێك لە زینەتەكانی ئەوەیە مرۆڤ لەززەتی لێوەردەگرێ بۆ ماوەیەكی كەم، پاشان بەبێ سوود دەڕواو خاوەنەكەی بەجێ دێڵا، بەڵكو هەندێ جار زیانی پێدەگەیەنێ ئەویش ماڵو منداڵە، وە جۆرێكی دیكەی دەمێنێتەوەو بەردەوام خاوەنەكەی سوودی لێوەردەگرێ، ئەویش پاداشتی كردەوە چاكەكانە كە پاداشتیان دەمێنێتەوە (الباقیات الصالحات).

(٤٧-٤٩): ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾
وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾
وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا
يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدا دەربارەی دۆخی ڕۆژی دوایی، وە ئەوەیشی تیایدایە لە ترس و دڵەڕاوكێ و نارەحەتی و بێزاركەر وەك فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ ﴾ واتە: لە شوێنی خۆیان لایان دەدات، دەیانكات بە لمی هەڵڕژاو، پاشان شیان دەكاتەوە وەك خوری شیكراوە، ئنجا دەبنە تەپ و تۆزێكی پەرش و بڵاو، وە زەوی تەخت دەبێ، دەبێتە دەشتێكی صافی كاكی بە كاكی وەك هیچ لاری و بەرزوو نزمیەكی تیادا نامێنێ، وە خوا ﷻ هەموو خەڵكی كۆدەكاتەوە لەسەر ئەو زەویە، هیچ كەسێكیان بەجێ ناهێڵا.

بەڵكو سەرەتاو كۆتای هەموو بەدیهێنراوەكان كۆ دەكرێنەوە، لە ناخی دەشت و لە قووڵایی دەریاكان، كۆیان دەكاتەوە دوای ئەوەی جیا ببوونەوە، وە دەیانگێڕێتەوە دوای ئەوەی لەت و پەت بوون، دروستكراوێكی نوێ، بە شێوەی ڕیز ڕادەگیرێن بۆ ئەوەی تەماشای كردەوەكانیان بكەن، وە بڕیاریان لە نێواندا دەدات بە حوكمێكی دادگەرانە، كە هیچ زوڵم و ستەمێكی تێدا نیە، وە پێیان دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ﴾ واتە: (سوێند بە خوا هاتنەوە بۆ لامان هەر بەو شێوەی یەكەمجار دروستمان كردن) بەبێ ماڵ و منداڵ و، عەشیرەت و هۆز، ئەوان هیچیان لەگەڵدا نیە تەنها كردەوەكانیان نەبێ، وە ئەوەی بە دەستیان هێناوە لە چاكە و خراپە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ ۚ ﴿٩٤﴾ ﴾الأنعام (واتە: ئێستاش وەك چۆن یەكەمجار دروستمان كردوون تاك تاك هاتن بۆ لامان، وە ئەوەی كە پێمان دابوون لە پشت خۆتانەوە بە جێتان هێشتوە، وە ئەو تكاكارانەتان لەگەڵ نابینین كە پێتان وا بوو تێتاندا هاوبەشن).

وە لێرەدا فەرموویەتی وەك دواندنێك لەگەڵ ئەوانەی نكوڵی زیندووبوونەوە دەكەن، بێگومان ئەوان بە چاوی خۆیان بینیویانە: ﴿ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴾ (واتە: ئێوە گومانتان وابوو كە ئێمە كاتێك دانانێین بۆ لێپرسینەوەتان) واتە: ئێوە نكوڵی پاداشت دانەوەی كردەوەكانتان دەكرد، وە نكوڵی پەیمان و هەڕەشەكانیتان كرد، ئا ئەوەتا بە چاوی خۆتان بینیتان و چەشتتان، جا ئەو كاتە نامەی كردەوەكان ئامادە دەبێ كە فریشتە بەڕێزەكان نووسیویانە، دڵەكان بۆی

دەفڕن، ناخۆشیی ڕووداوەکان یەکجار گەورەیە، ئەوەندە قورس‌و ناخۆشە خەریکە بەرد دەتاوێنێتەوە، تاوانباران‌و موجریمان دڵیان دێتە لەرزە، کاتێ بینیان کردەوەکانیان هەمووی نووسراوە، وە هەموو قسەو کردەوەکانیان ژمێردراوە، دەڵێن: ﴿يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَا﴾ (واتە: ئەی هاوار! بۆ ئێمە، ئەو نامەو دەفتەرە چییە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووک‌و گەورەی نەهێشتووە هەمووی تۆمار کردوە).

واتە: هیچ تاوانێکی گەورەو بچووکی جێنەهێشتووە، هەمووی تیادا تۆمار کراوەو پارێزراوە، هیچ کردەوەیەکی نهێنی‌و ئاشکرای بیر نەکردوە، وە نە شەوو نە ڕۆژ، ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗا﴾ (واتە: هەر کردەوەیەکیان کردبێ تیایدا ئامادەیە)، توانای نکوڵی کردنیان نیە، ﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا﴾ (واتە: وە پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات)، لەو کاتەدا پاداشت وەردەگرن‌و دان بە کردەوەکانیاندا دەنێن‌و سەرشۆڕ دەبن، وە سزایان لەسەر پێویست دەبێ، (ئنجا پێیان دەوترێ): ئەم سەرەنجامە دەستپێشخەری خۆتانە تووشتان هاتووە، بێگومان خوا بە هیچ جۆرێ ستەم لە بەندەکانی ناکات، بەڵکو ئەوان دەرچوون لە دادپەروەری‌و فەزڵی خوا.

(٥٠): ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات لە دوژمنکاری ئیبلیس بۆ ئادەم‌و نەوەکانی، وە فەرمانی بە فریشتەکان کردوە بۆ ئەوەی کڕنۆشی بۆ بەرن، وەکو ڕێز گرتن‌و بە مەزن دانانی، وە وەکو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا، ئەوانیش گوێڕایەڵیان کرد ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾ (واتە: جگە لە ئیبلیس نەبێ کە لە پێڕی جنۆکەکان بوو، بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو)، وە وتی: ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾﴾ الإسراء (واتە: ئایا کڕنووش ببەم بۆ ئەوەی لە قوڕ دروستت کردوە؟ وە وتی: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف (واتە: من لەو چاکترم)، بەمە دەرکەوت دوژمنایەتی بۆ خواو باوکتان ئادەم‌و ئێوەش، ئایا ئێوە ئەی ئادەمیزاد چۆن ئیبلیس‌و نەوەکانی لە جنۆکەکان ﴿أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا﴾ (واتە: دەکەن بە دۆست‌و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من، لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن، ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران) واتە: ئای چ شتێکی خراپیان هەڵبژارد بۆ نەفس‌و دەروونی خۆیان لە دۆستایەتی شەیتان‌و -ئەو شەیتانەی کە فەرمان ناکات تەنها بە فاحیشە نەبێ‌و خراپە نەبێ- دوورکەوتنەوە لە دۆستایەتی ڕەحمان، کە هەموو بەختیاری‌و

سەركەوتنێكو دڵ خۆشیەك لە دۆستایەتی ئەودا بە دەست دێ.
لەم دەقەدا، هاندانی تێدایە بۆ ئەوەی شەیتان بە دوژمن دابنرێ، وە پێی هەڵنەخەڵەتێو فریوی نەدا، وە باسكردنی ئەو هۆكارەی دەبێتە مایەی فریودانی، بێگومان كەس شەیتان ناكات بە دۆستی خۆی جگە لە ستەمكار، جا چ ستەمێك مەزنترە لە ستەمی ئەو كەسەی شەیتان دەكات بە دۆستێكی ڕاستەقینە، وە واز لە پشتیوانیو دۆستایەتی خوای ستایش كراو دێنێ؟!
خوا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾البقرة، (واتە: خوا دۆستی ئەوانەیە بڕوایان هێناوە لە تاریكاییەكانەوە بەرەو ڕووناكیی دەریان دێنێ، وە ئەوانەی بێبڕوان دۆستەكانیان تاغووتەكانن لە ڕووناكییەوە بەرەو تاریكییەكان دەریان دێنن، ئەوانە خاوەنی ئاگرنو بە هەمیشەیی تێیدان).
وە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ﴿٣٠﴾﴾الأعراف، واتە: (كۆمەڵێكیشیان گومڕاییان لەسەر پێویست بووە، چونكە لە جیاتی خوا شەیتانەكانیان بە دۆست گرتوە).
(٥١-٥٢): ﴿مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾﴾:
﴿مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ﴾ خوا ﷻ فەرموویەتی: من شەیتانەكانو ئەو گومڕایانەم ئامادەی ﴿خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾(واتە: دروستكردنی ئاسمانەكانو زەوی نەكردوە) واتە: نە ئامادەم كردوونو نە ڕاوێژم پێكردوون، ئیتر چۆنە دەبنە دروستكەر بۆ ئەوانە؟! بەڵكو تاكو تەنها لە دروستكردنو مشوورخواردنو حیكمەتو ئەندازەگیریدا، بەس خوایە بەدیهێنەری هەموو شتەكانە بە گشتی، بە حیكمەتو دانایی خۆی سەرپەرشتیاری دەكاتو هەڵیدەسوڕێنێ، دەی ئیتر چۆن دەبێ هاوبەشی بۆ دابنرێ لە جنۆكەكان، بكرێن بە دۆستو گوێڕایەڵی بكرێن وەكو چۆن گوێڕایەڵی خوا ﷻ دەكرێ، لە كاتێكدا ئەوان نە دروستكەرنو نە ئامادەی دروستكردنیش بوون، وە هاوكاری خواشیان نەكردوە لەو كارەدا؟! بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا﴾ (واتە: من هەرگیز گومڕاكەرانم نەكردوە بە یارمەتی دەری خۆم)، یارمەتیدەرو پشتیوانی خوا ﷻ لە هیچ كارێكدا، واتە: ناگونجێو شایستە نیە خوا بەشیان پێ بدا لە مشوور خواردنی دروستكراوەكان، چونكە ئەوان هەوڵو كۆششیان دەخستەكار بۆ

گومراکردنی بەدیهێنراوەکانو دوژمنایەتی پەروەردگاریان، جا شایستەترین شت بەوان ئەوەیە لە ناویان بیات نەک نزیکیان بکاتەوە.

پاشان باسی حاڵی ئەوانەی کردوە کە هاوەڵ بۆ خوا بۆ دادەنێن لە دونیادا، وە ئەو هاوبەش دانانەشی بەتاڵ کردۆتەوە بەوپەڕی بەتاڵ کردنەوە، وە بڕیاری داوە بە نەفامیو گێلی ئەو کەسەی کە هاوبەشی بۆ دادەنێ، وە باسی حاڵی وانو هاوبەشەکانیانی کردوە لە ڕۆژی دواییدا، خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: ﴿نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ﴾ واتە: (بانگی ئەوانە بکەن کە لەگەڵ مندا دەتانکردن بە هاوبەش)، بە بۆچوونی خۆتان، واتە: بە پێی ئەو بۆچوونە خراپەتان، ئەگەرنا لە ڕاستیدا خوا ﷻ هاوبەشی نیە نە لە زەوییو نە لە ئاسمانەکاندا، واتە: بانگی هاوبەشەکانتان بکەن، بۆ ئەوەی سوودتان پێ بگەیەننو ڕزگارتان بکەن لە ناخۆشیەکان، ﴿فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ﴾ (ئەوانیش بانگیان دەکەن، بەڵام وەڵامیان نادەنەوە، نایەن بە هاواریانەوە)، چونکە لەو ڕۆژەدا بڕیارو دەسەڵات تەنها بۆ خوایە، هیچ کەس بە ئەندازەی گەردیلەیەک ناتوانێ سوود بگەیەنێ نە بە خۆی، نە بە غەیری خۆی، ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم﴾ واتە: لە بت پەرستو شەریکو هاوبەشەکانیاندا ﴿مَّوْبِقًا﴾ واتە: (لەناو بەر) نێوانی ئەوانو هاوبەشەکانیان لە یەکتر جیادەکاتەوە، وە هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان دوور دەخاتەوە، ئەو کاتە دوژمنایەتی هاوبەش دانەرانو هاوبەشەکانیان ڕوون دەبێتەوە، وە بێبڕوایان دەکەنو خۆیان بەری دەکەن لێیان، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾الأحقاف، (واتە: کاتێکیش خەڵک کۆ دەکرێنەوە (لە قیامەت) پەرستراوەکان دەبنە دوژمنیانو (پەرستراوەکان) بە پەرستنەکەیان بڕوا ناکەن).

(٥٣): ﴿وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾﴾:

واتە: کاتێ ڕۆژی قیامەت دێ ئەوەی ڕوویداوە لە حیسابو کیتاب ڕوویداوە، هەر دەستەو تاقمێک لە بەدیهێنراوەکان بە پێی کردەوەکانیان جیادەکرێنەوە، سەپاندنی سزا پێویست دەبێ بەسەر موجریمو تاوانباران، ئەوجا دۆزەخ بە چاوی خۆیان دەبینن پێش ئەوەی بچنە ناوی تووشی ترسو دڵەڕاوکێ دەبن، چونکە دەزانن ئەوان دەخرێنە ناویەوە، ڕاڤەزانانی قورئان دەڵێن وشەی (الظن) لێرەدا بە مانای دڵنیایی (اليقين) دێت، دڵنیا دەبن کە ئەوان دەچنە ناو دۆزەخەوە، ﴿وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا﴾ واتە: ڕێگایەکیان دەست ناکەوێ بۆ خۆ لادان لەو ئاگرە، وە هیچ تکاکارێکیشیان نیە بێ مۆڵەتی خوا، لەمەدا ترسانو تۆقاندن بەدیدەکرێ کە دڵو سینگ پڕ دەکات.

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ
ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ
إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُواْ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ
ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ
إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلْبَٰطِلِ
لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوًا ﴿٥٦﴾
وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ
مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ
وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًاۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓاْ إِذًا
أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ
لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ
مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلْنَا
لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ
أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ
بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾

(٥٤): ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی مەزنــیو گەورەییو گشــتگیری قورئــان، ئەو بێگومان هەمــوو جــۆرە نموونەیەكــی هێناوەتــەوە لــەم قورئانــەدا بــۆ خەڵكــی، واتە: لــە هەموو ئــەو ڕێگایانــەی دەیگەیەنــێ بــە زانســتی ســوودبەخشو خــۆش بەختــی هەتاهەتایــی، وە هەمــوو ئەو ڕێگایانەشــی كــە دەیپارێزێ لــە شــەڕو خراپــەكاری، نموونەی حــەڵاڵو حــەڕامو پاداشــتی كــردەوەكانو هانــدانو ترســاندنی تێدایە، وە هەواڵی ڕاستو دروست بۆ دڵەكانو بیــرو بڕواو، ئارامیــیو ڕووناكی تێدایــە، ئەمــەش ئەوە پێویســت دەكا تەســلیم بــێ بەم قورئانــە، بــە ملكەچــیو گوێڕایەڵی، وە دژایەتــی نەكردنی لە هیــچ كارێكدا، وە لەگەڵ ئەمــەدا زۆرێ لە خەڵكی موجادەلەو مشــتومڕ دەكــەن لە هەقو ڕاســتیدا دوای ئــەوەی بۆیان ڕوون بووەتــەوە، وە بە ناهەقو بەتاڵ مشــتومڕ دەكــەن، ﴿ لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّ ﴿٥٦﴾ ﴾الكهف (بــۆ ئــەوەی (ئایینی) ڕاســتی پێ لەنــاو بەرن)، لەبــەر ئــەوە فەرموویەتــی: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴾ (واتە: بەڵام هەمیشــە ئادەمی لــە هەمــوو شــتێ زیاتر مشــتو مــڕ دەكات) واتــە: مشــتومڕو كێشــەو ناكۆكی لــە قورئاندا دەكات، لەگــەڵ ئــەوەدا ئــەوە شایســتەو دادپــەروەری نیــە بۆ ئەوان، ئــەوەی كــە وای كردوە بــەم شــێوەیە بــنو بڕوا بە خــوا نەهێنن، ئــەوە تەنها ســتەمو نكوڵــی كردنە، نەك لەبــەر كەمو كــوڕی بەڵگــەو ڕوون كردنەوەكانــی قورئــان، ئەگەرنــا ئەگەر ســزایان بــۆ بهاتایــەو ئەوەیان بەســەر بهاتایــە وەكــو چۆن بەســەر پێشــینانیاندا هات، ئــەوە حاڵیان بــەو جۆرە نەدەبــوو، لەبەر ئەمەیــە فەرموویەتی:

(٥٥): ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُواْ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ ﴾:

واتــە: هیــچ شــتێ ڕێگری لــە خەڵــك نەكــردوە لــە بڕواهێنان، لــە كاتێكــدا ئــەو هیدایەتەی كــە هــەقو ناهــەقو ڕێنماییو گومڕایــی پێ لە یەكتــر جیا دەكرێتــەوە پێیان گەیشــتووە، وە بەڵگەو حوجەیان لەســەر پێویســت بــووەو بیانوویان نەماوە، هیچ شــتێ ڕێگریــان لێناكات لە بــڕوا نەهێنــان، بەڵكو ســتەمو تاوان ڕێگریــان لێ دەكات لە بــڕوا هێنان، هیــچ نەماوەتەوە تەنها ئــەوە نەبێــت خــوا نەریتو ســوننەتی پێشــینیان بەســەردا بهێنــێ، ســوننەتی خوا لــە خەڵكانی پێشــیندا بــەم شــێوە بــوو، ئەگــەر بڕوایــان نەهێنایــە، ســزایان بــۆ پێش دەهــات، یان ســزایان دەبینــی بــەرەو ڕوویان دەهــات، ئەمەیان ڕووبەڕوو بەچــاو دەبینی، واتە: با بترســن لەمەو داوای لێــوردن بكــەن لــە بێبڕواییەكەیان پێش ئەوەی ســزایان بۆ بێــت كە هیــچ گەڕانەوەیەكی نیە.

(٥٦): ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا ٥٦ ﴾:

واتــە: پێغەمبەرانمــان بــە هەوەنتــەو گاڵتــەوە نە نــاردووە، وە لەبەر ئــەوەش نەمان نــاردوون بۆ ئــەوەی خەڵكــی بیانــكات بــە پەرســتراو، وە بۆ ئــەوەش نەمان نــاردوون بانگــی خەڵكی بكەن بــۆ بەرژەوەنــدی نەفــسو دەروونیــان، بەڵكــو ناردوومانن خەڵكــی بانگ بكەن بــۆ لای هەموو خێــرو چاكەیــەكو ڕێگری بكــەن لە هەمــوو خراپەیەك، وە مژدەیــان پێ بدەن لــە جێبەجێ كردنــی ئەوانــەدا بــە پاداشــتی بە پەلــە لــە ئێســتاو داهاتووشــدا، وە بیانترســێنن لە ســەرپێچی خــوا بــە ســزای بە پەلــە لە ئێســتاو لــە داهاتــوودا، بــەو شــێوەیە بەڵگەی خــوا پێویســت بووە لەســەر بەنــدەكانو بیانوویــان نەمــاوە، لەگەڵ ئەوەشــدا ســتەمكارو بێبڕوایان یاخــی دەبن تەنها مشــتومڕو دەمەدەمــێ دەكــەن بــە ناهەقو پــووچو بەتاڵ، بــۆ ئــەوەی ئاینی هەقی پــێ لەناو بــەرن، هــەوڵو كۆششــی زۆریان دا لە سەرخســتنی بەتــاڵو پووچدا، ئــەوەی لــە توانایاندا بوو درێغیــان نەكــرد بــۆ لــە ناو بردنــی هــەقو پــووچ كردنــەوەی، گاڵتەجاریــان بــە پێغەمبەرانی خــواو نیشــانەكانی دەكــرد، دڵیــان خــۆش بــوو بــەوەی لــە لایانــە، خــوا ناهێڵێــت ئاواتیــان بێتــە دی، وە هیــچ شــتێكی تــری ناوێــت جگــە لــەوە نەبــێ ئاینو نــووری خۆی ســەربخات، هەرچەنــدە بێبڕوایــان پێــی ســەخڵەتو دڵتەنگ بــن، ﴿ بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ فَيَدۡمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ ١٨ ﴾الأنبياء (واتــە: هــەق دەدەین بەســەر ناهەقدا بە هۆیەوە ناهەق مێشــكی دەپــرژێو تێكدەشــكێ، ئنجــا دەســت بەجــێ دەفەوتێو لەنــاو دەچێ).

لــە حیكمــەتو ڕەحمەتــی خــوا ئەوانــەی لەســەر پووچــن خــوا بــە هــۆی هەقــەوە هەڵیــان دەوەشــێنێتەوە، لــە مەزنترین هۆكارەكان بــۆ دەركەوتنی هەقو ڕوونبوونــەوەی بەڵگەكانی، وە

ڕوون بوونــەوەی بەتـاڵو خراپیەکانـی، بـە پێچەوانەکەیانـەوە شـتەکان دەردەکەون.

(٥٧-٥٩): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا۟ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَـٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ هـەواڵ دەدا بێگومـان هیـچ تاوانێـک مەزنترو گەورەتـر نیـە لـە تاوانی ئەو کەسـەی کـە بە ئایەتەکانـی خوا ئامۆژ گـاری کرابـێ، وە هەقو ڕاسـتیو هیـداتو گومڕایـی بـۆ ڕوون کرابێتـەوە، وە ترسـێنرابێو هاندرابـێ، لـە بەرانبـەردا گوێـی پێنەدابـێو ئامۆژ گـاری لـێ وەرنەگرتبـێ، نەگەڕابێتـەوە لـەو تاوانەی لەسـەری بووە، وە ئاکامـی ئـەو کارە خراپانـەش کـە بـە دەسـتی خـۆی پێشـی خسـتووە لـە بیـری کردبێ، هەسـت بـە چاودێری خـوا نەکات بەسـەریەوە، ئەم جۆرە کەسـە سـتەمکارە لەو کەسـەی کە ئایەتەکانـی خوای بـۆ نەخراوەتـە ڕوو، وە یادی نەخراوەتـەوە، ئەگەر چی ئەویش سـتەمکارە، بـەڵام سـتەمەکەی سـووکترە لەمـە، چونکە ئـەو کەسـەی گوناهێک بـە زانیارییـەوە دەکات گوناهەکـەی گەورەتـرە لـەو کەسـەی بەم شـێوەیە نیە.

بـەڵام خـوا سـزای داوە بـە هـۆی پشـت کردنـی لـە ئایەتەکانـی، وە بە هـۆی لەبیـر کردنی تاوانـەکان، وە ڕازی بوونـی بـەوەی نەفـسو دەروونی لە حاڵەتـی خراپەدا بێ لەگەڵ ئەوەشـدا زانیویەتـی خراپـە، خـۆی دەرگاکانی هیدایەتی بەسـەر خۆیدا داخسـتووە، بـەوەی پەردەیەکی ئەسـتووری داوە بەسـەر دڵیدا بووەتـە ڕێگر لە بەردەم تێگەیشـتن لە ئایەتەکانی خـوا، هەروەها بیستنیشـی توانـای ئەو بیسـتنەی نیە کـە دەگا بـە دڵ، ﴿ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴾ (واتـە: کەڕیمان خسـتۆتە سـەر دڵەکانیـان) کەڕییـەک ڕێگریـان لێـدەکا لـە گەیشـتنی ئایەتەکان بـە دڵیان، وە لـە بیسـتنیان بـە شـێوەیەک سـوودی لـێ وەربگرن، جـا ئەگـەر حاڵیان بـەم شـێوەیە بێ، ئـەوە بێگومـان هیدایەتیـان بـۆ نیـە، ﴿ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴾ (واتە: جـا ئەگـەر بانگیان بکەی بـۆ ڕێگای ڕاسـت هەرگیـز هیدایـەت وەرناگرن)، چونکـە ئەوەی ئومێـد دەکـرێ وەڵامـی بانگخـواز بداتـەوە بـۆ هیدایـەت ئەو کەسـەیە کـە زانا نەبـێ، بەڵام ئەوانـەی ئایەتو نیشـانەکانیان بینیو پاشـان خۆیان کوێر کـرد لە ئاسـتیدا، وە ڕێگای هەقیان بینـیو وازیـان لێهێنا، ڕێگـای گومڕاییان گرتەبەر، خـوا ﷻ لە بەرانبەردا سـزای دان، بە کلیل

دانـی دڵەکانیـانو مـۆردان بەسـەریاندا، جـا لـە هیدایەتدانیانـدا هیـچ ڕێگەچارەیـەک نیە، لەم ئایەتـەدا ئـەوە دەردەکەوێ ترسـاندنی ئەو کەسـەی واز لە هـەق دێنێ پاش ئەوەی ناسـیویەتی، وە بۆشـاییەک دەکەوێتـە نێـوان ئەوانو هەقو ڕاسـتی، دوای ئـەوە هەرگیز ناتوانـن هیدایەت وەربگـرن، بە ڕاسـتی ئەوە مەزنتریـن ترسـاندنو قەدەغەکردنە.

پاشـان خـوا ﷻ هەواڵـی داوە دەربـارەی بەرفراوانـی لێبـووردنو سـۆزوو بەزەیـی، بێگومـان ئـەو لـە هەمـوو تاوانـەکان خۆش دەبـێ، وە تەوبەی ئەو کەسـەش قبـووڵ دەکات کـە داوای لێبوردنـی لێـدەکا، بـە ڕەحمەتی خـۆی دایدەپۆشـێ، چاکەکانی خـۆی پێدەبەخشـێ، بێگومان ئەگـەر خـوا ﷻ بەندەکان سـزا بـدا بە هۆی ئـەو تاوانو سـەرپێچیانەی پێشـی دەخـەن، ئەوە سـزایان بـۆ پێـش دەخات، بەڵام خـوا ﷻ نەرمو نیانو لەسـەرخۆیە سـزا پێش ناخـات، بەڵکو مۆڵـەت دەداو پشـتگوێ ناخـات، وە تاوانیـش شـوێنەواری خـۆی هـەر بەجێدێڵـێ ئەگەرچی بـۆ ماوەیەکـی درێژیش دوابکـەوێ، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا﴾ (واتـە: بـەڵام بـۆ سـزادانی ئـەوان کاتێکـی دیاری کـراو هەیـە، بێجگە لـە (خـوا) هیـچ پەنایەکیـان دەسـت ناکـەوێ) واتە: بـۆ ئـەوان کاتێکـی دیاری کـراو هەیە پاداشـت دەدرێنـەوە بـە پێـی کردەوەکانیـان، هەر دەبێ ئـەو پاداشـتە وەربگرن، هیـچ چارەو پەنـاو لایەنگرێکیـان نیە لـەو ڕۆژەدا، ئەمەش سـوننەتی خـوای گەورەیە لە پێشـینو دوایینـدا، کە سـزای بـە پەلەیان بـۆ دانەبەزێنـی، بەڵکـو بانگیـان دەکا بۆ تەوبـەو گەڕانەوە، جـا ئەگەر تەوبەیـان کـردو گەڕانـەوە، لێیـان خۆش دەبـێو میهرەبانـی خـۆی دەبارێنێ بەسـەریاندا، وە سزاشـیان لەسـەر لادەبـات، بەڵام ئەگـەر بـەردەوام بـوون لەسـەر سـتەمکردنو کەللەڕەقیان، وە ئـەو کاتـەش هـات کە خـوا ﷻ بۆیانـی دیاریکردوە، ئەوە سـزایان بـۆ دادەبەزێنـێ، لەبەر ئـەوە فەرموویەتـی: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ﴾ (واتـە: ئـەو هەمـوو شـارو وڵاتانەمـان بەردبـارانو وێـران کرد کاتێ دانیشـتوانیان سـتەمیان کرد)، واتە: بە هۆی سـتەمی خۆیـان، نەک بە هۆی سـتەمێک لەلایـەن ئێمـەوە، ﴿وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا﴾ واتە: (بۆ لـە ناوبردنیـان) کاتێکی دیاری کراومـان بۆیان داناوە، نـە بۆیان پێش دێ نـە دواش دەکەوێ.

(٦٠-٨٢): ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ
حُقُبٗا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجۡمَعَ بَيۡنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ سَرَبٗا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ
لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي
نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ

مَا كُنَّا نَبْغِۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا
وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ
إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ
صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا
﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ﴾تاوەكو دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع
عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴾خوای بەرز هەواڵ دەدات دەربارەی پێغەمبەرەكەی مووسا عليه السلام وە زۆری حەزكردنی لە خێرو چاكەو گەڕان بە دوای زانستو زانیاریدا، ئەو بە گەنجەكەی وت كە خزمەتكاری بوو لە كاتی ئاسایی‌و گەشتكردندا ناوی (یوشع بن نون) بوو، كە خوا دوای ئەوە ئاگاداری كردەوە: ﴿لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ ﴾ واتە: من بەردەوام لە گەشت كردندامو هەر دەڕۆم ئەگەرچی ماندوویش بم هەتا دەگەم بە شوێنی بە یەك گەیشتنی هەردوو دەریاكە، ئەویش ئەو شوێنەیە كە خوا ﷻ وەحی بۆ كردوە كە تۆ لەوێ بەندەیەك لە بەندەكانی خوا دەبینی، ئەو زانستێكی لە لایە كە لە لای تۆ نیە، ﴿أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴾ (واتە: یان ماوەیەكی دوورو درێژ دەڕۆم)، مانای ئەوەیە: كە حەزوو ئارەزوو (ی زانست) وای لە مووسا كرد ئەم قسەیە لەگەڵ گەنجەكەدا بكات، ئەمە جەخت كردنەوەیە كە لەلایەن ئەوەوە، لەبەر ئەوەیە ئەنجامیدا.

﴿ فَلَمَّا بَلَغَا ﴾ (جا كاتێ گەیشتن)، واتە: مووساو گەنجەكە ﴿مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا ﴾ (ئەو شوێنەی دوو دەریاكە بەیەك دەگەن ماسیەكەیان بیرچوو) ماسیەكیان پێ بوو بۆ ئەوەی لە ڕێگا سوودی لێوەربگرنو بیخۆن، مووسا پەیمانی پێدرابوو هەر كات ماسیەكەی ون كرد ئەوە لەو شوێنە ئەو بەندەیە دەدۆزنەوە كە مەبەستیانە، ماسیەكە خۆی فڕێداو ڕێگەی خۆی گرتەبەر لە ناو دەریاكە، ئاوەكە لەت بوو وەكو خۆی لێنەدەهاتەوە، ئەمەش یەكێكە لە نیشانەكانی خوا.

ڕاڤەزانان وتوویانە: ئەو ماسیەیان وەك توێشوو لەگەڵ خۆیان بردبوویان، كاتێ گەیشتنە شوێنی مەبەست، ئاوی دەریای بەر كەوتو تەڕ بوو، بە فەرمانی خوا ڕێگای بۆ نێو دەریاكە گرتەبەر، زیندوو بۆوەو لەگەڵ گیاندارانی دەریاكە كەوت.

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِۚ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٦٧﴾ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ﴿٧٤﴾

جا کاتێ مووساو گەنجەکە بەلای شوێنی بە یەک گەیشتنی دوو دەریاکە تێپەڕین، مووسا (عليه السلام) بە گەنجەکەی وت: ﴿ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴾ واتە: بە ڕاستی لەم گەشتەماندا کە لە (شوێنی بەیەک گەیشتنەکە تێپەڕین تا ئێرە) هیلاک بووین، ئەگەرنا سەفەرەکە بۆ لای بە یەک گەیشتنی شوێنی ئەو دوو دەریایە دوورو درێژتر بوو، ئەوان لەو ڕێگایەدا هەستیان بە ماندوو بوون نەکرد، ئەمەش یەکێکە لەو ئایەتو نیشانانەی کە بەڵگەن بۆ مووسا (عليه السلام) لەسەر بەدەستهێنانی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێ، وە هەروەها حەزوو ئامەزرۆیی مووسا (عليه السلام) بۆ گەیشتن بەو شوێنە ڕێگاکەی بۆ ئاسان کردن، کاتێ گەیشتنە شوێنەکەی خۆیان هەستیان بە ماندوێتی کرد، کاتێ مووسا (عليه السلام) ئەم قسەیەی بە گەنجەکە وت: (خواردنەکەمان بۆ بێنە بە ڕاستی لەم سەفەرەماندا دووچاری ماندوویی‌و زەحمەت بووین)، گەنجەکەش پێی وت: ﴿ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ ﴾ واتە: (ئایا لەبیرتە کاتێ چووینە پەنا بەردەکە بۆ (پشوودان) بە ڕاستی من ماسیەکەم لەوێ لەبیر کرد)، واتە: ئایا نەتزانی کاتێ کە شەو پشووماندا لە پەنای بەردەکەدا ئەو بەردەی کە لەلای هەردووکیان ناسراو بوو، ﴿ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾ (بە ڕاستی من لەوێ ماسیەکەم لەبیر کرد، هیچ شتێک ئەو ماسیەی لەبیر نەبردمەوە کە بۆت باس بکەم جگە لە شەیتان)، چونکە ئەو هۆکار بوو لەوەدا، ﴿ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴾ (واتە: کاتێ ڕێی گرتە بەر بۆ ناو دەریاکە چووە ناویەوە، ئەمە یەکێ بوو لە شتە سەرسووڕهێنەرەکان).

ڕاڤەزانان دەڵێن: ئەو ڕێگا برینە بۆ ماسیەکە ڕۆیشتن بوو بۆ ناو دەریاکە، وە بۆ مووسا (عليه السلام) و گەنجەکەش جێی سەرسوڕمان بوو، کاتێ گەنجەکە ئەم قسەیەی وت، مووسا (عليه السلام) پەیمانی لە خوا وەرگرتبوو لە هەر شوێنێکدا ماسیەکەیان ون کرد لەو

شـوێنەدا (خضر) دەدۆزنەوە، جا مووسـا ﷺ فەرمـووی: ﴿ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِ ﴾ واتە: ئەوەمان دەویسـت ﴿ فَٱرۡتَدَّا ﴾ واتە: گەڕانـەوە ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴾ واتە: بەو شـوێنەی لێیەوە هاتبـوون كـە ماسـییەكەیان تێیـدا ون كردبـوو، كاتێ گەیشـتن بـەو شـوێنە بەندەیەك لە بەندەكانـی ئێمەیـان بینـی، ئەویـش (خـضر) بوو ئـەو پیاوێكی چـاك بوو پێغەمبـەر نەبوو، لەسـەر بۆچوونی ڕاسـتو دروست.

﴿ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا ﴾ واتـە: (خـوا ڕەحمەتی تایبەتـی پێدابوو) بەوە زانسـتی زیادی كردبـوو كردەوەیشـی چاك بووبوو ﴿ وَعَلَّمۡنَٰهُ ﴾ (شـارەزامان كـرد) ﴿ مِن لَّدُنَّا ﴾ واتە: (لـە لایـەن خۆمانـەوە) بە زانیـاری تایبـەت، ئەوەندە زانیـاری پێدرا بوو كە بە مووسـا ﷺ نەدرابـوو، ئەگەرچـی مووسـا ﷺ لـە زۆر شـتدا لەو شـارەزاتر بوو، بـە تایبەت لە زانسـتە ئیمانـیو بنچینەییـەكان، چونكـە یەكێـك بـوو لـە پێغەمبەرانـی خـاوەن (عـزم)، ئەوانەی كـە خـوا فەزڵـی پێدابوون بە سـەر هەمـوو دروسـتكراوەكاندا بە زانسـتو كـردەوەو جگە لەوانـەش، كاتـێ مووسـا ﷺ پێی گەیشـت، بە ئـەدەبو ڕێزەوە پرسـیاری لەو شـتە كرد كـە پێویسـتیەتی، لێـی پرسـی: ﴿ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴾ (واتە: ئایا شـوێنت بكـەوم بـۆ ئـەوەی فێرم بكـەی لەوەی كە خـوا فێری كـردووی)، كە بەو زانسـتە ڕێنمایـیو هیدایەتـت وەرگرتـووە، هەقت پێی ناسـیووە لە زۆر مەسـەلەدا؟ وە خوای گەورە بەخشـیبووی بـە خـضر جۆرێ لـە ئیلهـامو كەرامەت، تـا بەوانە ئاگـادار بوو بەسـەر زۆرێ لـە نهێنـی شـتەكاندا، تەنانـەت بـەلای مووساشـەوە شـاراوە بـوو، جا (خـضر) بە مووسـای فەرمـووی: بـەڵام تـۆ: ﴿ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴾ واتە: هەرگیـز ناتوانی لەگـەڵ مندا خۆت بگـری، چونكـە شـتانێك دەبینی ناتوانـی خۆت لـە بەرانبەریـدا ڕابگری، لـەو كاروبارانەی كـە بـە ڕووكـەش خراپن، بـەڵام لـە ناوەڕۆكدا بـەو جۆرە نیـە، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتی: ﴿ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴾ واتـە: تـۆ چـۆن خـۆت دەگـری لەسـەر شـتێ، كە دەوری پەنهـانو ئاشـكرایت نـەداوە، وە مەبەسـتو دەرەنجامی ئەو شـتە نازانی؟!

مووسـا ﷺ فەرمـووی: ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴾ (واتە: ئەگەر خـوا بیـەوێ بـە خۆڕاگـری دەمبینـی، وە سـەرپێچی لە هیـچ فەرمانێكـت ناكـەم) ئەمەش سـوور بوونـی مووسـا ﷺ بـوو پێش ئـەوەی ئەو شـتە ببینـێ كە پێـی تاقـی دەكرێتەوە، سـوور بـوون شـتێكە، ئارامگرتنیـش شـتێكی دیكەیە، لەبـەر ئەمەیـە مووسـا ﷺ ئارامی نەگرت كاتـێ شـتەكە ڕوویدا.

لەو کاتەدا (خضر) پێـی وت: ﴿ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾ واتـە: (ئەگـەر شـوێنم کەوتـی) ڕاسـتەوخۆ پرسـیارم لێ مەکـەو نکوڵـی لەو شـتانە مەکە کـە ئەنجامیـان دەدەم، تـا خـۆم هەواڵی ئـەو کارانەت پـێ دەدەم، لـەو کاتەی کە پێویسـتە بیزانـی، (خـضر) قەدەغـەی کرد کە مووسـا ؈ پرسـیاری لێ بـکات، وە پەیمانیشـی پێدا کـە حەقیقەتـی شـتەکانی پـێ بڵـێ، ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا ﴾ (ئنجا بە یەکەوە ڕۆیشـتن تا سـواری کەشـتیەک بـوون، بەندە چاکەکە کەشـتییەکەی کـون کرد)، واتـە: لەوحەیـەک لـە لەوحەکانـی کەشـتیەکەی لێکـردەوە، لـەوەدا مەبەسـتێکی هەبـوو، بـەم نزیکانـە ڕوونـی دەکاتـەوە، مووسـا ؈ خـۆی ڕانەگـرت، چونکـە بەڕووکـەش وا دەردەکـەوێ کـە ئـەوە کارێکـی خراپـەو دەبێتە ناتـەواوی بـۆ کەشـتیەکە، وە هۆکارێک بـوو بـۆ نووقـم بوونـی خەڵکەکەی، لەبـەر ئەمە مووسـا ؈ فەرمـووی: ﴿ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا لِقِينَا ﴾ (واتـە: کەشـتییەکەت کـون تێکـرد بـۆ ئـەوەی سەرنشـینانی نـاوی نغرۆ بکـەی، بە ڕاسـتی کارێکی زۆر ناشایسـتەت کرد) واتـە: کارێکی زۆر ناشـرینت کـرد، ئەمـەش بـە هـۆی ئـارام نەگرتنیەوە بـوو ؈، خـضر پێـی فەرموو: ﴿ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ (واتـە: ئایـا مـن نەمووت: تۆ هەرگیـز ناتوانی خۆت بگـری لەگـەڵ منـدا) واتـە: چۆنـم پـێ وتیت بـەو شـێوەیە ڕوویـدا، مووسـا ؈ ئەمەی بیـر چوو بـوو، جـا فەرمـووی: ﴿ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴾ واتە: کارەکـەم (فێـر بوونـی ئەم زانیاریـەم) لەسـەر قورس مەکـە، لێم ببـورە، بێگومـان ئەوە بە هـۆی لـە بیـر چوونـەوەوە ڕوویدا، ئەمـە یەکەمجـارە لێـم مەگرە، دوو شـتی پێکـەوە کۆ کـردەوە: دانپێدانـانو بیانـوو بـۆ هێنانـەوە، بێگومـان ڕەوا نیە بۆ تـۆ ئەی خـضر توونـد بیت لەگـەڵ هاوڕێیەکەتـدا، بۆیـە خضریش لێـی بووری.

﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا ﴾ واتـە: (ئنجـا بـە ڕێکەوتـن تـا گەیشـتنە تـازە لاوێکـی)، منداڵـی بچـووک ﴿ فَقَتَلَهُ ﴾ خـضر کوشـتی، مووسـا ؈ زۆر تـوورە بـوو، دەمارگیری بـۆ ئایـن گرتی، کاتـێ ئەو منداڵـە بێ تاوانـەی کوشـت ﴿ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴾ (مووسـا وتـی: کەسـێکی پاکـی بـێ گوناهت هەروا کوشـت، بە ڕاسـتی کارێکـی زۆر خراپو نارەوات کـرد)، واتـە: چ گوناهێک لەوە خراپتـرە منداڵێکی بچووکـی بـێ تـاوان بکوژی کە کەسیشـی نەکوشـتبێ؟!

قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن
سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا
﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا
أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ
قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي
وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا
السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ
أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا
الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا
وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ
رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ
وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن
يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ
وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾
وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾

یەکەم جار مووسا (عليه السلام) بیری چوویەوە، بەڵام ئەم جارە بیر چوونەوە نەبوو، بەڵکو ئارامی نەگرت، خضر پێی وت: وەک سەرزەنشت کردنو وەبیرهێنانەوە: ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾؟! مووسا (عليه السلام) پێی فەرموو: ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ﴾ (ئەگەر پرسیارم لێکردی) دوای ئەم جارە ﴿فَلَا تُصَاحِبْنِي﴾ واتە: (ئەوە هاوڕێتیم مەکە) ئەوکات تۆ پاساوت هەیە بە وازهێنان لە هاوڕێتیم، ﴿قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا﴾ واتە: ئەوە بە ڕاستی لەلایەن منەوە تۆ عوزرت هەیەو هیچ کەمتەرخەمیت نەکردوە، ﴿فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا﴾ (واتە: بە ڕێکەوتن تا گەیشتنە لای خەڵکی شارێک) داوای میوانداریيان لێ کردن، بەڵام ئەوان میوانداریيان نەکردن، ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ (دیوارێکیان بینی) عەیبدار بوو، خەریک بوو بڕوخێ، ﴿فَأَقَامَهُ﴾ خضر دیوارەکەی چاک کردەوە، دووبارە سەر لە نوێ دروستی کردەوە.

جا مووسا (عليه السلام) پێی وت: ﴿لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ (ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەری وەردەگرت)، واتە: خەڵکی ئەم شارە میوانداریان نەکردین، لەگەڵ ئەوەدا پێویست بوو لەسەریان میوانداریمان بکەن، تۆش دیوارەکە چاک دەکەی بەبێ کرێ، لە کاتێکدا دەتوانیت کرێش وەربگریت؟! جا ئەو کاتە مووسا (عليه السلام) وەفای نەکرد بەو پەیمانەی کە پێی دابوو، خضریش بیانووی بە دەستەوە بوو، بۆیە بە مووسای وت: ﴿هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾ واتە: تۆ ئەوەت کردە مەرج بەسەر خۆتەوە، ئێستا هیچ بیانوویەکت نەماو هاوڕێیەتیشمان جێگای نەما ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ واتە: ئاگادارت دەکەمەوە بەوەی ئینکاریت لەگەڵم کرد، وە هەواڵیشت دەدەمێ کە مەبەستی من لەوانەدا چی بووە، وە چۆنیش لێکدەدرێتەوە.

﴿أَمَّا السَّفِينَةُ﴾ (بەڵام کەشتیەکە) کە کونم کرد، ﴿فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ﴾

(هی چەند کەسێکی هەژار بوو، ئیشیان دەکرد لە دەریادا) ئەمەش نەرمو نیانیو سۆزو بەزەیی پێویست دەکات بۆیان ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴾ (ویستم بە کون کردن عەیبداری بکەم تا پادشا داگیری نەکات، چونکە لە پێشیانەوە پادشایەک هەبوو هەموو کەشتیەکی چاکی داگیر دەکرد)، واتە: ڕێگاکەیان بە تەنیشت ئەو پاشا ستەمکارەوە بوو، هەر کەشتیەکی چاک تێپەڕ ببووایە بەسەریدا، هیچ ناتەواویەکی نەبووایە، داگیری دەکردو بە زۆر دەیبرد، ویستم کونی تێبکەم، بۆ ئەوەی عەیبدار بێو ڕزگاری بێت لەو ستەمکارە.

﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَـٰمُ ﴾ (واتە: بەڵام ئەو منداڵەی) کە کوشتم ﴿ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ﴾ (واتە: ئەوە باوکو دایکی ئیماندار بوون جا ئێمەش ترساین خۆشەویستی ئەو لاوە پاڵیان پێوە بنێت)، ئەو منداڵە لە قەزاو قەدەریدا هاتبوو، ئەگەر پێبگات، ئەوە باوکو دایکی تووشی کوفرو زێدەڕەوی دەکات، یان لەبەر خۆشەویستیان بۆی، یان لەبەر پێویستیان پێی، یان لە سنووریان دەر دەکات، لەبەر ئەوە کوشتم چونکە ئەوانەم دەزانی، بۆ ئەوەی ئاینی دایکو باوکە ئیماندارەکەی پارێزراو بێ، چ سوودێک لەم سوودە گەورەترە؟ ئەگەرچی تاوانیش بوو بەرانبەریانو دابڕانی نەوەکەیان لێیان، ئەوە بێگومان خوا ﷻ نەوەیەکیان پێدەدا کە چاکترە لەو منداڵە، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾ واتە: (جا ویستمان پەروەردگاریان لە بری ئەو بۆیان بگۆڕێت بە منداڵێکی چاکتر لەو پاکتر لە گوناه) واتە: منداڵێکی چاکی پاک، خاوەن ڕەحمو سۆز، بێگومان ئەو منداڵەی کە کوژرا، ئەگەر گەورە بووایە ئەوە بە توندترین شێوە سەرپێچیانی دەکرد، بە جۆرێک تووشی کوفرو لە سنوور دەرچوونیانی دەکرد.

﴿ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ ﴾ ئەو دیوارەی کە چاکم کردەوە ﴿ فَكَانَ لِغُلَـٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَـٰلِحًا ﴾ (هی دوو منداڵی هەتیو بوو لە شارەکەدا، لە ژێریدا گەنجینەیەک هەبوو کە هی دوو منداڵەکە بوو، وە باوکی ئەو دوو منداڵە چاکو خواناس بوو)، واتە: حاڵی ئەو دوو منداڵە سۆزو بەزەییو میهرەبانی دەخوازێ، چونکە منداڵنو باوکیان نەماوە، هەروەها خوا ﷻ پاراستوویانێتی لەبەر چاکی باوکیان، ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا ﴾ واتە: لەبەر ئەمە دیوارەکەم ڕووخاند، وە ئەو گەنجینەش لە ژێریدا بوو بۆیانم دەرهێنا هەر بە خۆڕایی، ﴿ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾ واتە: ئەم کارەی کە کردم ڕەحمەتێکە لە لایەن پەروەردگارتەوە، خوا بەخشیویەتیە بەندە چاکەکەی خۆی خضر ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ﴾ (بە فەرمانی خۆم ئەو کارەم نەکردوە) لە لایەن نەفسی خۆمو بە ویستی خۆم، بەڵکو

ئەوە ڕەحمەتی خواو فەرمانی ئەوە ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی كە بۆم شیكردیتەوە، ﴿تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ (نهێنیو هۆی ئەو كردەوانە بوو كە تۆ توانای خۆگرتنت نەبوو لەسەریان).
لەم چیرۆكە سەرسوڕهێنەرو گەورەیەدا كە پڕە لە چەندین سوودو بڕیارو یاساكان، بە پشتیوانی خوا هەندێكی لێرەدا باس دەكەین:

## (چەند سوودێك كە لەم بەسەرهاتە وەردەگیرێن)

یەكەم: فەزڵو چاكەی زانست، وە گەشتكردن لە پێناو بەدەستهێنانی، بێگومان ئەوە لە گەورەترین كارەكانە، چونكە مووسا ﷺ ڕێگایەكی دووروو درێژی بڕی، وە تووشی ناڕەحەتیو زەحمەتی بوو لە پێناو بەدەستهێنانیدا، وازی هێنا لە مانەوە لە ناو نەوەكانی ئیسرائیلدا بۆ فێركردنو ئامۆژگاری كردنیان، لە بەرانبەردا سەفەرو گەشتی هەڵبژارد بۆ زانستێكی زیاتر.
دووەم: دەستپێكردن لە گرنگەوە بۆ گرنگتر، بێگومان زیاد بوونی زانست گرنگترە لە وازهێنان لە گەلو نەتەوە، وە وازهێنان لە خۆسەرقاڵكردن بە فێركردنی خەڵك بەبێ ئەوەی زانستی خۆت زیاد بكات، كۆكردنەوە لە نێوان فێربوونو فێركردندا تەواوترە.
سێیەم: دروستە مرۆڤ خزمەتكاری هەبێ لە شوێنی خۆیو گەشتكردندا، بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتیدەرو مایەی پشوودان، وەك ئەوەی مووسا ﷺ كردی.
چوارەم: ئەو كەسەی گەشتو سەفەر دەكا بۆ بەدەستهێنانی زانست یان جیهادكردن، یان هاوشێوەی ئەوانە، ئەگەر بەرژەوەندی وای خواست هەواڵ بدا بە مەبەستەكەیو ئەو شوێنەیشی دەیەوێ، بێگومان ئەوە تەواوترە لە شاردنەوەی، چونكە لە ئاشكراكردنیدا سوودێكی زۆر هەیە لە خۆ ئامادەكردنو بەجێهێنانی كارەكە بە شێوەیەكی دروست، وە ئاشكراكردنی ئەو پەرستشە گەورەیە، هەروەك مووسا وتی: ﴿لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾ وە هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیداوە بە هاوەڵەكانی لە كاتی جەنگی تەبوكدا، عادەتو نەریتی خۆی وابوو لەو حاڵەتانەدا شاردنەوەو پەنهانیی هەڵدەبژارد، ئەمەش لەبەر ڕەچاو كردنی بەرژەوەندیی.
پێنجەم: شەڕو خراپەو هۆكارەكانی بدرێتە پاڵ شەیتان لە ڕووی ڕازاندنەوەو جوانكردنی خراپەكان بۆ خەڵكی، ئەگەر چی هەموو بە قەزاو قەدەری خوایە، وەكو گەنجەكەی لای مووسا ﷺ وتی: ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾
شەشەم: دروستە مرۆڤ هەواڵ لەو شتانە بدات كە سروشتی نەفسو دەروون دەیخوازێ، لە

نارەحەتی، یان برسێتی، یان تینوێتی، بە مەرجێک لە رووی نارەزاییو تورەییەوە نەبێو راستیش بکات، چونکە مووسا وتوویەتی: ﴿لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾

حەوتەم: چاکتر وایە خزمەتکاری ئادەمیزاد زیرەکو ورياو چاوکراوە بێ، بۆ ئەوەی کارەکەی بە تەواوی بۆ بەجێبهێنێ.

هەشتەم: چاکتر وایە مرۆڤ ئەوەی خۆی لێی دەخوا هەر لەو خواردنە بە خزمەتکارەکەی بدات، وە هەردووکیان بە یەکەوە نان بخۆن، چونکە رووکەشی دەقەکە، ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا﴾ دانەپاڵە بۆ لای هەمووان مووساو خزمەتکارەکەی پێکەوە نانیان خوارد.

نۆیەم: یارمەتیو پشتیوانی دادەبەزێ بۆ سەربەندە بە پێی ئەنجامدانی فەرمان پێکراوەکان, ئەوەی فەرمانەکانی خوا جێبەجێ دەکات بە جۆرێک یارمەتی دەدرێ کە غەیری خۆی بەو جۆرە یارمەتی نادرێت ﴿لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەو گەشتەی کە لە دوای بە یەک گەیشتنی دوو دەریاکە، بەڵام گەشتی یەکەمیان بۆ لای شوێنی بە یەکگەیشتنی دوو دەریاکە گلەیی ماندووبوونی نەکرد لەگەڵ ئەوەی رێگاکە دوورو درێژ بوو، چونکە ئەوە گەشتی راستەقینە بوو، بەڵام ئەمەی دوایی وادەردەکەیو چەند ساتێکی رۆژ بوو، چونکە ئەوان ماسیەکەیان بیرچووبوو کاتێ لە پاڵ بەردەکەدا پشوویان دا، وە وادەردەکەوێ ئەوان لەوێ خەوتبن، پاشان لە دوای بەرەبەیان دەرچووبێتن، تا کاتی نانخواردنی بەیانی هات، مووسا ﷺ بە گەنجەکەی وت: ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا﴾ واتە: (خواردنەکەمان بۆ بێنە)، ئەو کات بیری کەوتەوە، لەو شوێنەدا بیریان چووە کە کۆتا شوێنی مەبەستیان بووە.

دەیەم: ئەو بەندەی کە مووسا ﷺو گەنجەکەی پێی گەیشتن، پێغەمبەر نەبوو، بەڵکو بەندەیەکی خواناسو چاکەخواز بوو، چونکە وەسفی کردوە بە بەندایەتی، وە باسی منەتی خوای کردوە بەسەریەوە بە میهرەبانیو زانست، باسی پەیامو پێغەمبەرایەتیەکەی نەکردوە، خۆ ئەگەر پێغەمبەر بووایە ئەوە بێگومان باسی دەکرد، هەروەکو چۆن باسی غەیری ئەوەی کردوە.

بەڵام وتەی خوا ﷻ لە کۆتایی چیرۆکو بەسەر هاتەکەدا: ﴿وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِي﴾ ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی ئەو پێغەمبەر بووە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئیلهامو شت خستنە ناو دڵ لەلایەن خواوە، هەروەکو چۆن بۆ غەیری پێغەمبەرانیش ئەوە هەیە، وەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِ ۝٧﴾القصص، (واتە: وەحیمان کرد بۆ دایکی مووسا کە شیری پێ بدات)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ۝٦٨﴾النحل، (واتە: وە پەروەردگارت سرووش (ئیلهامی) بۆ هەنگ کرد، کە لە چیاکاندا

خانوو بۆ خۆت دروست بکە).

یازدە: ئەو زانستەی خوا فێری بەندەکانی دەکات دوو جۆرە: جۆرێکیان بە دەستی دێنێ بە ماندووبوونو هەوڵو کۆشش، جۆرێکیشیان خوا ﷻ پێی دەبەخشێ بۆ هەر یەکێک لە بەندەکانی بیەوێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَعَلَّمْنَـٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾.

دوازدە: ئەدەب نواندن لەگەڵ مامۆستا، وە نواندنو قسەکردنی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەی بەوپەڕی ئەدەبو نەرمو نیانیەوە، چونکە مووسا ﷺ وتی: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ بە شێوەی پرس پێکردنو ڕاوێژەوە قسەکەی دەردەبڕێ، ئایا تۆ لەمەدا ڕێگام پێ دەدەی یان نا؟ وە دانیشی بە وەدانا کە دەیەوێ فێری زانست بێ، بە پێچەوانەی ئەو شێوازەی کە خەڵکانی وشک یان لووت بەرز لەسەرین، ئەوەی وا خۆی دەرناخات بۆ مامۆستاکەی کە پێویستی بە زانستەکەیەتی، بەڵکو دەڵێ هەردووکمان یارمەتیدەری یەکین، بەڵکو هەندێجار وا گومان دەبا ئەو مامۆستاکەی فێر بکات، بە ڕاستی ئەوە جاهیلو نەفامە، جا زەلیلیو خۆ بە کەم زانین بۆ مامۆستاو دەرخستنی ئەوەی پێویستی بە زانستەکەیەتی لە چاکترینی شتەکانی بۆ فێرخواز.

سێزدە: خۆبەکەم دانانی خاوەن فەزڵو پلەو پایە بۆ زانستی کەسێک کە لە خوار ئەوەوە بێت، چونکە بێگومان مووسا ﷺ چاکتر بوو لە خضر.

چواردە: هەوڵدانی کەسی زانای خاوەن پلەو پایە بەدوای زانستدا، کە لەو بوارەدا ڕاهێنانی نەکردبێو ئەزموونی نەبێ، بۆ لای کەسێک کە لەو بوارەدا شارەزایەو ڕاهێنانی کردوە، ئەگەرچی لەڕووی زانستەوە بە چەندین پلە لەو خوارتر بێ.

چونکە مووسا ﷺ یەکێک بوو لە پێغەمبەرانی خاوەن عەزم، خوا زانستێکی وای پێداوە کە نەیداوە بە غەیری خۆیان، بەڵام لەم زانستە تایبەتەدا ئەوەی لای خضر بوو لە لای مووسا ﷺ نەبوو، لەبەر ئەمە مووسا سوور بوو لەسەر وەرگرتنی ئەو زانستە لێیەوە.

لەسەر ئەمە نابێت کەسێکی شارەزای فەرموودەناس ئەگەر کەمو کوڕی هەبوو لە زانستی (نحو) یان (صرف) یان هاوشێوەی ئەوانە لە زانستەکان، نەچێتە لای ئەو کەسانەی لەم شارەزاترن لەم بوارە، با ئەو کەسە فەرموودەناسو فەقیە نەبێ.

پازدە: دانەپاڵی زانستو غەیری زانست لە فەزڵو چاکەکان بۆ لای خوا ﷻ، وە دانپێدانان بەوەو سوپاسگوزاری خوا لەسەری، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ ﴾ واتە: لەوەی خوا ﷻ فێری کردووی.

شازدە: زانستی بە سوود ئەو زانستەیە كە ڕێنمایی (خاوەنەكەی) دەكات بۆ چاكە، جا هەر زانستێک ژیریو ڕێنمایی تێدا بوو بۆ ڕێگای خێروو چاكە، وە ئاگادار كردنەوەیشی تێدا بوو، لە ڕێگاكانی شەڕو خراپە، یان هۆكارێک بوو بۆ ئەو مەبەستە ئەوەیش لە زانستە بە سوودەكانە، جگە لەوە یان ئەوەیە زیانبەخشە، یان ئەوەیە هیچ سوودێكی تێدانیە، ﴿ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾.

حەڤدە: بێگومان ئەو كەسەی هێزی ئارام گرتنی نیە لە ڕێگای هاوڕێیەتی زاناو زانستدا، وە بە جوانی پابەند نابێ پێیەوە بێگومان زانستێكی زۆری لە دەست دەچێ بە گوێرەی ئارام نەگرتنی، جا هەر كەسێک خۆڕاگر نەبێ زانستیشی دەست ناكەوێ، وە هەر كەسێک خۆڕاگربێو ئارامگرتن بەكاربهێنێ ئەوە بێگومان دەگات بە هەموو ئەو شتانەی كە هەوڵی بۆ داوە، ئەمەش لەو قسەی خضر وەرگیراوە كە هۆكاری ئەوەی بە مووسا ڕاگەیاند لەبەرچی ناتوانێ زانستی لێ وەربگرێ ئەویش لەبەر ئەوەیە كە مووسا ناتوانێ صەبر بگرێ لەگەڵیدا.

هەژدە: گەورەترین هۆكار بۆ بەدەستهێنانی ئارامی، ئەوەیە مرۆڤ بە زانستو ئەزموون دەوری ئەو كارە بدا كە فەرمانی پێكراوە خۆڕاگربێ لەسەری، ئەگەرنا هەر كەس نەزانێ بۆ دەخوێنێو یان ئامانجو دەرەنجامو سوودو بەرهەمەكەی نەزانێ، ئەوە ناتوانێ لەسەری ئارام بگرێ، لەبەر فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾ هۆكاری ئەوەی پێ دەڵێ كە بۆچی ناتوانێ ئارام بگرێ، وە نەبوونی شارەزایی تەواوی بەو كارانە.

نۆزدە: فەرمانكردن بە لەسەرخۆبوونو چەسپاوی، وە پەلەنەكردن لە بڕیاردان بەسەر شتێكدا هەتا شارەزای مەبەستو ناوەڕۆكی دەبێ.

بیست: بەستنەوەی كاروبارەكانی داهاتوو -كە لە كردەوەی مرۆڤەكانن- بە ویستو مەشیئەتی خوا، وە نابێ مرۆڤ بە شتێک بڵێ: من ئەو كارە دەكەم لە داهاتوودا، بەڵكو دەبێ بڵێ: ﴿ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾.

بیستو یەک: سوور بوون لەسەر ئەنجامدانی كارێک، وەكو ئەنجامدانی ئەو شتە نیە، چونكە بێگومان مووسا ﷺ وتی: ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا ﴾ بڕیاری لەسەر ئارامگرتندا، بەڵام ئەنجامی نەدا.

بیستو دوو: مامۆستا ئەگەر بە بەرژەوەندی زانی لە ڕێگرتنی قوتابیەكەی، لەوەی دەسپێشخەری بكات لە پرسیار كردن دەربارەی هەندێ شت، هەتا مامۆستا لە كاتی خۆیدا هەڵوەستە بە قوتابیەكەی دەكات، بێگومان بەرژەوەندی دەبێ ڕەچاوو بكرێ لەم مەسەلەیەدا، هەروەها

ئەگەر قوتابییەكە لە ڕووی تێگەیشتنەوە پێنەگەیشتبێ، یان قەدەغەی لێ بكات لە هەندێ پرسیاری وردو درشت، كە غەیری ئەوە لە پێش ترە، یان پرسیارێک بكات، پەیوەندی بە بابەتەكەوە نەبێ.

بیستو سێ: چوونە ناو دەریا دروستە، جگە لەو كەسەی كە ترسی لە چوونە نێو دەریا هەیە.

بیستو چوار: ئەو كەسەی شتێكی بیر دەچێ تاوانبار نابێ بە هۆی بیرچوونەوەكەی، نە لە هەقی خوادا، نە لە هەقی ئادەمیزادا، چونكە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ﴾.

بیستو پێنج: پێویستە لەسەر مرۆڤ لە مامەڵەو كاروبارەكانی خەڵكیدا لێبوردەیی هەڵبژێرێت، نابێ شتێک بخاتە ئەستۆیان لە توانای ئەواندا نەبێ، یان قورسو گران بێ بە سەریانەوەو ماندوویان بكات، چونكە ئەمە دەبێتە مایەی دووركەوتنەوەو بێزار بوون لێی، بەڵكو ئاسانترین هەڵدەبژێرێ، بۆ ئەوەی كارەكەی بۆ ئاسان بێ.

بیستو شەش: بێگومان كاروبارەكان بە پێی ڕواڵەتیان حوكمو بڕیاریان لەسەر دەدرێ، وە بڕیاری دونیاییش بەوەوە پەیوەست دەبن، لە ماڵو خوێنو غەیری ئەوانیش، بێگومان مووسا ﷺ نكوولی كرد لە خضر لە كونكردنی كەشتیەكەو كوشتنی منداڵەكە، ئەم كاروبارانەیش بە پێی ڕووكەشیان، یەكێكن لە خراپەكاریەكان، لە بەرانبەردا مووسا ﷺ ناتوانێ بێدەنگ بێت، جگە لەم حاڵەتە نەبێ كە لەگەڵ خضر دایە، مووسا ﷺ پەلەی كرد لەمەدا، وە دەستپێشخەری كرد لە بڕیارداندا لە حاڵەتە گشتیەكە، ڕووی بە لای ئەوەوە نەكردەوە كە ئەو حاڵەتە جیایە، دەبێ خۆڕاگر بێ لەسەری، وە دەستپێشخەری نەكات بۆ نكوولی كردن.

بیستو حەوت: بنچینەیەكی گەورەو گرنگ ئەویش بریتیە لە: (خراپەیەكی گەورە لادەدا بە هۆی ئەنجامدانی خراپەیەكی بچووک)، وە ڕەچاوی گەورەترین ئەو دوو بەرژەوەندیە بكرێ بە لە دەستدانی بچوكترینیان، بێگومان كوشتنی منداڵەكە شەڕو خراپە بوو، بەڵام مانەوەی تا باوكو دایكی تووشی فیتنە بكات لە ئاینەكەیاندا شەڕەكەی مەزنترو گەورەترە، وە مانەوەی منداڵەكە بەبێ كوشتن، وە پارێزگاری لێكردنی، ئەگەر چی وا گومان ببرێ ئەوە خێرو چاكە، بەڵام خێر لەوەدایە ئاینی باوكو دایكیو ئیمانەكەیان پارێزگاری لێ بكرێ، لەبەر ئەوە خضر منداڵەكەی كوشت، ئەم یاساو بنچینەیە لقو پۆو سوودو وەدەستهاتوویەكی زۆری تێدا جێ دەبێتەوە، كە هەرگیز ناتوانرێ كورت هەڵبهێنرێ، هەموو بەرژەوەندیو خراپەكان كۆ دەبنەوە تیایدا.

بیستو هەشت: هەروەها بنچینەیەكی دیكەی گەورەی تێدایە ئەویش: (دروستە مرۆڤ ماڵی

جگە لە خۆی بەکاربێنێ ئەویش لە ڕووی بەرژەوەندیو لابردنی خراپەکاری لەسەر ئەو ماڵە، ئەگەرچی پرسیشی پێنەکات، تەنانەت ئەگەر بە هۆی کارەکەیەوە هەندێ لەو ماڵەی لە دەست بچێ)، هەر وەکو چۆن خضر کەشتیەکەی کون کرد بۆ ئەوەی لەکەداری بکاتو پارێزراو بێ لە دەست بەسەرداگرتنی لەلایەن پاشاکە، جا لەسەر ئەمە ئەگەر سوتانێک، یان خنکاو نوقم بوونێک، یان وێنەی ئەوانە ڕوو بدات، لە ماڵی مرۆڤێکدا، یان لە ماڵی خۆیدا، لەناوچوونی هەندێ لە ماڵەکە، یان ڕووخانی هەندێکی ببێتە مایەی پاراستنی ئەوانی دیکە، دروستە بۆ مرۆڤ ئەنجامی بدات، شەریعەت ڕێگەی پێی داوە، ئەویش بە هۆی پاراستنی ماڵی جگە لە خۆی، بەهەمان شێوە پیاوێکی ستەمکار ویستی ماڵو سامانی کەسێ ببات، وە کەسێک هەستا هەندێ لەو ماڵەی پێدا، بۆ ئەوەی باقیەکەی دیکەی نەکەوێتە دەست ئەو ستەمکارە، دروستە ئەگەر چی مۆڵەتیش لە خاوەن ماڵەکە وەرنەگرێ.

بیستو نۆ: کارکردن لە دەریادا دروستە، وەکو کارکردن لە وشکانی، چونکە فەرموویەتی: ﴿ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ ﴾ نکوڵی لە کارەکەیان نەکرد.

سی: دەگونجێ هەژار هەندێ ماڵی هەبێ بەشی پڕ کردنەوەی پێویستیەکانی نەکات، ئەو ماڵە نەبێتە مایەی ئەوە لە هەژاری دەری بکات، چونکە خوا ﷻ هەواڵی داوە ئەو هەژارانە، خاوەن کەشتی بوون.

سیو یەک: بە ڕاستی کوشتن لە تاوانە گەورەکانە، لەبەر وتەی مووسا ﵇ لە کوشتنی منداڵەکەدا: ﴿ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ﴾.

سیو دوو: بێگومان کوشتنی تۆڵە سەندنەوە تاوان نیە، وەک دەفەرموێ: ﴿ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ ﴾.

سیو سێ: پیاوی چاک خوا ﷻ دەیپارێزێ لە فیتنەی نەفسیو خۆیو ماڵو منداڵی.

سیو چوار: خزمەت کردنی پیاوچاکان، یان ئەوانەی پەیوەستن پێیانەوە، چاکترە لە غەیری ئەوان، چونکە هۆکارو عیللەتی دەرهێنانی گەنجینەکەو چاککردنەوەی دیوارەکە هەمووی لەبەر ئەوە بوو کە باوکەکەیان پیاو چاکو صالح بوو.

سیو پێنج: پێویستە مرۆڤ لەگەڵ خوادا بە ئەدەب هەڵسوکەوت بکات لە کاتی قسەکردنیدا، ئەوەتا خضر لەکەدار کردنی کەشتییەکە دەداتە پاڵ نەفسی خۆی، وەک دەڵێ: ﴿ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا ﴾ بەڵام خێرو چاکە دەداتە لای خوای گەورە وەک دەڵێ: ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾ هەروەک چۆن ئیبراهیم ﵇ فەرمووی: ﴿ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ٨٠ ﴾الشعراء، (واتە: وە کاتێ نەخۆش کەوتم هەر ئەو

شیفام دەدا)، وە جنەكان وتیان: ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾الجن، (واتە: وە بەڕاستی نازانین كە ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی كە لەسەر زەوین، یان پەروەردگاریان ڕێنمایی ویستووە بۆیان)، لەگەڵ ئەوەدا هەمووی بە قەزاو قەدەری خوایە.

سی‌و شەش: پێویستە برادەر لە هاوەڵەكەی خۆی جیانەبێتەوە لە حاڵەتێ لە حاڵەتەكاندا، وە واز لە هاوڕێیەتی كردنی نەهێنێ، ئەگەر وازیشی لێ هێنا پاساو بۆ جیا بوونەوەكەی بێنێتەوە، وەک چۆن خضر بەرانبەر مووسا ئاوای كرد.

سی‌و حەوت: بێگومان گونجان‌و هاوڕابوونی هاوڕێ بۆ هاوڕێیەكەی لە غەیری ئەو شتانەی قەدەغە كراوە، هۆكارێكن بۆ بەردەوام بوون‌و مانەوەی هاوڕێیەتیەكەیان، هەر وەكو چۆن نەگونجان‌و هاوڕا بوون هۆكارێكن، بۆ پچڕانی هاوڕێیەتی.

سی‌و هەشت: ئەو ڕووداوانەی لەسەر دەستی خضر ڕوییان دەدا هەمووی قەزاو قەدەری ڕەهای خوا بوون، خوا ویستی وابوو لەسەر دەستی ئەو بەندە صالحە جێبەجێیان بكات، بۆ ئەوەی لووتف‌و بەزەیی خۆی لە بڕیارو حوكمدانیدا بە بەندەكانی پیشان بدا وەک بەڵگەیەک، هەندێ جار خوا قەزاو قەدەر بەسەر بەندەكەیدا دێنی زۆری پێناخۆشە، بەڵام بەرژەوەندی ئاینەكەی تێدایە، هەروەكو ڕووداوی منداڵەكە، یان بەرژەوەندی دونیای تێدایە، وەكو چیرۆكی كەشتیەكە، خوا ﷻ نموونەیەكی لە نەرم‌و نیانی‌و بەخشندەیی خۆی پێنیشاندان، بۆ ئەوەی بزانن‌و ڕازی ببن بە ئەوپەڕی ڕازی بوون بەو قەزاو قەدەرانەی كە ناخۆش‌و پڕ لە ئێشن.

(٨٣-٨٨): ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُواْ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ﴾:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ ﴾ خاوەن كتێبەكان، یان هاوبەشدانەران پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی چیرۆک‌و بەسەرهاتی (ذو القرنین)، خوا ﷻ فەرمانی پێكرد كە بڵێ: ﴿ سَأَتْلُواْ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾ هەواڵێكی گرنگ‌و دواندنێكی سەرسوڕهێنەری تێدایە، واتە: بۆتان باس دەكەم هەندێ لە بارودۆخی، وە ئەوەی سوودو قازانجی ئێوەی تێدایەو دەبێ بە پەندو ئامۆژگاری، بەڵام ئەوەی باس نەكراوە دیارە پەندو ئامۆژگاری تێدانیە بۆیە باسی نەكردوە،

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا
﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ
وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۗ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ
فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ
فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً
ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ
إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَۖ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرٗا ﴿٩١﴾ ثُمَّ
أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا
لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ
وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن
تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي
بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ
بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ
قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾

﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتـە: خـوا ﷻ هێـزو دەسـەڵاتی پێـدا، لـە هەمـوو ناوچەکانـی سـەر زەوی ملکەچیـان بـۆ دەنواند، ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا﴾ واتـە: خـوا هەندێ لـەو هۆکارانەی پێدابـوو بۆ گەیشـتن بەو شـتانەی کـە پێی گەیشـتبوو، هـەر بـەو هۆکارانـە زاڵ بـوو بەسـەر وڵاتو شـارەکاندا، وە بە ئاسانترین شـێوە دەگەیشـتە ئەوپـەڕی شـوێنی ئاوەدانـیو بنیاتنـان.

(ذو القرنـین) کاری بـە هەموو ئەو هۆکارانە کـرد کە خـوا پێی دابـوو، واتە: لە شـوێنی خۆیـدا بەکاریدەهێنـا، هەمـوو کەسـێک ناتوانـێ کار بـەو هۆکارانـە بـکات کە پێی دراوە، وە هەمـوو کەسـێکیش بـە توانا نیە بەسـەر هۆکاردا، جـا ئەگەر توانا بەسـەر هۆکارە حەقیقیـەکانو کارکـردن پێیـان کۆ بوویەوە ئەوە مەبەسـتەکە بە دەسـت دێ، بـەڵام ئەگەر هەردووکیـان یـان یەکێکیان نەبوو ئـەوە مەبەسـتەکە نایەتە دی.

ئـەو هۆکارانـەی خـوا بەخشـیبووی بـە (ذو القرنـین)، نـە خـوای بـەرزو نـە پێغەمبـەر ﷺ هەواڵیـان دەربـارەی ئەو هۆکارانـە پێنەداوین؟ وە هیچ هەواڵێکیش بە شـێوەیەکی ڕاسـتو دروسـت نەگەیشـتووە بـە ئێمە دەربـارەی ئەو هۆکارانـە، لەبـەر ئەمەیە هیچمان لە دەسـتدا نیـە جگـە لە بێدەنگ بـوون نەبـێ، وە مادام هیـچ هەواڵێکمان دەربـارەی ئـەو هۆکارانە پێ نەگەیشـتووە، ڕوو ناکەینـە بـاس کردنی ڕیوایەتـە ئیسـرائیلیەکانو هاوشـێوەکانیان، بەڵام ئێمـە بـە کورتـیو پوختـی دەزانیـن، ئـەو هۆکارانـە بەهێـزو مەزن بـوون، هەم لـە ڕووی ناوەکـیو هـەم دەرەکیـەوە، بـەو هۆکارانـەوە بـوو بە خـاوەن سـەربازی مەزن لـە ڕووی ژمـارەو ئامـادەو ڕێکخسـتنەوە، هەر بـەو هۆکارانـە زاڵ بوو بەسـەر دوژمندا.

هـەر بە هۆی ئەمەشـەوە توانیویەتـی بگاتە هەموو ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوای زەوی، خوا ئەو هۆکارانـەی پێدابـوو تا گەیشـتە شـوێنی ئـاوا بوونی خـۆر، تا خـۆری بینی لـە کانیاوێکدا

وەکـو ئـەوەی ئاوابـێ لـە کانیاوێکـدا کە قوڕە ڕەشـەی بـە دەوردایە، ئـەو شـێوە بینینەش شـتێکی عادەتییـە بۆ کەسـێک کـە نێوانی خۆیو ئـاوا بوونی خۆر ئـاو هەبـێ، وای دەبینێ کـە خۆرەکـە هەر لە نێـو ئاوەکـەدا ئاوا دەبـێ ئەگەر چـی زۆر بەرزییشـە ﴿ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗا ﴾ واتـە: لـە لای ئـاوا بوونـی خۆردا ڕێـی بە کۆمەڵێـک کەوت.
﴿ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴾ واتـە: یـان سـزایان بدە بە کوشـتن یـان بـە لێـدان، یـان بەدیل گرتـنو، هاوشـێوەی ئەوانە، یـان چاکەیـان لەگەڵـدا بکە، (ذو القرنـین) سەرپشـک کـرا لە نێـوان ئـەم دوو بڕیـارەدا، چونکە بـە ڕواڵـەت وا دەردەکەوێ کـە ئـەو قەومە یـان کافربوونـە یان فاسـقو تاوانبار، یان شـتێ لـەو جۆرە، چونکـە ئەگەر ئـەوان بـڕوادار بوایـەنو فاسـقو تاوانبـار نەبوایـەن، سەرپشـک نەدەکـرا لە سـزادانیاندا، بێگومـان (ذو القرنـین) خـاوەن سیاسـەتی شـەرعی بـوو، کـە شایسـتەی ئەوەیـە وەسـفو سـتایش بکـرێ، بۆیە خـوا ﷻ یارمەتیـدا بۆئەوە، جا وتـی: دەیانکەم بە دوو بەشـەوە: ﴿ أَمَّا مَن ظَلَمَ ﴾ واتە: سـتەم بکات بـە کوفر کـردن ﴿ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴾ واتـە: دوو جـار سـزا دەدرێ: سـزایەک لە دونیاو سـزایەک لـە دوارۆژ.
﴿ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ واتـە: (هـەر کـەس بڕوابێنـێو کـردەوەی چـاک بـکات) ئـەوە بەهەشـتی بـۆ هەیـە، وە حاڵی بـاش لای خـوا ﷻ پاداشـت دانەوەیە لـە ڕۆژی دواییـدا، ﴿ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴾ (واتـە: کارو فەرمانـی خۆمانـی بۆ ئاسـان دەکەیـن)، واتـە: لەگەڵیـدا چـاک دەبیـنو نەرمونیـان دەبیـن بـە قسـەکردن، وە کارو مامەڵەکانـی بـۆ ئاسـان دەکەیـن، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە (ذو القرنـین) یەکێک بـوو لـە پادشـا خوانـاسو دادپەروەرەکانی جیهـان، چونکە لـە مامەڵەکردنی لەگـەڵ هەموو کەسـێکدا، ڕەچـاوی ڕەزامەنـدی خـوای کردوە.
(٨٩-٩٨): ﴿ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرٗا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ
وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ
فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي
بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا
جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا
﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ ﴾ واتە: (پاشان ڕێگاو هۆی گەیشتنی بەو مەبەستەی دایەبەر ﴿ هەتا گەیشتە شوێنی ئاوابوونی خۆر)، دووبارە گەڕایەوە بۆ شوێنی هەڵاتنی، شوێن ئەو هۆکارانە کەوتبوو کە خوا ﷻ پێی بەخشیبوو، تا گەیشتە شوێنی هەڵاتنی خۆر، ﴿ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾ واتە: بینی خۆر هەڵدێت بەسەر خەڵکانێکدا، هیچ پەردەیەکیان نەبوو لە خۆر بیانپارێزێ، یان لەبەر ئەوەی شوێنی نیشتەجێ بوونیان بۆ خۆیان ئامادە نەکردبوو، ئەویش بە هۆی گوێ پێنەدانو وەحشی گەرێتیو نەبوونی شارستانیانەوە بوو، یان لەبەر ئەوەی خۆر بەردەوام بەسەریانەوە بوو، خۆریان لێ ئاوا نەدەبوو بە شێوەیەک شایستەی باسکردن بێ، وەک ئەوەی لە خۆر هەڵاتنی ئەفریقیای باشوور هەیە، ئنجا گەیشتە شوێنێک زانستی خەڵکی سەر زەویی پێی نەدەگەیشت، چ جای ئەوەی بەلاشە پێی گەیشتبن، لەگەڵ ئەمەدا، هەموو ئەمانە بە گوێرەی قەزاو قەدەری خواو زانستی ئەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە بوو بەسەرهاتی (ذو القرنين)، بێگومان ئێمە ئاگادار بووین بەوەی هەیبوو لە خێرو چاکەو هۆکارە مەزنەکان، وە بە زانستمان لەگەڵیدا بووین، بۆ هەر کوێ بڕوشتایەو ڕووی بکردایەتە کوێ.

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ (واتە: هەتا گەیشتە نێوانی دوو بەربەست (نێوانی دوو چیا))، ڕاڤەزانانی قورئان دەڵێن: ڕووی کردە ڕۆژهەڵات، مەبەستی گەیشتن بە باکور بوو، گەیشتە نێوانی دوو بەربەست، ئەوانەش دوو زنجیرە چیای ناسراو بوون لەو سەردەمەدا، بەربەستێ لە نێوان یەئجوجو مەئجوجو خەڵکی ئەو شوێنە، خەڵکێکی لە نزیک ئەو دوو بەربەستە بینی، لە هیچ قسەیەک تێنەدەگەیشتن (بە زمانی خۆیان نەبێ) لەبەر ناڕوونی زمانو بیرو هۆشو دڵیان، بە ڕاستی خوا ﷻ بەهرەو هۆکارێکی زانستی ئەوتۆی دابوو بە (ذو القرنين) دەیتوانی بە ئاسانی لە زمانی ئەوان تێبگاتو قسەیان لەگەڵدا بکاتو پێکەوە بدوێن، بۆیە شەکوای حاڵی خۆیان لە زەرەرو زیانی یەئجوجو مەئجوج برد بۆ لای (ذو القرنين) ئەمانە دوو ئۆممەتی مەزنی نەوەی ئادەمن، جا وتیان: ﴿ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ (بە ڕاستی یەئجوجو مەئجوج لەم خاکەدا خراپەکاری دەکەن) بە کوشتنو تالان کردنی ماڵو جگە لەوانەش ﴿ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا ﴾

واتــە: ئايـا خەرجيەكـت پـێ بدەيـن، ﴿عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا﴾ (واتــە: بـۆ ئـەوەی بەربەسـتێ لـە نێـوان ئێمــەو ئەوانـدا دروسـت بكـەی) ئەمــە بەڵگەيــە لەســەر ئــەوەی كــە خۆيــان نەيانتوانيــوە بەربەســتێک دروســت بكــەن، وە توانــای (ذو القرنين)يشــيان زانيــوە، ويسـتيان خەرجيەكـی بدەنــێ بـۆ ئــەوەی ئــەو كارەيــان بۆ بـكات، وە هــۆكاری بەربەستەكەشــيان بــۆی بــاس كــرد، ئەويــش: خراپــەكاری يەئجــوجو مەئجــوج بــوو لەســەر زەويــدا.

(ذو القرنـين) كەسـێكی تەماحــاكار نەبــوو، چــاوی نەبڕيبــووە دونيــاو زۆر تامــەزرۆی نەبــوو، وازی لــە دونيــا نەهێنابــوو لــە چــاک كردنــی حاڵــی ئەوانــەی لــە ژێــر دەســتيدا بــوون، بەڵكــو مەبەسـتی تەنهــا چاكســازی بــوو، بۆيــە وەڵامــی داواكاريەكەيانــی دايەوە، لــەوەی كــە بەرژەوەنــدی ئەوانــی تێدايــە، پاداشــتو كرێشــی لەبــری ئــەو كارەدا وەرنەگــرت، وە ســوپاس گــوزاری پەروەردگــاری كــرد لەســەر جێگيــر كردنــی هێــزو توانــای بەســەر ئــەو كارەدا، جــا پێــی فەرمــوون: ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ﴾ (ئــەو ســامانو دەســەڵاتەی پەروەردگــارم پێــی داوم چاكتــرە) واتــە: لــەوەی ئێــوە پێــم دەدەن، بەڵكــو تەنهــا داواتــان لێدەكــەم هاوكاريــم بكــەن بــە هێــزی دەســتو بازووتــان ﴿أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا﴾ واتــە: بــۆ ئــەوەی ببێتــە بەربەســت لــە پەڕينەوەيــان بــۆ لای ئێــوە ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِ﴾ واتــە: پارچــە ئاســنم بــۆ بێنــن (لەســەر يــەک دايبنێــن) ئەمەيــان پێــدا.

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ﴾ (واتــە: هەتــا نێوانــی) هــەردوو كێوەكــەی پــڕ كــردو ڕێكــی يــەک بــوون ﴿قَالَ ٱنفُخُواْ﴾ وتــی: فــوو بكــەن بــەو ئاگــرەدا، دايگيرســێنن بــە داگيرســاندنێكی مــەزن، وە هــەوای لێبــدەن تــا تــەواو مســەكەی دەتوێتــەوە، كاتــێ مســەكەی توايــەوە، كــە دەيويســت بــە نێوانــی وورده ئاســنەكانی دابــكات ﴿قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾ (ذو القرنـين) وتــی: مســی تــواوەم (بــۆ بێنــن) تــا بيكــەم بەســەريدا، بەربەســتەكە خــۆی گــرت بــە خۆگرتنێكــی بەهێــزو تۆكمــە، وە بــەو بەربەســتە ڕێگــری كــرد لــە زيانــی يەئجــوجو مەئجــوج لــە خەڵكــی.

﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾ واتـــە: هيـــچ توانايەكيـــان نەبـــوو ســەركەون بەســەريدا بــە هــۆی بەرزيەكــەی، وە نەيــان دەتوانــی كونــی بكــەن لەبــەر قايمــیو بەهێــزی، كاتــی ئــەم كارە جوانــەو شــوێنەوارە مەزنــەی تــەواو كــرد، نيعمەتــی داوە پــاڵ خــوای گــەورەو وتــی:

قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي
حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ
فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾
ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا
﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ
أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا
﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ
صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ
أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ
بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا
لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ
ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ
أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟
لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾

﴿ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾ واتــە: ئەمــە فــەزڵو چاكــەی خوایــە بەســەرمەوە.

ئەمــە حاڵی جێنشــینە خوانــاسو چاكەكانە، ئەگەر خــوا منەتی خۆی بكات بەســەریاندا، سوپاســگوزاریو پابەندبوونیــان زیاتر دەبێ، وە زیاتــر داندەنێــن بەســەر نیعمەتەكانــی خــوادا، هــەر وەكــو ســولەیمان ﷺ كاتێ عەرشــی دەســەڵاتدارو پادشای ســەبەئیان بۆ ئامــادە كرد، لەگــەڵ ئەو هەمــوو دووریەدا، وتــی: ﴿ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ﴿٤٠﴾ ﴾النمــل. (واتــە: ئەوە لــە فەزڵی پەروەردگارمــە بــۆ ئــەوەی تاقیــم بكاتەوە ئایــا شــوكرانە بژێــر دەبــم، یــان كوفرانــە بژێــر)، بە پێچەوانــەی ئەوانــەی لووتبەرزو خۆبــەزل زانــن، وە لە زەویدا خۆیان بەگەورە دەزانن، بەڕاســتی نیعمەتە گــەورەكان خراپەو خۆبــەزل زانینیــان زیاتــر دەكات، هــەر وەكــو قــاروون وتــی -كاتــێ خــوا ﷻ گەنجینەی ئاڵتــوونو زیــوی زۆری پێــدا، هەڵگرتنی كلیلەكانی ئــەو گەنجینەو قاســانە زۆر بە زەحمەت هەڵدەگیــرا بۆ كۆمەڵێكــی بەهێــز- وتــی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ ﴿٧٨﴾ ﴾ القصص. (واتــە: بێگومــان ئــەو ســامانەم پێــدراوە بەهۆی ئــەو زانیاریەوە كــە هەمە).

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي ﴾ (واتــە: جــا هــەركات بەڵێنــی پەروەردگــارم هــات) بە دەرچوونــی یەئجوجو مەئجــوج، ﴿ جَعَلَهُۥ ﴾ واتە: ئەو بەربەســتە بەهێزو مەحكەمە دەكاتــە ﴿ دَكَّآءَ ﴾ واتــە: ئەو بەربەســتە دەڕوخێنــی، لەگەڵ زەویــدا ڕێــك دەبێتەوە ﴿ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾ (واتــە: بێگومــان بەڵێنــی پەروەردگارم هەقو ڕاســتە.

(٩٩-١٠١): ﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ ﴾:

﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ﴾ (واتــە: واز لــە خەڵكی دێنین لــەو ڕۆژەدا دێنو دەچن بەنــاو یەكتــردا، وەكــو شــەپۆلی دەریــا)، دەگونجــێ لێــرەدا ڕانــاو (ضمیر) بگەڕێتــەوە بۆ

یەئجـوجو مەئجـوج، ئـەوان ئەگەر دەرچن بـۆ ناو خەڵكی -لـە زۆربوونیاندا لە سـەر زەوی- دێـنو دەچـن وەكـو شـەپۆلی نـاو دەریـا، هەر وەكـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الأنبیاء، واتـە: (ژیان درێـژەی دەبـێ) تا ئەو كاتـەی (بەربەسـتەكەی) یەئجوجو مەئجـوج دەكرێتـەوە، ئەوانیش لـە هەمـوو بەرزاییەكـەوە بە پەلـە بە (چەسـپانی) دێنـە خوارێ).

دەشـگونجێ ڕاناوەكـە (ضمیر) بگەڕێتـەوە بۆ دروسـتكراوەكان لـە ڕۆژی دواییـدا، ئەوان لـەو ڕۆژەدا كـۆ دەكرێنەوەو زۆر دەبن، لە ناخۆشـی ئـەو ڕۆژەو ئەو بوومەلـەرزە گەورەدا، هەندێكیـان بـە ناوی ئەوی دیكەدا شـەپۆل دەدەنو دێنو دەچن، بـە بەڵگەی وتەی خوا ﷻ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا ﴾ واتـە: كاتـێ ئیسـرافیل فـوو بـە صـوردا دەكات، خـوا ﷻ ڕووحـەكان دەگەڕێنێتەوە بۆ ناو جەسـتەكان، پاشـان لـە ڕۆژی دواییدا كۆیـان دەكاتەوە لە شـوێنێكدا یەكەمیـنو دواییـن، بێبڕوایانو بڕواداران، بۆ ئەوەی پرسـیارو لێپرسـینەوەیان لێ بـكات، وە پاداشـتی كردەوەكانیـان بداتەوە، بـەڵام ئەوانەی بێبـڕوان -بـە جیاوازیەكانیان- ئەوە دۆزەخ پاداشـتیانە، تیایـدا دەمێننەوە بۆ هەمیشـەیی.

﴿ وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا ﴾ (واتـە: وە لـەو ڕۆژەدا دۆزەخ پێشـانی كافـران دەدەیـن بـە پێشـاندانێكی تـەواو)، هـەروەك فەرموویەتـی: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ الشـعراء، (واتـە: دۆزەخ دەردەخرێـتو ئاشـكرا دەكرێت بۆ بێبڕوایـان)، واتە: بۆیان دەردەخـرێ بـۆ ئـەوەی ببێتە جێگـاو مەنزڵگەیـان، وە بۆ ئـەوەی چێژو لـەززەت وەربگرن بـە كـۆتو زنجیـرو گەرمیو كـوڵاویو ساردیەكەی، وە بـۆ ئـەوەی چێژ لە سـزاو تۆڵە وەربگـرن، سـزایەك دڵـەكان كوێـر دەكاتو گوێكان كـەڕ دەكات، ئەمەش شـوێنەوارو بەرهەمـی كردەوەكانیانـە، چونكە ئـەوان لە دونیـادا: ﴿ ٱلَّذِينَ كَانَتۡ أَعۡيُنُهُمۡ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكۡرِي وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ سَمۡعًا ﴾، ئەوانـەی كـە لـە دونیـادا پشـتیان كردبـوو لـە یـادو زیكری خـوای كارلەجـێو قورئانـی پیـرۆز، وە وتیـان: ﴿ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ ﴿٥﴾ ﴾ فصلت، (واتـە: دڵەكانمـان لـە نێـو چەنـد پەردەیەكدایـە (تێناگەیـن)، لـەوەی تۆ ئێمـەی بـۆ بانـگ دەكـەی)، وە لەسـەرچاویان چەندیـن پـەردە هەیـە ڕێگریـان لێدەكات لـە بینینـی ئایەتو نیشـانە بە سـوودەكانی خـوا، هەروەكـو فەرموویەتـی: ﴿ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ ﴿٧﴾ ﴾ البقرة، (واتـە: چاوەكانیـان پـەردەی بەسـەردا دراوە).

﴿ وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ سَمۡعًا ﴾ واتـە: توانایـان نیـە ئایـەتو نیشـانەكانی خوا ﷻ ببیسـتن،

كـە بـەرەو ئیمـان دەیانبـات، چونكـە ڕقیان لـە قورئـانو پێغەمبـەرە ﷺ، بێگومـان ئەوەی ڕقـی لە شـتێ بێت حـەز ناكات گوێـی لێ بگـرێ، ئەگـەر ڕێگاكانی زانسـتو خێریان لێ بگیرێـت، ئـەو كاتە بیسـتنو بینیـنو عەقڵێكیان نابێ سـوودی لێ ببینن، ئـەوكات بێگومان كوفـر بـە خوا دەكـەنو نكوولـی ئایەتەكانـی دەكـەنو پێغەمبەرانی بـە درۆ دەزانـن، ئنجا شایسـتەی دۆزەخ دەبن كـە خراپترین سـەرەنجامە.

(١٠٢): ﴿أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ١٠٢﴾:

ئەمە سـەلماندنو ڕوونكردنەوەیە بـۆ بەتاڵ كردنەوەی بانگەوازی هاوبـەش دانانو بێبڕوایان، ئەوانـەی كـە هەنـدێ لـە پێغەمبەرانو دۆسـتانی خوایـان كرد بە هـاوەڵو شـەریك لەگەڵ خـوادا دەیانپەرسـتن، وە پێیـان وابوو ئەوانـە دەبن بە پشـتیوان بۆیانو ڕزگاریـان دەكەن لە سـزای خواو پاداشـتیان دەدەنـەوە، لە كاتێكدا ئـەوان بێبڕوا بـوون بە خواو بـە پێغەمبەرانی. خـوا بـە بەڵگـەی عەقڵـیو بـە شـێوەی پرسـیارو نكوڵیـی كـردن بەڵگەكانیـان پووچـەڵ دەكاتـەوەو پێیـان دەفەرمـوێ: ﴿أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ (واتـە: ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان وا گومـان دەبـەن كـە بەندەكانـم بكـەن بـە یـارو یـاوەرو پەرسـتراوی غەیـری مـن) واتە: هەرگیـز بەو شـێوەیە نابێ، وە نابێ دۆسـتی خوا پشـتیوانی لـە دوژمنـی خوا بـكات، بێگومان دۆسـتانی خـوا موافقـن لەگەڵ خـوادا، لە خۆشویسـتنو ڕەزامەنـدیو توورەیـیو ڕق لێبوونـەوەدا، ئـەم مانایـە وەكـو ئـەو ئایەتـەی خوایـە كـە فەرموویەتـی: ﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٤٠﴾ سـبأ، (واتـە: وە ڕۆژێـک خـوا هەموویـان كۆدەكاتـەوە، پاشـان بـە فریشـتەكان دەفەرمـوێ: ئایـا ئەوانـە لـە دونیا ئێوەیـان دەپەرسـت). هەر كەسـێک وا گومـان ببات كە ئـەو دۆسـتێكی خـوای كردوە بە دۆسـتی خـۆی، لـە كاتێكدا دژایەتـی خـوا دەكات، ئەوە درۆزنە.

وە دەگونجـێ -ڕواڵەتـی هـەر وایـە- مانـای دەقەكـە: ئایـا بێبڕوایـان بـە خـواو بـە پێغەمبەرەكـەی ﷺ وا گومـان دەبـەن، كـە دۆسـتانێک بگرن جگـە لە خوا سـەریان بخەنو سـوودیان بۆیـان هەبـێ، بـە ڕاسـتی ئەمـە بۆچوونێكـی بەتاڵـەو گومانێكی فاسـیدە، هەموو بەدیهێنـراوەكان هیچیـان بـە دەسـت نیە نـە دەتوانن سـوود بگەیەنـن، وە نە زیانیـش، ئەمە وەک ئەم ئایەتەیـە: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا

تَحۡوِيلًا ﴿٥٦﴾ ﴾الإسراء، واتــە: (ئــەی موحەممــەد ﷺ بە بێبڕوایــان بڵێ: هاوار بکــەن لەوانەی کــە ئێــوە بــە خواتــان دەزانین جگە لــە خــوا، ئەوانە دەســەڵاتیان نیە بــەڵاو زیانتان لەســەر لابدەن، وە دەســەڵاتی گۆڕانیشــیان نیە، وە فەرموویەتــی: ﴿ وَلَا يَمۡلِكُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴿٨٦﴾ ﴾الزخـرف، (واتــە: ئەوانــەی ئێــوە لــە جیاتــی خــوا داوایان لــێ دەکەن تکایــان بــە دەســت نیــە)، ئایەتــی دیکــەش هــەن هاوشــێوەی ئەمانە خــوا باســیان دەکات، هەموویــان ئامــاژە بــەوە دەکــەن، ئەوانــەی غەیــری خوا دەکــەن بە دۆســتو پشــتیوانیان، گومــراو سەرلێشــێواون، ناگــەن بــە ئومێــدو مەبەســتەکانیان، بەڵکــو بەهەندێکیشــی ناگەن، ﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴾واتــە: لــە دۆزەخــدا میوانــداری دەکرێن، خراپترین شــوێنو مەنزڵگایانــە، وە دۆزەخ جێــی میوانداریانە.

(١٠٣-١٠٦): ﴿ قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ﴿١٠٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمۡ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ ﴾

﴿ قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ﴾واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ بــە خەڵکــی بڵــێ: -وەک وریاکردنــەوەو ترســاندن- ئایــا هەواڵتــان پێبــدەم بــە زەرەرمەندتریــن کــەس بــە ڕەهایی؟ ﴿ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾(واتــە: ئەوانــە ئــەو کەســانەن کە کردەوەو کۆششــیان بــە فیڕۆ چــوو لە ژیانــی دونیــادا)، واتــە: هــەر کردەوەیــەک کردوویانە پــووچو پەرشو بــڵاو بووەتــەوە، وە وا گومــان دەبــەن ئــەوان کارێکی زۆر چاکیــان کردوە، ئەمــە کردەوە چاکەکانیانــە کــە بــەو شــێوەیە، ئاخــۆ کــردەوە خراپەکانیــان دەبــێ چــۆن بــێ؟ ئــەو کردەوانــەی دژایەتــی خــواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێدەکــەن؟ ئەوانە کێن کە خەســارەتمەندن لــە کارو کردەوەکانیــان؟ ﴿ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٥﴾ ﴾الزمـر، (واتــە: بێگومــان زەرەرمەنــدان ئەوانــەن کــە خۆیــانو کــەسو کاریــان لە دەســتداوە، لــە ڕۆژی قیامەتــدا، ئاگاداربــن هــەر ئــەوە زەرەرمەنــدی ئاشــکراو دیارە).

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ ﴾ واتــە: نکوولــی ئایــەتو نیشــانەکانی قورئــان دەکــەن، وە ئەو نیشــانانەی بــە چاو دەیبینن بەڵگەن لەســەر پێویســت بوونی ئیمــان بە خواو بە فریشــتەکانو بــە پێغەمبــەرانو کتێبــەکانو ڕۆژی دوایی.

﴿ فَحَبِطَتۡ ﴾(پووچــەڵ بوویەوە) بە هۆی ئــەو بێبڕواییەوە، ﴿ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنًا ﴾(واتــە: کردەوەکانیــان پوچــەڵ دەرچــوو، لــە ڕۆژی دواییــدا هیچ نــرخو ڕێزێکیان

بـۆ دانانێیـن)، چونكـە سـوودی وەزنو كێـش بریتیە لـە: بەراورد كـردنو هەڵسـەنگاندنی چاكـەكان بە خراپەكان، وە تەماشـا كردنی پەسـندو ناپەسند، ئەوانە هیـچ چاكەیەكیان نیە، بـە هـۆی لە دەسـتدانی مەرجەكانـی، ئەویـش ئیمانە، هەروەكـو خـوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ ﴾ طه، (واتـە: ئەوەشـی كـە كـردەوە چاكەكانـی كردبـێو بڕواداریـش بووبـێ ئـەوە نە دەترسـێ سـتەمی لێـی بكرێ، نە دەترسـێ پاداشـتی كـەم بكرێتـەوە)، بـەڵام كردەوەكانیان سـەرژمێر دەكـرێو هەژمار دەكـرێ، دانـی پێدادەنێـن، وە بـە هۆی ئـەو كردەوانەیـان لە پێش چـاوی خەڵكی ڕیسـوا دەكرێـن، پاشـان لەسـەری سـزادەدرێن، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ ﴾ واتە: (پاداشـتیان) پووچـەڵ بوونـەوەی كردەوەكانیانە، لـە ڕۆژی قیامەتدا هیچ ڕێـزو بەهایەكیان نیـە، ﴿ وَزْنًا ﴾ بـە هۆی بـێ نرخیو سـووكیان، ئەمەش بە هـۆی بێبڕوا بوونیـان بە ئایەتو نیشـانەكانی خـوا، وە گاڵتـە كردنیان بـە ئایەتەكانیو بـە پێغەمبەرەكەی ﷺ، لەگـەڵ ئەوەدا هـەق وابوو بـڕوا بە ئایەتو نیشـانەكانی خـواو پێغەمبەرەكەی ﷺ بێننو بە مەزن تەماشـای بكـەن، وە پێـی هەسـتن بـە چاكترین شـێوە، بەڵام ئـەوان كارەكەیـان پێچەوانـە كردەوە، بۆیـە پێچەوانـە كرایەوە بەسـەریاندا، وە ڕیسـوا بـوونو خزانە ناو سـزاوە.

كاتـێ كـە چارەنووسـی بێبڕوایـانو كردەوەكانیانـی ڕوون كـردەوە، ئنجـا كـردەوەی بـڕواداران‌و چارەنووسـیانی ڕوون كـردەوە، پاشـان فەرمـووی:

(١٠٧-١٠٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ ﴾:

واتـە: ئەوانـەی بڕوایان هێناوە بـە دڵەكانیانو كـردەوەی چاكیان ئەنجامداوە بە جەسـتەیان، ئـەم وەسـفە هەموو ئایـن لە خۆ دەگـرێ، عەقیدەو كـردەوەكانو بنچینەكانو لـقو پۆكان، بـە ئاشـكراو پەنهانـەكان، ئەوانە -بەجیـاوازی پلـەو پایەیان لـە ئیمانو كـردەوەی چاك- بەهەشـتەكانی فیردەوسـیان بۆ هەیە.

دەگونجـێ مەبەسـت لە بەهەشـتەكانی فیردەوس، بەرزترینی بەهەشـتو ناوەنـدو چاكترینی بـێ، وە ئـەم پاداشـتە بۆ كەسـێكە ئیمانی تـەواو بێو خاوەن كـردەوەی چاك بـێ، ئەویش پێغەمبـەرانو نزیكانە.

وە دەگونجـێ مەبەسـت پێـی، هەمـوو پلـەو پایەكانی بەهەشـت بێـت، ئەم پاداشـتە هەموو چینەكانـی بـڕواداران دەگرێتـەوە، چاكـەكارانو ناوەنـدەكانو هەموویـان بـە پێـی حاڵی

خۆیـان، ئەمـە لـە پێشـترینی ئـەو دوو مانایەیـە لەبەر ئـەوەی گشـتگیرە، وە لەبـەر ئەوەی (الجنـة) بـە كـۆ باس كـراوەو پاڵ دراوەتـە لای (الفـردوس)، وە لەبەر ئەوە فیـردەوەس بۆ بـاخو بێسـتانێ بـەكار دەهێنـرێ كـە تـرێو یـان دارو درەختی چڕو پـڕی لەخـۆ گرتبێ، ئەمەش ڕاسـتە بـۆ هەموو بەهەشـت.

جـا بەهەشـت شـوێنی میوانـداری خـاوەن ئیمـانو كـردەوەی چاكـە، چ میوانداریـەك گەورەتـرو مەزنتـرو بەرێزتـرە لەم میوانداریـە، كە هەموو خۆشـیەكانی تێدایە بـۆ دڵەكانو ڕووحـەكانو جەسـتەكان، وە تیایدایـە ئـەوەی نەفـس حـەزی لـێ دەكاتو چـاو چێـژی لێوەردەگـرێ لـە باڵەخانـەو كۆشـكو تـەلاری جـوانو باخچەی سـەرنج ڕاكێـشو داروو درەختـی بە بەرهـەمو باڵندەی دەنگ خـۆش، وە خواردنو خواردنەوەی بەتـامو بە لەززەتو ئافرەتـی زۆر جـوانو خزمەتـكارو منـداڵ، وە ڕووباری ڕۆیشـتوو دیمەنی سـەرنجڕاكێشو جوانـی هەسـتەوەرو مەعنەویو نـازو نیعمەتی بـەردەوام.

وە بەرزتریـنو چاكتریـنو مەزنترینـی ئەوانـە، چێـژ وەرگرتنە بـە نزیك بـوون لە خوای بـە بەزەیـیو بەدەسـتهێنانی ڕەزامەندی ئەو، بە ڕاسـتی ئـەوە گەورەترین نـازو نیعمەتەكانی نـاو بەهەشـتە، وە خۆشـیو چێـژ وەرگرتن بـە بینینی ڕووخسـاری خـوای پەروەردگار، وە بیسـتنی قسـەكانی خوای بـە بەزەیی.

ئـای لـەو میوانداریـە چەنـدە گـەورەو جـوانو تـەواوە! بـە ڕاسـتی لـەوە مەزنتـرە هیـچ بەدیهێنراوێـك بتوانێ وەسـفی بـكات، یان بەبـای خەیاڵیدا بێـت، ئەگەر بەنـدەكان هەندێ لـەو نـازو نیعمەتانە بزانن‌و ئـەو زانیاریە بگەیشـتایە بە دڵیان لەسـەر هەندێ لەو خۆشـیانەی كـە لـە بەهەشـتدا هەیە، ئـەوە دڵیان دەیـدا لە شـەقەی باڵ، لەبـەر شـەوقو تامەزرۆیی ئەو بەهەشـتە، وە دڵیـان دەبـڕاو لەت لـەت دەبوو، لەبـەر ئـازاری جیابوونەوەیان لەو بەهەشـتە، هـەر بـە پەلەو بە بـازدان بـۆی دەچـوون، هەرگیـز فەزڵـی دونیـای بەسـەرچوویان نەدەدا بەسـەریدا، كـە تەنهـا لەزەتێكـی قەرەباڵغی كاتی لەناو چـوو بوو، وە هەرگیز نەیاندەهێشـت كاتێكیـان لـێ بڕوا بە خەسـارەتمەندیی لە دەسـتیان بچـێ، هەر چركەیەك لە خۆشـیەكانی بەهەشـت بەرانبـەر خۆشـیەكانی دونیا بە هـەزاران سـاڵ مەزەندە دەكـرێ، بـەڵام بێئاگایی دایپۆشـیون، بڕوابوونیـش لاوازەو زانسـتیش كەمـە، ئیـرادەش كەلێنـی تێكەوتـووە، بۆیـە ئـەوەی بوو كە بـوو (فَـلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إلاَّ باللـهِ العَـلِيِّ العَظِيم).

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ ئەمـە خۆشـی تـەواوە، هەمـوو نیعمەتەكانـی بـە

تـەواوی تێدایـە، لـە تەواوێتیـدا ئەوەیـە کە ناپچـڕێو کۆتایـی پێ نایـەت ﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾ واتـە: نەدەگـۆڕێو نـە دەگوازرێتـەوە، چونکـە ئـەوان هـەر شـتێک دەبینـن پێی سەرسـام دەبن، وە دڵخۆشـبوونو خۆشـحاڵبوونیان بەسـەر دادێ، هیچ نـازو نیعمەتێک نابینن لـە سـەرووی ئەوەی کـە پێیـان دراوە.

(١٠٩): ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾﴾

﴿قُل﴾ واتـە: پێیـان بڵـێ وەک هەواڵدانێـک دەربارەی مەزنـی خواو سـیفەتە فراوانەکانی، کـە بەندەکانـی ناتوانن پەی پـێ ببەن پێیان بڵـێ: ﴿لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ﴾ واتە: ئـەم دەریایانەی کە لـە جیهانـدا هـەن، ﴿مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي﴾ (واتـە: ببن بە مەرەکـەب بۆ (نووسـینی) زانیاری پەروەردگـارم)، وە هەمـوو درەختەکانـی دونیـا، لـە سـەرەتای تا کۆتـای لـە دارودرەختی شـارو دەشـتو دەریاو قەڵەمـەکان، ﴿لَنَفِدَ الْبَحْرُ﴾ (واتـە: بێگومان ئاوی دەریـاکان تەواو دەبـن)، وە قەڵەمەکانیـش دەشـکێن ﴿قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي﴾ (واتـە: پێش ئەوەی قسـەی پەروەردگـارم تـەواو بێـت)، ئەمە شـتێکی مەزنە هیچ کەسـێک ناتوانـێ دەوری بدات.

لـە دەقێکـی دیکـەدا فەرموویەتـی: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾﴾لقمان، (واتـە: ئەگـەر هەرچـی درەخت لە زەویدایـە قەڵەمو پێنووس بێـت، وە هەموو دەریـای زەوی ببێتە مەرەکـەب حـەوت دەریـای تـر دوای (ئـەوەی باسـکرا) ببێتـە مەرەکەب فەرمایشـتەکانی خـوا دوایـی نایەتو تـەواو نابـن!) ئەمە لـە نزیک کردنـەوەی مانایـە بۆ بیرو هۆشـەکان، چونکـە ئەمانـە هەمـووی دروسـتکراوە، هەموو دروسـتکراوەکان تـەواو دەبـنو کۆتاییان پێدێـت، بـەڵام قسـەی خـوا ﷻ، یەکێکە لە سـیفاتەکانی، سیفاتەکانیشـی دروسـتکراو نیە، هیـچ سـنوورێکو هیـچ کۆتاییەکـی بـۆ نیە، جـا هـەر فراوانیو مەزنیـەک دڵـەکان بۆی بچـن، خوا لەسـەرووی ئەوەوەیە، بە هەمان شـێوە سـەرجەم سـیفاتە بەرزەکانـی خوا، وەک زانسـتو حیکمـەتو توانـاو میهرەبانی، ئەگەر زانسـتی هەمـوو بەدیهێنـراوەکان کۆببێتەوە لـە سـەرەتاوە بـۆ دواییـن، خەڵکـی ئاسـمانەکانو زەوی، بەراورد بە زانسـتی خـوا، کەمترە لـە قەبـارەی ئـەو ئاوەی کـە چۆڵەکەیەک بـە دەنووکی لـە قەراغـی دەریـادا هەڵیدەگرێ، لـە چـاو ئـاوی دەریاکـە، ئەمـەش لەبەر ئـەوە خـوا ﷻ خـاوەن سـیفاتە مەزنـە بەرفراوانە تەواوەکانـە، بێگومـان سـەرەنجامی هەمـوو کارێک بـۆ لای پەروەردگـار دەگەڕێتەوە.

(١١٠): ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾

﴿ قُلْ ﴾ واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ بـە بێبڕوایـانو جگە لـە ئەوانیش بڵـێ: ﴿ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾ (واتـە: مـن مرۆڤێكم وەكـو ئێوە) واتە: پەرسـتراو نیم، وە شـەریكو هاوبەش نیم لـە موڵكـدا، وە لە زانسـتی پەنهانـدا، خەزێنـەی خوا لـە لای من نیە.

وە ﴿ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾ بەندەیەكـم لـە بەندەكانـی پەروەردگـارم، ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴾ واتـە: فەزڵـم دراوە بەسـەرتانەوە بـە وەحـیو نیگـا، كـە خـوا ﷻ وەحـی بـۆ كـردووم، كـە گەورەتریـن هەواڵـی بـۆ ئێـوە: ﴿ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی پەرسـتراوتان پەرسـتراوێكی تـاكو تەنهایـە) هیچ هاوبەشـی نیە، وە هیچ كەسـێك شایسـتەی بەندایەتی نیـە بـە قـەد مسـقاڵە زەڕەیەك جگـە لە ئـەو، وە بانگتـان دەكەم بـۆ ئەو كـردەوەی كە لە خـوا نزیكتـان دەكاتەوە، وە پاداشـتی ئەو بەدەسـت دێنن‌و سـزاو تووڕەیی خـۆی لێتان دور دەخاتەوە.

بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴾ (واتـە: هـەر كـەس بـە تەمایـە بـە خزمـەت پەروەردگـاری بگـات ئـەوە بـا كـردەوەی چـاك ئەنجـام بـدات)، كردەوەیـەك بـە گوێرەی شـەرعی خوابێ، لـە واجبەكانو سـوننەتەكان ﴿ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ (واتـە: لـە پەرستنی پەروەردگـاردا كـەس نەكاتـە هاوبـەش) واتـە: ڕیایی‌و ئیرەیـی لـە كردەوەكانیـدا نـەكات، بەڵكـو بە دڵسـۆزی لـە پێناو خـوادا ئەنجامیـان بدات، ئەم كەسـە دڵسـۆزی بـۆ خـواو شـوێنكەوتنی پێغەمبـەری پێكـەوە كۆكردوەتـەوە، ئەوەی تەمەننـای دەكات دەسـتی دەكەوێـت، بـەڵام جگـە لەم كەسـە، ئـەوە زەرەرمەنـدی دونیاو دواڕۆژە، نزیـك بـوون‌و ڕەزامەنـدی خـوای پەروەردگـاری لە دەسـت داوە.

تەفسیری سووڕەتی (الكهف) تەواو بوو.


سورة مريم
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ
نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي
وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا
﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى
عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ
ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا
نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا
﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا
وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ
رَبُّكَ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ
شَيْـًٔا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً ۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا
تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ
ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾

## تەفسیری سوورەتی (مریم)
## مەککیە (٩٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ
رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ
نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ
مِنِّي وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ
بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفْتُ
ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا
فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ
مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا
﴿٦﴾ ﴾:

واتــە: ئەمــە ﴿ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴾ (واتــە: ئەمــەی دەخوێنرێتــەوە بەســەرتدا باســی بەزەیــی پەروەردگارتــە بــە بەنــدەی خــۆی کــە زەکەریایــە)، بــەم نزیکانــە بۆتــی دەخوێنینــەوەو بــە دوورو درێــژی باســی دەکەیــن، بــۆ ئــەوەی حاڵــی پێغەمبەرەکــەی زەکەریــای پــێ بناســرێ، وە شــوێنەواری بــەرزو ســیفاتی جوانەکانیشــی، بــە ڕاســتی لــە چیــرۆکو سەرگوزەشــتەیدا پەنــدو وانــەی تێدایــە بــۆ ئەوانــەی پەنــد وەردەگــرن، وە پێشــەنگو ڕێپیشــاندەرە بــۆ پەیــڕەوکاران، وە لەبــەر درێژەپێدانــی ڕەحمــەتو میهرەبانیەتــی بــۆ دۆســتو ئەولیاکانــی، وە بــە چــی هــۆکارێ دەســتەبەر بــوو بۆیــان، کــە دەبێتــە مایــەی خۆشویســتنی خــوای بــەرزو مــەزنو زۆر یــاد کردنــی، بــەو شــێوەیە خــوا ﷻ زەکەریــای هەڵبــژارد بــۆ پەیامەکــەی، وە تایبەتــی کــرد بــە وەحــیو نیگــای خۆیــەوە، ئەویــش بــە چاکتریــن شــێوە پێــی هەســتا، هاوشــێوەی پێغەمبەرانــی پێشــوو، خەڵکــی بانــگ کــرد بــۆ لای پەروەردگــاری فێــری کــردن لــەو زانســتو زانیاریــەی خــوا ﷻ فێــری کردبــوو، وە ئامۆژگــاری کــردن لــە ژیــانو پــاش مردنیــدا، وەکــو بــرا پێغەمبەرەکانــیو شــوێنکەوتوانیان، بــەڵام کاتــێ بینــی تووشــی لاوازی بــووە، وە هیــچ

کەسێکیش نیە شوێنی بگرێتەوە لە بانگەوازکردنی خەڵک بۆ لای پەروەردگاریو ئامۆژگاری کردنیان، سکاڵای لاوازی خۆی برد بۆ لای پەروەردگاری، وە پاڕایەوە لێی بە پاڕانەوەیەکی نهێنی، بۆ ئەوەی بە تەواوتریـنو چاکتریـنو دڵسۆزترین شێوە تەواوی بکات ﴿ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي ﴾ (بە ڕاستی ئەی پەروەردگارم من ئێسکم لاواز بووە)، واتە: ئێسکم لاواز بووە، ئەگەر ئێسکیش لاواز بوو، کە ڕاگری جەستەیە، ئەوە سەرجەم ئەندامەکانی جەستەش بە دوایدا لاواز دەبن، ﴿ وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا ﴾ (لەبەر پیری مووی سەرم بریقە دەداتەوە)، چونکە پیری بەڵگەیە لەسەر لاوازیو چوونە نێو تەمەنە، وە نێردراوی مردنو ئاگادار کردنەوەیەتی، جا پەنای بردە بەر خوا ﷻ بە لاوازیو بێ توانایی، ئەمەش لە خۆشەویسترین هۆکارەکانی بۆ لای خوا ﷻ چونکە خۆبەری کردنە لە هێزو توانای خۆی، وە بەستنەوەی دڵە بە هێزو توانای خوا ﷻ، ﴿ وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴾ واتە: پەروەردگارم هەرگیز لە پاڕانەوەم لێت بێ هیوا نەبووم، بە دەست بە تاڵیو بێ هیوایی مەمگێڕەوە، بەڵکو بەردەوام پشتیوانم بە، وە پاڕانەوەکانم لێوەربگرە، بە بەردەوام لووتفو نەرمو نیانیو چاکەی تۆ ڕژاوە بەسەرمدا، ئەمەش تەوەسول کردنێتی بۆ لای خوا ﷻ بە نازونیعمەتەکانی، جا داوای لە خوا ﷻ کرد وەک چۆن پێشتر چاکەی لەگەڵ کرد، نازونیعمەتو چاکەکانی لە داهاتوودا بۆ تەواو بکات.

﴿ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي ﴾ واتە: من ترسام لەوەی لە پاش مردنی من کەسێک نەبێ کاروبارەکانی ئاینی بەنی ئیسرائیل بەڕێوە ببات، وە کەسێک نەبێ بانگەوازیان بکات بۆ لای ئاینەکەت، ڕواڵەتی ئەمە وا دەردەکەوێ زەکەریا کەسێکی نەبینیوە لە ناو گەلەکەیدا شایستەی پێشەوایەتی بێت، ئەمە دڵسۆزیو بەزەیی زەکەریا دەگەیەنێ، بێگومان دوعا کردنی بۆ ئەوەی خوا منداڵی پێ بدات، وەک داواکردنی خەڵکی نەبوو، چونکە خەڵکی بە زۆری مەبەستیان پێی تەنها بەرژەوەندی دونیاییە، بەڵام ئەو مەبەستی بەرژەوەندی ئاینیو ترسان لە لە دەستچوونی ئاینەکەی بوو، وە تەماشای کرد بێجگە لەو کەسی دیکە شایستە نیە بەو کاروبارە.

ماڵەکەی یەکێک بوو لە ماڵە ناودارەکان لە ڕووی ئاینی، وە کانگای پێغەمبەرایەتیو جێگای خێرو چاکە بوو، جا داوای کرد لە خوا ﷻ منداڵێکی

پـێ بـدات، بـە کاروبـارە ئاینیـەکان هەڵبسـێ لـە دوای خـۆی، وە سـکاڵای کـرد کـە خێزانەکـەی نەزۆکـە، واتـە: بـە هیـچ شـێوەیەک منداڵـی نابـێ، وە خۆیشـی گەیشـتۆتە ئـەو پـەڕی پیـری، واتـە: پیریـەک شـەهوەت‌و منـداڵ خسـتنەوەی بـە دەگمـەن بـە دوادا دێـت، ﴿ فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴾ (واتـە: جـا تـۆ لەلایـەن خۆتـەوە منداڵێکـی چاکـم پـێ ببەخشـە) ئـەم پشـتیوانیە پشـتیوانی ئاینیـە، وە میراتگـری پێغەمبەرایەتـی‌و زانسـت‌و کردەوەیـە.

لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴾ (میراتگـری پێغەمبەرێتـی مـن‌و بنەماڵـەی یەعقـووب بـێ، ئـەی پەروەردگـارم! وایشـی لێبکـە کـە خـۆت لێـی ڕازی بیـت)، واتـە: بیکـە بـە بەندەیەکـی چـاک‌و تـۆ لێـی ڕازی بـی، وە لای بەندەکانـت خۆشەویسـتی بکـەی.

بـە پوختـی: زەکەریـا داوای لـە خـوا کـرد منداڵێکـی نێرینـەی بۆخـوا سـوڵحاوی چاکـی پـێ ببەخشـێ، بـۆ ئـەوەی لـە پـاش مردنـی ببێتـە دۆسـتی خـواو ببـێ بـە پێغەمبەرێـک جێگـای ڕەزامەنـدی بـێ لەلایـەن خـواو لەلایەنـی دروسـتکراوەکانی خـوا، ئەمـە باشـترین شـتە خـوا بیـدا بـە بەنـدە لـە منداڵەکانـدا، لـە میهرەبانـی خـوا ﷻ بـە بەندەکـەی ئەوەیـە منداڵێکـی چاکـی پـێ ببەخشـێ، کـە کۆکـەرەوەی هەمـوو خوڕەوشـتە جـوان‌و سـیفاتە ستایشـکراوەکان بـێ، خـوا ﷻ ڕەحمـی پێکـردوو نزاکـەی قبـووڵ کـرد، جـا فەرمـووی:

(٧-١١): ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ٧ قَالَ
رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ٨
قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا ٩ قَالَ رَبِّ
ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ١٠ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ
مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾:

﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾ واتـە: خـوا لەسـەر دەسـتی فریشـتەکان مـوژدەی پێـدا بـە یەحیـا، وە هـەر خـوا ﷻ ناویشـی لێنـا بـە یەحیـا، ئـەو نـاوە پڕاوپـڕی ناوەڕۆکەکـەی بـوو: ژیانێکـی هەسـتپێکراو ژیـا، بـۆ ئـەوەی فـەزڵ‌و منەتـی بـۆ تـەواو بـکات، وە بـە ژیانێکـی مەعنـەوی ژیـا، ژیانـی دڵ‌و ڕووح بـە وەحـی زانسـت‌و دیـن.

﴿لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا﴾ واتــە: (لــە پێــش ئــەو هیــچ کەسـێک بــەو نــاوە نــاو نەنــراوە)، وە دەگونجــێ ماناکــەی: لــە پێــش ئەودا کەســمان بــە هاوشـێوەی ئــەو دانەناوە، ئنجــا ئــەوە دەبــێ بــە مــوژدەدان بــە تەواوبــوونو وەســفکردن بــە ســیفاتە تــەواوەکان، وە ئــەو پێــش کەوتــووە بەســەر پێشــینی خۆیــدا، بــەڵام لەســەر ئــەم ئەگــەرە پێویســتە ئــەم گشــتگیریە تایبــەت بکــرێ بــە ئیبراهیــمو مووســاو نــووحو هاوشـێوەکانیان، کــە بێگومــان ئــەوان چاکتــرن لــە یەحیــا.

جــا کاتــێ مــوژدەی ئــەو منداڵــەی بــۆ هــات کــە داوای کردبــوو، ســەری ســوڕماو بەلایــەوە عەجیــب بــوو، وتــی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ﴾ (ئــەی پەروەردگــارم! چــۆن منداڵــم دەبــێ؟) لــە کاتێکــدا ڕێگریەکانــی منــداڵ بــوون لەمــنو خێزانەکەمــدا دەرکەوتــووە، ئەمــە ئــەوە دەگەیەنــێ ئــەو کاتــەی کــە داوای منداڵــی کــردوە، ئــەو نزایــە ئەوەنــدە بەهێــز بــە دڵــی داهاتــووە، ئــەو هۆکارانــەی منــداڵ نەبوونــی نەهاتۆتــە بــەر چــاو، وە ئەوەنــدەش ســوور بــووە لەســەر ئــەوەی منداڵێکــی هەبــێ، ئــەم ســوور بوونــەی دیســان وای کــردوە ئــەو هۆکارانــەی لەبەرچــاو نەبــن، لــەو حاڵەتــەدا کاتــێ دوعاکــەی وەرگیــراوە ســەری ســوڕماوە!! خــوا وەڵامــی دایــەوە فەرمــووی: ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ واتــە: (وتــی بــەو جۆرەیــە پەروەردگاریشــت فەرمــووی: ئــەو دروســتکردنە بــەلای منــەوە زۆر ئاســانە)، واتــە: بەڵێ لــە دابو نەریتــدا غەریــبو نامۆیە، وە بەهەمــان شـێوە لــە ســوننەتی خــوا لــە دروســتکراوەکانیدا نامۆیــە، بــەڵام بــۆ توانــاو دەســەڵاتی خــوا ﷻ ئاســاییە شــتێک بێنێتــە بــوون بەبــێ هۆکارەکانــی، ئــا لەبــەر ئــەوە زۆر ئاســانە بەلایــەوە، هەرگیــز لــەوە گرانتــر نیــە کــە ســەرەتا هێناویەتیــە بــوونو هیــچ نەبــووە، ﴿قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً﴾ واتــە: (وتــی: ئــەی پەروەردگــار! نیشــانەیەکم بــۆ دابنــێ) بــۆ ئــەوەی دڵــم پێــی ئــارام بــێ، ئەمــە شــەکو گومــان نیــە لــە هەواڵــی خــوادا، بەڵکــو ئەمــە وەکــو ئەوەیــە کــە خۆشەویســت ئیبراهیــم ؈ فەرمــووی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴿٢٦٠﴾﴾ البقـرة، (واتــە: پەروەردگــارم! پێشــانم بــدە چــۆن مــردوو زینــدوو دەکەیتــەوە؟ خــوا فەرمــووی: ئایــا ئیمانــت نەهێنــاوە؟ وتــی: بــا، ئیمانــم هێنــاوە، بــەڵام بــۆ ئــەوەی دڵــم ئــارام بگــرێ)، داوای زانیــاری زیاتــری کــرد، وە گەیشــتن بــە دڵنیایــی بینیــن (عــين اليقــين)ی کــرد، دوای ئــەوەی گەیشــتبوو بــە دڵنیایــی زانســتو زانیاریــی (علــم اليقــين)، خــواش بــە

هـۆی رەحمەتـی خۆیـەوە وەڵامـی داواکـەی دایـەوە.
﴿ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴾ لـە ئایەتێکـی دیکـەدا دەفەرموێ: ﴿ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزًا ﴿٤١﴾ ﴾آل عمـران، (واتـە: نیشـانەکەت ئەوەیـە کـە مـاوەی سـێ رۆژ بـە ئامـاژە نەبـێ قسـان ناکـەی) هەردووکیـان یـەک مانایـان هەیـە، جارێـک بـە شـەو دەریدەبـڕێ، وە جارێـک بـە رۆژ، بـەڵام یـەک جێبەجـێ کردنیـان هەیـە، ئەمـەش یەکێکـە لـە ئایـەتو نیشـانە سەرسـوڕهێنەرەکان، چونکـە ڕێگـری کردنـی لـە قسـەکردن بـۆ مـاوەی سـێ رۆژ، وە بێتوانایـی لێـی بەبـێ ئـەوەی لاڵ بـێو هیـچ نەخۆشـیەکی هەبـێ، بەڵکـو ئاسـایی بـێو هیـچ ناتەواویەکـی نەبـێ، یەکێکـە لـەو بەڵگانـەی لەسـەر قـودرەتو توانـای خـوا کـە پێچەوانـەی عـادەتو نەریتـی خەڵکـن، لەگـەڵ ئەمـەدا قسـە نەکردنـی تەنهـا پەیوەنـدی هەبـوو بـە گفتوگـۆ کـردن لەگـەڵ خەڵکیـدا، بـەڵام تەسـبیحاتو زیکـر کـردنو وێنـەی ئەوانـە، ئاسـایی بـوو دەیتوانـی بە زمانـی ئەنجامیـان بـدات، بۆیـە لـە دەقێکـی دیکـەدا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٤١﴾ ﴾آل عمـران، (واتـە: وە زۆر یـادی پەروەردگـارت بکەو تەسـبیحاتی خـوا بکـە بـە ئیـوارانو بەیانیـان)، هەتـا دڵنیـا بـوو، وە دڵـی ئـارام بـوو، وە دڵخـۆش بـوو بـەم مـژدە گەورەیـە، وە فەرمانـی خـوای بەجێهێنـا بـە سوپاسـگوزاری بـە عیبـادەت بـۆ کردنـیو یـاد کردنـی، بۆیـە لـە میحرابەکـەدا ئیعتیکافـی کـرد، ئنجـا لـە پەرسـتگاکە دەرچـوو بـۆ نـاو گەلەکـەی، ﴿ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾واتـە: بـە ئامـاژەو هێمـا (پێـی وتـن): ﴿ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةً وَعَشِيًّا ﴾ (بـە گەلەکـەی وت: کـە بەیانیـانو ئێـواران زیکـری خـوا بکـەن)، چونکـە مـژدە دان بـە یەحیـا لـە مافـی هەمووانـدا بەرژەوەندیەکـی ئاینـی بـوو.

يَـٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَـٰبَ بِقُوَّةٍۢ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّۭا ﴿١٢﴾
وَحَنَانًۭا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةًۭ ۖ وَكَانَ تَقِيًّۭا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ
يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّۭا ﴿١٤﴾ وَسَلَـٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ
وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّۭا ﴿١٥﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ
مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًۭا شَرْقِيًّۭا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًۭا
فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًۭا سَوِيًّۭا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّىٓ
أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَـٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّۭا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ
رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَـٰمًۭا زَكِيًّۭا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى
غُلَـٰمٌۭ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌۭ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّۭا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ
قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌۭ ۖ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةًۭ لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةًۭ
مِّنَّا ۚ وَكَانَ أَمْرًۭا مَّقْضِيًّۭا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ
مَكَانًۭا قَصِيًّۭا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ
قَالَتْ يَـٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَـٰذَا وَكُنتُ نَسْيًۭا مَّنسِيًّۭا ﴿٢٣﴾
فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّۭا ﴿٢٤﴾
وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَـٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًۭا جَنِيًّۭا ﴿٢٥﴾

**(١٢-١٥):** ﴿ يَـٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَـٰبَ بِقُوَّةٍۢ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّۭا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًۭا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةًۭ ۖ وَكَانَ تَقِيًّۭا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّۭا ﴿١٤﴾ وَسَلَـٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّۭا ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ يَـٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَـٰبَ بِقُوَّةٍۢ ﴾ **فەرمایشتەکەی پێشوو بەڵگەیە لەسەر لە دایکبوونی یەحیاو گەنجێتیو پەروەردە کردنی، بەڵام گەیشتە تەمەنێک کە لە دواندن تێبگات، خوا ﷻ فەرمانی پێکرد بە هێزەوە کتێبەکە وەربگرێ، واتە: بە توندی وەری بگرێ، ئەویش بە کۆشش کردن بە لەبەر کردنی قسەو بێژەکانیو تێگەیشتن لە ماناکانی، وە کردار کردن بە فەرمانو قەدەغەکراوەکانی، ئەمەش تەواوی وەرگرتنی کتێبە بە هێزو توانا، فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ کردو ڕووی لە کتێب (تەورات) کرد، لەبەری کردو لێی تێگەیشت، خوا ﷻ زیرەکییو ورياییەکی پێ بەخشی، کە لە غەیری ئەودا نەبوو، بۆیە فەرموویەتی:** ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّۭا ﴾ **واتە: زانینی حوکمەکانی خواو کار پێکردنیان (مان پێدا)، هەر لە تەمەنی منداڵیدا.**

﴿ وَحَنَانًۭا مِّن لَّدُنَّا ﴾ **وە هەروەها پێمان بەخشیبوو ڕەحمەتو بەزەییەک، بۆ ئەوەی کارەکانی بۆ ئاسان بێو بارودۆخی چاک بێت، کارەکانیشی پێ ڕاستو ڕەوان بێ** ﴿ وَزَكَوٰةًۭ ﴾ **واتە: پاکی لە هەموو بەڵاو تاوانێک، دڵی پاک بوویەوە، ئەویش نەمانی وەسفە سەرزەنشت کراوەکانو ڕەوشتە ناشرینەکان لە خۆ دەگرێ، بە هەمان شێوە زیاد کردنی ڕەوشتە جوانەکانو وەسفە ستایش کراوەکانیش دەگرێتەوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:** ﴿ وَكَانَ تَقِيًّۭا ﴾ **واتە: فەرمانەکانی جێبەجێ دەکردو لە قەدەغە کراوەکان دوور کەوتەوە، هەر کەسێک بڕوادارێکی لە خوا ترس بێ ئەوە دۆستو وەلی خوایە، لە ئەهلی بەهەشتە کە دیاری کراوە بۆ لە خوا ترسان، وە پاداشتی دونیاو دوارۆژ بەدەست دێنێ کە خوا لەسەر تەقواو خۆپارێزی ڕێکی خستووە.**

﴿ وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ ﴾ واتە: (هەڵسوکەوتی لەگەڵ دایکو باوکیدا چاک بوو)، سەرپێچییانی نەدەکرد، لەگەڵیشیاندا خراپ نەبوو، بەڵکو چاکەکار بوو بەرانبەریان بە قسەو کردار.

﴿ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴾ واتە: خۆی بە گەورە نەدەزانیو لووت بەرزی نەدەنواندا بەسەر بەندەکانی خواوە، بەهەمان شێوە بەسەر دایکو باوکیشیدا، بەڵکو بە بەردەوامی خۆی بە کەم دەزانیو زەلیلی دەنواند بۆ خوا ﷻ، دوو شتی پێکەوە کۆکردەوە بەجێهێنانی مافەکانی خوا، وە مافی بەندەکانی، لەبەر ئەمە سەلامەتی بۆ دەستەبەر بووە لە لایەن خواوە لە هەموو بارودۆخەکانیدا، لەسەرەتاو داهاتوو.

لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴾ (واتە: سەلامی خوای لەسەر بێ لەو ڕۆژەی لە دایک بوو، وە لەو ڕۆژەی کە دەمرێ، وە لەو ڕۆژەش کە زیندوو دەکرێتەوە)، ئەمەش سەلامەتی لە شەیتانو خراپەو سزا دەگرێتەوە لە هەر سێ حاڵەتەکەداو ئەوەیشی لە نێوانیاندایە، بێگومان ئەو پارێزراوە لە ئاگرو مەترسی، وە لە خەڵکی بەهەشتە، دروودو سەلامی خوا ﷻ بڕژێ بەسەریدا، وە بەسەر باوکیو سەرجەم پێغەمبەران، خوا بمانگێڕێ لە شوێنکەوتووانیان، بە ڕاستی ئەو بەخشندەو بەرێزە.

(١٦-٢١): ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ﴾:

دوای ئەوەی باسی چیرۆکو بەسەرهاتی زەکەریاو یەحیای کرد، کە بێگومان یەکێکە لە ئایەتو نیشانە سەرسوڕهێنەرەکان، ئنجا دەچێتە نێو بەسەرهاتێکی دیکە کە زۆر لەوانە سەرسووڕهێنەرترە، بە پلەبەندی لە نزمترینەوە بۆ بەرزترین، جا فەرموویەتی: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) لە قورئانی پیرۆزدا (باسی بەسەرهاتی) ﴿ مَرْيَمَ ﴾ مەریەم عليها السلام بکە، ئەمە لە مەزنترینی فەزڵەکانیەتی، کە لە قورئانی پیرۆزدا باسی هاتووە، ئەو قورئانەی لە بەردەستی مسوڵماناندایە دەیخوێننەوە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای زەویدا، بە جوانترین شێوە باسی دەکرێ، وەک پاداشتێ بۆ کردەوە چاکەکانیو کۆششە لەبن نەهاتووەکانی، واتە: باسی سەرگوزشتەی چاکی مەریەم بکە، کاتێ: ﴿ ٱنتَبَذَتْ ﴾ واتە: دوور کەوتەوە لە کەسو کاری ﴿ مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴾ واتە: کەوتبوویە ئەو لایەوە کە ڕۆژیان لێ هەڵدێ، ﴿ فَٱتَّخَذَتْ

﴿مِن دُونِهِمْ حِجَابًا﴾ واتە: پەردەو بەربەستێکی دانابوو (لە نێوان خۆیو خەڵکیدا) ئەم دوور کەوتنەوەو پەردە دانانە، بۆ ئەوە بوو کەنارگیر بێو بە تاکو تەنها پەرستش بۆ پەروەردگاری بکات، وە لێی بپارێتەوە بە دڵسۆزیو ملکەچ بوونو زەلیلی، ئەوەش گوێڕایەڵی ئەو بوو، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾﴾ آل عمران، (واتە: وە یادبکەوە کاتێک فریشتەکان وتیان: ئەی مەریەم! بێگومان خوا هەڵیبژاردوویو پاکی کردوویەوەو بەسەر ئافرەتانی جیهانییاندا هەڵیبژاردووی * ئەی مەریەم! بۆ پەروەردگارت ملکەچبەو کڕنووش بەرەو لەگەڵ ڕکووع بەراندا ڕکووع بەرە).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا﴾ ئەویـش جبریـل ﷺ، ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ واتـە: (لـە شـێوەی) پیاوێکـی تـەواو جـوانو شـێوازێکی ڕێـکو پێـک، بـە بـێ هیـچ کـەمو کـوڕیو ناتەواویـەک، چونکـە نەیدەتوانی لەسـەر شـێوەی ڕاسـتەقینەی خـۆی جبریـل ﷺ ببینـی، کاتـێ بـەو جـۆرە بینـی، لـە کاتێکـدا ئـەو دورەپەرێـز بـوو لـە کـەسو کارەکـەی خـۆیو لـە خەڵکـی، پـەردەی دانابـوو لەبـەردەم بەرێزتریـن کەسـی خۆیـدا، وە ترسـا لـەوەی ئەمـە پیاوێـک بـێ بیـەوێ زیانـی پێبگەیەنـێو تەماحـی تێکردبـێ، پشـتی بـە خـوا بەسـتو داوای پەنـای لـە ئـەو کـردو پێـی وت: ﴿أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنكَ﴾ واتـە: پەنـا دەگـرم بـە خـواو پشـت بـە ڕەحمەتـی خـوا ﷻ دەبەسـتم، کـە بتـەوێ زیانـم پێبگەیەنـی ﴿إِن كُنتَ تَقِيًّا﴾ واتـە: ئەگـەر تـۆ لـە خوا ﷻ دەترسـیو کاری پێدەکـەی، واز لـە مـن بێنـە، دوو شـتی پێکـەوە کۆکردەوە، پشتبەسـتن بـە پەروەردگـاری لەگـەڵ ترسـاندنی پیاوەکـە لـە خـوای گـەورە، وە فەرمانـی پێکـرد بـە پابەنـد بـوون بـە تەقـوای خـوا، چونکـە لەوکاتـەدا گەنجێکـی تـاکو تەنهـا بـوو، دووریـش بـوو لـە خەڵکیـەوە، گەنجەکـەش کـە جبریلـە ﷺ لەوپـەڕی جوانیـدا بـوو، وەکـو مرۆڤێکـی کامـڵو تـەواو دەردەکـەوت، هیـچ وشـەیەکی خراپـی بەرانبـەر بـەکار نەهێنـا، بەڵکـو ئـەوە تەنهـا ترسـێک بـوو لـە لایـەن ئـەوەوە، ئەمـەش ئەوپـەڕی پاکـیو دوور کەوتنـەوە دەگەیەنـێ لـە شـەڕو هۆکارەکانـی.

وە ئەم داوێن پاکیە -بەتایبەت لەگەڵ کۆبوونەوەی هۆکارەکانو نەبوونی هیچ بەربەستێ- لە مەزنترین کردەوەکانە، لەبەر ئەمەیە خوا وەسفی کردوە لەسەری، وەک فەرموویەتی: ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا ﴿١٢﴾﴾ التحريم. (واتە: وە

مەریەمی کچی عیمران ئەوەی کە داوێنی خۆی پاک ڕاگرت، ئەوسا ئێمە فوومان پیا کرد لە رووحێک کە خۆمان دروستمان کردوە)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩١ ﴾ الأنبياء (واتە: وە باسی ئەو ئافرەتە (مەریەمی کچی عیمران بکە) کە داوێنی خۆی پاراست، ئنجا فوومان پیاکرد (بە هۆی جبرائیلەوە) لەو ڕووحەی هی خۆمان بوو، وە مەریەمو کوڕەکەیمان کرد بە موعجیزەیەک بۆ جیهان).

خوا ﷻ قەرەبووی ئەو داوێن پاکییەی بۆ کردوە، بە پێدانی کوڕێک کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خواو پێغەمبەرێکیشە لە پێغەمبەرانی.

جا کاتێ جبریل ﷺ بینی مەریەم ترساوەو تۆقیوە، فەرمووی: ﴿ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ ﴾ واتە: کارو پیشەی من جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە لە تۆدا ﴿ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی منداڵێکی پاکو خاوێنت پێ ببەخشم)، ئەمە مژدەیەکی مەزنە بە بەخشینی منداڵی پاکو خاوێن، چونکە بێگومان پاکو خاوێنی دووربوون لە سیفاتە ناشرینەکانو دەرکەوتنی سیفاتە ستایشکراوەکان دەگرێتەوە، سەری سوڕما لە بەدیهاتنی منداڵێ بە بێ باوک، بۆیە وتی: ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴾ منداڵیش بەوە نەبێ نابێ؟!!

﴿ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ ﴾ (واتە: جبریل وتی کارەکە بەو جۆرەیە (کە پێم وتی) پەروەردگارت فەرمووی ئەو کارە لای من زۆر ئاسانەو بۆ ئەوەی بیکەین بە موعجیزەو نیشانەیەک بۆ خەڵکی)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەواوی تواناو دەسەڵاتی خوا، وە لەسەر ئەوەی کە هۆکارەکان خۆیان کاریگەری دروست ناکەن، بەڵکو کاریگەریان بە پێی ویستو توانای خوایە.

لە هەندێ شتەکاندا بە پێچەوانەی ئەوەی خەڵک عادەتیان پێوە گرتووە خوای پەروەردگار شتەکان ئەنجام دەدا بەبێ هەبوونی هۆکارەکان، بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو خەڵکە ببرێ لە سەیر کردنی هۆکارەکانو، هەڵسوڕێنەرو سازیاری هۆکارەکانیان بیر بخاتەوە ﴿ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ ﴾ واتە: بیکەین بە ڕەحمەتێک لە لایەن خۆمانەوە، بۆ کوڕەکەی کە (عیسایە ﷺ) وە بۆ دایکیو بۆ هەموو خەڵکی.

بەڵام سەبارەت بوونی بە ڕەحمەتی بۆ (عیسا ﷺ) ئەوەیە کە تایبەتی کرد بە وەحی خۆیو منەتی کرد بەسەریدا وەکو چۆن منەتی پێی کرد بەسەر خاوەن عەزمەکاندا.

وە سەبارەت بوونی بە ڕەحمەت بۆ دایکی، ئەوەی کە بە دەستی هێنا لە شانازیو وەسفو

پیاهەڵدانی چاکو جوانو سوودی مەزن.
سەبارەت بە بوونی بە ڕەحمەت بۆ خەڵکی، بێگومان گەورەترین نیعمەتی بەسەریانەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون ئایەتەکانی خوا بۆیان دەخوێنێتەوە بەسەریاندا، وە پاکیان دەکاتەوە، وە فێری کتێبو حیکمەتیان دەکات، ئەوانیش بڕوای پێدێننو گوێڕایەڵی دەکەن، خۆشبەختی دونیاو دوا ڕۆژیان بۆ بەدەست دێت.
﴿ وَكَانَ ﴾ واتە: بوونی عیسا (عليه السلام) لەم حاڵەتەدا ﴿ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴾ واتە: (کارێکی بڕیاردراوە لە لایەن خواوە) بە بڕیارێکی پێشوو، هەردەبێ ئەم قەزاو قەدەرە جێبەجێ ببێ، جا جبریل (عليه السلام) فووی کرد بە گیرفانی مەریەمدا.

(٢٢-٢٦): ﴿ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ ﴾

﴿ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ ﴾واتە: کاتێک مەریەم سکی پڕ بوو بە عیسا (عليه السلام) لە ئابڕووچوون ترساو لە خەڵکی دوور کەوتەوە ﴿ مَكَانًا قَصِيًّا ﴾ واتە: (بۆ شوێنێکی دوور لە کەسو کاری)، کاتێک کە منداڵ بوونی نزیک بوویەوە، ئەوسا ئێشو ژانی منداڵ بوون ناچاری کرد بڕواتە پەنای قەدی دار خورمایەک، کاتێ کە ئازاری منداڵ بوونو ئازاری تەنهاییو برسێتیو ئازاری قسەی خەڵکی تووش بوو، ترسا لەوەی ئارام نەگرێ، خۆزگەی خواست پێش ئەمە بمردایەو ببووایەتە کەسێکی لە بیرچووی باسنەکراو، ئەم خۆزگە خواستنە لەسەر بنەمای ئەم ناڕەحەتیانە بوو کە تووشی بوون، ئەگەرنا ئەو خۆزگە خواستنە هیچ بەرژەوەندیو خێرێکی بۆ ئەو تێدا نەبوو، بەڵکو بەرژەوەندیو خێر لەوەدا بوو کە ڕوویدا.
جا ئەو کاتە جبریل (عليه السلام) ترسەکەی ڕەواندەوەو جێگیری کرد لە ژێر دارخورماکەوە، دەگونجێ جبریل (عليه السلام) لە شوێنێکەوە بانگی کردبێ نزم تر بووبێ لە شوێنەکەی مەریەم، پێی فەرموو: خەفەت مەخۆو خەمبار مەبە ﴿ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴾ واتە: بێگومان پەروەردگارت لە خوارتەوە جۆگەیەکی ئاوی بۆ فەراهەم هێناوی بۆ ئەوەی لێی بخۆیتەوە ﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴾ (واتە: قەدی ئەو دارخورمایە بۆ لای خۆت ڕاوەشێنە خورمای تازە پێگەییوت بەسەردا دەبارێ) واتە: خورمایەکی تازەو بە تامو بە سوود،

فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ
إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتۡ
بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾
يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ
أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي
ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي
نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي
جَبَّارٗا شَقِيّٗا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ
وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ
ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ
فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٣٦﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ
بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ
وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾

﴿فَكُلِي﴾ لەو خورمایە بخۆ ﴿وَٱشۡرَبِي﴾ لە ئاوی جۆگەکەیش بخۆرەوە ﴿وَقَرِّي عَيۡنٗا﴾ (چاوو دڵ ڕۆشن بە) بە عیسا، ئەمە دڵنیاییەک بوو لە ڕووی سەلامەتی ئێشو ژانی منداڵ بوون، وە بەدەستهێنانی خواردنو خواردنەوەیەکی بە لەززەت بوو.

بەڵام لە ڕووی قسەو قسەڵۆکی خەڵکەوە فەرمانی پێکرد ئەگەر کەسێکی بینی بە ئاماژە پێی بڵێ: ﴿إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا﴾ واتە: (بڵێ: بە ڕاستی من قسەنەکردنم لەسەرخۆم نەزرکردووە بۆ خوای میهرەبان) واتە: بێدەنگ بوونم هەڵبژاردووە ﴿فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا﴾ واتە: لەگەڵیاندا مەدوێ، بۆ ئەوەی پشوو بدەی لە قسەو قسەڵۆکەکانیان بێدەنگی لای ئەوان یەکێک بوو لە عیبادەتە شەرعیەکان، لەبەر ئەوە فەرمانی پێکرا لەگەڵیاندا نەدوێ دەربارەی ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی دەیانداوە پاڵی، چونکە خەڵکی بڕوایان پێنەدەکرد، وە هیچ سوودێکیشی نەبوو، وە بۆ ئەوەی بەری بوونی لە سەر زمانی عیسا بێ لە ناو بێشکەدا، دیارە ئەوەش مەزنترین شایەتیە لەسەر پاکیو بەرائەتی مەریەم.

بێگومان ئافرەتێک منداڵێک بهێنێ بە بێ پیاو، وە بانگەشەش بکات کە ئەو منداڵە باوکی نیە ئەوە گەورەترین بانگەشەیە، ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە چەندین شایەتیش بهێنرێ بڕوای پێناکرێ، بۆیە خوا ﷻ بەڵگەی بۆ ئەم موعجیزە هێنایەوە کە لە دەرەوەی عادەتە بە شتێک لە ڕەگەزی خۆی بێ، ئەویش قسەکردنی عیسا بوو ﵇ لە کاتی منداڵیدا، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٧-٣٣): ﴿فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ

فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا
كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا
﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾ ﴾

﴿فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ﴾واتە: کاتێ مەریەم بێ نیازو بێ ئومێد بوو لە خۆی، عیسای هەڵگرتو هێنای بۆ نێو گەلەکەی، چونکە دەیزانی ئەو پاکەو هیچ تاوانێکی نیە، بۆیە بەسەر بەرزیو بێ باکیەوە گەڕایەوە، جا ئەوانیش پێیان وت: ﴿لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴾واتە: (شتێکی زۆر خراپو ئابرووبەرت هێناوە) مەبەستیان لەم قسەیە خراپی مەریەم بوو دوور لە ڕووی ئەو، ﴿يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ﴾بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێ هاڕوون برای ڕاستەقینەی مەریەم بووبێ بۆیە داویانەتە پاڵی، بە ناوی پێغەمبەرانەوە ناویان دەنا، ئەوە هاڕوونی کوڕی عیمران نیە کە برای مووسایە، چونکە لە نێوانیاندا چەندین سەدە هەیە، ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا﴾ واتە: دایکو باوکی تۆ کەسانێکی خواناسو چاک بوون دووربوون لە شەڕوو خراپە، بە تایبەت ئەم شەڕو خراپەی کە ئاماژەی پێدەکەن، وە مەبەستیان ئەوە بوو: تۆ چۆن بە پێچەوانەی وەسفی ئەوانی، کارێکت کردوە باوکو دایکت ئەنجامیان نەداوە؟ بەو شێوەیە نەوەکان بە زۆری هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان دەچن لە چاکیو خراپیدا، بۆیە سەریان سووڕما چۆن شتی وا ڕوویداوە لە مەریەم.

مەریەمیش ئاماژەی بە منداڵەکەی کرد، واتە: لەگەڵ ئەودا قسە بکەن، بۆیە ئاماژەی بەوە کرد، چونکە فەرمانی پێکراوە لە کاتی قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بڵێت: ﴿إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا﴾ کاتێ ئاماژەی بۆ کردن کە قسە لەگەڵ عیسادا ﷺ بکەن، ئەوانیش بەسەر سوڕمانەوە وتیان: ﴿كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا﴾(چۆن لەگەڵ منداڵێکی ساوای نێو بێشکەدا قسە بکەین؟) چونکە لە عادەتو دابو نەریتدا شتی لەو جۆرە نەبوو، وە شتی لەو جۆرە لەو تەمەنەدا ڕووی نەدابوو.

جا ئەو کاتە عیسا ﷺ لە ناو لانکدا هاتە قسە کردنو وتی: ﴿إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا﴾لەگەڵیان دواو وەسفی خۆی کرد بە پەرستنی خوا، وە ئەو هیچ وەسفێکی ئەوتۆی تێدانیە تا شایستەی ئەوە بێ بکرێ بە پەرستراو، یان کوڕی پەرستراو، بەرزیو بڵندی بۆ خوا ﷻ لە قسەی گاورەکان ئەوانەی پێچەوانەی عیسا ﷺ

بـوون لـەو وتەیەیدا کـە وتوویەتـی: ﴿ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: مـن بەندەی خـوام)، ئەوانەی کە بانگەشـەی ئـەوە دەکەن موافقی عیسـان.

﴿ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ واتـە: بڕیـاری داوە کتێبـم پێبدات ﴿ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴾ هەواڵـی پێدان کە بەنـدەی خوایـە، وە خـوا ﷻ فێری کتێبی کـردوە، کردویەتی بـە یەکێک لـە پێغەمبەرانی، ئەمـە لـە تەواوێتی نەفـسو دەروونێتی.

پاشـان باسـی ئەو شـتانە دەکات کە تەواو کەرن بۆ غەیری خۆی، فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ ﴾ واتـە: لە هـەر جێگاو شـوێنێکدا بم، خوا ﷻ بەرەکـەتو پیرۆزی لەگەڵمـدا دانـاوە لـە فێرکردنـی خێـرو چاکەو بانگـەواز کـردن بـۆی، وە قەدەغەکردن لە شـەرو خراپـە، وە بانگـەواز کـردن بۆ لای خوا لـە گوفتـارو کردارەکانیدا، جا هەر کەسـێ لەگەڵیـدا دابنیشـتایە، یان کۆ ببوایەتـەوە لەگەڵیدا، ئـەوە بەرەکەتو پیـرۆزی بەردەکەوت، وە خۆشـبەختو کامـەران دەبوو پێی.

﴿ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴾ واتە: ڕایسـپاردووم هەڵسـم بـە مافەکانی، کە مەزنترینیـان نوێـژە، وە مافـی بەندەکانـی کـە گەورەترینیـان دەرکردنـی زەکاتـە، هەموو تەمەنـم، واتـە: من وەسـێتی پەروەردگـارم جێبەجـێ دەکەمو کاری بـۆ دەکەم.

هەروەهـا ڕایسـپاردووم ڕێـز لـە دایکـم بگـرم، چاکەکاربـم لەگەڵیدا بـە ئەوپـەڕی چاکە، ئـەوەی بەمـن دەکـرێ پێی هەسـتم لـە خزمەتیدا، بـە هـۆی ڕێزو فـەزڵو چاکەیـەوە، وە لەبـەر ئـەوەی دایکیشـمە، دایکیش مافـی هەیـە بەسـەر منداڵەکەیەوە.

﴿ وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا ﴾ واتـە: (نـەی کـردووم) بـە خـۆ بـەزل زانێـک، خۆم لـە خەڵکی بـە گەورەتـر بزانـم ﴿ شَقِيًّا ﴾ (خراپەکارێکی ملهـوڕ) لە دونیامـدا یاخود لـە دواڕۆژمدا، پەروەردگـارم وای لێنەکـردووم بەڵکـو وای لێکـردووم گوێڕایـەڵو ملکـەچو زەلیل بم بۆ بەندایەتـی کردنی، خۆشـبەخت بم لە دونیـاو دواڕۆژدا، منو ئەوانەیشـی شـوێنم کەوتوون.

کاتـێ کـە خوا سـیفەتە بـەرزو جوانەکانی بـۆ تەواو کـرد، فەرمـووی: ﴿ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴾ واتـە: لـە فـەزڵو بەخشـندەیی خـوا سـەلامەتیم بە دەسـت هێنـاوە لـەو ڕۆژەی لە دایک بـووم، وە لـەو ڕۆژەی دەمرمو لەو ڕۆژەیشـی زیندوو دەکرێمـەوە، وە سـەلامەتم لـە شـەڕو خراپـەو لـە شـەیتانو لـە سـزاو تۆڵە، ئەویـش ئەوە دەخـوازێ کـە پارێزراوەو سـەلامەتە لە ناڕەحەتیو شـوێنو ماڵی خراپـەکاران کە دۆزەخە، وە ئـەو لـە خەڵکی بەهەشـتە کە (دار السـلام)ە، ئا ئەمـە موعجیزەیەکی مـەزنو بەڵگەیەکی

زۆر ڕوونــە، لەســەر ئــەوەی کە عیــسا ﷺ پێغەمبــەرو بەندەی ڕاســتەقینەی خوایە.

(٣٤-٣٦): ﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ٣٤ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٣٥ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٣٦ ﴾

﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ﴾واتە: ئەوەی وەســف کرا بەو ســیفاتانە، ئەوە عیسای کــوڕی مەریەمــە بەبێ هیچ گومــانو دوو دڵیــەک، بەڵکو قســەیەکی هەقو ڕاســتەو وتەی خوایــە، کــە هیــچ کــەس لــەو ڕاســتگۆتر نیە، هیــچ کەس قســەی لە قســەی ئــەو جوانترو چاکتــر نیــە، ئەمــە هەواڵێکــی ڕاســتەقینەو دڵنیاکەرەوەیە دەربارەی عیســا ﷺ، ئەوەیشــی دەربــارەی دەوتــرێ پێچەوانــەی ئــەم قوڕئانە بێت، ئــەوە بێگومان پــووچو بەتاڵــە، ئەوپەڕی ئــەو قســەیە بۆ ئــەوە دەگەڕێتەوە خاوەنەکــەی بە گومان قســە دەکات بەبــێ زانیاریی، لەبەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴾ئــەوان تێیــدا بەدگومانن، مشــتو مڕیــش تێیدا لەســەر گومــانو پووچیــان دەکــەن، تیایانــدا هەیــە دەڵــێ: عیســا ﷺ خوایە، یــان کوڕی خوایــە، یان ســێیەمی ســێیەکانە، بــەرزیو مەزنی بــۆ خوا لەو بوختانو قســە هەڵبەســتراوانە، ﴿ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖ ﴾واتــە: ناگونجــێو شــایەن نیــە (بــۆ خــوا منداڵــی هەبێــت)، چونکــە ئــەوە لــە کارە ئەســتەمو مەحاڵەکانــە، لەبــەر ئــەوە خــوا ﷻ دەوڵەمەنــدی بێنیازی ســتایش کــراوە، خاوەنــی هەمــوو بەدیهێنراوەکانە، جــا ئیتر چۆن لــە بەنــدەو موڵکی خۆی یەکــێ دەکاتــە ڕۆڵەی خــۆی؟ ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥٓ ﴾واتە: پــاکو بێگــەردە لە منــداڵو ناتەواوی، ﴿ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا ﴾واتــە: (هەرکاتــێ بیەوێ کارێ بکات) لە کاروبــارە بچووکو گەورەکان هیــچ کــەس ناتوانــێ ڕێگــری لێبــکات، وە هیــچ کارێــک بۆ ئەو قــورسو زەحمــەت نیە، ﴿ فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾جــا ئەگــەر توانــاو دەســەڵاتی خــوا ﷻ جێبەجــێ کراوبــێ لە جیهانــی ســەروو خــوارو ئیتــر چــۆن دەبــێ منــداڵ بدرێتــە پاڵــی، وە ئەگــەر هەر شــتێکی بــوێ پێــی بڵــێ: ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾(ببــە یەکســەر ببێــت) ئیتر بۆچــی بەدیهێنانی عیســا ﷺ بەبێ باوک کارێکی دوورە؟

لەبــەر ئەمەیــە عیســا ﷺ هەواڵیــداوە کە ئــەو بەندەیەکی پــەروەردە کــراوە وەکو غەیری خــۆی، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ ﴾ئــەو خوایــەی کــە دروســتی کردووینو وێنــای کێشــاوین، وە کاروبارەکانمانــی بەڕێوە بردووەو هەڵســوڕێنەری قــەزاو قەدەرەکانە ﴿ فَٱعۡبُدُوهُ ﴾واتــە: بــە دڵســۆزیەوە بەندایەتــی بۆ بکــەنو بە چاکتریــن شــێوە گوێڕایەڵی

بکـەن، ئەمـە داننانـە بـە یەکتاپەرسـتی پەروەردگاریّتـیو یەکتاپەرسـتی پەرسـتراویّتی، وە بەڵگـە هێنانەوەیـە بـە یەکـەم لەسـەر دووەم، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴾ واتـە: ڕێگایەکی ڕاسـتو دروسـت دەیگەیەنـێ بە خوا ﷻ، لەبەر ئـەوە ڕێگای پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانێتی، جگـە لەم ڕێگایە ئەوە ڕێگای گومراییو سـەر لێشـێواویە.

(٣٧-٣٨): ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ٣٧ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَاۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ٣٨ ﴾:

﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡ ﴾ کاتێ خوا ﷻ حاڵی عیسـای کـوڕی مەریەمی ڕوونکردەوە کـە هیـچ گومـانو دوودڵیەکـی تێـدا نیـە، هەواڵیـداوە کـە دەسـتەو تاقمەکانـی گـاورو جوولەکـەو غەیـری وانیش جیـاواز بـوون لەبـارەی عیسـاوە، هەندێکیـان زۆر زێدەڕۆییان تێداکـردووەو ڕۆچـوون تیایـدا، هەندێکیـان وتوویانـە: عیسـا عليه السلام خوایـە، وە هەندێکـی دیکەیـان وتوویانـە: کـوڕی خوایـە، وە هەندێکی دیکـەش وتوویانە: سـێیەمی سـێیەکەیە. وە هەندێکـی دیکـە هەر بە پێغەمبەریشـیان نەزانیـوە، بەڵکو تۆمەتباریان کـردوە بەوەی کە منداڵی داوێن پیسـە، وەکـو جوولەکەکان.

هەمـوو ئەوانـە قسـەکانیان بەتـاڵو پووچو بـێ مانایـە، وە بۆچوونەکانیشـیان فاسـیدوو بێ عەقڵانەیـە، لەسـەر کەللەڕەقیو عینـادی بونیات نراوە، وە لەسـەر بەڵگەی خـراپو گومانی بـێ بـاو، هەمـوو ئەوانـە شایسـتەی هەڕەشـەی زۆر توونـدن، بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واتـە: (سـزاو لـە ناوچـوون بـۆ ئەوانەی کە بێبـڕوا بـوون) بە خواو پێغەمبـەرانو کتێبەکانـی، وە دەچێتـە نێویانـەوە جوولەکـەو گـاور، ئەوانـەی دەربـارەی عیسـا عليه السلام وتـەی کوفـرو بێبڕوایـی دەڵێـن: ﴿ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾ واتـە: بینینی ڕۆژی دوایـی، کـە شـایەتی بـۆ دەدا هەموو مرۆڤـەکان بە سـەرەتاو دواییـن، وە هەمـوو ئەوانەی لـە ئاسـمانەکانو زەویدان، دروسـتکەرو دروسـتکراو، ئـەو ڕۆژەی کە پڕە لـە بوومەلەرزەو ناخۆشـی، کـە پاداشـتی کارو کـردەوەکان دەگرێتەوە، جا ئـەو کاتە دەردەکـەوێ ئەوەی شـاردوویانەتەوەو دەریانخسـتووە، وە ئەوەیشـی پەنهانیـان کردوە.

﴿ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا ﴾ واتـە: ئـای کـە چەند بیسـەرو بینـەرن لـەو ڕۆژەدا، دان بە بێبڕواییو قسـە خراپـەکانو هاوبـەش دانانیـان دەنێـنو دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ١٢ ﴾ السجدة، (واتـە: ئـەی پەروەردگـاری ئێمـە ئـەوەی بەڵێنـت پێـدا بوویـن دیمـانو بیسـتمان دەی بمانگێـڕەوە بـۆ دونیـا تا کـردەوەی

چاک بکەین بە ڕاستی ئێمە دڵنیایین لە قیامەت)، جا لە ڕۆژی دوایدا حەقیقەتو ڕاستی ئەوەیان بۆ دەردەکەوێ کە لەسەری دەڕۆیشتن.

﴿ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ هیچ بیانوویەکیان نیە لەم گومڕاییەدا، چونکە لە نێوانی دوو شت دان نکوڵییەکی گومڕاکەر لەسەر بەرچاو ڕوونی، وە ناسینی هەقو خۆ لادان لێی، لە نێوان ئەم دووانە دان، وە لە نێوانی گومڕایی‌و سەرلێشێواو لە ڕێگەی ڕاستو توانا لەسەر فێر بوونو ناسینی هەقو ڕاستی، بەڵکو ڕازیە بە گومڕاییەکەی وە ئەوەیشی لەسەری دەڕوا لە خراپی کردەوەکانی، هەرگیز هەوڵ نادا بۆ ناسینی هەق لە پووچو بەتاڵ، سەرنج بدەو بزانە چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ پاش فەرموویەتی: ﴿ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ﴾ نەیفەرمووە (فويل لهم) (وەیل بۆ ئەوان)، بۆ ئەوەی ڕاناوەکە بگەڕێتەوە بۆ (الأحزاب) چونکە لە ناو ئەو حیزبە جیاوازانەدا دەستەو تاقمێکیان تێدا بوو کە شوێنی هەقو ڕاستی کەوتبوون، دەربارەی عیسا عليه السلام دەیانوت: (عیسا بەندەو پێغەمبەری خوایە) ئیمانیان پێ هێناو شوێنی کەوتن، ئەو بڕوادارانە ئەو هەڕەشەی خوا ﷻ نایانگرێتەوە، لەبەر ئەمەیە خوا هەڕەشەکەی تایبەت کردوە بە بێبڕوایان.


وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ
٣٩ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ٤٠ وَاذْكُرْ
فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ٤١ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ
لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا ٤٢ يَا أَبَتِ
إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا
سَوِيًّا ٤٣ يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ
عَصِيًّا ٤٤ يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ
فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا ٤٥ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ آلِهَتِي
يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا ٤٦ قَالَ
سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا ٤٧
وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَىٰ أَلَّا
أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا ٤٨ فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن
دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ٤٩
وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ٥٠
وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَىٰ إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ٥١

(٣٩-٤٠): ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾﴾: (الإنذار) واتە: ئاگادار کردنەوەیەکە کە ترساندنی لەگەڵدابێ، وە هەواڵدان بە سیفەتەکانی، وە حەقیقەتی ئەوەی بەندەکانی پێ ئاگادار دەکاتەوەو دەیانترسێنێ ڕۆژی حەسرەتو ئاخ هەڵکێشانە، کاتێ کە کاروباری خەڵکی کۆتایی پێ دەهێنرێ، سەرەتاو کۆتایان لە یەک شوێندا کۆدەکرێنەوە، وە پرسیاریان لێدەکرێ دەربارەی کردەوەکانیان، جا هەر کەسێک بڕوای بە خوا هێنابێو شوێنی پێغەمبەرانی کەوتبێ، ئەوە خۆشبەختو کامەرانە، کە دوای ئەوە هەرگیز تووشی ناخۆشیو بەدبەختی نابێ، وە هەر کەس بڕوای نەهێنابێ بە خواو شوێنی پێغەمبەرانی نەکەوتبێ ئەوە بەدبەختو چارە ڕەش دەبێ، دوای ئەوە هەرگیز خۆشبەختی بە خۆیەوە نابینێ، نەفسو ماڵی خۆی بە خەسارەت دەدا، ئەو کاتە ئاخ هەڵدەکێشێو پەشیمان دەبێتەوە بە جۆرێک کە دڵو سنگی پارچە پارچەو شەق دەبێ، جا داخو حەسرەتێک لەوە مەزنترە لە لەدەستدانی ڕەزامەندی خواو بەهەشتەکەی،وە خۆی شایستەی تووڕە بوونو ئاگر بکات، بە جۆرێک کە نەتوانێ بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی کردەوەی چاک بکات، وە هیچ ڕێگایەک نەبێ بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیا کاروبارەکانی بگۆڕێ؟!

ئەمە پێشینیانە ئەوان لە دونیادا بێ ئاگایی بەرچاوی گرتبوون، بێ ئاگان لەو ڕۆژە سەختو گەورەیە، هەرگیز ئەو ڕۆژەیان بەدڵدا نایەت، ئەگەر بەدڵیشیاندا بێ ئەوە هەر بێ ئاگا بوون، بێئاگاییو بێهۆشی باڵی بەسەردا کێشا بوون، ئەوانە هەرگیز بڕوا بە خوا ﷻ ناهێنن، وە شوێنی پێغەمبەرانیش ناکەون، دونیا سەرقاڵی کردوون، ئارەزووە کاتیەکانیان بۆتە بەربەست لە بەردەم ئیمان هێنانیان، جا دونیاو ئەوەیشی تیایدایە

لـە سـەرەتاوە تـا کۆتـا لـە دەسـتی خاوەنەکـەی دەردەچـێ، وە خاوەنەکانیشـی ئـەو جێ دەهێڵـن، سـەرەنجام زەوی‌و ئەوەیشـی لە سـەریەتی هەر بۆ خـوا ﷻ دەمێنێتـەوە، هەموویان دەگەڕێنـەوە بۆ لای خوا ﷻ، پاداشـتیان دەداتـەوە بەپێی ئەو کردەوانەی تیایـدا کردوویانە، ئەوەیشـی لـە دەسـتیان داوە تیایدا، یـان بە دەسـتیان هێناوە، هـەر کەسـێک چاکەیە بکات ئـەوە بـا ستایشـی خوا ﷻ بـکات، وە هـەر کەس جگە لـەوە ئەنجام بـدات ئەوە بـا لۆمەی کـەس نـەکات جگـە لە خـۆی نەبێ.

(٤١-٥٠): ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا
يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ
أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ
إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ
ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ
لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ
أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ
وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ ڕێزدارتریـن کتێـب‌و چاکترینیـان‌و بەرزترینیـان ئـەم کتێبـە ڕوونکەرەوەیـە کـە بیرخەرەوەیـەو پـڕە لـە دانایـی، ئەگـەر هەواڵەکانـی تێدا بـاس کرابێ ئـەوە ڕاسـترین‌و شایسـتەترینیانە، وە ئەگـەر فەرمـان‌و قەدەغەکردنی تێدا بـاس کرابێ ئەوە بەرزتریـن فەرمـان‌و قەدەغەکـراوەکان‌و دادپەروەرترینیانـە، وە ئەگـەر باسـی پاداشـت‌و هەڕەشـەو پەیمانـی تێـدا کرابێ ئەوە شایسـتەترین‌و بـە بەڵگەترین دەنگ‌و باسـێکە کە بینا کـراوە لەسـەر دادگەری‌و حیکمەت‌و فـەزڵ، وە ئەگەر لە شـوێنێکدا باسـی پێغەمبەرانی تێدا کرابـێ، ئـەوەی کـە باسـکراوە تەواوتـرو چاکترە لە غەیـری خـۆی، بۆیە لە زۆر شـوێندا لـە بەسـەرهاتی پێغەمبەران باسـی ئەوە دەبینیـن کە فەزڵیان دراوە بەسـەر غەیـری خۆیانداو پلەیـان بـەرز بۆتـەوە، ئەمـەش بـە هـۆی ئـەو کارە گەورەوەیـە کـە پێـی هەڵسـاون، لـە بەندایەتـی بـۆ کردن‌و خۆشویسـتن‌و ملکەچ بوون‌و هەڵسـان بـە جێبەجێ کردنـی مافەکانی خـۆی‌و مافـی بەندەکانـی، وە بـە هۆی بانگـەواز کردنـی خەڵکی بـۆلای خـواو ئارامگرتن لەسـەری، بـە هـۆی ئـەو کارانـەوە پێگـەی بەرزیـان بـە دەسـت هێنـاوەو گەیشـتوون بە مەقامـی زۆر بڵند.

لەم سـوورەتەدا خوا ﷻ باسـی کۆمەڵێ لـە پێغەمبەرانی کـردوە، فەرمانی بـە پێغەمبەرەکەی کـردوە یادیـان بکاتـەوە، چونکـە لـە یادکردنەوەیانـدا وەسـفو پیاهەڵدانـی خـواو ئـەو پێغەمبەرانـە دەردەکەوێ، وە ئاشـکراکردنی فەزڵو چاکەی خوا ﷻ بۆ ئەوانە، وە هاندانیشـی تێدایـە لەسـەر برواهێنـان پێیـانو خۆشویسـتنیانو پەیرەوکردنیـان، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴾ خـوا هـەردوو سـیفەتی پێغەمبەرێتـیو ڕاسـتگۆیەتی بەیەکـەوە هێناوە.

(صدیـق): زۆر ڕاسـتگۆ، ڕاسـتگۆیە لـە گوفتارو کـردارو بارودۆخیـدا، وە بە ڕاسـتدانەری هەمـوو ئەمانەیـە کـە فەرمانـی پێکـراوە بـە ڕاسـتی دابنـێ، ئەویش زانسـتی مـەزن لە خۆ دەگـرێ کـە گەیشـتۆتە نـاو دڵو کاریگـەری لەسـەر دروسـتکردوەو گەیشـتۆتە پلـەی یەقیـنو دڵنیایـی، وە کـردەوەی چاکو تـەواوی ئەنجـام داوە، ئیبراهیـم ﷺ بەرێزترینی نـاو پێغەمبەرانە دوای موحەممەد ﷺ، باوکی سـێیەمە بۆ دەسـتە بەرێزەکان، ئـەو پێغەمبەرەیە کـە خـوا لەوەچەو نەوەکانیـدا پێغەمبـەرانو کتێبی ڕەوانە کـردوون، وە ئـەو پێغەمبەرە بوو کـە بانگـی خەڵکـی کـردوە بـۆ لای خـوا ﷻ، ئارامی گرتووە لەسـەر ئـەو هەمـوو ئازارو ناخۆشـیانەی تووشـی بووە، بانگـی نزیکو دووری کـردوە، هەوڵێکـی زۆری داوە لە بانگ کردنـی باوکیـدا، پەروەردگار باسـی چۆنیەتی ئـەو بانگەوازیـەی لەگەڵ باوکیـدا دەکاتو فەرموویەتـی: ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ ﴾ بەندایەتـی بـۆ کردنی بتەکانی بە باشـی بـۆ ڕوون کردەوەو پێـی وت: ﴿ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴾ واتـە: ئـەی باوکـی خۆشەویسـتم بۆچـی بتانێـک دەپەرسـتی کـە لە خـودی خۆیانـدا ناتـەواون، وە بـە هەمان شـێوە لـە کرداریشـیاندا، نە دەبیسـتێو نـە دەبینـێ، وە هیـچ زەرەرو زیانێکی بە دەسـت نیە بـۆ بەنـدەکان، بەڵکـو بـۆ نەفسـی خۆیشـی هیـچ قازانجێکـی نیـە، وە لـە توانایدا نیـە هیچ شـتێک ڕەت بکاتەوە، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشـکرایە، لەسـەر عیبادەت کردنی شـتێکی ناتـەواو لـە زاتو کردەوەکانیـدا شـتێکی ڕەتکراوەیـە بە شـەرعو عەقڵ.

وە بـە ئاماژەکردنیـش دەبێتـە بەڵگـە ئەوەی پێویسـتو چاکـە بەندایەتی ئەو کەسـە بکرێ کـە تـەواوەو کامڵـە، ئەوەی کە بەنـدەکان هیـچ نازونیعمەتێکیان دەسـت ناکـەوێ تەنها لە ئـەوەوە نەبـێ، وە هیـچ کەسـیش نیـە زیانو ناخۆشـیان لـێ دووربخاتـەوە جگە لـە خوای بـەرزو مەزن.

﴿ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ ﴾ واتـە: ئـەی باوکـی خۆشەویسـتم بـە

کەمم مەزانە، وە دەڵێ من کوڕی تۆم، ئەوەی لای تۆ هەیە لای من نیە، بەڵکو خوا هەندێ زانستی پێداوم کە بە تۆی نەداوە، مەبەستیش لەمە ئەو فەرمایشتەیە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴾ واتە: ڕێگایەکی ڕاستو ڕەوان، ئەویش بەندایەتی کردنی خوای تاکو تەنهاو بێ شەریکە، وە گوێڕایەڵی کردنی لە هەموو بارودۆخەکاندا، لەم دواندنەدا نەرمو نیانیەکی تەواو دەردەکەوێ لەلایەن ئیبراهیمەوە بۆ باوکی، بە باوکی نەوت: (أنا عالم، وأنت جاهل) واتە: من زانامو تۆ نەزانی، یان نەیوت: (لیس عندک من العلم شیئاً) واتە: تۆ هیچ زانستێکت نیە.

بەڵکو بە شێوەیەک دواوە لەگەڵ باوکیدا ئەوەی لە لای منو تۆ هەیە هەردووکی هەر زانستە، بەڵام ئەوەی گەیشتۆتە من نەگەیشتۆتە تۆ، پێویستە لەسەرت شوێنی بەڵگەو حوججە بکەویو گوێڕایەڵی بکەی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ ﴾ (ئەی باوکی خۆشەویستم شەیتان مەپەرستە) چونکە هەر کەسێک بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکات ئەوە بەندایەتی شەیتانی کردوە، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ ﴾ یس، (واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئایە وەسیەتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە بە ڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە)، واتە: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴾ جا هەر کەسێک شوێن پێی شەیتان بکەوێ ئەوە یاخیە لە خوا، وەکو شەیتان، وە لە باسکردنی دانەپاڵی وشەی (العصیان) بۆ لای ناوی (الرحمن) ئاماژەیە کە سەرپێچیو تاوان دەبێتە بەربەست لە بەردەم بەزەیی خوادا، وە دەرگاکانی بەسەردا دادەخات، هەروەک چۆن گوێڕایەڵی گەورەترین هۆکاری بەدەستهێنانی بەزەیی خوایە، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ واتە: بە هۆی سوور بوونت لەسەر کوفرو ڕۆچوونت لە سەرپێچیی کردنی خوا ﴿ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴾ واتە: (ببیتە دۆستی شەیتان) لە دونیاو دوارۆژدا، دەترسم دابەزیتە ئاستی پلەو پایە نزمەکانی ئەو، وە فرێ بدرێیتە شوێنە پڕ زیانەکانی ئەو، ئیبراهیمی خەلیل عليه السلام پلە بە پلە بانگەوازەکەی دەست پێکرد لەگەڵ باوکیدا لە ئاسانترینیانەوە بۆ ئاسان، هەواڵی پێدا بەو زانستەی کە پێی دراوە، ئەو زانستەش ئەوە دەخوازێ کە شوێنی من بکەوی، تۆ ئەگەر گوێڕایەڵیم بکەی ڕێنماییت دەکەم بۆ ڕێگای ڕاست، پاشان قەدەغەی لێکرد لە بەندایەتی بۆ شەیتان، وە هەواڵی ئەوەی پێدا کە چەندین زیانی لێدەکەوێتەوە، پاشان ئاگاداری کردەوە لە

سـزاو خەشـمو قینـی خوا ئەگەر بـەردەوام بێ لەسـەر ئەو حاڵـە، وە دەبێتە دۆسـتو هاوەڵی شـەیتان، ئـەم هەمـوو دواندنە هیچ سـوودێکی نەبـوو لەگەڵ ئـەو بەدبەختەدا، بـە وەڵامێکی نەفامانـە وەڵامـی دایـەوەو وتـی: ﴿أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ﴾(واتـە: تـۆ واز لە پەرسـتراوەکانی مـن دێنـیو نایانپەرسـتی)؟! شـانازی بـەو پەرسـتراوانەوە دەکـرد کـە لە بـەردو صەنـەم دروسـتکرابوون، وە لۆمـەو سەرزەنشـتی ئیبراهیمـی دەکـرد لەسـەر ئەوەی کـە وازی لێهێنـاونو نایانپەرسـتێ، ئەمـەش لە نەفامیەکی قـوڵو بێبڕواییەکی زیانبەخشـەوە سـەرچاوەی گرتـووە، شـانازی دەکـرد بە پەرسـتنی بتەکانو بانگەشـەی بـۆ دەکردن.

﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ﴾واتە: (سـوێند بێ ئەگەر واز نەهێنی) لە قسـەکردنت بە پەرسـتراوەکانم، وە بانگـەواز کردنـم بـۆلای بەندایەتی کردنی خـوا ﴿لَأَرْجُمَنَّكَ﴾واتە: بە بـەرد دەتکوژم ﴿وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾واتـە: بڕۆ ماوەیەکی زۆر قسـەم لەگەڵ مەکە.

ئیبراهیمـی خەلیل ﷺ وەڵامی دایـەوە، بە وەڵامدانەوەی بەندەکانی خوا لـە کاتی دواندنیان لەگـەڵ نەفامەکاندا، قسـەی ناشـرینی پێ نـەوت بەڵکو ئارامـی گرت، ڕووبـەڕووی باوکی نەبوویـەوە بـە شـێوەیەک کە پێـی ناخۆش بـێ، وتـی: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكَ﴾واتە: سـەلامەت دەبـی لـە دواندنـم لەگەڵتـدا لە جنێو تانەو تەشـەرو قسـەی ناشـرین، وە بە هەر شـتێک تۆ پێـت ناخـۆش بـێ، ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾واتـە: سـەرەڕای ئەمەش مـن بـەردەوام داوای هیدایـەتو لێخۆشـبوونت بۆ دەکـەم لای خوا، بـەوەی هیدایەتت دا بۆ ئیسـلام کـە بـەو هۆیەشـەوە لێخۆشـبوون بەدەسـت دێنـی ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾واتە: (بـە ڕاسـتی پەروەردگـار) لەگەڵمـدا بەبەزەیـیو میهرەبانـە، چاودێریـم دەکات، بـەردەوام داوای لێبوردنـی بـۆ دەکـرد لـە لای خوا، بـە ئومێدی ئـەوەی خـوا هیدایەتی بـدات، کاتێ بـۆی دەرکـەوت باوکی دوژمنی سەرسـەختی خوایـە، هیچ شـتێک سـوودی پێناگەیەنێت، وازی لـە داوای لێبـوردن هێنـاو خۆی لێی بـەری کرد.

بێگومـان خـوا فەرمانـی پێکردوویـن شـوێنی میللەتـی ئیبراهیـم ﷺ بکەویـن، لـە شـوێنکەوتنی میللەتەکـەی گرتنـە بـەری ڕێگاکەیەتـی لە بانگـەواز کردن بـۆ لای خوا، بە ڕێگـای زانسـتو حیکمـەتو نـەرمو نیانـیو لە سـەرخۆیی، وە گواسـتنەوە لـە پلەیەکەوە بـۆ پلەیەکـی دیکـە، وە ئـارام گرتنیـش لەسـەریو بـێ ئومێـد نەبـوون لێی، ئـارام گرتنی بانگخـواز لەسـەر ئـەوەی دێتە پێشـی لـە ئەزیـەتو ئازاردانی لەلایـەن خەڵکی بە قسـەو بە کـردەوە، بەرەنگاربوونەوەیـان بـە لێبوردنو بەخشـینیان، بەڵکـو چاکەکـردن لەگەڵیاندا بە

قســەو کردەوە.
کاتــێ بــێ ئومێــد بــوو لــە گەلەکەیو لــە باوکــی وتــی: ﴿ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: (وە دوورە پەرێــز دەبــم لــە) خۆتــانو ئــەو بتانــەش کــە دەیپەرســتن، ﴿ وَأَدۡعُواْ رَبِّي ﴾ (واتــە: لــە پەروەردگــارم دەپاڕێمــەوە)، ئەمــەش هــەردوو پاڕانەوەکــە دەگرێتــەوە، پاڕانــەوەی پەرســتن، پاڕانــەوەی داوا کــردن، ﴿ عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴾ واتــە: ئومێــدەوارم خــوا خۆشــحاڵم بــکات بــە وەڵامدانــەوەی دوعاکانــمو قبووڵ کردنــی کردەوەکانــم، ئەمە پیشــەی کەســێکە کــە بــێ ئومێد بــێ لەوانەی کە بانگەشــەیان بــۆ دەکات -ئەوانیش شــوێنی هەواوئــارەزوو کەوتــوون، ئامۆژگاری ســوودی نەبوو بۆیان، بۆیــە بــەردەوام بوون لــە سەرکێشــیو لاری خۆیاندا- ســەرقاڵ بــێ بە چاککردنــی نەفسو دەروونــی، ئومێــدو تکای وابــێ پەروەردگــاری کردەوەکانی لــێ وەربگــرێ، وە خۆی دور بگرێ لــە شــەری خەڵکــی خراپەکار.

﴿ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلًّا ﴾ (واتــە: جــا کاتێــک ئیبراهیــم دوور کەوتــەوە لــەوانو لــەو بتانــەی کــە دەیانپەرســت ئێمە ئیســحاقو (لــە ئیســحاقیش) یەعقووبمــان پێ بەخشــی کە هەریــەک لەوانیشــمان) واتە: لە ئیســحاقو یەعقــووب، ﴿ جَعَلۡنَا نَبِيّٗا ﴾ (واتــە: کــرد بــە پێغەمبەر)، ئــەو دیاریەی بۆ بە دەســت هات کــە بریتــی بــوو لــە بــوون بــە یەکێــک لــە پێغەمبــەرە چاکانی خــوا ﷻ بــۆ نــاو خەڵکی ناردبــوون، ئەوانــەی خــوا ﷻ تایبەتــی کردوون بــە وەحیو نیگــای خــۆی، وە هەڵیبژاردن بــۆ پەیامەکــەیو لە نــاو جیهانــدا پاڵفتــەی کردن.

﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُم ﴾ واتــە: ئیبراهیــمو کوڕەکانیمــان (بەهرەمەنــد کــرد)، ﴿ مِّن رَّحۡمَتِنَا ﴾ (واتــە: لــە بەزەیــی خۆمــان)، ئەمــە هەمــوو ئــەو ڕەحمەتانــەی خــوا دەگرێتــەوە کــە بــە دیــاری پێــی بەخشــین، لــە زانســتە بــە ســوودەکانو کــردەوە چاکــەکانو نــەوەی زۆرو بەربــڵاو، کــە پێغەمبــەرانو پیاوچاکانێکی زۆریــان تێدا بــوو، ﴿ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴾ (واتــە: باســی چاکــەی ئەوانمان خســتە ســەر زوبانــی خەڵکی)، ئــەوەش یەکێکی دیکەیــە لــەو بەزەییانــەی کە خوا بــە ئیبراهیــمو منداڵەکانی بەخشــی، چونکە خــوا پەیمانی بــە هەمــوو چاکەکارێــک داوە کــە ناوبانگــی چاکــی بــڵاو بکاتەوە بــە پێــی چاکەکانی، ئەوانیــش لــە پێشــەوایانی چاکەخــواز بوون، خوا ستایشــی ئەوانــی بڵاو کردەوە ستایشــێک پــڕ لــە ڕاســتیو دوور لــە درۆ، ستایشــێکی بــەرزی دیار نــەوەک شــاراوە، خەڵکی باســیان

دەکـەن لـە ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاوا، ستایشـیان دەکەنو خۆشـیان دەویـن پڕ بەدڵـەکان، وە خۆشەویسـتیەک لەسـەر زمانـەکان، ئەوان بوون بە پێشـەنگ بـۆ پەیـڕەوکاران، وە بوون بە پێشـەوای هیدایـەت دراوان، لە هەمـوو سـەدەکاندا یادکردنەوەیـان نوێ دەبێتـەوە، ئەوەش فـەزڵو چاکـەی خوایـە، دەیبەخشـێ بـە هـەر کەسـێک کـە بیـەوێ، وە خـوا ﷻ خاوەن فـەزڵو چاکـەی مەزنە.

(٥١-٥٣): ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ۝٥١ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ۝٥٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ۝٥٣ ﴾.

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ ﴾ واتـە: لـەم قورئانـە مەزنەدا باسـی مووسـای کـوڕی عیمران بکـە، بـە شـێوەیەکی پـڕ لـە ڕێـزو گەورەیـی، وە پلـەو پایـەو خوڕەوشـتی تـەواوی بناسـێنە ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی ئـەو کەسـێکی هەڵبـژاردە بـوو)، بـە (فتحـة)ی (لام) خوێنراوەتـەوە بـە مانـای: ئـەوەی کـە خـوا ﷻ هەڵیبـژاردووەو باڵفتـەی کـردوە بەسـەر جیهانیانـدا، وە بـە (کسرة)ی (لام)ەکـەش خوێنراوەتـەوە (مخلِصا) بـە مانـای: مووسـا کەسـێکی دڵسـۆز بـووە بـۆ خـوا ﷻ لـە هەمـوو کارو کـردەوەو وتـەو نیەتەکانیـدا، لـە هەمـوو بارودۆخەکانـدا وەسـف کـراوە بـە دڵسـۆزی، وە هـەردوو ماناکـە تەواوکـەری یەکتـرن، بێگومـان خـوا ﷻ هەڵیبـژاردوە بـە هـۆی دڵسـۆزیەوە، وە دڵسۆزیشـی بووەتـە مایـەی هەڵبژاردنـی، مەزنتریـن حاڵـەت کـە بەنـدە وەسـفی پـێ بکـرێ بریتیـە لـە دڵسـۆزی بـوون بـۆ خـوا ﷻ، ﴿ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴾ (واتـە: نێـردراوو پێغەمبـەر بـوو بـۆ نـاو خەڵـک) واتـە: خـوا بـۆی کۆکـردەوە نێـردراویو پێغەمبەرایەتی (الرسـالة والنبـوة) جـا نێردراوێتـی (الرسـالة) گەیاندنـی فەرمایشـتی خـاوەن نێـردراو دەخـوازێ، وە گەیاندنـی هەمـوو ئـەو یاسـاو ڕێسـایانە کـە لـە ڕیسـالەکەدا هاتـووە، بـە وردو درشـتیەوە، وە پێغەمبەرایەتـی (النبـوة) وەحـی خـوا دەگەیەنـێ بـۆ پێغەمبەرەکـەی، وە تایبەتـی دەکات بـە دابەزاندنـی وەحـی بـۆی، جـا پێغەمبەرایەتـی (النبـوة) لـە نێـوان ئـەوو پەروەردگـاری دایـە، وە نێردراوێتـی لـە نێـوان ئـەوو خەڵکـی دایە، بەڵکـو خوا ﷻ مووسـا ؏ی تایبـەت کـردوە لـە بەرزتریـنو چاکترینـی جۆرەکانـی وەحـی، کـە ئەویـش قسـەکردنیەتی لەگـەڵ خـوادا، وە نزیـک کردنەوەیەتـی بـە شـێوەیەک قسـە لەگـەڵ خـوادا بـکات، بـەم شـێوەیە تایبـەت کـراوە لـە نـاو پێغەمبەرانـدا بـە (کلیـم الله)، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی:

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ٥٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن
رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ٥٣ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ
صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ٥٥ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ
كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ٥٧ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ
ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن
ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ٥٨ ۞فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ
خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا
٥٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ
وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ٦٠ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ
بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ٦١ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا
سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ٦٢ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي
نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ٦٣ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ
مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ٦٤

﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا﴾ واتــە: (ئێمــە ئەومــان بانــگ کــرد) لــەلای ڕاســتی کێــوی طــور لــە کاتــی ڕۆشــتنیدا یــان (الأیمــن) واتــە: بەرەکەتدار لــە (الیُمْــن) وەرگیــراوە، واتــە: بەرەکەت، ئــەم مانایــە بەڵگەیــە لەســەر وتــەی خــوا ﷻ ﴿أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا ٨﴾ النمــل، واتــە: (کاتێــک مووســا گەیشــتە لای ئاگرەکــە بانگــی لێکــرا کــە موبــارەکــو بەبەرەکــەتو پیــرۆز بــوو). ﴿وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا﴾ واتــە: مووســامان نزیــک کــردەوە تــا قســەی لەگەڵــدا بکەیــن، جیــاوازی لــە نێــوان بانــگ کــردنو قســە لەگــەڵ کردندا (النداء) بانــگ کردن بریتیە لــە هاوار بــە دەنگی بــەرز، (والنجاء) بریتیە لە قســەکردن بە شــێوەیەک لە خــواری ئەوەوە بێ، لەم دەقەدا قســەکردنی خوا ﷻ دەچەســپێنێ، وە جۆرەکانی لە (بانگکردنو قســەکردن) ئەمــەش مەزهەبــی ئەهلی ســوننەو جەماعەیــە، پێچەوانــەی ئەوانــەی ئینکاری قســەکردنیان کــردوە، لــە جەهمیــەو موعتەزیلــەکان، وە ئەوەیشــی شــوێن پێــی ئەوانــی هەڵگرتبێ.

وە کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴾ (واتــە: لــە بەزەیــیو بەخشــندەیی خۆمــان هاروونــی برایمــان دا بە مووســا کــە ئەویــش پێغەمبەر بــوو)، ئەمە لە گەورەتریــن فــەزڵو چاکــەی مووســاو ئامۆژگــاری بوو بــۆ براکەی هــاروون، ئــەو داوای لــە پەروەردگــاری کرد کە لــەو کاروبارەدا کەســێکی لەگەڵــدا بکاتە شــەریک، وە بیکات بــە نێــردراو وەکو ئــەو، خوای گــەورەش ئــەو دوعایەی لێوەرگــرت، خوا ﷻ لــە بەزەییو بەخشــندەیی خــۆی هاروونی بــرای کرد بــە پێغەمبــەر، جــا پێغەمبەرایەتی هاروون شــوێنی پێغەمبەرایەتــی مووســا ﷺ کەوتــووە، هــاوکاری کــردوە لــە کاروبارەکانیدا وە پشــتیوانی لێکردوە.

(٥٤-٥٥): ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ

بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ ﴾:
واتـە: لـە قورئانـی پیـرۆزدا باسـی ئـەم پێغەمبـەرە مەزنەیـان بـۆ بکە کـە گەلی عـەرەب لـەوەوە بـوون، وە گـەورەی وەچـەی ئادەمیش هـەر لـەوەوە پەیدا بـووە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ ﴾ (بێگومـان ئـەو لـە پەیمـانو بەڵێنەکانیـدا ڕاسـتگۆ بوو)، واتـە: هیـچ پەیمانێکی نـەدەدا ئیـلا جێبەجێـی کـردوە، ئەمـەش هەمـوو ئـەو پەیمانانـە دەگرێتـەوە کـە لەگـەڵ خـوا ﷻ، یـان لەگـەڵ بەندەکانـی خـوادا بەسـتوویەتی، وە لەبـەر ئەمەیـە کاتـێ پەیمانـی دا بـە باوکـی لـە کاتـی سـەربڕیندا ئـارام بگـرێ، وە وتـی: ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾الصافـات، (بـەم زووانـە دەمبینـی بـە ویسـتی خـوا یەکێـک دەبـم لـە ئارامگـران)، وەفـای بـوو بـەو قسـەیەی کـە کـردی، باوکی هانـدا لەسـەر سـەربڕینەکە، کـە ئـەوە گەورەتریـن موصیبـەتو تاقیکردنەوەیـە کـە تووشـی مـرۆڤ دەبـێ، پاشـان وەسـفی کـردوە بـە نێـردراویو پێغەمبەرایەتی کـە گەورەترینـی منەتەکانی خوایە بەسـەر بەندەکەیـەوە، وە شـوێنکەوتووانی لـە پلـەو پایـە بەرزەکانـدان لـە نـاو خەڵکیـدا.
﴿ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ ﴾ واتـە: هەڵدەسـتا بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی خوا بەسـەر خێزانەکەیـدا، فەرمانـی پـێ دەکردن بـە ئەنجامدانـی نوێژێک کە ئیخلاصـی تێدابێ بـۆ خـوای پەرسـتراو، وە زەکاتدانێـک کـە چاکـەی تێدابـێ بۆ بەنـدەکان، سـەرەتا خۆی کامـڵو تەواو کرد، پاشـان غەیری خۆشـی تـەواو کرد، بـە تایبـەت تایبەتمەندترین کەس لـەوەوە ئەویـش خانەوادەکەی بـوو، چونکە لە پێشـتر بوون بـە بانگەوازەکەی لە کەسـانی تـر، ﴿ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴾ (واتـە: هەمیشـە لـە لای پەروەردگاری جێگـای ڕەزامەندی بـوو)، ئەویش بـە هۆی گوێڕایەڵـی کردنی ڕەزامەنـدی پەروەردگاری، وە کۆشـش کردنی لـەو کارەی جێگـای ڕەزامەنـدی خوایە، خـواش لێی ڕازی بـوو کردی بە یەکێـک لە بەندە تایبەتـەکانو دۆسـتە نزیکەکانـی خۆی، خـوا لێی ڕازی بـوو، وە ئەویش لـە پەروەردگاری ڕازی بوو.
(٥٦-٥٧): ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ ﴾:
واتـە: باسـی بکـە لـە قورئانـدا لـە ڕووی بە گـەورە گرتنو ڕێـزو پلـەو پایە بۆ دانـان، وە وەسـف کردنـی قورئـان بـە سـیفەتی تـەواو بـێ کـەمو کوڕیـی، ﴿ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴾ (باسـی ئیدریـس بکـە) خـوا ﷻ بـۆی کۆکردوەتـەوە لە نێـوان ڕاسـتگۆییەک کە هەمـوو ڕاسـتیەکی تەواوو زانسـتی کامـڵو دڵنیایی چەسـپاو کردەوەی چـاک دەگرێتەوە،

وە نێـوان هەڵبژاردنـی بـۆ وەحی خـۆیو پەیامەکەی.

﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾واتە: خوا ناوبانگی بەرز کردەوە لە ناو جیهانیاندا، وە پێگەی بەرز کردەوە لە نێو نزیکانی خۆیدا، بۆیە ئەو هەم دەنگو باسی هەم پێگەی بەرز بوو.

(٥٨): ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴿٥٨﴾ ﴾

کاتێ باسـی ئـەو پێغەمبـەرە بەرێزانـەی کرد، ئنجا باسـی فـەزڵو چاکەو پلـەو پایەکانیانی کـرد، فەرمـووی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾واتـە: خـوا نـازو نیعمەتێکـی دابارانـد بەسـەریاندا هیچ نیعمەتێکـی دیکە پێی ناگات، وە منەتێکی کرد بەسـەریاندا پێشـتر منەتـی لەو جۆرەی نەکردوە بەسـەریاندا، لـە پێغەمبەرایەتیو نێـردراوی، ئەوانەن کە خوا ﷻ فەرمانـی پێکردوویـن، داوای لێبکەیـن هیدایەتمان بـدات بۆ ڕێگای ئەوانـەی نیعمەتی خۆی ڕژانـدوە بەسـەریاندا، هـەر کەسـێک گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ بـکات ئـەوە ﴿ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴿٦٩﴾ ﴾النسـاء. (واتـە: لەگـەڵ ئەوانەدایـە کـە خـوا نیعمەتـی لەگەڵ کـردوون لە پێغەمبەرانی خۆی)، وە هەندێکیـان ﴿ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴾واتە: (لـەو پێغەمبەرانـە هەندێکیـان لە نـەوەی ئادەمـن (وەک ئیدریـس) وە لە نـەوەی ئەوانەش (کـە لە کەشـتییەکەدا) لەگەڵ نوحدا هەڵمـان گرتـن (وەک ئیبراهیم) ﴿ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ ﴾(واتـە: وە لـە نەوەی ئیبراهیـمو یەعقووب وەک ئیسـماعیلو یوسـف)، ئەمانە باشـترین ماڵەکانـی جیهانن، خـوا ﷻ هیدایەتـی داونو هەڵبـژاردوون، ئەوانـە حاڵیان وایە لـە کاتـی خوێندنـی ئایەتەکانـی خـوای بەبەزەییدا، کـە باس لـە هەواڵی غەیـبو پەنهانو سـیفاتەکانی خـوای مـەزنو هەواڵـی ڕۆژی دوایـیو پەیمانو هەڕەشـەکان، ﴿ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴾واتـە: ملکـەچ دەبـن بـۆ ئایەتەکانـی خـوا ﷻ، وە ترسـیان لە خـوا زیاتـر دەبێ، ئـەم ترسـەش شـوێنەواری خـۆی لـە نـاو دڵەکانیانـدا جێدەهێڵێ لـە ڕووی ئیمـانو ئومێدو ترسـەوە، وایـان لێـدەکات بگریـنو سـوژدە ببەن بـۆ پەروەردگاریـان، ئەمانە لەو کەسـانە نیـن ئەگـەر ئایەتەکانی خوا ببیسـن وەک کـەڕو لاڵو کوێـر بەسـەریاندا تێدەپەڕن.

وە لـە دانەپاڵـی ئایەتەکان بـۆ لای ناوی خـۆی ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کـە ئایەتەکانـی لـە ڕەحمەتو چاکـەی خۆیەتی بـۆ بەندەکانی، کاتـێ هیدایەتـی داون بۆ هـەق، چاوەکانیانـی پاراسـتووە لـە کوێـریو ڕزگـاری کـردوون لـە گومڕایـیو کوێری کـردوون بەرانبەر بـە نەفامی.

(٥٩-٦٣):﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ ﴾:

﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ ﴾ کاتێ باسی ئەو پێغەمبەرە دڵسۆزانەی کرد، ئەوانە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوونو گوێڕایەڵیان دەکرد، ئنجا باسی ئەوانەی کرد کە لە دوای ئەوان هاتن، ئەو فەرمانەی پێیان کراوە گۆڕیان، بە ڕاستی ئەوان کەسانێک لە نەوەکانیان بوونە جێنشینیان، گەڕانەوە بۆ دواوە، نوێژەکانیان دەفەوتاند کە فەرمانیان پێکرابوو بەجێی بهێننو پارێزگاری لێبکەن، کەمتەرخەمیان تێدا کردو پشتگوێیان خست، جا ئەگەر نوێژەکان بفەوتێنن کە کۆڵەکەی دینەو تەرازووی ئیمانو دڵسۆزیە بۆ پەروەردگاری جیهانییان، وە ئەنجامدانی نوێژ لەو کردەوانەیە کە زۆر جەختی لێکراوەتەوە، وە باشترین خەسڵەتە بۆ ئینسان، هەر کاتێک ئەو نوێژە بەو پێگە گەورەیەی خۆی زایە کرا، ئەوە زایە کردنی بابەتەکانی تری دین زۆر ساناتر دەبێ، وە بابەتەکانی تریش ڕەتدەکرێتەوە، هۆکاری سەرەکی بۆ ئەمە ئەوەیە ئەوان شوێنی هەواو حەزوو ئارەزوی نەفسو دەروونیان کەوتن، خەڵکی دوای ئەوە هەموو خەمێکیان تێر کردنی هەواو ئارەزووەکانیان بوو، پێشیان خستبوو بەسەر هەقو مافەکانی خوادا، بەرهەمی ئەو شوێنکەوتنە بوو بە مایەی لە دەستدانی مافەکانی خوا، وە بووبە هۆی ئەوەی زیاتر ڕۆبچن لە حەزوو ئارەزووەکانی نەفسو دەروونیان، هەرچۆنێ بۆیان ڕێک بکەوتایە بەدەستیان دەهێنا، بە هەر جۆرێ بهاتایەتە پێشیان کەمتەرخەمیان نەکرد﴿ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴾ واتە: (ئەوانە لە داهاتوودا تووشی) سزایەک دەبن بە قەد دوو هێندە زۆر توندوو بە ئێش دەبێ.

پاشان جیای کردوەتەوە فەرموویەتی:﴿ إِلَّا مَن تَابَ ﴾ (واتە: جگە لەوەی تەوبەی کردبێ) لە هاوەڵدانانو بیدعەو سەرپێچی کردن، خۆی دارنی بێ لەمانە پەشێمان بوویێتەوە، وە سوور بێ لەسەر ئەوەی جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە بۆ سەریان﴿ وَءَامَنَ ﴾ بڕوا بە خواو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دوایی بێنێ﴿ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾ ئەویش ئەو کردەوەیە کە خوا دایناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی، ئەگەر مەبەستی پێی خوا بێ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی تەوبەو ئیمانو کردەوەی چاکیان پێکەوە کۆکردوەتەوە،

﴿ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾(دەچنـە بەهەشـتەوە) کـە پێکهاتووە لە نـازو نیعمەتی بـەردەوامو ژیانی خـۆش‌و لە نزیـک پەروەردگاری بەخشـندە، ﴿ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴾(سـتەمیان لێناکرێ) لە پاداشـتی کردەوەکانیـان، بەڵکـو هەمووی بە تـەواوی دەبیننەوە، بـە چەند بەرانبـەر زیاترە.
پاشان خوا ﷻ باسی کردوە ئەو بەهەشتەی کە پەیمانی پێداون بە چوونە ناوەوەی وەک بەهەشتەکانی دیکە نیە، بەڵکو ئەو بەهەشتە ﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ﴾ واتە: بەهەشتانێکن جێگای مانەوەن، گواستنەوەو جێگۆڕکێو نەمانیان تێدانیە، ئەویش لەبەر فراوانیو زۆری خێرو خۆشیو لەززەتەکانی، ﴿ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتە: ئەو بەهەشتەی کە خوای بە بەزەیی بەڵێنی داوە، وە داویەتیە پاڵ ناوی (الرحمن)ی، چونکە پڕە لە ڕەحمەتو چاکە، کە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە ختوورەش بە دڵی کەسدا نەهاتووە.
وە خـوا لـە جێگایەکـی دیکـەدا نـاوی بەهەشـتی بـە ڕەحمـەت هێنـاوە، فەرموویەتـی: ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١٠٧ ﴾آل عمـران، (واتـە: وە ئەوانـەی کـە ڕوویـان سـپی دەبـێ ئـەوە لە نـاو بەزەیـی خـوادان، ئەوانـە تێیـدا دەمێننەوە بـە هەمیشـەیی)، هەروەهـا بـە دانەپاڵی بـۆ لای ڕەحمەتـی خۆی، بەڵگەیە لەسـەر بـەردەوام بوونـی خۆشـیەکانی، ئـەو خۆشـیانە بـەردەوام دەبن بـە هۆی مانـەوەی ڕەحمەتی خـوا، ئەو هەمـوو خۆشـیە شـوێنەواری ڕەحمەتـی خوایە.
(العبـادة): لـەم دەقەدا مەبەسـت پێـی ئەو بەندانەیە کـە خوا ﷻ دەپەرسـتن، ئەوانەی پابەندن بـە شـەریعەتەکەی، بەندایەتـی بووەتـە وەسـفێک بۆیـان، وەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾وێنـەی ئەمـەش، بـە پێچەوانـەی ئـەو بەندانـەی تەنها موڵکـی ئەون، ئەوانـەی نەیانپەرسـتووە، ئەوانـە ئەگـەر چـی بەندەی خـوان لـە پەروەردگارێتیـدا، چونکە دروسـتی کردوونو ڕزقو ڕۆزی داونو کاروباری ڕێکخسـتوون، ئەوانـە نابن بە بەندەیەک کـە بە ویسـتی خۆیـان خـوا بپەرسـتن، کـە خاوەنەکەی وەسـف بکـرێ لەسـەری، بەڵکو بوونیـان بـە بەنـدە بوونێکـی ناچاریـە، بە هیچ جـۆرێ وەسـف ناکرێن.
کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾وەنگە پەیوەسـت بـێ بە ﴿ وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ئـەو کاتە ماناکـە بـەم شـێوەیە دەبێ: خـوا ﷻ پەیمانی پێـداون بە بەهەشـت پەیمانێکی پەنهـان نەیان بینیـوە، بروایـان پێهێنـاوەو پەنهانەکەیـان بە ڕاسـت زانیوە، هەوڵو کۆششـیان بـۆی داوە، لەگـەڵ ئـەوەدا نەیانبینیـوە، جـا ئەگـەر بیانبینایە چـۆن دەبوو، ئـەوە زۆر بـە تامەزرۆیی تر کاریـان بـۆ دەکـرد، حـەزو ئارەزوویان مەزنتـر دەبوو بـۆیو کۆششـی زیاتـرو زیاتریان

بـۆی دەکـرد، جا ئەمـە دەبێتە وەسـفێک بۆیـان بە هـۆی بڕوابوونیـان بە غەیـبو پەنهان، کـە بریتیـە لـە ئیمانێکی بە سـوود.
هەروەهـا ڕەنگە ماناکەی: ئەم بەهەشـتانەی کە خـوای بەبەزەیی پەیمانـی داوە بە بەندەکانی، لـەو کارانـەی کـە وەسـفەکان دەرکـی پێناکـەن، هیـچ کـەس نایزانـێ غەیری خـوا، ئەو بەهەشـتە تامـەزرۆ بوونـی زۆری تێدایە، وە وەسـف کردنی کورتیش، کـە دەروونی مرۆڤ پێـی دەگەشـێتەوە، بـە جۆرێ ئەوانەی وەسـتاون بێـزار دەبن، ئەمەش وەکـو وتەی خوا ﷻ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، (واتە: هیچ کـەس نازانـێ چـی شـاراوەتەوە بۆیـان لـە بەهەشـتدا کـە هـۆی گەشـبوونی چاوانـن ئەم پاداشـتەیان بـە هـۆی ئـەو کردەوانەیە کـە کردوویانە).
هەمـوو مانـاکان ڕاسـتو چەسـپاون، بەڵام گونجاندنـی یەکەم لـە پێشـترە بەبەڵگەی وتەی خـوا ﷻ ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی خـوا) هـەر دەبـێ بەڵێنـی بـەدی بێ، چونکـە ئـەو پێچەوانـەی بەڵێنـی خـۆی نـاکا، ئـەو ڕاسـتگۆترینی بێژەرانـە ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا ﴾ واتـە: هیـچ قسـەیەکی بـێ سـوود نابیسـتن، وە هـەر قسـەیەکیش ببێتـە هـۆی تاوانبـاری، گوێیـان لـە تانـەو جوێـنو قسـەی ناشـرین نیـە، وە هەروەها قسـەیەکیش کە سـەرپێچی خـوای تێدابـێ یان قسـەیەکی بێزارکـەر ﴿ إِلَّا سَلَـٰمًا ﴾ واتـە: تەنها ئەو قسـانە نەبـێ کە سـەلامەتە لە هەمـوو کەمو کـوڕیو ناتەواویەک لـە زیکری خواو سـڵاو کردنو قسـەی خـۆشو مـژدەدەر، وە قسـەی چاکـی نێـوان برایانـی ئەهلـی بەهەشـت دەبیسـتن، وە بیسـتنی قسـەکانی خـوای بەبەزەیـی، وە دەنگـە خـۆشو سەرنجڕاکێشـەکان لـە دەنگی حۆریـەکانو فریشـتەو منـداڵو گۆرانـی خۆشـی گۆرانیبێـژان، وە ئـەو دەنگانـەی کـە ئاوازێکـی خۆشـیان هەیـە، چونکـە ئـەو ماڵـە ماڵـی ئاشـتیە هیـچ شـتێکی تێـدا نیـە تەنها سـڵاو کردنێکی تەواونەبـێ لە هەمـوو ڕووەکانـەوە ﴿ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾ واتە: ڕزقو ڕۆزیـان لـە خـواردنو خواردنەوەکان وە جۆرەها لـەزەت بەردەوامە بۆیـان هەرکاتێ داوای بکـەن، وە لـە چـی کاتێکـدا حـەزی لـێ بکـەن، وە لـە تـەواویو لـەزەتو جوانی، ئەوەیـە لەکاتێکـی دیاریکراودایـە ﴿ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾ (بەیانیـانو ئێـواران) ڕوودانەکـەی گـەورە بێو سوودەکەشـی سـوودێکی تەواو بێ، ئەمە ئەو بەهەشـتەیە کە وەسـفمان کردوە بـەوەی کـە باسـکرا لەمـەو پێـش ﴿ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴾ واتە: ئەو بەهەشـتە دەیبەخشـین بـە خۆپارێـزان، وە دەیکەیـن بە ماڵی هەمیشـەیان بـە بەردەوامـی، تێدا کۆچ

ناکـەنو جێگۆڕکێـیـان پێناکـرێ، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾آل عمـران، (واتـە: وە خێرایـی بکـەن بـەرەو لێبوردنێـک لـە پەروەردگارتانەوەو، بەهەشـتێک کـە پانییەکەی هێنـدەی ئاسـمانەکانو زەویـە، بۆ پارێـزکاران ئامـادە کراوە).

(٦٤-٦٥): ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴿٦٥﴾ ﴾ جارێکیان جبریل ﷺ لە دابەزینی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دواکەوتبوو، پێغەمبەریش ﷺ پێ فەرموو: (لو تأتینا أکثر من ما تأتینا) (واتە: ئەگەر زیاتر لەوەی کە ئێستا دێی، بێی بۆ لامان) زۆر تامەزرۆیی بوو، وە زۆر خەمی دابڕانی دەخوارد، وە لەبەر ئەوەی بە دابەزینی دڵی ئارام بێ، خوا ﷻ لەسەر زمانی جبریل ئەم دەقەی دابەزاند: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَ ﴾واتە: (ئێمەی فریشتەکان لە ئاسمانەوە دانابەزین بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ) واتە: ئێمە هیچ شتێکمان لەو کاروبارەدا بەدەست نیە، ئەگەر فەرمانمان پێکرا ڕاستەوخۆ فەرمانەکەی جێبەجێی دەکەین، وە سەرپێچی فەرمانی ناکەین، هەروەک دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾التحریم، (واتە: سەرپێچی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ دەکرێ، وە ئەو کارە دەکەن کە خوا فەرمانیان پێ دەکات)، ئێمە بەندەی فەرمان پێکراوین، ﴿ لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: هەموو کاروباری ڕابردوو داهاتوو ئێستا تەنها بۆ خوایە، جا ئەگەر ڕوون بوویەوە کاروبارەکان هەمووی بۆ خوایە، وە ئێمەش بەندەی بەڕێوەبراوین، ئەوکاتە کارەکە لە نێوان دوو شتدا دەخولێتەوە: ئایا حیکمەتی خوایی ئەوە دەخوازێ فەرمان بە جبریل بکات بچێ بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ ئەویش فەرمانەکە جێبەجێ بکات؟ یان ئەوە بڕیار نادراو دەیەوێ درەنگتر بچێ؟ لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴾(واتە: هەرگیز تۆ لە بیر ناکاتو فەرامۆشت ناکات) وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ ﴾الضحى، (واتە: پەروەردگارت وازی لـێ نەهێناویتو لێت دڵگیر نەبووە) بەڵکو بە بەردەوام گرنگی بە تۆ دەدا، کاروبارەکانت بەڕێوە دەبات بە جوانترین شێوە، واتە: ئەگەر دابەزینمان لە کاتی خۆیدا دواکەوت، ئەوە تۆ خەمبار مەبەو بە لاتەوە قوورس نەبێ، وە بزانە بێگومان خوا ﷻ ویستو ئیرادەی وایە لەبەر حیکمەتێک کە خۆی دەیزانێ، پاشان باسی هۆکاری ئەوەمان بۆ دەکات کە زانیاریی ئەو دەوری هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێکیشی لە بیر ناچێت؟

رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ
هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ
أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ
وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ
لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ
شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ
هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ
حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا
لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا أَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾
وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾
قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا
مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ
مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا هُدًى
وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾

ئـەوەی ﴿ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ (واتە: پەروەردگـاری زەوی‌و ئاسـمانەکانە) دروسـتکردنیان بـە چاکتریـن‌و تەواوترین سیسـتەم، بـە جـۆرێ بـێ ئاگایـی‌و ئیهمال کـردن‌و پووچیـەک لـە بەڕێوەبردنیانـدا ڕوونـادات، ئـەوە بەڵگەیەکـی ڕوون‌و یەکلاکەرەوەیە لەسـەر زانیاریـی بەرفراوانی خـوا، کەواتـە ئـەی موحەممـەد ﷺ خـۆت سـەرقاڵ مەکە بـەردەوام بیر لـەوە بکەیتەوە لەبیـر بکرێـی، بەڵکو خـۆت سـەرقاڵ بکە بـەو شـتەی کـە سـوودت پـێ دەگەیەنێ‌و مایەی دەسـتکەوتە بـۆت، ئەویش بەندایەتی کردنیەتـی بـە تـاک‌و تەنهـاو بێ هـاوەڵ، ﴿ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ﴾ واتـە: خۆڕاگربـە لـە پەرسـتنیداو کۆشـش بکـە، وە پێـی هەسـتە بـە تەواوترین پـێ هەسـتان بە پێـی تواناو دەسـەڵاتت، خۆسـەرقاڵ کـردن بـە عیبادەتی خـوا ﷻ دەبێتـە مایـەی دڵدانـەوەی بەندە لە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە ئـارەزووی دەکات، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴿١٣١﴾ ﴾ طه، (واتـە: تـۆ چاوەکانـت مەبـڕە ئـەو نـازو نیعمەتانەی داومانە بە دەسـتەو تاقمێـک لە بێبڕوایـان، چونکە ئـەوە زینـەت‌و جوانـی ئەو ژیانـی دونیایەیە، بـۆ ئەوەیە تاقیـان بکەینەوە)، تا ئەو شـوێنەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾ طه، (واتـە: فەرمـان بـدە بـە ئەندامانی خێزانەکـەت بـە نوێـژ کـردن‌و خۆشـت خۆڕاگـرو بـەردەوام بـە لەسـەر بەجێهێنانی).

﴿ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴾ واتـە: ئایـا ئاگاداریـت وێنـەی ئـەو خوایـە هەبێـت لـە نـاو بەدیهێنراوەکانـدا؟! ئەمـە پرسـیارە بـە واتـای ڕەتکردنـەوە دێ، ئـەوەی زانراوە بـە عەقڵ، واتـە: تـۆ نازانیـت وێنـەو هاوشـێوەی ئـەو خوایـە هەبێـت، چونکـە ئـەو پەروەردگـارەو جگـە لەویـش بەندەیە، ئـەو خولقێنـەرە جگە لـە ئەویـش خولقێنـراوە، ئـەو دەوڵەمەندە لە هەمـوو ڕووەکانـەوە جگـە لەویـش هەژارو بـێ دەرەتانە لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، وە ئەو

تـەواوەو خـاوەن تـەواوی ڕەهایە لـە هەمـوو ڕووەکانەوە، غەیـری ئەویش ناتـەواوەو هیچ جـۆرە تەواویەکـی تێـدا نیـە، مەگەر ئـەوە نەبێ خـوا ﷻ پێی بەخشـیبێ، ئەمـە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیـە کە خوا شایسـتەی ئەوەیە بەتـاکو تەنهایی بپەرسـترێ، بێگومان بەندایەتی بـۆ کردنـی هەقـە، وە بەندایەتی بـۆ غەیری ئـەو بەتـاڵو پووچە، ئـا لەبەر ئەمەیـە فەرمانی کـردوە بە تـاکو تەنهـا بپەرسـترێو خۆڕاگریێ لەسـەر ئەو پەرستشـە، هـۆکاری بۆ ئەمە هێناوەتـەوە بـەوەی کـە کامڵو تـەواوو تاکو تەنهـاو مەزنە، وە خـاوەن نـاوە جوانەکانە.

(٦٦-٦٧): ﴿ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ٦٦ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ٦٧ ﴾

﴿ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ مەبەسـت لـە مـرۆڤ لێـرەدا هـەر کەسـێکە نکوڵـی زیندووبوونـەوە بـکات، ڕووداني بـە دوور بزانێت، دەڵـێ: -وەک پرسـیارکردنێک لـە ڕووی ڕەتکردنەوەو عینـادیو بێبڕواییـەوە-: ﴿ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴾ واتـە: خـوا چـۆن زینـدووم دەکاتـەوە دوای مردنـم، وە دوای ئـەوەی دەبـم بـە خـۆڵ؟! ئەمـە ڕوونـاداو نابێـت، دیارە ئـەم قسـەیەی بـە پێـی عەقڵـی فاسـیدو مەبەسـتی خراپیەتـی، ئـەو نکوڵییەی کـە هەیەتی کردوویەتـی دەربـارەی پێغەمبەرانـی خـواو کتێبەکانی، ئەگەر تەماشـا بکات بـە کەمترین تەماشـا کـردن، وە سـەرنج بـدات بـە کەمتریـن سـەرنجدان، بـۆی دەردەکـەوێ بـە دوور دانانـی زیندووبوونـەوە ئەوپـەڕی بـێ عەقڵیـە، لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ باسـی بەڵگەیەکی یەکلاکـەرەوەو ڕوونـی کـردوە، بە شـێوەیەک هەمـوو کەسـێک بزانێ کـە زیندوبوونەوە شـتێکی مومکینـە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴾ واتـە: بۆچـی ئـاوڕێ ناداتـەوەو بیر لە سـەرەتای خـۆی ناکاتەوە، خـوا یەکەمجار دروسـتی کـردوە ئەو شـتێک نەبووە، کەسـێک بتوانێ شـتێ لە نەبـووەوە بیهێنێتـە بوون، لە کاتێکـدا شـتێک نەبووە بـاس بکـرێو ناوبهێنرێ، ئایـا ناتوانـێ دووبارە دروسـتی بکاتەوە دوای لـەتو پـەت بـووە، ناتوانـێ دووبـارە کـۆی بکاتـەوە دوای ئـەوەی لاشـەکەی جیا بۆتـەوە؟! ئەمـەش وەکـو وتـەی خـوا وایـە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ ٢٧ ﴾ الروم، (واتـە: ئـەو خـوا زاتێکـە بەدیهێنانی دەسـتپێکردوە لە پاشـان دوای مردنـی دووبـارە دروسـتی دەکاتـەوە ئەمـە لـەلای خوا ئاسـانترە).

وە لـە وتـەی خوادا: ﴿ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ بانگ کردنە بۆ سـەرنجدان بـە بەڵگەیەکی عەقڵـی بـە نەرمونیانتریـن شـێوە، وە بێگومان ئینـکار کردنـی زیندووبوونەوە بونیـات نراوە

لەسـەر بـێ ئاگایـیو غەفڵەتـی خاوەنەکـەی لـە دروسـتکردنی یەکەمیـدا، ئەگەرنـا ئەگەر بیربکاتـەوە عەقڵـی بخاتـە جێگای خـۆی ئەوە ئینـکاری زیندووبوونـەوەی ناکات.

(٦٨-٧٠): ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ سـوێندی خـواردووە -کـە ڕاسـتگۆترینی بێژەرانـە- بـە پەروەردگاریێتـی خۆی، ئـەو بێبڕوایانـەی بڕوایان بـە زیندووبوونـەوە نیە هەموویـان کۆدەکاتەوە لـە ڕۆژی دواییدا لەگـەڵ شـەیتانەکان لـە ڕۆژێکـی دیـاری کـراو زانـراودا، ﴿ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴾ واتـە: هەموویـان بەسـەر ئەژنۆیانـدا کەوتوون لەبەر ترسـناکی ئـەو ڕۆژەو زۆری بوومەلـەزە، وە ناخۆشـی بارودۆخـەکان، لـە چاوەڕوانـی بڕیـارو حوکمـی خـوای گەورەو بـەرزدان، لەبـەر ئەمەیـە باسـی حوکمـی خـۆی کـردوە تیایانـدا، ﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾ واتـە: پاشـان دەریدەهێنیـن دەیخەینـە دۆزەخـەوە لـە هەمـوو پێڕوو دەسـتەیەک، لەو سـتەمکارانەی کە بەشـدارن لە سـتەمو کوفرو سەرکێشـی، کامەیـان تاوانبارتـرەو سـتەمو کوفـری زیاتـرە پێش دەخرێن بۆ سـزا، پاشـان بەو شـێوەیە پێـش دەخرێـن بـۆ سـزا کامەیـان کوفـرو بێبڕوایـی زیاترە بـە دوای یەکـدا، لـەو کاتەدا ئـەوان نەفریـن لـە یەکتـر دەکـەن، هەندێکیـان نەفریـن لـەوی تـر دەکات، دواییـان بە پێشـینیان دەڵـێ: ﴿ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ ﴾ الأعراف (واتە: ئەی پەروەردگارمـان! ئەوانـە ئێمەیـان گومـڕا کـرد، دە تۆش لە ئاگـردا دوو قات سـزایان بدە، پەروەردگـار فەرمـووی: بـۆ هـەر یەکێکتان سـزای دوو بەرانبـەر هەیە، بەڵام ئێـوە نازانن‌و بێئاگـان * سـەرۆکو چاولێکـەرەکان بـە شـوێنکەوتوانیان دەڵێـن، ئێـوەش هیـچ زیـادە ڕێزێکتـان بەسـەر ئێمـەدا نیە).

هەمـوو ئەمانـەی باسـکرا شـوێنی دادپـەروەریو حیکمـەتو زانسـتی خـوا ﷻ دەکـەون، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴾واتە: زانسـتمان دەوری ئـەوەی داوە کـە کێ شـیاوترە بخرێتـە دۆزەخو بسـوتێنرێ، بێگومان ئێمە ئەوان دەناسـین‌و زانیاریمـان بـە کارو کردەوەکانیشـیان هەیە، وە سزاشـیان دەزانین.

(٧١-٧٢): ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا

﴿وَنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾﴾:

﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ئـەم دواندنـە لەگـەڵ هەمـوو دروسـتکراوەکاندا، چاکەخوازو خراپەکاریان، بـڕوادارو بێبڕوایان، بێگومـان هیچ یەکێکیان نیـە هـەر دەبێ تێپەڕبـێ بەسـەر ئاگردا، ئەمـە بڕیارێکـەو خوا داویەتـیو پەیمانـی داوە بە بەندەکانـی، هـەر دەبـێ جێبەجێـی بـکات، هیـچ ڕێگریـەک نیە لە بـەردەم وەسـتانیدا.

ڕاووبۆچونـی جیـاواز هەیـە دەربـارەی مانـای (ورودهـا) هەندێـک دەڵێـن: دۆزەخ ئامـادە دەکـرێ بـۆ هەمـوو دروسـتکراوەکان، هەتـا هەموویان پێـی بێتاقـەت دەبن، پاشـان دوای ئـەوە پارێـزکاران ڕزگـار دەکات، وە وتـراوە تێپەڕبوونـی:

(ورودهـا) یانـی: چوونـە نـاو دۆزەخو ئامـادە بوونیـان، بـۆ بـڕواداران دەبێتـە سـاردیو سـەلامەتی، وە وتـراوە: (الـورود) بریتیـە لە تێپەڕبوونە بەسـەر پردی سـیراتدا بـە ئەندازەی کردەوەکانیـان، جـا هەندێکیان تێدەپەڕێ بەسـەریدا وەکـو چاوترووکانێـک، وە هەندێکی دیکـە وەک بـا، وە هەندێکـی دیکە بە قەد خێرایی سـوارچاکێک، وە هەندێـک بە ڕاکردن، وە هەندێـک بـە ڕۆیشـتنی ئاسـایی، وە هەندێ بە سـەر سـک دەخشـێن، وە هەندێکی دیکە بەردەبنـەوە نـاو ئاگرەکـە هەموو ئەوانـە بە پێی تەقـواو خواناسـیانە، لەبـەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا﴾ (واتـە: دواتـر ئەوانە ڕزگار دەکەیـن کە خۆپارێز بـوون) بـە ئەنجامدانی فەرمانـەکانو واز هێنان لە قەدەغە کـراوەکان ﴿وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (ئەوانـەی کە سـتەمیان) لـە خۆیان کردوە بە کوفرو سـەرپێچی کردنـی پەروەردگار ﴿فِيهَا جِثِيًّا﴾ (بـە چـۆک دادێـن) ئەمە بە هۆی سـتەمو کوفـر کردنیانەوە مانەوەیان لـە دۆزەخدا بـە هەمیشـەیی بۆ پێویسـت بـووە، وە سـزایان بۆ شایسـتە بووە، هەمـوو هۆکارەکانیشـیان لێدابڕاوە.

(٧٣-٧٤): ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا أَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾﴾:

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا﴾ واتـە: هـەر کاتێـک ئایەتـە ڕوونو ئاشـکراکانمان بخوێنرێتـەوە بەسـەر ئەو بێبڕوایانـەدا -بەڵگەکانی ڕوونو ئاشـکران لەسـەر یەکتاپەرسـتی خـواو ڕاسـتی پێغەمبەرەکانـی، ئـەوەی گوێـی لـەو ئایەتانـە بێـت، بـڕوای پێدێنـێو دڵنیایـی بـۆ دروسـت دەبـێ- بـەڵام ئـەوان بـە پێچەوانـەی جووڵانەوەو گاڵتەیـان پێکـرد، وە گاڵتەشـیان بـەوە کـرد کـە بـڕوای پێهێنـاوە، بەڵگەیـان هێنایەوە بە

خۆشگوزەرانیان لە ژیانی دونیادا، کە ئەوان لە بڕواداران چاکترن، ئەوان بەرهەڵستی هەقیان کردو وتیان: ﴿ أَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ ﴾ واتە: (کام لەم دوو پێرە) ئێمەو ئیمانداران ﴿ خَيْرٌ مَّقَامًا ﴾ واتە: (جێو شوێنی خۆشترە) لە دونیادا، لە زۆری ماڵو منداڵو فەراهەم بوونی خۆشیو ئارەزووەکان؟ ﴿ وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾ (کامیان) کۆڕو مەجلیس (ی چاکترە؟) واتە: ئەم پێشەکیە فاسیدەیان بۆ خۆیان کردوەتە ئەنجام، کە گوایە ئەوان خاوەن ماڵو دارایەکی زۆرن، زۆربەی داواکاریەکانی دونیایان بۆ دەستەبەر بووە، کۆڕو مەجلسیان گەرمو قەرەباڵغە، وە خۆشترو ڕازاوەترە، بڕوادارانیش بە پێچەوانەی ئەوانن، ئەوان چاکترن لە بڕواداران، ئەمە بەڵگەیەکە لەوپەڕی خراپیدایە، ئەمە هەڵگێرانەوەی حەقیقەتەکانە، ئەگەرنا زۆری ماڵو داریی‌و منداڵو دیمەنی ڕازاوەو جوان، زۆرجار دەبنە مایەی لەناو چوونو گومڕابوونی خاوەنەکەی، لەبەر ئەمە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴾ واتە: (پێش ئەوان چەندین نەتەوەی (بێبڕوامان) لە بەین برد) کەلو پەلەکانیان، لە ڕووی ناوماڵو قاپو شوێنی خەوتنو تەلارو ماڵی جوانو شێوەو دیمەنیان زۆر لەوان جوانتر بوو، لە ژیانێکی پڕ لە خۆشی دابوون لە مان زۆر زیاتر بوو، وە لە لەززەتی دڵخۆشکەرو شێوەی جوان دابوون، جا ئەگەر ئەوانەی پێش ئەمان وا تیاچوون کە لە ماڵو دارایی‌و خۆشگوزەرانی‌و ڕەنگو ڕووخساردا لەمان چاکترو جوانتر بوون، هیچ لەمانە نەیانی پاراست لە سزای خوا، ئەی ئەمان چی کە لە ئەوان کەمترو زەلیل تر بوون، چۆن دەیانپارێزن لە سزا؟!

﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ ﴾ القمر. (واتە: ئایا کافرەکانی ئێوە ئەی خەڵکی مەککە باشترن لەم گەلانەی کە باسکران، یان ئێوە ئەمان نامەتان هەیە لە کتێبە ئاسمانیەکاندا کە سزا نەدرێن)؟

لەم دەقەدا ئەوە دەردەکەوێ بەڵگە هێنانەوە بە خۆشیەکانی دونیا بۆ خۆشی ژیانی دوارۆژ لە خراپترینی بەڵگەکانە، ئەوە یەکێکە لە ڕێچکەکانی بێبڕوایان.

(٧٥): ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ ﴾

کاتێ باسی بەڵگە بێ بنەماو پووچەکانیانی کرد، کە بەڵگەن لەسەر کەللەڕەقی‌و عینادیانو سەختی گومڕایی بوونیان، لێرەدا هەواڵیدا هەرکەسێ لە گومڕایی دایەو پێی ڕازیەو کۆششی بۆ دەکات، ئەوە بێگومان خوا مۆڵەتی پێدەداو گومڕاییەکەی

لـەلا خۆشەویسـتتر دەکات، وەک سـزایەک بـۆی، بە هۆی ئـەوەی گومرایـی هەڵبژاردووە بەسـەر هیدایەتـدا، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۝٥ ﴾ الصف، (واتـە: جـا کاتێـک لایاندا لە هـەق، خواش زیاتـر دڵی وەرگێـران) هەروەهـا فەرموویەتی: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ۝١١٠ ﴾ الأنعام (واتـە: وە (کاتـی هاتنـی موعجیـزەکان) دڵو چاویـان وەردەگێریـنو لادەدەیـن (لەبـاوەڕ هێنـان) هـەروەک لەسـەرەتاوە بڕوایـان بـە قوڕئـان نەهێنـا، وە لێیان دەگەڕێـین لـە سەرکەشـی خۆیانـدا هـەر سـەرگەردان بن).

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ ﴾ -واتـە: ئەوانـە کە دەڵێـن: ﴿ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾ (واتە: کام لـەم دوو کۆمەڵـە جـێو شـوێنو خانوو بـەری خۆشـترە)- ﴿ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ ﴾ (ئـەو هەڕەشـانە) بە کوشـتن یان غەیری کوشـتن (لـە دونیـادا) ﴿ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ ﴾ (یان بە هاتنـی ڕۆژی دوایـی) کە ئەمەش لە بابەتی پاداشـتە لەسـەر کـردەوەکان ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴾ واتـە: ئـەو کاتـە بۆیـان دەردەکـەوێ پووچـی بانگەوازەکەیـان، بێگومـان ئـەوە بانگەوازێکـی پـەرشو بـڵاوە، وە دڵنیـا دەبن کـە ئەوان لـە ئەهلی شـەڕو خراپـەن، ﴿ وَأَضْعَفُ جُندًا ﴾ (واتە: کێ سـەربازو لەشـکری بێهێزترە)، بـەڵام ئـەم زانینە هیچ سـوودێکیان پێناگەیەنـێ، چونکە ئـەوان ناتوانن بگەڕێنـەوە بۆ دونیا، کار بکـەن پێچەوانـەی کارەکەی پێشـوویان.

(٧٦): ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ۗ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ۝٧٦ ﴾:

کاتـێ باسـی کـرد کـە ئـەو مۆڵـەت دەدا بـە سـتەمکارانو تەمەنیـان درێـژ دەکات تا لە گومڕاییـدا بمێننـەوە، ئنجـا باسـی ئـەوەی کـرد ئەوانـەی لەسـەر ڕێبـازی هیدایـەت بوون بـە فـەزڵو چاکـەو میهرەبانـی خـۆی هیدایەتیـان بـۆ زیـاد دەکات، وە هیدایەت زانسـتی بـە سـوودو کـردەوەی چـاک دەگرێتـەوە، جا هـەر کەسـێک ڕێگایـەک بگرێتەبـەر بۆ زانسـتو ئیمـانو کردەوەی چـاک خوا ﷻ بـۆی زیاد دەکاو کار ئاسـانی بـۆ دەکات، وە کاروبـاری دیکـەی پێدەبەخشـێ کـە ناچێتـە چوارچێـوەی هـەوڵو کۆششـی خۆیەوە.

ئـەم دەقـە بەڵگەیە لەسـەر زیـادو کەمی ئیمـان هەروەکو چـۆن زانایانی سـەلەف وتوویانە، بەڵگـەش لەسـەر ئەمە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَـٰنًا ۝٣١ ﴾ المدثر، (واتە: ئیمانـداران ئیمانەکەیـان زیـاد بـکات)، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ

زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا ﴿٢﴾ الأنفـال، (واتـە: وە کاتێـک ئایەتەکانـی خوایـان بەسـەردا بخوێنرێ ئیمانیـان زیـاد دەکات)، هەروەهـا واقعیـش دەبێتە بەڵگە لەسـەر زیـاد بوونی ئیمـانو کەم کردنـی ئیمان بریتیە لە قسـەی ناودڵو قسـەی زمـان، وە کردەوەی دڵو کـردەوەی زمانو جەسـتەیە، بڕوادارانیـش لەوانـەدا پلـەو پایەیـان جیـاوازە بـە مەزنتریـن جیـاوازی، پاشـان فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾ واتە: ئـەو کردەوە چاکانەی دەمێننـەوە، بە پچڕانی هیـچ شـتێک ناپچڕێـن، وە پەرشو بڵاویـش نابن ئەوانەش کـردەوە چاکەکانـن، لە نوێژو زەکاتو ڕۆژوو حـەجو عومـرە، وە خوێندنـی قورئـانو زیکـرو یـادی خـواو چاکەکردن لەگـەڵ بەدیهێنراوەکانـدا، وە کردەوەکانی دڵو جەسـتە.

جـا ئـەم کردەوانـە: ﴿ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ﴾واتـە: ئـەو کـردەوە چاکانـە پاداشـتەکەی لـەلای خـوا دەمێننـەوە ئەمەش لـە بابەتـی بەکارهێنانی (أفضـل التفضيـل)، لە غەیـری بابەتـی خۆیـدا هاتـوە، بێگومان بێجگە لـەو کـردەوە چاکانەی کە سـوودیان هەیە هیچ کردەوەیەکی تر خاوەنەکەی پاداشـتی لەسـەر وەرناگرێو سـەرکەوتووش نابێ، سیاقی باسـکردنی (الباقیـات الصالحـات) لێـرەدا -والله أعلـم- کاتێ کە باسـی دۆخی سـتەمکارانی کـردوە کـە پێیان وابـووماڵو منـداڵو پلـەو پایەی بـەرزو هاوشـێوەکانی نیشـانەیەکە بۆ چاکـی بارودۆخـی خاوەنەکـەی لـە ڕۆژی دواییدا، خوا ﷻ لێـرەدا هەواڵیـداوە کارەکە بەو شـێوە نیـە کە ئـەوان پێیـان وابـووە، بەڵکو کـردەوە نیشـانەی خۆشـبەختیو سـەرکەوتنە، ئەویـش ئـەو کردەوانەیـە کە خـوا ﷻ خۆشـی دەوێو پێـی ڕازیە.

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا
٧٧ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ٧٨ كَلَّا
سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ٧٩ وَنَرِثُهُۥ
مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ٨٠ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً
لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ٨١ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ
عَلَيْهِمْ ضِدًّا ٨٢ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ
تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ٨٣ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ٨٤
يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ٨٥ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ
إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ٨٦ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ
ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ٨٧ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ٨٨ لَّقَدْ
جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ٨٩ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ
وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ٩٠ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا
٩١ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَـٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ٩٢ إِن كُلُّ مَن فِى
ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَـٰنِ عَبْدًا ٩٣ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ
وَعَدَّهُمْ عَدًّا ٩٤ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ٩٥

**(٧٧-٨٠):** ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾:

**﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴾ واتە: سەرت سوڕنەمێنێ لە حاڵی ئەو کافرەی کە کوفر کردن بە ئایەتەکانی خواو ئەو بانگەشە گەورەیەی پێکەوە کۆکردۆتەوە، گوایە ئەو لە ڕۆژی دوایی‌دا ماڵو منداڵی پێدەدرێ، واتە: یەکێک دەبێ لە خەڵکی بەهەشت بەڕاستی ئەمە سەرسووڕهێنەرترینی شتەکانە، خۆ ئەگەر بڕوادار بووایەو ئەم بانگەشەیەی بکردایە ئەوە کارەکە ئاسانتر دەبوو.**

**ئەم دەقە پیرۆزە ئەگەرچی بۆ بێبڕوایەکی دیاریکراو دابەزیوە، بەڵام هەموو بێبڕوایەک دەگرێتەوە، کە پێی وابێت ئەو لەسەر هەقەو یەکێکە لە ئەهلی بەهەشت.**

**خوا سەرزەنشتی کردوو بە درۆی خستەوەو فەرمووی: ﴿ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ ﴾ واتە: ئایا بە زانستی دەوری نهێنیەکانی داوە هەتا زانیبێتی لە داهاتوودا چی دەبێ، وە ئەو کەسێکە لە ڕۆژی دوایی‌دا ماڵو منداڵی پێدەدرێ؟ ﴿ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴾ واتە: (یان بەڵێنی لە خوای میهرەبانی وەرگرتووە)، یان ئەوەی کە بانگەشەی بۆ دەکات وەری گرتووە لە خوا، واتە: هیچ شتێکی لەو جۆرە لە ئارادا نیە، ئەوەی ئەو دەیڵێ قسەیەکی هەڵواسراوە، هیچ زانستێکی دەربارەی ئەو نیە، ئەم دابەش کردنو ڕەتکردنەوەیە کە خوای پەروەردگار بۆ قسەکەی ئەوان کردوویەتی لەو پەڕی بیانوو بڕین دایە، ئەو کەسەی پێی وایە لە ڕۆژی دوایی‌دا خێری دەست دەکەوێ لە لای خوا ﷻ خاڵی نابێ لە:**

**یەکەم: یان ئەوەیە قسەکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەو زانایە لەو شتە پەنهانانەی لە داهاتوودا ڕوودەدەن، بێگومان زانراوە ئەمە تایبەتە بە خواوە، هیچ کەسێک دەربارەی داهاتوو**

هیچ نازانێ مەگەر ئەوە نەبێ خوا ﷻ بە موعجیزە هەندێ لە پێغەمبەرانی پێ ئاگادار کردبێتەوە.
دووەم: یان ئەوەیە پەیمانێکی لە خوا وەرگرتووە بە برواهێنانو شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکانی، کە خوا ﷻ پەیمانیداوە بە شوێنکەوتوانی کە هەموویان ئەهلی ئاخیرەتنو رزگاربوو براوەن، جا ئەگەر ئەم دووکارە رەتکرایەوە ئەوە بەتاڵی بانگەشەکەیان دەردەکەوێ، ﴿ كَلَّا ﴾ واتە: کارەکە بەم شێوەیە نیە کە ئەوان پێیان وایە، بێژەر ئاگادار نیە بەسەر غەیبەوە، چونکە بێبڕوایە هیچ زانستێکی لە زانستی پێغەمبەران پێ نیە، وە بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرنەگرتووە، ئەویش بە هۆی بێبڕوایی‌و نەبوونی ئیمانیەوە، بەڵکو شایستەی پێچەوانەی ئەوەیە کە دەیڵێ، وە بێگومان قسەکەی نووسراوەو پارێزگاری لێکراوە، بۆ ئەوەی سزا بدرێ‌و تۆڵەی لێبکرێتەوە، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ﴾ واتە: جۆرەها سزاو ئازاری بۆ زیاد دەکەین وەک چۆن بە جۆرەها شێوە گومرایی‌و سەرلێشێواوی زیاد بوو.
﴿ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ ﴾ ماڵو منداڵی بە میرات لێی وەردەگرینەوە، لە دونیادا بە تەنیا دەگوازرێتەوە، بەبێ ماڵو خێزانو پشتیوانو دۆست، ﴿ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ﴾ (واتە: لە رۆژی دواییدا بە تەنیا دێتەوە لامان)، ئەو کاتە قورسی سزاو ئازاری بە ئێشی تۆڵەکردنەوە دەبینێتەوە، کە ئەوە پاداشتی هاوشێوەی ئەو ستەمکارەیە لە رۆژی دواییدا.

(٨١-٨٢): ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ لِّيَكُونُواْ لَهُمۡ عِزّٗا ۝٨١ كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا ۝٨٢ ﴾

(واتە: ئەو بێبڕوایانە لە جیاتی خوا جۆرەها شتی تریان کردوەتە پەرستراوی خۆیان تا پایەداری‌و دەسەڵاتیان دەستبکەوێت * نەخێر وانیە ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن، بڕوایان بە پەرستنی ئەوان نیەو نارەزایی دەردەبڕن، دژایەتیان دەکەنو بەرپەرچیان دەدەنەوە).

(٨٣-٨٤): ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّآ أَرۡسَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا ۝٨٣ فَلَا تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدّٗا ۝٨٤ ﴾

ئەمە لە سزای بێبڕوایانە -کاتێ پشتیان بە خوا نەبەستووەو دەستیان نەگرتووە بە حەبلی خواوە، بەڵکو هاوەڵیان بۆ داناوەو پشتیوانیان لە دوژمنەکانی کردوە لە شەیتانەکان- زاڵی کردوە بەسەریاندا هاوتای یەکی کردوون، شەیتانەکان هانیان دەدەن بۆ تاوانو سەرپێچی کردن، بێزاریان دەکەن بۆ کوفر کردن چۆن بێزارکردنێک، وەسوەسەو ختورە دەخەنە دڵەکانیانەوەو نیگایان بۆ دەکەن، پووچو بەتاڵیان لەلا جوان دەکەنو هەقو راستیان لەلا ناشرین دەکەن، پاشان خۆشەویستی شتی پووچ دەچێتە دڵەکانیانەوەو دەیخۆنەوە، بە جۆرێ کۆششی بۆ دەکەن

وەكو كەسێک چۆن كار بۆ هەق دەكات بە هەموو تواناو هێزیەوە، لە پێناویدا دەجەنگێ، شەڕ لەگەڵ شوێنكەوتوانی هەقدا دەكات لە پێناوی پووچو بێ بنەمادا.

هەموو ئەمانە سزای ئەو كارەیەتی كە: پشتی دوژمنانی خوا دەگرێو لەگەڵ دۆستانی خوا نایێ، لە ئەنجامدا سزاكەی ئەوەیە كە شەیتان بەسەریدا زاڵ دەكرێ، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە ئەگەر بڕوای بە خوا بهێنایەو پشتی پێ ببەستایە، ئەوە شەیتان هیچ دەسەڵاتێكی نەدەبوو بەسەریدا، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾النحل، (واتە: بە ڕاستی شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەی كە بڕوایان هێناوەو تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن).

﴿ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: (پەلە مەكە) لەسەر ئەو بێبڕوایانەی پەلە دەكەن سزا بدرێن ﴿ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴾ واتە: (ئەوان چەند ڕۆژێكی ژمێردراویان هەیە نە پێش دەكەوێ بەسەریانداو نەدوا دەكەوێ، مۆڵەتیان پێ دەدەینو نەرمو نیان دەبین لەگەڵیاندا تا ماوەیەک، بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای فەرمانی خوا ﷻ، ئەگەر ئەمە تیایاندا سەرنەكەوت، ئنجا تۆڵەیان لێ دەستێنینەوە بە تۆڵە سەندنەوەی كەسێكی زاڵی بە توانا.

(٨٥-٨٧): ﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾ ﴾:

﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی جیاوازی ئەو دوو دەستەو كۆمەڵە، لە خواترسانو تاوانباران، ئەوانەی لە خوا ﷻ دەترسن -بە خۆپاراستن لە شیركو بیدعەو سەرپێچی- خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا بەڕێزو حورمەتو مەزنیەوە، كۆیان دەكاتەوە، وەكو شاندێک دەهێنرێن بۆ لای خوا، وە شتێكی زانراوە كاتێ وەفدێک بۆ لای یەكێک دەچێ ئەوە وەفدەكە دڵیان ئومێدو گومانی باشی تێدایە بەرانبەر ئەو كەسەی كە بۆ لای دەچن.

پارێزكارانو خواناسان بە شێوەی وەفد بۆ لای خوای بە بەزەیی دەڕۆن، ئومێدیان بە ڕەحمەتو گشتگیری چاكەكانی هەیە، بە ئومێدی بەدەستهێنانی بەخشینو ڕەزامەندی فراوانی، ئەویش بە هۆی ئەو كردەوە چاكانەیە كە پێشیان خستوەو شوێنی ڕەزامەندی ئەو كەوتوون، خوا ﷻ پەیمانی پێداون بەو پاداشتە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی، بۆیە ئەوانیش ڕوویان كردۆتە پەروەردگاریان بە دڵنیاییو متمانە بوون بە چاكەكانی.

بەڵام تاوانباران بە تینوێتی ڕاپێچ دەكرێن بۆ ناو دۆزەخ، ئەمەش ترسناكترین حاڵەتەكانە،

ئەویش بە ڕێ كردنیانە بە شێوەی زەلیلیو بچووكیەوە بۆ مەزنترین زینداناو خراپترین تۆڵە، ئەویش دۆزەخە، لە كاتی تینوێتیو نارەحەتیاندا پەنا دەبەن كەس پەنایان نادا، هاوارو داوا دەكەن كەسێک نیە وەڵامیان بداتەوە، داوای شەفاعەت دەكەن هیچ كەس نیە شەفاعەتیان بۆ بكات، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ ﴾ واتە: ئەوان خاوەنی تكا نین، وە ئەوان هیچ شتێكیان لەو تكایەدا بۆ نیە، بەڵكو شەفاعەت وتكا تەنها لە لای خوایە ﷻ، ﴿ قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ ﴿٤٤﴾ ﴾ الزمر، (واتە: شەفاعەت هەمووی بۆ خوایە)، بێگومان هەواڵیداوە كە تكای تكاكاران سوودیان پێناگەیەنێ، چونكە ئەوان بەڵێنیان لە خوای پەروەردگار وەرنەگرتووە بە بڕواهێنان پێیو بە پێغەمبەرانی، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە هەر كەسێ بەڵێنی لە خوا ﷻ وەرگرتبێو بڕوای پێ هێنابێو شوێنی پێغەمبەرانی كەوتبێ ئەوە لەو كەسانەیە كە شەفاعەتی بۆ بەدەست هاتووە.

هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنبياء، (واتە: وە فریشتەكان تكا ناكەن تەنها بۆ ئەو كەسە نەبێ خوا ڕازی بێ تكای بۆ بكرێ)، خوا ﷻ بڕواپێهێنانو شوێنكەوتنی پێغەمبەرانی بە پەیمان ناوبردووە، چونكە لە كتێبەكانیو لەسەر زمانی پێغەمبەرانی پەیمانی داوە بە پاداشتێكی جوان بۆ ئەو كەسانەی شوێنیان دەكەون.

(٨٨-٩٥): ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾ ئەمە ناشرین كردنو بێزاندنی وتەی كەللەڕەقانو نكوڵیكارانە، ئەوانەی پێیان وابوو خوای بە بەزەیی ڕۆڵەو نەوەی بۆ خۆی داناوە، وەک وتەی گاورەكان: ﴿ الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ﴿٣٠﴾ ﴾ التوبة، (واتە: مەسیح كوڕی خوایە)، وە وەک وتەی جولەكەكان: ﴿ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ ﴿٣٠﴾ ﴾ التوبة، (واتە: عوزەیر كوڕی خوایە) وەک قسەی هاوبەشدانەران كە دەیانووت: فریشتەكان كچانی خوان، بەرزیو بڵندی بۆ خوا ﷻ لە قسە بێ ماناكانیان، بەرزیەكی بێ وێنە.

﴿ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴾ (واتە: بە ڕاستی بوختانێكی ناقۆڵا دەكەنو گوفتارێكی ناشایستەو سەرسووڕهێنەر دەڵێن) واتە: بوختانێكی مەزنو ناشرین.

لە مەزنیو گەورەیی ئەو بوختانە بێگومان ﴿ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ ﴾ (نزیكە ئاسمانەكان)

لە مەزنیی و توونەدو تۆڵیاندا ﴿يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ﴾ واتە: (لەتو پەت ببن) لەم قسەیەدا ﴿وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ﴾ واتە: زەوی خەریکە شەق بەرێت و ڕۆبچێت ﴿وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا﴾ واتە: کێوەکانیش خەریکە بکەونو وورد و خاش بن.

﴿أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ﴾ (واتە: کاتێ نەفامان بوونی نەوەو ڕۆڵەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان)، واتە: لەبەر ئەو بانگەشە ترسناک و ناشرینە، خەریکە ئەم بەدیهێنراوانە، بەو شێوەیان لێ بێت کە باسکرا، لە کاتێکدا خوا: ﴿وَمَا يَنبَغِي﴾ واتە: ناگونجێ و نابێ ﴿لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ (واتە: خوا منداڵ بۆ خۆی بڕیار بدات) چونکە دانانی منداڵ بەڵگەیە لەسەر ناتەواوی و پێوستبوونی، لە کاتێکدا خوا دەوڵەمەندی ستایش کراوە، هەروەها منداڵ لە ڕەگەزی باوکێتی، خوای بەرزو مەزن وێنەو هاوشێوەی نیە.

﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾ واتە: (هیچ کەسێک نیە لە ئاسمانەکانو زەویدا بەندەی) زەلیل و ملکەچی خوا نەبێ، کەس ناتوانی لێی یاخی بێ و کەسیش نیە ڕێگری لێ بکات، فریشتەکان، مرۆڤەکان، سەربازەکان، جگە لە ئەوانیش، هەموویان موڵکی خوان، کاروباریان هەڵدەسوڕێنێ و بەڕێوەی دەبات، هیچ شتێکیان لە موڵک و خاوەندارێتی بە دەست نیە، ئیتر چۆن خوا منداڵ بۆ خۆی دادەنێ، ئەمەش پێگەو مەزنی و دەسەڵاتی خوایە؟!!

﴿لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا﴾ واتە: بێگومان زانست و زانیاری خوا دەوری هەموو بەدیهێنراوەکانی داوە، ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان، وە سەرژمێری کردەوەکانیانی کردوە بە ژماردن، نە هەڵە دەکاو نە بیری دەچێتەوە، هیچ شتێ لەلای ئەو شاراوە نیە.

﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾ واتە: (هەموویان بە تاک و تەنها) بە بێ ماڵ و منداڵ و پشتیوان، هیچی لەگەڵدا نیە جگە لە کردەوەکەی خۆی نەبێ، خوا پاداشتی دەداتەوە، بە چاکی بۆی دەژمێرێ، ئەگەر خێر بێ ئەوە خێرە، ئەگەر شەریش بێ ئەوە شەرە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴿٩٤﴾﴾ الأنعام. (واتە: سوێند بێت بێگومان ئێوە بە تەنهاو یەک یەک گەڕانەوە بۆ لامان، هەر وەکو یەکەمجار دروستمان کردن).

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴿٩٨﴾

(٩٦): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾﴾:

ئەمە یەكێكە لە نیعمەتەكانی بەسەر بەندەكانیەوە، ئەوانەی ئیمانو كردەوەی چاكیان پێكەوە كۆكردوەتەوە، پەیمانی پێداون خۆشەویستیان بخاتە دڵی دۆستانی خۆیەوە، ئەوانەشی كە لە ئاسمانەكانو زەویدان، جا ئەگەر لە دڵەكاندا خۆشەویست بن زۆرێ لە كارو بارەكانیان بۆ ئاسان دەبێ، وە چاكەو خێرو خێراتو ڕێنیشاندانو پێشەوایەتیان بۆ دەستەبەر دەبێ، لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە: {إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ قَالَ لِجِبْرِيلَ: قَدْ أَحْبَبْتُ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ ﷺ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا، فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يَضَعُ لَهُ الْقَبُولَ فِي الْأَرْضِ} (أخرجه أحمد برقم: (٩٣٤١)، ومسلم برقم: (٢٦٣٧)، وابن حبان برقم: (٣٦٥)).

واتە: ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆشویست بانگی جبریل دەكاتو پێی دەڵێ: من فلان كەسم خۆشدەوێ تۆش خۆشت بوێ، جبریلیش خۆشی دەوێ، پاشان جبریل بانگی خەڵكی ئاسمان دەكاتو پێیان دەڵێ: خوا فلان كەسی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، خەڵكی ئاسمان خۆشیان دەوێ، پاشان ئەو خۆشویستنەی لەسەر زەویش بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە كەسێكی قبووڵ كراو خۆشویستراو.

بۆیە خوا خۆشەویستیان دەخاتە دڵی بەندەكانەوە، چونكە ئەوان خوایان خۆش دەوێ، خواش خۆشەویستی كردوون لە دڵی دۆستو ئەولیاو خۆشەویستانیدا.

(٩٧-٩٨): ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴿٩٨﴾﴾:

﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ﴾ خوا ﷻ هەواڵ ئەدا لەسەر نیعمەتەكانی، كە ئەم

قورئانــە پیــرۆزەی ئاســان کــردوە لەســەر زمانــی پێغەمبــەر موحەممــەد ﷺ، وشــەو بێــژەو ماناکانی ئاســان کــردوە، بۆ ئەوەی مەبەســتەکەی بەدەســت بێتو سوودیشــی پێوەربگیرێ، ﴿لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ﴾(واتــە: تــا مــژدەی پێ بدەیــت بە پارێــزکاران) بــە هاندانی مــژدە پێــدراو بە پاداشــتی لە ئێســتاو لــە داهاتوو، وە باســی هــۆکاری پێویســت بوونی ئەو مژدەیەشــی کردوە.

﴿وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا﴾واتــە: ئەوانەی سەرســەختن لەســەر گەمژەییو پووچیــان، تووندن لەســەر بیبڕواییــان، دەیانترســێنیو بیانوویــان دەبــڕێ، بەڵگەشــیان بــۆ ڕوون دەکاتــەوە، تا ئــەوەی تیادەچــێ با لەســەر بەڵگــەی ڕوون تیــا بچێ، ئەوەشــی زینــدوو دەبێتەوە با لەســەر بەڵگــە زینــدوو بێتــەوە، پاشــان هەڕەشــەیان لێــدەکات بــە لــە ناوچوونــی درۆزنانــی پێش خۆیــان، جــا فەرموویەتی:

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ﴾(واتــە: گــەلو کۆمەڵــی زۆرمان پێش ئەمــان لەناو برد) لــە گەلــی نــووحو، عــادو، ثمود و، فیرعــەون، جگــە لــە ئەوانیــش لە گەلــە عینــادو بەدرۆ دانــەرەکان، کاتــێ بــەردەوام بــوون لــە گومڕایــیو سەرکێشــیو لــووت بەرزیــان، خوا لە ناوی بــردنو هیچی لــێ نەهێشــتنەوە.

﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾(واتــە: ئایــا هەســت ئەکەیــت بــە هیــچ کەســێک لەوانــە مابێــت)؟ (الرکــز): دەنگێکــی شــاراوەیە، واتــە: هیــچ شــوێنەوارێکیان نەمایــەوە، بەڵکــو تەنهــا هــەواڵو بەســەرهاتیان مایەوە، بــۆ ئەوەی ببــن بە پەند بــۆ ئەوانەی پەنــد وەردەگرن، وە شــوێنەواریان کــوێر بوویەوە بۆ ئــەوەی ببن بە ئامۆژگــاری بۆ ئەوانەی ئامۆژگــاری وەردەگرن.

تەفسیری سووڕەتی (مریم) تەواو بوو.


سورة طه
بسم الله الرحمن الرحيم
طه ﴿١﴾ ما أنزلنا عليك القرءان لتشقى ﴿٢﴾ إلا تذكرة
لمن يخشى ﴿٣﴾ تنزيلا ممن خلق الأرض والسموت العلى ﴿٤﴾
الرحمن على العرش استوى ﴿٥﴾ له ما في السموت وما في
الأرض وما بينهما وما تحت الثرى ﴿٦﴾ وإن تجهر بالقول
فإنه يعلم السر وأخفى ﴿٧﴾ الله لا إله إلا هو له الأسماء
الحسنى ﴿٨﴾ وهل أتىك حديث موسى ﴿٩﴾ إذ رءا نارا
فقال لأهله امكثوا إني ءانست نارا لعلي ءاتيكم منها بقبس
أو أجد على النار هدى ﴿١٠﴾ فلما أتىها نودي يموسى ﴿١١﴾ إني
أنا ربك فاخلع نعليك إنك بالواد المقدس طوى ﴿١٢﴾

## تەفسیری سوورەتی (طه)

## مەككیە (١٣٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٨): ﴿ طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾:

(١): (خـوا دەفەرمـوێ:) ﴿ طه ﴾ لـە كـۆی ئـەو پیتە پچـڕ پچڕانەیە کـە لە زۆربەی سـوورەتەکاندا دەسـتی پێکـراوە، وە ناویش نیە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ.

(٢): ﴿ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴾ واتـە: مەبەسـت لـە وەحـیو دابەزاندنـی قورئان بۆ سـەر تـۆ، وە دانانـی شـەریعەت بۆ ئـەوە نیە دووچـاری نارەحەتیت بـکات، یان بـۆ ئەوەیێ لـە شـەریعەتدا ئەرکێ بسـپێرێ کە لـە توانای ئـەرک پێسـپێردراوانا نەبـێ، وە جیهانیان بێ توانـا بن لە ئاسـتیدا، بەڵکو وەحیو قورئانو شـەریعەت خـوای بە ڕەحمو میهرەبـان دایناوە، وە کردوویەتـی بە گەیشـتن بە ڕێگاکانی خۆشـبەختیو سـەرکەوتنو سـەرفرازی، ئاسـانی کـردوە بەوپەڕی ئاسـان کـردن، هەموو بـەشو ڕێگاکانی سـووک کـردوەو کردوویەتی بـە خـۆراک بـۆ دڵو ڕووحـەکانو حەوانەوەی جەسـتەکان، بۆیە سروشـتی پـاکو عەقڵی ڕاسـت وەریـان گرتـووەو ملکەچـی بـوون، بـە هۆی (ئەو زانسـتەی لـە خۆی گرتـووە لە خێـروو چاکە لـە دونیـاو دوارۆژدا)، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

(٣): ﴿ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾ تەنهـا ئـەو کەسـە ئامۆژ گـاری لێوەردەگـرێ کـە لـە خـوا ﷻ بترسـێ، ئامۆژ گـاری پێوەردەگـرێ لـە هانـدان بـۆ بەرزتریـن داواکاریـەکان،

ئنجـا کار دەکا بــەو جــۆرە، وە دەبێتــە ئامۆژ گــاری بــۆ ترســاندنی خەڵکــی لــە بەدبەختیو خەســارتمەندی، وە حوکمــە شــەرعیەکانی بیردەخاتــەوە بە تێرو تەســەلی، کە بە شــێوەیەکە جوانــی هێڵە گشــتییەکانی ڕاســتەوخۆ لە عەقڵی ئینســان جێــی دەبێتەوە، بــە جۆرێک موافقی وردەکاریەکانیەتــی کــە لــە عەقــڵو فیترەتیــدا هەن، لەبــەر ئەوە خوا نــاوی لە قورئــان ناوە ﴿ تَذۡكِرَةً ﴾بیرخســتنەوە بــۆ شــتێکە بوونی هەبێ، بــەڵام دەبــێ خاوەنەکەی لێــی بێئاگا بــێ، یــان ئاگای لە وردەکاریەکانی نەبێ، وە بیرخســتنەوەی تایبــەت کردوە ﴿ لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴾ (بــۆ ئــەو کەســەی لە خــوا بترســێ) چونکە جگە لەو کەســەی لە خوا دەترســێ کەســی دی ســوود لەم بیرخســتنەوەیە وەرناگرێ، کەسێک بــڕوای بە بەهەشــتو ئاگر نەبــێو لە دڵیدا مســقاڵە زەرەیەک ترســی خــوا نەبێ چــۆن ســوودی لێوەردەگرێ؟

﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ١٠ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ١١ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ١٢ ﴾الأعلی، (واتــە: بێگومــان ئــەوەی لــە خــوا بترســێ پەنــدی لــێ وەردەگــرێ * وە ئــەوەی زۆر خراپیش بێ خــۆی لــێ دوور دەخاتــەوە * ئــەوەی دەچێتــە نێــو ئاگری هــەرە گەورەوە). پاشــان باســی گەورەیــی ئــەم قورئانــە مەزنــەی کــردوە، لەلایــەن دروســتکەری ئاســمانەکانو زەویــەوە نێردراوەتــە خــوارەوە، کە کاروبــاری هەمــوو بەدیهێنــراوەکان ڕێکدەخات، واتــە: بڕوا بەو قورئانــە بکــەن بــەو پــەڕی ملکەچیو خۆشویســتنو تەســلیم بوونــەوە، وە بە مەزنــی دابنێن بــەو پــەڕی مەزندانان.

خــوا ﷻ زۆر جــار لــە قورئانــدا بــەراوردی کردوە لــە نێــوان (بەدیهێنــان - فەرمانــدا)، وە (الخلق والأمر)، هــەروەک چــۆن لــەم دەقەدا هاتــوە، وە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ ٥٤ ﴾الأعــراف، (واتــە: بەدیهێنــانو فەرمانــدان هەر بــۆ خوایە)، وە لە فەرمایشــتی خــوادا هاتــوە: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ ١٢ ﴾ الطلاق، (واتــە: خــوا زاتێکــە کە حــەوت ئاســمانی دروســت کــردوە، وە بە وێنــەی ئەوان زەویشــی دروســت کــردوە، فەرمانی خــوا لــە نێوانیانــدا دادەبەزێت).

بــەو شــێوەیە خــوا ﷻ بەدیهێنــەرو فەرمانکــەرو قەدەغــەکارە، هــەروەک چــۆن هیــچ بەدیهێنەرێــک نیــە غەیــری ئــەو نەبــێ، بۆیە لەســەر خەڵک پابەند بــوون نیە نە بــە فەرمانو نــە بــە قەدەغەکــردن تەنهــا لــە لایــەن بەدیهێنەرەکەیانــەوە نەبــێ، هەروەهــا بەدیهێنانــی بەدیهێنــراوەکانو هەڵســوڕاندنی قــەدەریو گەردوونــی گرتۆتــە خــۆ، وە فەرمانەکەیشــی هەڵســوڕاندنی شــەرعیدینی لەخــۆ گرتــووە، هــەروەک چۆن بەدیهێنــراوەکان بــەدەر نین لە

حیكمەتی ئەو، هیچ شتێكی بە گاڵتەو گۆترە بەدی نەهێناوە، بە هەمان شێوە فەرمان ناكاو قەدەغە ناكا تەنها بە دادپەروەریو حیكمەتو چاكە نەبێ.
جا كاتێ كە ڕوون بوویەوە خوا بەدیهێنەری كاربەڕێخەری فەرمانكەری قەدەغەكارە هەواڵیدا دەربارەی مەزنیو گەورەیی خۆی فەرموویەتی:
(٥): ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ (واتە: خوای میهرەبان بەرزبووە سەر عەرشو قەراری گرت) عەرش بەرزترینو مەزنترینو بەرفراوانترینی بەدیهێنراوەكانە، ﴿ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ بەرز بوونەوەیەك شایستە بێ بە گەورەیی ئەوو گونجاوبێ لەگەڵ مەزنیو جوانیدا، جا بەرزبوویەوەو قەراری گرت لەسەر عەرش، هەموو موڵكی لە خۆگرت.
(٦): ﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ﴾ (واتە: تەنها موڵكی خوایە ئەوەی لە ئاسمانەكانو ئەوەی لە زەویدایە وە ئەوەی لە نێوانیاندایە) لە فریشتەكانو مرۆڤەكانو جنۆكەكانو ئاژەڵەكانو بێگیانەكانو ڕووەكەكان ﴿ وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴾، (ئەوەی لە ژێر) زەویدایە، هەموویان موڵكی خوان، بەندەی بەڕێوەبراوو ڕامكراون، لە ژێر قەزاو قەدەری خواو بەڕێوەبردنی ئەودان، هیچ موڵكێكیان بە دەست نیە، تەنانەت بۆ نەفسی خۆشیان هیچ سوودو زیانێكیان بە دەست نیە، وە نەمردنو نە ژیانو نە زیندوو بوونەوەیان.
(٧): ﴿ وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ ﴾ (واتە: ئەگەر تۆ بە ئاشكرا قسە بكەیت ئەوە بە ڕاستی خوا لە نهێنی دەزانێ) قسەی شاراوە ﴿ وَأَخۡفَى ﴾ لە نهێنی شاراوەتر، بریتیە لەو نهێنیەی لە دڵدایە، بەڵام بە زمان دەرینەبڕیوە، یان: ئەو نهێنیەی بەسەر دڵ دادێ ﴿ وَأَخۡفَى ﴾ ئەوەیە بە دڵی مرۆڤدا نەهاتووە، خوا دەزانێ ئەو لە كاتی خۆیدا بە دڵی دادێ.

مانای ئەوەیە: بێگومان زانستو زانیاری خوا ﷻ دەوری هەموو شتەكانی داوە، بە وردو درشتو گەورەو شاراوەو ئاشكراكانی، یەكسانە ئەگەر ئەوەی لە دڵتدایە دەری ببری یان بەنهێنی بمێنێتەوە، هەمووی یەكسانە لە زانستی خوا ﷻ، كاتێ كە بڕیاری كەماڵی ڕەهای دا بە گشتگیری فەرمانو قەدەغە كراوەكانیو گشتگیری ڕەحمەتو بەزەییو بەرفراوانی مەزنی، وە بەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرشو گشتگیری موڵكو گشتگیری زانستی، ئەنجامی هەموو ئەمانە ئەوەیە: كە تەنها خوا ﷻ شایستەی بەندایەتی بۆ كردنە، وە تەنها بەندایەتی كردن بۆ ئەو هەقو ڕاستە كە شەریعەتو عەقڵو سروشت پێویستی

کـردوە، وە بەندایەتـی غەیـری ئەو بەتـاڵو پووچە، بۆیـە فەرموویەتی:
(٨): ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ واتـە: هیـچ پەرسـتراوێک نیـە بـە هـەقو ڕاسـتی، وە هیـچ ئیلاهێـک نیـە بە خۆشەویسـتیو زەلیلـیو تـرسو ئومێدو ملکەچ بـوون و نـزاوە تەنها خوا نەبـێ، ﴿ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ واتـە: تەنهـا بـۆ ئـەوە هەموو ناوە تـەواوو جوانـەکان، لە جوانیانـدا هەمـوو ئەو ناوانە بەڵگەن لەسـەر سـتایش کـردن، هیـچ ناوێکیان تێدا نیـە بەڵگە نەبـێ لەسـەر وەسـفو سـتایش، وە لە جوانـی ئەو ناوانـە ئەوەیە تەنهـا ناوێکـی ڕەقو تەق نیـە، بەڵکـو کۆمەڵە ناوو وەسـفێکن لە جوانیاندا بەڵگەن لەسـەر سـیفاتە تـەواوەکان، وە هەر سـیفەتێکیش کـە هەیەتـی لـەو پـەڕی تەواویو گشـتگیریو بەرزیـی دایە، وە لـە جوانی ئـەو ناوانـەدا ئەوەیـە فەرمانـی بـە بەنـدەکان کـردوە پێیـان بپاڕێنـەوە، چونکـە هۆکاری نزیـک بوونـەوەن لە خوا ﷻ، ئـەو ناوانەی خۆش دەوێو ئەو کەسەیشـی خـۆش دەوێ کە خۆشـیانی دەوێو حـەز دەکا بیانپارێزێ، وە ئەو کەسەیشـی خـۆش دەوێ دەگەڕێ بە دوای ماناکانیـداو بـەو ناوانە پەرستشـی خوای پێـدەکات، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعـراف. (واتـە: تەنهـا بـۆ ئەو خـوا هەیە نـاوە هـەرە جوانەکان پێیـان بپاڕێرەوە).
(٩-١٢): ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ ﴾

خـوا ﷻ بـە شـێوەی پرسـیاری سـەرنجڕاکێشو بـە مەزندانانـی ئـەم چیـرۆکو بەسـەرهاتەو بـە گـەورە دانانـی بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾ (واتـە: هـەواڵو دەنـگو باسـی مووسـا ؑ پێغەمبـەرت پێگەیشـتووە) لـە حاڵێکـدا کـە سـەرەتای خۆشـحاڵی بـوو، وە لـە سـەرەتای دروسـت بوونـی پێغەمبەرایەتی دابـوو، ئـەو ئاگرێکـی لـە دوورەوە بینـی، پێشـتر ڕێگاکەی ون کردبوو، تووشـی سـەرما بـوو هیـچ شـتێکی لـەلا نەبوو خـۆی پێ گـەرم بکاتـەوە لـە گەشـتەکەیدا ﴿ فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ ﴾ واتـە: (بمێننـەوە مـن) بینیومـە ﴿ نَارًا ﴾ ئاگرێـک، ئـەو ئاگـرە لە لای ڕاسـتی کێـوی طور بـوو ﴿ لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ ﴾ (واتە: ئـەڕۆم بـۆ لای بەڵکو لەو ئاگـرە چلۆسـێکتان بـۆ بێنمـەوە) خۆتانی پێ گـەرم بکەنـەوە ﴿ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴾ واتـە: یـان لـە لای ئـەو ئاگـرە کەسـێکم دەسـت بکەوێـت ڕێگـام پێنیشـان بـدات، ئەو

مەبەستی ڕووناکی هەستەوەری بوو، وە هیدایەتێک بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگری بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکەو وەرگرتنی ئاگرێک بۆ خۆ گەرم کردنەوە، بەڵام ڕوناکیەکی مەعنەوی بینی، ئەویش ڕووناکی وەحی بوو کە مژدە دەدات بە ڕووحو دڵەکان، وە هیدایەتی ڕاستەقینە، هیدایەتی ڕێگای ڕاست، کە دەیگەیەنێتە بەهەشتانی پڕ لە نازو نیعمەت، شتێکی بەدەست هێنا هەر حیسابیشی بۆ نەکردبوو، وە بە بای خەیاڵیشدا نەدەهات.

﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا ﴾ واتە: (جا کە گەیشتە لای) ئاگرەکە کە پێشتر لە دوورەوە بینیبووی، جا -لە ڕاستیدا- نوورو ڕووناکیەک بوو، ئەویش ئاگرێک بوو سوتێنەرو ڕووناکی بەخش بوو، بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: [حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهَا لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ] (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٦٤٩)، مُسْلِمٌ برقم: (١٧٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٣٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ في «الأَوْسَط» برقم: (٦٠٢٥)).

واتە: پەردەی خوا ڕووناکییە، یان ئاگرە، ئەگەر خوا پەردەکەی لابدات پرشنگی ڕووی خوای پەروەردگار هەرچی لە حوکمی بینینی خوادایە هەمووی دەسوتێنێ.

کاتێ گەیشتە لای ئاگرەکە بانگی لێ کرا، واتە: خوا بانگی کرد، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ ﴾مریم، (واتە: ئێمە ئەومان بانگ کرد لەلای ڕاستی کێوی طوور، وە نزیکمان کردەوە تاکو قسەی لەگەڵدا بکەین).

﴿ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴾ هەواڵی پێدا کە ئەو پەروەردگاریەتی وە فەرمانی پێکرد خۆی ئامادە بکات بۆ موناجاتیو گرنگی پێبدات، وە پێڵاوەکانی دابکەنێ، لەبەر ئەوەی لە شوێنێکی پیرۆزو پاکو مەزندایە، ئەگەر ئەو جێگایە هیچ پیرۆزیەکی نەبووایە تەنها ئەوە نەبێ خوا هەڵیبژاردووە بۆ موناجاتی لەگەڵ مووسادا ئەوە بەسیەتی.

زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: خوا فەرمانی کردوە بە مووسا عليه السلام پیلاوەکانی فرێ بدا، چونکە لە پێستی کەر بوون، «خوا زاناترە بەوە».

وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠
فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ
أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ
عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلْكَ
بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا
وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا
يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا
وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ
إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ
مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ
رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن
لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ
أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ
كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ
أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾

**(١٣):** ﴿ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ ﴾:

﴿ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ ﴾ واتە: هەڵمبژاردووی لە ناو خەڵکیدا، ئەمەش لە گەورەترین نیعمەتو منەتەکانێتی کە کردوویەتی بەسەرمووسادا ، سوپاسگوزاریەک دەخوازێ کە شایستەی ئەم نیعمەتە بێ، لەبەر ئەمە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾ واتە: باش گوێ بگرە بۆ ئەو وەحیو نیگایەی کە بۆت دەکرێ، چونکە بناغەو بنچینەی ئاینەو ڕێبازو بیرو باروەڕێتی، وە کۆڵەکەی بانگەوازی ئیسلامە.

پاشان هۆکاری ئەوەی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە وەحی بۆ دەکات، بە وتەی خۆی:

**(١٤):** ﴿ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ ﴾:

واتە: خوا شایستەی پەرستنەو بەوە وەسف کراوە، چونکە تەواوە لە ناوو سیفاتەکانیدا، تاکو تەنها لە کردارەکانی، هیچ هاوبەشو هاوشێوەو هاوشانو وێنەی نیە.

﴿ فَٱعْبُدْنِى ﴾ (واتە: من بپەرستە) بە هەموو جۆرەکانی پەرستن، بە ئاشکراو بە نهێنی، بە بنچینەو لقو پۆکان، پاشان تایبەت باسی ئەنجامدانی نوێژی کردوە -ئەگەر چی لە نێو پەرستندایە- ئەمەش بە هۆی فەزڵو حورمەتو گەورەیی، وە بە هۆی ئەوەی بەندایەتی دڵو زمانو ئەندامەکانی جەستە دەگرێتەوە.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِذِكْرِىٓ ﴾ (تا منت بێتەوە یاد)، لێرەدا (لام) بۆ تەعلیلە (بۆ ڕوون کردنەوەی هۆکارەکەیە) واتە: نوێژ بکە لە پێناو ئەوەی یادی من بکەی، چونکە یادکردنەوەی خوا گەورەترینی مەبەستەکانە، ئەویش پەرستنی خوایە بە دڵو بەوەش دڵ خۆشبەخت دەبێ، دڵێک لە یادی خوا کەوتبێ، ئەوە لە هەموو خێرو چاکەیەک کەوتووە، وە ئەو دڵە بە تەواوی وێران بووە کە یادی خوای تێدا نیە، خوا بۆ پەرستنی خۆی چەندین جۆر پەرستنی داناوە کە مەبەست تیایاندا بەجێهێنانی یادێتی، بە تایبەتی نوێژ.

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ ﴿٤٥﴾ ﴾العنكبوت، (واتە: بیخوێنەوە ئەو قورئانەی کە سروشت کراوە بۆت، وە نوێژ بکە بێگومان نوێژ قەدەغەی خاوەنەکەی دەکات لە کاری ناشرین‌و ناپەسند، وە زیکرو یادی خوا گەورەترە). واتە: ئەوەی تیایدایە لە زیکرو یادی خوا گەورەترە لە قەدەغە کردنی فاحیشەو خراپە، ئەم جۆرە پێی دەوترێ یەکتاپەرستی پەرستراوێتی، وە یەکتاپەرستی پەرستن، جا یەکتاپەرستی پەرستراوێتی بریتیە لە وەسفکردنی خوای بەرزو مەزن، وە یەکتاپەرستی پەرستن وەسفی بەندەیە بە پەرستن(ی خوای تعالی).

(١٥): ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ ﴾ واتە: (ڕۆژی دوایی) هەر دەبێ ڕووبدات ﴿ أَكَادُ أُخۡفِيهَا ﴾ واتە: (دەمەوێ کاتی هاتنی) لە خۆمی بشارمەوە هەر وەک چۆن لە هەندێ (قراءة)ەکاندا هاتووە، وەک ئەم ئایەتەی خوا ﷻ: ﴿ يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ﴿٦٣﴾ ﴾الأحزاب، (واتە: خەڵکی پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی کاتی ڕوودانی ڕۆژی دونیا تێکچوون؟ بڵێ: زانیاری ئەو ڕۆژە لای خوایە)، ﴿ وَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٨٥﴾ ﴾الزخرف، (واتە: زانینی هاتنی ڕۆژی دوایی تەنها لە لای خودایە)، زانینی ئەو ڕۆژە خوا ﷻ لە هەموو بەدیهێنراوەکانی شاردۆتەوە، هیچ فریشتەیەکی نزیک، وە هیچ نێردراوێکی خوا کاتی ڕوودانی نازانێ.

حیکمەت لە هاتنی ڕۆژی دواییدا: ﴿ لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی پاداشت بدرێتەوە هەموو کەسێک بە گوێرەی ئەو کردەوەی کە دەیکات) لە چاکەو خراپە، ئەوە دەرگایەکە بۆماڵی پاداشت ﴿ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ﴿٣١﴾ ﴾النجم. (واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردوە، بە پێی کردەوەکانیان، وە پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە چاکەیان کردوە بە چاکتر لەوەی کردوویانە).

(١٦): ﴿ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾:

واتە: جا با ئەو کەسەی بڕوای بە ڕۆژی دوایی نیە ڕێگریت لێنەکات لە بڕواهێنان بە ڕۆژیی دوایی‌و پاداشت دانەوەو کارو کردەوەی چاک بۆ ئەو ڕۆژە، چونکە کەسی بێبڕوا بڕوای بە هاتنی نیە، وە خۆی لە گوماندایە هەوڵ دەدات خەڵکیش بخاتە ناو گێژاوی گومانەوە، ئەو کەسە مشتومڕ دەکات لەسەر شتی بەتاڵ، هەرچی لە توانایدا بێ بۆ ئەو گومانە بەڵگە

دەهێنێتەوەو درێغی ناکات، ئەوە شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە، نیازی ئەوە ناکات بگات بە هەقو ڕاستی، بەڵکو هەموو ئامانجەکانی لە شوێنکەوتنی حەزوو ئارەزووەکانیدا کۆکردۆتەوە، دەخیلەو ئاگادار بە گوێ بۆ کەسێ بگری ئەمە حاڵی بێ، یان شتێ لە قسەو کردەوەکانی وەربگری کە دژە بە ئیمانو بڕواهێنان.

بۆیە خوا ﷻ ئاگاداری دەدا لەو جۆرە کەسەی ئەمە حاڵی بێ، چونکە ئەوە لە ترسناکترین کەسە وەسوەسەو ختوورە بخاتە دڵی بڕوادارەوەو تووشی دەجەلو بێ دینی بکات، وە لەبەر ئەوەی نەفسو دەروونەکان لەسەر گومانو دوودڵیو پەیڕەوکردن وەستاون، لەم دەقەدا ئاگادار کردنەوەو ئاماژە بەدی دەکرێت بۆ دوورکەوتنەوە لە هەموو بانگخوازێک بۆ پووچو بەتاڵ، ڕێگری لە ئیمانێک دەکات کە پێویستە، یان گومان دەخاتە نێو دڵەوە، وە ئاگادارکردنەوەیشی تێدایە لە تەماشا کردنی ئەو کتێبانەی قسەی پووچو بەتاڵ دەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی.

وە لەمەدا باسی بڕواپێهێنانو بەندایەتی کردنو بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی کردوە، چونکە ئەم سێ شتە بنەماو بنچینەی ئیمانن، وە ڕوکنو پایەی دینن، ئەگەر ئەو سیانە تەواو بوون، ئەوە کاروباری دین تەواو دەبێ، وە ئەگەر ناتەواو بوو یان یەکێک لەو سیانە نەبوو، ئەوە دینەکەی کەمو کوڕی هەیە، ئەمەش وێنەی وتەی خوای بەرزو مەزنە لە هەواڵدانی دەربارەی تەرازووی خۆشبەختیو بەدبەختی ئەو دەستەو تاقمانەمان کە کتێبیان پێدراوە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾المائدة، (واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئەوانەی بوون بە جوولەکەو ئەستێرە پەرست، وە شوێنکەوتووانی عیسا هەر کەس لەوانە بڕوایان هێنابێ بە خواو بەڕۆژی دواییو کردەوەی چاکیان ئەنجامدابێ ئەوە نە هیچ ترسێکیان لەسەرە، وە نە خەفەتبار ئەبن لە ڕۆژی دواییدا)، وە کە دەفەرموێ: ﴿ فَتَرْدَىٰ ﴾ واتە: لەناو دەچێتو بەدبەخت دەبێت، ئەگەر شوێن ڕێگەی ئەو کەسانە بکەوێ کە لە ڕێی خوا لایانداوە.

(١٧-٢٣): ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ﴾:

کاتێ خوا ﷻ بنچینەو بنەمای ئیمانی ڕوون کردەوە بۆ مووسا ﷺ، ویستی پشتیوانی خۆیو بەسەر دوژمنەکەیدا بۆ ڕوون بکاتەوەو هەندێ لە نیشانەو ئایەتەکانی خۆی پێنیشان بدات، بۆ ئەوەی دڵی ئارام بێتو چاوەکانی ئۆقرە بگرنو ئیمانی پێی بەهێزتر بێ، پێی فەرموو: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ (واتە: ئەی مووسا ﷺ ئەوە چیە بە دەستی ڕاستەوە)، خوای گەورە خۆی دەیزانی چی بە دەستەوەیە، بەڵام ئەمە بۆ گرنگی پێدانی زیاترە کە بە شێوەی پرسیاری نکوڵی لێکردن هێناویەتی.

مووسا ﷺ وتی: ﴿عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي﴾ (واتە: ئەوە گۆچانەکەی خۆم دەدەم بەسەریدا لە کاتی ڕۆیشتندا، وە گەڵای درەختی پێدەوەرێنم بۆ مەڕەکانم) باسی ئەم دوو سوودەی کرد لە گۆچانەکەدا، سوودێک بۆ مرۆڤ، ئەویش ئەوەی پشتی پێدەبەستی لە کاتی هەستانو ڕێکردنیدا، وە سوودێکی دیکەش بۆ ئاژەڵەکانی، ئەویش ئەوەیە شوانی مەڕی پێدەکات، جا ئەگەر مەڕوو ماڵاتەکەی بلەوەڕێنی لە ناو داروو درەختدا بە گۆچانەکەی دەدا لە گەڵای دارەکان بۆ ئەوەی بوەرێنە خوارەوەو مەڕەکانی بیخۆن.

ئەم ڕەوشتە بەرزە لە مووسادا بەدی دەکرێ لە گرنگیدانی بە مەڕوومالاتو چاک بوون لەگەڵیاندا، بەڵگەیە لەسەر گرنگی پێدانی خواو هەڵبژاردنو پاڵفتە کردنی، وە ئەم تایبەت کردنەی مووساش لە سۆنگەی بەزەیيو حیکمەتی خوا خۆیەتی ﴿وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ﴾ واتە: بۆ چەند مەبەستێکی ﴿أُخْرَىٰ﴾ (دیکەش بەکاری دەهێنم) جگە لەم دوو مەبەستە.

لە ئەدەبی مووسا ﷺ کاتێ خوا پرسیاری لێدەکات کە چی بە دەستی ڕاستیەوەیە، ئەو پرسیارەش دوو مانا هەڵدەگرێ، پرسیار کردن لە خودی گۆچانەکەی دەستی، یان سوودی گۆچانەکە، وەڵامی دایەوە بە خودی گۆچانەکەو سوودەکەیشی.

پاشان خوا پێی فەرموو: ﴿أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ﴾ (واتە: ئەی مووسا گۆچانەکەت فڕێ بدە، جا ئەویش فڕێیدا) دەستبەجێ گۆچانەکە بوویە مارێکو بە خێرایی دەڕۆییشت، بە مۆڵەتی خوا گۆچانەکە گۆڕا بۆ مارێکی گەورە، مووسا پشتی هەڵکردو ڕایکرد لە ترسا ئاوڕی نەدایەوە، لەوەسف کردنی مارەکە بەوەی بە خێرایی دەڕۆیی بۆ لا بردنی گومانێک کە دەگونجێ بوونی هەبێ، ئەویش ئەوەیە کەسێک گومان بباتو بڵێ: ئەوە خەیاڵەو حەقیقەتی نیە، جا ئەو وەسفەی خوا بۆ مارەکە بۆ نەهێشتنی ئەو جۆرە وەهمو گومانەیە.

پاشان خوا بە مووسا ﷺی فەرموو: ﴿خُذْهَا وَلَا تَخَفْ﴾ (واتە: بیگرەو مەترسە)

هیچ ترسێکت لەسەر نیە لە لایەن مارەکەوە، ﴿ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴾ واتە: (دەیگێڕینەوە سەر) هەمان هەیئەتو سیفەتی پێشووی خۆی، کە گۆچان بوو، مووسا ﷺ فەرمانی خوای جێبەجێ کرد، دەستی بۆ بردو هەڵیگرت بوو بە گۆچانەکەی چاخی جاران. پاشان خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ ﴾ واتە: دەستت بخەرە گیرفانی خۆت، پاشان بە هێز بەبن باڵتەوە بیگوشە ﴿ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ﴾ واتە: کە دەری دێنیت سپی دەبێو دەدرەوشێتەوە هۆی سپی بوونو درەوشانەوەکەش نە نەخۆشییە، نە نیشانەی بەڵەکیە، ﴿ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴾ (واتە: ئەمەش موعجیزەیەکی ترە جگە لە گۆچانەکەت)، خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ فَذَٰنِكَ بُرْهَـٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ القصص. (واتە: ئەم دوو موعجیزەیە دوو بەڵگەن لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ سەر فیرعەونو داروو دەستەی، بە ڕاستی ئەوانە قەومێکی یاخیو نالەبارو تاوانبار بوون). ﴿ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَـٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴾ واتە: (بۆ ئەوەی هەندێ لە موعجیزەو بەڵگە گەورەکانی خۆمانت پێشان بدەین)، واتە: ئەم دوو کارەی کە باسمان کرد لە گۆڕینی گۆچانەکە بۆ مارێکی گەورەی ڕۆیشتوو، وە دەرهێنانی دەست لە بن باڵ بە شێوەیەکی سپیو درەوشاوە، بۆ ئەوەبوو نیشانە گەورەکانی خۆمانت پێنیشان بدەین، کە بەڵگەیە لە سەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیتو حەقیقەتی ئەو پەیامەی هێناوتە.

(٢٤-٣٦): ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَـٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾:

کاتێ خوا ﷻ وەحیو نیگای کرد بۆ مووسا ﷺ، وە ئاگاداری کردەوەو ئایەتو نیشانە ڕوونەکانی پێنیشاندا، ئنجا ناردی بۆ لای فیرعەون پاشای میسر، فەرمووی: ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾ واتە: لە کوفرو خراپەکاریو لووت بەرزی لە زەویداو دەست گرتن بەسەر هەژارو نەدارەکاندا سنووری تێپەڕاندووە، تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی بانگەشەی پەروەردگارێتیو پەرستراوێتی کردوە -خوا ڕووڕەشی بکات- واتە: سەرکێشیو یاخیبوونی هۆکارێک بوون بۆ لە ناو چوونی، بەڵام لە ڕەحمەتو حیکمەتو دادپەروەری خوا ﷻ ئەوەیە کە سزای هیچ کەس نادا دوای ئەوە نەبێ پێغەمبەرانی بۆ بنێرێو بەڵگەو بیانووی ببڕێو حوججەی لەسەر پێویست بکات، جا ئەوکات مووسا بۆی دەرکەوت ئەرکێکی

قورس‌و مەزن كەوتۆتە سەر شانی، كاتێ كە نێردراوە بۆ لای ئەم كەسە یاخی بوو عینادە، كە هیچ كەس لە ناو خەڵكی میسردا ناتوانێ بەرانبەری بوەستێ، وە مووساش تاك‌و تەنهایەو پێشتریش كەسێكی كوشتووە لەو شارە، ڕاستەوخۆ ئامادەیی خۆی پێشاندا بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانی پەروەردگاری، داوای یارمەتی‌و سینە فراوانی‌و هۆكار ئاسانی بۆ تەواویی بانگەوازیەكەی لە پەروەردگاری كردو وتی:

﴿ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴾ واتە: (پەروەردگارم سنگم) بەرفراوان بكە، بۆ ئەوەی بتوانم بەرگەی قسەی ناشرین‌و كردەوەی ناشرین بگرم، وە دڵم پێیان لەكەو پەڵە نەگرێ‌و سنگم توونـد نەبێ، چونكە بێگومان سینە ئەگەر تووندو تەسك بوو ئەوە خاوەنەكەی شایستەی ئەوە نیە ڕێنمایی‌و بانگەوازی خەڵكی بكات، خوا بە پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ فەرمووە: ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾آل عمران، (واتە: بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان (بۆ هاوەڵان) نەرم‌و نیان بووی ئەگەر تۆ بەدخوو قسە ڕەق‌و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوە هەموویان بڵاوەیان دەكرد). بێگومان خەڵكی هەق‌و ڕاستی وەردەگرن لەگەڵ نەرم‌و نیانی‌و سینە فراوانی‌و لێبووردەییدا.

﴿ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴾ واتە: كارم بۆ ئاسان بكە هەر ئیش‌و كارێ دەیگرمە بەر وە هەر ڕێگایە لە پێناوی تۆدا دەیبرم، هەر زەحمەتێك دێتە پێشم لەسەرم ئاسانی بكە، لە ئاسانكردنی كاروبارەكان ئەوەیە كە بانگخواز بۆ هەر بابەتێ لە دەرگای خۆیەوە بچێتە ژورەوە، وە لەگەڵ هەر كەسێكدا بدوێ بەو شێوەی كە بۆ ئەو دەگونجێ، وە هەوڵ بدا نزیكترین ڕێگا بەكاربێنێ، بۆ وەرگرتنی قسەكەی.

(٢٧-٢٨): ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴾:

واتە: (گرێی زمانیشم بەرەڵا بكە * بۆئەوەی لە قسەكانم تێبگەن) ڕاڤەكارانی قورئان دەڵێن: قورسیاییەك لە سەر زمانی مووسا عليه السلام هەبوو، خەڵكی بە جوانی لە قسەكانی تێنەدەگەیشت، وەك خوا ﷻ دەربارەی دەفەرموێ كە مووسا عليه السلام وتوویەتی: ﴿ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا ﴿٣٤﴾ ﴾القصص، (واتە: وە هاروونی برام زمانی لە من پاراوترە)، بۆیە داوای كرد لە خوا ﷻ كە ئەو گرێیە لەسەر زمانی لاببا بۆئەوەی خەڵكی لێی تێبگەن، وە بۆ ئەوەی بتوانێ مەبەستی تەواو لە قسەو ڕوون كردنەوەی ماناكانی بپێكێ.

﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴾ واتە: (لە خزمانی خۆم كەسێك بكە) بە پشتیوانم هاوكاریم بكاو پشتیوانیم لێبكا، وە یارمەتیم بدا لەسەر ئەو پەیامەی هێناومە، مووسا عليه السلام داوای كردووە

ئەو کەسە کەسی خۆی بێ، چونکە ئەمە داوا کردنی چاکەیە، شایستەترین کەسیش کە داوای چاکەی بۆ بکەی نزیکانتە، پاشان ناوی دیاری کردوەو فەرموویەتی: ﴿ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ ﴾ واتە: پشتمی پێ قایم بکەو بەهێزی بکە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا ٣٥ ﴾القصص. (واتە: بێگومان ئێمە بە براکەت بەهێزت دەکەین، وە دەسەلاتێک بە هەردووکتان دەدەین).

﴿ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴾ واتە: (بیکەرە هاوبەشم) لە پێغەمبەرایەتیدا، بیکەی بە پێغەمبەرو نێرراو وەکو چۆن منت کردوە.

پاشان باسی سوودو قازانجی ئەوەی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴾ مووسا ؑ زانیویەتی کە چەقی هەموو بەندایەتیو ئاین لە سەر یادی خوا ﷻ وەستاوە، بۆیە داوای کردوە براکەیشی لەگەڵیدا بێ، هاوکاریو یارمەتی یەکتر بدەن لە سەر چاکەو تەقوای خوا ﷻ، بۆئەوەی زیاتر زیکری خوا ﷻ بکەن لە تەسبیحو تەهلیلو جگە لەوانەش لە جۆرەکانی عیبادەت.

﴿ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴾ واتە: (بەڕاستی تۆ بینای بەهەموو شتێکی ئێمە) بێگومان تۆ زانای بە بێهێزیو هەژاریو پێویستی ئێمە بۆ تۆ لە هەموو کارێکدا، تۆ بیناترو بە بەزەیی تری لە نەفسی خۆمان، جا منەتی خۆت بکە بەسەرماندا بەوەی کە داوامان کردوە، وە پاڕانەوەکەشمان لێوەربگرە.

خوا پێی فەرموو: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾ واتە: بێگومان هەموو داخوازیەکانت پێدرا، سینەو دڵت ئاسوودەو گوشاد دەکەین، کاروبارت بۆ ئاسان دەکەین، گرێی زمانت دەکەینەوەو زمانت پاراو دەکەین بۆ ئەوەی لێت تێبگەن، بەهۆی هاروونەوە پشتت بەهێز دەکەین ﴿ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ٣٥ ﴾القصص. (واتە: وە دەسەلاتێک بە هەردووکتان دەدەین ئەوسا بە هۆی ئایەتەکانی ئێمەوە دەستیان بە ئێوە ناگات، وە ئەوەی شوێنتان دەکەوێ سەردەکەون).

ئەم داواکاریە لە لایەن مووساوە ؑ بەڵگەیە لەسەر تەواوی ناسینی خواو زیرەکیو تەواوی زانینی بە کاروبارەکان، وە تەواوی ئامۆژگاری، بەوشێوەیە ئەو کەسەی بانگەواز دەکات بۆ لای خواو پێشەوایەتی دەکات پێویستە سینەی گوشادو بەرفراوان بێ، وە نەرمو نیانو زمان پاراو بێ، بتوانێ ئەوەی دەیەوێ بەشێوەیەکی جوان دایبڕێژێ بەتایبەت ئەگەر بانگکراو نکوولیکەرو خۆبەزل زانو سەرکێش بوو.

بەڵکـو زمانپاراوەیـیو ڕەوان بێژیـی بـۆ کەسـێ خـاوەن ئـەم پلـەو پایـە بێـت زۆر پێویسـتە، چونکـە خەڵکـی زۆر ڕووی تێدەکـەن، وە خۆیشـی پێویسـتی پێیەتـی بـۆ ئـەوەی هـەقو ڕاسـتی بەجوانـی دەربخـات، هەتـا لەتوانایـدا هەیـە جوانتـری بـکات، بـۆ ئـەوەی خۆشەویسـت بێـت لـە دڵو دەروونەکانـدا، وە بەتـاڵو پـووچ ناشـرینو قیـزەون بـکات بـۆ ئـەوەی خەڵکـی لێـدوور بکەوێتـەوە.

هەروەهـا لەگـەڵ ئەمەشـدا پێویسـتە لـە دەرگاکانـەوە بچێتـە ژوورەوە، وە خەڵکـی بانـگ بـکات بـۆ لای خـوا بـە حیکمـەتو ئامۆژگـاری چـاک، وە مشـوومڕ بـکات بـە چاکتریـن شـێوە، وە مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکـی بـکات هەرکەسـەو بـە پێـی حاڵـی خـۆی، ئـەوەی کارەکـە بـۆ ئـەو جـۆرە بانگخوازانـە تەواوتـر دەکات بریتیـە لـە بوونی پاڵپشـتو یارمەتـی دەرێـک، بـۆ ئـەوەی یارمەتـی بـدەن لـەو شـتانەی کـە دەیەوێـت بیـکاتو بیڵێـت، چونکـە دەنگـەکان تـا زۆر بـن کاریگەریـان زیاتـر دەبێـت، لەبـەر ئـەوە مووسـا ﷺ داوای ئـەو شـتانەی کـرد، خـوای گـەورەش پێیـدا.

ئەگەر سەیری حاڵی پێغەمبەران لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت، دەبینیت بەم شێوەیە بوون، هەریەکەو بە پێی بارودۆخی، بە تایبەت کۆتای پێغەمبەرانو بەڕێزترینیان موحەممەد ﷺ، بێگومان ئەو لە چڵەپۆپەدایە لە هەموو سیفەتێکی تەواودا، بە شێوەیەک لە ڕووی سینە فراوانیو ئاسانکارییو زمان پاراوەییو بەکارهێنانی تەعبیری جوانو ڕوونکردنەوە، وە پاڵپشتی کردنی لەلایەن هاوەڵانەوە بە جۆرێک بووە هاوشێوەی نەبووە.

(٣٧-٤١): ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ﴾

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی منەتـی خـۆی کـرد بەسـەر بەنـدەو پێغەمبەرەکەیـەوە مووسـای کـوڕی عیمـران، لـە ئایـنو وەحـیو پەیـامو وەڵامدانـەوەی داواکاریەکانـی، ئنجـا باسـی نـازو نیعمەتەکانـی دەکات لـە کاتـی پـەروەردە کردنیـدا، وە گواسـتنەوەکانی لـە قۆناغێکـەوە بـۆ قۆناغەکانـی دیکـە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە جارێکـی تریـش منەتمـان کـرد بەسـەرتدا)

إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ
فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ
عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ
هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا
وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ
فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾
وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا
تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا
لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ
عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ
﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ
ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ
كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾

کاتێک ئیلهاممان کرد بۆ دایکت بتخاتە ناو تابووتێکی تایبەتەوە لە کاتی شیرەخۆری لە ترسی فیرعەون، چونکە فەرمانی کردبوو بە سەربڕینی نەوەکانی ئیسرائیل، دایکی شاردیەوەو زۆر ترسا لەوەی لەناو بچێت، خستیە ناو تابووتێکەوە، پاشان فڕێی داوە ناو دەریاوە، واتە: کەنداوی ڕووباری نیل لە میسر، خوا فەرمانی بە دەریا کرد فڕێی بداتە کەنارێک، خوا بۆی نووسیبوو بکەوێتە دەست سەرسەختترین دوژمنی خواو دوژمنی مووسا، وە لەماڵی ئەودا پەروەردە ببێ، ببێتە مایەی ئۆقرەی چاوەکانی ئەو کەسەی دەیبینێ.

بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى﴾(واتە: خۆشەویستیم ڕژاند بەسەرتدا) هەر کەسێک بیبینایە خۆشی دەویست ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ﴾بۆ ئەوەی پەروەردە بکرێیت لە ژێر چاودێری مندا، چ چاودێریو کەفالەتێ گەورەترو تەواوترە لە پشتیوانی خوای چاکەکارو بە بەزەیی، بە توانایە لەسەر گەیاندنی سوودو قازانج بە بەندەکەیو دوورخستنەوەی زیان لێی؟! ناگوازرێتەوە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە، ئیللا خوای گەورە بە شێوەیەک حاڵەتەکەی بەڕێوە دەبرد کە لە بەرژەوەندی مووسا بووایە.

لە جوانی بەڕێوەبردنیدا کاتێک مووسا کەوتە دەستی دوژمنەکەی، دایکی زۆر خەمبارو قەلەق بوو، تا وای لێ هات دڵی بەتاڵ بوو، نزیک بوو نهێنی ئەو منداڵە ئاشکرا بکات، ئەگەر خوا چەسپاوو بەهێزی نەکردایە، لەم حاڵەتەدا خوا ﷻ شیرخواردنی هەموو ئافرەتێکی لەسەر مووسا عليه السلام حەرام کرد، سنگی هیچ ئافرەتێکی نەدەگرد، بۆ ئەوەی سەرەنجام بگەڕێتەوە بۆ لای دایکیو شیری پێبدات،

وە لای ئـەو بمێنێتـەوەو بـە ئارامـیو ببێتـە بیلبیلـەی چـاوی، لـە ماڵـی فیرعەونـەوە هەڵسـان بـە بانگهێشـت کردنـی ئافرەتـان بـۆ ئـەوەی یەکێـک بدۆزنـەوە شـیری پـێ بـداو سـنگی بگرێـت، بـەڵام ئـەو سـنگی هیـچ کەسـی نەدەگـرد، خوشـکەکەی مووسـا دەچـێو پێیـان دەڵـێ: ﴿ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ القصص، (واتـە: ئایـا ماڵێکتـان پیشـان بـدەم کـە ئـەو منداڵەتـان بـۆ بەخێـو بکـەنو دڵسـۆز بـن بـۆی؟).

﴿ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا ﴾ (واتـە: بـە هۆیـەوە تۆمـان گێڕایـەوە بـۆ لای دایکـت تـا چـاوو دڵـی گـەش بێتـەوەو خەفـەت نەخـوات، وە کەسـێکت کوشـت) ئـەو کەسـە پیاوێکـی قیبتـی بـوو (لـە تاقمـی فیرعـەون بـوو) کاتێـک کـە مووسـا چـووە نێـو شـارەکە لـە کاتـی بێئاگایـی خەڵکەکـەدا، دوو پیـاوی بینـی شـەڕیان دەکـرد، یەکێکیـان لـە تایەفـەی مووسـا بـوو، ئـەوی تریـان لـە تایەفەی دوژمنەکانـی بـوو لـە قیبتیـەکان، ﴿ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴿١٥﴾ ﴾ القصص، (ئنجـا ئەوەیـان کـە لـە تایەفـەی خـۆی بـوو داوای یارمەتـی لـێ کـرد لـە دژی ئـەوەی لـە (تاقمـی) دوژمنەکـەی بوو، مووسـاش مسـتێکی لێـداو ئـەو پیـاوە قیبتیـەی کوشـت) لـە خـوا پاڕایـەوەو داوای لێخۆشـبوونی کـرد، خـوای گـەورەش لێـی خـۆش بـوو، ئنجـا دوای ئـەوەی بیسـتی کـەوا گـەورەکان بـە دوایـەوەن دەیانـەوێ بیکـوژن، ڕایکـرد، ئنجـا خـواش ڕزگـاری کـرد﴿ مِنَ ٱلْغَمِّ ﴾ (لـە تۆڵـەی ئـەو گوناهـەی ئەنجامـی دابـوو) وە لـە کوشـتن﴿ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ﴾ واتـە: تاقیمـان کردیتـەوەو تووشـی بـەڵاو نارەحەتیمـان کـردی بینیمـان بەردەوامیـت لەسـەر ڕێگـای ڕاسـت، یـان تۆمـان گواسـتەوە لـەو حاڵـەی تێیـدا بـووی قۆنـاغ بـە قۆنـاغ هەتـا گەیشـتی بـەو قۆناغـەی کـە پێـی گەیشـتووی﴿ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ﴾ (واتـە: ئنجـا چەنـد سـاڵێک مایتـەوە لـە نێـو خەڵکـی مەدیەنـدا) کاتـێ ڕای کـرد لـە دەسـتی فیرعـەونو دەسـەڵاتدارانی ئـەو سـەردەمە بـە هـۆی ئـەوەی دەیانویسـت بیکوژنـەوە، ئنجـا ڕووی کـردە شـاری مەدیـەنو لـەوێ ژنـی هێنـاو بـۆ مـاوەی دە سـاڵ، یـان هەشـت سـاڵ مایـەوە﴿ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴾ واتـە: بەهاتنێـک هاتـی قـەدەر تـۆی هێنـا، وە خـوا ﷻ زانیبـوویو ویسـتی وابـووە لـەم سـەردەمو شـوێنەدا بێیـت، هاتنـی تـۆ تەنهـا ڕێکـەوت نەبـووە، بەڵکـو بـە قـەدەرو ویسـتی خـوا ﷻ

بـووه، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر تـەواوی گرنگیدانـی خـوا بـە مووسـای کەلیـم ﷺ، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴾ واتـە: کارو بەخششـەکانی خـۆم بـە تـۆدا تێپەڕانـد، وە بـە جوانیـم گەڕاندیـەوە، وە پـەروەردەم کـردی، بـۆ ئـەوەی بـۆم ببیـە کەسـێکی تایبـەتو خۆشەویسـت، وە بگەیتـە پلـەو پایەیـەک هیـچ کـەس لـە بەدیهێنـراوەکان پێـی نەگـات، جگـە لـە کەمێکیـان نەبـێ، ئەگـەر خۆشەویسـتێک بیـەوێ کەسـێک هەڵبژێـرێ لـە نێـو بەدیهێنراوەکانـدا، وە بگاتـە پلـەی تـەواوی ئـەوەی خۆشەویستەکەی داوای دەکات، هەمـوو تواناکانـی بـۆ ئـەو مەبەستە بەکاربێنـێ بـۆ ئـەوەی بگـات بـەو ئامانجـە، دەی گومانـت چـۆن دەبـێ بەرانبـەر تواناو بەخشـندەیی خـوای پەروەردگـار، دەبـێ چ کارێـک بـۆ ئـەو کەسـە بـکات کـە بۆ خـۆی دەیـەوێو هەڵبیـژاردووە لـە نێـو بەندەکانـی؟!

(٤٢-٤٦): ﴿ ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي ﴿٤٢﴾ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآۖ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾

خـوا ﷻ منەتـی کـردوە بەسـەر مووسـادا ﷺ بـە نـازو نیعمـەتو دیـنو دونیایـی، پێـی فەرمـوو: ﴿ ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ ﴾ (واتـە: ئـەی مووسـا) بـڕۆ تـۆو هـارون ﴿ بِـَٔايَٰتِي ﴾ واتـە: بـەو ئایـەتو نیشـانانەی مـن کـە بەڵگـەن لەسـەر هـەقو جوانیەکـەی، وە بەڵگـەن لـە سـەر پـووچو ناشـرینیەکەی، وەک دەسـتو گۆچـانو وێنـەی ئەوانیـش لـە نـۆ ئایـەتو نیشـانەدا بـۆ لای فیرعـەونو دەسـەڵاتدارانی ﴿ وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي ﴾ واتـە: سسـتیو کەمتەرخەمـی مەکـەن لـە بـەردەوام بوونـی یـادی مـن، بەڵکـو بـەردەوام بـنو پابەندبـن پێیـەوە، هەروەکـو چـۆن پەیمانتـان داوە بـەوە ﴿ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾ طـە، بێگومـان یـادی خـوا یارمەتیـدەرە بـۆ ئەنجامدانـی سـەرجەم کارەکان، کارەکان لەسـەر بەنـدە ئاسـانو سـووک دەکات ﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾ واتـە: (بـڕۆن بـۆ لای فیرعـەون) بـە ڕاسـتی ئـەو لـە سـنوور دەرچـووە لـە کوفـرو سەرکێشـیو سـتەمو دوژمنکاریـدا.

﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا ﴾ واتـە: (گفتوگـۆی لەگەڵـدا بکـەن) بـە نـەرمو نیانـیو لەسـەرخۆیی‌و پـڕ لـە ئەدەبـەوە بەبـێ بەکارهێنانـی وشـەی ناشـرینو نەشـیاو لـە قسـەکردندا، یـان وشـکیو ڕەقـی لـە ڕەفتـاردا، ﴿ لَّعَلَّهُۥ ﴾ بەڵکـو بـە هـۆی قسـەی

نـەرمو نیانـەوە ﴿يَتَذَكَّرُ﴾ بەڵکـو بیـر بکاتـەوەو قسـەکانتان لێوەربگـرێ ﴿أَوْ يَخْشَىٰ﴾ یـان بترسـێ لـە شـتانێک کـە زیانـی پێدەگەیەنـن واز بهێنـێ، بێگومـان قسـەی نـەرم هـۆکارە بـۆ ڕێنمایـی، وە قسـەی ڕەقو وشـک خەڵکـی لـە خاوەنەکـەی دوور دەخاتەوە، خـوای گـەورە قسـەی نـەرمو نیانـی شـیکردۆتەوە، وەک فەرموویەتـی: ﴿فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾﴾ النازعـات (واتـە: پێـی بڵـێ: ئـەوە ناکرێـت دڵو دەروونو کـردارو ڕەفتـارت پـاکو پوختـە بێـت* تـا ڕێنمایـت بکـەم بـۆ ناسـینی پەروەردگـارت، تـا ترسـت لـەو زاتـە هەبێـتو سـتەم نەکەیـت).

لـە بـە کارهێنانـی وشـەی (هـل) کـە دەلالـەت لـە ڕاوێـژ کـردنو قسـە ڕا گۆڕینـەوە دەکات لەلایـەن مووسـاوە، ئـەم وشـەیە دڵـی کـەس نایەشـێنێو هەسـتی کـەس بریـنـدار نـاکات،، بانگـی دەکات بـۆ خـۆ پاکردنـەوە لـە پیسـی، کـە لـە بنچینـەدا مەبەسـت پێـی خۆپـاک کردنەوەیـە لـە شـیرکو هاوبەشـدانان، بێگومـان هەمـوو عەقڵێکـی تـەواو تەندروسـت وەری دەگـرێ، نەیفەرمـوو: (أزكيك) واتـە: پاکـت دەکەمـەوە، بەڵکـو فەرموویەتـی: (تـزكى) تـۆ خـۆت پـاک بکـەرەوە.

پاشـان بانگـی دەکات بـۆ ئـەو ڕێگـای پەروەردگـاری کـە پـەروەردەی کـردوە، وە نازو نیعمەتـە ئاشـکراو نهێنیەکانـی ڕشـتووە بەسـەریدا، کـە پێویسـتە لـە بەرانبـەردا شـوکرانە بژێـری بکـرێو یـادی بکرێتـەوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ﴾ دوای ئـەوەی ئـەو قسـە نەرمانـەی وەرنەگـرت، کـە لـە جوانیـدا دڵ ڕەتـی ناکاتـەوە، زانـرا کـە یادخسـتنەوە سـوودی نیـە بـۆی، بۆیـە خـوا گرتـی بـە گرتنێکـی توونـدو بەهێـز. ﴿قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ﴾ (واتـە: مووسـاو هـارۆون وتیـان: ئـەی پەروەردگارمـان بـە ڕاسـتی ئێمـە دەترسـین)، واتـە: ئێمـە دەترسـین فیرعـەون سـزامان بـدات، پێـش ئـەوەی پەیامەکـەی تـۆی پێرابگەیەنیـنو بیانـووی ببڕیـن ﴿أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ واتـە: یاخـی بـێو سەرکەشـی بـکات لـە هـەقو ڕاسـتی، وە بـە موڵـک هێـزو دەسـەڵاتو سـەربازو پشـتیوانەکانی لـە سـنوور دەربچێـت.

﴿قَالَ لَا تَخَافَآ﴾(واتـە: فەرمـووی: مەترسـن) لـەوەی دەسـتدرێژی بکاتـە سـەرتان، ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ واتـە: ئێـوە لـە ژێـر پارێزگـاریو چاودێـری منـدان، هەرچـی ئێـوە دەیڵێـن مـن دەیبیسـتم، وە هەرچـی دەیکـەن مـن دەیبینـم، کەواتـە مەترسـن، ئیتـر ترسـەکەیان نەمـاو دڵیـان ئـارام بوویـەوە بـە پەیمانـی پەروەردگاریـان.

(٤٧-٤٨): ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ ﴾

واتە: هاتن بۆ لای بەم دوو کارە، بانگ کردنی بۆ ئیسلام، ئازادکرنی ئەم نەتەوە بەڕێزە، نەوەکانی ئیسرائیل، لە بەستنەوەو بە کۆیلە کردنیان، بۆ ئەوەی ئازاد بن‌و خۆیان کاروباری خۆیان ڕاپەڕێنن، وە مووسا شەریعەت‌و ئاینی خوا لە ناویدا بەجێبهێنێ، ﴿ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ ﴾(واتە: بە ڕاستی ئێمە بەڵگەو موعجیزەمان بۆ هێناوی)، کە بەڵگەن لەسەر ڕاستیمان، ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾الأعراف، تا کۆتایی ئەوەی خوای پەروەردگار دەربارەیان باسی فەرموویەتی، ﴿ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾واتە: هەر کەسێک شوێنی ڕێبازی ڕاستەقینە بکەوێ‌و هیدایەت وەربگرێ بە شەریعەتی ڕوون‌و ئاشکرا، ئەوە سەلامەتی بەدەست دێنێ لە دونیاو دوارۆژدا.

﴿ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ ﴾(واتە: بە ڕاستی ئێمە وەحیمان بۆ کراوە)، واتە: هەواڵمان پێدراوە لەلایەن خواوە نەک لە لایەن نەفس‌و دەروونمانەوە ﴿ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾واتە: ئەو کەسەیە کە هەواڵی خواو پێغەمبەرەکەی بە درۆ دەزانی، وە پشت دەکات لە ملکەچی‌و شوێنکەوتنیان، ئەمە هاندانی تێدایە بۆ فیرعەون کە بڕوایان پێ بهێنێ‌و بە ڕاستیان دابنێ‌و شوێنیان بکەوێ، وە ترساندنیەتی بە پێچەوانەکەی، بەڵام ئەو ئامۆژگاری‌و بیر هێنانەوەیە هیچ سوودی نەبوو بۆی، چونکە نکوڵی‌و بێبڕوایی کرد بەرانبەر پەروەردگاری، وە دەمە دەمێی کرد لەوەدا بە هۆی ستەم‌و عینادیەوە.

(٤٩-٥٥): ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾

﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾واتە: فیرعەون بە نکوڵی کردنەوە بە مووسای ووت: ﴿ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾؟ مووساش وەڵامی دایەوە بە وەڵامێکی زۆر ڕوون‌و ئاشکراو

ڕەوان: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ واتــە: پەروەردگارمــان ئــەو زاتەیــە کــە هەمــوو بەدیهێنراوەکانــی دروســتکردوە، دروســتکردنێکی تایبەتــی داوە بــە هــەر بەدیهێنراوێــک بــە گوێــرەی ئــەوەی شایستەیەتی، وە مافی هەمــوو دروســتکراوێکی داوە کــە شایســتەیە بەخــۆی لــە دروســتکردندا، کــە بەڵگەیــە لەســەر جوانــی بەدیهێنانــی لــە گەورەیــی لاشــەو بچووکــیو ناوەنــدی وە ســەرجەم ســیفاتەکانی دیکــەش ﴿ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ پاشــان ڕێنمایــی هەمــوو بەدیهێنراوەکانــی کــردوە، بــۆلای ئەوەی دروســتی کــردوە بۆی، ئــەم ڕێنماییــە، ڕێنمایــی گشــتیە کــە بەچــاو لــە هەمــوو بەدیهێنراوەکانــدا دەبینــرێ، وەک دەبینــی هەمــوو بەدیهێنراوێــک هــەوڵو کۆشــش دەکات بــۆ بەدەســتهێنانی ئــەوەی ســوودی هەیــە بــۆی، وە دوورخســتنەوەی ئــەو شــتەی زیانــی هەیــە، تەنانــەت خــوا ﷻ ئەوەنــدە عەقڵــی بەخشــیوەتە ئاژەڵــەکان کــە بتوانــن کاروبــاری خۆیــان بەڕێبخــەن، ئەمــەش وەک وتــەی خــوا ﷻ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾ السجدة، (واتــە: خــوا زاتێکــە هەمــوو شــتێکی بــە جوانتریــن شــێوە دروســت کــردوە)، جــا ئــەو زاتــەی کــە بەدیهێنراوەکانــی دروســت کــردوون بــە جوانتریــن شــێوە، بــە شــێوەیەک عەقڵەکان ناتوانــن لەمــە جوانتــر شــتێ هەڵبژێــرن، وە ڕێنمایــی کــردوون بــۆ بەرژەوەندیەکانیــان، بــە حەقیقــەت ئــەوە پەروەردگــاری ڕاســتەقینەیە، جــا نکوڵــی کردنــی نکوڵــی کردنــە لــە مەزنتریــن شــت کــە بوونــی هەیــە، بەڕاســتی ئــەوە خۆبــەزل زانیــیو درۆکردنــە بــە ئاشــکرا، ئەگــەر گریمــان ئینســان نکوڵــی لــە کۆمەڵێــک شــتی زانــراو کــرد، ئــەوە نکوڵــی کردنــی لــە پەروەردگــاری جیهانیــان زۆر لــەوە گەورەتــرە. لەبەرئەمــە فیرعــەون نەیتوانــی نکوڵــی لــە بەرانبــەر ئــەم بەڵگــە یەکلاکــەرەوەدا بــکات، دەســتی کــرد بــە تێکــەڵو پێکــەڵ کردنــی بابەتەکــە، بابەتەکــەی لــە مەبەســتی ســەرەکی خــۆی لادا بــە مووســای وت: ﴿ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ واتــە: حــاڵو هەواڵیــان چۆنــە، وە چیــان بەســەرهات؟ بێگومــان ئــەوان پێشــی ئێمــە کەوتــن بــە ئینــکاریو کوفــروو ســتەمو ئێمــەش ئەوانمــان کردۆتــە پێشــەنگی خۆمــان؟

قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِي
جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُواْ
وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنۡهَا
خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدۡ
أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئۡتَنَا لِتُخۡرِجَنَا
مِنۡ أَرۡضِنَا بِسِحۡرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأۡتِيَنَّكَ بِسِحۡرٖ مِّثۡلِهِۦ
فَٱجۡعَلۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكَ مَوۡعِدٗا لَّا نُخۡلِفُهُۥ نَحۡنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانٗا
سُوٗى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوۡعِدُكُمۡ يَوۡمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحۡشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحٗى
﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرۡعَوۡنُ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم
مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ
وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ
ٱلنَّجۡوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم
مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴿٦٣﴾
فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴿٦٤﴾

جا مووسا فەرمووی: ﴿ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴾ واتە، کردەوەکانیان لە چاکەو خراپە هەمووی سەرژمێری دەکات، لە پەڕاوێکدا تۆماری دەکات، کە بریتیە لە اللوح المحفوظ، خوا بە زانیاری خۆی هەم بە شارەزایی خۆی دەوری هەموو شتێکی داوە، هیچ شتێکی لێ ون نابێ، وە هیچ شتێکیش لەوانەی دەیزانێ لە بیری ناچێتەوە، ناوەڕۆکی ئەمە ئەوەیە گەلانی پێشوو هەرچیان پێشخست بۆ خۆیان پێشیان خست بێگومان سەرەنجامی کردەوەکانیان دەبیننەوەو پاداشت دەدرێنەوە لە سەری، پرسیاری تۆ دەربارەی ئەوان هیچ مانایەکی نیە ئەی فیرعەون، ئەوان گەلانێک بوون بەسەر چوون هەرچیان کرد کردیان هەر بۆ خۆیان بوو، وە ئێوەش هەرچی دەکەن هەر بۆ خۆتانە، جا ئەگەر ئەو بەڵگانەی بۆمان هێناوی، وە ئەو ئایەتو نیشانانەی نیشانمان داوی هەقیقەتو ڕاستی یەکلابووەتەوەو، کەواتە: ملکەچی هەق بەو واز لە زوڵمو ستەمو کوفر بهێنە، وە واز لە مشتومڕو دەمەدەمێی بەتاڵ بێنە، ئەگەر تۆ هەردوو دڵیو گومانێکت هەیە، یان دەبینی بەلاتەوە ڕاست نیە، ئەوە ڕێگا کراوەیەو دەرگای لێکۆڵینەوە دانەخراوە، ئەگەر دەتوانی بەڵگە بە بەڵگەو سەلماندن بە سەلماندن، وەڵام بدەرەوە، دڵنیابە هەرگیز ڕێگایەک نادۆزیتەوە بۆ وەڵامدانەوەیان.

چۆن لە کاتێکدا خوا ﷻ هەواڵیداوە فیرعەون نکوولی کردووەو لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵەوە دڵنیا بوو کە مووساو هاروون هەقن، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ ﴿١٤﴾ ﴾النمل، (واتە: جا ئەوانەی هەر ڕق ئەستووریان کردوو باوەڕیان پێنەبوو بە زۆرداریو خۆبەلزانی لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتەو ڕاستە) مووسا فەرمووی: ﴿ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ

﴿هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ ﴿١٠٢﴾﴾ الإسراء، (واتە: سوێند بە خوا بێگومان تۆ دەزانی هیچ کەس ئەم موعجیزانەی نەناردۆتە خوارەوە جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی کە ڕوونکەرەوەن) بێگومان زانرا فیرعەون لە ڕۆژگارێک لە ڕۆژگارەکاندا کەسێکی ستەمکارە تەنها مەبەستی خۆبەزلزانینە لەسەر زەویدا.

پاشان لەو بەڵگە یەکلاکەرەوانە قسەی دیکەی هێنانەوە، بە باسکردنو بیرهێنانەوەی زۆرێک لەو چاکەو بەخششو پێویستانەی خوا بۆ بەندەکانی، فەرمووی: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدًا ﴿١٠﴾﴾ الزخرف، واتە: (پەروەردگارم زاتێکە زەوی بۆ کردوون بە) بە جۆرێ دەتوانن تیایدا بحەسێنەوەو ئارام بگرنو ماڵو خانووی تێدا دروست بکەنو کشتوو کاڵو دانەوێڵەی تێدا بچێنن، لەبەر ئەوە بۆی زەلیل کردوون، وای لێنە کردوە بێتە بەربەست لە بەردەم بەرژەوەندیەک لە بەرژەوەندیەکانتان، ﴿وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلًا﴾ واتە: (وە لە ناویدا) چەندەها ڕێگای بۆ فەراهەم هێناون لە زەویەکەوە بۆ زەویەکی دیکە، لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە، تا ئادەمیزادەکان بتوانن تێبپەڕنو بگەن بە هەموو شوێنێکی سەر زەوی بە ئاسانترین شێوە، لە گەشتو سەفەرەکانیاندا سوود وەربگرن زیاتر لەوەی دادەنیشن ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ واتە: لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێ ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴿١٦٤﴾﴾ البقرة، بە هۆی ئەو بارانەوە هەموو جۆرە ڕووەکەکانی ڕواندوە بە ڕەنگو شێوەو تامو بۆنی جیاوازەوە، لەوانەش ڕزقو بژێوی بۆ خۆمانو ئاژەڵەکانمان دابین کردوە، ئەگەر بەو جۆرە نەبووایە ئەوە لە ناو دەچوو ئەوەی لەسەری دەژی لە نەوەکانی ئادەمو گیاندارەکان لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:

﴿كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡ﴾ (واتە: بخۆنو ئاژەڵو ماڵاتەکانیشتان بلەوەڕێنن) میانەی دەقەکە بە شێوەی منەتکردنە بەسەر بەندەکاندا، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە کە بنچینە لە هەموو ڕووەکەکاندا حەلاڵو ڕێگەپێدراویە، هیچ شتێکیان قەدەغە نەکراوە مەگەر ئەوە نەبێ زیانبەخشە، وەک ئەوەی ژەهراوی بێت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾ واتە: (بە ڕاستی ئەوەی کە باسکرا بەڵگەی تێدایە) بۆ ئەوانەی خاوەن عەقڵێکی سەنگینو هێمنن، وە خاوەن بیرو هۆشێکی ڕاستن، دەربارەی فەزڵو چاکەو بەزەیىو سەخاوەتی فراوانو چاودێری تەواوی خوا، وە خاوەن بیر کردنەوەیەکی ڕاستو دروستن دەربارەی ئەوەی کە بە ڕاستی خوا: پەروەردگاری پەرستراوە، خاوەنداری ستایش کراوە، هیچ کەس شایستەی بەندایەتی بۆ کردن نیە جگە لە ئەو نەبێ،

هەروەها کەس شایستەی ستایشو پیاهەڵدانو وەسفکردن نیە، جگە لەو خوایە نەبێ کە منەتی کردوە بەسەر بەندەکانیدا بەم نیعمەتانە، وە لەسەر ئەوەی خوا دەسەلاتی هەیە بەسەر هەموو شتەکاندا، هەر وەکو چۆن زەوی زیندوو کردەوە دوای ئەوەی مردبوو، بێگومان زیندوکەرەوەی مردوە.

خـوای گـەورە خەڵکانـی خـاوەن عەقڵو ژیـری تایبـەت کـردوە، چونکە ئەوان سـوود لە ئایەتەکانـی خـوا وەردەگرن، تەماشـایان دەکەن بە تەماشـاکردنی پەنـدو ئامۆژگاری، بەلام غەیـری خـاوەن عەقڵـەکان، ئەوانی دیکە لە ئاسـتی ئـاژەڵو ڕەشـە ولاخو مـەڕو مالاتدان، سـەرنجی نـادەن بە شـێوەی پەنـد وەرگرتـن، چاوەکانیان ئـەوە بەدیی ناکەن کە مەبەسـتە، بەڵکـو هـەر وەکـو ئـاژەڵ وان دەخـۆنو دەخۆنـەوە، دڵەکانیانیشـیان بێئاگانو بە لاشـەش ڕوویـان لێوەرگێـڕاوە ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ یوسـف، (واتـە: زۆر بەڵگـەو نیشـانە هەیـە لە ئاسـمانەکانو زەویـدا، بە لایانـدا دەڕۆن بەلام ئـەوان ڕوویـان لێوەردەگێڕن).

خـوای گـەورە دوای ئەوەی باسـی ڕێزو شـەرەفی زەوی کـرد، وە سـتایش کردنی بە هۆی ئـەو بارانەی بەسـەریدا دایبەزاندوە، ئـەو زەویە بە مۆڵەتـی پەروەردگـاری جۆرەها ڕووەکی جیـاواز سـەوز دەکات، ئنجـا هەواڵـی دا بێگومان ئـەو ئێمەی لـەم زەویە دروسـت کردوە، دوای ماوەیـە دەمانخاتـەوە نـاوی ئەگـەر مردیـن، پاشـان جارێکـی تـر لەو زەویـە دەرمان دەهێنێتـەوە، هـەر وەکـو چۆن لـە نەبوونەوە لـەو زەویـە ئێمـەی هێناوەتە بـوون، بێگومان هەموومـان ئەوەمـان زانیوە، جارێکی تـر دوای مـردن زیندوومان دەکاتەوە بۆ لێپرسـینەوەو پاداشـت دانەوەمـان هەر کەسـەو بـە پێی کـردەوەی خۆی.

ئەمە دوو بەڵگەی عەقڵی ڕوونو ئاشکران لەسەر دروستکردنەوە: دەرهێنانی ڕووەک لە زەوی لە دوای مردنی، وە دەرهێنانی ئەرک پێ سپێردراوان لە زەویدا لە دروست کردنیاندا.

(٥٦-٦١): ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾﴾:

﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ بێگومـان خوا ﷻ هـەواڵ دەدات هەموو بەڵگەو

ئایـەتو پەندەکانـی نیشـانی فیرعـەون داوە ئەوانەی بە چـاو دەبینریٚو ئەوانـەی لە نەفسو دەروونـدا هەسـتی پێدەکـریٚ، نەپابەند بوو نـە گوێرایەڵی کـرد، بەڵکو درۆی کردو پشـتی تێکرد.

هەواڵەکەی بە درۆداناو پشتی لە فەرمانو قەغەکراو کرد، هەقی لە جێگای پووچ داناو پووچیشی کرد بە هەق، وە لەسەر پووچو بەتاڵی مشتومڕوو دەمە دەمێ دەکرد، بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکات، بۆیە وتی: ﴿ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴾ (واتە: هاتوویت بۆ ناومان بۆ ئەوەی دەرمان بکەیت لە خاکەکەمان بە جادووگەریەکەت ئەی مووسا ﷺ) پێی وابوو ئەو ئایەتو بەڵگانە کە مووسا ﷺ نیشانی دەدا جادوو چاوبەستە، مەبەست تیایدا ئەوەیە لە زەوی باوو باپیریان دەریان بکاو بۆ خۆی دەستی بەسەردا بگریٚ، فیرعەون بۆیە ئەم قسەی کرد تا کاریگەری لە دڵی گەلەکەیدا دروست بکات، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە حەزی بۆ خاکو ئاوەکەی دەجوڵیٚ زۆر قوورسە بەلایەوە جیابوونەوەی لێی، لەبەرئەمە فیرعەون هەواڵیدا بە خەڵکەکەی کە مووسا مەبەستی ئەوەیە، ئەمەیشی بۆیە وت تا خەڵکەکە ڕقی لێهەڵبگرنو هەوڵی دژایەتیکردنی بدەن، بۆیە ووتی: سوێند بێت جادوویەکت بۆبەکاربێنین وەکو ئەو جادووەی خۆت وایێ، جا کاتێکمان بۆ دابنیٚ ﴿ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴾ (واتە: لە نێوانی ئێمەو خۆتدا دابنیٚ نە ئێمە سەرپێچی لێبکەینو نە تۆش با شوێنێکی تەختو ڕاست بێ) واتە: زانستی ئێمەو زانستی تۆ وەک یەک بێ دەربارەی کاتی دیاریکردنی مەوعیدەکە، یان شوێنێکی ڕێکو تەخت بێ هەموو خەڵکی بتوانن ببینن، جا مووسا ﷺ فەرمووی: ﴿ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ ﴾ واتە: (کاتی دیاریکراوتان) با ڕۆژی جەژن بێ، ئەو ڕۆژەی دەست لە ئیشو کار هەڵدەگرنو یەکلادەبنەوە ﴿ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴾ واتە: هەموویان کۆببنەوە لە کاتی چێشتەنگاودا، بۆیە مووسا ئەوکاتەی دیاریکرد چونکە لە ڕۆژی جەژنو لە کاتی چێشتەنگاودا زۆرترین خەڵک کۆدەبنەوە، وە دەتوانن حەقیقەتی شتەکان بەچاوی خۆیان ببینن، کە لە کاتێکی تردا بەو شێوەیە نیە.

﴿ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ﴾ واتـە: (فیرعـەون پشـتی هەڵکـرد) هەرچی لـە توانایدا بـوو کـۆی کـردەوە بـۆ ئـەوەی سـەربکەویٚ بەسـەر مووسـادا، نێـردراوی خۆی نـارد بۆ شـارو شـارۆچکەکانی دەوروبـەری، بۆ ئەوەی بـە بەتواناترینی جادووگـەرەکان کۆبکەنەوە، لـەو سـەردەمەدا سـیحروو جـادوو زانسـتێکی بـڵاوو گرنگـی پێدراو بـوو، بۆیـە فیرعەون خەڵکێکـی زۆری کۆکـردەوە لـە جادووگەران، پاشـان هەریەکەیان لە شـوێنی دیاریکراودا

ئامـادە بوون لەگـەڵ هەمـوو خەڵكیدا.

ئـەو ڕۆژە خەڵكێكـی زۆرو بـێ ئەنـدازە كۆبوویەوە لـە پیـاوانو ئافرەتان دەسـەڵاتدارانو پیاوماقـوڵانو خەڵكی ئاسـاییو مندالو گـەورە، بە خەڵكەكەیـان وت: ﴿ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾الشعراء، (واتـە: بـە خەڵكـی وت: ئێـوە كۆدەبنــەوە تاكـو شـوێن جادووگەران بكـەون ئەگەر ئـەوان زاڵو سـەركەوتوبوون).

كاتـێ كـە خەڵكەكـە كۆبوونـەوە لـە هەمـوو شـارو شـارۆچكەكانەوە، مووسـا ﷺ ئامۆژگـاری كـردنو بەڵگـەو حوججـەی لەسـەر پێویسـت كـردن پێیانـی فەرمـوو: ﴿ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ﴾ واتـە: هـەوڵ مـەدەن ئـەو پووچـیو باتڵـەی ئێـوە لەسـەرین بـە هـۆی جادووەكانتانـەوە سـەریبخەن بەسـەر هەقـدا، وە درۆ هەڵبەسـتن بـە دەم خـواوە، ئەگینـا لەلایـەن خۆیـەوە سـزایەكتان بـۆ دادەبەزێنـێ لـە بنچینـە دەرتـان دێنـێ، كۆشـشو هەوڵدانەكانتـان بـێ ئـاكام دەكات، ناشـگەن بـەو پلـەو پایـەو ڕێـزەی كـە دەتانـەوێ لای فیرعـەونو دارو دەسـتەكەی بـە دەسـتی بێنـن، ڕزگاریـش نابـن لـە سـزای خـوا ﷻ.

قسـەی ڕاسـتی هـەر دەبـێ كاریگـەری لـە نـاو دڵەكاندا دروسـت بـكات، ئنجا مشـتومڕو دووبەرەكـی كەوتە نێوان جادووگەرەكانەوە كاتێ قسـەكەی مووسـایان بیسـت، دەگونجێ لـە چوارچێـوەی دووبەرەكـیو مقۆمقۆیانـدا كەوتنە گومانیـان بێ لە مووسـا ﷺ، ئایا ئەو لەسـەر هەقـە یان نـا؟ بەڵام ئـەوان تـا ئێسـتا یەكلانەبوونەتەوە، تاكـو ئەوەی خـوا بڕیاری لەسـەر داوە بێتـە جێبەجـێ كـردن، ﴿ لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ﴿٤٢﴾ ﴾الأنفـال، (واتـە: بـۆ ئـەوەی لەناوبچێ ئەو كەسـەی بە لای خـواوە لەناو چووە لـەڕووی بەڵگـەوە، وە بـۆ ئـەوەی بژی ئـەوەی بـە لای خـواوە دەژی لـە ڕووی بەڵگەوە)، (مەبەسـتی ئەوەیـە: كـێ مسـوڵمان دەبێـت بـا لەسـەر بەڵگـە مسـوڵمان بێت، كێـش كافر دەبێـت بـا ئەویش لەسـەر بەڵگـە بێت).

(٦٢-٦٧): ﴿ فَتَنَـٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَٰنِ لَسَـٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ ﴾:

﴿ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴾ ئـەو کاتـە لەنـاو یەکتـردا دەسـتیان کـرد بە چپەچـپ، ڕێککەوتـن لەسـەر یەک وتار بۆ ئـەوەی لە کاتـی قسـەکردنو ڕەفتارکردنیاندا سـەرکەوتن بەدەسـت بێنـن، وە بـۆ ئـەوەی خەڵکی پابەنـد بکەن بـە ئاینەکـەی خۆیانەوە، ئـەو چپەچپـەی شـاردیانەوە خوا ﷻ تەفسـیری کـردوەو فەرموویەتـی: ﴿ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا ﴾ واتـە: (وتیـان بـە ڕاسـتی ئەمانـە دووجادووگـەرن دەیانـەوێ دەرتانپەڕێنن لە خـاکو وڵاتەکەتان بـە جادووەکەیان) وەکو قسـەکەی پێشـووی فیرعەونیـان ووت، یـان ئەو قسـەی کە کردیـان ڕێک کـەوت لەگەڵ ئـەوەی فیرعەونـدا بەبـێ مەبەسـت، یـان ئەوەیـە پێشـتر لەگـەڵ فیرعەونـدا ڕێککەوتوون لەسـەر ئەو وتـارە، بۆ ئەوەی ببێتە پاڵپشـتیەک بۆ قسـەکەی فیرعەون، وە شـتێکی زیاتریان وت لەسـەر قسـەکەی فیرعـەون: ﴿ وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴾ (واتـە: وە ڕێبـازو نەریتـە هـەرە باشـەکەتان لەناوبـەرن) واتـە: ڕێبازی سـیحروو جادووکـردن، ئێرەیی‌و حەسـوودی بـە جادووەکـەی ئێـوە دەبـات، وە دەیـەوێ ناوبانگـی خـۆی بەسـەرتاندا زاڵ بـکات بـۆ ئـەوەی پلەوپایـەی خـۆی بەرزبکاتـەوە، دەیـەوێ ئـەو ببێتە خـاوەن ئەم زانسـتە کـە ئێوە لـەم سـەردەمەدا سـەرقاڵن پێیەوە وە بەهۆیەوە سـامانو ماڵتان دەسـت دەکـەوێ لەگەڵ پلەو پایـەی بـەرزی نێـو خەڵکیـدا، ئەمە هاندانـی هەندێکیـان بـوو بۆهەندێکی دیکەیان، لەسـەر هـەوڵو کۆششـکردن بۆسـەرکەوتن بەسـەر مووسـادا ؑ، لەبەر ئەمەیـە وتیان:

﴿ فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ﴾ واتـە: بە جـارێ خۆتان دەربخـەنو خۆتان کۆ بکەنـەوە، هاوکاری یەکتـری بکـەنو پشـتیوانی لـە یەکتر بکـەن، بـۆ ئـەوەی قسـەو بۆچوونتان یـەک بێت، ﴿ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ ﴾ (پاشـان بـە یەکریـز بێنـە (گۆڕەپانەکەوە) بـۆ ئەوەی توانـای زیاتریان هەبـێ بـۆ ئەنجامدانـی کارەکەیان، وە سـامو هەیبەتتان زیاتـر بێ لە دڵەکانـدا، وە بۆ ئەوەش هیـچ کەسـێکتان هیچ کەسـێکی دیکە بەجـێ نەهێڵن لـەم کارەدا، بزانن ئەمڕۆ هەر کەسـێ سـەربکەوێو زاڵ بـێ بەسـەر غەیـری خۆیدا، ئەوە سـەرکەوتوو سـەرفرازە، ئەمـە ڕۆژێکە ڕۆژێکـی دیکـە لەو جـۆرە نایەتەوە.

بـەرزی‌و مەزنـی بۆ خوا سـەرکەوتوو نەبوون لـە بەتاڵـی‌و پووچیاندا، لەگەڵ ئـەوەی هەموو هۆکارەکانیان بەکارهێنا، وە هەموو فرتو فێڵێک بۆ ئەوەی هەقی پێ لەناو بەرن، بەڵام خوا ﷻ ڕووناکـی خـۆی تەواو دەکاتو سـەریدەخات بەسـەر بەتـاڵو پووچـدا، کاتـێ فێڵەکانیان تـەواو بوو، مەبەستەکانیشـیان گۆشـەگیر بوو، هیچیان بەدەسـتەوە نەما تەنها ئـەو کارە نەبێ،

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ
أَلْقُواْ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا
تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ ۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ
كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ
لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ
أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ
ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا
عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا
فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ
عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ
تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾

﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ ﴾ گۆچانەکەت ﴿ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴾ (واتە: یان لە سەرەتادا ئێمە فڕێی دەدەین)، مووسایان سەر پشک کرد، وا خۆیان دەرخست کە سەردەکەون بەسەر مووسادا بە هەر جۆرێ بێ، مووسا پێی فەرموون: ﴿ بَلْ أَلْقُواْ ﴾ (نەخێر ئێوە لە پێشەوە فڕێی بدەن) ئەوانیش دارەکانیان فڕێدا، ﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ ﴾ (لە ناکاو گوریسو داردەستەکانیان وا هاتە) پێش چاوی مووسا ﴿ مِن سِحْرِهِمْ ﴾ لە جادووەکانیان ﴿ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴾ چەند مارێک بوون دەجوڵانو دەڕۆیشتن، کاتێ ئەوە هات بە خەیاڵی مووسادا ، ﴿ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴾ (واتە: لە دڵی خۆیدا کەمێک ترسا) هەر وەکو سروشتی مرۆڤێکی ئاسایی، ئەگەرنا ئەو سوور بوو لەسەر پەیمانی خواو سەرخستنی.

(٦٨): ﴿ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ ﴾:

﴿ قُلْنَا ﴾ بۆ دڵنیا بوونو ئارام بوونەوەی مووسا وتمان: ﴿ لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ (واتە: مەترسە بێگومان هەر تۆ سەرکەوتوو دەبی) بەسەریاندا، واتە: سەردەکەویو زاڵ دەبی بەسەریاندا، ئەوانیش زەلیلو سەرشۆڕ دەبن لەبەر دەستتدا.

(٦٩-٧٣): ﴿ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ ۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ ﴾.

﴿ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ ﴾ واتـــە: گۆچانەکـــەت ﴿ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴾ واتـــە: فـــڕتو فێڵەکانیـــان هیـــچ بەرهەمێکـــی نابـــێ بۆیـــانو سـەرکەوتووش نابـن، ئـەوە فێڵـی ئـەو جادووگەرانـە بـوو کـە چاوبەسـتیان لـە خەڵکـی دەکـرد، وە بەرگـی باتڵیـان دەخسـتە بـەر هـەقو خەڵکیـان پـێ هەڵدەخەڵەتانـد، مووسـا گۆچانەکـەی فڕێـدا هەرچـی جـادووی ئـەوان کردبوویـان قووتـی داو هەڵیدەلووشـی، خەڵکیــش هەموویــان تەماشــای ئــەو ڕووداوەیــان دەکــرد.

جادووگـەران بەدڵنیاییـەوە بۆیـان دەرکـەوت ئەمـەی مووسـا ﷺ سـیحر نیـەو بێگومان لەلایـەن خواوەیـە، بۆیـە دەستپێشـخەریان کـرد بـۆ بڕواهێنان.

﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾الشـعراء (واتـە، جادووگـەرەکان خـران بـە ڕوودا بـە سـوجدە بردنـەوە * وتیـان: بڕوامـان هێنـا بـە پەروەردگـاری جیهانیـان * پەروەردگـاری مووسـاو هـارووون)، لـەو کۆبوونـەوە جەماوەریـە گەورەیـەدا هـەقو ڕاسـتی بـە دیـار کـەوتو ڕوون بوویـەوە، بـە هەمـان شـێوە باتـڵو پووچـی جادووگەرانیـش بـە دیـار کـەوتو ڕوون بوویـەوە، هـەق دەرکـەوتو ئاشـکراو ڕوون بوویـەوە، سـیحرو جـادوو فڕوفێڵیـش لـە پێـش چـاوی هەمـوو خەڵـک پـووچو بەتـاڵ بوویـەوە.

ئـەم بەسـەرهاتە بـوو بـە بەزەیـیو ڕوونکـەرەوە بـۆ ئیمانـداران، وە بـوو بـە بەڵگەیـەک بەسـەر نکوولیکەرانـەوە ﴿ قَالَ ﴾ فیرعـەون بـە جادووگەرانـی وت: ﴿ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ﴾ واتـە: چـۆن بڕواتـان هێنـا بەبـێ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ لای مـنو مۆڵەتـم لێوەربگـرن؟

فیرعـەون سـەری سـووڕما لـە بڕواهێنانیـان، چونکـە ئـەوان زۆر بـە ئـەدەبو خۆبەکـەم زانو ملکەچـی هەمـوو فەرمانەکانـی ئـەو بـوون، پاشـان فیرعـەون دوای ئـەم سـەلماندنە ڕۆچـوو لـە کوفـرو سەرکێشـیدا، وە عەقڵـی گەلەکەیشـی لـە خشـتەبرد، وە بـە گەلەکـەی ڕاگەیانـد ئـەم سـەرکەوتنەی مووسـا بەرانبـەر بـە جادووگـەرەکان لەبـەر ئـەوە نیـە هـەقو ڕاسـتی پێیـە، بەڵکـو ئـەو لەگـەڵ جادووگەرەکانـدا پێکـەوە دەسـتیان تێکـەڵ کـردوو فڕوفێڵیـان بەکارهێنـا، وە پیلانیـان دانـا بۆئـەوەی فیرعـەونو گەلەکـەی لـە وڵات شـار بـەدەر بکـەن، خەڵکەکـەش ئـەم فڕوفێڵەیـان قبـووڵ کـردو وایـان زانـی ڕاسـت دەکات.

﴿ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾الزخـرف، (واتـە: فیرعەون بـەم قسـانە گەلەكـەی خـۆی لـە خشـتە بـرد ئەوانیـش گوێڕایەڵیـان كـرد، بـە ڕاسـتی ئـەوان خەڵكێكـی لـە سـنوور دەرچـوو بـوون).

ئـەم وتـارەی فیرعـەون كـە پێشكەشـی خەڵكەكـەی كـرد ناچێتـە عەقڵـی هیـچ كەسـێكی خـاوەن زانسـتو واقـع بیـن، چونكـە مووسـا بـە تەنهـا لـە مەدیەنـەوە هـات، وە كاتـێ كـە هـات لەگـەڵ هیـچ یەكێـك لـە جادووگەرەكانـدا كۆنەبوویـەوە، بەڵكـو ڕاسـتەوخۆ بانگـی فیرعـەونو گەلەكـەی كـرد، وە ئایـەتو بەڵگەیەكـی زۆری بـۆ هێنانـەوە، جـا فیرعـەون ویسـتی لەمـەدا دژایەتـی مووسـا بـكات هەرچـی لـە توانایـدا بـوو بـەكاری هێنـا، فەرمانـی كـردو نێـردراوی خـۆی نـارد بـۆ شاروشـارۆچكەكانی دەوروبـەری، كـە هەمـوو جادووگەرێكـی شـارەزاو بـە توانـا كۆبكەنـەوەو بیهێنـن بـۆ لای، بەڵێنـی پاداشـتو پلـەو پایـەی بـەرزی پێـدان لـەلای خـۆی، ئـەوان زۆر سـووربوون لەسـەر كارەكەیـان، وە هەمـوو فێڵێكیـان بەكارهێنـا بـۆ ئـەوەی سـەركەون بەسـەر مووسـادا ﷺ، ئـەوەی لـەو پێنـاوەدا كردیـان كردیـان، ئایـا دەگونجـێ ئـەوان پێشـتر لەگـەڵ مووسـادا لەسـەر ئەمـە ڕێككەوتبـن وە یەكدەنگیـش بووبـن لەسـەر ئـەوەی كـە ڕوویـدا؟! بـە ڕاسـتی ئەمـە لـە مەحـاڵ مەحاڵتـرە.

پاشـان فیرعـەون هەڕەشـەی لـە جادووگـەرەكان كـردو وتـی: ﴿ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ﴾ (واتـە: دەسـتو قاچتـان دەبڕمـەوە بـە پێچەوانـەوە)، هـەروەك ئـەو سـزایەی بەرانبـەر كەسـێكی ڕێگـری بكـوژی خراپـەكار دەكـرێ، بـە بڕینـی دەسـتی ڕاسـتو قاچـی چەپـی ﴿ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ ﴾ (واتـە: بێگومـان بـە قـەدی دارخورمـادا هەڵتـان دەواسـم) واتـە: لەبـەر ئـەوەی ناوبانـگ دەركەنو ڕیسـوابن، ﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ﴾ (واتـە: ئەوسـا بەڕاسـتی دەزانـن كاممـان مـن یـان خواكـەی مووسـا سـزامان سـەخترو بەردەوامتـرە).

مانـای ئەوەیـە فیرعـەون پێـی وابـووە سـزای ئـەو سـەخترە یـان سـزای خـوا ﷻ، وای زانیـوە سـزای ئـەو لـە سـزای خـوا ﷻ سـەخترو توندتـرو بەردەوامتـرە، حەقیقەتەكانـی سـەروژێر كردۆتـەوە، وە كەسـانی گەمـژەو بـێ عەقڵـی پـێ ترسـاندووە، بۆیـە كاتـێ جادووگـەرەكان هـەقو ڕاسـتیان ناسـی خـوا عەقڵـی ئـەوەی پێـدان كـە حەقیقەتـەكان بناسـنەوە، وەڵامـی فیرعەونیـان دایـەوەو وتیـان: ﴿ لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾

واتــە: ئێمــە تــۆ هەڵنابژێریــن، وە ئەوەیشــی کــە بەڵێنــت پێداویــن بــە پاداشــتو نزیــک بوونـــەوە، بەســـەر ئـــەوەی خـــوا ﷻ نیشـــانی داویـــن لـــە بەڵگـــە ڕوونو ئاشـــکراکان دەیســـەلمێنن بـــە ڕاســـتی خـــوا پەروەردگـــاری پەرســـتراوە بـــە تـــاکو تەنهـــا، وە جگـــە لــە ئەویــش بەتــاڵو پووچــە، چــۆن تــۆ هەڵدەبژێریــن بەســەر خوایــەک کــە دروســتی کردوویـــن؟ ئەمـــەش نابـــێ ﴿ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ﴾ (جـــا هەرچیـــت لـــە دەســـت دێـــت بیکــە)، بــەوەی کــە هەڕەشــەت لێکردوویــن لــە بڕینــی دەســتو قــاچو هەڵواســینو ســـزادان ﴿ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴾ واتـــە: ئـــەوەی تـــۆ هەڕەشـــەمان لێدەکەیـــت لــە ئێمــە تەنهــا لــەم دونیایــە دایــە، کۆتایــی پێدێــتو دەڕواو زیانمــان پێناگەیەنــێ، بــە پێچەوانــەی ســزای خــوا بــۆ کەســێ بــەردەوام بــێ لەســەر کوفــر، بێگومــان ئــەوە ســـزایەکی بـــەردەوامو گەورەیـــە.

ئەمــەش وەکــو ئــەوە وایــە وەلامێــک بێــت بــۆ قســەکەی فیرعــەون: ﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ﴾ قســـەی ئـــەو جادووگەرانـــە بەڵگەیـــە لەســـەر ئـــەوەی پێویســـتە بـــۆ کەســی عاقــڵ بــەراورد بــکات لــە نێــوان لەززەتــی دونیــاو لەززەتــی دوارۆژدا، وە لــە نێـــوان ســـزای دونیـــاو ســـزای دوارۆژدا.

﴿ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا ﴾ واتــە: (ئێمــە بڕوامــان بــە خــوا هێنــاوە بــۆ ئــەوەی) لە کوفــرو گوناهەکانمــان خۆشــبێ، بێگومــان ئیمــان کەفارەتــی ســڕینەوەی گوناهەکانــە، تەوبــەش پێــش خــۆی دەســڕێتەوە.

﴿ وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِ ﴾ (واتــە: هەروەهــا لــەو جــادووەش کــە بــەزۆر پێــت کردیــن) کــە بەرانبــەر هــەق پێــی وەســتاینەوە، ئەمــە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی ئەمــان پێشــتر بەویســتو ئــارەزووی خۆیــان ئــەو کارەیــان هەڵنەبــژاردووە، بەڵکــو فیرعــەون زۆری لێکـــردن بـــە زۆر لێکـــردن.

بـــە ڕواڵـــەت وادەردەکـــەوێ -خـــوا زاناتـــرە- مووســـا ﷺ کاتـــێ ئامۆژگـــاری کـــردن وەک چـــۆن پێشـــتر باســـکرا کـــە پێـــی وتـــن: ﴿ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖ ﴾ ئـــەو ئامۆژگاریـــە کاری تێکـــردن، وە کاریگەریەکـــی فراوانـــی لـــە دەروونیانـــدا جـــێ هێشـــتبووە، لەبـــەر کاریگـــەری ئـــەو ئامۆژگاریـــە کەوتنـــە مقۆمقـــۆو ڕاجیایـــی لـــە نـــاو یەکتـــردا، پاشـــان فیرعـــەون ناچـــاری کـــردن بـــەو کارەو زۆری لێکـــردن لەســـەر ئـــەو فێڵـــەی ئەنجامیانـــدا، لەبـــەر ئەمەیـــە قســـەکانی

پێشووی فیرعەونیان دووبارە کردەوە، پێش ئەوەی بێن بۆ لای مووسا ﷺ کاتێ وتیان: ﴿إِنْ هَٰذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾ جادووگەرانیش لەسەر ئەوە ڕۆیشتن کە فیرعەون بۆی ڕێکخستبوونو ناچاری کردن لەسەری.

ڕەنگە ئەم خاڵە وای کردبێ لە دڵەوە پێیان ناخۆش بووبێ ڕووبەڕووی هەق بینەوە بە پووچو بەتاڵ، ئەوەشی کردویانە چاوی خۆیانیان لە ئاستیدا نووقاندوە، وە هەر ئەمەش بوویێتە هۆکاری ئەوەی خوا بەزەیی پێیاندا بێتەوەو سەرکەوتوویان بکات بۆ ئیمانو تەوبە کردن.

﴿وَاللَّهُ خَيْرٌ﴾(واتە: وە خوای گەورە پاداشتی چاکترەو بەردەوامترە)، لەو پاداشتەو پلەو پایەی تۆ پەیمانت پێدابووین ﴿وَأَبْقَىٰ﴾(واتە: چاکەی خوا دەمێنێتەوە نەک ئەوەی فیرعەون دەیڵێ: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾فیرعەون ویستی بڵێ سزای من قورسترەو بەردەوامترە.

هەموو ئەوانەی لە چیرۆکی مووسا لەگەڵ فیرعەوندا هاتووە، خوا باسی کردوە کاتێ دەگاتە چیرۆکی جادووگەرەکان، باسی ئەوە دەکات فیرعەون هەڕەشەی لێکردوون بە دەست بڕینو هەڵواسین، باسی جێبەجێ کردنی نەکردوە، فەرموودەیەکی ڕاستیش لەوبارەوە نەهاتووە، جا جەختکردنەوە لەسەر ئەنجامدانی، یان ئەنجام نەدانی لەسەر بەڵگە وەستاوە، بەڵام هەڕەشەکردنی لەگەڵ توانینی ئەنجامدانی بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی، چونکە ئەگەر ڕووی نەدایە ئەوە خوا باسی دەکرد، وە هەموو ئەوانەی بەسەرهاتەکەیان باس کردوە کۆکن لەسەر ئەوەی سزاکەیان بەسەردراوە.

(٧٤-٧٦): ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾﴾

﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا﴾خوا ﷻ هەواڵ دەدا هەر کەسێ بێت بۆ لای بە موجریمیو تاوانباری -واتە: وەسفی جورمو تاوان بێ لە هەموو ڕوویێکەوە، ئەوە مەبەست پێی کوفرە- وە بەردەوام بێ لەسەر ئەوە تا مردن، ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، کۆتو زنجیری زۆر

مەزنـە، ئـەو تەوقانـەی دەخرێنـە ملیـان زۆر گـەورەن، چـاڵو قوڵاییەکـەی زۆر دووره، گەرمییەکـەی‌و سـاردییەکەی زۆر بـە ئـازاره، سـزای وای تێدایـە کـە دڵو جەرگـی ئینسـان دەتوێنێتـەوه، لـە توونـدی ناخۆشـی ئـەوەدا، سـزا دراو نـە دەمـرێ‌و نـە دەژی، نـە دەمـرێ بـۆ ئـەوەی پشـوو بـدات، نـە دەژیـی بـۆ ئـەوەی لـەززەت وەربگـرێ، پـڕە لـە سـزای دڵو ڕووحو جەسـتە، کـە کـەس ناتوانـی ئەنـدازەی بـکات، بـۆ سـاتێکیش لەسـەری لاناچێـت، داوای یارمەتـی دەکات کـەس نیـە یارمەتـی بـدات، دەپاڕێتـەوەو داوا دەکات کـەس نیـە وەڵامـی بداتـەوە.

بەڵـی ئەگـەر دواو بـکات بـە دەمیـەوە دێ بـە ئاوێـک وەک مسـی تـواوه وایـە، دەموچـاو دەبرژێنـێ، ئەگـەر بپاڕێتـەوە بـەم شـێوە وەڵام دەدرێتـەوه،﴿ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ١٠٨ ﴾ المؤمنـون (واتـە: بـە ڕیسـوایی تێیـدا بمێننـەوەو هیـچ قسـەیەک مەکـەن).

وە هـەر کەسـێک بـە ئیمانـەوە بێتـەوە لای خـوا پێغەمبەرانـی بـە ڕاسـت زانیبـێ، شـوێن پەیامـی خـوا کەوتبـێ﴿ قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی کـردەوەی چاکیشـی کردبـێ)، لـە واجبـەکانو سـوننەتەکان﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴾ واتـە: لـە جێگـا بـەرزەکانوماڵـە ڕازاوەکانو چێـژو لـەززەت وەرگرتنـی بـەردەوام، وە ڕووبـاری ڕۆیشـتوو مانـەوەی هەمیشـەیی‌و دڵخۆشـی مـەزن کـە چـاو نەیبینیـوە، گوێـش نەیبیسـتوه، بەختـورەش بـە دڵـی کەسـدا نەهاتـوە،﴿ وَذَٰلِكَ ﴾ ئـەو پاداشـتە﴿ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴾ واتـە: خـۆی پاککردبێتـەوە لـە شـیرک‌و کوفـرو تـاوانو سـەرپێچی، یـان ئەوەیـە بـە گشـتی وازی لێدێنـێ‌و نایـکات، یـان تەوبـەی کـردوە لـەو گوناهانـەی کردوویەتـی، هەروەهـا نەفـس‌و دەروونـی پـاک کردۆتـەوەو گەشـەی پێـداوە بـە ئیمانو کـردەوەی چـاک، جـا بێگومـان تەزکیـەو خۆپاکرنـەوە دوو مانـای هەیـە: پاککـردنو پاڵفتەکـردن، وە لابردنـی پیسـی‌و چەپەڵـی، وە بەدەسـتهێنانی خێـرو چاکـەی زیاتـر، (الـزكاة) لەبـەر یەکێـک لـەو دوو کارە ناونـراوە بـە زەکات.

وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا
فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ٧٧ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ
بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ٧٨ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ
وَمَا هَدَىٰ ٧٩ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ
جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ٨٠ كُلُواْ مِن
طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ
وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ٨١ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ
وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ٨٢ ۞وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن
قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ٨٣ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ
رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ٨٤ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ
ٱلسَّامِرِيُّ ٨٥ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ
يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ
أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم
مَّوۡعِدِي ٨٦ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ
أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ٨٧

**(٧٧-٧٩):** ﴿ وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ٧٧ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ٧٨ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ٧٩ ﴾

کاتێ کە مووسا ﷺ بە بەڵگەو سەلماندنەکانی زاڵ بوو بەسەر فیرعەونو گەلەکەیدا، لە میسر مایەوەو بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، وە هەوڵی دەداو کۆششی دەکرد بۆ ڕزگار کردنی نەوەکانی ئیسرائیل لە فیرعەونو سزاکەی، فیرعەونیش لە ئەوپەڕی لووت بەرزیو سەرکەشیدا بوو، زۆر زۆر توند بوو لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیلدا، خوای گەورە چەندین بەڵگەو پەندی نیشانی دا، کە لە قورئاندا بۆمانی باس کردوە. نەوەکانی ئیسرائیل نەیاندەتوانی ئیمانەکەیان ئاشکرا بکەن، لە ترسی فیرعەوندا ماڵەکانیان کردبوو بە مزگەوت، ئارامیان دەگرت لەسەر زوڵمو ستەمی فیرعەون، خوا ویستی ڕزگاریان بکات لە دوژمنەکەیان، وە لەسەر زەویدا جێگیریان بکات، بۆ ئەوەی بەندایەتی بۆ بکەنو فەرمانەکانی بەجێ بێنن.

خوا ﷻ وەحی کرد بۆ پێغەمبەرەکەی مووسا ﷺ کە شەوڕۆیی بکەن لە سەرەتای شەودا، بۆ ئەوەی جێگیربن لەسەر زەویدا، وە هەواڵیدا کە فیرعەونو گەلەکەی بەم نزیکانە شوێنیان دەکەون، ئەوانیش سەرەتای شەو دەرچوون هەموو بەنی ئیسرائیل بە ماڵو منداڵو خێزانیان، کاتێ خەڵکی میسر بەیانی کردەوە تەماشایان کرد بەنی ئیسرائیل نەمابوون، فیرعەونی دوژمنیان لێیان تووڕە بوو نێردراوی نارده نێو شارەکانی دەوروبەری کە خەڵکی کۆبکەنەوە، بۆ دەرچوون بە دوای بەنی ئیسرائیلدا، بۆ ئەوەی بیانگرێو داخو تووڕەیی خۆی بەسەریاندا بەتاڵ بکاتەوە، بەڵام خوا ﷻ زاڵە بەسەر کاروبارەکانیدا، هێزو سەربازەکانی ئامادەبوونو ئنجا کەوتنە دوای بەنی ئیسرائیل،

خۆیو سـەربازەکانی کاتی ڕۆژهەڵات شـوێنیان کەوتـن ﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١ ﴾ الشعراء، (واتـە: ئنجـا کاتـێ دوو کۆمەڵەکـە چاویـان بـە یەکتر کـەوت هاوەڵەکانـی مووسـا وتیـان: بێگومـان ئێمـە گیراویـن، پێمـان دەگـەن)، کەوتنە تـرسو دڵەڕاوکـێ، دەریـا لـە پێشـیانەو فیرعەونیش لـە دوایانەوەیـە، فیرعەون پـڕ ببوو لە ڕقو لـە تووڕەبـوون بەرانبەریـان، مووسـا ؑ دڵی زۆر دڵنیـاو بێ ترس بـوو، بارودۆخی زۆر جێگیـر بـوو، متمانـەی هەبـوو بـە پەیمانـی پەروەردگـاری، وتـی: ﴿ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢ ﴾ الشعراء، (واتـە: نەخێـر پێتـان ناگـەن، بێگومان مـن پەروەردگـارم لەگەڵە دڵنیابـن ڕێگـای ڕزگـار بوونم پێشـان دەدات).

خـوا وەحـی بۆ کـرد کە بـە گۆچانەکـەی لـە دەریاکە بـدا، ئەویـش لێیـدا، دەریاکە لەت بـوو دوازدە ڕێگـای لێبوویـەوە، شـەپۆلی ئاویش خـۆی دەخـواردەوە بە بـەرزی کێوەکان بـە لای ڕاسـتو چەپـی ڕێگاکـە، خـوا ﷻ بـە فەرمانی خـۆی ڕێگـای نـاو دەریاکەی بۆ وشـک کـردن، وە فەرمانیشـی پێکردن کە نەترسـن لـە فیرعـەونو خنکان لە نـاو دەریادا، ئەوانیـش ئـەو ڕێگایـان گرتەبـەر ئنجـا فیرعـەونو سـەربازەکانی دوایـان کەوتـن، تا ئەو شـوێنەی قەومی مووسـا هەموویان پەڕینـەوە لە دەریاکە، وە سـوپاکەی فیرعەونیش هێشـتا لـە نـاو وشـکایی دەریاکە بـوون دەیانویسـت بگەن بـە نەوەکانی ئیسـرائیل، خـوا فەرمانی بـە دەریاکـە کـرد لەسـەریان بێتـەوە یـەک، جا لـە نـاکاو دەریاکە ئەوانـی لە نێـو خۆیدا داپۆشـی جـا چ داپۆشـینێک، هەموویان خنـکانو نقووم بوون، هیچ کەسـێکیان لـێ ڕزگار نەبـوو بەنـی ئیسـرائیلیش بـە چاوی خۆیـان تەماشـای لەناوچوونـی دوژمنەکانیـان دەکرد، خـوا ﷻ چـاوو دڵی ڕۆشـن کـردن بەلەنـاو بردنیان.

ئەمە سەرەنجامی کوفرو بێبڕوایيو هیدایەت وەرنەگرتنە بە هیدایەتی خوا ﷻ، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴾ (واتە: فیرعەون گەلەکەی گومڕا کرد) بەوەی کوفرو بێبڕوایی بۆ جوان کردن، وە پەیامی پێغەمبەر مووسا ؑی لەلا ناشرین کردنو بەکەمی دانا، نەبووە مایەی هیدایەتو ڕێنموویيان لە کاتێ لەکاتەکاندا، بەڵکو ڕێگای گومڕاییو سەرلێشێوای پێنیشان دان، پاشان بوو بە مایەی سزاو نارەحەتی بۆ گەلەکەی.

(٨٠-٨٢): ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ٨٠ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ٨١ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ٨٢ ﴾:

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ﴾ خوا ﷻ یادی بەنی ئیسرائیل دەخاتەوە بە منەتی مەزنی خۆی بەسەریانەوە، بەلەناوبردنی دوژمنەکەیان، وە بەڵێنی لەگەڵ مووسا ﵇ لەلای ڕاستی کێوی طور، کتێبی بەسەردا دابەزیوەکە هەموو بڕیارە گەورەکانو هەواڵە جوانەکانی تێدایە، بۆ ئەوەی نازونیعمەتی ئاینیان بۆ تەواو بکات، دوای نیعمەتی دونیایی، وە هەروەها یادو منەتێکی دیکەی تریشی دەکاتەوە لەو کاتەی تووشی سەرگەردانی بوونو دەخولانەوە بەسەر زەویدا، بە دابەزاندنی گەزۆو شەلاقە (باڵندەیەکە گۆشتی لە هەموو باڵندەیەک چاکترە) وە ڕزقو ڕۆزی فراوان بۆیان فەراهەم دەبوو بەبێ ماندوبوون، ئەو پێی فەرموون: ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ﴾ (واتە: بخۆن لەو ڕۆزیە پاکانەی پێمان داون)، واتە: سوپاسگوزاری بن لەسەر ئەو بەخششانەی پێی بەخشیون ﴿ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ ﴾ واتە: (زیادەڕۆیی مەکەن) لە ڕزقو ڕۆزیدا، بەکاریبێنن لەسەرڕێچی خوادا، وە فیزو کەشخەیی بە نیعمەتەکانیەوە بکەن، بەڕاستی ئێوە ئەگەر ئەوەتان کرد سزای منتان لەسەر پێویست دەبێ، واتە: خەشمو قاری من دەتانگرێتەوە، پاشان سزاتان دەدەم ﴿ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ﴾ واتە: (جا هەر کەسێ قاروو تووڕەیی من دایبگرێ) ئەوە بێگومان تیاچووەو هەڵدێراوەو زەرەرمەند بووە، چونکە ئەگەر ڕەزامەندیو چاکە نەبوو ئەوە تووڕەبوونو تیاچوون شوێنی دەگرێتەوە.

لەگەڵ ئەمەدا دەرگای تەوبە کراوەیە، ئەگەرچی چەندە تاوانیشی زۆربێ، لەبەرئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ ﴾ واتە: زۆر لێبوردەو بە بەزەییمو بۆ ئەو کەسەی تەوبە دەکات لە کوفرو بیدعەو گوناهو تاوان، وە ئیمان دێنێ بە خواو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دوایی، وە کردەوەی چاکی ئەنجامداوە لە کردەوەکانی دڵو جەستەو وتەکانی زمان ﴿ ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ واتە: بەردەوام بووە لەسەر ڕێگاو شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتووە، وە ئاینی بەهێزو تۆکمەی پەیڕەو کردوە، ئەم کەسە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێ، وە لەو گوناهانەی دەبورێ کە پێشتر ئەنجامی داوەو سوور بووە لەسەری، چونکە هاتۆتەوە لای خوا بە هۆکارێکی زۆر گەورەی بە دەستهێنانی بەزەییو لێخۆشبوون، بەڵکو هەموو هۆکارەکان لەم شتانەدا کورت هەڵهێنراون، بێگومان تەوبەو داوای لێبوردن پێشی خۆی دەسڕێتەوە، ئیمانو ئیسلامیش کردەوەی پێشوو هەڵدەوەشێننەوە، وە کردەوەی چاک تاوانەکان دەسڕێتەوە، لەگەڵ گرتنەبەری ڕێگاکانی هیدایەت بە هەموو جۆرەکانی، لە فێربوونی زانستو وردبوونەوە لە ئایەت یان فەرموودە، هەتا واتایەک لە واتاکانی بۆ دەرکەوێو ڕێنموویی پێوەرگرێ، وە بانگەواز کردن بۆ لای دینی

خواو ڕەتكردنەوەی بیدعە یان كوفر یان گومڕایی، وە جیهادو كۆچكردنو غەیری ئەوانەش لە بەشەكانی هیدایەت، هەموویان دەبنە مایەی كەفارەتی گوناهەكان، دەبنە هۆی بە دەستهێنانی ئەو مەبەستەی كە لە ئینسان داوا كراوە.

(٨٣-٨٦): ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾﴾:

خوا ﷻ پەیمانی بە مووسادا بێتە لای بۆ ئەوەی تەوڕاتی بۆ دابەزێنێ، لە ماوەی سی شەودا بە دە شەوی تر ماوەكەی بۆ تەواو كرد، كاتێ ماوەی دیداری پەروەردگاری تەواو بوو، مووسا ؈ پەلەی كرد بۆ ئامادە بوونی بە تامەزرۆییەوە لەو بە یەك گەیشتنەی پەروەردگاری، وە سوور بوو لەسەر بەڵێنەكەی، خوا ﷻ پێی فەرموو: ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: چی وای لێكردی پێش گەلەكەت بكەوی، بۆ ئارامت نەگرت تا تۆو گەلەكەت بەیەكەوە بێن ئەی مووسا؟ مووساش وتی: ﴿هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي﴾ واتە: ئەوان نزیكن لە منەوە بەم نزیكانە پێم دەگەن، بۆیە بە پەلە هاتم بۆ لات ئەی پەروەردگارم تا لە تۆ نزیك بمو لێم ڕازی بی، وە تامەزرۆم بۆ دیدارت، خوا ﷻ پێی فەرموو: ﴿فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ﴾ واتە: (جا بە ڕاستی ئێمە قەومەكەتمان تاقیكردەوە دوای تۆ)، بە پەرستنی گوێرەكە، ئەوان ئارامیان نەگرت، تاوەكو تووشی میحنەتو نارەحەتی بوونو بێبروا بوونەوە، ﴿وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ﴾ (وە سامیری گومڕای كردن)، ﴿فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا﴾ سامری (لە خشڵی تواوە) پەیكەری گوێرەكەیەكی بۆ دروست كردن، ئیتر ﴿لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ﴾ بۆڕەیەكی هەبوو وەك بۆڕەی گوێرەگە، وتیان: ﴿هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ﴾ (ئەمە پەرستراوتانەو پەرستراوی مووسایە) مووسا ئەمەی بیرچوو، بەنی ئیسرائیلیش بەو هۆیەوە تووشی فیتنە بوون، بەندایەتی گوێرەكەكەیان كرد، وە هاڕوونیش قەدەغەی ئەو كارەی لێكردن، بەڵام ئەوان وازیان لێ نەهێنا.

كاتێ مووسا گەڕایەوە بۆ ناو گەلەكەی بە قارو توورەییو خەمو خەفەتەوە بە سەرزەنشتو سەركۆنە كردنی كارەكەیانەوە وتی: ﴿يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًا﴾ ئەویش بە دابەزاندنی تەوڕات بۆیان ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾ واتە: ماوەكەی منتان بە دوور زانی لە كاتێكدا ماوەیەكی كەمو كوورت بوو، ئەمەش قسەی زۆرێك لە ڕاڤەكارانی قورئانە.

وە دەگونجێ ماناكەی ئەوە بێ: ئایا ماوەی پێغەمبەرایەتیو نێردراوێتی زۆری پێچوو بە لاتانەوە، ئێوە هیچ زانیاریەكتان نەبوو دەربارەی پێغەمبەرایەتیو شوێنەواری، وە هیچ هەواڵێكتان لەو بارەوە نەبوو، وە هیچ شوێنەوارێكتان لەو بارەوە لەبەر چاو نەمابوو، بۆیە ئێوەش غەیری خواتان پەرست، چونكە هیچ زانیاریەكتان دەربارەی شوێنەواری پێغەمبەرایەتی نەبوو؟ واتە: لە ڕاستیدا كارەكە بەو جۆرە نیە، بەڵكو پێغەمبەرایەتی لە نێو ئێوەدا بوو زانستیش چەسپی بوو، هیچ پاساوێک وەرناگیرێ لەم كارەدا، یان دەتانەوێ بە كارەكەتان سزای خواتان لەسەر حەلاڵ بێ، واتە: خۆتان ڕووبەڕووی كۆمەڵە كارێ كردەوە ببێتە مایەی ئەوەی سزای خواتان لەسەر پێویست بێ، ئەمە حەقیقەتو ڕاستیەكەیەتی، ﴿ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴾ (بۆیە بەڵێنی منتان شكاند) كاتێ فەرمانم پێكردن بە بەردەوامیو ئیستیقامە، وە بە هاروون وەسیەتم بۆ كردن، نە ڕێزتان لە نەبوونی من گرت، وە نە حورمەتتان لە بوونی هاروون گرت لە ناوتاندا.

(٨٧-٨٩): ﴿ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَـٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَـٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَـٰذَآ إِلَـٰهُكُمْ وَإِلَـٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ ﴾

واتە: بە مووسایان وت: ئەو كارەی كردمان بە ئەنقەست نەبوو، وە بەویستو دەسەلاتی خۆمان نەمانكرد، بەلام هۆكارەكەی ئەوە بوو ئێمە چەند كۆڵو بارێک درابوو بە كۆڵماندا لە خشڵی قیبتیەكان، وەک باسیان كردوە خشڵو زێڕێكی زۆریان بە خواستن لە قیبتیەكان وەرگرتبوو، خشڵو زێڕەكانیان دەرهێنا سامریش بە هەمان شێوە خشڵەكانی خۆی دەرهێنان پێكەوە فڕێیاندا، كاتێ كە مووسا ڕۆیشت هەموو خشڵەكانیان كۆكردەوە بۆ ئەوەی كاتێ گەڕایەوە چاوی پێدا بگێڕێتەوە، سامیری لە ڕۆژی غەرق بوونی فیرعەوندا سەیری شوێن پێی ولاخی جبریلی كردبوو، نەفسی هانی دابوو مشتێک لە شوێن پێی ولاخەكەی جبریل هەڵبگرێ، ئەو شوێن پێیە ئەگەر بەسەر هەر شتێكی بكردایە گیانی دەهاتە بەر وەكو تاقیكردنەوەیەک، هەڵسا بەو پەیكەری گوێرەكەیەی داكرد كە دروستی كردبوو لەو خشڵانە، یەكسەر گوێرەكەكە دەستی كرد بە جووڵە، وە ئەو گوێرەكەیە دەنگێكو بۆڕەی لێوە دەهات، ئنجا وتیان: مووسا بە دوای پەروەردگاریەوەیە، لە كاتێكدا خوا ﷻ لێرەوەیەو مووسا عليه السلام بیری چووە.

فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ
وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا
وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ
مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى
وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ
إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾
أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى
وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ
بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ
ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ
فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ
مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ
عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ
إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾

ئەمــەش دەگەڕێتــەوە بــۆ گەمژەیــی‌و کــەم عەقڵیــان، کاتــێ بینیــان ئــەم شــتە نامۆیــە دەنگێکــی لێــوە دێتــەدەر دوای ئــەوەی زانیــان بێگیانــە پێیــان وابــوو ئەمــە خــوای ئاســمانەکان‌و زەویــە، ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ ﴾ (واتــە: ئایــا ئــەوان نابینــن) ئــەم گوێرەکەیــە وەڵامــی ﴿ يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا ﴾ واتــە: قســە نــاکاو وەڵامیشــیان ناداتــەوە، وە هیــچ زیــان‌و قازانجێکیشــی بۆیــان نیــە، ئــەوەی قســەو کــردارو کەماڵــی نەبــێ شایســتەی ئــەوە نیــە بپەرســترێ، ئــەو خــۆی کــەم‌و کوڕی زۆر زیاتــرە لەوانــەی دەیپەرســتن، چونکــە ئــەوان قســە دەکــەن‌و توانایــان هەیــە بەســەر هەنــدێ شــتدا لــە ســوودو بەرگــری کــردن، دیــارە ئەویــش بــە ویســت‌و قــەزاو قــەدەری خوایــە بۆیــان.

(٩٠-٩٤): ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى
وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ
رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى
خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴾ واتــە: بــە ڕاســتی لــە پەرســتنی گوێرەکەکــەدا ئــەوان هیــچ عــوزرو بیانوویەکیــان نەبــوو، ئەگەرچــی گومانێکیــان پیشــاندرا لــە بنەڕەتــی پەرســتنەکەیاندا، بــەڵام هــاڕوون قەدەغــەی لێکــردن، وە هەواڵــی پێــدان ئــەوە بــۆ فیتنــەو تاقیکردنەوەیــە، پەرســتراوی ڕاســتەقینەیان خــوای بەبەزەییــە، کــە ســەرجەم نــازو نیعمەتــە ئاشــکراو نهێنیــەکان لــە ئەوەوەیــە، ئــەو خوایــەی لابــەری ناخۆشــیەکانە، وە فەرمانــی کــردوە شــوێنی ئــەو بکــەون‌و لــە گوێرەکەکــە دوورە پەرێــز بــن، بــەڵام ئــەوان یاخــی بــوون‌و

وتیـان: ﴿ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴾ (واتـە: هەرگیـز وازناهێنیـن وە بـە دەوریـدا دێیـنو دەڕۆیـن) هەتـا مووسـا دەگەڕێتـەوە بـۆ ناومـان.

کاتـێ مووسـا گەڕایـەوە رووی کـردە هاروونـی بـرایو بـە سەرزەنشـتو لۆمەکردنـەوە پێـی وت: ﴿ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ﴾ (واتـە: ئـەی هـاڕوون! چ شـتێک رێـی لێگرتـی لـە شـوێنکەوتنی مـن کاتـێ بینیـت ئەمانـە گومڕابوونـە)، هەواڵـت پێبدایـەم بەڵکـو زوو بگەڕامایـەوە بـۆ ناویـان؟ ﴿ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴾ (واتـە: ئایـا سـەرپێچی فەرمانـی منـت کـرد؟) لـەوەی کـە وتـم: ﴿ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ الأعراف. (واتـە: تـۆ لـە نـاو گەلەکەمـدا جێنشـینم بـەو کاری چـاک بکـەو شـوێنی ڕێبـازی خراپـەکاران مەکـەوە).

مووسـا ئەوەنـدە تـووڕە بـوو سـەرو ڕیشـی هاڕوونـی گـرتو ڕایکێشـاو سەرزەنشـتی کـرد، هاڕوونیـش پێـی وت: ﴿ يَبْنَؤُمَّ ﴾ (ئـەی کـوڕی دایکـم) ئەمـەی وەک نـەرمو نیانیـەک بەکارهێنـا ئەگەرنـا ئـەوان بـرای دایـکو باوکیـن، ﴿ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴾ (واتـە: مـووی سـەرو ڕیشـم مەگـرەو ڕامەکێشـە بەڕاسـتی ترسـام کـە هاتیتـەوە پێـم بڵێیـت: تـۆ جیاوازیـت خسـتە نێـوان بەنـی ئیسـڕائیلیەکانەوە چاوەڕوانـی فەرمانـی منـت نەکـرد)، تـۆ فەرمانـت پێکـردم بیـم بـە جێنشـینت لـە نێویانـدا، ئەگـەر شـوێنت کەوتبـامو بەدواتـدا بهاتایـەم، ئـەوە وازم لـەوە دەهێنـا کـە تـۆ فەرمانـت پێکـردووم، وە ترسـام لـەوەی لۆمـەو سەرزەنشـتم بکـەی، وە ﴿ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ (واتـە: بڵێـی تـۆ جیاوازیـت خسـتە نێـوان نەوەکانـی ئیسـڕائیلەوە) کاتـێ کـە جێتهێشـتن بەبـێ سەرپەرشـتیارو جێنشـین، بێگومـان ئەمـەش دەبێتـە مایـەی جیـاوازیو دووبەرەکـی لـە نێوانیانـدا، لەگـەڵ قەومـی سـتەمکاراندا هەژمـارم مەکـەو دڵـی دوژمنانـم پـێ خـۆش مەکـە.

ئنجـا مووسـا پەشـیمان بوویـەوە لـەو هەڵسـوکەوتەی بەرانبـەر هاڕوونـی بـرای کـردی، چونکـە ئەو شایسـتەی ئـەوە نەبـوو، ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾ الأعـراف، (واتـە: ئـەی پەروەردگـارم! لـە خـۆمو براکەم خۆشـبە وە بمـان خـەرە نـاو بەزەیـیو میهرەبانـی خۆتـەوە تـۆ میهرەبانترینـی هەمـوو میهرەبانەکانـی) پاشـان ڕووی کـردە سـامریو وتـی:

(٩٥-٩٧): ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ٩٥ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ٩٦ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ٩٧ ﴾:

﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴾ واتە: (سامری ئەی تۆ چیتە)، ئەم کارە چیبوو تۆ کردت؟ سامری وتی: ﴿ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ ﴾ (واتە: من شتێکم بینی ئەوان نەیانبینی)، ئەویش جبریل بوو ﷺ ئەو کاتەی لەسەر ولاخەکەی بوو لە دەریاکە دەهاتە دەر، وە لەو کاتەی فیرعەونو سەربازەکانی خنکان ئەمەش وتەی ڕاڤەکارانی قورئانە، ئنجا من مشتێکم لە شوێن پێی ولاخەکەی جبریل هەڵگرت، وە پرژاندم بەسەر گوێرەکەکەدا ﴿ وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴾ (واتە: بەو جۆرە نەفسم ئەم کارەی بۆ جوانو شیرین کردم) کە مشتێکم هەڵگرتو پرژاندم، ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا، مووسا پێیفەرموو: ﴿ فَٱذْهَبْ ﴾ دوور کەرەوە لێم، دوابکەوە ﴿ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ﴾ لە دونیادا سزایەک درا، هیچ کەسێک لێت نزیک نەبێتەوە، وە دەستت لێ نەدا تەنانەت ئەگەر کەسێک بیەوێ لێت نزیک بێتەوە پێی بڵێی: دەستم لێ مەدەو نزیکم مەکەوە، دەستی بۆ شتێ برد کە پێشتر کەس دەسی بۆ نەبردبوو، وە بە شوێنێکدا ڕۆشت کەس بەو شوێنەدا نەرۆشت.

﴿ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ﴾ (وە بێگومان بەڵێنێکیشت هەیە لە ڕۆژی دوایدا هەرگیز لێی ڕزگار نابیت)، پاداشت (و سزا) دەدرێیتەوە بە پێی کردەوەکەی خۆت لە چاکەو خراپە، ﴿ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ﴾ واتە: (سەیری) گوێرەکەکەشت بکە (کە بەردەوام دەتپەرست)، ﴿ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴾ (واتە: دڵنیابە چاک دەیسوتێنین، پاشان بێگومان خۆڵەمێشەکەش پەرش و بڵاو دەکەینەوە بە دەریادا)، مووسا ﷺ ئەوەی وتی ئەنجامیدا، جا ئەگەر ئەوە پەرستراوێکی ڕاستەقینە بووایە بەرگری لە خۆی دەکرد، لە بەرانبەر ئەو کەسەی دەیەوێ لە ناوی ببات.

بێگومان جوولەکەکان دڵیان ئاودرابوو بە خۆشەویستی گوێرەکەکە، مووسا ﷺ ویستی لە پێش چاویان لە ناوی ببات، بە جۆرێ کە نەتوانرێ دووبارە

بهێنرێتــەوە، ســوتاندیو پاشــان خۆڵەمێشــەکەی بــە دەریــادا کــرد، بــۆ ئــەوەی هــەر خۆشەویســتیەکی ئــەو گوێرەکــە لــە دڵیانــدا مــاوە نەمێنــێ وەکــو چــۆن خــۆی نەمــا، چونکــە مانــەوەی دەبێتــە مایــەی بــەڵاو فیتنــە، هەروەهــا لــە نەفســی مرۆڤــدا بەهێزتریــن پاڵنــەر هەیــە بــۆ پەلکێــش کردنــی مــرۆڤ بــۆ بەتــاڵو پــووچ.

کاتــێ بــۆی ڕوون کردنــەوە بەتاڵــیو پــڕو پوچــی پەرســتنی گوێرەکەکــە، مووســا ﵇ هەواڵــی پێــدان کــێ شایســتەی پەرســتنە بــە تــاکو تەنهــایو هاوەڵــی بــۆ دانەنــرێ، جــا فەرمــووی:

(٩٨): ﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾ ﴾:

واتــە: هیــچ پەرســتراوێکی ڕاســتەقینە نیــە تەنها خــوا نەبــێ، ناپەرســترێ، خۆشناویســترێ، داوای ئومێــد لــە کــەس ناکــرێ، لــە کــەس ناترســێنێرێ، داوا لــە کــەس ناکــرێ، جگــە لــە خــوا ﷻ، چونکــە تــەواوەو خــاوەن نــاوە جوانــەکانو ســیفاتە بەرزەکانــە، بەزانســتی دەوری هەمــوو شــتێکی داوە، هــەر نیعمەتێــک هەبــێ لــە لای بەنــدەکان تەنهــا لەلایــەن خواوەیــە، وە هیــچ کــەس ناتوانــێ ڕێگــری لــە زیــان بــکات تەنهــا خــوا نەبــێ، هیــچ کــەس شایســتەی پەرســتن نیــە بێجگــە لــە خــوا.

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا
ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا
﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ
فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ
بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ
أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ
فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾
لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ
لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا
﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ
قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ
عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ
ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ
ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا
فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

(٩٩- ١٠١): ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾﴾:

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾ خـوا ﷻ منـەت دەکات بەسـەر پێغەمبەرەکەیدا ﷺ، بـەوەی بۆی گێڕاوەتەوە لـە هـەواڵو بەسـەرهاتی پێشـینەکان، وەکو ئـەم بەسـەرهاتە مەزنـە، وە ئـەو حوکمانەی تیایدایـە، کـە هیـچ کەسـێک لـە خـاوەن کتێبـەکان نکوولّی ئـەو بەسـەرهاتە ناکەن، بە ڕاسـتی تۆ هەواڵـی پێشـینت نەخوێندوەو لێکۆڵینـەوەت لەسـەر نەکـردوە، هەواڵدانت بـە هـەقو ڕاسـتی دەربـارەی ئوممەتەکانـی پێشـوو بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی تـۆ بە ڕاسـتی پێغەمبەری خوایت ﷺ ئەو پەیامەیشـی هێناوتە ڕاسـتە، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا﴾ (واتـە: بـە تەئکید لەلایـەن خۆمانەوە پێمان داوی) بەخشـینێکی گرانبەهـاو خەڵاتێکی بـی پایـان ﴿ذِكْرًا﴾ ئەویـش ئـەم قورئانـە پیرۆزەیە، باسـی هـەواڵو بەسـەرهاتەکانی ڕابـردوو داهاتـووی کـردوە، وە یادخەرەوەیەکـە نـاوو سـیفاتە بەرزەکانی خـوات دەخاتەوە یـاد، هەروەهـا ئەحکامەکانـی فەرمـانو قەدەغـە کـردنو پاداشـتو سـزات بیردەخاتەوە. ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی ئەم قورئانـە هەموو ئەو حوکـمو بڕیارانە دەگرێتـەوە کە عەقڵو سروشـتی مـرۆڤ شـایەتی چاکێتـیو تـەواوی بـۆ دەدەن، وە قورئـان هەمـوو ئەوانەمان بیر دەخاتـەوە کە خوا لـە ناویـدا داینـاوە.

جـا ئەگـەر قورئـان بیرخـەرەوە بێ بـۆ پێغەمبـەرو ئوممەتەکـەی، ئەوە پێویسـتە بـەو پەڕی قبـووڵ کردنو تەسـلیم بـوونو ملکەچ بوونو بـە مەزن دانانـەوە وەری بگـرن، وە بە نووری ئـەو قورئانـە ڕێنمایی وەربگرن بۆ ڕێگای ڕاسـتو دروسـت، وە ڕووی تێبکـەن بە فێربوونو فێر کردن.

بـەڵام وەسـتانەوە لـە بەرانبەریداو پشـتێکردنی، یـان نکووڵی کردنـی، بێگومان ئـەوە کوفرە بـەم نیعمەتـە، هەرکەسـێک ئەوە بـکات ئەوە شایسـتەی سـزادانە، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ مَّنۡ أَعۡرَضَ عَنۡهُ ﴾ (واتـە: پشـتی تـێ بـکاو) بـڕوای پـێ نەهێنـێ، یـان کەمتەرخەمی بـکات لە فەرمـانو قەدەغەکراوەکانیـداو بـە کـەم تەماشـایان بکات، یـان بـە فێربوونی ئـەو مانایانەی کە ئـەرکو پێویسـتە ﴿ فَإِنَّهُۥ يَحۡمِلُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وِزۡرًا ﴾(واتە: ئـەوە بەڕاسـتی هەڵیدەگرێ لە ڕۆژی دواییـدا بارێـک لـە تاوان) دیـارە ئەویـش تاوانەکانی خۆیەتـی، ئەو تاوانانـەی کە بە هۆیـەوە پشـتی کردوە لـە قوڕئانو تووشـی کوفـرو بێبڕوایـی بووە.

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهِ ﴾ بێبڕانـەوە تێیـدا دەمێننـەوە، واتـە: ئەو گوناهانـەی هەمووی لە ئەسـتۆیانە، چونکە سـزا بریتیـە لە خودی کردەوەکان، ئەو کردەوانە بەسـەر خاوەنەکەیـدا هەڵدەگەڕێنەوە بە سـزا، بـە پێـی بچووکـیو گەورەییـان، ﴿ وَسَآءَ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ حِمۡلٗا ﴾ واتـە: (چ بارێکی خـراپو بـێ فـەڕە کە بـە کۆڵیانەوەیە، وە چ سـزایەکی قورسـە پێی سـزا دەدرێن لـە ڕۆژی دواییدا، پاشـان باسـەکە دەگوازێتەوە بۆ باسـکردنی قۆناغـی ڕۆژی دواییو ناخۆشـیەکانی.

(١٠٢- ١٠٤): ﴿ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا ١٠٢ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ١٠٣ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ١٠٤ ﴾: دەفەرمـوێ: ﴿ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا ١٠٢ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ١٠٣ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ﴾ واتـە: کاتـێ کـە فـوو دەکـرێ بـە صـوردا بـۆ جـاری دووەم خەڵکـی لـە گۆڕەکانیـان دێنـە دەرەوە هـەر کەسـەو بـە پێی حاڵی خـۆی، جا پارێـزکاران وەکـو وەفدێک پێشـوازیان لێدەکرێ بـۆ لای خوای بەبەزەیـی، هەموو موجریمو تاوانبارانیـش کۆدەکرێنـەوە لـەو ڕۆژەدا دەمو چاویان شـین هەڵگەڕاوەتەوە بـە هۆی ترسو دڵەڕاوکـێو تینوێتـی، لـە نێـوان یەکتردا بە چرپەوە قسـە دەکـەن دەربـارەی کورتی ماوەی ژیانـی دونیـاو بـە پەلـە هاتنـی ڕۆژی دوایـی، جـا هەندێکیـان دەڵێن: ئێـوە تەنها دە شـەوو ڕۆژ لـە دونیـادا ماونەتـەوە، وە هەندێکـی دیکەیان قسـەی تـر دەڵێن، خوا ﷻ بـە چپەکانیان دەزانـێو دەبیسـێ چـی دەڵێـن ﴿ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ﴾ واتـە: دادپەروەرتریـنو ژیرترینیـان دەڵـێ: (ئێـوە تەنهـا یـەک ڕۆژ ماونەتەوە)، مەبەسـت لەم گفتووگۆیـەدا دەربڕینی پەشـیمان بوونەوەیەکـی مـەزنو گەورەیـە، لـەوەی چۆن ئـەو کاتـە کورتەیـان بەفیـڕۆداوە، وە بەبێ ئاگایـیو پشـت تێکردنـەوە بەسـەریان برد، ڕوویـان کردە ئەو شـتانەی زیانی هەبـوو بۆیان، تـا ئەوەتا ئێسـتا پاداشـت دەدرێنەوە، وە هەڕەشـەکانیش هاتنە جێ، ئێسـتا هیچـی دیکە نەماوە

تەنهـا پەشـیمان بوونـەوە نەبـێ، وە دوعا لـە خۆیان دەکـەن بە وەیـلو تیاچـوون، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ١١٢ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ١١٣ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١٤ ﴾الفرقـان، (واتـە: چەنـد سـاڵ لەسـەر زەوی مانەوە؟ لە وەڵامـدا دەڵێـن: ڕۆژێک یـان کەمتر لـە ڕۆژێک، لەو فریشـتانە بپرسـە کە ژمێریـارن، (خوا) فەرمـووی: نەماونەتـەوە ماوەیەکی کەم نەبـێ، ئەگەر ئێـوە بەڕاسـتی دەتانزانی).

(١٠٥- ١١٢): ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا ١٠٥ فَيَذَرُهَا قَاعٗا صَفۡصَفٗا ١٠٦ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجٗا وَلَآ أَمۡتٗا ١٠٧ يَوۡمَئِذٖ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُۥۖ وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا ١٠٨ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ١٠٩ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠ ۞وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ لِلۡحَيِّ ٱلۡقَيُّومِۖ وَقَدۡ خَابَ مَنۡ حَمَلَ ظُلۡمٗا ١١١ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا وَلَا هَضۡمٗا ١١٢ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدا دەربـارەی ناڕەحەتیەکانـی ڕۆژی دوایـی، وە ئەوەیشـی تیایدایـە لـە بوومەلـەرزەو قـورسو گرانـی ئـەو ڕۆژە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ ﴾ واتە: ئـەو کێوانـە چیان بەسـەردێ لە ڕۆژی دواییـدا، ئایا وەکـو خۆیان دەمێننەوە یـان نا؟ ﴿ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا ﴾واتـە: لایدەبـاو لە بیخیـان دەردێنێ لە شـوێنەکانی خۆیـان وەکو خوری شـیکراوەیان لێـدێ، یـان وەکـو لمیـان لێـدێ، پاشـان ووردو خاشـیان دەکاو ئنجـا پەرشو بڵاویـان دەکاتو ڕێـکو تەختیـان دەکاتـەوە لەگـەڵ زەویـدا، زەویـش ڕێکو سـاف بێ ئـاوو گژوگیـا دەمێنێتەوە، هەموو لایەکانی ڕاسـتو سـاف دەبن هیچ جـۆرە لاریو بەرزیو نزمیەکـی نامێنـێ، ئەمە لە ئەوپەڕی ڕاسـتیو یەکسـانیدایە، ﴿ وَلَآ أَمۡتٗا ﴾ واتە: شـیوو دۆڵو شـوێنی بـەرزو نزمی نامێنێ هەمـووی ڕێک دەبێتـەوە، زەوی بە تەواوی بە دیـار دەکەوێ، وە فـراوان دەبـێ بۆ دروسـتکراوەکان، درێژ دەبێتەوە بە شـێوەی پێسـتەی خۆشـکراو، هەموویان لـە یـەک شـوێندا کۆدەکرێنـەوە، گوێیان لـە بانگکەرێـک دەبێ، چاویـان بەدوایـدا دەچێ، لەبـەر ئەمە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ يَوۡمَئِذٖ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ ﴾(واتـە: هەموو دەکەونە شـوێن ئـەو بانگکـەرە) ئەوکاتەی کە لـە گۆڕەکانیـان زیندوو دەکرێنـەوەو هەڵدەسـتنەوە، بانگکەر بانگیـان دەکات بـۆ ئامـادە بـوونو کۆبوونـەوە لە شـوێنێکی تایبەتـدا، ئەوانیش بە ئەسـپایی شـوێنی دەکـەون لای لـێ ناکەنـەوە نـە بـۆ لای ڕاسـت نە بـۆ لای چـەپ، ﴿ لَا عِوَجَ لَهُۥ ﴾ واتـە: هیـچ وەرچەرخـانو لادانێک نیە لـە بانگ کردنـی جاڕدەرەکە، بەڵکـو بانگکردنەکەی

هەقو ڕاستە بۆ هەمـوو بەدیهێنراوەکان، هەموویان دەیبیستن، بە گشتی بانگی هەموویان دەکات، ئەوانیش لـە شوێنی وەستانی قیامەت، هەمـوو خەڵکی لە ترسی خوای بـە ڕەحم دەنگیان نـزم دەکـەن ﴿ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴾ واتە: (نابیستی تەنها) دەنگی پێیەکان نەبێ، یـان دەنگی ژێـر لێو بـە نهێنـی، زۆر بـە هێواشـی دەدوێن تەنهـا لێویـان دەجوڵـێ، ترس‌و بێدەنگـی‌و وەستان باڵدەکێشی بەسەریاندا، لـە چاوەڕوانـی بڕیـاری خـوای بـە ڕەحمـدان دەربارەیـان، ڕومەتیـان زەلیلـی‌و شـوێنەواری ترسـی پێـوە دیارە، لەو شـوێنە مەزنـەدا دەبینی دەوڵەمەنـدەکان‌و هـەژاران‌و پیـاوان‌و ئافرەتـان‌و ئـازادو کۆیلـەکان‌و ژێردەستەو خەڵکـی بـازار بێدەگـن سـرتەیان لێـوە نایـەت، دەموو چـاوەکان ملکەچن، کـەس نازانێ چی بەسـەر دێ‌و چـی بەرانبـەر دەکـرێ، هەریەکەو سـەرقاڵە بە نەفسـی خـۆی ناتوانی فریای کەسـی تر بکـەوێ، نـە بـاوک نە بـرا نـە هـاوڕێ‌و نـە خۆشەویسـت، ﴿ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾عبـس، (واتـە: هەمـوو یەکێـک لـەوان لـەو ڕۆژەدا کارێکـی وای هەیـە، کە کەس ناپەرژێتە سـەر کەسـی تـر) لەو کاتـەدا دادگەری لـە نێوانیانـدا دەکات حاکمـی دادپەروەر، چاکەخـواز بە پێـی چاکەکانـی، خراپەکاریـش بە پێـی خراپەکانی.

هیـواو ئومێـد بـە پەروەردگاری بەخشـندەی بـە بەزەیی‌و بـە سـۆزو میهرەبان لـەو ڕۆژەدا بە شـێوەیەکە دروسـتکراوەکان فـەزڵ‌و چاکـەو لێبوردەیی‌و لێخۆشـبونێکی وای لـێ دەبینن کە زمانـەکان ناتوانـن تەعبیری بکـەن، بیرو بۆچوونەکانیـش ناتوانن بیهێننە پێـش چاوی خۆیان، ئـەو کاتە هەمـوو دروسـتکراوەکان ڕەحمـەت‌و بەزەیی خوا دەبینـن، ئەو میهرەبانیـە تایبەت دەبـێ بەوانـەی بڕوایـان بەخـواو پێغەمبەرەکانی هێناوە، جا ئەگـەر وترا: ئەم هیـواو ئومێدەتان بـە بەزەیـی خـوا ﷻ لە کوێوە سـەرچاوەی گرتـووە، ئەگەر ویسـتت بڵێی: ئەم زانسـتەتان لە کوێوە سـەرچاوەی گرتووە؟

دەڵێیـن: لـەوەی کـە دەیزانیـن لـە زاڵبوونـی ڕەحمەتی خوا بەسـەر تورەییـدا، وە لـە فراوانی بەخشـندەیی، کـە هەمـوو دروسـتکراوەکانی گرتوەتـەوە، وە لەوەشـی لـە نەفسـی خۆمـان‌و غەیـری خۆمانیشـدا دەیبینیـن، لـەو نـازو نیعمەتـە بەردەوامانە لـەم دونیایـەدا، بـە تایبەتیش لـە جیاکردنـەوەی ڕۆژی دوایـی، بێگومـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ ﴾ (واتـە: بێگومـان لە ترسـی خـوا هەموو دەنگـەکان نزم دەبـن) وە ﴿ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾ (واتـە: مەگەر کەسـێ خـوای میهرەبان ڕێگای پـێ بدات)، هەروەهـا فەرموویەتی: ﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ﴿٢٦﴾ ﴾ الفرقـان، (واتـە: لـەو ڕۆژەدا فەرمـان ڕەوایەتی تەنها بۆ

خـوای میهرەبانـە)، لەگـەڵ فەرمـوودەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ: {جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ مَائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءاً وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ جُزْءاً وَاحِداً فَمِنْ ذلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا، خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ} (أخرجه البخاري برقم: (٥٦٥٤)، ومسلم برقم: (٢٧٥٢)).

(واتـە: خـوا ڕەحمەتـی کردوەتـە سـەد بـەش نـەوەدو نۆ بەشـی لەلای خـۆی دانـاوە، یەک بەشیشـی بـۆ سـەر ئـەرز دابەزانـدووە، جا لـەو بەشـەدا دروسـتکراوەکان لـە نێـوان یەکتردا ڕەحـم بـە یەکتـر دەکەن، هەتـا ئەسـپ سـمەکەی بەرزدەکاتەوە لـە بێچووەکەی بـۆ ئەوەی زیانـی پێنەگات).

وە لەگـەڵ فەرمـوودەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ: {لله أرحم بعباده من الوالدة بولدها}[٤] (واتە: خـوا زۆر بـە ڕەحمتـرە بـۆ بەندەکانـی، لـە ڕەحمـی دایـک بـۆ کۆرپەکـەی)، چـی دەڵێی دەربـارەی ڕەحمەتـی خوا بڵـێ، بێگومـان ڕەحمەتی خوا ﷻ لەسـەرووی هەمـوو ئەوانەیە کە تـۆ دەربارەی دەیڵێـی، وە بیربکەرەوە چۆن دەتـەوێ، بێگومان ڕەحمەتی خوا ﷻ لەسـەرووی بیرکردنەوەکانـی تۆوەیـە، پاکـی بـۆ ئـەو خوایـەی چەنـدە بـە ڕەحمـە، لـە دادپـەروەری‌و سـزادانیدا، هەروەکـو بەرەحمـە لە فـەزڵو چاکەکانـی‌و پاداشـت دانەوەیدا.

بـەرزی‌و مەزنـی بـۆ ئـەو خوایـە کـە ڕەحـم‌و میهرەبانـی دەوری هەمـوو شـتێکی داوە، وە بەخشندەیشـی دەوری هەمـوو زیندەوەرێکـی داوە، گەورەیـی بـۆ ئـەو خوایـەی بێنیـازە لـە بەندەکانـی‌و بـە سـۆزە بەرانبەریـان، ئەوانیـش بـە بـەردەوام هـەژارن‌و پێویسـتیان پێیەتی لە هەمـوو بارودۆخەکانـی ژیانیانـدا، تەنانـەت بە قـەد چاوتروکانێکیـش بێنیاز نین لـە ڕەحمی خوا ﷻ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا ﴾ واتـە: هیـچ کەسـێک لـە بەدیهێنـراوەکان ناتوانـێ تکات بـۆ هیچ کەس بـکات مەگەر کەسـێ خوا ﷻ خـۆی مۆڵەتـی تکاکردنـی پێدابێـت، وە مۆڵـەت بـە هیچ کەسـێ نـادا مەگەر کەسـێ خۆی پێـی ڕازی بـێ، واتـە: لە پێغەمبـەران‌و نێـرراوان‌و بەندە نزیکەکانـی، لەوانەی کە لـە گوفتارو کرداریـان ڕازیبـێ، ئەویش بڕواداری دڵسـۆزە، جا ئەگـەر یەکێک لەم کارانەی لەدەسـتدا، ئـەوە کـەس ناتوانـێ شـەفاعەتی هیچ کەسـێکی تر بـکات، خەڵکی لـە ڕۆژی دوایـیـدا دەبن

٤) ورد بلفظ: {اللـهُ أَرْحَـمُ بِعِبَـادِهِ مِـنْ هـذِهِ بِوَلَدِهَـا} مُتَّفَـقٌ عَلَيـهِ: البخـاري برقـم: (٥٩٩٩)، ومسـلم برقـم: (٢٧٥٤).

به دوو بەشـەوە:

یەکـەم: سـتەمکاران بە هۆی کوفـرو خراپەکاریانـەوە، ئەوانە هیچیان دەسـت ناکـەوێ تەنها پەشـیمانیو بێبەشـبوون نەبێ،وە سـزای بە ئێـش لە ناو دۆزەخـداو تووڕەیی خـوای میهرەبان.

دووەم: هەر کەسـێ بـڕوای هێنابـێو کردەوەی چاکـی کردبێ لە واجبو سـونەتەکان ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا﴾واتـە: ناترسـێ تاوانەکانـی بـۆ زیاد بکـرێ، ﴿وَلَا هَضْمًا﴾واتە: نـە لە کەم کردنـەوەی پاداشـت دەترسـێ، بەڵکو خـوا ﷻ لە گوناهەکانـی دەبورێ، کـەمو کورتیەکانی بـۆ پاک دەکرێتـەوە، وە چاکەکانیشـی چەند بەرانبـەر دەکاتـەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾﴾النسـاء، (واتـە: ئەگەر چاکەیەکت هەبێـت خوا چەند دانـەی دەکاتەوەو دەیبەخشـێت لەلایـەن خۆیەوە پاداشـتێکی گەورە).

(١١٣): ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾﴾

واتـە: ئـا بـەو جـۆرە ئـەم قورئانەمـان دابەزانـدووە بـە زمانێکـی بەرێـزی عەرەبی، کـە لێی تێدەگـەنو مانـاو وشـەکانی شـاراوە نیـە ﴿وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ﴾واتە: بـە چەندەها جۆر هەڕەشـەمان تێـدا بـاس کـردوە، جـارێ بـە ناوەکانـی کـە بەڵگـەن لەسـەر دادپـەروەریو تۆڵەکردنـەوە، وە جارێک بە باسـکردنی لـە ناوبردنی گەلو ئوممەتەکانی پێشـوو، وە فەرمانی کـردوە ئوممەتەکانـی دوای ئـەوان پەنـدوو ئامۆژگاری لێوەربگـرن، وە جارێ بە باسـکردنی شـوێنەواری تاوانو ئەو کەمو کوڕیانەی بەدەسـتی دەخەن، وە جارێ بە باسـکردنی ناخۆشـیو سـەختیەکانی ڕۆژی قیامـەت، وە ئەوەیشـی تیایدایە لە ناڕەحەتیو گومـانو دوودڵی، وەجارێ بـە باسـکردنی دۆزەخ، وە ئەوەیشـی تیایدایە لە جۆرەکانی سـەرپێچیو سـزادان، هەموو ئەمانە ڕەحمـەتو میهرەبانیـە بـۆ بەندەکان، بۆ ئەوەی لە خوا ﷻ بترسـنو واز لە شـەڕو خراپەکاری بهێنـن کـە دەبێتە مایەی زیـان بۆیـان، ﴿أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا﴾(واتە: یا بیرکردنـەوەو بێداری دروسـت ببـێ بۆیان بە هـۆی قورئانـەوە) کاری خێرو چاکـە ئەنجام دەدەن کـە دەبێتە مایەی سـوودو قازانجیـان، لەبەر ئـەوەی بە زمانـی عەرەبیەو بە جۆرەها شـێواز هەڕەشـەی تێدا تۆمار کـراوە گەورەترین هـۆکارو مەزنتریـن پاڵنەرە بۆ تەقـوای خواو کردەوەی چـاک، ئەگەر بە عەرەبـی نەبووایـە، یـان هەڕەشـەی بەم شـێوەیە تێـدا تۆمار نەکرایـە، ئەوە ئـەم کاریگەریەی نەدەبوو.

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن
يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ
إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا
لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾
فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا
مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ
﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ
ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ
لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ
﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا
جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى
فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ
عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾

**(١١٤):** ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾﴾:

کاتێ خوا ﷻ باسی حوکمو بڕیاری پاداشتی کرد لە بەندەکانیدا، وە باسی حوکمو بڕیاری ئاینی کرد کە لە کتێبەکەیدا دایبەزاندووە، بە ڕاستی ئەمە لە شوێنەوارەکانی موڵکو دەسەڵاتی خوایە، ﴿فَتَعَٰلَى﴾ واتە: گەورەییو بەرزیو پاکو بێگەردی بۆ ئەو خوایە، کە دوورە لە هەموو ناتەواویو کەمو کوڕیەک، ﴿ٱلۡمَلِكُ﴾ ئەو خوایەی کە موڵکو دەسەڵات وەسفی ئەوە، وە دروستکراوەکان هەموویان بەندەو موڵکی ئەون، وە حوکمو بڕیارەکانی قەدەریو شەرعی جێبەجێ بووە تیایاندا، ﴿ٱلۡحَقُّ﴾ واتە: بوونو دەسەڵاتو کەماڵی خوا هەقو ڕاستە، سیفاتی کەماڵو تەواو لە هیچ کەسدا حەقیقەتی نیە جگە لە خوای بەرزو مەزن نەبێ، وە لەوانە: موڵکو دەسەڵات، بێگومان غەیری خوا ﷻ لە وانەی دروستکراون خاوەن موڵکو دەسەڵاتن لەهەندێ کاتدا بەسەر هەندێ شتەوە، ئەوە موڵکو دەسەڵاتێکی کوورتو کەمو پووچە، نامێنێو کۆتایی پێ دێ، بەڵام پەروەردگار خاوەن موڵکە زیندووە ڕاگرو گەورەیە، ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ ﴿١١٤﴾﴾ واتە: پەلە مەکە لە وەرگرتنی قوڕئاندا کاتێک جبریل بەسەرتدا دەیخوێنێتەوە، وە ئارام بگرە هەتا ئەو لێ دەبێتەوە، ئەگەر ئەو لە خوێندن بوویەوە ئنجا تۆ بیخوێنەوە، ئەوە دڵنیابە خوا گرەنتیو دڵنیایی کۆکردنەوەی قوڕئان لە سینەتو خوێندەوەی تۆی بۆ قوڕئان داوە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ القيامة، (واتە: زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی وەحی تا پەلەی تیا بکەی * بەڕاستی بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سینەتو خوێندنەوەی * ئنجا کاتێ قوڕئانمان بۆ خوێندیتەوە (بە هۆی جبریلەوە) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو

بکەوە * ئنجا دڵنیابە ڕوونکردنەوەشی لەسەر ئێمەیە).
پەلە کردنی پێغەمبەر ﷺ لە وەرگرتنی قورئانو خوێندنەوەی ئەو وەحیەی بۆی هات بەڵگەیە لەسەر حەزو خۆشەویستی تەواوی بۆ زانست، خوا فەرمانی پێکردوە داوای زانستی زیاتر بکات، چونکە زانست خێرو چاکەیە، وە زۆری زانست شتێکی داواکراوەو لەلایەن خواوەیە، وە ڕێگای گەیشتن بەزانست: بریتیە لە هەوڵدانی زۆرو تامەزرۆیی بۆ زانستو زانیاریی، وە داوا کردنی لە خواو، پشت بەستن بە خوا بۆ بەدەست هێنانی، وە پێویستیو هەژاری دەربڕین بۆ خوا لە هەموو کاتو ساتێکدا.
لە دەقە پیرۆزەکە ئەدەبو خوڕەوشت وەردەگیرێ لە وەرگرتنی زانستدا، ئەو کەسەی گوێدەگرێ بۆ زانست پێویستە لەسەرخۆو ئارام بێ، هەتا مامۆستاکەی لە قسەکانی دەبێتەوە، کە هەندێکیان پەیوەندیان بە هەندێکی دیکەوە هەیە، جا ئەگەر مامۆستا لێبوویەوە، خوێندکار هەر پرسیارێکی بوێ لێی دەکات، نابێ پەلە بکات لە پرسیار کردنو قسەی مامۆستا ببڕێ، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بێبەش بوونی، بە هەمان شێوە پرسیارلێکراو، پێویستە لەسەری گوێ بۆ پرسیاری پرسیارکەر بگرێ، پێش ئەوەی وەڵامی بداتەوە لە مەبەستەکەی تێبگا، بە ڕاستی ئەوە دەبێتە هۆکارێ بۆ وەڵام دانەوەی ڕاستو دروست.
(١١٥): ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾
واتە: ئێمە ئامۆژگاری ئادەممان کردو فەرمانمان پێکردو پەیمانمان لێوەرگرت تا پێی هەستێ، ئەویش بڕیاریدا پابەند بێو ملکەچو گوێڕایەڵ بێ، وە سوور بێ لەسەر بەجێهێنانی، لەگەڵ ئەوەدا ئەوەی بیرچوو کە فەرمانی پێکرابوو، ئەو سوور بوونە قایمو پتەوەی هەڵوەشایەوە، دەرنجامی ئەو بەڵێن شکاندنە ئەوەی هات بەسەریدا کە هات، بوو بە پەندو وانە بۆ نەوەکانی، سروشتی ئەوانیش هەر وەکو سروشتی ئەوی لێهات، ئادەم بیری چوو، نەوەکانیشی بیریان چوو، ئادەم هەڵەی کرد نەوەکانیشی هەڵەیان کرد، پابەند نەبوو لەسەر ئەو سوور بوونەی کە جەختی لەسەر کردبوویەوە، بەهەمان شێوە نەوەکانیشی، داوای تەوبەو لێبوردنی کرد لە هەڵەکەی، دانی پێدا نا، خوا ﷻ لێی خۆش بوو، ئەوەی بە باوکی خۆی بچێ ستەمی نەکردوە[٥]. پاشان خوا ﷻ بە درێژی باسی ئەم بەسەرهاتەی ئادەم ؑمان بۆ دەکات کە لەسەرەوە بە کورتی ئاماژەی پێکرد، دەفەرموێ:

---

٥) (ئەمەی شێخ نەقڵی کردوە پەندێکی عەرەبیە: (ومن يشابه أباه فما ظلم)، ئەوەی بە باوکی خۆی بچێ ستەمی نەکردوە).

(١١٦- ١٢٢): ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ
١١٦ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ١١٧ إِنَّ لَكَ
أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ١١٨ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ١١٩ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ
ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ١٢٠ فَأَكَلَا مِنْهَا
فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ١٢١
ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ١٢٢ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ١١٦ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴾ واتە: خوا ﷻ کاتێ لە دروستکردنی ئادەم بوویەوە بە دەستەکانی خۆی، وە ناوەکانی فێر کردو فەزڵو ڕێزی بەیان کردن، فەرمانی کرد بە فریشتەکان کڕنووش ببەن بۆ ئادەم وەکو ڕێزگرتنو بە مەزن دانانێک، ئەوانیش ڕاستەوخۆ کڕنووشیان بردو فەرمانی خوایان بەجێهێنا، ئیبلیس لە نێوانیاندا بوو، لووت بەرزی نواند لە ئاستی فەرمانی پەروەرگاریو ڕەتی کردەوە کڕنووش ببات بۆ ئادەم، وتی: ﴿ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ١٢ ﴾ الأعراف، (واتە: من لەو چاکترم منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردوە)، هەر ئەو کاتە دوژمنایەتی سەختی بۆ ئادەمو ژنەکەی ئاشکرا کرد، دوای ئەوەی کە بووە دوژمنی خوا، هۆکاری ئەو دوژمنداریەش ئێرەییو حەسوودی بردن بوو، خوا ﷻ ئادەمو خێزانەکەی لە مەترسی ئەو دوژمنە ئاگادار کردەوەو فەرمووی: ﴿ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴾ (واتە: ئاگادار بن لە بەهەشت دەرتان نەکات، چونکە دووچاری ناخۆشیو زەحمەت دەبن)، بێگومان لە بەهەشتدا ڕزقو ڕۆزیەکی خۆشو پشوویەکی تەواوتان بۆ هەیە.

﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ١١٨ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴾ واتە: گەرمی (خۆر) لێت نادات ئازارت پێبگەیەنێت، خوا گەرەنتی داوە بە بەردەوام بوونی خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو ئاوو ماندوو نەبوونو نارەحەتی، بەڵام خواردنی درەختێکی دیاریکراوی لێ قەدەغە کرد، فەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥ ﴾ البقرة، (واتە: نزیکی ئەو دارەختە مەکەونەوە دوایی دەبن بە یەکێک لە ستەمکاران)

بە بەردەوام شەیتان ڕێرەوەکەی بۆ تەنگ دەکردن، وە خواردنی دارەکەی لەلا جوان دەکردنو دەیووت: ﴿ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾ واتە: (ئایا نیشانت

بدەم) ئەو درەختەی هەرکەسێ لێی بخوات نامرێ بۆ هەمیشەیی لە بەهەشتدا دەمێنێنەوە ﴿ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾واتە: مولکو دەسەلاتێک کە دوایی نەیەت ئەگەر لەو درەختە بخۆی، هات بۆ لایان بەوێنەی کەسێکی ئامۆژگاریکار، بەنەرمو نیانی قسەی لەگەڵدا کردن، ئادەم بە قسەکانی سەرسام بوو هەڵخەڵەتا، ئنجا هەردووکیان لە درەختەکەیان خواردوو لە دەستیان بەربوویەوە، وە جلەکانیشیان داماڵرا، سەرپێچەکەیان ئاشکرابوو، عەیبو عەورەتی هەریەکەیان بۆ ئەوەی دیکە دەرکەوت، پاش ئەوەی داپۆشراو بوون، ئنجا کەوتنە کۆکۆدنەوەی گەڵا درەختەکانی بەهەشت خۆیانی پێداپۆشن، تووشی شەرمەزاریەکی ئەوتۆ بوون مەگەر تەنها خوا ﷻ خۆی بیزانێ.

﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾واتە: (ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست لایدا)، پەلەیان کرد لە تەوبەو پەشیمانی، وە وتیان: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأعراف، (واتە: ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمانکرد جا ئەگەر لێمان نەبووری میهرەبانیمان لەگەڵدا نەکەی بێگومان ئێمە لە زیانباران دەبین) خوا ﷻ پاڵفتەی کردو هەڵیبژارد، وە ڕێگای تەوبەو داوای لێخۆشبوونی بۆ ئاسان کرد، ﴿ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴾واتە: تەوبەی لێوەرگرتو ڕێنمایی کرد، ئادەم عليه السلام دوای تەوبەکە زۆر باشتر بوو لە حاڵەتی پێش لە تەوبەکە، فرتو فێڵی دوژمن گەڕایەوە سەر خۆیو پووچو بەتاڵ بوویەوە، نازونیعمەتەکانی خوا ﷻ تەواو بوو بەسەر ئادەمو نەوەکانیەوە، بۆیە پێویستە لەسەریان پێی هەستنو دانی پێدابنێن، وە ئاگادار بن لەو دوژمنەی کە بە بەردەوامی بە درێژایی شەوو ڕۆژ خۆی مەلاس داوە بۆیان، ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف، (واتە: ئەی نەوەی ئادەم! شەیتان فریوتان نەدات، وەک چۆن باوکو دایکتانی وەدەرنان، پۆشاکەکانی لێ دارنین تاکو عەورەتەکانی خۆیانیان پێ نیشان بدات، بە دڵنیاییەوە خۆیو کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، ئێوە نایانبینن، وە بە دڵنیایی ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆستو نیزیکی ئەوانەی کە بروا ناهێنن).

(١٢٣- ١٢٧): ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ

بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾:

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدا کە بێگومان ئەو فەرمانی کردوە بە ئادەمو ئیبلیس هەردووکیان بڕۆنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، وە با ئادەمو نەوەکانی شەیتان بکەنە دوژمنی خۆیانو بە ووردی وورپایی خۆیان وەربگرن لێی، خۆیان بۆی ئامادەبکەنو دژایەتی بکەن، بێگومان خوا ﷻ کتێبیان بۆ دادەبەزێنێو پێغەمبەرانیان بۆ دەنێرێ، کەڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون دەکەنەوە ئەو ڕێگایەی دەیانگەیەنێ بەبەهەشتەکەی، وە ئاگاداریان دەکەنەوە لەو دوژمنە ئاشکراو سەرسەختەیان، وە هەر کاتێک ئەو ڕێنماییەیان بۆ هات کە بریتیە لە کتێبەکانو پێغەمبەران بێگومان هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، ئەوە شوێنی فەرمانی خوا ﷻ کەوتووەو دوور کەوتووەتەوە لە قەدەغەکراوەکانی، ئەوە نەلە دونیادا گومڕا دەبێ، وە نە لە دوارۆژدا تووشی ناخۆشیو زەحمەت دەبێ، بەڵکو ئەو کەسە هیدایەت دراوە بۆ ڕێگای ڕاست لە دونیاو دوارۆژدا، وە خۆشبەختیو ئاسایشی بۆ هەیە لە دوارۆژدا.

وە لە ئایەتێکی دیکەدا خوا ﷻ ترسو خەمو پەژارەی لێ ڕەتکردۆتەوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ البقرة، (واتە: ئەو کەسەی دوای ڕێنمایی من کەوت نە ترسیان لەسەرەو نە خەم دەخۆن) وە شوێنکەوتنی ڕێنماییش بە: بە ڕاست دانانی هەواڵەکانی قورئانو، بە وە دژایەتی نەکردنی بە گومانو دوودڵی، فەرمانەکانی نێوی جێبەجێ بکەی بەوەی کە بەرهەڵستی نەکەیت بە هۆی شەهوەتو ئارەزووەوە، ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى ﴾ واتە: (هەر کەسێک پشت هەڵکا) لەو کتێبەی کە هەموو داواکاریە بەرزەکانی تێدایە، وە وازی لێ بێنێ بە جۆرێ ڕووی لێ وەربگێڕێ، یان گەورەترو مەزنتر لە ڕوو وەرگێڕانو بە جۆرێ نکوڵی لێبکاتو کوفری بەرانبەر بکات، ﴿ فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ واتە: ئەوە پاداشتی ئەو کەسە ئەوەیە گوزەرانێکی سەختو تەنگی بۆ دابین دەکەین ئەویش بریتیە لە سزاو تۆڵە.

﴿ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ هەندێ لە ڕاڤەکارانی قورئان ڕاڤەیان کردوە بە سزای ناو گۆڕ، ئەو کەسە گۆڕەکەی لێ تەسک دەبێتەوە، وە تێیدا دەکوشرێو سزا دەدرێ لە پاداشتی پشتێکردنی لە یادی خوا ﷻ، ئەم دەقەش یەکێکە لەو دەقانەی بەڵگەن لەسەر سزای ناو گۆڕ.

دەقی دووەم فەرموودەی خوایە ﷻ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ ﴿٩٣﴾ ﴾الأنعام، (واتە: وە ئەگەر ببینی لە کاتێکدا کە ستەمکاران لە سەختیی‌و دژوارییەکانی مەرگ دانو فریشتەکانیش دەستیان بۆ درێژ کردوون).

دەقی سێیەم: ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾السجدة، (واتە: وە بە ڕاستی ئێمە سزای بچووکتریان پێ دەچێژین جگە لە سزای هەرە گەورەی دۆزەخ، تا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

دەقی چوارەم: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴿٤٦﴾ ﴾غافر، (واتە: بەیانیانو ئێواران دەبرێنە دیار ئاگرو ئاگریان بۆ ڕادەنوێنرێ).

ئەو بەڵگەیەی کە هەندێ لە زانایانی پێشوو دەیهێننەوە بۆ بوونی سزای گۆڕ تەنها ئەو ئایەتەی بەڵگەی چوارەمە (والله أعلم)، وە خوای گەورە لە کۆتاییەکەیدا باسی سزای ڕۆژی دوایی کردوە، هەندێ لە ڕاڤەزانانی قورئان پێیان وایە (المعيشة الضنك) گشتیەو بۆ ژیانی دونیاشە، ئەوانەی پشت هەڵدەکەن لە یادی پەروەردگاریان تووشی خەمو پەژارەو ئێش‌و ئازار دەبن کە ئەوە سزایەکی بە پەلەیە لە دونیادا، وە لە ژیانی بەرزەخ‌و ڕۆژی دواییدا، چونکە (المعيشة الضنك) لە ئایەتەکەدا بە ڕەهایی هاتووە، نەبەستراوەتەوە بە هیچەوە ﴿ وَنَحْشُرُهُۥ ﴾ واتە: ئەم کەسەی کە پشتی هەڵکردوە لە یادی خوا ﷻ (حەشری دەکەین) ﴿ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ (واتە: لە ڕۆژی دواییدا بە کوێری)، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ﴿٩٧﴾ ﴾الإسراء، (واتە: وە لە ڕۆژی دوایدا حەشریان دەکەین بەسەر ڕوو دەمو چاویاندا کە کوێرو لاڵو کەڕن). بە دەم زەلیلیی‌و پەشیمانی‌و تەمبێ بوونو ئێش‌و ئازار لەو حاڵەی تێیدایە دەڵێ: ﴿ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴾ (واتە: بۆچی بە کوێری حەشرت کردم) خۆ من لە ژیانی دونیادا ﴿ بَصِيرًا ﴾ ساغ‌و بینا بووم چی وایلێکرد بگەم بەم حاڵەتە ناشرینە؟

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦
وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ
أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ١٢٧ أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ
يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ١٢٨
وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ١٢٩
فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ
وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ
تَرۡضَىٰ ١٣٠ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ
ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا لِنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَرِزۡقُ رَبِّكَ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ ١٣١ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ
بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ
لِلتَّقۡوَىٰ ١٣٢ وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم
بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٣٣ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ
مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ
ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ١٣٤ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ
فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ١٣٥

﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ﴾ واتە: (هەر بەو شێوەیە ئایەتەکانی ئێمەت بۆ هاتو لەبیر خۆت بردەوە)، وە پشتت تێکرد ﴿ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴾ واتە: بەو شێوەیە لەناو سزادا جێ دەهێڵرێی، وەڵامی دەدرێتەوە کە ئەوە خودی کردەوەکانی خۆتە، پاداشتیش بەپێی کردەوەیە، هەروەک چۆن کوێربووی لە ئاستی یادی خوا ﷻ، وە پشتت تێکردو لە بیری خۆت بردەوە، بەو شێوەیە خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا حەشرت دەکا بۆناو دۆزەخ بە کوێریو کەڕیو لاڵی پشتت تێ دەکرێو لە نێو سزادا لە بیر دەکرێی ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾ واتە: ئەم سزایە ﴿ نَجۡزِي ﴾تۆڵە دەسەنین، بەوەی زێدەڕۆیی کردبێو تاوانی گەورەی ئەنجام دابێو سنورەکانی خوای بڕیبێ لەو شتانەی کە مۆڵەتی پێدراوە ﴿ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ﴾ (واتە: بڕوای نەهێنابێ بە ئایاتەکانی پەروەردگاری) ئەو دەقانەی کە بەڵگەن لەسەر هەموو داواکاریەکانی ئیمان بە شێوەیەکی ڕوونو ڕەوان، خوا ﷻ ستەمی لێ نەکردوەو سزایشی لە شوێنێکدا دانەناوە کە شایستە نەبێ، بەڵکو هۆکاری سزادانە کە زێدەڕۆییو ئیمان نەهێنانێتی ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾ واتە: (وە سزای ڕۆژی دوایی سەختترە) لە سزای دونیا بە چەند قات ﴿ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾ (بەردەوامترە) چونکە کۆتایی پێ نایە بە پێچەوانەی سزای دونیا، بێگومان دەپچڕێو کۆتایی پێدێ، بۆیە ترسو وریابوون لە سزای ڕۆژی دوایی پێویستە لەسەرمان.

(١٢٨): ﴿ أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ١٢٨ ﴾:

ئایا بۆ ئەو بە درۆدانەرانەو پشتهەڵکەرانەی ڕوون نەکردۆتەوە، وە ڕێگای ڕاستی پێنیشان نەداونو دووری نەخستونەتەوە لە ڕێگای فەسادو خراپەکاری، ئەوەی کە خوا ﷻ

هێناویەتـی بەسـەر بەدرۆدانەرانـی پێـش ئەوانـدا لە سـەدەکانی پێشـوترو ئـەو ئوممەتانەی یـەک بـە دوای یـەک هاتـنو چیرۆکەکانیان دەسـتاو دەسـت بـۆ گوازرایـەوە، وە لەپاش لەناوچوونیـان بـە چـاوی خۆیـان شـوێنەواری ئـەو ئوممەتـە لەناوچوانەیـان دەبینی، وەک قەومـی هـوودو صالـحو لـووطو جگـە لەئەوانیـش، ئـەو گـەلو ئوممەتانـە دوای ئـەوەی پێغەمبەرانـی ئێمەیـان بـە درۆدانا، وە پشـتیان لـە کتێبەکانمان کرد تووشـی سـزای زۆر بە ئێشـمان کـردن ئەمـانو ئاسـایش دەدا بـە ئـەوان کە وەکـو گـەلو ئوممەتەکانی پێشـین سـزانەدرێن؟ ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ ﴾القمر، (واتـە: ئایـا کافرەکانی ئێوە باشـترن لەم گەلانـە، یان ئێـوە ئەماننامەتان هەیە لـە کتێبە ئاسـمانیەکان «کە سـزا نادرێـن» یان دەڵێـن: ئێمـە کۆمەڵێکی سـەرکەوتووینو نابەزین؟).

هیـچ شـتێک لەمانـە بەوجۆرە نیـە، ئـەو بێبڕوایانە چاکتـر نەبـوون لەوانەی پێشـینیان، هەتا خـوا ﷻ بەهۆی چاکەکانیان سـزایان لەسـەر هەڵبگـرێ، بەڵکو ئەوان لەبێبڕوایانی پێشـینیان خراپتـر بـوون، چونکـە کوفریـان کـرد بەرانبـەر بەڕێزترینـی پێغەمبـەرانو چاکترینـی کتێبـەکان، ئـەوان بە هیـچ شـێوەیە بەرائەتیـان بـۆ نەهاتـووە، وە پەیمانیـان وەرنەگرتووە لـە خـوا تا سـزا نەدرێـن، وە بەو شـێوەیەش نیـە کـە دەڵێـن: کۆبوونەوەیان سـوودیان پێ دەگەیەنـێو بەرگریـان لێـدەکات، بەڵکـو ئـەوان زەلیلتـرو بـێ قیمەترن لـەوەی بەرگریان لێبکـرێ، لە ناوچوونـی گەلانی پێشـووتر بە هـۆی تاوانەکانیانەوە یەکێکە لـە هۆکارەکانی هیدایـەت، چونکـە یەکێکـە لەو بەڵگانەی لەسـەر ڕاسـتی پەیامی ئـەو پێغەمبەرانـەی بۆیان هاتـوون، وە بەتاڵـیو پووچـی ئەوەی ئەوان لەسـەری دەڕۆیشـتن، بەڵام خـۆ هەموو کەس سـوودو کەڵک لـە ئایەتو نیشـانەکان وەرناگرێ، بەڵکو کەسـانێک سـوودی لێوەردەگرن خاوەن عەقڵێکی سـەلیمو سروشـتێکی ڕاسـتەقینە بـن، وە خاوەن دڵێک بن کـە خاوەنەکەی سەرزەنشـت دەکا لـە کاری خراپە.

(١٢٩-١٣٠): ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ ءَانَآيِٕ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ ﴾

ئەمـە دڵدانەوەیە بـۆ پێغەمبەری خـوا ﷺو فێرکردنیەتی لەوەی دەستپێشـخەری نەکات بۆ لە ناوبردنـی بـە درۆدانەرانو پشـتهەڵکەران، بێگومان کوفـرو بەدرۆدانانیـان هۆکارێکی چاکە

بـۆ حـەڵاڵ بوونی سـزا بۆیانو پێویسـت بوونی لەسـەریان، چونکـە خـوا ﷻ گوناهەکانی کردوەتـە هۆکاری دروسـت بوونی سـزاو تۆڵـە، هـەردەم ئەنجامدانی گوناهو سـزا هاوڕێی یەکترنو بـە یەکەوەن.

ئەوانـە هۆکارەکانـی سـزایان بەدەسـتهێنا، بـەڵام ئـەوەی بوو بە هۆی دواخـستنی سـزایان بریـاری پەروەردگارتـە، بـۆ ئـەوەی مۆڵەتیـان بداو سـزاکەیان بـۆ دوابخـات، وە کاتێکی دیـاری کـراوی بـۆ هێناونەتەوە، جـا کاتی دیاریکـراو جێبەجـێ کردنی فەرمانـی خوا ﷻ تەنها ئەوەیە سـزای لەسـەر دواخسـتن تا کاتـی دیاریکـراو، وە بۆ ئـەوەی پیاچوونەوەیەک بکـەن بـە فەرمانەکانـی خوادا، لە بەرانبەریشـدا خوا ﷻ لێیان خۆش بێو سـزاکەیان لەسـەر هەڵبگـرێ، ئەگەر سـزای خوایان لەسـەر پێویسـت نەبووبـێ، لەبەر ئەمەیە خـوا ﷻ فەرمانی بـە پێغەمبەرەکـەی کـردوە کـە دان بـە خۆیـدا بگرێ لەسـەر ئـەوەی بـە زمانیـان ئازاری دەدەن، وە فەرمانـی پێکـردوە کـە خـۆی پەنـا بگرێت لەمە، وە پشـت بەو ببەسـتێ بە هۆی بـە پاکگرتـنو سـتایش کردنـی پەروەردگـاری، لـەو کاتـە چاکانـەدا، لە پێـش هەڵاتنی خـۆرو لە پێـش ئاوابوونیدا، وە لە هەندێ کاتو سـاتەکانی شـەودا، وە لە سـەرەتاو کۆتایی ڕۆژدا، ئەمـە گشـتیە دوای تایبـەت کـردن، ئەگـەر تـۆ ئەمـەت کـرد، ڕازی بـی بـەوەی خـوا پێـت دەدا لـە پاداشـتی ئێسـتاو داهاتـوو، وە بـۆ ئـەوەی دڵـت ئـارامو ئاسـوودە بێ، وە چاوەکانـت ئۆقـرە بگـرن بـە بەندایەتی کـردن بـۆ پەروەردگـارت، وە ببێتـە دڵنەوایی لەسـەر ئـەو ئەزیەتـەی کە ئـەوان پێـت دەگەیەنن، ئەو کات ئارام گرتنت لەسـەر سـووک دەکاتو ئاسـانتر دەتوانـی ئـارام بگری.

(١٣١): ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾

واتـە: بەسەرسـامیەوە چاوەکانـت مەبـڕە نـازو نیعمەتەکانـی دونیـا، ئەوانەشـی کـە چێژی لێوەردەگـرن لـە خـواردنو خواردنـەوەی بەلـەزەتو جـلو بەرگـی جـوانو ڕازاوەو ماڵی خـۆشو ئافرەتانـی زۆر جـوانو سـەرنجڕاکێش، هەمـوو ئەمانـە جوانـیو زینەتـی ژیانـی دونیـان، ئـەو دەروونانـەی سەرکێشـن زۆر پێـی دڵخـۆش دەبـن، ئەوانەش پشـتیان کردوە لـە ئاینـی خـوا پێـی سەرسـام دەبـن، وە گەلـی سـتەمکاران چێـژی لێوەردەگرن، پاشـان بـە پەلـە کۆتایـی پێدێـتو هەمـووی دەڕواتو عەشـقو خۆشەویسـتانی دەکـوژێ، کاتێ پەشـێمان دەبنـەوە پەشـێمانی هیـچ سـوودێکی بۆیان نیـە، لـە ڕۆژی قیامەتـدا دەزانن چیان

پێش خستوە، بەڵكو خوا دونیای كردوە بە جێگای تاقیكردنەوە، بۆ ئەوەی بزانێ كێ لەسەری دەوستێو پێی یاخی دەبێ، وە كێ خاوەن كردەوەی چاكە، هەر وەكو خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾الكهف، (واتە: بە ڕاستی ئێمە هەرچی وا بەسەر زەویەوەیە كردوومانە بە زینەتو جوانی بۆ زەوی، بۆ ئەوەی خەڵكی تاقی بكەینەوە كامیان كردەوەی جوانترو چاكترە؟ وە بەڕاستی ئەوەی بەسەر زەویەوەیە ئێمە هەمووی دەكەین بە زەویەكی تەختی وشكو برنگ).

﴿ وَرِزْقُ رَبِّكَ ﴾ (واتە: دڵنیابە ڕزقو ڕۆزی پەروەردگارت)، ئەوەی كە پێشخراوە بۆت لە: زانستو ئیمانو حەقیقەتی كردەوە چاكەكان، وە ئەوەی دوا خراوە بۆت لە: خۆشی نەبڕاوە، ژیانێكی سەلامەتو ئارام لە نزیكی پەروەردگاری بەبەزەیی ﴿ خَيْرٌ ﴾ (چاكترە) لەو نازو نیعمەتانەی داومانە بە تاقمو دەستەیەك (لە بێبڕوایان)، لەزاتی ئەو نازو نیعمەتانەو سیفاتەكانی ﴿ وَأَبْقَىٰ ﴾ (وە بەردەوامترە)، لەبەر ئەوەی نابڕێتەوە، خواردنی بەردەوامەو لەگەڵ سێبەریدا، هەر وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾الأعلى، (واتە: بەڵكو ئێوە ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن، كەچی دواڕۆژ زۆر باشترەو بەردەوامترە).

ئەم دەقە ئاماژەیە بۆ ئەوە، ئەگەر بەندە بینی نەفسو دەروونی تەماحی زۆری هەیە بۆ دونیاو بە تامەزرۆیی ڕووی تێكردوە، با تەماشای ئەوە بكات خوا بۆی داناوە لە ڕزقو ڕۆزی پەروەردگاری، وە با هەردووكیان بەراورد بكات.

(١٣٢): ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾:

واتە: هانی ماڵو منداڵت بدە لەسەر نوێژ كردنو هەراسانیان بكە لە بەجێهێنانی فەرزو سونەتەكان، فەرمان كردن بە شتێك فەرمانكردنە بە هەمووی ئەوانەی كە تەواو نابێ تەنها بەوە نەبێ، كەواتە فەرمان كردن بە نوێژ فەرمانكردنە بە فێر كردنی ئەوەی نوێژ تەواوو دروست دەكاتو ئەوەشی نوێژ فاسدو پووچ دەكاتەوە.

﴿ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾ (خۆڕاگرو بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی) نوێژ، بە بەجێهێنانیو پایەكانیو ئادابەكانیو خشوعی ناو نوێژ، بە ڕاستی ئەمە قورسە لەسەر نەفسو دەروون، بەڵام دەبێ زۆر لە نەفسی بكاو لەگەڵیدا تێبكۆشێو بەردەوام ئارامی هەبێ لەگەڵیدا،

بـە ڕاسـتی بەنـدە ئەگـەر نوێژەکانـی بـە تـەواوی بەجێبهێنـێ، ئەوە جگـە لە نوێـژ هەموو لـە هەمـوو عیبادەتەکانـی دیکـەدا چاکتـرو بـە تواناتـرە، وە ئەگـەر نوێژەکان لە دەسـت بـدات، ئـەوە جگـە لـە نوێـژەکان عیبادەتەکانـی تر بە ئاسـانی لە دەسـتیان دەدات، پاشـان خـوا گرنتـی ڕزقو ڕۆزی داوە بـە پێغەمبەرەکـەی، وە پێـی ڕاگەیانـدوە کـە گرنگی دانی بـە ڕزقو ڕۆزی سـەرقاڵی نـەکات لـە جێبەجـێ کردنـی دینـی خـوا، وەک فەرموویەتـی: ﴿ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَ ﴾ واتـە: ڕزقو ڕۆزی تـۆ لەسـەر ئێمەیـە، تۆمان بە خۆمان سـپاردووە، وەک چـۆن ڕزقو ڕۆزی هەمـوو دروسـتکراوانمان بـە خۆمان سـپاردووەو ڕزقیـان دەدەین، چۆن ڕزقـی کەسـێک نادەین هەسـتایێ بـە جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانـی ئێمەو سـەرقاڵ بێ بە یادکردنیانـەوە؟ ڕزقو بژێـوی خـوا گشـتگیرە بۆ لە خوا تـرسو جگە لە ئەویش، پێویسـتە گرنگـی بـدرێ بـەوەی کـە خۆشـبەختی ئەبـەدی تێدایـە، ئەویـش تەقـوای خوایـە، لەبەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلۡعَٰقِبَةُ ﴾ (سـەرەنجامی چـاک) لـە دونیـاو دواڕۆژ ﴿ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾ (بـۆ خۆپارێـزە)، کـە بریتیـە لـە بەجێهێنانـی فەرمـان پێکـراوەکانو واز هێنان لـە قەدەغە کـراوەکان، هـەر کەسـێک بەجێیان بێنێ ئەوە سـەرەنجامی باشـی بۆ هەیە، هـەر وەکو خوا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٨٣ ﴾القصص، (واتـە: سـەرەنجام بـۆ لـە خوا ترسـانو خۆپارێزانە).

(١٣٣- ١٣٥): ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٣٣
وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن
قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ١٣٤ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ
ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ١٣٥ ﴾

واتـە: بەدرۆدانەرانی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەگەر ڕاسـتە پێغەمبەرە ئەدی بەڵگەو نیشـانەیەکمان بـۆ ناهێنـی لـە لایـەن پەروەردگاریەوە؟ مەبەسـتیان ئایـەتو بەڵگەی پێشـنیار بـوو، وەکو (لە شـوێنی دی دەفەرموێ) وتیان: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ٩٠ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ٩١ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ٩٢ ﴾الإسراء، (واتـە: وتیـان: هەرگیـز بـڕوات پێ ناهێنیـن، هەتا لەم زەویـەدا کانیاوێکمـان بـۆ هەڵنەقوڵێنی، یان باخێکـت ببـێ لـە دارخورماو تـرێ، چەند ڕووبارێـک هەڵقوڵێنی لـە نێـوان درەختەکاندا بە خـوڕ بـڕوات، یـان ئاسـمان بڕوخێنی بە سـەرماندا بـە پارچـە چارچە کـراوی وەک چۆن

لافـت لێـداوە، یان خواو فریشـتەکان بێنـی ڕوو بـەڕوو بیانبینین).
ئەمە کەللەڕەقیو عینادیو سـتەم بوو لەلایەن ئەوانەوە، چونکـە بێگومان ئەوانو پێغەمبەر ﷺ ئادەمیـزادنو بەنـدەی خـوان، شایسـتە نیـە بـۆ ئـەوان بـە پێـی هـەواو ئـارەزووی خۆیان پێشـنیاری ئایـەتو بەڵگـە بکـەن، بەڵکو ئەو کەسـەی دایدەبەزێنـێو هەڵیدەبژێـرێ بە پێی حیکمەتـی خۆیەتـی ئەویش خـوا ﷻ، چونکە وتـەی ئـەوان: ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ ۝٣٧﴾ الأنعـام (واتـە: ئەگەر ئایەتێکی بەسـەر دابەزیبایـە لەلایـەن پەروەردگاریەوە)، ئەمە ئـەوە دەخـوازێ کـە ئایـەتو بەڵگەیەک نەهاتـووە لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبـەر ﷺ، ئەمەش درۆیەکـی هەڵبەسـتراوە، بێگومـان بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکراو یەکلاکەرەوەی بـۆ هاتووە، کـە بە هەندێ لـەو بەڵگانە مەبەسـت دێتە جێ، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم﴾ ئەگەر ئـەوان ڕاسـت دەکـەن لـە قسـەکانیاندا، ئـەوان داوای هەق دەکـەن بـە بەڵگەکانی ﴿بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ واتـە: ئـەم قورئانـە مەزنـە کـە کتێـبو پەڕاوەکانـی پێشـوو لـە تـەوراتو ئینجیـل و ئەوانـی دیکە هاوتاو هاوشـێوەی ئەون، ئـەوەی قورئـان هەواڵی پێداوە ئەوانیـش هەواڵیـان پێـداوە، وە بەڕاسـتدانانی قورئـان لەو کتێبانـەدا باسـکراوە، وە موژدەی هاتنـی پێغەمبەرێکیشـیان داوە، ئـەم ئایەتـەش وەک ئـەو ئایەتەیە کـە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ۝٥١﴾ العنکبوت، واتـە: (ئایـا بـۆ ئـەوان بـەس نیـە کـە ئێمـە قورئانمان ناردۆتـە خـوار بـۆ سـەر تـۆ دەخوێنرێتـەوە بەسـەریاندا بە ڕاسـتی لـەم قورئانـەدا بەزەییو پەنـدو ئامۆژگاری هەیـە بۆ بـڕواداران).
ئایـەتو بەڵگـەکان سـوود بـە ئیمانـداران دەگەیەنـن، وە ئیمـانو یەقیـنو دڵنیاییـان پێی زیـاد دەکات، بـەڵام ئەوانـەی پشـتیان تێکـردوەو بەرهەڵسـتیان کـرد هەرگیـز ئیمانی پێ ناهێنـنو سـوودی لـێ وەرناگـرن، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ۝٩٧﴾ یونـس، (واتـە: بـە ڕاسـتی ئەوانـەی دەرچـووەو چەسـپاوە بۆیان بڕیـاری پەروەردگـارت بڕواناهێنـن * هەرچەن بۆیان بێـت هەمـوو بەڵگـەو نیشـانەیەک هەتا نەیبینن بە چاوی خۆیان سـزای سـەختی ئـازاردەر) سـوود لە هاتنـی ئەمانـەداو دواندنیان بـۆ ئەوەیە بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بـێو بیانوویان ببـڕێ، وە لەبـەر ئـەوەی کاتێ سـزایان بۆ دادەبـەزێ نەڵێـن: ﴿لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ﴾ بـە سـزا، ئەوەتا پێغەمبەری مـن هاتو بەڵگەو

سـەلماندنی منـی لایـە، جا وەک ئـەوەی ئێـوە دەیڵێـن، بە ڕاسـتی بزانن.
ئـەی موحەممـەد ﷺ ڕووبەڕووی ئەو کەسـانەی کە بە درۆتیان دەزانـیو دەڵێن: چاوەڕوانی مردنـت دەکەیـن، ﴿ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ ﴾ (هەمـوو چاوەڕوانین)، ئێـوە چاوەڕوانی مردنی مـن بکـەن، منیـش چاوەڕوانی سـزای ئێـوە دەکـەم، ﴿ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِ ﴿٥٢﴾ ﴾التوبة، واتـە: یـان سـەرکەوتن، یـان شـەهید بـوون، ﴿ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَا ﴿٥٢﴾ ﴾التوبة، (واتـە: ئێمـەش چاوەڕێـی ئـەوە لـە ئێـوە دەکەین کـە لەلایەن خۆیـەوە سـزایەکتان تووش بـکات، یان بە دەسـتی ئێمە سـزا بدرێن).
﴿ فَتَرَبَّصُواْۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ ﴾ (دە ئێـوەش چـاوەڕوان بن، ئەوسـا لە ئاینـدەدا دەزانـن، کێ خاوەنی) ڕێگـای ڕاسـتە، ﴿ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ (کێ ڕێنمایی وەرگرتوە) بـە خوو ڕەوشـتو هەڵسـوکەوتی، من یـان ئێـوە؟ خاوەنی ڕێگای ڕاسـت سـەرکەوتووەو لەسـەر بەرچـاو ڕوونیـە، ڕزگاربـوو سـەرفرازە، وە هـەر کەسـێک لـەو ڕێنماییـە لابدات، بێگومـان خەسـارەتمەندو بـێ ئومێـدو سـزا دراوە، بـە تەئکید ئـەوەش زانرا کـە پێغەمبەری خـوا لەسـەر ڕێنمایی بـوو، وە دوژمنەکانیشـی بە پێچەوانـەوەی ئەوە بوون، خـواش زاناترە.

تەفسیری سووڕەتی (طه) تەواو بوو.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾
مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ
يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ
ظَلَمُوا هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ
تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ
وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ
افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ
﴿٥﴾ مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ
﴿٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ
الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا
لَّا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ
الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾
لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾

## تەفسیری سوورەتی (الأنبیاء)

## مەککیە (١١٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٤﴾ ﴾:

﴿ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴾ ئەمە سەرسوڕمانە لە حاڵەتی خەڵکی، بێگومان ئامۆژگاری بۆ ئەوان هیچ سوودێکی نیەو ترساندنیش هیچ بەهایەکی نیە، بە ڕاستی لێپرسینەوەیان نزیک بووەتەوە، وە پاداشتدانەوەیان لە کردەوە چاکو خراپەکانیان، لە کاتێکدا ئەوان لە بێئاگایی‌و غەفڵەتی پشت تێکردندان لە ئاینی خوا، واتە: بێئاگان لەوەی بۆی دروستکراونو ڕوو وەرگێڕن لەوەی سەرزەنشت کراون، وەکو ئەوەی بۆ دونیا دروست کرابێتن‌و بۆ چێژ وەرگرتن هاتبنە دونیاوە، خوای مەزن بەردەوام ئامۆژگاریان بۆ تازە دەکاتەوە، بەردەوام ئەوان لە بێئاگایی‌و پشت تێکردندان، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ ﴾ یادیان بکاتەوە ئەوەی سوودی هەیە بۆیان، وە ئەوەی زیانی هەیە بۆیان دووری بخاتەوەو بۆیان بسەلمێنێت، ﴿ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ ﴾ بیستنێک بێتە بەڵگە بەسەریانەوە ﴿ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ﴾ واتە: دڵەکانیان لە غەفڵەتو بێ ئاگایی پشت تێکردندایە بە ئەرکی سەر شانیان لە دونیاو بە جەستەشیان گاڵتەو گەپ دەکەن، سەرقاڵ بوون بە ئارەزووبازیەوەو کار کردن بە بەتاڵو پووچو قسەی بێ ماناو سووک، لەگەڵ ئەوەدا

وا پێویست بوو لەسەریان بەم شێوەیە نەبن، دڵەکانیان فەرمانو قەدەغەکراوەکانی وەربگرتایە، وە بیانبیستبایە بە بیستنی ئەوەی کە پێویستە، وە جەستەیان کۆششی بکردایە بۆ عیبادەتی پەروەردگاریان کە لە پێناویدا دروستکراون، ڕۆژی قیامەتو لێپرسینەوەو پاداشتیان لە بیر بووایە، بەم شێوەیە کارەکانیان بۆ تەواو دەبوو حاڵیان باش دەبوو کردەوەکانیشیان پاڵفتە دەبوو. دەربارەی مانای فەرموودەی خوا: ﴿ ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ ﴾ دوو بۆچوون هەیە:

یەکەمیان: ئەم ئۆممەتە کۆتا ئۆممەتەو پێغەمبەرەکەیشی دوایینی پێغەمبەرانە، لەسەر ئۆممەتەکەی قیامەت بە جێدێت، قیامەت لێی نزیک بووەتەوە لە چاو ئۆممەتەکانی پێشوودا، بۆیە فەرموویەتی: {بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ}(أخرجە أحمد برقم: (١٢٢٦٧)، والبخاري برقم: (٦١٣٩)، ومسلم برقم: (٢٩٥١)) (واتە: ناردنی منو دواڕۆژ وەکو ئەم دووانە وەهایـن) وە هەردوو پەنجەکەی جووت کرد، پەنجەی شایەتمانو ئەوەی لە تەنیشتێتی.

دووەمیان: مەبەست لە نزیک بوونەوەی لێپرسینەوەو مردنە، هەر کەسێک مرد ئەوە قیامەتی ئەو بەرپا بووە، وە دەچێتە ماڵی پاداشتی کردەوەکانی، بە ڕاستی سەرسوڕهێنەرە بە لای هەموو بێ ئاگایەکی پشتتێکردوو، نازانی کەی مردن لە ناکاو یەخەی پێدەگرێت بەرەبەیان یان سەر لە ئێوارە، ئەمە حاڵەتی هەموو خەڵکیە جگە لەوانە نەبێت کە پەروەردگار هاوکاریو پشتیوانیان دەکات، خۆی بۆ مردنو دوای مردن ئامادە دەکات.

پاشان باسی چەپچی بێبڕواو ستەمکارەکان دەکات لە ڕووی ئینکاریو کەللەڕەقیانەوە، وە بەراورد کردنی هەق بە باتڵ، بێگومان ئەوان چەپیان دەکردو ڕێکدەکەوتن لە نێوان یەکتردا کە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ بڵێن: ئەویش مرۆڤێکە وەکو ئێوە، چی فەزڵی ئەوی داوە بەسەر ئێوەداو تایبەتی کردوە لە ناوتاندا، خۆ ئەگەر کەسێک لە ئێوە هەمان بانگەشەی ئەوە بکات ئەوە بانگەشەکەی هەروەکو بانگەشەی ئەو وایە، بەڵکو ئەو دەیەوێ خۆی بسەپێنی بەسەرتانداو پێشەوایەتیتان بکات، جا بە هیچ جۆرێ گوێڕایەڵی مەکەنو بە ڕاستی دامەنێن، ئەو جادووگەرە، ئەوەیشی کە هێناویەتی لە قورئان هەر جادووە، خۆتانی لێ بپارێزنو خەڵکی لێ ئاگادار بکەنەوەو بڵێن: ﴿ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ﴾ (واتە: ئایا ئێوە دەڕۆن بە دوای جادوودا لە کاتێکدا ئێوە دەبینن)؟ ئەمەو خۆیان باش دەیانزانی کە ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ بە ڕاستی، بەو

بەڵگــەو نیشــانانەی کــە بینیبوویــان کــە جگە لــە ئــەوان نەیبینیبوو، بــەڵام ســتەمو تاوانو کەللەڕەقــی وای لێکــردن، خوای بەرز بە زانســتی دەوری چپە چپەکانیانی داوە، وە لەســەری ســزایان دەدات، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ ﴾واتە: ئەوەی ئاشــکراو نهێنیە (چرپــە چــرپ)، ﴿ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾لــە هەر شــوێنێکی ئاســمانو زەوی بێت ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾بــۆ هەمــوو دەنگەکان بە جیــاوازی زمانو جــۆری پێویســتیەکان ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ ئەوەی لــە ناخدایــەو نهێنیە.

(٥-٦): ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ۝٥ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ۝٦ ﴾

﴿ بَلْ قَالُوٓاْ ﴾خــوای مــەزن باســی درۆی بــە درۆخــەرەوەکان دەکات بــە موحەممەد ﷺ، وە بــەوەی کــە هێناویەتــی لــە قورئانــی پیــرۆز، بێگومــان ئــەوان کە بــە گێل لــە قەڵەمیان دەدا، وە قســەی بەتاڵــی جیاوازیــان زۆر دەربــارەی کــرد، جارێــک دەیانــوت: ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ ﴾وەکو قســەی کەســێکی نووســتوو وایــە خــەوی تێکــەڵو پێکەڵــی بینیبێت، کە هەســت نــاکات چــی دەڵێــت، وە جارێکــی دیکــە دەیانــوت: ﴿ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾هەڵیبەســتوە لە لایــەن خۆیــەوە، وە جارێکــی تــر دەیانوت: ئــەو شــاعیرە، وە ئەوەیشــی هێناویەتی شــیعرە. هــەر کەســێک کەمتریــن زانیــاری هەبێــت بە ڕاســتی شــتەکان، لــە حاڵەتــی پێغەمبەر ﷺ، وە تەماشــای ئــەوەی کردبێــت کە ئــەو پەیامەی هێنــاوە، هیچ گومانێکــی لە دڵــدا نامێنێت، بێگومــان ئــەو قورئانــە گەورەتریــن وتــەو بەرزترینیانــە، بە ڕاســتی ئــەوە لە لایــەن خواوە هاتــووە، هیــچ کــەس لــە مرۆڤــەکان ناتوانێــت وێنــەی هەندێکــی بهێنێتــەوە، وەکو چۆن خــوا ﷻ بەربەرەکانــی دوژمنەکانــی کــردوە بــەو قورئانە، بۆ ئــەوەی لە ڕووی بوەســتنەوە لەگــەڵ بوونــی هۆکارەکانــی دژایەتی کــردن لەبــەر دەســتیاندا، نەیانتوانی شــتێک بهێننەوە لــە هاوشــێوەی ئــەو قورئانــە، خۆیــان بــاش ئەوەیــان دەزانــی، ئەگەرنــا چــی وای لێکردن دەستەوەســان دابنیشــن؟ وە زمانــی ورۆژانــدی جگــە لــە ڕاســتی نەبــێ کــە هیچ شــتێک لە بەرانبەریــدا ناوەســتێت؟ لەبــەر ئەوە ئــەم وتانەیــان دەداوە پاڵی چونکــە بڕوایــان پێنەبوو، تا خەڵکــی لێدور بخەنــەوە ئەوانەی کە نەیانناســیبوو، ئەویــش گەورەترینی نیشــانەی بەردەوام بــوو کە بەڵگەیە لەســەر ڕاســتی ئــەوەی پێغەمبــەر ﷺ هێناویەتی، ئــەوە زامنەو چارەســەرە. هــەر کەســێک جگــە لــەو قورئانــە داوای بەڵگەیەکــی دیکە بکات، یــان نیشــانەو ئایەتێک لــە ئایەتــەکان پێشــنیار بــکات، ئــەوە نەفــامو ســتەمکارەو لــەو دوژمنانەیــە کە بــە درۆی

دەخەنــەوە، وە داواکردنــی پێشــنیاری ئایەتــەکان زیانتریــن شــت بــوو لەســەریان، لەبــەر ئــەوەی ئەگەر مەبەســتیان ناســینی هــەق بووایــە، بێگومان بە بەڵگــە بــۆی ڕوونکردنەوە، وە ئەگــەر مەبەســتیان بێتواناییـی‌و بیانــوو هێنانــەوە بووایە بۆ نەفــس‌و دەروونی خۆیــان، ئەگەر ئــەوە نەهێنێتــەوە کــە داوایــان کــردوە، ئەوان بــەو حاڵــە دەمێننــەوە ئەگەر ئەوەشــی داوای دەکــەن بۆیــان بەجێبهێنێــت، هەرگیــز بــڕوای پێناکــەن، ئەگــەر هەمــوو نیشــانەیەکیان بۆ بهێنێــت بــڕوای پێناکــەن هەتــا بــە چــاوی خۆیان ســزای ســەختو بە ئێــش نەبینــن. بۆیە فەرموویەتــی: ﴿ فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴾ واتــە: وەکــو حوشــترەکەی صالحو گۆچانەکــەی مووســا، وە وێنــەی ئەوانە.

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ ﴾ واتــە: بەم ئایەتە پێشــنیار کراوانــە، بەڵکــو ســوننەتی خــوا ﷻ وادەخوازێ هــەر کەســێ داوای بکات، پاشــان بۆی بە دەســت بێــتو بــڕوا نەهێنێ، ئەوە ســزای بــۆ پێش دێــت، پێشــنەکان بڕوایــان پێنەهێنا، ئایا ئەمانــە بــڕوای پــێ دێنن؟ چــی وای لێکــردوون چاکتربن لەوانەی پێشــین؟ ئــەو خێرە چیە تیایانــدا لــە کاتــی بینینیدا وا بخــوازێ بڕوا بهێنــن؟ ئەمە ئیســتفهامە بە واتای نەفــی هاتووە، واتــە: هەرگیــز بڕواهێنان لــە لایەن ئەوانــەوە ڕوونادات.

(٧-٩): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٧ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ ٨ ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٩ ﴾:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾ واتــە: ئەمــە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی پێغەمبەریان بــە درۆ دانــا کــە دەیانوت: ئــەی بۆ فریشــتە نەبووە کە پێویســتی بــە خــواردنو خواردنەوە نیــە، وە بــە مامەڵــە کــردن لــە بــازاڕدا؟ ئــەی بۆچــی هەتاهەتایــی نەدەمایەوە؟ جــا ئەگەر بــەم شــێوەیە نەبێــت، ئــەوە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی پێغەمبــەر نیــە، ئــەم گومانە بــەردەوام لــە دڵــی بەدرۆخەرەوانــی پێغەمبەرانــدا بــوو، لــە بێبڕواییــدا لە یــەک چوون، وتەکانیشــیان هاوشــێوەی یەکتــر بــوو، خــوا ﷻ وەڵامی ئــەم گومانــەی بەدرۆدانەرانــی دایــەوە، ئەوانەی کــە بڕوایــان بــە پێغەمبەرانی پێشــوو هەبــوو -ئەگــەر نەبووایە جگــە لــە ئیبراهیم ﷺ کە هەمــوو دەســتەو تاقمــەکان بڕوایان پێ هێنــاوە، وە هاوبــەش دانەران وادەزانن ئەوان لەســەر ئایــن‌و میللەتــی ئــەون- بــەوەی پێغەمبەران پێــش موحەممــەد ﷺ هەموویان مــرۆڤ بوون، ئەوانــەی نانیــان دەخواردو لە بــازاڕدا دەســوڕانەوە، وە هەمــوو ئەوانەی بەســەر مرۆڤدا دێت

بەسەر ئەوانیشدا دەهات لە مردنو جگە لە ئەویش، بێگومان خوا ﷻ ناردوونی بۆ ناو گەلو نەتەوەکەیان، جا ئەوەی بە ڕاستی دانان بە ڕاستی داناںو ئەوەی بە ناڕاستی زانین بە ناڕاستی زانین، وە بەڵێنی خۆی بە ڕاستی بردە سەر لە گەڵیاندا لە ڕزگاربوونو خۆشبەختیو کامەرانی بۆیان، وە بۆ شوێنکەوتووەکانیان، وە زێدەڕۆیانی لە ناو برد.

جا دەبێ حاڵی پێغەمبەر ﷺ چۆن بێت، گومانی پووچو بەتاڵی بۆ دێننەوە لە نکووڵی پەیامەکەی، لە کاتێکدا ئەو یەکێکە لە برا پێغەمبەرەکانی، ئەوانەی بەدرۆخەرەوانی موحەممەد ﷺ دانیان بە پەیامەکەیاندا دەنا؟ جا ئەمە پەیوەست کردنیانە بە ئەوپەڕی ڕوونکردنەوە، ئەوان ئەگەر دان بە پێغەمبەرێکدا دەنێن لە مرۆڤ، وە دان بە پێغەمبەردا نانێن لە غەیری مرۆڤ، بەڕاستی گومانەکەیان بەتاڵە، خۆیان بەتاڵیان کردوەتەوەو دانیان بە خراپیدا ناوەو پێچەوانەی جوڵاونەتەوە، جا ئەگەر وادابنرێ ئەوان ڕاستەوخۆ ئینکاری پەیامی پێغەمبەر ﷺ بکەن وەک مرۆڤ، بەوەی کە نابێ پێغەمبەر بێ تەنها فریشتەیەک نەبێ بۆ هەتاهەتایی خواردنو خواردنەوە نەخواتەوە، ئەوە بێگومان خوا ﷻ وەڵامی ئەم گومانەی داوەتەوە بە وتەی: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ﴿٩﴾ ﴾الأنعام، واتە: وە دەیانوت: بۆچی فریشتەیەک نە نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەری (ببینین)، ئەگەر فریشتەیەکمان بناردایەتە خوارەوە، بێگومان کار تەواو دەبوو، پاشان مۆڵەت نەئەدران * ئەگەر ئەو (پێغەمبەرە)مان بکردایەتە فریشتەیەک، بێگومان دەمانگۆڕی بە وێنەی پیاوێکو بێگومان لێمان دەشێواندن وەک چۆن خۆیان لە خۆیان دەشێواند).

بێگومان مرۆڤەکان توانایان نیە نیگا لە فریشتەوە وەربگرن، ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ﴿٩٥﴾ ﴾الإسراء، (واتە: بڵێ: لە زەویدا فریشتە هەبوایە بە دڵنیاییەوە تیایدا بگەڕانایە (بە وێنەی ئادەمی) بێگومان لە ئاسمانەوە دەماننارده خوارێ بۆیان فریشتەیەکی پێغەمبەر)، ئەگەر گومانێکتان هەبوو، وە زانستتان نەبوو بە حاڵەتی پێغەمبەرانی پێشوو، ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ ﴾ لە خاوەن کتێبەکانی پێشوو، وەکو خاوەن تەوراتو ئینجیل، هەواڵتان دەدەنێ بەوەی زانستتان دەربارەی هەیە، بێگومان ئەوان هەموویان مرۆڤن لە ڕەگەزی ئەوانەن بۆیان نێردراوە.

ئەم دەقە پیرۆزە ئەگەر چی هۆکارەکەی تایبەتە بە پرسیارکردن دەربارەی حاڵەتی

پێغەمبەرانـی پێشـین لـە زانایانی گاورو جوولەکـە، بێگومان گشـتگیرە بۆ هەمـوو بابەتێک لـە بابەتەکانـی ئایـن، بنەماو لـقو پۆکانی، ئەگـەر مرۆڤ شـارەزایی دەربـارەی نەبێت، جا فەرمانکردنـی تێدایـە بـە فێربـوونو پرسـیارکردن لە خـاوەن زانسـت، لەبەر ئـەوە فەرمانی پێکـردوون بـە پرسـیار لێکردنیـان، چونکـە پێویسـتە لەسـەریان فێـر ببـن، وەڵامـی ئەوە بدەنـەوە کە فێـری بوون.

وە لـە تایبـەت کردنی پرسـیار لـە خاوەن زیکـرو زانسـت، قەدەغەکراوە پرسـیار کردن لە جاهیـلو نەفـامو نەخوێنـدەوار، وە نەهـی کـراوە لە ئەویـش وەڵامـی بداتەوە، لـەم دەقەدا بەڵگـە هەیـە کـە پێغەمبەرانیـان ئافرەتیـان تیـادا نەبووە، نـە مەریـەمو نە غەیـری ئەویش، بۆیە خـوا ﷻ فەرمووویەتـی: ﴿إِلَّا رِجَالًا﴾.

(١٠): ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾﴾:

﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا﴾ سـوێند بـە خوا ناردومانەتـە خوارەوە بۆتان ـئـەی خەڵکینە! ئـەی موحەممـەد!- کتێبێکـی پیـرۆزو قورئانێکـی ڕوون ﴿فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾ واتـە: ڕێـزو شـانازیو بەرزبوونەوەتـان، ئەگـەر یـادی پێبکەنەوە ئـەوەی تیایدایـە لە هەواڵە ڕاسـتەکان، وە بڕواتـان پێـی هەبێت، ئـەوەی تیایدایە بە جێی بهێنـن لە فەرمانـەکان، وە دوور بکەونەوە لـەوەی لێـی قەدەغە کـراون، ڕێـزو هەیبەتتـان زیـاد دەکاتو کاروبارتان گـەورە دەبێت، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ ئـەوەی سـوودتان پێدەگەیەنێـتو زیانتان لێدەدات؟ چـۆن ڕازی نابنو کار ناکـەن لەسـەر ئەوەی یـادی ئێوەی تێدایـە، وە ڕێزتان لـە دونیـاو دواڕۆژدا؟ جا ئەگەر عەقڵتـان هەبووایـە شـوێنی ئەو ڕێگایـە دەکەوتن.

کاتـێ شـوێنی نەکەوتـنو ڕێگـای دیکەتـان گرتەبەر کـە دەبێتـە مایەی سەرشـۆڕیو بێ نرخیتـان لـە دونیـاو دواڕۆژدا، دەردەکـەوێ ئێـوە خـاوەن عەقڵێکـی ڕاسـت نیـنو خاوەن بۆچوونێکـی تەندروسـتیش نین.

حەقیقەتـی ئـەم دەقـە ڕوویداوە، بێگومـان ئەوانەی بڕوایان بـە پێغەمبەر ﷺ هێنـاو بە قورئان یادیـان کـردەوە لە هـاوەڵانو پـاش ئەوانیـش، سـەرکەوتنو شـەرەفی مەزنیان بەدەسـت هێنـا بەسـەر پاشـاکانەوە، بێگومان ئەوە لـە لای هەموو کـەس زانراوە، وەکو چـۆن زانراوە هەرکەسـێ دەسـت بـەم قورئانـەوە نەگرێ سَـەربەرزو سـەرکەوتوو نابـێ، بەڵکـو زەلیلو ڕیسـواو نامـۆ دەبـێ، کەوابوو هیـچ ڕێگایەک نیـە بۆ خۆشـبەختی دونیـاو دواڕۆژ جگە لە یادکردنـەوە بەم کتێبـە نەبێ.

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا
ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾
لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ
تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ
دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا
ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ
لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ
عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ
﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ
عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ
لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾
لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ
مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ
مَن قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾

(١١-١٥): ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾﴾

خوا ﷻ ئاگاداری ستەمکاران‌و بەدرۆدانەرانی پێغەمبەر ﷺ دەکات کەچی بەسەر ئەو ئۆممەتانە هێناوە کە پێغەمبەرانی خۆیانیان بەدرۆداناوە، ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا﴾ واتە: لە ناومان برد بە سزایەکی توندو تیژ، ﴿مِن قَرْيَةٍ﴾ لە شارو لادێیەک ﴿وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾ بێگومان کاتێ بێبڕوایان هەستیان کرد بە سزاو تۆڵەی خوا ﷻ کە ناتوانن خۆیان ڕزگار بکەن، دەستبەجێ ڕایان کردو شارەکانیان بەجێهێشت زۆر بە پەشیمانی‌و دوودڵیەوە ئاخیان هەڵدەکێشا لەوەی کە ئەنجامیان داوە، وە ڕایان دەکرد بۆ ئەوەی تووشیان نەبێ.

جا بە شێوەی گاڵتەجاڕیەوە پێیان وترا: ﴿لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾ واتە: ڕاکردن‌و پەشیمان بوونەوە هیچ سوودێکی نیە، ئەگەر تواناتان هەیە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو نازونیعمەت‌و هەواو ئارەزووانەی تێیدا ڕۆچوو بوون، وە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو کۆشک‌و تەلارە ڕازاوانەی کە دیاریتان کردبوو بۆ خۆتان، وە بۆ لای ئەو دونیایەی کە سەری لێشێواندن‌و بێ ئاگای کردن لە پەیامی خوا ﷻ جا بۆ خۆتان تیایدا بە توانا بمێننەوەو چێژی لێوەربگرن، وە لە ماڵی خۆتان بمێننەوە بە دڵنیایی‌و ئارامیەوە وەکو چۆن لە پێشوو دەمانەوە، ئەوە زۆر دوورە کامەیە گەیشتن بەوە؟ بە ڕاستی کات بەسەرچوو، سزاو تووڕەیی بۆیان حەڵاڵ بوو عیزەت‌و ڕێزوو دونیایان هەموو لە دەستدا، پەشیمان بوونەوەو ئاخ هەڵکێشان بوو بە خۆزگەیان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ

﴿ دَعْوَىٰهُمْ ﴾ واتە: پارانەوە بە وەیلو هاوارو پەشیمان بوونەوەو دانپێدانان لەسەر خۆیان کە ستەمکارن، وە خوا ﷻ دادپەروەرە لەوەی بەسەریاندا هێناویەتی، ﴿ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴾ وەکو ئەو ڕووەکانەی کە وشک دەبنەوەو لە جووڵە دەکەونو دەنگیان نامێنێو خامۆش دەبن، جا ئاگادار بن لە بەردەوام بوونتان لە بەدرۆدانانی بەڕێزترینی پێغەمبەران، سزاتان لەسەر پێویست دەبێ وەکو چۆن بۆ پێشینی ئێوە پێویست بوو.

(١٦-١٧): ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾:

﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵیداوە کە بێگومان ئەو زەویو ئاسمانی بەبێ هوودەو گاڵتەجاڕی دروست نەکردوە، بەڵکو بۆ هەقو لە پێناو هەقدا بەدیهێناوە، تا بەندەکان بیکەن بە بەڵگە کە تەنها ئەو پەروەردگاری مەزنە، بەڕێوەبەرو لەسەرخۆیە، میهرەبانو بەبەزەییە، خاوەن هەموو تەواویو ستایشەکانە، وە خاوەنی هەموو عیززەتەکانە، ڕاستگۆیە لە وتندا، پێغەمبەرانی بە ڕاست داناوە کە هەواڵیان دەربارەی داوە، بێگومان ئەو بە توانایە لە دروستکردنەوەی ئەرزوو ئاسمانەکان کە چەندە بەرفراوانو مەزنە، وەک چۆن بە توانایە لە دروستکردنەوەی جەستەکان پاش مردنیان، تا پاداشتی چاکەکار بە چاکە بداتەوە، وە خراپەکاریش بە خراپەکانی ﴿ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا ﴾ واتە: ئەگەر بمانویستبایە، ئەگەرێکی مەحاڵە ﴿ لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ ﴾ واتە: لە لایەن خۆمانەوە، ﴿ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ ئاگادارمان نەدەکردنەوە لەسەر ئەوەی تیایدایە لە یاریو گاڵتەجاڕی، چونکە ئەوە ناتەواویەو نموونەی خراپە نامانەوێ نیشانی ئێوەی بدەین.

جا ئاسمانەکانو زەوی کە بەردەوام لە پێش چاوی ئێوەن ناکرێ بە گاڵتەو گەمە دروستکرابن، هەموو ئەوانە دابەزاندنە بۆ لای عەقڵە بچووکەکانو متمانە پێکردنیانە بە هەموو جۆرەکانی متمانە پێکردن، جا پاکی بۆ خوای کارزانو نەرمو نیان، کارلەجێ لە دانانی شتەکان لە جێگای خۆیاندا.

(١٨-٢٠): ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە ئەو هەق دەدات بەسەر بەتاڵو ناهەقداو سەری دەخات، بێگومان هەموو بەتاڵێک وتراوەو مشتو مڕی

پێکـراوە، خـوا ﷻ هەقو ڕاسـتی دابەزانـدوە بە زانسـتو ڕوونکردنـەوەوە کـە بەتاڵی پێ پـەرشو بـڵاو دەبـێو دەپژێو تێک دەشـکێ، وە بـۆ هەموو خەڵـک بەتاڵـیو پڕوپووچی ڕوون دەبێتـەوە، ﴿ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ﴾ واتـە: پەرشو بـڵاو دەبێو دەفەوتێ، ئەمە گشـتگیرە لـە هەمـوو بابەتە ئاینیـەکان، هیـچ بەتاڵکەرەوەیەک گومانێکـی عەقڵی، یان نەقڵی دروسـت نـاکات بـۆ بەڕاسـت دانانی بەتـاڵ یان ڕەتکردنـەوەی هەقو ڕاسـتی، ئیلا خـوا ﷻ بەڵگەی یەکلاکـەرەوەی عەقڵـیو نەقڵـی بـۆ دیاری کـردوە، کـە بەتاڵو پـووچ لە نـاو دەبات، جا بـۆ هەموو خەڵـک دەردەکـەوێ بەتاڵیو ناهەقـی ئەوە، ئەمەش بـە خوێندنـەوەی بابەتەکان ڕوون دەبێتـەوە بابـەت بە بابەت.

پاشـان فەرموویەتی: ﴿ وَلَكُمُ ﴾ ئەی ئەو کەسـانەی وەسـفی خواتان کردوە کە شایسـتەی ئـەوە نیـە لـە دانانی منـداڵو خێـزان، وە لە بـتو هاوبـەش دانەرەکان، بەشـی ئێـوە لەوەدا ﴿ ٱلْوَيْلُ ﴾ پەشـیمانیو ڕەنـج بـە خەسـاری بۆ ئێـوە، ئـەوەی ئێوە وتتـان هیچ سـوودێکی تێدانیـە، وە ناگەڕێتـەوە بـۆ لاتـان بـە گەڕانەوەیەکـی هیوابەخـش، کار بکـەن لـە پێناوی ئـەودا تەنهـا پێچەوانـەی مەبەسـتەکانتانە ئەویش بـێ ئومێدیو بێبـەش بوونە.

پاشـان هەواڵـی داوە بە ڕاسـتی ئەوەی لە ئاسـمانەکانو زەویدایـە بۆ ئەوە، هەمـووان بەندەو کۆیلـەی ئـەون، هیـچ موڵکێکیـان نیـەو هیـچ بەشـێکیان نیـە لـە موڵکـدا، کـەس ناتوانێ هـاوکاری بـکات بەسـەریەوە، وە شـەفاعەتیش ناکرێـت بە ویسـتی ئەو نەبـێ، چۆن جگە لـە خـوا ﷻ دەکرێ بـە پەرسـتراو، وە چـۆن منداڵی بـۆ دادەنرێت؟

بـەرزیو بڵنـدی بـۆ پاشـای مـەزن کـە گەردنەکان بـۆی کـەچ بـوونو گرانـەکان بۆی زەلیـل بـوون، وە فریشـتە نزیکەکان ملکەچـی بوونو سـەریان دانواند بـۆ بەندایەتی کردنی بـە بەردەوامـیو بـە گشـتی، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَنْ عِندَهُۥ ﴾ واتـە: لـە فریشـتەکان ﴿ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴾ واتـە: قـەت مانـدوو نابـنو خۆیـان بـە گـەورە نازانـن لـە ئاسـتی بەندایەتی بـۆ کردنیاندا بـۆ خوا ﷻ چونکـە ئارەزوویـان زۆرەو زۆریـان خـۆش دەوێـت، وە جەسـتەیان بەهێـزە، ﴿ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴾ واتـە: ڕۆچـوون لـە عیبادەت کـردنو تەسـبیحاتدا لـە هەمـوو کاتەکانیاندا، نـەک لە کاتە بەتاڵەکانیـان، ئـەوان لـە زۆر عیبـادەت کردنـدا بـەو جـۆرەن، لەمـەدا گەورەیـیو مەزنیی دەسـەڵاتی خوا ﷻ دەردەکەوێت، وە تەواوی زانسـتو حیکمەتی، کە وا پێویسـت دەکات لـە غەیـری ئـەو نەپەرسـترێت، وە بەندایەتـی بۆ ئـەو نەبـێ بۆ کـەس نەکرێت.

(٢١-٢٥): ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ٢١ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ٢٢ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةًۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٤ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥ ﴾:

﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ کاتێ کە خوا ﷻ تەواو دەسەڵاتی خۆی ڕوون کردەوە، وە ملکەچ بوونی شتەکانی بۆ خۆی، نکوولی لە هاوبەش دانەران کرد ئەوانەی غەیری خوا ﷻ چەند پەرستراوێکیان لە زەویدا هەڵبژاردوە، کە لەوپەڕی بێ توانایی‌و بێ دەسەڵاتیدان، ﴿ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴾ ئیستفهامە بە مانای نەفی دێت، واتە: توانای زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەیان نیە، وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرًّا وَلَا نَفۡعًا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ٣ ﴾الفرقان، بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە کە هیچ شتێک دروست ناکەن، بەڵکو خۆشیان دروستکراون دەسەڵاتیان نیە بۆ خۆیان، نە زیانو نە سوودو نە قازانج بگەیەنن، هەروەها مردنو ژیانو زیندووبوونەوەی خۆیان بە دەست نیە، ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمۡ يُنصَرُونَ ٧٤ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ وَهُمۡ لَهُمۡ جُندٌ مُّحۡضَرُونَ ٧٥ ﴾یس، (واتە: بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە، بەو هیوایەی یارمەتی بدرێن * ئەو پەرستراوانە ناتوانن یارمەتیان بدەن، بەڵام ئەمان سەربازی ئامادەن لە خزمەتیاندان).

جا بتپەرست بەدیهێنراو دەپەرستێت کە هیچ سوودو قازانجێکی بۆی نیە، وە واز لە دڵسۆز بوون دەهێنی بۆ خوا ﷻ، کە خاوەن هەموو تەواویەکە، وە هەموو بڕیارو فەرمانەکانو سوودو زیان بەدەستیەتی.

بە ڕاستی ئەمە لە نەبوونی سەرکەوتنو بەدبەختیو نەفامیەتیو تووندی ستەمکردنیەتی، بێگومان تەنها یەک پەرستراو خاوەن بوونەوەرە، وەکو چۆن لە بوونەوەردا تەنها پەروەردگارێک هەیە، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ﴾ واتە: لەئاسمانەکانو زەویدا ﴿ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ (ئاسمانو زەوی) لە زاتیاندا کاول دەبوون، وە هەموو بەدیهێنراوەکانی ناویشی تێکدەچوون.

ڕوونکردنەوەی ئەمە: جیهانی ئاسمانەکانو زەوی بەو شێوەی کە دەبینرێ، لە تەواوترین

ڕێکخستندایە، کە هیچ کەمو کوڕیو ناتەواویەکی تێدانیە، بە هەمان شێوە هیچ بەرگریکارێکو دژیەکیشی تێدانیە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یەک بەڕێوەبەرو یەک پەروەردگارو یەک پەرستراوی هەیە، جا ئەگەر دوو بەڕێوەبەرو پەروەردگاری هەبووایە یان زیاتر، ئەوە یاساو ڕێسای تێکدەچوو، بێگومان هەردووکیان دژی یەکتر دەبوونەوە، ئەگەر یەکێکیان شتێکی بویستایەو ئەویتریش نەبوونی، بە ڕاستی ئەوە دەبووە مەحاڵو ویستی هەردووکیان لە یەک کاتدا پێکەوە بهاتبایەتە دی، وە ویستی کەسێکیان جگە لە ئەوی تر بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئەوی دیکەو نەبوونی توانای، وە ڕێککەوتنیان لەسەر یەک ویست لە هەموو کاروبارەکاندا گونجاو نیە.

کەواتە: دەردەکەوێ بە ڕاستی زاڵو بەدەسەڵات کە ویستەکانی بەتەنها دێتە بوون، بەبێ بەرگریکارو دژیەک، بریتیە لە خوای تاکو تەنها، لەبەر ئەمە خوا باسی بەڵگەی ڕێگری کردنی کردوە وەک دەفەرموێ: ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون، (واتە: خوا ﷻ هیچ ڕۆڵەیەکی بۆ خۆی بڕیار نەداوە، وە هیچ پەرستراوێکی تری لەگەڵدا نەبووە (ئەگەر پەرستراوی تری لەگەڵدا بووایە) ئەو کاتە هەر پەرستراوێک چی دروستکردوە (بۆ خۆی) دەبرد، وە هەندێکیان زاڵ دەبوون بەسەر هەندێکی تریاندا خوا پاکو بێگەردە لەوەی ئەوان دەیڵێن).

وە لەوەدا -لەسەر یەکێک لە دوو بۆچوونە- خوا فەرموویەتی: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ ﴾الإسراء، (واتە: ئەی موحەممەد! بڵێ: ئەگەر لەگەڵ خوادا پەرستراوی تر بیووایە وەک ئەو (بتپەرستانە) دەڵێن، ئەو کاتە دەگەڕان بە دوای ڕێگایەکدا بۆ لای خاوەنی عەرش (کە خوایە) * پاکیو بەرزیو بڵندی بۆ خوا لەوەی (بتپەرستان) دەیڵێن (دەربارەی، خوا زۆر بەرزترە). بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: پاکو بێگەردی بۆ خوا لە هەموو ناتەواویەک چونکە تەواوەو تاکو تەنهایە، ﴿ رَبِّ ٱلْعَرْشِ ﴾ کە بریتیە لە سەقفی بەدیهێنراوەکانو بەرفراوانترینو مەزنترینیان، جا پەروەردگارێتی جگە لەو لە پێشترە کە ڕەوا نەبێو نادروست بێ، ﴿ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی ئینکارو بێبڕوان، کە منداڵو خێزانیان بۆ خوا ﷻ دانا، وە بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوبەشیان بۆ قەراردا، ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ ﴾ لەبەر مەزنیو عیزەتی، وە تەواوی دەسەڵاتی هیچ کەسێک ناتوانێ

بەرگـری لێـکات، یـان بەربەرەکانێ بکات نە بـە گوفتارو نە بـە کردار، وە لەبـەر تەواوی حیکمـەتو دانایـی هەموو شـتێکی لـە جێگای خۆیـدا داناوە زۆر بـە وردبینیـەوە کە عەقڵ دەرکـی پێـدەکات، جـا پرسـیار ڕووبـەڕووی ناکرێتـەوە، چونکـە دروسـت کردنـی هیچ عەیـبو ناتەواویەکـی تێدانیـە، ﴿ وَهُمۡ ﴾ واتە: هەمـوو بەدیهێنـراوەکان، ﴿ يُسۡـَٔلُونَ ﴾ پرسـیاریان لێدەکـرێ لـە گوفتـارو کردارەکانیان لەبـەر بێتوانایـیو بێ دەسـەڵاتیان، لەبەر ئـەوەی بەنـدەن هەقی خۆیەتی پرسـیار لە کـردەوەو هەڵسـوکەوتەکانیان بکرێـت، چونکە ئـەوان بـە قەد مسـقاڵە زەرەیەکیش هیچ دەسـەڵاتێکیان نیە بەسـەر خۆیـانو غەیری خۆیان.

پاشـان گەڕایـەوە بۆ حاڵی بتپەرسـتەکان، بێگومـان ئەوانە هەڵیانبژاردوە چەند پەرسـتراوێک جگـە لە خـوا، جا تۆ بـە سەرزەنشـتو لۆمەکردنـەوە پێیان بڵـێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةًۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ ﴾ واتـە: بەڵگـە بهێننـەوە لەسـەر ڕاسـتی ئـەوەی بڕیارتـان داوە، هەرگیـز ناتوانـن بـۆ ئـەوە بەڵگـە بهێننـەوە، بەڵکـو بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە بـە جێهاتووە لەسـەر بەتاڵیو پووچی ئـەو کردارانەیـان، لەبەرئەمە فەرموویەتـی: ﴿ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۗ ﴾ واتـە: هەمـوو کتێـبو شـەریعەتەکان یەکدەنگـن لەسـەر ئـەوەی مـن وتوومە لـە بەتـاڵو پرووپوچـی شـیرک، ئەمـە کتێبی خوایە کـە قسـەی دەربارەی هەموو شـتێکی تێدایـە بـە بەڵگـەی عەقڵـیو نەقڵی، وە ئـەوەش کتێبەکانـی پێشـینە هەموویان بـە بەڵگەوە دەیسـەلمێنن کـە مـن وتومە.کاتـێ کـە زانرا ئـەوان بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بـووە، وە ڕوون بوویـەوە بەتاڵـی ئـەوەی کـە لەسـەری دەڕۆن دەرکەوت ئـەوان ناتوانن بیسـەلمێنن، چونکـە سـەلماندنی بـڕاوە یـەکلای دەکاتـەوە، کـە ئـەوە هیـچ دژێکی نیـە ئەگەرنـا پێی ناوتـرێ یەکلاکـەرەوە، وە ئەگـەر دژیەکـی هەبوو ئـەوە بێگومـان شـوبهەو گومانێکە کە هیچ شـتێک لە هـەق دەرناخات، وە لـە فەرمـوودەی: ﴿ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ ﴾ واتە: ئەوەی ئەوان لەسـەری دەڕۆیشـتن تەنها لاسـایی کردنەوەی پێشـینانیان بوو، مشـتو مڕیان دەکـرد بەبـێ زانیاریـیو ڕێنمایـی، وە نەشـارەزایی ئـەوان دەربارەی هـەقو ڕاسـتی لەبەر شـاردنەوەو لێڵـی نیـە، بەڵکو لەبـەر ئەوەیە ئـەوان پشـتیان تێکـردوە، ئەگەرنا ئـەوان تەنها ڕوویـان تێبکردایـە هەقو ڕاسـتیان بـۆ ڕوون دەبوویـەوە لە بەتـاڵو پووچ، بە شـێوەیەکی ڕوونو ئاشـکرا، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ﴾ کاتـێ کـە خـوا باسـی پێشـینی هێنایـەوە، وە فەرمانـی کـرد بـە گەڕانـەوە بـۆ لایـان لـە ڕوونکردنەوەی ئـەم بابەتـەدا بە جوانتریـن شـێوە ڕوونـی کردۆتەوە لـە وتەی:

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ
بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم
بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ
وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ
﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ
جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ
يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ
ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ
وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ
ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ
ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ هه‌موو پێغه‌مبه‌ران كه‌ له‌ پێش تۆوه‌ هاتوون له‌گه‌ڵ كتێبه‌كانیاندا، پوخته‌ی په‌یامه‌كه‌یانو بنه‌مای كاروباره‌كه‌یان بریتی بووه‌ له‌ به‌ندایه‌تی كردنی خوای تاكو ته‌نها به‌بێ هاوه‌ڵو شه‌ریک بۆ دانان، وه‌ ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ خوا ﷻ په‌رستراوی هه‌قه‌، وه‌ به‌ندایه‌تی كردنی غه‌یری ئه‌و به‌تاڵو پووچه‌.

(٢٦-٢٩): ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴾ خوا ﷻ هه‌واڵ ده‌دات ده‌رباره‌ی گه‌مژه‌یی بتپه‌رستانو به‌ درۆدانه‌رانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ، ئه‌وان وایانده‌زانی -خوا ڕوویان ناشرین بكات- خوا ﷻ منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوه‌، وه‌ ده‌یانوت: فریشته‌كان كچانی خوای مه‌زنن، به‌رزی بۆ خوا ﷻ له‌ وته‌ نابه‌جێكانیان.

وه‌ هه‌واڵی ده‌رباره‌ی وه‌سفی فریشته‌كان داوه‌، به‌وه‌ی كه‌ ئه‌وان به‌نده‌ی په‌روه‌ردگارن كاروباریان به‌ ده‌ستی خوایه‌، ئه‌وان هیچ شتێكیان له‌و كاره‌دا نیه‌، بێگومان ئه‌وان ڕێز لێگیراون له‌ لای خوا ﷻ، خوا ﷻ ڕێزی لێگرتوون، به‌و شێوه‌ی كه‌ تایبه‌تی كردوون به‌ پاكو خاوێنی، ئه‌وان له‌وپه‌ری ئه‌ده‌بدان له‌گه‌ڵ خوادا ﷻ، وه‌ فه‌رمانه‌كانی جێبه‌جێ ده‌كه‌ن، ﴿ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ ﴾ واته‌: شتێک ناڵێن په‌یوه‌ندی به‌ ئه‌وانه‌وه‌ نه‌بێت، هه‌تا خوا ﷻ نه‌یڵێت، له‌به‌ر ته‌واوی

ئـەدەبو ڕێزیـان، وە زانسـتیان هەیـە بـە تـەواوی کاربەجێـیو زانسـتی ﴿ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: هـەر چ فەرمانێکیـان پـێ بـکات جێبەجێـی دەکـەن، سـەرپێچی ناکـەن بـە قـەد چاوتروکانێکیـش، وە هیـچ کردەوەیەکیـان نیـە بە ویسـتو ئـارەزووی خۆیـان بەبـێ فەرمانـی خـوا ﷻ، لەگـەڵ ئەمـەدا خـوا ﷻ بـە زانسـت دەوری داون، جـا خـوا ﷻ دەزانـێو ئاگـادارە، ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ واتـە: کاروبارەکانـی ڕابـردوو داهاتـوو، ئـەوان لـە زانیاریـی ئـەو دەرناچـن، وەکـو چـۆن لـە فەرمـانو بەڕێوەبردنیـدا دەرناچـن.

لـە وردەکاری وەسـف کردنیـان، پێشـی ناکـەون بـە گوفتـار، ئـەوان تـکا بـۆ هیـچ کەسێک ناکـەن، مەگـەر خـوا ﷻ ڕازی بـێ تـکای بـۆ بکـرێ، ئنجا تـکای بـۆ دەکەن، بـەڵام خـوا ﷻ ڕازی نیـە بـە هیـچ گوفتـارو کردارێـک مەگـەر بـۆ ئـەو بێـتو، بـە پێـی شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر ﷺ بێـت، ئـەم دەقـە لـە بەڵگەکانی چەسـپاندنی شـەفاعەتو تکاکردنـە، بێگومـان فریشـتەکان تـکا دەکـەن، ﴿ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴾ واتـە: زۆر دەترسـن، ملکـەچ بـوون بـۆ گەورەیـی ئـەو، ڕوومـەتو ڕووخسـاریان ملکەچـی عیـززەتو جوانـی خـوا ﷻ دەبێـت، دیـار خـوا ڕوونـی کـردەوە بێگومـان ئـەوان مافـی ئەوەیـان نیـە بپەرسـترێن، وە شایسـتەی هیـچ شـتێک نیـن لـە بەندایەتـی بـەوەی وەسـفی کـردوون لـەو سـیفاتانەی کـە وادەخـوازێ، بەهەمـان شـێوە باسـی کـردوە ئـەوان هیـچ بەشـێکیان نیـە، تەنانـەت بـە وتنیـش، وە هـەرکام لەوانـە بڵـێ: ﴿ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ ﴾ لەسـەر شـێوەی فەرزبـوونو پلـەو پایەدانـان، ﴿ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ چ سـتەمێک لـەوە مەزنتـرە کـە بەندەیەکـی ناتـەواوی هـەژار لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، خـۆی بکاتـە هاوبەشـی خـوا ﷻ لـە پەرسـتراوێتیو پەروەردگارێتـی؟

(٣٠): ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾:

(خـوای پەروەردگـار دەفەرمـوێ:) ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ﴾ ئایـا تەماشـا ناکـەن ئەوانـەی بێبڕواییان کـرد بـە پەروەردگاریـان، وە نکووڵـی دڵسـۆزییان بـۆی کـرد لـە بەندایەتیـدا، کـە بەڵگەیەکیـان نیشـان بـدات بـە چـاوی خۆیـان ببینـن، لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو

پەروەردگـاری بەخشـندەو پەرسـتراوە، جـا کاتـێ تەماشـای ئاسـمانەکانو زەوی دەکەن، دەبینـن یەکپارچەیـە، ئـەم ئاسـمانە نـە هـەوری تێدایـەو نـە بـاران، وە زەوی دەبینـی وشـکو بێگیانـە، گژوگیـای تێدانیـە، ئنجـا لـە یەکتـر جیامـان کـردەوە: ئاسـمان بـە بـارانو زەوی بـە ڕووەکـو گژووگیـا، ئایـا ئـەو کەسـەی هـەوری هێنـاوە بـوون لـە ئاسـماندا، پـاش ئـەوەی کـە کـەشو هـەوا ئاسـایی بـوو هیـچ پەڵەهەورێکـی پێـوە نەبـوو، وە ئـاوی بـە لەززەتـی خسـتوەتە ناویـەوە، پاشـان دەیگوازێتـەوە بـۆ لای وڵاتێکـی مـردوو، کـە وشـکایی تەپـوو تـۆز باڵـی بەسـەردا کێشـاوەو ئـاوی تیـادا نەمـاوە، جـا کاتـێ کـە خـوا ﷻ بارانـی بەسـەردا بارانـد، ڕووەکـی لـێ دێتـە دەرو بـەرزی دەکاتـەوە، وە دەیڕوێنـێ لـە هەمـوو جـۆرە گیـاو گوڵێکـی جـوان، بـە شـێوەی جیـاوازو سـوودی جـۆراو جـۆر، ئایـا ئـەوە بەڵگـە نیـە لەسـەر ئـەوەی کـە خـوا ﷻ ڕاسـتە، وە جگـە لـەو بەتاڵـە، وە ئـەو مـردوو زینـدوو دەکاتـەوە، بـە بەزەیـیو میهرەبانـە؟ لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتـە: بڕوایەکـی تـەواو کـە هیـچ گومـانو دوودڵـیو هاوبـەش دانانێکـی تێـدا نەبێـت.

(٣١-٣٣): ﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾﴾:

﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ واتـە: لـەو بەڵگانـەی لەسـەر هێـزو توانـاو تـەواویو تـاکو تەنهایـیو میهرەبانـی، ئەویـش ئەوەیـە کاتـێ زەوی جێگیـر نابـێ بـە کێـوەکان نەبـێ، کێوەکانـی وەکـو میـخ داکوتیـوە، بـۆ ئـەوەی جووڵـە نـەکات بەوانـەی بەسـەر پشـتیەوەن، چونکـە ئەگـەر بـەو شـێوە نەبێـت مرۆڤـەکان ناتوانـن لەسـەری پشـوو بـدەن، هەروەهـا کشـتوکاڵو کاری ڕۆژانەیـان بـۆ ناکـرێ، جـا بـە کێـوەکان جێگیـری کـردوە، بـەو هۆیـەوە بەرژەوەنـدیو سـوودو قازانجـەکان بەدەسـت دێـن، کـە کێـوەکان هەندێکیـان بـە هەندێکـی تریانـەوە پەیوەسـتن، پەیوەسـت بوونێکـی تـەواو و تۆکمـە، ئەگـەر کێوەکان بـە بـەرزی بمانایانـەوە ئـەوە پەیوەنـدی لـە نێـوان مرۆڤـەکان لـە شـارێکەوە بـۆ شـارێکی تـر دەپچـڕا.

جـا لـە حیکمـەتو میهرەبانـی خـوا ﷻ ئەوەیـە کێوەکانـی کردۆتـە ڕێڕەوێکـی ئاسـان

تـا مرۆڤـەکان بتوانـن بەسـەریدا تێپـەڕن لـە وڵاتێکـەوە بـۆ وڵاتێکـی تـر، وە لەبـەر ئـەوەی تیایـدا ڕابمێنـنو بیـر بکەنـەوە لـە تـاکو تەنهایی خـوای منەتـکار ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا ﴾ بـۆ ئـەو زەویـەی کـە ئێـوە لـە سـەری دەژیـن ﴿ مَّحْفُوظًا ﴾ سـەقفێکی پارێـزراوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ﴿٤١﴾ ﴾ فاطر، (واتـە: بـە ڕاسـتی خـوا ﷻ ئاسـمانەکانو زەوی ڕاگیـر دەکات بـۆ ئـەوەی لـە ڕێـڕەوی خۆیـان لانـەدەن) بـە هەمـان شـێوە پارێـزراوە لـە گوێڕاخسـتنی شـەیتانەکان بـۆ بیسـتن.

﴿ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴾ واتـە: غافـڵو بێئاگـان، ئەمـە گشـتگیرە بـۆ هەمـوو ئایـەتو نیشـانەکانی ئاسـمان، لـە بـەرزیو بەرفراوانـیو مەزنـیو جوانـیو وردبینـی سەرسـوڕهێنەری، وە جگـە لـەوەش لەوانـەی کـە تیایدایـە لـە ئەسـتێرەکانو خـۆرو مانگـی ڕووناککـەرەوە کـە ڕۆژو شـەو بـە هـۆی ئەوانـەوە لـە دایـک دەبـێ، هەردووکیـان بـە بەردەوامـی لـە خولگـەی خۆیانـدا دەسـوڕێنەوە، بـە هەمـان شـێوە ئەسـتێرەکانیش، جـا بـەو هۆیـەوە سـوودی بەنـدەکان بەدەسـت دێـت لـە گەرمـاو سـەرماو وەرزەکان، وە بـە هۆیـەوە دەزانـن ژماردنـی عیبـادەتو مامەڵەکانیـان، لـە شـەواندا پشـوو دەدەنو لـە ڕۆژیشـدا بڵاودەبنـەوە بـۆ سـەر کاروبارەکانیـان، هەمـوو ئەمانـە ئەگـەر کەسـێکی ژیـرو عاقـڵ بیـری لێبکاتـەوەو تێیـدا ڕابمێنـێ بێگومـان بـۆی دەردەکـەوێ خـوا ﷻ داینـاون بـۆ کاتێکی دیاریکـراو، مرۆڤـەکان سـوودو بەرژەوەندی خۆیانـی تێـدا بەدەسـت دێنـن، پاشـان دوای ئەمـە نامێنـێو پـەرشو بـڵاو دەبێتـەوە، لـە نـاوی دەبـات ئـەو کەسـەی کـە هێناویەتیـە بـوون، وە دەیوەسـتێنێ ئـەو کەسـەی کـە جوولـەی پێکـردوە، خەڵکـی دەگوازرێنـەوە لـە ماڵێکـەوە بـۆ ماڵێکـی تـر، لـەوێ پاداشـتی کردەوەکانـی خۆیـان بـە تـەواوی دەبینـن، وە دەزانـرێ مەبەسـت لـەم ماڵـە کـە دونیایـە بـۆ ئەوەیـە ببێتـە کێڵگـەی دواڕۆژ، ئـەم دونیایـە جێگـای گەشـتو سـەفەرە، نـەک شـوێنی مانـەوە.

(٣٤-٣٥): ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

کاتـێ کـە دوژمنانـی پێغەمبـەر ﷺ دەیانـوت شـاعیرەو چاوەڕوانـی مردنـی دەکەیـن، خـوا ﷻ فەرمـووی: ئەمـە ڕێگـای هەمووانـە، بڕیارمـان نـەداوە بـۆ هیـچ کەسـێک ﴿ مِّن قَبْلِكَ ﴾ ئـەی موحەممـەد ﴿ ٱلْخُلْدَ ﴾ مانـەوەی هەمیشـەیی لـە دونیـادا، ئەگـەر

مردیــت ڕێگــای هاوشــێوەی تــۆ لــە پێغەمبــەرانو پیــاو چــاکان هــەر بــەو شــێوەیە بووە ئەوانیــش مــردوون ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ﴾ ئایــا ئەگــەر مردیــت ژیانــی ئــەوان بــەردەوام دەبێــت دوای تــۆ، دەی بــا هــەوڵ بــدەن ئــەوان بمێننــەوە ئەگــەر دەکــرێ، نەخێــر بــەو شــێوەیە نیــە، بەڵکــو هەمــوو دەبێــت لــە ناوبچــن، بۆیــە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ﴾ ئەمــە هەمــوو نەفســی بەدیهێنــراوەکان دەگرێتــەوە، بەراســتی ئەمــە پەرداخێکــی ئــاوە هەمــوو دەبــێ بیخۆنــەوە، ئەگەرچــی درێــژەش بخایەنــێ، وە چەندیــن ســاڵ تەمــەن بــکات، بــەڵام خــوا ﷻ بەندەکانــی بەدیهێنــاوە لــە دونیــادا فەرمانــی پێکــردوونو قەدەغــەی لێکــردوون، وە تاقیکردوونەتــەوە بە خێرو شــەڕ، بــە دەوڵەمەندیو هــەژاری، بــە زەلیلــیو ســەربەرزی، بــە ژیــانو مــردن، هەمــوو ئەمانــە بــەڵاو فیتنەیەکن لــە لایــەن ئــەوەوە تــا تاقیــان بکاتــەوە، کــێ لــەوان کــردەوەی چــاک ئەنجــام ئــەدات، وە کێــش هەڵدەخلیســکێو تووشــی فیتنــە دەبــێ، وە کێــش ڕزگــاری دەبــێ، ﴿وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ﴾ واتــە: پاداشــتان دەدەینــەوە بــە پێــی کردەوەکانتــان ئەگــەر خێــر بــوو بــە خێــر، وە ئەگــەر شــەڕ بــوو بــە شــەڕ، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ۝٤٦﴾ فصلت، (واتــە: پەروەردگــاری تــۆ ئــەی موحەممــەد) ســتەمکار نیــە بەرانبــەر بــە بەندەکانــی، ئــەم دەقــە بەڵگەیــە لەســەر بەتاڵــی قســەی ئــەوەی کــە دەڵێ خضر مــاوە، ئــەو بــۆ هەتــا هەتایــی لە دونیــادا دەمێنێتــەوە، بێگومــان ئــەو قســەیە هیــچ بەڵگەیەکــی لەســەر نیــەو پێچەوانــەی بەڵگــە شــەرعیەکانە.


وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا
ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ هُمۡ
كَـٰفِرُونَ ٣٦ خُلِقَ ٱلۡإِنسَـٰنُ مِنۡ عَجَلٖ سَأُوْرِيكُمۡ
ءَايَـٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ٣٧ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡوَعۡدُ
إِن كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ ٣٨ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ
لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا
هُمۡ يُنصَرُونَ ٣٩ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا
يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ٤٠ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ
بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ
بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٤١ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ
مِنَ ٱلرَّحۡمَـٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ٤٢
أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ
أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ٤٣ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَـٰٓؤُلَآءِ
وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي
ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَـٰلِبُونَ ٤٤

(٣٦-٤١): ﴿ وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِي
يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ
هُمۡ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَـٰنُ مِنۡ
عَجَلٖ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَـٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ
﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن
كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ
ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ
﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا
يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ
﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ
فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ
يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾ ئەمەش لە توونـدی بێبڕوایانەوەیە، بێگومان هاوبەشدانەران ئەگەر پێغەمبەری خوایان ببینایە گاڵتەیان پێ دەکرد، وە دەیانوت: ﴿ أَهَـٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ ﴾ واتە: ئا ئەم بە کەم زانراوە -بە بۆچوونی خۆیان- جنێو بە پەرستراوەکانتان دەداتو زەمیان دەکات، واتە: بە بای خەیاڵتاندا نەیەتو ڕێزی لێ مەگرن.

ئەمە گاڵتە پێکردنو بە کەم زانینی ئەوان بوو بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەوە لە تەواوی ئەوە، بەڕاستی ئەو تەواوەو چاکترینە کە لە چاکەکانی دڵسۆزی بەندایەتی کردنیەتی بۆ خوا ﷻ، وە سەرزەنشت کردنی هەموو ئەوانە جگە لە خوا ﷻ دەپەرسترێن، وە باسی شوێنو پلەو پایەیەتی، بەڵام ئەو بێبڕوایانەن کە شایستەی گاڵتەو گاڵتە پێکردنن، ئەوانەی کە هەموو ڕەوشتێکی خراپو نابەجێیان لە خۆیاندا کۆکردووەتەوە، کوفر کردنیان بەرانبەر بە پەروەردگارو ئینکاری کردنیان بەرانبەر پێغەمبەرەکانیان، خواش کردنی بە بێ قیمەتترینو نزمترین بەدیهێنراوەکانی خۆی، چونکە کاتێ کە باسی ڕەحمان دەکرا ئەوان بێبڕواییان پێ دەکردو، زیکریان نەدەکردو بڕوایان پێی

نەبــوو، ســەرەڕای ئــەوەش کــە هاوەڵیان بــۆی دادەنا، زیکر کردنەکەشیان کوفرو شــیرک بــوو، جــا دەبــێ کارەکانی تریــان چۆن بــێ؟ بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾

لــە باســکردنی نــاوی پیــرۆزی ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾لێــرەدا، ڕوونکردنەوەیــە بــە ناشــرینی حاڵیان، ئــەوان چــۆن لــە بەرانبەر چاکــەی ڕەحمانــدا کوفــرو شــیرکیان بڕیــاردا، لە کاتێکــدا ئەو هەمــوو نــازو نیعمەتەکانی ڕشــتووە بەســەریانداو ڕێگری لــە نارەحەتیەکان کــردوە، ئەوەی لــە دەســتی بەندەکاندایــە لــە لایــەن ئەوەوەیــە، تەنهــا ئــەو دەتوانــێ خراپەیان لێ بــە دوور بخات.

﴿ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖ ﴾واتــە: پەلە کــەرە، دەسپێشــخەری لــە شــتەکان دەکات‌و پەلە لە ڕوودانیانــدا دەکات، بــڕواداران پەلــە دەکــەن خــوا ﷻ بــە زوویی ســزای بێبڕوایــان بدات، بێبڕواکانیــش پشــتی تێدەکــەن‌و پەلــەی ســزا دەکــەن، بــە بەدرۆخســتنەوەو سەرکەشــی‌و کەللەڕەقیــەوە دەڵێــن: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ خــوا ﷻ مۆڵەت دەداو بێئاگــا نابێ، لەســەرخۆیەو کاتێکــی دیاریکراوی بۆ دانــاون ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤ ﴾الأعــراف، (واتــە: ئەگــەر کاتــی مردنیــان هــات، نــە ســاتێ دوادەکــەوێ‌و نە ســاتێ پێــش دەکــەوێ)، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي ﴾واتە: تۆڵــە دەکەینەوە لــەوەی بێبڕوایی‌و ســەرپێچی کــردوە، ﴿ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴾واتە: پەلەی ئەوە مەکەن، بە هەمان شــێوە بێبڕوایــان دەڵێن: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ ئــەم قســەیانە بە سەرکەشــی‌و لــووت بەرزیەوە وتوە، ئەی بۆچی ســزایان لەســەر پێویســت نەدەبــوو و بۆیــان دانەدەبــەزی، جــا ﴿ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ ئــەو حاڵەتــە ناخۆشــەیان ﴿ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ ﴾ کــە ئاگــر لــە هەمــوو لایەکــەوە دەوری داون ﴿ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴾واتــە: هیــچ کەس ناتوانێ ســەریان بخات‌و یارمەتیــان بــدات ﴿ بَلۡ تَأۡتِيهِم ﴾ئاگــر ﴿ بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ ﴾لە ناکاودا سەرســامیان دەکاو تووشــی ترس‌و شــۆکێکی مــەزن دەبــن ﴿ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا ﴾چونکە ئەوان زەلیلــن، لــەوەش لاوازتــرن کــە ئــەو ســزایە ڕەت بکەنــەوە ﴿ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾ واتــە: مۆڵەتیــان پێنــادرێ ســزایان بۆ دوابخرێ، ئەگــەر ئەوان بە ڕاســتی ئەم حاڵەتەیــان زانیبووایە، هەرگیــز پەلەیــان نەدەکرد لە ســزاداندا، وە لێی دەترســان بە توندترین ترســان، بەڵام کاتێ کــە ئــەم زانســتەیان لــە لانەماو ڕۆیــی هەرگیز ئــەو وتەیــان نەئــەوت، کاتێ کــە گاڵتەیان

بـە پێغەمبەرەکەیـان کـردو وتیـان: ﴿ أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ ﴾ واتـە: پرسـیاری لێبکـەن بەوەی ئەمە پێشـەی ئوممەتەکانی پێشـوو بووە لەگـەڵ پێغەمبەرەکانیاندا، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم ﴾ واتە: دەوری دانو سـزای بـۆ دابەزانـدن ﴿ مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ واتە: سـزایان بـۆ دابەزی، هەمـوو هۆکارەکانیـان لێدابـڕا، دەی بـا ئاگاداربـن ئـا ئەوانـە لەوەی تووشـیان ببـێ وەکو چـۆن تووشـی بـە درۆدانـەران (پێش خۆیـان) بوو.

(٤٢-٤٤): ﴿ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ باسـی بێتوانایـی ئەوانە دەکات کـە جگە لە خوا ﷻ شـتێکی دیکە دەپەرسـتن، بە ڕاسـتی ئەوانـە پێویسـتیەکی بێ ئەندازەیـان هەیە بە پەروەردگـاری میهرەبان، کـە بەزەییو میهرەبانـی ئـەو چـاکو خراپـی گرتۆتـەوە لـە شـەوگارو ڕۆژەکانـدا، جـا فەرموویەتـی: ﴿ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم ﴾ واتـە: کـێ دەتوانـێ پاسـەوانیتان بـکاو بتانپارێـزێ ﴿ بِٱلَّيۡلِ ﴾ کاتـێ کـە ئێـوە خەوتـوون لەسـەر جێگاکانتـانو هەمـوو هەسـتەوەرەکانتان ڕۆشـتووە، ﴿ وَٱلنَّهَارِ ﴾ لـە کاتـی بڵاوبوونـەوەو بـێ ئاگاییتانـدا ﴿ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ واتـە: ئایـا جگـە لـەو کەسـێکی تـر هەیـە بتانپارێـزێ؟ بێگومان جگە لـە ئەو هیـچ پارێزەرێـک نیە ﴿ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴾ ئـا لەبـەر ئەمـە هاوبەشـیان بـۆی دادەنـا، ئەگەرنا، ئەگـەر ئـەوان ڕوویـان بکردایـە یـادی پەروەردگاریـانو ئامۆژگاریەکانیـان وەربگرتایە، ئـەوە بێگومـان هیدایـەت دەدران بـۆ ژیری، وە سـەرکەوتوو دەبـوون لـە کاروبارەکانیاندا ﴿ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَا ﴾ واتـە: ئەگـەر بمانـەوێ زیانیان پـێ بگەیەنین ئایا پەرسـتراوەکانی ئـەوان توانایان هەیـە بەرگریان لێبکەنو ئـەو زیانەیان لـێ دووربخەنەوە؟! ﴿ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴾ واتـە: لـە لایـەن ئێمـەوە پشـتیوانیان لێناکـرێ، وە ئەگەر لەلایەنـی خواوە پشـتیوانیان لێ نەکرا، ئەوە سەرشـۆڕ دەبن لـە کاروبارەکانیانـدا، نە دەتوانن سـوود بـە خۆیان بگەیەنـن، وە نە دەتوانن زیـان لە خۆیان دووربخەنەوە.

ئـەوەی پێویسـتی کـردوە لەسـەر بـەردەوام بوونیان لـە بێبڕوایـیو هاوبەش دانـان خوا ﷻ

دەفەرموێ: ﴿ بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ﴾ واتە: ماڵو منداڵمان پێ بەخشیونو تەمەنمان درێژ کردوون، سەرقاڵ بوونە بە چێژ وەرگرتن لێیەوە، بێئاگا بوون لەوەی کە بۆچی دروستکراون، تا تەمەنی زۆریان بەسەر بردو دڵەکانیان ڕەق بوو و سنوورەکانیان بەزاند، وە لە بێبڕوایدا زیاتر ڕۆچوون، ئەگەر لایان بکردایەتەوە بەلای ڕاستیانەوە، وە بەلای چەپیانەوە لە زەوی، نەیاندەبینی تەنها گەلێکی لەناوچوو نەبێت، نەیان دەبیست دەنگی هاواری سزا نەبێت، وە هەستیان بە چەندین لە ناوچوونی یەک لە دوای یەک دەکرد، بە ڕاستی مردن لە هەموو ڕێگاکاندا دانراوە بۆ پێکانی دەروونە پیسەکان.

لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ﴾ واتە: بە مردنی خەڵکەکەی‌و لە ناوچوونیان قۆناغ بە قۆناغ، هەتا باشترینیان ببێتە میراتگری سەر زەوی، ئەگەر ئەوان ئەم حاڵەتەیان ببینایە لەخۆبایی نەدەبوون، بەردەوام نە دەبوون لەسەر ئەوەی لەسەری دەڕۆیشتن ﴿ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ ئەوانەی لە تواناياندایە دەربچن لە قەدەری خوا ﷻ؟ وە بە توانایان ڕێگریان بکردایە لە مردن؟ ئایا ئەمە وەسفیانە هەتا لەخۆبایی ببن بە مانەوەی درێژخایەن؟ یان کاتی نێردراوی پەروەردگاریان دێت بۆ کێشانی ڕووحەکانیان، زەلیل‌و ملکەچ دەبن، ناتوانن کەمترین بەرگری بکەن؟

قُلۡ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِۚ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا
مَا يُنذَرُونَ ٤٥ وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ
لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٤٦ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ
ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ
مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧
وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا
لِّلۡمُتَّقِينَ ٤٨ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ
مُشۡفِقُونَ ٤٩ وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُۚ أَفَأَنتُمۡ لَهُۥ
مُنكِرُونَ ٥٠ ۞وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا
بِهِۦ عَٰلِمِينَ ٥١ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ
أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ٥٢ قَالُواْ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ٥٣ قَالَ
لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٥٤ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا
بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ٥٥ قَالَ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٥٦
وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ٥٧

(٤٥-٤٦): ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِۚ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ قُلۡ ﴾ ئەی موحەممەد ﷺ بە هەموو خەڵکی بڵێ: ﴿ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِ ﴾ واتە: بێگومان من پێغەمبەرم، لای خۆمەوە هیچ شتێکتان بۆ ناهێنم، گەنجینەی خوا ﷻ لە لای من نیە، لە غەیبو پەنهان نازانمو ناڵێم من فریشتەم، بەڵکو بێدارتان دەکەمەوە بەوەی خوا ﷻ نیگای بۆ کردووم، جا ئەگەر ئێوە وەڵامی منتان دایەوە ئەوە وەڵامی خواتان داوەتەوە، وە پاداشتتان دەداتەوە لەسەر ئەوە، وە ئەگەر پشتتان تێکرد، ئەوە من هیچ شتێکم بەدەست نیە، بەڵام هەر چ کاروبارێکە تەنها لە لایەن خواوەیە، ﴿ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ ﴾ واتە: کەڕ هیچ نابیستێ، چونکە بیستنی فاسیدو تێکچووە، وە مەرجی بیستن لەگەڵ دەنگدایە، کە شوێنێ هەبێ شیاوی ئەوە بێت، بە هەمان شێوە نیگا هۆکارە بۆ ژیانی دڵو ڕووحەکانو تێگەیشتن لە خوا ﷻ، بەڵام ئەگەر دڵ شیاوی بیستنی ڕێنمایی نەبێت، ئەوە هیدایەتو ڕێنمایی بۆی وەکو کەڕ وایە بۆ بیستنی دەنگەکان، جا بتپەرستان کەڕن لە ئاستی هیدایەتدا، هیدایەت وەرنەگرتنیان شتێکی سەرسووڕهێنەر نیە بە تایبەت لەم حاڵەتەدا کە سزایان بۆ نەهاتوەو دووچاری هیچ نارەحەتیەک نەبوون، جا ئەگەر دووچاری ﴿ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ ﴾ واتە: ئەگەر بەشێکی کەمیش بێ، لە سزای خوا ﷻ کەم نیە، ﴿ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾ واتە: هیچ وتەیەکیان نەبوو، تەنها پارانەوە بە هاوارو تیاچوونو پەشیمان بوونەوە نەبێ، وە دانپێدانان بە ستەمو بێبڕواییانو شایستە بوونیان بە سزای خوا ﷻ.

(٤٧): ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی بڕیاری دادپەروەری خۆی لە نێوان بەندەکانیدا، کاتێ کۆیان دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا، بێگومان ئەو تەرازووی دادپەروەریان بۆ دادەنێ بۆ پێوانە کردنی چاکەو خراپەکانیان، کە مسقاڵە زەڕەیەکیش دەخوێنێتەوە، ﴿ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ ﴾بڕوادار بێ یان بێبڕوا، ﴿ شَيْـًٔا ﴾بەوەی لە چاکەکانی کەم بکرێتەوە، یان خراپەی بۆ زیاد بکرێ ﴿ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾کە بچوکترین شتو بێ نرخترینیانە لە خێرو شەڕ ﴿ أَتَيْنَا بِهَا ﴾ئێمە دەیهێنین تا پاداشتی خاوەنەکەی پێ بدرێتەوە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾الزلزلة، (واتە: هەر کەسێک بە قەد مسقاڵە زەڕەیەک چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە * وە هەر کەسێک بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەک خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە).

وە وتیان: ﴿ يَـٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَـٰذَا ٱلْكِتَـٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾ ﴾الكهف، (واتە: ئەی هاوار بۆ ئێمە ئەم نامەو دەفتەرە چیە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووکو گەورەی بە جێنەهێشتوەو تۆماری کردوە، هەر کردەوەیەکیان کردبێ تیایدا ئامادەیە).

﴿ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴾مانای ئەوەیە خوا ﷻ خۆی بژمێرێ، واتە: زانایە بە کردەوەی بەندەکانو دەیانپارێزێ، لە کتێبدا جێگیری دەکات، زانایە بە ئەندازەیانو بە ئەندازەی پاداشتو سزاو مافەکانیان، بۆ هەموو کەسێک پاداشتی خۆی پێدەگەیەنێ.

(٤٨-٤٩): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴾زۆرجار خوا ﷻ ئەم دوو کتێبە پیرۆزە پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئەو دووانەی کە جیهانی مرۆڤایەتی لەوان چاکترو مەزنترو بە بەرەکەت دارتری بۆ نەهاتووە، کە بریتین لە تەوراتو ئینجیل، هەواڵیداوە کە دایبەزاندووە بۆ مووساو هارونیش شوێنکەوتەی ئەوە ﴿ ٱلْفُرْقَانَ ﴾ئەویش

تەوراتـە، کـە جیاکـەرەوەی نێـوان هـەقو ناهـەقو هیدایـەتو گومڕاییـە، ئـەو کتێبـە پیـرۆزە ﴿ وَضِيَآءً ﴾ واتـە: ڕووناکیـە ڕێنمایـی پـێ وەردەگـرن ئەوانـەی خـوا ﷻ هیدایەتـی داون، وە حوکمەکانـی پێدەناسـرێو حـەڵاڵو حەرامـی پـێ جیادەکرێتـەوە، وە ڕووناکیـە لـە تاریکـی نەفامـیو بیدعـەو گومڕایـی ﴿ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ یـادی پێدەکەنـەوە ئـەوەی سـوودی هەیـە بۆیـانو زیانیـان لێـدەدا، وە یـادی خێـرو شـەڕی پێدەکرێتـەوە، لێـرەدا پارێزکارانـی تایبـەت کـردوە بـە یادکـردن، چونکـە ئـەوان سـوودی لێوەردەگـرن لـە زانسـتو کـردەوە، پاشـان پارێزکارانـی تەفسـیر کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتـە: لـە خـوا دەترسـن لـە کاتـی پەنهانیـدا، لەوکاتـەی کـە خەڵـک نایانبینـێ، جـا ئەگـەر خەڵکـی بیانبینـێ ئـەوە لـە پێشـترە، خۆیـان لـە حـەرام دەپارێـزنو فەرمانـەکان جێبەجـێ دەکـەن، ﴿ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ ﴾ واتـە: دەترسـنو دڵەکانیـان دەلـەرزێ چونکـە خـوا ﷻ دەناسـن، جـا چاکـەو ترسـیان پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، (عطـف) کـردن لێـرەدا لـە بەشـی (عطـف) ی سـیفاتە جیـاوازەکان، کـە هاتـووە دەربـارەی یـەک شـت، وە وەسـف کراویـش تاکـە.

(٥٠): ﴿ وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُۚ أَفَأَنتُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٥٠ ﴾:

﴿ وَهَٰذَا ﴾ واتـە: قورئـان ﴿ ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ ﴾ (واتـە: یادخەرەوەیەکـی بـە فـەڕو پیـرۆزە) وەسـفی کـردوە بـە دوو وەسـفی گـەورە، بوونـی بـە یادکردنـەوە یـادی پێبکرێتـەوە لـە هەمـوو کاتەکانـدا، لـە ناسـینی خـوا ﷻ بەنـاوو سـیفاتو کردەوەکانـی، وە لـە سـیفاتی پێغەمبـەرانو پیاوچـاکانو بارودۆخیـان، وە لـە ئەحکامەکانـی شـەرع لـە عیبـاداتو کڕیـنو فرۆشـتنو جگـە لەوانـەش، وە لـە ئەحکامەکانـی پاداشـتو بەهەشـتو دۆزەخ، جـا یـادی پێدەکرێتـەوە لـە بابەتـەکانو بەڵگـە عەقڵـیو بیسـتراوەکان، خـوا ﷻ نـاوی نـاوە بـە یادخـەرەوە، چونکـە یـادی ئـەوە دەکاتـەوە کـە خـوا ﷻ لـە عەقـڵو پاکیـدا چەسـپاندوویەتی، لـە بەڕاسـتدانانی هەواڵـە ڕاسـتەکانو فەرمانکـردن بـەوەی چاکـە لـە ڕووی عەقڵـەوەو قەدەغەکردنـی ئـەوەی خراپـە بـە عەقـڵ، وە بوونـی ﴿ مُّبَارَكٌ ﴾ (واتـە: بـە فـەڕو پیـرۆزە) زۆربـەی خێـرو چاکـەکان لـە خـۆ دەگـرێ، زیادکـردنو گەشـەکردنیش، هیـچ شـتێ ئەوەنـدەی ئـەم قورئانـە بەفـەڕو بەرەکـەت نیـە، بێگومـان هەمـوو خێـرو نیعمەتێـک، وە زیـادەی دینـی یـان دونیایـی یـان دواڕۆژ بـە هـۆی

ئەوەوەیـە، جـا ئەگـەر موبـارەکو بەفـەڕ بـوو، پێویسـتە وەربگیـرێ بـە قبوولکـردنو ملکەچـیو تەسـلیم بـوون، وە سوپاسـکردنی خـوا ﷻ لەسـەر ئـەم خەلاتـە پیـرۆزەو بەجێهێنانـیو دەرهێنانـی بەرەکەتەکـەی بەفێربوونـی مانـاو واتاکانـی، بـەلام هەسـتان بـە پێچەوانـەی ئـەم حاڵەتـە، لـە پشـت تێکـردنو کەنارگیرخسـتنیو نکوولـی کردنـیو بڕوانەبـوون پێـی، ئەمـە لـە مەزنتریـن کوفـرو توندتریـن نەفامـیو سـتەمە، لەبـەر ئـەوە خـوا ﷻ نکوولـی کـردوە لەسـەر ئـەوەی نکوولـی لێـدەکات، جـا فەرموویەتـی:

﴿ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾

(٥١-٦٦): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ
مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ
أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ
رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ
أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ
﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ
إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا
بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ
﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ
عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ
شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ ﴾

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی مووسـاو موحەممـەدی کـرد (علیهمـا السـلام)، وە باسـی کتێبەکەیانـی کـرد، فەرمـووی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ ﴾ واتـە: لـە پێـش ناردنـی مووسـاو موحەممـەدو دابەزاندنـی کتێبەکەیـان، خـوای گـەورە نیشـانی ئیبراهیمـی دا دەسـەلاتو خاوەنێتـی خـۆی بـۆ ئاسـمانەکانو زەوی، وە ڕوشـدو ڕێنماییو شـارەزایی پێبەخشـی بـۆ ئـەوەی خـۆی پـێ تـەواو بـکاتو بانگـی خەڵکـی بـۆ لای بـکات، بـە هیـچ کەسـێک لـە جیهانـدا نەبەخشـراوە جگـە لـە موحەممـەد ﷺ نەبـێ، وە ڕوشـدی داوەتـە پاڵـی، چونکـە ژیـرو شـارەزابوو بـە پێـی بـارودۆخو پلـەو پایـەی، بێگومـان هەمـوو بڕوادارێـک ڕوشـدی پێـدراوە بـە ئـەو بڕوایـەی هەیەتـی ﴿ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴾ واتـە: ڕوشـدو ژیریمـان پێـداو تایبەتمـان کـرد بـە پەیـامو پلـەی (الخلة)

بەوپــەڕی خۆشەویســتی هەڵمانبــژارد لــە دونیــاو دوارۆژدا، چونکــە دەمانزانــی ئــەو شــیاوی ئەوەیــەو پــڕ بــە پێســتی ئــەوە، لەبــەر پاکــیو بیــر تیــژی، بۆیــە بەڵگــەی بــۆ گەلەکــەی هێنایــەوەو قەدەغــەی کــردن لــە هاوبــەش دانــانو بتەکانیانــی شــکاندو ناچــاری کــرد بــە بەڵگــە.

جــا فەرمــووی: ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ﴾ ئــەو بتانــەی کــە داتــان تاشــیوە بــە دەســتی خۆتــانو لەســەر وێنــەی هەنــدێ لــە بەدیهێنــراوەکان ﴿ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴾ بەلایانــەوە ماونەتــەوەو دەیانپەرســتنو پەیوەســت بــوون پێیانــەوە، ئەمــە چیــە؟ چــی فــەزڵو چاکەیەکــی هەیــە؟ ئــەی کــوا عەقڵتــان بــۆ کــوێ ڕۆشــتووە کــە کاتەکانتــان بــە بەندایەتــی کردنــی ئەمانــە بەســەر بــردوە؟ لــە کاتێکــدا ئێــوە بە دەســتی خۆتــان هەڵتــان کۆڵیــون، ئەمــە جێگــای سەرســوڕمانە، بەندایەتــی شــتێک دەکــەن بــە دەســتەکانی خۆتــان هەڵیدەکۆڵــن؟! وەڵامیــان دایــەوە بەبــێ بەڵگــە، وەڵامێکــی بێهێــز کــە هیــچ گومانــێ لــە خۆناگــرێ، وتیــان: ﴿ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا ﴾ بــاوکو باپیرانمــان بینــی کــە وایــان دەکــرد بۆیــە ڕێگــای ئەوانمــان گرتەبــەرو شــوێنیان کەوتیــن لــە عیبــادەت کردنــدا.

بێگومــان زانــراوە کــردەوەی هیــچ کەســێک لــە بەدیهێنــراوەکان جگــە لــە پێغەمبــەران نابێتــە بەڵگــە، وە دروســت نیــە بکرێتــە سەرمەشــق بــە تایبــەت لــە بنەماکانــی ئایــنو یەکتاپەرســتی پەروەردگــاری جیهانییــان، لەبــەر ئەمــە ئیبراهیــم عليه السلام پێــی وتــن: ﴿ قَالَ لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ واتــە: گومڕاییەکــی ڕوونو ئاشــکرا، چ گومڕاییــەک لــەوە گەورەتــرە هاوبــەش دابنێــنو واز لــە یەکتاپەرســتی بهێنــن؟ جــا ئــەوەی وتتــان شایســتەی ئــەوە نیــە دەســتی پێــوە بگیــرێ، ئێــوە هەمووتــان پێکــەوە لــە گومڕاییــدان ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ واتــە: بەســەر ســوورمانەوە لەســەر قســەکەیو بەگــەورە دانانــی ئــەوەی وتوویەتــی چــۆن دەستپێشــخەریی کــردوە بــە گێــڵو گەمژەدانانــی بــاوو باپیرانیــان.

﴿ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴾ واتــە: ئــەو قســەی کــە تــۆ کردووتــەو ئــەوەی بۆت هێناویــن ئایــا ئــەوە ڕاســتە؟ یان قســەکانی تــۆ بــۆ ئێمــە گاڵتەپێکردنــە، وەک کەســێک نازانــێ چــی دەڵــێ؟ وە ئەمــەی کــە ئــەوان دەیانــەوێ تەنهــا بەرپەرچدانەوەیــە لــە نێــوان دوو شــتدا، لەبــەر ئــەوە دایاننابــوو بــە پلەیەکــی زانــراو لای هەمــوو کەســێک، ئــەو

قسەی کە ئیبراهیم هێناویەتی قسەیەکی گەمژانەیەو نازانێ چی دەڵێ، ئیبراهیم وەڵامی دانەوە بە وەڵامێک حەقیقەتی گەمژەیی‌و کەم عەقڵیانی دەرخست، فەرمووی: ﴿ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ بەڵگەی عەقڵی‌و بەڵگەی بیستراو پێکەوە بۆیان کۆکردەوە، بەڵام بەڵگەی عەقڵی ئەوە بێگومان هەموو کەس دەزانێ تەنانەت ئەو کەسانەش کە ئیبراهیم مشتو مڕی لەگەڵدا کردن، ئەویش ئەوەیە خوا ﷻ تاکو تەنهایە بەدیهێنەری هەموو بەدیهێنراوەکانە، لە نەوەکانی ئادەم‌و فریشتەکان‌و جنۆکەو ئاژەڵەکان‌و ئاسمان‌و زەوی، ڕێکخەری هەموویانە بە جۆرەها ڕێکخستن، جا هەموو بەدیهێنراوێک لەسەر پاکیەو بەڕێوەبراوەو لە ژێر فەرماندایە، دەچێتە ئەم چوارچێوەی ئەوەوە هەموو ئەوانەی دەپەرسترێن جگە لە خوا ﷻ، ئایا دەگونجێ کەسێ خاوەن عەقڵ‌و ژیری بێ بەدیهێنراوێکی کارتێداکراو بپەرستێ، هیچ سوودو زیانێکی بەدەست نیە، وە نە مردن‌و نە ژیان‌و نە زیندووکردنەوەش، وە واز لە عیبادەتی بەدیهێنەری ڕزق‌و ڕۆزیدەری کاربەڕێخەر بهێنێ؟ بەڵام بەڵگەی بیستراو ئەوە لە پێغەمبەرانەوە وەرگیراوە، بەڕاستی ئەوەی هێناویانە پارێزراوەو هەڵەی تێدانیە، بە ناهەق هەواڵ نادەن، وە لە جۆرەکانی ئەم بەشە شایەتی یەکێکە لە پێغەمبەران لەسەر ئەوە، بۆیە ئیبراهیم عليه السلام فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم ﴾ واتە: خوا ﷻ تاکو تەنهاو پەرستراوە، وە بەندایەتی جگە لە ئەو بەتاڵە ﴿ مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ واتە: چ شایەتیەک لە پاش شایەتی خوا ﷻ لە شایەتی پێغەمبەران بەرزترە، بە تایبەت خۆڕاگرو بە هێزەکان لە ناویاندا خەلیلی ڕەحمان، کاتێ کە ڕوونی کردەوە بتەکانیان هیچ شتێکیان بەدەست نیە ویستی بە کردەوە بێهێزی‌و بێتواناییان بسەلمێنێ، بۆیە فەرمووی: ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم ﴾ واتە: پلان دادەنێم بە شکاندنی بتەکانتان، ﴿ بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ﴾ (دوای ئەوەی پشتان تێکردن) لە جەژنێک لە جەژنەکانتاندا، کاتێ بەجێیان هێشتن بە ئەسپاییەوە ئیبراهیم ڕۆی بۆ لایان،

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ
﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾
قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟
بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ
فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ
هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ
أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟
عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ
أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا
يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ
فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ
﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ
وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا
لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾

﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا﴾ واتـە: هەمـوو بتەکانـی شـکاندو وردی کـردن، ئـەو بتانە هەموویـان لـە ماڵێکـدا کۆکرابوونـەوە ئەویـش هەموویانی شـکاند ﴿إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ﴾ جگـە لـە بتـە گەورەکەیـان نەبـێ، لـە بـەر ئـەو مەبەسـتە وازی لێهێنـا کـە ئێسـتا ڕوونـی دەکەینـەوە، بیـر بکـەرەوە لـەم خۆپاراسـتنە سەرسـوورهێنەرە، بێگومـان هەمـوو بوغزێنراوێـک لـە لای خـوا ﷻ وشـەی (التعظیـم) بـە مـەزن دانانـی بـۆ بەکارناهێنـرێ، مەگـەر بـە دانە پاڵـی خاوەنەکانـی نەبـێ، هەروەکـو چۆن پێغەمبـەر ﷺ ئەگـەر نامـەی بناردایـە بـۆ دەسـەڵاتدارە بتپەرسـتەکانی سـەر زەوی دەیفەرمـوو: (إلى عظيـم الفـرس) وە (إلى عظيـم الـروم) وە هـاو وێنـەی ئەوانـە، نەیفەرمـوو (إلى العظيـم).

لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ﴾ نەیفەرموو: (كبيراً مـن أصنامهم) (گەورەیەک لـە بتەکان)، ئەمە پێویسـتە بیری لێ بکرێتەوە، خۆپاراسـتن لە بـە مەزندانانی ئەوەی خوا ﷻ بـێ نرخـی کـردوە، تەنهـا مەگـەر بدرێتە ئـەوەی بە گـەورە دایدەنـێ. وە کـە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾ واتـە: ئیبراهیـم وازی لـە شـکاندنی ئـەم بتـە هێنا، بـۆ ئەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ لایو گوێ بـۆ بەڵگەکەی بگـرنو ڕووی تێبکەنو پشـتی لێنەکـەن، لەبەر ئەمەیـە لـە کۆتاییـدا فەرموویەتـی: ﴿فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾، جـا کاتێ کـە بینیان چی بەسـەر بتەکانیانـدا هات لـە ئیهانەو سەرزەنشـت کـردنو ڕیسـوایی ﴿قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئیبراهیمیـان تۆمەتبـار کـرد بـە سـتەم کـردن، لـە کاتێکدا خۆیـان لـە پێشـتر بـوون بـە سـتەم، چونکـە نەیانزانـی شـکاندنی بتـەکان لـە کارە هەرە گەورەکانـی ئیبراهیمـە، وە لـە دادپـەروەریو یەکتاپەرسـتیەتی، بەڕاسـتی سـتەمکار ئـەو کەسـەیە بینـکات بـە پەرسـتراو، بـە چاوی خۆشـی دەبینـێ چیان بەسـەردا هـات ﴿قَالُوا۟

سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ ﴾ واتە: قسـەی پێدەوتن‌و سەرزەنشـتی دەکردن، هەرکەسـێ ئەمە حاڵی بێـت دەگونجێـت هەر ئەو شـکاندبێتی، یـان هەندێکیان گوێیـی لێبووە پلانی بۆیـان دادەنا، ﴿ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴾ کاتـێ بۆیـان دەرکەوت ئیبراهیم ﷺ ئـەو کارەی ئەنجامداوە ﴿ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ ﴾ واتـە: بـە ئیبراهیـم ﷺ ﴿ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ ﴾ واتـە: لـە پێـش چـاوی خەڵکی ﴿ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴾ واتـە: ئامادەبـن‌و بزانن کـێ پەرسـتراوەکانیانی شـکاندوە، ئەوەی ئیبراهیـم ﷺ دەیـەوێ‌و مەبەسـتیەتی ئەمەیـە، کە ڕوونکردنەوەی ڕاسـتی لـە پێش چاوی هەنـدێ لـە خەڵکـی بێ، تـا هەق ببینـن‌و ببێتە بەڵگـە بەسـەریانەوە، هەروەکو چۆن مووسـا فەرمـووی کاتـێ کـە پەیمانـی داوە فیرعـەون: ﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ۝٥٩ ﴾طـە، (واتە: مووسـا فەرمووی: کاتـی دیاریکراوتـان ڕۆژی خۆڕازاندنەوەیە، بە مەرجێـک لە کاتـی چێشـتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێنەوە)، جـا کاتێ خەڵکەکـە ئامادە بوون، وە ئیبراهیمیـش ئامـادە بـوو، وتیـان: ﴿ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا ﴾ واتە: ئەم شـکاندنە ﴿ بِـَٔالِهَتِنَا يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾ (واتـە: بـە پەرسـتراوەکانی ئێمە تـۆ کردووتە ئـەی ئیبراهیم؟) واتە چ شـتێ بوێـری کـردی، وە چی شـتێ وای لێکـردی کاری لەم جـۆرە بکەی؟ ئیبراهیمیـش لە پێش چـاوی خەڵکـی وتـی: ﴿ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا ﴾ واتـە: تـووڕە بوو شـکاندنی کاتـێ بینـی لەگەڵ ئەودا دەپەرسـترێن، وە ویسـتی بەندایەتـی تەنها بەندایەتـی خۆی بکرێ بـە تەنهـا، چونکە لـە هەموویـان گەورەترە.

ئـەم وتەیـە لـە ئیبراهیمـەوە مەبەسـتی ئـەوە بـووە دوژمـن‌و نەیارەکانـی ناچـار بـکات‌و بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بکات، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾ مەبەسـتی پێـی بتـە شـکێنراوەکان بـووە، پرسـیاریان لێبکەن بۆچی شـکێنراون؟ ئـەو بتەی کە نەشـکێنراوە، پرسـیاری لـێ بکەن بۆچی شـکاندی؟ ئەگەر ئەوان قسـە بکـەن وەڵامتان ئەدەنـەوە، وە مـن‌و ئێـوەش، وە هەمـوو کەسـێک دەزانـی ئەوانـە قسـە ناکەن، نە سـودیان هەیـە نـە زیـان، بەڵکـو ناتوانێ خـۆی ڕزگار بـکات ئەگـەر تووشـی نارەحەتیـەک ببێت ﴿ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ واتـە: عەقڵیـان زاڵ بـوو بەسـەریانداو هاتنەوە هۆشـی خۆیان، زانیـان بەڕاسـتی گومـران لـە بەندایەتی کردنیـدا، وە دانیان پێدانا کە سـتەمکارو بتپەرسـتن ﴿ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ بـەو شـێوە مەبەسـتەکە بـە دەسـت هـات‌و بەڵگەیـان لەسـەر پێویسـت بـوو بـە دانپێدانانیانـدا کە ئەوەی ئـەوان لەسـەری دەڕۆن بەتـاڵ‌و پووچە، وە کردەوەکەیانیـش کوفرو سـتەمە.

بەڵام بەردەوام نەبوون لەسەر ئەم حاڵە، بەڵکو ﴿ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ ﴾ واتە: هەڵگەڕانەوەو جارێکی ترو گەڕانەوە بۆ سەرسەختیو گومڕایی، بە ئیبراهیمیان وت: ﴿ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴾ (واتە: بێگومان تۆ زانیوتە کە ئەو بتانە قسە ناکەن) چۆن گاڵتەو ئیهانەمان پێ دەکەیت، پێمان دەڵێی پرسیاری لێبکەن لە کاتێکدا خۆت باش دەزانیت ئەوانە قسە ناکەن؟ ئیبراهیم سەرکۆنەی کردنو بە ئاشکرا هاوبەش دانانەکەیانی لە پێش چاو هەموو خەڵکی ئاشکرا کرد، وە روونی کردەوە پەرستراوەکانیان شایستەی بەندایەتی بۆ کردن نیەو فەرمووی: ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴾ نە سوودی هەیە نە ڕەتکردنەوە.

(٦٧-٦٩): ﴿ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾:

﴿ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: چی وای لێکردوون ئەوەندە گومڕاو دوڕاو بن! ئای چەندە بێ نرخن، ئێوەو ئەوانەش دەیانپەرستن بێجگە لە خوا ﷻ ئەگەر ئێوە عاقڵن ئەم حاڵە دەزانن، جا کاتێ عەقڵتان لە دەستداو شوێنی نەفامیو گومڕایی کەوتن، واتان لێ هات ئاژەڵ زۆر لە ئێوە چاکتر بێت.

جا ئەوکات هیچ سوودێکیان لێوەرنەگرتو بەڵگەشیان نەهێنایەوە، هێزیان بەکارهێنا بۆ سزادانی، جا ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴾ واتە: بە خراپترین شێوە بیکوژنو لە ناوی ببەن، بیسوتێنن لە پێناو پەرستراوەکانتانداو سەریان بخەن، دەک دابوەشێن بە چەندین جار کە بتێک دەپەرستن، خۆیان دانیان پێدانا پێویستی بەوەیە سەریبخەن، خوا ﷻ خۆشەویستەکەی سەرخست کاتێ فڕەیان داوە ناو ئاگر، بە ئاگرەکەی فەرموو: ﴿ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ جا ئیبراهیم ساردبوەوەو بێ زیان بوو، تووشی هیچ ئازارێک نەبوو، وە هەستیشی بە ناخۆشی نەکرد.

(٧٠): ﴿ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾:

﴿ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا ﴾ بە ڕادەیەک سووربوون لەسەر سوتاندنی ﴿ فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴾ واتە: (کردمانن بە زەرەر مەندترین) لە دونیاو دوارۆژدا، وەکو چۆن خوا ﷻ ئیبراهیمو شوێنکەوتووانی سەرخست.

(٧١): ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ ﴾:

﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا ﴾ بەو شێوە گەلەکەی بڕوایان پێنەهێنا جگە لە لووط عليه السلام

نەبێـت، وە وتـراوە: ئـەو بـرازای بووە، خـوا ﷻ ڕزگاری کـردووەو کۆچی کـردوە، ﴿إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ﴾ واتـە: وڵاتـی شـام، گەلەکـەی (بابل)یان چـۆڵ کرد لـە زەوی عیـراق، بـۆ شـام، وە فەرمـووی: ﴿وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾﴾ العنكبوت. (واتـە: مـن کـۆچ دەکـەم بـۆ لای پەروەردگارم بە ڕاسـتی تەنها ئـەو زاڵـی کار دروسـتە) لە فـەڕو بەرەکەتی شـام، زۆرێـک لـە پێغەمبەران لـە ناویدا بوونو تیایـدا ژیـاون، وە خـوا ﷻ هەڵبـژاردوە خۆشەویسـتەکەی کـۆچ بـکات بـۆ ئـەوێ، وە یەکێـک لـە سـێ ماڵـە پیرۆزەکـەی لەوێیە، ئەویـش (بیـت المقدس)ە.

(٧٢): ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾﴾:

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ﴾ کاتێـک کـە لـە قەومەکـەی دوور کەوتۆتـەوە، ﴿إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ کـوڕی ئیسـحاق ﴿نَافِلَةً﴾ پـاش ئـەوەی گـەورە بـوو، خێزانەکـەی نـەزۆک بـوو، جا فریشـتەکان مژدەیـان پێـدا بـە ئیسـحاق ﴿وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾﴾ هـود، (واتـە: لە پـاش ئیسـحاق (موژدەمـان پێـدا) بـە یەعقـوب)، یەعقوبیـش ئیسـرائیلە، کـە ئـەو نەتەوە مەزنـە لـەو بـوون، وە ئیسـماعیلی کـوڕی ئیبراهیـم کە لـە نەتـەوەی عەرەبە لەو بـووە، لە نەوەکانیشـی گـەورەی یەکەمیـنو دواینـە، ﴿وَكُلًّا﴾ لـە ئیبراهیـمو ئیسـحاقو یەعقوب ﴿جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ﴾ واتـە: هەسـتاون بـە مافەکانـی خـواو مافـی بەندەکانـی، وە لـە چاکبوونیـان خـوا ﷻ کردوونـی بـە پێشـەوا بـە فەرمانی ئـەو ڕێنمایـی دەکـەن، ئەمەش لەگەورەترینـی نیعمەتەکانـی خوایـە بەسـەر بەندەکەیـەوە کە بیـکات بە پێشـەواو خەڵکی ڕێنمایـی لـەوەوە وەربگـرنو بـە شـوێنیدا بـڕۆن، ئەویـش کاتێ کـە ئارامیان گـرتو بە ئایەتەکانـی دڵنیایـی تەواویـان هەبـوو. وە فەرمـوودەی خوا ﷻ:

وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ
ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ وَكَانُوا۟ لَنَا
عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ
ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ
فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ
وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ
إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾
فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا
مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾
وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ
فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ
إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾

**(٧٣):** ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾

﴿ يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾ واتە: خەڵكی هیدایەت ئەدەن بە ئاینی ئێمە، بە هەواو نەفسیان فەرمان ناكەن، بەڵكو بە فەرمانو ئاینی خواو شوێنكەوتنی ڕەزامەندی ئەو، بەندە نایێتە ئیمام هەتا بانگەواز بۆ لای دینی خوا نەكات، ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ كاریان پێدە كردو خەڵكیان بۆی بانگ دەكرد، ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو خێرەكان، لە مافەكانی خواو مافی بەندەكانی ﴿ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾ ئەمە لە بابەتی (عطف) ی تایبەتە لەسەر گشتی، لەبەر گەورەیی ئەم دوو عیبادەتەو فەزڵو چاكەیان، وە لەبەر ئەوە هەر كەسێك بەجێیان بهێنێت وەك چۆن فەرمانی پێكراوە، ئەوە ئاینەكەی بەجێهێناوە، ئەوەی لە بیریان بكات ئەوە جگە لەوانیشی لەبیر كردوە، چونكە نوێژ گەورەترین كردەوەیە، كە مافی خوایە تێدایە، وە زەكات باشترین كردەوەیە، كە چاكەی تێدایە بەرانبەر بەدیهێنراوەكان، ﴿ وَكَانُوا۟ لَنَا ﴾ واتە: نەك بۆ جگە لە ئێمە ﴿ عَٰبِدِينَ ﴾ واتە: بەردەوامن لەسەر بەندایەتی دڵو زمانو جەستە لە زۆربەی كاتەكانیاندا، جا شایستەی خۆیەتی بەندایەتی وەسفیان بێت، ئەمو وەسفەیان وەرگرتووە كە خوا ﷻ فەرمان بە بەدیهێنراوەكان دەكاتو لە پێناو ئەوەدا دروستی كردوون.

**(٧٤-٧٥):** ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت

﴿ تَّعۡمَلُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ ﴾ ئەمە پیاهەڵدانی خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی لووط ﷺ بە زانیاریی شەرعیو بڕیاردان لەناو خەڵکیدا بە دادپەروەری ڕاستی، بێگومان خوا ﷻ ناردی بۆ ناو گەلەکەی، بانگیان بکات بۆ بەندایەتی خواو قەدەغەیان لێ بکات لەو فاحیشەی کە لەسەر دەڕۆن، ئەویش لە ناویاندا مایەوە بانگی دەکردن، بەلام ئەوان وەلامیان نەدایەوە، خوا ﷻ ولاتیانی ژێروبان کردو هەموویانی سزادا، چونکە ئەوان ﴿ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَٰسِقِينَ ﴾ بانگەوازکاریان بەدرۆ داناو هەڕەشەی دەرکردنیان لێ کرد، خوا ﷻ لووطو گەلەکەی ڕزگار کرد، فەرمانی شەوڕۆییان پێ کردن، بۆ ئەوەی دوور بکەونەوە لە شارەکە، شەوڕۆییان کردو ڕزگاریان بوو، ئەوەش لە فەزڵو منەتی خوایە بەسەریانەوە.

﴿ وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآ ﴾ (لووطمان خستە ناو ڕەحمەتو میهرەبانی خۆمانەوە) ئەوەی بچێتە ناو میهرەبانی خواوە ئەوە پارێزراو دەبێ لە ترسو بیم، هەموو خێرو خۆشبەختیەکی دەست دەکەوێت، بە هۆی ئەوەی لە پیاوچاکانە، ئەوانەی کردارەکانیان چاک بووەو دۆخیان پاک بووەو خوا ﷻ خراپەیانی چاک کردوە، چاکبوون هۆکارە بۆ ئەوەی بەندە بچێتە ناو ڕەحمەتو بەزەیی خوا ﷻ، وەکو چۆن خراپە هۆکارە لە بێبەش بوون لە ڕەحمەتو خێرو چاکە، وە مەزنترینی چاکەخوازی ناو مرۆڤەکان پێغەمبەرانە، لەبەر ئەوە وەسفیان دەکات بە چاکە، سولیمان ﷺ دەڵێ: ﴿ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩ ﴾ النمل، (واتە: وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانت).

(٧٦-٧٧): ﴿ وَنُوحًا إِذۡ نَادَىٰ مِن قَبۡلُ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ٧٦ وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٧٧ ﴾:

یادی بەندەو پێغەمبەرمان نووح ﷺ بکەرەوە، بە وەسفو پیاهەڵدان، کاتێ خوا ﷻ ناردی بۆ لای گەلەکەی، لە ناویاندا مایەوە هەزار ساڵ جگە لە پەنجا ساڵ، بانگی دەکردن بۆ بەندایەتی خواو قەدەغەی دەکردن هاوبەشی بۆ دابنێن، بە ئاشکراو بە نهێنیو بە شەوو ڕۆژ.

کاتێ کە بینی ئامۆژگاریو سەرزەنشت کردنیان هیچ کەڵکو سوودێکی نیە بۆیان، بانگی پەروەردگاری کردو فەرمووی: ﴿ وَقَالَ نُوحٞ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ

ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرۡهُمۡ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرٗا كَفَّارٗا ﴿٢٧﴾ ﴾ نـوح، (واتـە: ئـەی پەروەردگـار هیـچ کەسـێک لـە بێبڕوایـان مەهێڵـە لەسـەر زەوی، چونکـە بێگومـان ئەگـەر وازیـان لێبێنـی بەندەکانـی تـۆ گومـڕا دەکـەن * وە هـەر منداڵـی تاوانبـاری سوپاسـنەکەر دەخەنـەوە)، خـوا ﷻ دوعاکـەی گیـرا کـرد، هەموویانـی خنکانـد، هیـچ کەسـێک لـە ئـەوان نەمایـەوە، خـوا ﷻ نـووحو کۆمەڵـە بڕوادارەکـەی لەنـاو کەشـتیەکدا ڕزگـار کـرد، وە نەوەکانـی بـۆ هەتـا هەتایـە هێشـتنەوە، سـەری خسـت بەسـەر گەلـە خـراپو گاڵتەجارەکەیـدا.

(٧٨-٨٢): ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ فَهَلۡ أَنتُمۡ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةٗ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ ﴾:

﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ ﴾ واتـە: یـادی ئـەو دوو پێغەمبـەرە بەخشـندەیە بکـەرەوە، داوودو سـولەیمان بەڕێـزو گـەورەوە تەماشـایان بکـە کـە خـوا ﷻ زانسـتێکی بەرفراوانـی پـێ بەخشـیبوو و لەگـەڵ دادوەری لـە نێـوان بەندەکانـدا، دەفەرمـوێ: ﴿ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ ﴾ واتـە: کاتـێ کـە خـاوەن کشـتوکاڵەکە دادوەری هێنـاوە لایـان کـە بە شـەو ئاژەڵـی کەسـانێکی تـر تێیـدا لەوەڕابـوون، لـە دارودرەختو کشـتووکاڵەکەیان خـوارد بـوو، داوود ﷺ دادوەری لـە نێوانیانـدا کـرد، بـەوەی کـە دەبـێ مەڕوماڵاتەکـە بدرێتـە خـاوەن کشـتووکاڵەکە، ئەمیـش بـە هـۆی ئـەوەی خاوەنی مەڕوماڵاتـەکان ڕۆچـوو بـوون لـەو کارە خراپـەدا، ئەویـش بـەو شـێوەیە سـزای دان، سـولەیمان دادپـەروەری لـە نێوانیانـدا کـرد، دادوەریەکـی چاکتـر، سـولەیمان وتـی: ئاژەڵـە زیـان خۆرەکـە بدرێتـە دەسـت خـاوەن کشـتوکاڵەکە، سـوودو کەڵـک لـە شـیرو بەرهەمـی وەربگـرێ، وە کشـتوکاڵەکەش بدرێتـە دەسـت خـاوەن ماڵاتەکـە، بەرووبومەکـەی بخـۆنو خزمەتـی بکـەن، تـا وەک پێـش زیـان لێکەوتنەکـەی لـێ دێتـەوە، لـەو کاتـەدا ئاژەڵەکـە بدرێتـەوە بـە خاوەنەکـەیو کشـتووکاڵەکەش بـۆ خاوەنەکـەی.

بـە ڕاسـتی ئەمـە لـە تـەواوی تێگەیشـتنو بیـر تیـژی سـولەیمان بـوو، لەبـەر ئەمەیـە

فەرموویەتی: ﴿ فَفَهَّمْنَـٰهَا سُلَيْمَـٰنَ ﴾واتە: ئەم دادوەریەمان تێگەیاند، ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە خوا ﷻ داوودی لە جگە لەوە تێنەگەیاندوە، بۆیە تایبەتی کردوە بە باسکردن بە بەڵگەی فەرموودەی: ﴿ وَكُلًّا ﴾هەریەک لە داوودو سولەیمان ﴿ ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دادوەر هەندێ جار راستی دەپێکێ‌و هەندێ جار هەڵە دەکات، ئەگەر هەڵەی کرد لۆمە ناکرێ بە مەرجێ هەموو تواناکانی لەو بوارەدا خستبێتە کار.

پاشان باسی ئەوەی کردوە کە تایبەتە بە هەر یەکێک لەوان، جا فەرموویەتی: ﴿ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ﴾چونکە داوود خواپەرسترین کەس بوو یادو زیکری خوا ﷻی زۆر زۆر دەکرد، خوا ﷻ دەنگێکی زۆر خۆشی پێبەخشی کە بە هیچ مرۆڤێکی نەبەخشیوە، جا ئەگەر زیکرو یادی خوای بکردایە کێوە کەرەکانو باڵندە لاڵەکان وەلامیان دەدایەوە، ئەمەش فەزڵو چاکەی خوایە لەسەری، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَكُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴾

﴿ وَعَلَّمْنَـٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ ﴾واتە: خوا ﷻ داوودی ﷺ فێری دروستکردنی پۆشاکی زرێی کرد، ئەو یەکەم کەس بوو دروستی کردو فێری بوو، لە دوای ئەو خەڵکی فێری ئەو پیشە بوون، خوا ﷻ ئاسنی بۆی نەرم کردو فێری کرد چۆن بەکاری دەهێنێت، چ سوودێکی زۆریشی تێدایە، ﴿ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ﴾ واتە: ئەوە پارێزەرە بۆ ئێوەو قەڵغانە لە کاتی جەنگو کوشتاردا، ﴿ فَهَلْ أَنتُمْ شَـٰكِرُونَ ﴾نیعمەتی خوا ﷻ بەسەرتانەوە، کە بۆی داناون لەسەر دەستی داوود ﷺ، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَـٰلًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَـٰنًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾النحل، (واتە: سازی داوە بۆتان جلو پۆشاکێک کە دەتانپارێزێ لە گەرما، هەروەها جلو پۆشاکێک لە کاتی جەنگدا دەتانپارێزێ، ئا بەو جۆرە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی تەواو دەکات بەسەرتانەوە، بۆ ئەوەی ملکەچو موسڵمان بن) دەگونجێ فێرکردنی خوا ﷻ بۆ داوود لە دروستکردنی پۆشاکی زرێ، وە نەرم کردنەوەی ئاسن شتێک بێ لە دەرەوەی نەریت، وەکو چۆن راڤەزانانی قورئان دەڵێن: خوا ﷻ ئاسنی بۆ نەرم کردوە هەتا وەکو هەویرو قوڕ بەکاری هێناوە، بەبێ ئەوەی بیخاتە بەر

ئاگـر، وە دەگونجێ فێـر کردنـی خـوا ﷻ بـۆ ئـەو بـە پێـی دابو نەریـت بـێ، وە نـەرم کردنـی ئاسـن بـۆی بـەوەی کـە خـوا ﷻ فێـری کـردوە، لـەو هۆکارانـەی کـە زانـراوە بـۆ نـەرم کردنـەوەی ئاسـن، ئەگـەر دروسـتکردنی لـەو کاروبارانـە نەبووایـە کـە خـوا ﷻ داینـاوە لـە توانـای بەندەکانـدا بـێ ئـەوە منەتـی نەدەکـرد بەسـەریانداو باسـی سـوودەکەی نەدەکـرد، چونکـە ئـەو زرێـەی داوود دروسـتی کـرد خـوا ﷻ تەنهـا مەبەسـتی ئـەوە نەبـوو، بەڵکـو منـەت بـە رەگـەزی (شـتەکە) دەکات، وە ئـەو گونجانـەی کـە راڤەزانـان باسـیان کـردوە هیـچ بەڵگەیەکـی لەسـەر نیـە، جگـە لـە وتـەی:﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ١٠ ﴾ سبأ، ئەمـە ئایێتـە بەڵگـە لەسـەر نـەرم کردنـەوەی بەبـێ هـۆکار، خـوا ﷻ زاناتـرە بـەوە.

﴿ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾ واتـە: رامـان هێنـا بـۆی﴿ عَاصِفَةٗ ﴾ واتـە: زۆر بـە پەلـە بـوو لـە رۆیشـتندا﴿ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ ﴾ واتـە: فەرمانـی ئـەوی جێبەجێدەکـرد، لـە بەیانیـان تـا نیوەرۆ مانگێـک رێگـا دەبـڕێ، وە نیـوەرۆ تـا ئێـوارە مانگێـک رێگـا دەبـڕێ﴿ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا ﴾ ئەویـش زەوی ولاتـی شـامە، کاتـێ کـە لـەوێ جێگیـر بـوو بەسـەر بـاوە دەرۆیشـت بـە خۆرهـەلاتو خۆرنشـیندا، وە گەرانـەوەو جێگـای بـۆ ئـەو ئـەرزە پیـرۆزە بـوو﴿ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ ﴾ بێگومـان بـە زانسـتمان دەوری هەمـوو شـتێکمان داوە، زانسـتمان بەخشـیە سـولەیمانو داوود تـا گەیاندمانـە ئـەو پلـەو پایـە کـە باسـمان کـرد.

وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ
ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ
رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾
فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ
وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ
﴿٨٤﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ
﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾
وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ
فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي
كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ
مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ
إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ
﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا
لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ
وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

(٨٢): ﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ ئەمەش بەهەمان شێوە لە تایبەتمەندیەکانی سولەیمانە عليه السلام، خوا ﷻ شەیتانو عفریتەکانی ڕامهێنا بۆی، وە دەسەڵاتی دا بەسەریانداو ژێرباری بوون، لەو کارانەدا کە لە توانایدا نەبوو زۆربەیان ئەنجام بدات، جا تیایاندا بوو دەچوونە ژێر دەریا تا گەوهەرو مرواری دەربێنن، وە جگە لەوەش، وە تیایاندا بوو هەرچی بویستایە بۆیان دەکرد لە ﴿مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ ﴿١٣﴾﴾سبأ. (واتە: پەرستگاو پەیکەرو چەندین قاپی (نان خواردن) وەک حەوزی گەورەو چەندین قازانو مەنجەڵی دامەزراو).

دەستەیەکیانی ڕام هێنا بۆ بونیاد نانی (بیت المقدس)، پاش ئەوەی کە مرد ئەوان لەسەر کارەکەی بوون، دوای ئەو یەک ساڵ مانەوە، هەتا زانیان کە مردوە، وەک بەم نزیکانە بە ویستی خوای بەرز باسی دەکەین ﴿وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ﴾ واتە: نەیاندەتوانی سەرپێچی بکەنو فەرمانی ڕەتبکەنەوە، بەڵکو خوا ﷻ بە تواناو عیززەتو دەسەڵاتی خۆی، ڕامیانی هێنابوو بۆی.

(٨٣-٨٤): ﴿وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾

﴿وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ واتە: یادی بەندەو پێغەمبەرمان ئەیوب عليه السلام بکەرەوە، کاتێ خوا ﷻ تووشی بەڵایەکی سەختو دژواری کردەوە، بینی ئارامگرەو پێی ڕازیە، بە شێوەیەک شەیتانی زاڵ کرد بەسەر جەستەیدا، وەک بەڵاو تاقیکردنەوەیەک لە لایەن خواوە، فووی کردە جەستەی تا ئاوسا ئنجا چڵکو پیسیەکی بێ ئەندازەی لێدەردەچوو بۆ ماوەیەکی زۆر، بەڵاو

نارەحەتی تەواو لەسەری tووندو بوو،ماڵو منداڵی مردو سەروەتەکەیشی نەما، ئنجا داوای لە پەروەردگاری کرد: پەروەردگارا ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (واتە: بە ڕاستی من دووچاری نەخۆشی ئازار بووم، تۆش میهرەبانترینی میهرەبانەکانی) پەنای برد بۆ خوا ﷻ دەربارەی حاڵی -بە ڕاستی حاڵی گەیشتە ئەوپەڕی خراپی- وە بە ڕەحمەتی بەرفراوانی پەروەردگاری، خوا ﷻ دوعاکەی لێوەرگرت، پێی فەرموو: ﴿ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾﴾ ص، (واتە: پێت بدە بە زەویدا ئەوە کانیاوێکی ساردە بۆ خۆشۆردنو خواردنەوە) پێیدا بە زەویدا، لە زەوی ئاوێکی زۆر سارد هاتە دەرەوە، خۆی پێ شۆردو ئاوی لێخواردەوە، خوا ﷻ ئەو نارەحەتیەی لەسەر لابرد ﴿وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ﴾ واتە: ماڵو منداڵەکانمان بۆ گەڕاندەوە، ﴿وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ بەوەی پێی بەخشی لە ماڵو منداڵێکی زۆر ﴿رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ (واتە: ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەت بوو لە ئێمەوە) بۆ ئەو، لەبەر ئەوەی ئارامیگرتو ڕازی بوو، خوای گەورە پاداشتی بە پەلەی دایەوە لە دونیاو دوارۆژدا، ﴿وَذِكْرَىٰ لِلْعَابِدِينَ﴾ واتە: ئامۆژگاریەک بۆ خواپەرستان، ئەوانەی سوودو کەڵک لە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن، ئەگەر تەماشای ئەو بەڵایە بکەن کە تووشی بوو، پاشان خوا چ پاداشتێکی دایەوە پاش لابردنی، وە تەماشای هۆکارەکەی بکەن، دەبینن ئارامگرتن بوو، بۆیە خوا ﷻ وەسفی دەکات لەسەر ئەوە وەک دەفەرموێ: ﴿إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِّعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾﴾ ص، (واتە: بە ڕاستی ئێمە ئەو ئەیوبەمان بە خۆڕاگر بینی، چ بەندەیەکی چاک بوو، بە ڕاستی ئەو زۆر گوێڕایەڵو ڕوو لە خوا بوو)، جا با بیکەنە پێشەنگ کاتێ کە تووشی بەڵاو ناخۆشی دەبن.

(٨٥-٨٦): ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٦﴾﴾:

﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ﴾ واتە: باسی بەندە هەڵبژێردراوو پێغەمبەرە نێردراوەکانمان بە چاکترین شێوە بکە، وە وەسفو ستایشیان بکە: ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم، ئیدریسو زەل کیفل، پێغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیل ﴿كُلٌّ﴾ هەموو ئەوانەی کە باسکرا، ﴿مِّنَ الصَّابِرِينَ﴾ ئارامگرتن بریتیە لە بەند کردنو ڕێگری کردن لە نەفسو دەروون، لەوەی بە سروشتی حەزی لێدەکات، ئەمەش هەر سێ جۆرە ئارامگرتنە کە دەگرێتەوە: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خوا ﷻ، ئارامگرتن لەسەر سەرپێچی کردنی خوا ﷻ، ئارام گرتن لەسەر قەزاو قەدەرە بە ئێشەکان، بەندە شایستەی ئەوە نیە پێی بوترێ ئارامگری تەواو هەتا بەم سێ دانەیە هەڵنەستێو مافی بە تەواوی نەدات، ئەو پێغەمبەرانەی کە وەسفی کردوون بە ئارامگرتن، بەڵگەیە

لەسەر ئەوەی پێی هەستاونو بەجێیان هێناوە، وە پێی هەستاون وەک چۆن پێویستە، بە هەمان شێوە وەسفی کردوون بە چاکەخواز، ئەویش چاکی دڵەکان بە ناسینی خواو خۆشویستنیو ملکەچ بوونی لە هەموو کاتێکدا، وە چاکی زمان، بەوەی کە تەڕ بێ بە زیکرو یادی خوا ﷻ، وە چاکی ئەندامەکانی جەستە، بە سەرقاڵبوونیان بە عیبادەتی خواو واز هێنان لە سەرپێچی کردن، جا بە ئارام گرتنو چاکەکاریان خوا ﷻ دەیانخاتە ناو ڕەحمەتی خۆیەوە، وە لەگەڵ براکانیاندا لە پێغەمبەران دایدەنێتو پاداشتی بە پەلە لە ئێستاو لە داهاتوودا پێیان دەبەخشێت، خوا ﷻ ناوی بەرز ڕاگرتوون لە جیهانداو باسی چاکەیانی خستە سەر زمانی ئادەمیزاد، ئەوە بەسە وەک حورمەتو ڕێزێک بۆیان.

(٨٧-٨٨): ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨ ﴾

(خوا ﷻ دەفەرموێ:) ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾ واتە: باسی بەندەو پێغەمبەرمان (ذا النون) ئەویش یونس ؑ واتە: خاوەنی حووت، بە جوانترین شێوەو چاکترین پیاهەڵدان، بە ڕاستی خوای بەرز ناردی بۆ لای گەلەکەی، جا بانگی کردن، بڕوایان نەهێنا، بەڵێنی پێدان بە دابەزینی سزا بە ماوەیەک ناوی نابوو بۆیان. جا سزایان بۆ هاتو بە چاوی خۆیان بینیان، گەڕانەوە بۆ لای خواو داوای لێبوردنیان لێکرد، خوا ﷻ سزای لەسەر هەڵگرتن، وەکو دەفەرموێ: ﴿ فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ٩٨ ﴾یونس، (واتە: جا با خەڵکی) شارێ (لەو شارانەی کە هەڕەشەیان لێکرا) بڕوایان بهێنایەو بڕواکەیان سوودی هەبووایە بۆیان، جگە گەلی یونس ؑ کاتێ هەموویان بڕوایان هێنا (پێش هاتنی سزاکە) لامان برد لەسەریان سزای سەرشۆڕی ڕیسوایی لە ژیانی دونیادا، وە بەهرەو خۆشیمان پێدان تا ماوەیەک).

وە دەفەرموێ: ﴿ وَأَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلۡفٍ أَوۡ يَزِيدُونَ ١٤٧ فَـَٔامَنُواْ فَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ١٤٨ ﴾الصافات، (واتە: ئەوسا بە پێغەمبەرێتی ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس یان زیاتر * گەلەکەش بڕوایان هێناو بەو هۆیەوە بەهرەمەندمان کردن لە ژیان تا ماوەیەک) جا ئەم ئوممەتە مەزنە لە گەورەترین چاکەکانیان بڕوایان هێنا بە بانگەوازەکەی یونس ؑ، ئەو بە تووڕەییەوە جێی هێشتن، ڕایکرد بۆ لای پەروەردگاری بە هۆی تاوانێک لە تاوانەکان، خوا ﷻ

باسی نەکردوە لە کتێبەکەیدا، ئێمەش پێویستمان بە دیاری کردنو زانینی نیە، وەک خۆی فەرموویەتی: ﴿ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ ﴾ الصافات، (واتە: کاتێ کە ڕایکرد بۆ لای کەشتیەکی پڕ لە خەڵک * قورعە کێشی کرد (لەگەڵ خەڵکی ناو کەشتیەکە)و ئەو لە دۆڕاوان بوو * (خرایە دەریایەکەوە) ئنجا نەهەنگێک قووتی دا ئەویش شایانی سەرزەنشت بوو)، وا دەردەکەوێ پەلە کردنو توڕەبوونی لە گەلەکەی‌و دەرچوونی لە نێویاندا پێش ئەوە بوویێ خوا ﷻ فەرمانی پێبکات بەوە، وە وایدەزانی خوا ﷻ تەنگانەی بەسەردا ناهێنێ، یان وا گومانی بردوە ئەو تێدەپەڕێت بەسەر خوای بەرزدا، وە دەرچوونی ئەم گومانانە بۆ ئەوانەی تەواون لە بەدیهێنراوەکان نایێتە بەربەست، بە مەرجی جێگیر نەبیێ‌و بەردەوام نەبێت لەسەری، چووە ناو کەشتیەکەوە لەگەڵ هەندێ خەڵکدا، جا قورعەیان کرد کێ فڕێی بدەنە ناو دەریاکەوە؟ کاتێ کە ترسان تووشی خنکان بین ئەگەر هەموویان لەناو کەشتیەکەدا بمێننەوە، لە قورعەکە یونس علیه السلام دەرچوو، (ئەوانیش فڕێیان داوە ناو دەریاکەوە) حووتەکە قووتی دا، ئنجا ڕۆشتە ناو تاریکایی دەریا، لەو تاریکاییە هاواری کرد: ﴿ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: دانی نا بە تەواوی یەکتاپەرستیدا بۆ خوا ﷻ، وە پاک ڕایگرت لە هەموو ناتەواوی‌و عەیبو ناخۆشیەک، دانی نا بە ستەمکردن لە نەفسی، خوای بەرز فەرمووی: ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ الصافات، (واتە: خۆ بە ڕاستی ئەو ئەگەر لە یادکارانی خوا ﷻ نەبووایە * تا ڕۆژی زیندوو کردنەوە لە ناو سکی ئەو حووتەدا دەمایەوە).

بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ﴾ واتە: ئەو ناڕەحەتیەی کە تێی کەوتبوو، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: ئەمە پەیمانو مژدەیە بۆ هەموو بڕوادارێک، بکەوێتە ناو خەمو خەفەتەوە، بە تەئکید خوای مەزن ڕزگاری دەکات لێی، وە بۆی سووکو ئاسان دەکات، لەبەر ئیمانەکەی، وەکو چۆن یونس علیه السلامی ڕزگار کرد.

(٨٩-٩٠): ﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾:

یادی بەندەو پێغەمبەرمان زەکەریا علیه السلام بکەرەوە، فەزڵو چاکەکانی بڵاو بکەرەوە کە لە چوارچێوەی ئەم چاکە مەزنە تا خەڵکی ئامۆژگاری لێوەربگرن، وە میهرەبانی خوایش بووە بۆ ئەو، بێگومان ئەو ﴿ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ واتە: ﴿ قَالَ

رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴿٤﴾ وَإِنِّي
خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي
وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴿٦﴾ ﴾مريم. (واتە: فەرمووی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ئێسکم لاواز بووە، لە بەر پیریم مووی سەرم بریقە دەداتەوە، پەروەردگارم هەرگیز لە پاڕانەوەم لێت بێ هیوا نەبووم * بە ڕاستی من دەترسم کەس‌و کارەکەم لە پاش مردنی خۆم‌و خێزانەکەشم نەزۆکە، جا تۆ لە لایەن خۆتەوە منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە * میراتگری من‌و بنەماڵەی یەعقوب بێت، ئەی پەروەردگارم وایشی لێبکە کە خۆت لێی ڕازی بیت).

لەم ئایەتانەدا بۆمان دەرکەوت خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا﴾ بێگومان زەکەریا کاتێ کە ئەجەل‌و سەرەمەرگی نزیک بوویەوە، ترسا لەوەی کە کەس لە پاش ئەو بانگەواز بۆ لای خوا ﷻ نەکاو ئامۆژگاری بەندەکان نەکات، یان لە کاتی خۆیدا تەنها بووە، یارمەتیدەری نەبووە کە پشتیوانی بکات لە ئەنجامدانی کاروبارەکانیدا، ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾ واتە: تۆ چاکترینی میراتگرانی، وە تۆ لە من بە بەزەیی تری بەرانبەر بە بەندەکانت، بەڵکو من دەمەوێ دڵم ئارام بگرێ‌و نەفس‌و دەروونم هێور بێتەوە، وە پاداشتم زیاد بکات ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ﴾ پێغەمبەری بەخشندە کە پێشتر خوا ﷻ کەسی بەم ناوەوە ناو نەناوە ﴿وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓ﴾ پاش ئەوەی نەزۆک بووە، کە پزدانی بۆ منداڵ بوون نەشیاوە، خوا ﷻ پزدانی شیاندوە بۆ منداڵ بوون لە بەر خاتر پێغەمبەرەکەی زەکەریا، ئەمەش لە سوودو بە دەستهاتووەکانی هاوڕێ‌و دۆستی چاکە، ئەو پیرۆز کراوە، کاتێ کە باسی ئەو پێغەمبەرو نێردراوانەی کرد هەریەکەو بە تەنها ئنجا بە گشتی وەسف‌و ستایشیان دەکات، دەفەرموێ:

﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ واتە: دەستپێشخەریان بۆ خێرو چاکە دەکرد، لە کاتی خۆیدا ئەنجامیان دەدا، وە تەواویان دەکرد بەو شێوە گونجاوەی کە پێویستە، هەرگیز چاکەیەکیان بە جێ نەدەهێڵا کە تواناى کردنیان هەبوایە ئیلا وەکو هەڵێک دەیان قۆستەوە ﴿وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗا﴾ واتە: داوای کاروباری چاکیان دەکرد لە ئێمە، لە بەرژەوەندی دونیاو دواڕۆژ، وە پەنایان دەگرت بە ئێمە لە هەموو شتێکی خراپ‌و ترسێنراو لەوەی کە زیانی هەیە بۆ هەردوو دونیا، ئەوان بە هیوا بوون دەترسان بێئاگاو بێباک نەبوون ﴿وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ﴾ واتە: خۆ بەکەم زان‌و زەلیل‌و ملکەچ بوون، ئەمەش لە تەواوی ناسینی پەروەردگاریانە، وە یادی مەریەم ﷺ بکەرەوە، وەسفی بکەو بەڕێزەوە تەماشای بکە، شەرەف‌و ڕێزی گەورە ڕابگرە، جا فەرمووی:


وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا
وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩١ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ
أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ٩٢
وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ٩٣
فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ
لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ٩٤ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ
أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ٩٥ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ
يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦
وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ٩٧ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨ لَوۡ كَانَ
هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٩٩
لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ١٠٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ
سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١

(٩١-٩٤): ﴿ وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا
فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا
وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩١ إِنَّ
هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ
فَٱعۡبُدُونِ ٩٢ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم
بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ٩٣
فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ
مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ
كَٰتِبُونَ ٩٤ ﴾:

﴿ وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا ﴾ واتە: پاراستی لە قەدەغەکراو بەڵکو لە حەڵاڵیش، شووی نەکرد بە هۆی سەرقاڵ کردنی بە عیبادەت کردنەوە، وە کاتەکانی بەکاردەهێنا بۆ خزمەتکردنی پەروەردگاری، کاتێ کە جبریل ﷺ هات لە وێنەی مرۆڤێکی ڕێکو پێکی خوڕەوشت بەرزی جواندا، ﴿ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ١٨ ﴾مریم، (واتە: وتی: من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر تۆ لە خوا دەترسیت)، خوا ﷻ بە پێی کردەوەکەی پاداشتی دایەوە، منداڵێکی پێبەخشی بە بێ باوک، بەڵکو جبریل ﷺ فووی پێدا کرد بە ئیزنی خوا ﷻ سکی پڕ بوو، ﴿ وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ کاتێ کە سک پڕ بوو پێی، وە سکەکەی دانا بەبێ دەست لێدانی کەس، کاتێ کە لە بێشکەدا قسەی کرد، وە دایکی بەری کرد لەوەی کە تۆمەتباران دابوویانە پاڵی، لەو حاڵەتەدا هەواڵی لەسەر خۆیدا، وە خوا ﷻ لەسەر دەستی چەندین موعجیزەی گەورەی هێنایە بوون کە زانراوە، جا مەریەمو کوڕەکەی نیشانە بوون بۆ هەموو جیهان، ئەوە لە دوای ئەوە باسیان دەکەنو پەندیان لێوەردەگرن.
وە کاتێ باسی پێغەمبەرانی کرد، بە دواندن لەگەڵ خەڵکیدا فەرمووی: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران، ئەوان ئوممەتو سەرمەشقی ئێوەن، کە شوێنیان دەکەون پەیڕەویان دەکەن، هەموویان لەسەر یەک ئاینو یەک ڕێگان، بە هەمان شێوە پەروەردگاریشیان یەکە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ ﴾ کە دروستم

کـردوونو پـەروەردەم کـردوون بـە نـازو نیعمەتەکانـم، جـا ئەگـەر پەروەردگار یـەک بوو، پێغەمبەریـش یـەک بـوو، ئاینیش یەک بـوو، کە ئەویـش بەندایەتـی کردنە بۆ خـوای تاکو تەنهـا کـە هیـچ هاوەڵێکی نیـە، بـە هەمـوو جۆرەکانی عیبـادەت کـردن، ئەرکی سەرشـانتان ئەوەیە پێی هەسـتن، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ (بەندایەتیم بۆ بکەنو بمپەرسـتن).
لە ڕاسـتیدا وا شـیاو بوو لەسـەر ئـەم کارە کۆک بنو جیـاوازی نەکەن تیایدا، بـەڵام گومڕاییو دەسـتدرێژی ڕێگـای نەدا تەنهـا دووبەرەکیو دابـڕان نەبێت، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ ﴾ واتـە: کۆمەڵو شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەران ئەوانەی دەدرانـە پاڵیان بەش بەش بـوون، بـوون بـە چەنـد دەسـتەیەکەوە، هەمـوو بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کە هـەق لە لای ئەوەو ناهەق لای دەسـتەکەی تـرە، وە ﴿ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٥٣ ﴾ المؤمنـون، (واتە: هەر کۆمەڵو دەسـتەیەکیان دڵخۆشـن بەوەی کـە هەیانە).
بێگومـان زانـراوە ئـەوەی پێکاویەتـی لـە ئـەوان، ئـەو کەسـەیە شـوێنی ئاینی پـاکو ڕێگای ڕاسـت کەوتبێـت، ئەمەش لـە داهاتـوودا دەردەکەوێ کاتـێ کە پـەردە هەڵدەماڵـدرێو نهێنی ئاشـکرا دەبـێ، وە خەڵکـی کۆدەکرێنـەوە بـۆ یەکلاکردنـەوەی دادوەری، جا ئـەو کاتە ڕوون دەبێتـەوە ڕاسـتگۆ لـە درۆزن، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ كُلٌّ ﴾ لـە دەسـتەو کۆمەڵـەکانو هاوشـێوەیان ﴿ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴾ واتـە: پاداشـتیان دەدەینـەوە بە چاکترین شـێوە، پاشـان بە درێژی باسـی پاداشـتیانی کردوە، بە دەربڕینو بە تێگەیشـتن، جـا فەرموویەتی: ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە: ئـەو کردەوانـەی کە پێغەمبـەران دایاننـاوەو کتێبەکانیش جەختیان لەسـەر کردوەتـەوە ﴿ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ ﴾ (بڕواداریـش بێت) بە خـواو پێغەمبەرەکانـیو ئەوەی کە هێناویانـە ﴿ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ ﴾ واتـە: پاداشـتی کردەوەکـەی بـە فیڕۆ نادەیـنو بەتاڵی ناکەینـەوە، بەڵکـو بۆی زیـاد ئەکەین بـە چەندین قـات ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴾ واتە: بۆی جێگیـر دەکەیـن لە (لـوح المحفوظ) ئەویـش ئەو پەڕاوەیە کـە لای فریشـتە پارێزەرەکانە، واتە: ئـەوەی کـردەوەی چاک نەکات، یـان ئەنجامی بـدات بەڵام بـڕوادار نەبێت، بێگومـان ئەوە بێ بەشـە، دوورخراوە لە دیـنو دونیایدا.

(٩٥): ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ٩٥ ﴾:
واتـە: ڕێگـە نـادرێ خەڵکی شـارو ئاوەدانیەک لـە ناوبرابێـت بگەڕێنـەوە بۆ دونیـاو تەوبەیان لـێ وەربگیـرێ، تـا بە دەسـتی بهێنن ئـەوەی لـە دەسـتیان داوە، گەڕانـەوە نیە بۆ ئـەوەی لەناو چـووەو سـزادراوە، یـا ئاگـادار بن دوێنـراوان لەسـەر بـەردەوام بوونیان لەسـەر ئـەوەی دەبێتە

مایـەی لەناوچـوونو لـە ناوبردنیـان، جـا دوایی کـەس نیە لەسـەریان بـەرزی بکاتـەوەو لای بیـات، بـا لە کاتـی پێویسـتدا دەسـت هەڵبگرن.

(٩٦-٩٧): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٩٧ ﴾

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾ ئەمـە ئاگـادار کردنەوەیەکـە لـە لایـەن خواوە بـۆ مرۆڤەکان، کە لەسـەر کوفرو سـەرپێچی دەڕۆن، بەڕاسـتی دەرچوونـی یەئجـوجو مەئجوج نزیـک بووەتەوە، ئـەوان دوو هۆزی زۆر گەورەن لـە نەوەکانی ئـادەم، لەکاتـی خۆیـدا (ذو القرنین) بەربەسـتی بـۆ دانـان، کاتـێ کە سـکاڵایان بـرد بۆ لای، دەربـارەی خراپەکاریـان لـە زەویدا، لـە ئاخر زەمانـدا بەربەسـتەکە دەکەنەوە، دەردەچـن بۆ ناو خەڵکـی بـەو حاڵەتەوەو بەو وەسـفەی کە خوا ﷻ باسـی کـردوە لە هەموو شـوێنو جێگایەکی بـەرزەوە، زۆر بـە پەلە، ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کـە ئەوان لە ڕووی ژمـارەوە زۆر زۆرن، وە زۆر بـە پەلـە تێدەپەڕن بەسـەر زەویـدا، یان بە خودی خۆیـان، یان بەو هۆکارانـەی کە خوا ﷻ بـۆی فەراهـەم هێنـاون ڕێگـای دوور نزیـک دەکاتەوە، گرانیشـیان بـۆ ئاسـان دەکات، ئەوان زاڵ دەبـن بەسـەر خەڵکیـداو هەمـووی دەخەنـە ژێـر ڕکێفی خۆیـان، بێگومان هیچ کەسـێک ناتوانـێ جەنگیـان لەگەڵدا بـکات ﴿ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ ﴾ واتە: ڕۆژی دوایـی کە خوا ﷻ بەڵێنـی داوە بـە هاتنـی، بەڵێنـی ئەویش هەقو ڕاسـتیە، جا لـەو ڕۆژەدا چاوی ئەوانـەی بێبڕوان بـوون ئەبڵـەقو زەق دەبـێ، لەبەر توونـدیو ناخۆشـیو نارەحەتی ئـەو ڕۆژە، وە لەبـەر ئەوەی دەزانـن چەنـدە تـاوانو کردەوەی خراپیـان لە دونیادا پێشخسـتووە، ئـەوان لـەو ڕۆژەدا هاوارو پەشـیمان بوونـەوەو ئاخ دەخۆن لەسـەر ئـەوەی کە لـە دەسـتیان داوە، وە دەڵێن: ﴿ قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾ (واتـە: ئێمـە لـە دونیـادا بێئاگا بووین لە ئـەم) ڕۆژە مەزنە، بـەردەوام ئێمە ڕۆچـوو بوویـن لـە بەهرەمەنـدیو بێئاگایـی، هەتا یەقیـنو ڕاسـتیمان بە چاوی خۆمـان بینیو ڕۆژی قیامەتمـان بەسـەردا هـات، جا ئەگەر کەسـێک بە هۆی پەشـیمانیو حەسـرەتەوە بمرێ، ئـەوە بێگومـان ئەوان دەمـردن ﴿ بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾ دان بە سـتەمەکەی خۆیانـدا دەنێن، وە دادپـەروەری خـوا ﷻ بەرانبەریـان، جـا ئـەو کاتـە فەرمانیـان پێدەکـرێ بۆ ئاگـر، ئەوانو ئەوانەیشـی کە دەیانپەرسـتن، بۆیـە فەرموویەتی:

(٩٨-١٠٣): ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ

﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ
فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾
لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِى مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ
ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾:

﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴾ واتـە: ئێـوە ئـەی ئەو کەسـانەی لەگەڵ خوادا پەرسـتراوێکی ترتـان دەپەرسـت جگـە لـەو ﴿ حَصَبُ جَهَنَّمَ ﴾ واتە: سـووتەمەنی نـاو دۆزەخن، ﴿ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴾ وە بتەکانتانیـش، حیکمەت لـەوەی کە بتەکان دەخرێنە ئاگـرەوە لە کاتێکدا بێگیانـن‌و عەقڵیـان نیـەو هیـچ تاوانێکیـان لەسـەر نیە، بـۆ ڕوونکردنـەوەی بە درۆخسـتنەوەی ئەوانەیـە کـە دەیانپەرسـتن، وە لەبـەر ئەوەیـە زیاتـر سـزا بچێـژن، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ﴾ ئەمـە وەک ئـەو ئایەتەیـە کە دەفەرمـوێ: ﴿ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾النحـل، (واتـە: بۆ ئەوەی ڕوونـی بکاتـەوە بـۆ خەڵکـی ئـەوەی تیایدایە جیـاوازن، وە تـا ئەوانـەش بێبڕوان بزانـن کە بە ڕاسـتی ئـەوان درۆزن بـوون)، هەر یەک لە پەرسـتکارو پەرسـتراوەکان لە دۆزەخـدا دەمێننەوە لێی دەرناچـن‌و ناگوازرێنەوە.

﴿ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ ﴾ لـە توونـدی سـزادا ﴿ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴾ ئـەوان تێـدا هیـچ نابیسـتن، چونکـە کـەڕن، لاڵـن، کوێرن، یـان هیـچ دەنگێـگ نابیسـتن جگە لە دەنگـی خۆیان نەبـێ، ئەویـش لەبەر توونديو سـەختی ئەو سـزایە، وە چوونە ناو پەرسـتراوی بتپەرسـتەکان بۆ نـاو ئاگـر ئـەوە تەنها بتەکانـە، یان ئەوانەیـە کە پەرسـتراون‌و بـەو پەرسـتنەش ڕازی بوو ون. بـەڵام مەسـیح‌و عوزەیـرو فریشـتەکان‌و هـاو وێنەی ئـەوان کـە پەرسـتراون وە هەروەها پیاو چـاکان، بێگومـان ئـەوان لـە دۆزەخـدا سـزا نادرێن، دەچنـە نێو فەرمـوودەی خـوا ﷻ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ ﴾ واتـە: لـە لایـەن ئێمـەوە پێشـتر بڕیاری خۆشـبەختیان بۆ دراوە لـە زانسـتی خـوادا وە لـە (لـوح المحفـوظ)دا، وە بـۆ ئـەوەی لـە دونیـادا کار ئاسـانیان بۆ کـراوە بـە کـردەوەی چـاک ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا ﴾ لـە دۆزەخ ﴿ مُبْعَدُونَ ﴾ ناخرێنـە ناویەوە، وە لـە نزیکیشـی نابن، بەڵکو بـە ئەوپـەڕی دوور بـوون دوور دەخرێنەوە لێـی، تەنانەت دەنگی بڵێسـەی ئاگری دۆزەخ نابیسـتن.


لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ
خَالِدُونَ ۝ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ
الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۝
يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَا
أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَا ۚ إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ۝ وَلَقَدْ
كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا
عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ۝ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ
عَابِدِينَ ۝ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ
۝ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَهَلْ
أَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۖ
وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ۝ إِنَّهُ يَعْلَمُ
الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ۝ وَإِنْ أَدْرِي
لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ۝ قَالَ رَبِّ احْكُم
بِالْحَقِّ ۗ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ۝

﴿ وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ﴾ لە خـواردنو خواردنەوەو ژنو ژنخـوازیو سروشـتی جوان، لـەوەی کە نە چـاو بینیوبەتی، وە نـە گوێ بیسـتوویەتی، وە بـە خـتـورەش بەسـەر دڵـدا نەهاتـووە، ئـەوە بەردەوامـە بۆیـان، سـات بـە سـات جوانی دەگەشـێتەوە ﴿ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ ﴾ واتـە: ترسـە گەورەکـە لـە ڕۆژی دوایـیـدا خەمبـارو بێتاقەتیان ناکات، کاتـێ کە ئاگـر نزیک دەکرێتـەوەو توورە دەبـێ لە سـەرپێچیکارو بێبڕوایـان، خەڵکی لـەو دۆخـە ترسـیان لـێ دەنیشـێ، بـەڵام ئەوانـە ترسـیان نیـەو خەمبار نابـن، چونکە دەزانـن چیـان پێـش خسـتووە، بێگومـان خـوا ﷻ ئارامـی پێـداون، لـەوەی لێـی دەترسـن ﴿ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ﴾ کاتـێ کـە لـە گۆڕەکانیـان زینـدوو دەکرێنـەوە، بەرێـزەوە نوێنـەرێ دەیانهێنێ بـۆ کۆکردنەوە، پیرۆزباییـان لێدەکـەنو پێـان دەڵێـن: ﴿ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ ئەمە ئـەو ڕۆژە بـوو کـە بەڵێنتـان پێدرابـوو، پیرۆزبایيتـان لێبێ بـەو پەیمانەی کە خـوا ﷻ پێی داون بـە پیرۆزبایيەکـی مـەزن، وە بـا دڵتـان خۆشـبێو لە خۆشـیدا بن بەوەی کـە خوا ﷻ پاراسـتوونی لـە تـرسو نارەحەتی.

(١٠٤-١٠٥): ﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَا ۚ إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾

﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە ئاسـمانەکان بـە مەزنـیو گەورەییانـەوە لـوول دەکاو دەیـان پێچێتـەوە، وەک چـۆن نووسـەر پـەڕە دەپێچێتـەوە، جـا ئەسـتێرەکانی پـەرشو بڵاو دەبـن، وە خـۆرو مانگیش دەکوژێنـەوەو لە شـوێنی خۆیان لادەچـن ﴿ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ﴾ واتە: دووبـارە کردنەوەمان بۆ

دروستکردن، وەکو دروستکردنمان وایە لەسەرەتادا، وەک چۆن یەکەم جار دروستمان کردنو هیچ نەبوون، بە هەمان شێوە دروستیان دەکەینەوە پاش مردن ﴿ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ پەیمانی خۆمان جێبەجێ دەکەین، لەبەر تەواوی توانای، بێگومان ئەو هیچ شتێک ناتوانێ رێگری لێ بکات ﴿ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ ﴾ کتێبی زەبورە، مەبەستی کتێبە دابەزێنراوەکانە، وەکو تەوراتو وێنەکانی ﴿ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ ﴾ واتە: لە کتێبە پیرۆزەکاندا نوسیومانە، پاش ئەوەی لە کتێبی پیشوودا نووسیومانە ئەویش (لوح المحفوظ)، وە قورئانی پیرۆز کە رێکاو رێکێتی هەموو ئەو قەزاو قەدەرانەی کە لێی دوا دەکەوێ، وە نووسراوە تیایدا: ﴿ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ واتە: زەوی بەهەشت ﴿ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴾ ئەوانەی فەرمانەکانیان جێبەجێ کردوەو دوور کەوتوونەتەوە لە قەدەغەکراوەکان، ئەوانە خوا ﷻ دەیانکاتە میرات گری بەهەشتەکان، وەک وتەی ئەهلی بەهەشت: ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ ٧٤ ﴾ الزمر، (واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەر بەڵێنێکی بە ئێمەدا راست بوو، وە زەوی بەهەشتی بە میرات پێداین، لە هەر شوێنێکی بەهەشتدا بمانەوێ نیشتەجێ دەبین).

وە دەگونجێ مەبەست: جێنشینی بێت لە زەویدا، خوای گەورە دەسەڵات بەبەخشێتە پیاوچاکان لەسەر زەویداو پشتیوانیان لێ بکات، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ٥٥ ﴾ النور، (واتە: خوا ﷻ بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە، کە بێگومان دەیانکاتە جێنشینی خۆی لە زەویدا، هەر وەکو ئەوانی (ئیماندارانی) پێش ئەمانی کرد بە جێنشین).

(١٠٦-١١٢): ﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ١٠٦ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٨ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٖۖ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٞ مَّا تُوعَدُونَ ١٠٩ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ١١٠ وَإِنۡ أَدۡرِي لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ١١١ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١١٢ ﴾:

خوا ﷻ وەسفی کتێبی پیرۆزی دەکات کە قورئانە، وە روونی دەکاتەوە کە تەنها ئەو زامنە بۆ مرۆڤ لە هەموو شتێک، وە بە راستی مرۆڤ بێنیاز دەکات، فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا ﴾ (واتـە: بێگومـان لـەم قورئانـەدا باسـمان کـرد ڕاگەیاندنێکـی ئاشـکرا هەیـە)، پێی دەگـەن بـە پەروەردگاریان، وە بـە ماڵی ڕێـزداری، جـا دەیانگەیەنێتە بەرزتریـن داواکاریو چاکترینـی حەزەکان، خواناسـان -کە باشـترینی دروسـتکراوەکانن- جگـە لەمـە هیچ ئامانجێکـی دیکەیان نیـە، چونکە زامنە بە ناسـینی پەروەردگاریـان، بە ناوە جوانەکانیو سـیفاتە بەرزەکانـیو کردەوەکانی، بە هـەواڵ دان بە پەنهانە ڕاسـتەقینەکان، وە بـە بانگەواز کردن بـۆ حەقیقەتەکانی ئیمـان، ڕوونکـەرەوەی هەموو فەرمـان پێکراوەکانو قەدەغەلێکراوەکانـە بە گشـتی، ناسـێنەری عەیـبو ناتەواویەکانـی نەفـسو کردەوەیە، وە ئـەو ڕێگایانەی کە پێویسـتە بیگرێتـە بەر لە وردەکاریەکانـی ئاینـدا، وە ئاگادارکردنەوە لە ڕێگاکانـی شـەیتانو ڕوونکردنـەوەی چوونە ناوەوەی بـۆ گیانی مرۆڤ، هەرکەسـێ قورئان بێنیـازی نـەکات، ئەوە خـوا ﷻ بێنیازی نـاکات، وە هەرکەسـێ قورئان بـەس نەبێت بۆی، ئـەوە خوا ﷻ پشـتیوانی لـێ ناکات.

پاشـان وەسـفی پێغەمبەرەکـەی دەکات کـە بـە قورئانەوە هاتـوە، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ پێغەمبـەر ﷺ ڕەحمەتـی هیدایەتـدراوە بـۆ بەنـدەکان، بـڕواداران ئـەو ڕەحمەتەیـان وەرگـرتو سوپاسـگوزاری خـوا ﷻ بـوونو پێی هەسـتان، وە جگـە لـەوان بێبڕواییـان بەرانبەری کـرد، لە بـری سوپاسـگوزاری نیعمەتەکانی خوا ﷻ کوفریـان پێکرد، پشـتیان کرد لـە ڕەحمەتو نیعمەتەکانـی خوا ﷻ، ﴿ قُلْ ﴾ پێـیـان بڵێ: ئـەی موحەممـەد ﷺ ﴿ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ (واتـە: بێگومان تەنهـا شـتێک کـە نیگـا کـراوە بۆ مـن (ئەمەیـە) کە بـە ڕاسـتی پەرسـتراوی ئێـوە تەنها خـوای تـاکو تەنهایـە) کە شایسـتەی بەندایەتـی نیە جگە لـەو نەبـێ، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ واتـە: ملکـەچ دەبـن بـۆ بەندایەتـیو تەسـلیمی پەرسـتراوێتی دەبـن، جـا ئەگـەر پێی هەسـتان ئـەوە ستایشـی خوا ﷻ بکـەن بـەو منەتـەی کردوویەتی بەسـەریاندا بـەم نیعمەتـەی کە پێشـی هەمـوو نیعمەتـەکان کەوتۆتەوە.

﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ ﴾ (واتـە: ڕوویـان وەرگێـڕا) لـە ملکـەچ بـوون بـۆ بەندایەتـی کردنـی پەروەردگاریـان، جـا ئاگاداریـان بکـەرەوە لـە تۆڵەسـەندنەوەی خواییو دابەزاندنی سـزای بـە ئێـش ﴿ فَقُلْ ءَاذَنتُكُمْ ﴾ واتـە: ئاگـادارم کردنـەوە بـە سـزا ﴿ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾ واتە: زانسـتی مـنو کـردەوەی ئێوە یەکسـانە، جا ئەگەر سـزاتان بـۆ دابەزی نەڵێـن: ﴿ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ﴾ [١٩ المائدة]، (واتە: هیچ مژدە دەرو ترسـێنەرێکمان بـۆ نەهات)، بەڵکو

ئێستا زانستی منو كردەوەی ئێوە وەكو یەك وایە، كاتێ كە ئاگادارم كردنەوەو ئێوەم ترساند بە بەڵاو ناخۆشیەكانی ڕێگای كوفر، وە هیچ شتێكم لێ نەشاردوونەتەوە. ﴿ وَإِنْ أَدْرِيٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴾ واتە: لە سزادان، چونكە زانستی ئەوە لە لای خوایە، ئەوە بە دەستی ئەوە، من هیچ شتێكم لە كاروباری ڕۆژی دواییدا بەدەست نیە، ﴿ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا ﷻ دەزانێ بە وتەو قسەی ئاشكرا، وە دەشزانێ بەو قسەی دەیشارنەوە)، ﴿ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُۥ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ واتە: لەوەیە دواخستنی سزا كە ئێوە پەلەتان لێ دەكرد شەڕو خراپ بێت بۆتان، وە با بۆ ماوەیەك لە دونیادا ڕابوێرنو بەهرەمەند بن، پاشان مەزنتر دەبێت بۆ سزادانتان ﴿ قَـٰلَ رَبِّ ٱحْكُم بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: (خوایە بڕیار بە هەق بدە) لە نێوان ئێمەو بێبڕوایاندا، خوا ﷻ ئەم نزایەی قبووڵ كرد، وە دادوەری لە نێوانیاندا كرد لە دونیادا پێش دوارۆژ، بەوەی بێبڕوایانی پێ سزادا لە جەنگی (بدر)داو جگە لەویش. ﴿ وَرَبُّنَا ٱلرَّحْمَـٰنُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ واتە: داوا لە پەروەردگارمان دەكەین بە ناوی ڕەحمان، وە پشتی پێ دەبەستین لە بەرانبەر ئەو قسە نابەجێیانەی ئێوە دەیكەن، بەم نزیكانە زاڵ دەبین بەسەرتانداو ئاینكەشتان پەرش و بڵاودەبێ، ئێمە لەم حاڵەتەدا سەرمان سوورنامێنێ بە خۆمان، وە پشت نابەستین بە هێزو توانای خۆمان، بەڵكو پشت بە ڕەحمان دەبەستین، كە نێوچانی هەموو بەدیهێنراوەكان بە دەستیەتی، داوا دەكەین پشتیوانی خۆیمان بۆ تەواو بكات بە ڕەحمەتی خۆی، بێگومان كردوویەتیو، ستایش بۆ خوا.

تەفسیری سوورەتی (الأنبیاء) تەواو بوو.


بسم الله الرحمن الرحيم
يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَنْ تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُ يُضِلُّهُ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّىٰ وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ﴿٥﴾

## تەفسیری سوورەتی (الحج)

**وتراوە: مەککیە، وتراویشە مەدەنییە (٧٨) ئایەتە**

**بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە**

(١-٢): ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ ﴾:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ ﴾ خوا ﷻ لەگەڵ هەموو خەڵکیدا دەدوێ، بەوەی لە پەروەردگاریان بترسن، کە پەروەردەی کردوون بە نازو نیعمەتە دیارو نهێنیەکان، جا هەقی خۆیەتی لێی بترسن، بە وازهێنان لە هاوبەشدانانو لە سنوور دەرچوونو سەرپێچی کردن، وە فەرمانەکانی جێبەجێی بکەن بە پێی تواناو هەرچی لە توانایاندا بوو. پاشان باسی ئەوەی کردوە کە یارمەتیان دەدات لەسەر تەقواو پارێزکاری، وە ئاگاداری کردوونەتەوە لە وازهێنان لێی، ئەویش هەواڵدانە بە ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی.

جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴾ کەس ناتوانێ هەڵیسەنگێنێو شارەزای ناوەڕۆکی بێ، بە شێوەیەک ئەگەر ڕوویدا زەوی هاتە لەرزەو کێوەکانیش ووردو خاش بوون، پاشان بوون بە تەپو تۆزێکی پەرشو بڵاو، پاشان خەڵکی دابەش بوون بۆ سێ کۆمەڵ، جا لەو کاتەدا ئاسمان لەت لەت دەبێو خۆرو مانگ دەپێچرێنەوەو تاریک دەبن، وە ئەستێرەکان بەردەبنەوەو لەتو پەت دەبن، وە شپرزەبوونو هەژان ڕوویان تێدەکا کە خەریکە دڵەکان لەتو پەت دەبن، منداڵان ڕەنگی پیریان لێدەنیشێو هەموو خەڵکی چاوی ئەبڵەق دەبێو تەماشا دەکات، لەبەر ئەمە فەرموویەتی:

﴿ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ ﴾ لەگەڵ ئەوەدا چەندە بە
توونـدی منداڵەکەی خۆشدەوێ بە تایبەت لەم حاڵەتەدا کە تەنها دەیەوێ بۆ خۆی
بـژی ﴿ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا ﴾ لە تووندی ترس و تۆقیندا ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ
سُكَٰرَىٰ ﴾ واتە: وا دەبینی -ئەی ئەو کەسەی تەماشایان دەکەی- خەڵکی سەرخۆشە
لە خواردنەوەی مەیی و ئارەق، بەڵام سەرخۆش نین ﴿ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴾
جا لەبەرئەوەی عەقڵەکانیان دەڕواو دڵەکانیان بۆش و بەتاڵ دەبێ و پڕ دەبێ لە ترس و
تۆقین، وە هەموو دڵێکیش لە ترسدا گەیشتە گەرو، چاوەکانیش ئەبڵەق بوون، تا لەو
ڕۆژەدا هیچ باوکێک تاوانی ڕۆڵەکەی هەڵناگرێت و هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێک لە تاوانی
باوکی هەڵناگرێ، لەو ڕۆژەدا ﴿ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ٣٤ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ٣٥ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ٣٦
لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ٣٧ ﴾ عبس، (واتە: مرۆڤ ڕادەکا لە برای * وە دایک و
باوکی * وە ژن و کوڕەکانی * هەموو یەکێک لەوان لەو ڕۆژەدا کارێکی وای هەیە
کە کەس نەپەرژێتە سەر کەسێکی تر) تا لەو کاتەدا ﴿ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ
يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ ﴾ الفرقان، (واتە:
وە ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیداو دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ
پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر * ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم
نەکردایە بە هاوبەش و خۆشەویست) لەو کاتەدا هەندێ ڕوو سپی دەبن و هەندێکی
دیکە ڕەش دەبن، وە تەرازووەکانیش جێگیر دەکرێن، ئەوەی کە بە قەد گەردیلەیەک
لە خێر و خراپە دەکێشێ، وە پەڕاوی کردارەکان بڵاودەبێتەوە، ئەوەشی کە تیایدایە
لە هەموو کردەوەو وتەو نیەتەکانە، لە بچووک و گەورە، وە (صراط) ڕێگا لەسەر
دۆزخ دادەنرێ (پێی دەوترێ: پردی صراط)، بەهەشت نزیک دەکرێتەوە بۆ پارێزکاران،
وە دۆزەخ ڕادەنوێنرێ بۆ گومڕایان ﴿ إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ١٢
وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ١٣ ﴾ الفرقان، (واتە: کاتێ (ئەم
ئاگرە) لە دوورەوە ئەوان دەبینێ، نرکەو ناڵەی گڕ و بڵێسەی دەبیستن * وە کاتێ
فڕێ دەدرێنە جێگایەکی تەنگ لە دۆزەخدا بە جووت کراوی دەست و قاچ و ملیان
لە کۆت و زنجیردا، لەوێ داوای تیاچوون و مردن دەکەن)، پێیان دەوترێ: ﴿ لَّا تَدۡعُواْ
ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ١٤ ﴾ الفرقان.

ئەگەر بانگی پەروەردگاریان بکەن تا دەریان بێنی، دەڵێن: ﴿ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا

تُكَلِّمُونِ ١٠٨ ﴾ المؤمنون، (واتە: خوا دەفەرموێ: (بەبێ نرخیو ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخداو هیچ قسەیەکم لەگەڵ مەکەن)، بە ڕاستی پەروەردگاری میهرەبان خەشمو قینو غەزەبی لێگرتوون، بێ ئومید بوون لە هەموو خێرێک، هەموو کردەوەکانیان دەبینن هیچ شتێکی لێ بزر نەبوو تەنانەت بە قەد توێکڵی ناوکە خورمایەک.

ئەمەو خواناسانیش لە باخەکانی بەهەشتدا دڵخۆش دەکرێن، لە جۆرەها نازو نیعمەتو لەززەتو خۆشیدان کە نەفسیان حەزی لێدەکات، وە بۆ هەتا هەتاییش لەوێ دەمێننەوە. هەقی خۆیەتی مرۆڤی عاقڵ کە دەزانێ هەموو ئەمانە لە پێشیەتی خۆی بۆی ئامادە بکات، ئاواتو ئائومێدی سەرقاڵی نەکات واز لە کردەوە بهێنێ، با تەقوای خوا ﷻ بکاتە دروشمی، ترسیش بکاتە پۆشاکی خۆی، خۆشەویستی خواو یادکردنی بکاتە ڕووحی کردەوەکانی.

(٣-٤): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤ ﴾:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ﴾ واتە: کۆمەڵێ لە خەڵکی ڕێگای گومراییان گرتوەتە بەر، مشتو مڕ بە ناڕەوا دەکەن بەرانبەر هەق، دەیانەوێ پووچو ناهەق بە ڕاستیو تەواو نیشانی خەڵکی بدەن، وە هەقیش بە ناڕەوا نیشان بدەن، بە هەر حاڵ ئەوان لەوپەڕی نەفامیدان، هیچ زانستێکیان نیە، ئەوەشی کە هەیانە، تەقلیدو لاسایی کردنەوەی زانا گومراکانیانە لە هەموو شەیتانێکی یاخیو سەرکێش، دەرچوو لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ نکوڵیان دەکات، بێگومان دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی کردوە، وە بووە بە پێشەوای ئەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ.

﴿ كُتِبَ عَلَيۡهِ ﴾ واتە: لەسەر ئەم شەیتانە سەرکێشە نووسراوە ﴿ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ ﴾ واتە: شوێنی بکەوێ ﴿ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ ﴾ لە هەقو ڕاستی، دووری دەخاتەوە لە ڕێگای ڕاست، ﴿ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ (واتە: وە ڕێنمایی دەکات بۆ سزای ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ)، لە ڕاستیدا ئەمە جێگری ئیبلیسە، خوای بەرز دەربارەی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦ ﴾ فاطر، (واتە: بێگومان (شەیتان) تاقمو کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ).

ئـا ئەمەی کـە مشـتومڕ دەکات دەربارەی خـوا ﷻ، بێگومان کـۆی کردوەتەوە لـە نێوان گومڕایـی خـۆیو گومڕاکردنی خەڵکـی، ئەوە شـوێنکەوتووە، وە لاسـایکەرەوەو پەیڕەوی هەمـوو شـەیتانێکی یاخـی دەکات، تاریکسـتانێک هەندێکی بەسـەر هەندێکـی دیکەوە، وە دەچێتـە نـاو ئەمـەوە زۆرینـەی خەڵکـی بێبـڕواو بیدعـەکار، بە ڕاسـتی زۆربەیان لاسـایی کردنـەوە دەکەن، مشـتو مڕ دەکـەن بەبـێ زانیاریی.

(٥-٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ ﴾ واتـە: لـە گومـانو دوودڵیـدانو زانیاریان نیـە دەربارەی ڕوودانـی، لەگەڵ ئەوەدا پێویسـتە لەسـەرتان پەروەردگارتان بەڕاسـت بزانن، وە پێغەمبەرانیشـتان بەڕاسـت بزانـن لـەوەدا، بـەڵام ئەگـەر گوێـی نەدەنێو هـەر لەگوماندا بـن، ئـەوە دوو بەڵگـەی عەقڵیـە بـە چـاوی خۆتـان ببینـن، هەریەک لـەو دووانـە دەبێتە بەڵگەیەکـی یەکلاکـەرەوە لەسـەر ئەوەی گومانتـان تیایدایـە، وە گومانەکانی ناو دڵیشـتان دەرەوێنێتەوە:

بەڵگـەی یەکەمیـان: بەڵگـە هێنانەوە بە سـەرەتای دروسـتبوونی مـرۆڤ، جـا فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ﴾ ئەویـش بـە دروسـتکردنی باوکی مرۆڤ ئـادەم ؊، ﴿ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ﴾ واتـە: (تنۆکـە ئاوێـک) لـە مەنـی، ئەمـە سـەرەتای قۆناغـی دروسـتکردنە ﴿ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ﴾ واتـە: ئـەو تنۆکـە ئـاوە بـە ئیزنـی خـوا ﷻ دەگـۆڕێ بـۆ خوێنێکی سـوور، ﴿ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ ﴾ واتـە: خوێنەکـە دەگوازرێتـەوە بـۆ پارچـە گۆشـتێک، بـە قـەدەر پاروویـەک خـواردن، وە ئـەو پارچـە گۆشـتە جارێـک دەبێتـە ﴿ مُّخَلَّقَةٖ ﴾ واتە: شـکڵو شـێوەی کێشـراو وەک مـرۆڤ ﴿ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ ﴾ (جارێکیش شـکڵو شـێوەی نەکێشـراوە) یزدانـی دایـک فڕێـی دەدات پێـش دروسـتکردنی، (واتـە: لەبـاری دەچـێ) ﴿ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡ ﴾ واتـە: سـەرچاوەی بەدیهێنانتـان، لەگەڵ تـەواوی توانای خـوادا لە یەک

چر کـەدا دروسـتی بـکات، بەڵکو دەیـەوێ بۆمانـی روون بکاتـەوە تـەواوی دانایی خۆیو مەزنـی دەسـەڵاتیو بەرفراوانی میهرەبانـی ﴿ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ ﴾ واتە: لـە منداڵدانـدا دەیهێڵینـەوە لە کاتی سـکپڕیدا، ئەوەی کە لە بـار نەچووە، بمانـەوێ بیهێڵنەوە هەتـا کاتێکـی دیاریکـراو، ئەویـش مـاوەی سـکپڕیە ﴿ ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ ﴾ لە سـکی دایکتان دەرتـان دەهێنیـن ﴿ طِفۡلٗا ﴾ هیـچ شـتێ نازانـن، هیـچ تواناتان نیـە، خـوا ﷻ دایکانی بۆ رامکـردون، لـە سـنگی ئەوانـدا ڕزقو ڕۆزیمـان بـۆ دیـاری کـردوون، پاشـان قۆنـاغ بـە قۆنـاغ دەگوازرێنـەوە، تـا دەگەنە تـەواوی هێـزو توانـا،﴿ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ ﴾ واتە: پێـش ئەوەی بگاتـە تەمەنـی بەهێزبوونو ژیربـوون، وە هەندێکتـان تێدەپەڕێنـی تا دەگاتە ئەوپـەڕی پیـری، کـە بـێ کەڵـک ترین تەمـەن، لەو تەمەنـەدا (مـرۆڤ) عەقڵ لە دەسـت دەدات، وەک چـۆن هێزو توانـای لە دەسـت داوە ﴿ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ ﴾ واتـە: بـۆ ئەوەی (هیـچ) نەزانێ ئەو کەسـە بە سـاڵاچووەی کە پێشـتر هیچ شـتێکی زانیوە، ئەویـش بـە هـۆی لاوازی عەقڵیـەوە، جـا هێـزی مرۆڤ بـە دوو شـتی لاوازەوە بەسـتراوە، لاوازی پیـریو ناتـەواوی. وەک خـوای بەرز فەرموویەتـی: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ ٥٤ ﴾ الروم، (واتـە: خـوا زاتێکە ئێوەی دروسـت کـردوە لە لاوازی، پاشـان دوای لاوازی بەهێـزی کـردوون، لـە دوای بەهێز کردنتـان لاوازیو پیـری بۆ دانـان، خوا هەرچی بوێـت دروسـتی دەکات، هەر ئـەوە زانای بەدەسـەڵات).

<u>بەڵگـەی دووەم:</u> زینـدوو کردنـەوەی زەوی پـاش ئەوەی کە مـردووە، خـوا ﷻ دەربارەی ئەمـە فەرموویەتی: ﴿ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ ﴾ واتە: وشـکو تۆزاویە، ڕووەکو سـەوزی تێدانیـە، ﴿ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ ﴾ واتـە: بـە گژووگیـا دەجـوڵا ﴿ وَرَبَتۡ ﴾ واتـە: زەوی هـەڵ دەدات پـاش ئـەوەی وشـک بـووە، ئەویش بـە هـۆی زۆری گژوگیاوە ﴿ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۢ ﴾ جـۆرێ لـە جۆرەکانی ڕووەک ﴿ بَهِيجٖ ﴾ بینەر سەرسـام دەکاتو ڕادەمێنێ.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ
قَدِيرٌ ٦ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي
ٱلْقُبُورِ ٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى
وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ٨ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُۥ فِي
ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ٩ ذَٰلِكَ
بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ١٠ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ
أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ذَٰلِكَ
هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ١١ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ
وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ١٢ يَدْعُواْ لَمَن
ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ١٣
إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ١٤ مَن كَانَ
يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى
ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥

ئەم دوو بەڵگە یەکلاکەرەوەیە، بەڵگەن لەسەر ئەم پێنج داواکاریە، ئەویش ئەمانەیە: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوەی باسکرا لە دروستکردنی مرۆڤو زیندووکردنەوەی زەوی پاش مردنی ﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾ واتە: پەروەردگاری پەرستراو، کە نابێ بەندایەتی بۆ هیچ شتێ بکرێ جگە لەو، تەنها بەندایەتی بۆ ئەو ڕاستەو بەندایەتی کردن بۆ جگە لەو شتێکی پووچە ﴿ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ وەک چۆن سەرەتا دروستی کرد، وە وەکو چۆن زەوی زیندووکردەوە پاش مردنی ﴿ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ وەکو پێی نیشاندان، لە توانای بەدیهێنانیو مەزنی دروستکردنی ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا ﴾ هیچ پاساوێک نیە بۆ بە دوور زانینی ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ﴾ جا پاداشتتان دەداتەوە بە کردەوەکانتان چاک بێ یان خراپ.

(٨-١٠): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ٨ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ٩ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ١٠ ﴾:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن ﴾ مشتو مڕی پێشوو بۆ کەسی پەیڕەوکارو لاسایی کەرەوە بوو، ئەم مشتو مڕە تایبەتە بە شەیتانی سەرکێشەوە، کە بانگ دەکات بۆ بیدعە، هەواڵیداوە بێگومان ئەو ﴿ يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ ﴾ واتە: مشتو مڕی پێغەمبەرانی خواو شوێنکەوتوانی دەکات بە باتڵو پووچ، بۆ ئەوەی هەقی پێ ژێر بخات، ﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ بەبێ زانیاریەکی تەواو ﴿ وَلَا هُدًى ﴾ لە مشتو مڕەکەیدا شوێنی کەسێک نەکەوتووە ڕێنمایی بکات، نە عەقڵێکی تەواوو ژیر، وە نە پەیڕەوکارێکی هیدایەتدەر، ﴿ وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴾ واتە: ڕوونو ئاشکرا، واتە: هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیو نەقڵی بە دەستەوە نیە، ئەوە تەنها گومانو دوو دڵیە شەیتان دەیخاتە دڵیەوە.

وەک دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ١٢١ ﴾ الأنعام. (واتە:

وە بشزانن کە شەیتانەکان هەمیشە شتی پڕو پووچ دەخەنە دڵی دۆستەکانیانەوە، بۆ ئەوەی مشتو مڕتان لەگەڵ بکەن) لەگەڵ ئەمەدا ﴿ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ ﴾ واتە: ڕووی لێ وەردەگێڕێ، ئەمە کینایەیە لەسەر لووت بەرزیو بە کەم زانینی خەڵک، دڵی خۆشە بەو زانستەی کە لەلایەتیو هیچ سوودێکی نیە، شوێنکەوتووانی ڕاستیو ئەوەشی کە هێناویانە بە کەم تەماشا دەکات ﴿ لِيُضِلَّ ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکاتو ببێتە بانگخوازێک بۆ ڕێگای گومڕایی، وە پێشەوا بێبڕواو گومڕاکان دەچنە نێو ئەمەوە.

پاشان باسی سزای دونیاییو دوا ڕۆژی کردوون، فەرموویەتی: ﴿ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ ﴾ واتە: لە دونیادا پێش قیامەت ڕیسوا دەبێت، ئەمەش لە نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانی خوایە، بێگومان تۆ کەسێ نابینی لە بانگخوازی بێبڕواو گومڕاکەران ئیللا لە ناو خەڵکیدا بێزراوو نەفرین لێکراوو سەرزەنشت کراوە، ئەوەش هەقی خۆیەتی، هەر کەسەو بە پێی حاڵی خۆیەتی ﴿ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾ واتە: پێی دەچێژین سزای سوتێنەرو گەرمای توند، ئەویش بە هۆی ئەو گوناهانەوەیە بە دەستی خۆی پێشی خستووە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾ (واتە: بێگومان خوا ستەمکار نیە بە بەندەکانی).

(١١-١٣): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ١٢ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ١٣ ﴾:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ ﴾ هەندێ لە خەڵکی لەوانەی کە بڕوایان لاوازە، ئیمان نەچووەتە ناو دڵیانەوە، بەڵکو یان بە هۆی ترسەوە وەریگرتووە، یان وەک نەریتێک وەریگرتووە کە لە کاتی ناڕەحەتیەکاندا چەسپاو نابێ ﴿ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦ ﴾ واتە: ئەگەر ڕزقو ڕۆزی بەردەوام بوو، هیچ ناڕەحەتیەکی نەهاتە پێش، دڵخۆش دەبێ بەو خێرە، نەک بە ئیمانی، جا ئەمە ڕەنگە خوا ﷻ لەشی ساغ بکاتو تووشی فیتنەی نەکات، تا ببێتە مایەی لادانی لە ئاینەکەی ﴿ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ﴾ واتە: لە ناخۆشی یان لە دەستدانی خۆشەویست، ﴿ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ ﴾ واتە: لە ئاینی هەڵدەگەڕێتەوە ﴿ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَ ﴾ واتە: جا یان لە دونیادا، ئەویش بە هۆی هەڵگەڕانەوەیەوە ئەوەی ویستی لەسەریەتی بۆی دەستەبەر نابێ، کە هەڵگەڕاوەیی کردوەتە دەستمایەی، لە جیاتی ئەوەی کە گومان دەبات دەستی بکەوێت، وە هیچی دەست نەکەوت جگە لەوە نەبێ کە بۆی دیاری کراوە.

بەڵام دواڕۆژ ئەوە دیارە، بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات کە پانتایی بە قەد ئەرزو ئاسمانە، وە شایستەی دۆزەخ دەبێ، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾ واتە: روونو ئاشكرا.
﴿يَدۡعُواْ﴾ ئەمەی کە هەڵگەڕاوەتەوە لە دینەکەی ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ﴾ واتە: ئەمە سیفەتی هەموو بانگکراو پەرستراوێکە جگە لە خوا ﷻ، بە ڕاستی ئەوە نە بۆ خۆیو نە بۆ جگە لە خۆی زیانو قازانجی نیە، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ﴾ کە گومراییەکەی لە دووریدا گەیشتووەتە سنووری کۆتایی، کاتێ پشتی کردوە لە عیبادەت کردنی ئەو خوایەی کە (النافع) سوود بەخشو (الضار) زیانگەیەنەری دەوڵەمەندو بێ نیازە، وە رووی کردوەتە عیبادەت کردنی بەدیهێنراوێکی وەکو خۆی، یان نزمتر لە خۆی، هیچ شتێکی بە دەست نیە، بەڵکو ئەو بۆ بەدەستهێنانی داواکاریەکەی لە پەرستراوەکەی بە تواناترە، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦ﴾ بێگومان زیانی لە عەقڵو جەستەو دونیاو دواڕۆژ زانراوە ﴿لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ﴾ واتە: ئەم پەرستراوە ﴿وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ﴾ واتە: هاوبەشو هاوڕێ کە پەیوەستە پێیەوە، بێگومان مەبەست لە (المولى والعشير) بە دەستهێنانی سوودو ڕەتکردنەوەی زیانە، ئەگەر شتێک لەمانەی دەستەبەر نەکرد ئەوە بێگومان سەرزەنشت کراوە.

(١٤): ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ١٤﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ واتە: کاتێ کە خوا ﷻ باسی مشتومرکەری کرد لەسەر بەتاڵ، ئەو دەبێ بە دوو بەشەوە: پەیڕەوکار، بانگخواز، بە هەمان شێوە باسی مسوڵمانی کرد لەسەر دووبەش:
بەشی یەکەم: ئیمان نەچووەتە ناو دڵیەوە وەک لە پێشەوە باسکرا، بەشی دووەم: بڕواداری ڕاستەقینەیە، ئەو بڕوایەی کە هێناویەتی بە کردەوەی چاک سەلماندوویەتی، خوا ﷻ هەواڵ دەدات، ئەو دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن، لەبەر ئەوە ناونراوە بە بەهەشت، چونکە کۆشکی بەرزو دارو درەختی چڕو پڕ دەوری داوە، بە هۆی چڕو پڕیەوە مرۆڤ دەپۆشی لە بینینی کەسانی دیکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ هەر شتێ خوا ﷻ بیەوێ دەیکات بەبێ بەربەستو ڕێگر، لەوانەش گەیاندنی پیاوچاکان بە بەهەشت، خوا ﷻ بمانگێرێ لەو کەسانە بە منەتو بەخشندەیی خۆی.

(١٥): ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ

﴿فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥﴾:

﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: هەر کەسێک وا گومان دەبات خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی سەرناخات‌و ئاینەکەی پەرش‌و بڵاو دەبێت، بێگومان سەرکەوتن لە لایەن خواوە لە ئاسمانەوە دادەبەزێت، ﴿فَلۡيَمۡدُدۡ﴾ ئەو کەسەی کە واگومان دەبات ﴿بِسَبَبٍ﴾ واتە: پەتێک ﴿إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ هەڵیبواسێ پێیەوە، ﴿ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ﴾ ئەو سەرکەوتنەی دادەباری بەسەریدا لە ئاسمانەوە ﴿فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ﴾ (ئنجا با بزانێت ئەو هەموو ڕق‌و تووڕەیی‌و نارەحەتی دڵی دەڕوات) واتە: ئەوەی فێڵی پێدەکات لە پێغەمبەر ﷺ، وە کار دەکات بۆ دژایەتی کردنی‌و سوورە لەسەر بەتاڵ کردنەوەی ئاینەکەی، لە ڕقی دەرکەوتنی ئاینەکەی، ئەمەش ئیستفهامە بە واتای نەفی دێت، بێگومان ئەو توانای نیە بەسەر شیفای ڕق‌و کینەکەیدا، ئەگەر چی هەر هۆکارێ بەکاربێنێ.

مانای ئەم دەقە پیرۆزە: ئەی ئەو کەسەی دژایەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەی، هەوڵ‌و کۆشش دەکەی ئاینەکەی بسڕیتەوە، کە بە نەفامی خۆت وا گومان دەبەی کە هەوڵدانەکەت سوودێکت پێدەگەیەنێ، بزانە تۆ هەرچەندە هەوڵبدەیت‌و هۆکار بەکاربێنی لە فرت‌و فێڵ بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ بە ڕاستی ئەوە ڕق‌و کینەت لانابات‌و چارەی دڵیشت ناکات، تۆ توانای ئەوەت نیە، بەڵام ئێمە بۆچوونێکت بۆ دەخەینە پێش چاو، دەتوانی ڕق‌و کینەت دابمرکێنیتەوە، وە لە دابڕینی سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ -ئەگەر بکرێ- لە دەرگای خۆیەوە بچۆرە ژوورەوە، بگە بە هۆکارەکانی، بڕۆ حەبل‌و گورێسێ پەیدا بکە، هەڵیبواسە بە ئاسماندا، پاشان پێی سەر بکەوە، تا دەگەی بەو دەرگایانەی کە سەرکەوتن لەوێوە دادەبەزێ، دەرگاکە بگرەو قوفڵی لێبدە، بەم حاڵە دڵت شیفای بۆ دێت، ئەمە بۆچوون‌و پیلانە، بەڵام جگە لەم حاڵە با نەیەت بە خەیاڵتدا تۆ شیفای تووڕەیی‌و ڕق‌و کینەت دەدەیت، ئەگەر هەموو خەڵکیش هاوکاریت بکەن.

وە ئەم دەقە پیرۆزە بەڵێن‌و مژدەی تێدایە، خوا ﷻ ئاینەکەی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی ﷺ‌و بەندە بڕوادارەکانی سەردەخات، ئەمە شتێکی شاراوە نیە، هەروەها لە بێ ئومێد بوونی بێبڕوایان، ئەوانەی دەیانەوێ نووری خوا ﷻ بکوژێننەوە بە فووی دەمیان، خواش نووری خۆی تەواو دەکات، ئەگەر چی بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێ، واتە: هەرچیش لە توانایاندا هەیە بیخەنە کار بۆ ئەو مەبەستە.

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ
﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ
وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ
يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ
وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ
ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن
مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ
ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ
مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ
مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ
أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ
ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ
أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾

(١٦): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾:

واتە: ئا بەم شێوەیە کاتێ درێژەماندا بەم قورئانە، کردمانە ئایەتی ڕوونکراوەو دیار کە بەڵگەن بۆ بابەتە بە سوودەکان، بەڵام هیدایەت بە دەستی خوایە، هەر کەسێ خوا ﷻ بیەوێ هیدایەتی بدات، ڕێنمایی لەم قورئانەوە وەردەگرێو دەیکاتە پێشەواو سەرمەشقی خۆی، وە بەو نوورە ڕۆشنایی وەردەگرێ، هەر کەسێ خوا ﷻ نەیەوێ ڕێنمایی بکات، ئەگەر هەموو ئایەتێکی بۆ بێت بڕوا ناهێنێ، قورئانیش سوودی پێناگەیەنێ، بەڵکو دەبێتە بەڵگە بەسەریەوە.

(١٧-٢٤): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ خوا هەواڵ دەدات دەربارەی دەستەو تاقمەکانی سەر

زەوی لــە بڕوادارانــی، وە جوولەکــەو گــاورەکانو ئەســتێرە پەرســتەکان، وە لــە ئاگــر پەرســتان، وە لــە هاوبەشــدانەران، خــوا هەموویــان کۆدەکاتــەوەو لــە ڕۆژی دواییــدا، وە بڕیــار دەدات لــە نێوانیانــداو جیایــان دەکاتــەوە بــە حیکمــەتو دادپــەروەری خــۆی، پاداشــتیان دەداتــەوە بــە پێــی کردەوەکانیــان کــە پاراســتویەتیو نوســیویەتیو ئاگــادارە، ئــا لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴾ (واتــە: خــوا بەســەر هەموو شــتێکدا ئاگــادارە).

پاشــان لــە یەکتــر جیایــان دەکاتــەوەو دەفەرمــوێ: ﴿ هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡ ﴾ هەموویــان بانگەشــەی ئــەوە دەکــەن کــە لەســەر هەقــن ﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ هەمــوو بێبڕوایــەک دەگرێتــەوە لــە جوولەکــەو گــاورو ئاگــر پەرســتو ئەســتێرە پەرســتو بتپەرســتان ﴿ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ مِّن نَّارٖ ﴾ واتــە: پۆشــاکی قەترانــی ڕەشــیان بــۆ دەبردرێــت، ئنجــا ئاگــر دەخرێتــە ناویــەوە، بــۆ ئــەوەی لــە هەمــوو لایەکــی بگرێتــەوە ﴿ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ﴾ ئاوێکــی زۆر گــەرم، دەتوێنرێتــەوە بــەو ئــاوە گەرمــە گۆشــتو بــەزو چەوریــی ئــەوەی لــە نــاو ســکیاندایە، لــە ســەختی گەرمــی ئاگرەکــەدا.

﴿ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴾ (گــورزی ئاســنی) بــە دەســتی فریشــتەکانەوەیە، زۆر تــووڕەو توونــدن، پێــی لێیــان دەدەنو هەلاهەلایــان دەکــەن ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴾ ســزایان لەســەر هەڵناگیــرێو مۆڵەتیــش نادرێــن بڕوبیانوویــەک بــۆ خۆیــان بهێننــەوە، بــە سەرزەنشــتیەوە پێیــان دەوتــرێ: ﴿ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾ واتــە: دڵو جەســتە دەســوتێنێ.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ بێگومــان زانــراوە ئــەم وەســفە تەنهــا بــۆ بڕوادارانــە، ئەوانــەی بڕوایــان بــە هەمــوو کتێبــەکانو هەمــوو پێغەمبــەران هێنــاوە ﴿ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ ﴾ واتــە: بازنــی ئاڵتــون لــە دەســتەکانیان دەکــرێ، پیــاوانو ئافرەتــان، ﴿ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴾ نازونیعمەتیــان بــۆ تــەواو دەبێــت بــە بــاس کردنــی هەمــوو جــۆرە خــواردنو خواردنــەوە بــە چێــژەکان، وە هەمــوو دارو درەخــتو کۆشــکە بــەرزەکان، وە باســی ســەرجەم ڕووبــارەکان لــە ڕووبــاری: ئــاوو شــیرو هەنگویــنو شــەرابو عــەرەق، وە جۆرەهــا جــلو بەرگــی ڕازاوەو نایــاب،

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ
﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ
وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ
﴿٢٥﴾ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ
بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ
ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ
كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُواْ
مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ
عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ فَكُلُواْ مِنْهَا
وَأَطْعِمُواْ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ
وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾
ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ
رَبِّهِۦ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ
فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُواْ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾

ئەویش بە هۆی ئەوەی کە ئەوان ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ گەورەترین و چاکترینیان وشەی دڵسۆزیە (لا إله) پاشان سەرجەم وتە جوانو بە نرخەکان کە یادی خوا ﷻ لە خۆدەگرێ، یان چاکە کردن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ واتە: ڕێگای ستایش کراو، چونکە هەموو شەرع حیکمەتو ستایش کردن لەخۆ دەگرێ، هەروەها چاکی فەرمان پێکراو و ناشرینی قەدەغەلێکراو، ئەوە ئاینێکە نە توونڕەوی تێدایەو نە شل ڕەوی، زانستی بەسوودو کردەوەی چاک لەخۆدەگرێ، یان: ڕێنمایی کراون بۆ ڕێگای خوای ستایش کراو، وە خوا ﷻ بە زۆری ڕێگا (الصراط) دەدرێتە پاڵی، چونکە خاوەنەکەی دەگەیەنێت بە خوا ﷻ.

وە لە باس کردنی ﴿ٱلْحَمِيدِ﴾ لێرەدا، تا ڕوون ببێتەوە ئەوان هیدایتیان بەدەستهێناوە بە ستایشو منەتی پەروەردگاریان بەسەریانەوە، لەبەر ئەمە لە بەهەشتدا دەڵێن: ﴿وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴿٤٣﴾﴾ الأعراف، (واتە: دەڵێن سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردین بۆ ئەم ڕێگایە، کە ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین، ئەگەر خوا ﷻ ڕێنمایی نەکردینایە).

خوا ﷻ ڕەخنە دەگرێ لە نێوانی ئەم هەموو ئایەتو نیشانانەدا، بە باسکردنی سوژدەی هەموو بەدیهێنراوەکان بۆی، هەموو ئەوانەی لە ناو ئاسمانەکانو زەویدان، هەروەها خۆرو مانگو ئەستێرەو کێوو داروو درەختو هەموو گیانلەبەران، وە زۆرێکیش لە خەڵکی، ئەوانەش بڕوادارانن ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ﴾ (واتە: زۆرێکیش سزای)، واتە: سزای بۆ پێویست کراو نووسرا بە هۆی کوفرو بێبڕواییەوە، خوا ﷻ سەرکەوتووی نەکرد بۆ بڕواهێنان، چونکە خوا ﷻ ئیهانەی کردوە ﴿وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ﴾ هیچ

کەسێ ویستی بەسەر خوادا زاڵ نیە، وە کەس ناتوانێ بەربەستی ویستو ئیرادەی بکات. جا ئەگەر هەموو بەدیهێنراوەکان بە گشتی سوژدە ببەن بۆ پەروەردگاریانو ملکەچی مەزنی ئەوبنو فەرمان بەرداری بن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو پەروەردگارێکی تاکو تەنهاو پەرستراوە، وە پاشای ستایش کراوە، هەر کەسێک لە بەندایەتی ئەو بترازێ بۆ غەیری ئەو بە ڕاستی ئەوە گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی دوور، وە دۆڕاوە بە دۆڕانێکی روونو ئاشکرا.

(٢٥): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی قیزەونیو ناشرینی ئەوەی کە بتپەرستەکان لەسەری بوون بەرانبەر بە پەروەردگاریان، بێگومان ئەوان کۆیانکردەوە لە نێوان بێبڕوایی بەرانبەر بە خواو پێغەمبەرەکەی، وە لە نێوان ڕێگری کردنی مسوڵمانان لە ڕێگای خوا ﷻ، وە ڕێگری کردنیان لە خەڵکی بۆ بڕواهێنان، بە هەمان شێوە لە مزگەوتی حەرام کە نە موڵکی ئەوان بوو نە موڵکی باو و باپیریان، بەڵکو بۆ هەموو خەڵکی یەکسانە، ئەوەی نیشتەجێیەو یان لە دەوروبەریەوە دێت، بەڵکو ئەوان ڕێگری باشترین بەدیهێنراوەکانیان کرد کە موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی بوون، لە کاتێکدا ئەم مزگەوتی حەرامە لە ڕێزو شکۆو مەزنی هەرکەس بیەوێ تیایدا لە هەق لابداو ستەم بکات، پێی دەچێژین سزایەکی بەئێش، جا تەنها ویستی ستەمکردن لە مزگەوتی حەرامدا سزا لەسەر خاوەنەکەی پێویست دەکات، ئەگەر جگە لەوە بێ سزا نادرێ تەنها بە ستەمکردن نەبێ، جا چۆن کەسێک گەورەترین ستەمی تێدا ئەنجام بدات لە کوفر کردنو هاوەڵ بۆ دانانو ڕێگری خەڵکی لە ڕێگای خوا، وە ڕێگری خەڵکی لە سەردانیو زیارەت کردنی، ئێوە چۆن گومان دەبەن خوا چیان لێ بکات؟! لەم دەقە پیرۆزەدا دەردەکەوێ پێویستە ڕێزی مزگەوتی حەرام بگیرێو بە مەزن تەماشا بکرێ، وە (مرۆڤ) خۆی بپارێزێ لەوەی بیەوێ ستەمی تێدا بکات.

(٢٦-٢٩): ﴿ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ
لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا
وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُواْ
ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۖ فَكُلُواْ مِنْهَا وَأَطْعِمُواْ

ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بـاس لـە مەزنـی ماڵـی حـەرامو گەورەیـی دروسـتکەرەکەی دەکات، ئەویـش خۆشەویسـتی ڕەحمانــە، جـا فەرموویەتــی: ﴿ وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ ﴾ واتــە: دیاریمــان کــردو بۆمــان دابەزانــد، بەشـێک لـە نەوەکانـی کردوەتـە خەڵکـی ئـەو شـوێنە، خـوا فەرمانـی پێـداوە بـە دروسـتکردنی، ئەویـش دروسـتی کـردوە لەسـەر تەقـوای خـوا، خـۆیو کوڕەکـەی ئیسـماعیل (علیهمـا السـلام) دروسـتیان کـردوە، فەرمانـی کـردوە هاوبەشـی بـۆ بڕیـار نـەدرێ تیایـدا، بـەوەی بەدڵسـۆزیو بـۆ خـوا ﷻ کاری تێـدا بـکا، بـە نـاوی خـواوە بونیـادی بنـێ، ﴿ وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ ﴾ واتـە: (ماڵەکـەم پـاک بکـەرەوە) لـە شـیرکو سـەرپێچی، وە لـە پیـسو پۆخڵـی، دانـە پاڵـی ڕەحمـان بـۆ لای نەفسـی خـۆی لەبـەر ڕێـزو گەورەییەتـی، تـا لـە دڵـدا بـە مـەزن دابنرێـتو لـە هەمـوو لایەکـەوە بچـن بـۆ زیارەتـی، وە بـە گـەورە تەماشـا بکرێـت لەبـەر پاکـیو مەزنـی، چونکـە ماڵـی پەروەردگـارە بـۆ تـەواف کارانو ئەوانەشـی تیایـدا دەمێننـەوە بـۆ عیبادەتـی کردنـی لـە عیبادەتـەکان، لـە زیکـرو قورئـان خوێنـدنو فێربوونـی زانسـتو فێرکردنـی، غەیـری وانـەش لـە جۆرەکانـی خۆنزیـک کردنـەوە، ﴿ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ واتـە: نوێـژ خوێنـان، واتـە: پاککردنـەوەی بـۆ ئـەو بەرێزانـە، ئەوانـەی هەمـوو مەبەسـتێکیان بەندایەتـی خـواو نزیکبوونەوەیـە لـە ماڵەکـەی، ئەوانـە مافیـان هەیـەو خـاوەن ڕێـزن، لـە ڕێزگرتنیـان پاککردنـەوەی ماڵـی حەرامـە لەبـەر ئـەوان، وە هەروەهـا، پاککردنەوەیەتـی لـە دەنگـی بـەرزو قسـەی بـێ مانـا کـە خواپەرسـتان بێتاقـەت بـکات، ئەوانـەی نوێـژو طـەواف دەکـەن، طەوافـی پێـش خسـتووە بەسـەر ئیعتیکافـدا، بـە هـۆی تایبەتمەنـدی بـەم ماڵـەوە، پاشـان ئیعتیـکاف لەبـەر تایبەتمەنـدی بـە ڕەگـەزی مزگەوتـەکان ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ ﴾ واتـە: ئاگاداریـان بکـەرەوە بـە حـەج کـردنو بانگیـان بکـە بـۆ لای، پێیـان ڕابگەیەنـە فـەرزو چاکـەو گەورەیـی ئـەو کارە، بێگومـان تـۆ ئەگـەر بانگیـان بکـەی دێـن بـۆ لات بـە حـەجو عومـرە کـردن، بـە پـێ لەسـەر قاچەکانیانـەوە دێـن، چونکـە زۆر تامـەزرۆن.

﴿ وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ ﴾ واتـە: بـە سـواری حوشـتری لاواز، ڕێگـا نارەحەتیەکـە ببڕێ تا دەگاتـە پیرۆزتریـن شـوێن ﴿ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو وڵاتێکـی دوورەوە،

بێگومـان ئیبراهیـم ﷺ وایکرد، پاشـان کورەکـەی لە دوای خۆی موحەممـەد ﷺ خەڵکی بانـگ کـرد بـۆ حـەج کردنـی ئـەم ماڵـە، سـەرەتا ئـەوان دەسـتیان پێکـردو دووبارەیان کـردەوە، ئـەو پەیمانـەی خـوا ﷻ پێـی دابـوو هاتەجـێ، خەڵکی بـۆی دەهاتن بـە پێیان‌و بە سـواری (وڵاخیشـەوە) لە خۆرهەڵاتی زەوی‌و خۆرنشـینیەوە، پاشـان باسـی سـوودەکانی سـەردانی ماڵـی حەرامـی کـردوە، هانی داون بـۆی، جـا فەرموویەتی:

﴿ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ واتـە: تـا لـە ماڵـی خـوادا سـوودە ئاینیـەکان وەربگـرن، لـە پەرستشـە چاکـەکان، وە ئـەو پەرستشـانەش کـە ئەنجـام نـادرێ تەنهـا لـەوێ نەبـێ، وە سـوودە دونیاییـەکان، لە کەسـابەت‌و بەدەسـتهێنانی قازانجـی دونیایی، هەمـوو ئەمانە دیارن گشت کەسـێک دەیزانێ، ﴿ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾ واتـە: ئەمـە لـە قازانجـە ئاینـی‌و دونیاییەکانـە، واتە: با نـاوی خوا ﷻ بهێنـن لـە کاتـی سـەربڕینی قوربانیـدا، سوپاسـگوزاری خـوا ﷻ بکەن لەسـەر ئـەو رزق‌و رۆزیـەی خـوا پێی بەخشـیون‌و بۆی ئاسـان کـردوون، جا ئەگـەر سـەرتان بڕین ﴿ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴾ واتـە: زۆر هـەژار بێـت.

﴿ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ ﴾ واتـە: پـاش لێبوونـەوەی قوربانیەکانیـان، بـا پیـس‌و پۆخڵـی کـە لـە ماڵی حەرام تووشـیان بـووە لای ببـەن ﴿ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ ﴾ (بـا نەزرەکانیان جێبەجـێ بکـەن) کە پێویسـتیان کردوە لەسـەر خۆیـان، لە حەج‌و عومـرەدا ﴿ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴾ واتـە: ماڵـی دێریـن، پیرۆزترینـی مزگەوتەکانـە بـە ڕەهایـی، ئازاد کـراوە بەسـەر هەر سـتەمکارێکەوە ویسـتبێتی سـەربکەوێ بەسـەریدا، ئـەم فەرمانکردنە بە طـەواف، بەتایبـەت دوای فەرمانکـردن بـە قوربانی، لەبـەر گەورەیی‌و شـەرەفیەتی، وە لەبەر ئـەوەی طـەواف مەبەسـتە، ئەوەی لـە پێـش ئەوەوەیـە هۆکارێکە بۆی.

وە دەگونجـێ -خـوا زاناترە- لەبەر سـوودێکی تر بێ، ئەویـش ئەوەیە طەواف هەموو کاتێ ڕێگـە پێدراوە، جا یەکسـانە بـەدوای قوربانیـدا بێت، یان بە سـەربەخۆیی بێت.

(٣٠-٣١): ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ﴾

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەوەی کـە باسـمان کـرد لـەو حوکمانـە، ئەویشـی تیایدایـە لـە بـە گەورە

زانیــن‌و ڕێزگرتنــی ســنوورەکانی خــوا ﷻ، چونکە بە گــەورە دانانی ســنوورەکانی خوا لەو کاروبارانەیــە کــە خــوا خۆشــی دەوێ‌و نزیکــە لێیــەوە، کە هەر کەســێ بە گــەورەو مەزنی دابنێــت خــوا پاداشــتێکی گــەورەو بێپایانــی دەداتــەوە، وە خێــری تێدایــە بۆ دیــن‌و دونیاو دوارۆژی لــە لای پەروەردگــاری.

(حرمــات الله): ســنوورەکانی خــوا: ئــەوەی تایبەتــە بــەو بەرێــزەو فەرمــان کــراوە ڕێــزی لێبگیــرێ بــە بەندایەتــی یــان غەیری ئەویــش، وەکــو قوربانیەکان بــە گشــتی، وە حەرەم‌و ئیحــرام، وە هــەدی، وەک ئــەو عیبادەتانــەی کە خوا ﷻ فەرمانــی کردوە بە بەنــدەکان پێی هە ستن.

جــا بــە مــەزن دانانیــان بــە گەورەدانانیانــە لــە دڵــەوەو خۆشویســتنێتی، وە تــەواو کردنــی بەندایەتــی تیایــدا بەبــێ تەنبەڵــی تەوەزەلــی‌و کەمتەرخەمــی.

پاشــان باســی منــەت‌و چاکــەی خۆی کــردوە بــەوەی کــە حەڵاڵی کــردوە لــە ئاژەڵەکان، لــە حوشــترو مانگــاو مــەڕ، وە لــە کــۆی قوربانیــەکان داینــاوە کــە پێــی نزیــک دەبێتەوە، لــە دووڕووەوە منەتــی تێــدا دانــاوە: ﴿إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ لــە قورئانــدا حــەرام کرابێ وەک دەفەرمــوێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ ۝٣﴾ المائـدة. (واتە: لەســەرتان قەدەغەکــراوە (گۆشــتی) مــردارەوە بــوو، خوێن، وە گۆشــتی بەراز) تــا کۆتایی دەقەکــە. بــەڵام خــوا ﷻ بــە ڕەحــم‌و میهرەبانی خــۆی بەرانبــەر بــە بەندەکانــی، قەدەغەی کــردوە لێیــان‌و ڕێگــری لێکــردوون بــۆ ئەوەی پــاک بینەوە لە شــیرک‌و هاوبــەش دانان‌و شــایەتی درۆ، لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ﴾ واتــە: پیســی‌و بۆگەنــی ﴿مِنَ الْأَوْثَانِ﴾ واتــە: بتــەکان، کــە کردووتانــە بــە پەرســتراو لەگــەڵ خوادا، ئەوانــە گەورەتریــن جۆری پیســین.

ئــەوەی دەردەکــەوێ ﴿مِنَ﴾ لێــرەدا بــۆ ڕوونکردنــەوەی ڕەگــەزە، وەک چــۆن زۆرێک لــە شــیکەرەوانی قورئــان وادەڵێــن، بەڵکــو بــۆ هەندێکــە (التبعیـض)، وە وشــەی (الرجس) گشــتگیرە بــۆ هەمــوو قەدەغەکــراو حــەرام کــراوەکان، ئــەو کات بــە گشــتی قەدەغــە لێکــراوە، وە لــە بتــەکان کــە هەندێکیــان تایبەتــن ﴿وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ واتــە: هەمــوو وتــە قەدەغەکــراوەکان، بێگومــان ئەوانــە لــە وتــە (الــزور)ە، کــە بریتیە لــە درۆ، لەوانــەش شــایەتیدانی درۆ، کاتێ هاوبەش دانان‌و پیســی‌و شــایەتی درۆی لــێ قەدەغەکردن،

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ
﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾
لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ
﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ
مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ
أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ
قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ
وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ
ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ
جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا
لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا
وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟
ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ
عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾

فەرمانی پێكردن بین بە ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ﴾ ڕووبكەنە خواو بەندایەتی بۆ كردنی، پشت لە غەیری خوا بكەن، ﴿غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ جا هاوشێوەی ئەو ﴿فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لە ئاسمان كەوتبێتە خوارەوە ﴿فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ﴾ بە پەلە ﴿أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ واتە: شوێنێكی دوور، بەهەمان شێوە هاوبەش بۆ خوا دانەریش، جا ئیمان هاوشێوەی ئاسمانە پارێزراوەو بەرزە، هەر كەسێك وازی لێبهێنێ وەكو ئەوە وایە لە ئاسمان بەربووبێتە خوارەوە، تووشی جۆرەها بەڵاو نارەحەتی بووبێ، یان باڵندە لە هەوادا دەیرفێنێو جەستەی پارچە پارچە دەكات، بە هەمان شێوە كەسێك كە هاوبەش دابنێو واز لە ئیمان بهێنێ ئەوە شەیتانەكان دەیفڕێنن لە هەموو لایەكەوەو لەتو پەتی دەكەن، وە دینو دونیایشی لێ دەبەن!

(٣٢-٣٣): ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾﴾:

﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ ئەوەی كە باسمان كرد بۆتان لەبەر بە گەورە زانینی سنوورو دروشمەكانی خوا ﷻ، مەبەست لە دروشمەكان دەرخستنی دینە بە ئاشكرا، وە لەوانە قوربانیەكانە بە گشتی وەك چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة (واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەكانی ئاینی خوان)، وە لەوانە ئاژەڵە هەدی وە هەموو نزیكبوونەوەكان بۆ ماڵ، ئەوانەی لە پێشەوە باسكران لە مانای بە گەورەدانانی قوربانیو بەجێهێنانی، وە تەواو كردنی بە چاكترین شێوە بە پێی توانای بەندە، لەوانەش ئاژەڵی هەدی، بە گەورە دانانی بە بەخێو كردنو قەڵەو كردنی، وە تەواو كردنی لە هەموو ڕوویەكەوە،

جـا بە مەزن دانانی دروشـمەکانی خـوا ﷻ لە خواترسـی دڵەکانیانەوەیە، دیارە ئەو کەسـەی بـە مەزنـی دادەنـێ دەیسـەلمێنێ خاوەن تەقـواو ئیمانێکـی تـەواوە، چونکە بە مـەزن دانانی بریتیـە لـە بە گـەورە دانانـی خوا.

﴿ لَكُمۡ فِيهَا ﴾لـە ئاژەڵـی هەدیـدا ﴿ مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴾ ئەمـەش لـە ئاژەڵـە هەدیەکانـدا لـە حوشـترو هاوشـێوەی، خاوەنەکـەی سـوودی لێوەردەگرێ بۆ سـواربوونو شـیرەکەیو هاوشـێوەی ئەوانـە، ئـەوەی کـە زیانی نیـە بـۆی ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴾واتە: دیاریکـراوە بـۆ سـەربڕین، ئەگەر گەیشـتە جێگـای خۆی ئەویـش ماڵی دێرینـی کەعبەیە، واتـە: حەرەم بە گشـتی (مینـا)و جگە لە ئەویـش، ئەگەر سـەربڕدرا، لێی دەخـۆنو دەیکەن بە دیـاری، وە دەرخـواردی هـەژارو پێـەرەتانـی دەدەن.

(٣٤-٣٥): ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا ﴾واتـە: بـۆ هەموو ئوممەتێـک لە ئوممەتە پێشـینەکان قوربانیمـان دانـاوە، واتـە: پەلـە بکەن بۆ خێـرو چاکەکان، تـا ببینین کێ لە ئێـوە کردەوەی چـاک دەکات، حیکمـەت لـە دانانـی خوا ﷻ بـۆ هەمـوو قوربانیـەک، بـۆ بەجێهێنانی یاد کردنو شـوکرانە بژێریەتی، لەبـەر ئەمە فەرموویەتـی: ﴿ لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾واتـە: ئەگـەر چـی ڕەگـەزی شـەریعەتەکانیش جیـاواز بێـت، هەموویـان یەکدەنگـن لەسـەر ئـەم بنەمایـە، ئەویشـە پەرسـتراوێتی خوایـە بـە تـاکـو تەنهـا لـە عیبـادەت کردنـداو وازهێنانـە لـە هاوبـەش دانان بـۆی، لەبـەر ئەوە فەرموویەتـی: ﴿ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ ﴾واتـە: تەنهـا ملکەچی ئـەو بن، نەک غەیری ئـەو، بێگومان ئیسـلام ڕێگـای هەیە بۆ گەیشـتن بـە ماڵی ئاشـتی ﴿ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴾بە خێـری دونیاو دواڕۆژ، (المخبت) ملکـەچ بـۆ پەروەردگاریو جێبەجێـکاری فەرمانەکانی، خـۆ بەکەم زان لـە بەندایەتی بـۆ کردنیدا.

پاشـان باسـی سـیفاتەکانی (المخبتین) دەکات، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ ﴾واتـە: لـە ترسو بە مـەزن دانانی، واز لـەو قەدەغە کراوانە دەهێنـن لەبەر ترسو بیمیـان لە خـوای تاکـو تەنهـا، ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ ﴾لەسـەر ئەوەی تووشـیان دەبـێ لـە ناخۆشـی، بـە هیچ شـتێک لـەو ناڕەحەتیـان تـووڕە نابـنو ناشـکوری دەرنابڕن،

بەڵکو لەبەر خوا ﷻ ئارام دەگرن، بە ئومێدی پاداشت، ﴿ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ واتە: ئەوانەی بە ڕێکو پێکیو چاکیو تەواویەوە ئەنجامی دەدەن، بەوەی فەرزو سوننەتەکان ئەنجام دەدەن، بە ئاشکراو پەنهانو لە دەرەوەو لە ناخەوە، ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ واتە: ئەمە هەموو نەفەقەو خەرجیە پێویستەکان دەگرێتەوە، وەک زەکاتو کەفارەتو نەفەقەو خەرجی ژنەکانو کۆیلەو خزمو کەسەکان، وە نەفەقەو خەرجی سوننەتەکان، وەک خێرو بەخشین بە هەموو جۆرەکانی.

وە پیتی (مِنْ) کە مەبەست پێی هەندێکە، تا بزانرێ ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە ئاسانە، وە (خەڵکی) هانداوە بۆی، بێگومان ئەوە بەشێکی کەمە لە ڕزقو ڕۆزی خوا، بەندە لە بەدەستهێنانیدا توانای نیە، ئەگەر ئاسانکاری خوا نەبێ بۆی پێی ببەخشێ، ئەی ئەو کەسەی ڕزقو ڕۆزیت پێبەخشراوە لە فەزڵو چاکەی خواوە، ببەخشە لەوەی خوا ﷻ پێی بەخشیوی، خوا دەبەخشێ بەسەرتداو فەزڵو چاکەی خۆیت بۆ زیاد دەکات.

(٣٦-٣٧): ﴿ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٣٦ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٣٧ ﴾:

﴿ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ ﴾ ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروشمەکان گشتین لە هەموو ئەوانە لە ئایندا بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێن، وە بە ڕاستی لە پێشەوە خوا ﷻ هەواڵیداوە هەر کەسێک دروشمەکانی بە مەزن دابنێت ئەوە لە خۆپارێزی دڵەکانە، وە لێرەدا هەواڵی داوە لە کۆی دروشمەکانی، حوشترو مانگایە، لەسەر یەکێک لەو دوو بۆچوونە، جا بە مەزن تەماشا دەکرێتو قەڵەو دەکرێت بە چاکی ﴿ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞ ﴾ (واتە: خێرو چاکەی تێدایە بۆتان) ئەوەی دەیکات بە قوربانیو جگە لەویش، لە خواردنو خێر کردنو سوود وەرگرتن ﴿ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا ﴾ واتە: لە کاتی سەربڕیندا بڵێن: (بسم الله) ئنجا سەری ببڕن ﴿ صَوَآفَّ ﴾ واتە: وەستاون، لەسەر پێ دەوستێنرێت دەستی چەپی دەبەسرێتەوە پاشان دەکرێت بە قوربانی ﴿ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا ﴾ واتە: کەوتە سەر زەوی لە جوڵە کەوتو گیانی تیانەما ئەوکاتە ئامادەیە بۆ ئەوەی بخورێت ﴿ فَكُلُواْ مِنۡهَا ﴾ ئەمە دواندنە لەگەڵ ئەو کەسەی قوربانیە کە دەکات، دروستە لە قوربانیەکەی بخوات ﴿ وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّ ﴾ واتە: بیدەن بەو

هـەژارەی داوا نـاکاتو ڕازیـەو خۆی دەگرێ لـە داواکـردن، وە ئەو هەژارەیشـی کە داوا دەکات، هەمـوو یەکێـک لەوانـە مافی هەیە تیایـدا ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ﴾ واتە: حوشـتر ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ (بـۆ ئەوەی سوپاسـگوزاری) خوا بکەن لەسـەر ڕامهێنانـی، بێگومان ئەگـەر ڕامینەکردایـەت بـۆ ئەو قوربانیـە، ئێوە بەو ئاسـانیە تواناتـان نەدەبـوو، بەڵکو زەلیلی کـردوە بۆتـانو ژێرباری کـردوون، وەکو میهرەبانیەک بـۆ ئێوەو چاکەخـوازی لەگەڵتاندا، دەی کەوابـوو ئێوەش ستایشـی بکەن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا﴾ واتـە: مەبەسـت تەنهـا لـە سـەربرینی نیـە، وە گۆشـتو خوێنـی ناگاتـە خـوا، چونکـە ئـەو دەوڵەمەنـدو بێنیـازە، بەڵکـو دڵسـۆزیو چاوەڕوانـی پاداشـتو نیەتـی پاکـی دەوێ تیایـدا، لەبـەر ئـەوە فەرموویەتـی: ﴿وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡ﴾ واتـە: لەمـەدا هاندان هەیە لەسـەر دڵسـۆزی لـە سـەربڕیندا، دەبێت مەبەسـت تەنهـا ڕەزامەنـدی خوا بێـت، نەک فەخـرو شـانازیو ڕووپامایيو بۆ نـاو بانگ، وە نـەک تەنهـا بـۆ عـادەتو نەریت بێـت، بەهەمان شـێوە سـەرجەم پەرستشـەکان، ئەگەر دڵسـۆزی تەقـوای خـوای تێـدا نەبـێ، وەکـو توێکڵێـک وایـە ناوکـی نەبێت، یـان وەک جەسـتەیەک ڕووحی تێـدا نەبێـت، ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی بـە گەورەو مەزنـی ڕابگـرن ﴿عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ﴾ واتە: لەسـەر ئەوەی ڕێنمایـی کردوون، بێگومـان ئەو شایسـتەی تەواترین پیاهەڵدانو ستایشـکردنە، وە گەورەترین بـە مەزن دانانە، ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ واتـە: بـە عیبادەتـی خـوا، بە جۆرێـک بەندایەتی بۆ خـوا بکەن وەکـو ئـەوەی دەیبینـن، ئەگـەر نەگەیشـتنە ئەم پلـەو پایە، بـا لەکاتـی پەرسـتندا بڕوایان وابێ ئـەو ئاگـادارە بەسـەریانەوەو دەیانبینێ.

وە چاکەکاربـن لەگـەڵ بەندەکانـی خـوا ﷻ بـە هەمـوو جۆرەکانـی چاکـەکاری لـە سـوودگەیاندن بـە مـاڵ، یان زانسـت، یان ئامۆژگـاری، یان فەرمـان بە چاکە، یـان قەدەغە کردنـی لـە خراپـە، یـان قسـەیەکی چـاکو جـوانو هاوشـێوەی ئەوە.

چاکەکاران مژدەیان پێدراوە لە لایەن خواوە بە خۆشـبەختی دونیاو دوارۆژ، بێگومان خوا ﷻ چاکەیـان لەگەڵـدا دەکات، وەکـو چۆن چاکەیـان لە عیبـادەت کردنو لەگـەڵ بەندەکانی خـوادا کـردوە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠﴾الرحمـن، (واتـە: ئایا پاداشـتی چاکە هەر چاکـە نیـە)، ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ ٢٦﴾یونس، (واتـە: ئەوانـەی چاکەیـان کردوە پاداشـتی چاکتـرو زیاتریان بـۆ هەیە).

(٣٨): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ئەمە هەواڵی بەڵێن‌و مژدەیە لە لایەن خواوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بێگومان خوا ﷻ پشتیوانیان لێ دەکات‌و هەموو نارەحەتیەکیان لێ بە دوور دەخات، وە هەموو شەڕو خراپەیەکیان لەسەر لادەبات -بەهۆی بڕواهێنانیانەوە- لە شەڕو خراپەی بێبڕواکان، وە شەڕو گومانی خراپی شەیتان‌و شەڕی نەفس‌و دەروونیان‌و کردەوەی خراپەکانیان، وە لە کاتی دابەزاندنی بەڵاو ناخۆشیەکان کاریان لەسەر سووک دەکات، هەموو بڕوادارێک ئەم پشتیوانیەی بۆ هەیە، چاکیش بە پێی ئیمانەکەی، جا هەیە کەمەو هەیە زۆرە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ ﴾ واتە: خیانەتکارە بەو ئەسپاردەی کە خوا خستویەتیە ئەستۆی، مافی خوا بە کەم تەماشا دەکات‌و خیانەتی لێدەکات، وە خیانەت لە خەڵکیش دەکات ﴿ كَفُورٍ ﴾ (واتە: بێبڕوایە بەرانبەر بە نیعمەتەکانی خوا، چاکەی بەسەردا دادەبارێنی، بەڵام ئەو لە بەرانبەردا کوفرو سەرپێچی دەکات، ئا ئەمە خوا خۆشی ناوێ، بەڵکو ڕقی لێیەتی‌و غەزەبی لێدەگرێ، وە لە داهاتوویەکی نزیکدا پاداشتی دەداتەوە لەسەر بێبڕوایی‌و خیانەتەکەی، مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە: خوا ﷻ هەموو دەستپاکێکی خۆش دەوێ کە ئەمانەتەکەی سەر شانی بەجێدەهێنی‌و سوپاسگوزاری پەروەردگاریەتی.

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ
٣٩ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ
رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ
صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ
كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ
عَزِيزٌ ٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ
وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ٤١ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ٤٢ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ
لُوطٍ ٤٣ وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ
ثُمَّ أَخَذْتُهُمْۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ٤٤ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
أَهْلَكْنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ
مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ٤٥ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ
لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا
لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ٤٦

**(٣٩-٤١):** ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ٣٩ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ٤١﴾:

**بڕواداران لە سەرەتای ئیسلامەوە ڕێگریان لێکرابوو لە جەنگ لەگەڵ کردنی بێبڕواکان، وە فەرمانیان پێکرابوو بە ئارامگرتن لەسەریان، ئەمەیش لەبەر حیکمەتێکی خوایی، کاتێ کۆچیان کرد بۆ مەدینەو ئازاردران، وە هێزو توانایان بەدەستهێنا، فەرمانی کوشتار کردنیان پێدرا، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ﴾ ئەوەی لێ تێدەگا ئەوان پێشتر ڕێگریان لێکرابوو لە کوشتار کردنی بێبڕوایان، خوا ڕێگەیدا بە جەنگو کوشتار کردن بەو مسوڵمانانەی شەڕیان لە بەرانبەردا دەکرێ، لەبەر ئەوە ڕێگەیان پێدرا، چونکە ستەمیان لێدەکرا ڕێگریان دەکردن لە ئاینەکەیانو لەسەری سزا دەدرانو لەو پێناوەیدا شاربەدەرکران ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ با تەنها داوای سەرکەوتن لەو بکەنو پشت بەو ببەستن.**

**پاشان باسی سیفەتی ستەمەکەیانی کردو فەرمووی: ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم﴾ واتە: پەنایان برد بۆ دەرچوون، بە هۆی ئازارو ئەشکەنجە دانەوە، ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ﴾ تەنها تاوانیان ئەوە بوو دوژمنانیان تۆڵەیان لێدەکردنەوە ﴿أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ واتە: تەنها ئەوە نەبێ بە تاکو بێ هاوبەش (خوایان) دەپەرست، وە بە دڵسۆزیەوە بەندایەتیان بۆ دەکرد، جا ئەگەر ئەمە گوناهە، ئەوە گوناهی ئەوانە، ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ**

بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ﴾ البروج، (واتـە: وە ئـەم سزایەشـیان هـەر لەبەر ئـەوە دەدران کە بروایـان هێنابـوو بـە خوای بە دەسـەڵاتی سـتایش کراو.

ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر حیکمەتـی جیهـاد کـردن، بێگومـان مەبەسـت تێـدا بەجێهێنانی ئاینـی خواو دوورخسـتنەوەی ئەو بێبڕوایانەیە کـە ئازاری بڕواداران دەدەنو دەستپێشـخەری دەکـەن بـە سـتەم کـردن بەرانبەریـان، تـا خەڵکی بـە ئـازادی بەندایەتـی بۆ خـوا بکەنو شـەریعەتی خـوا بە ئاشـکرا بەرپا بکـەن، لەبەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ ﴾ خـوا ﷻ بـە تێکۆشـەران لـە پێنـاوی ڕێگـای ئـەودا زیانـی بێبـڕواکان ناهێڵـێ ﴿ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ ﴾ واتـە: ئـەو پەرسـتگا گەورانـە کـە هـی دەسـتەکانی خـاوەن کتێبەکانـە دەڕوخێنـرا، پەرسـتگای جوولەکەو گـاورو مزگەوتی مسـوڵمانان ﴿ يُذْكَرُ فِيهَا ﴾ واتـە: لـەم پەرسـتگایانەدا ﴿ ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴾ نوێژەکانیـان تیـادا ئەنجامـدەدا کتێبی خوایان بەسـەردا دەخوێنـرا، یادی خوای تیـادا دەکرا بـە جۆرەها شـێوە، جـا ئەگەر خـوا ﷻ خەڵکی لە نـاو نەبردایـە هەندێکیان بـە هەندێکیان، بێبڕوایـان زاڵ دەبـوون بەسـەر مسـوڵماناندا، پەرسـتگاکانیان تێکـدەدان، وە لـە ئاینەکەیاندا تووشـی فیتنەیـان دەکردن، ئەمـە بەڵگەیە کـە جیهاد ڕێگەپێـدراوە، لەبەر دوورخسـتنەوەی (صائـل) زیانبەخـش، وە غەیـری ئەمەش مەبەسـتە.

وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو وڵاتانەی کـە ئارامی باڵی بەسـەردا کێشـاون بـە عیبادەت کردنـی خـواو ئاوەدانکردنـەوەی مزگەوتـەکانو بەجێهێنانـی دروشـمەکانی خـوا لـە هەمـوو شـوێنەکاندا، لـە فەزڵـی موجاهیدەکانەوەیـە، وە بـە بەرەکەتـی ئەوانـە بێبڕوایانـی دوورخسـتوەتەوە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ ﴾ البقرة، (واتـە: ئەگـەر خـوا خەڵکـی هەندێکیان بـە هەندێکیان لەنـاو نەبردایـە، ئـەوە زەوی تێک دەچـوو، بـەڵام خـوا خـاوەن فـەزڵو چاکەیـە بەسـەر هەمـوو جیهانییان).

جـا ئەگـەر بڵێ: ئێسـتا دەبینیـن مزگەوتەکانی مسـوڵمانان ئاوەدانـەو تێک نـەدراوە، لەگەڵ ئـەوەدا زۆرێـک لەو وڵاتانە میرنشـینی بچووکن، وە دەسـەڵاتێکی نارێکن، ئـەوان ملکەچی ئەوە نابن کوشـتاری دراوسـێکانیان بکـەن لە (الإفرنج) دانیشـتوانی ئەورووپـا، بەڵکو دەبینین مزگەوتـەکان لەژێـر دەسـەڵاتی ئەوانـدا ئاوەدانـە، وە خەڵکەکەیشـی لـە خۆیـان ئەمینـن، لەگـەڵ ئـەوەدا دەسـەڵاتدارە بێبڕواکانیـان توانایـان هەیـە تێکی بـدەنو بیڕوخێنـن، خوای

گـەورەش هەواڵـی داوە ئەگەر خـوا خەڵکی لەنـاو نەبردایـە هەندێکیان بـە هەندێکیان، ئەم پەرسـتگایانە دەڕووخـان، ئێمە ئێسـتا ئـەو لەناو بردنـە نابینین.
وەڵام دەدرێتـەوە کـە ئـەم پرسـیارو ئاڵۆزیـە، دەچێتە ناو ئەم دەقەوە بە گشـتی، وە بەشـێکە لـە بەشـەکانی، بێگومـان هەرکەسـێ بـارودۆخو یاسـای دەوڵەتـەکان بزانێـت لە ئێسـتادا، بێگومـان هەمـوو ئۆممـەتو ڕەگەزێک لـە ژێـر فەرمانڕەوایەتـی خۆیدایـە، وە ئەندامن لە ئەندامـی کۆمـکار، وە بەشـێکن لـە بەشـەکانی حکومـەت، جـا یەکسـانە ئـەو ئۆممەتـە بە توانـاو دەسـت ڕۆیشـتوو بێـت بە ژمـارەی، یـان خۆ ئامادەکـردن، یـان ماڵو سـامان، یان کـردەوە، یـان خزمـەت کردن.
ئـەو حکومەتانـە بەرژەوەنـدی دینـیو ئاینـی ئـەو گەلانـە لەبەرچـاو دەگرن، وە دەترسـێ ئەگـەر ئـەوە نـەکات کەلێـن بکەوێتـە نـاو یاسـاکەیەوەو هەندێ لـە پایەکانی لە دەسـت بـدەن، جا بـەم هۆیـەوە کاروبارەکانی دیـن جێبەجێ دەکەن، بـە تایبـەت مزگەوتەکان کە بێگومـان لەوپـەڕی ڕێـکو پێکیـدان، تەنانەت پایتەختـی دەوڵەتـە گەورەکانیش.
وە ئـەو دەوڵەتانەش کە سـەربەخۆن هەسـتی مسـوڵمانان لەبـەر چاو دەگرن، لەگـەڵ بوونی ئیرەیـیو ڕقو کینـەدا لـە نێوان دەوڵەتەکانـی گاورەکاندا، کە خوا ﷻ هەواڵـی داوە ئەوە تا ڕۆژی دوایـی بـەردەوام دەبێت، حکومەتی مسـوڵمان بەو شـێوە دەمێنێتـەوە ناتوانێ بەرگری لـە خـۆی بـکات، پارێزراو دەبـێ لە زۆرێـک لـە زیانەکانیان، لەبـەر ئیرەیی بردنیـان، هیچ یەکێکیـان ناتوانـێ زەبرو زەنـگ بەکاربهێنێ دژی مسـوڵمانان بە هۆی مەترسـی دەوڵەتانی تـر، لەگـەڵ ئەوەدا خـوا ﷻ هەر دەبێ سـەرکەوتنی مسـوڵمانان نیشـانی بەندەکانـی بدات، ئـەوەی کە پەیمانـی پێی داوە لـە کتێبەکەیدا.
بێگومـان هۆکارەکانـی دەرکـەوت، بە هەسـت کردنی مسـوڵمانان بە گرنگـی گەڕانەوەیان بـۆ لای ئاینەکەیـان، وە هەسـتکردن بە بیرو بـڕوای کارکردن، ستایشـی دەکەیـنو داوای ئـەوەی لێدەکەیـن نـازو نیعمەتـی تـەواو بـکات بەسـەرمانەوە، لەبـەر ئـەوە لـە بەڵێنێکـی ڕاسـتەقینەی پـڕاو پـڕ لەگەڵ ئێسـتادا: ﴿ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ﴾ واتە: هەڵدەسـتێ بەسەرخسـتنی ئاینەکـەی، بە دڵسـۆزی ئەنجامـی دەدات، لـە پێناویدا دەجەنگێت، تا وشـەی خـوا بـەرز ڕابگـرێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ واتە: تـەواوی هێـز، زاڵە بەسـەر هەموو بەدیهێنراوەکانـدا، نێوچاوانیـان بـە دەسـتیەتی، مژدەتـان لـێ بێ ئـەی مسـوڵمانان، بێگومان ئەگـەر چـی ئێـوە ژمـارەو خـۆ ئامادەکردنتـان لاواز بـێ، وە دوژمنتـان لـە ڕووی ژمارەو

توانـاوە بەهێزتر بێ، بەڕاسـتی ئێوە پشـتیوانتان بەهێزو بە توانایە، وە پشـتتان بەسـتوە بەوەی کـە دروسـتی کـردوون، هـەر کردەوەیەک ئەنجـام بـدەن ئەو دروسـتی کـردوە، جا کار بکـەن بەو هۆکارانـەی فەرمانی پێکراوە، پاشـان داوای سـەرکەوتنتان لەو بکـەن، هەردەبێ سـەرتان بخـات ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧ ﴾محمد (واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانەی برواتـان هێنـاوە! ئەگـەر ئێـوە یارمەتـی (ئاینـی) خـوا بدەن خـواش ئێـوە زاڵو سـەرکەوتوو دەکات (بەسـەر بێبڕوایانـدا)، وە پێگەتـان جێگیر دەکات (لە جەنـگو خۆڕاگرتـان) دەکات).

ئـەی بڕواداران هەسـتن بـە بەجێهێنانی مافەکانی بـڕواو کردەوەی چـاک، بێگومان ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ ٥٥ ﴾النور، (واتـە: خـوا بەڵێنـی داوە بـەو کەسـانەی کـە بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوەی چاکیـان کـردوە کـە بێگومـان دەیانکاتـە جێنشـینی (خەڵکـی تر) لە زەویـدا هـەر وەک ئەوانـی (ئیماندارانـی) پێش ئەمانـی کـردە جێنشـین، وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسـپێنێ ئـەو (ئاینە)ی کـە خوا پێـی ڕازی بووە بۆیـان، وە ترسو بیمیان بـۆ دەگۆڕێ بـە ئاسـایشو ئارامـی (لەوکاتـەدا ئیتـر) هەر مـن دەپەرسـتنو هیچ هاوبەشـێکم بـۆ بڕیار نادەن).

پاشـان باسـی نیشـانەی ئەوەی کردوە کە سـەری دەخات، بێگومان هەرکەسـێ بانگەشـەی ئـەوە بـکات خوا سـەری دەخـات لەگـەڵ ئاینەکەیـدا، وە بـەم شـێوەیە وەسـف نەکرابوو، ئـەوە درۆزنـە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: دەسـەڵاتمان پێـدان لەسـەر زەویـدا، بەبـێ ئـەوەی کەسـێ بەربەرەکانیـان بـکاتو دژایەتیـان بـکات ﴿ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتـە: لـە کاتو سـنووری خۆیـدا، وە مەرجەکانـی لـە نوێـژی هەینـیو جەماعەتـدا، ﴿ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ واتە: ئەوەی بە تایبەت لەسـەریانە، وە لەسـەر ژێردەسـتەکانیان بـە گشـتی، دەیـدەن بـە خەڵکی شایسـتە، کە شـایانی ئەوەن پێیـان بدرێ ﴿ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ ئەمـە هەمـوو کارێکـی چـاک دەگرێتـەوە بـە پێـی شـەرعو عەقـڵ، لـە مافەکانـی خـواو مافـی خەڵکـی ﴿ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ هەمـوو خراپەیـەک دەگرێتـەوە بـە پێی شـەرعو عەقـڵ، خراپیەکـەی زانراو بـێ، وە فەرمان کردن بە شـتێکو قەدەغەکـردن لێـی دە چێتـە ناویـەوە، ئەوەی کـە تەواو نابـێ تەنها بـەوە نەبێ، جـا ئەگەر

فەرمـان بـە چاکـەو قەدەغەکردنـی خراپـە لەسـەر خوێنـدنو فێربـوون وەسـتابێ، خەڵکی ناچـار دەکرێـن لەسـەر فێربـوونو فێرکـردن، وە ئەگەر لەسـەر تەمێکردنێک وەسـتا بێت، لـە شـەرعدا ئەندازەکـەی دیاریکرابوو، یان دیـاری نەکرابوو، وەکو جۆرەکانی سەرزەنشـت کـردن، ئـەوە پێی هەڵدەسـتن، وە ئەگەر لەسـەر ئەوە وەسـتابوو خەڵکی دابنـرێ رێگری لێ بکـەن ئـەوە پێویسـتە بکرێـت، وە هاوشـێوەی ئەوانە کە فەرمـان بە چاکـەو قەدەغەکردنی خراپـە تـەواو نابـێ تەنها بـەوە نەبـێ ﴿ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴾ واتە: هەمـوو کاروبارەکان دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، بێگومـان هەواڵی داوە سـەرەنجام بـۆ خۆپارێزە.

هـەر کەسـێ خـوا دەسـەڵاتی دابـێ بەسـەر بەندەکاندا لـە دەسـەڵاتدارە گـەورەکان، وە بە فەرمانـی خوا ﷻ هەسـتا، ئەوە سـەرەنجامێکی باشـی دەبێت، وە هەرکەسـێ خۆی بسـەپێنی بە هێزو دەسـەڵاتو سەرکەشـی، وە ئەوەی هەواو ئارەزووی بیەوێت بەسـەریاندا بسـەپێنێ، بێگومـان ئـەوە ئەگـەر دەسەڵاتیشـی هەبێـت، سـەرەنجامی بـاش نابێـت، دەسـەڵاتەکەی شـوومو غـەرە، سەرەنجامیشـی زەمکراوو سـەرکۆنەکراوە.

(٤٢-٤٦): ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ
وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَـٰبُ مَدْيَنَ ۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَـٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ
كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَـٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ
عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ
يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ
﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾ خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: ئەگـەر بـە درۆت دەخەنـەوە ئـەو هاوبـەش دانەرانـە، تـۆ یەکـەم پێغەمبەر نیـت بـە درۆ دانرابیت، وە یەکـەم ئوممەتیـش نیـن پێغەمبەرەکەیان بـە درۆ زانیبـێ، ﴿ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَـٰبُ مَدْيَنَ ﴾ واتە: گەلەکەی شـوعەیب ﴿ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَـٰفِرِينَ ﴾ بـە درۆزانـران، سـزام بـۆ پێـش نەخسـتن بەڵکو مۆڵەتـم پێـدان، هەتا بـەردەوام بـوون لە سـەرپێچیداو رۆچـوون، وە لە بێبروایـیو هاوبەش دانانیشـدا لـە زیـاد بوونـدا بـوون ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ﴾ بـە سـزا گرتنێکـی بەهێـزو بەتوانـا ﴿ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾ نکوولـی مـن لەسـەر کوفـرو بە درۆخسـتنەوەیان، سـەرەنجام دەبـێ توونـدتریـن سـزا بدرێن، وە بـوون بـە ناشـرینترین عیبـرەت، هەندێکیانـی خنکاند،

هەندێکیــان بــە بوومەلەرزەو هەورە تریشــقە لەنــاوی بــردن، هەندێکیان بە بــای تیژ لەناوی بــردن، وە هەندێکیانــی نغــرۆی نــاو زەوی کــرد، هەندێکــی تریان بە ســزای ڕۆژی ســێبەر لەنــاوی بــردن، دەی با بە درۆدانــەران پەند لەوانــە وەربگرن، کە تووشــیان بێت وەک چۆن ئــەوان تووشــیان بــوو، بێگومان ئەمــان لە ئەوان باشــتر نیــن، وە بەرائەتو پاکیان لــە کتێبە پیرۆزەکانــەوە بــۆ دانەبەزیــوە، چەندیــن خەڵک لــە بەدرۆدانەران بەو شــێوە ســزادران.

لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ ﴾ واتــە: چەندەهــا شــارو دێهــات ﴿ أَهْلَكْنَٰهَا ﴾ واتە: بە ســزای ســەختو ڕیســوایی لــە دونیــادا ﴿ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ﴾ بە بێبڕوایــی کــردنو بەدرۆخســتنەوەی پێغەمبەرانیــان، ســزای ئێمــە ســتەمێک نەبــووە بۆ ئەو ســتەمکارانە ﴿ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾ واتــە: لە وڵاتیاندا، کۆشــکو تەلارەکانیان، کەوتبــووە ســەر ســەقفەکان، کە ببوو بــە شــوێنێکی ڕوخاو پاش ئــەوەی کە ئــاوەدان بوو، وە ترســناک بــوو پــاش ئەوەی پــڕی لــە خەڵکی بــوو ﴿ وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴾ واتــە: چەندیــن بیــرە ئاو هەبــوون خەڵکــی لێی کــۆ دەبوونــەوە بــۆ خۆیــانو ئاژەڵەکانیان ســوودیان لــێ وەردەگــرت، ســەرەنجام خەڵکەکــەی لە دەســت داو کەســێک نەمــا کەڵکی لێــوەر بگرێــت، چەندیــن کۆشــکو تــەلار خاوەنەکانــی لەگەڵــدا مانــدوو بــوون، بەرزیان دەکــردەوەو دەیــان ڕازانــدەوە، بــەڵام کاتــێ کــە فەرمانی خــوا ﷻ هات هیچ ســوودێکی پێنەگەیانــدن، بــە چۆڵــی مانــەوە، بێگومــان بــوو بــە عیبــرەتو پەندێــک بۆ ئەو کەســەی پەنــد وەردەگرێــت، وە نموونەیەک بــۆ ئەوانەی بیر دەکەنــەوە ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بــە جەســتەو دڵەکانیــان ﴿ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ ﴾ ئایەتو نیشــانەکانی خوا ﷻ، وە ســەرنج بــدەن لــەو شــوێنانەی کــە بــوون بــە پەنــد ﴿ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ هەواڵی گەلانــی پێشــوو، ئــەو ســەدانەی کــە ســزادران، ئەگەرنا تەنهــا بە تەماشــا کردنو بیســتن، وە گەشــتکردن بــەو شــوێنانەدا بەبێ بیر کردنــەوەو پەنــد وەرگرتن هیچ ســوودو کەڵکێکی نیــەو ناگــات بە ئامانــج، لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾ واتــە: ئــەم کوێــر بوونــە زیان بــە ئایــن دەگەیەنێ، کوێــر بوونی دڵــە لــە ئاســتی ڕاســتیدا، هەتــا نابینێــ، وەکو چــۆن کوێر شــتەکان نابینــێ، بــەڵام کوێر بوونــی چــاو تەنهــا زۆرێــک بەرژەوەندیەکانــی دونیا لە دەســت دەدات.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا
عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن
قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ
﴿٤٨﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَالَّذِينَ
آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾
وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ
الْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا
إِذَا تَمَنَّىٰ أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي
الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ
مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ
قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ
الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ
فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَىٰ صِرَاطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ
تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

(٤٧-٤٨): ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ (٤٧) وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ (٤٨) ﴾: ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ ﴾ واتە: بە درۆدانەران داوایان دەکرد بە پەلە سزایان بۆبێ، بەهۆی نەفامیو ستەمکاریو لە خۆبایی بوونیانەوە، خوایان بەبێ توانا لە قەڵەم دەداو پێغەمبەرەکەیان بەدرۆدەخستەوە، لە کاتێکدا خوا ﷻ هەرگیز پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات، ئەوەی پەیمانی پێداون بە سزادان هەردەبێ ڕووبدات، هیچ بەرگریو ڕێگریەک نابێتە هۆکار.

بەڵام پەلەکردنو دەست پێشخەری تیادا، ئەوە لای تۆ نیە ئەی موحەممەد ﷺ، با خەمبارت نەکات پەلەکردنیانو بە بێ توانا تەماشاکردنی ئێمە، بەرانبەر بە ئەوان، بێگومان سزای ڕۆژی دوایی لە پێشیانەوەیە کە سەرەتاو کۆتاییان کۆدەکاتەوەو جەزایان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، ئنجا سزای هەتا هەتاییان بۆ دەبێ، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ لە درێژی ئەو ڕۆژەو نارەحەتیو گەورەیی، جا یەکسانە لە دونیادا سزا بدرێن یان بۆیان دوا بخرێ، بێگومان ئەم ڕۆژە هەر دەبێ پێی بگەن.

وە دەگونجێ مەبەست: لەوە کە خوا ﷻ زۆر لەسەرخۆیە، ئەوە بێت ئەگەر ئەوان داوای سزادانی بەپەلە بکەن، بێگومان یەک ڕۆژ لە لای خوا وەک هەزار وایە لەلای ئەوان کە بیژمێرن، جا ماوە ئەگەرچی ئێوە پەلە بکەنو سزاتان بەسەردا دوا بکەوێ ئەوە بێگومان خوا ﷻ بۆ ماوەیەکی زۆر مۆڵەتتان دەداو بێ ئاگا نابێ لێتان، هەتا کە ستەمکاران دەگرێ بە سزایەک هەرگیز ڕزگاریان

نابـێ ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا ﴾ واتـە: ماوەیەکـی زۆر مۆڵەتـم دان ﴿ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ﴾ واتـە: لەگـەڵ سـتەم کردنیانـدا بـە هیـچ شـێوەیەک دەسـت پێشـخەریان بـۆ سـتەم کـردن نەبـووە مایـەی ئـەوەی ئێمـەش دەسـت پێشـخەری بکەیـن بـۆ سـزادانیان ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهَا ﴾ بـە سـزادان ﴿ وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾ واتـە: لەگـەڵ سـزادانیدا لـە دونیـا دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا ﷻ، ئنجـا بـە هـۆی تاوانەکانیشـیەوە سـزا دەدرێ، جـا بـا ئـەو ستەمکارانە ئاگـادار بـن لـە پێویسـت بوونـی سـزای خـوای گـەورە بەسـەریاندا، وە بـا لـە خۆبایـی نەبـن بـە هـۆی ئـەوەی مۆڵەتیـان پێـدراوە.

(٤٩-٥١): ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ ﴾

﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ ﴾ خـوا فەرمـان بـە بەنـدەو پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ دەکات کـە لەگـەڵ هەمـوو خەڵکیـدا بـدوێ، بـەوەی کـە پێغەمبـەرە لـە لایـەن خـواوە بـە هـەق‌و ڕاسـتی نێـردراوە، مـژدەدەرە بـۆ بـڕواداران بـە پاداشـتی خوایـی، ترسـێنەرە بـۆ بێبـڕواو سـتەمکاران لـە سـزای خـوا.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مُّبِينٌ ﴾ واتـە: ئاگادارکردنـی ڕوون کردۆتـەوە، ئەویش ترسـاندنە لەگـەڵ ئاگـادار کردنـەوەدا بـەوەی لێـی دەترسـێ، چونکـە بەڵگـەو سـەلماندنی ڕوون‌و ئاشـکرای هێنـاوە لـە سـەر ڕاسـتی ئـەوەی ئاگـاداری کردوونەتـەوە پێـی، پاشـان بـە تێـرو تەسـەلی باسـی ترسـاندن‌و مـژدەدان دەکات، جـا فەرموویەتـی: ﴿ فَالَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە بـە دڵەکانیـان، بڕوایەکـی تـەواوو ڕاسـتگۆیانە ﴿ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ بـە ئەندامانـی جەسـتەیان ﴿ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ ﴾الحج، واتـە: ئـەو بەهەشـتانەی کـە پـڕن لـە جۆرەهـا نـازو نیعمـەت، لـە خـواردن‌و خواردنـەوەو ژن‌و ژنخـوازی‌و وێنـای جـوان‌و دەنگـەکان، وە لەسـەرووی هەموویـەوە بینینـی پەروەردگـاری بەخشـندەو بیسـتنی وتەکانـی ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا ﴿٨٦﴾ ﴾المائـدة، واتـە: نکوڵـی نازونیعمەتەکانـی پەروەردگاریـان دەکـرد، وە پێغەمبـەران‌و نیشـانەکانیان بـە درۆ دەخسـتەوە، ئەوانـە هاوەڵـی دۆزەخـن بـۆ هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، سـزایان لەسـەر سـووک ناکـرێ، وە بـۆ سـاتێکیش پشـوویان پێنـادرێ.

(٥٢-٥٤): ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّىٰ أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي

أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾
لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ
فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـە حیکمـەتو لێزانینـی خـۆی، وە هەڵبژاردنـی بـۆ بەندەکانـی، بێگومـان خـوا ﷻ پێـش موحەممـەد ﷺ هیـچ نێردراوێکـی نەنـاردوە ﴿ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ ﴾ واتـە: دەیخوێنـد بـە خوێندنەوەیـەک کـە خەڵکـی پـێ ئاگـادار بکاتـەوەو فەرمانیـان پـێ بـکات بـە چاکـەو قەدەغەیـان بـکات لـە خراپـە ﴿ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ ﴾ واتـە: لـە خوێندنەوەکەیـدا لە ڕێگـای فرتو فێڵەکانیـەوە کـە پێچەوانـەی ئـەو خوێندنـەوە بـوو، لەگـەڵ ئـەوەدا خـوای گـەورە پێغەمبەرانـی پاراسـتووە بـەو پەیامـەی کـە لـەلای خـواوە دەیهێنـن بـۆ بەنـدەکانو ڕایدەگەیەنـن، لـە هەمـوو گومـانو تێکـەڵ بـوون بـە شـتێکی تـرەوە.

بـەڵام ئـەم گومـان دروسـتکردنە لـە لایـەن شـەیتانەوە جێگیـرو بـەردەوام نیـە، بەڵکـو بەربەسـتێک بـوو دەهاتـە پێـشو دواتـر لادەچـوو، وە بـۆ هەمـوو بەربەسـتەکان ئەحکامـی خـۆی هەیـە، لەبەرئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ واتـە: لای دەبـاو دەیسـڕێتەوەو بەتاڵـی دەکاتـەوە، وە ڕوونـی دەکاتـەوە کـە ئـەوە لـە نیشـانەو ئایەتەکانـی ئـەو نیـە ﴿ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتـە: دەیچەسـپێنیو ڕزگـاری دەکاو دەیپارێـزێ، وە بـە پاکـی دەمێنێتـەوە لـە تێکـەڵ بوونـی گومانـی شـەیتان ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ ﴾ واتـە: خـوا زۆر زانایـە ﴿ حَكِيمٌ ﴾ شـتەکان لـە جێگـای خۆیـدا دادەنێـت، جـا لـە تـەواوی حیکمەتـی ئەوەیـە شـەیتانەکانی بـە توانـا کـردوە لـەو گومانـەی کـە باسـکرا، تـا بـە دەسـت بێـت ئـەوەی کـە باسـی کـردوە، بـە ئایەتـی: ﴿ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً ﴾ بـۆ دوو دەسـتە لـە مـرۆڤ، خـوای گـەورە لێیـان بێباکـە ئەوانیـش بریتیـن لـە: ﴿ لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ واتـە: لاوازیو نەبوونـی ئیمانێکـی تـەواو و بەڕاسـت دانانێکـی ڕاسـتەقینە، جـا ئـەم جـۆرە کەسـانە بچوکتریـن گومـان کاریگـەری دەهێنـێ بەسـەر دڵیانـدا، ئەگـەر گومانەکانـی شـەیتان ببیسـتن تووشـی گومـانو دوو دڵـیو فیتنـە دەبـن، ئنجـا دەبێتـە فیتنـەو بـەڵا بۆیـان ﴿ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە دڵەکانیـان ڕەقـە، نـە ئامۆژگـاریو نـە

سەرزەنشت کردن کاریگەریان لەسەر دروست ناکات، وە لە خواو پێغەمبەرەکەی تێناگەن بە هۆی ئەوەی دڵیان رەقە، جا ئەگەر ببیستن ئەو گومانانەی کە شەیتان دەیخاتە دڵیانەوە دەیکەنە بەڵگەیەک لەسەریان لەسەر پرووپوچیەکانیان، وە مشتو مڕی پێ دەکەنو دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی پێدەکەن، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ واتە: دژایەتی خواو نکوولی راستی دەکەنو پێچەوانەی دەجوڵێنەوە، دوورن لە راستیەوە، ئەو گومانەی شەیتان دروستی دەکات کاریگەری لەو دوو کۆمەڵە دەکات، جا ئەو پیسیو چەپەڵیەی لە دڵیاندا هەیە دەریدەخەن، بەلام دەستەی سێیەم، ئەوە دەبێتە رەحمەت بۆیان، ئەوانەش ئەوانەن کە باسکراون لە ئایەتی: ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ وە لەبەرئەوە خوا ﷻ ئەوەندە زانستی پێی بەخشیون کە هەقو راستی لە پووچو بەتاڵ جیابکەنەوە، وە رێنماییو ژیریی لە گومڕایی، جا نێوانی ئەو دوو کارە دەتوانن جیا بکەنەوە -راستیەکی جێگیر کە خوا چەسپاندوویەتی، وە بەتاڵێکی کاتی کە خوا ﷻ لای دەبات- بەوەی لەسەر هەر یەکەیان بەڵگە هەیە، وە تا بزانن خوا ﷻ کاربەجێیە، هەندێ جۆری بەڵاو نارەحەتی دەهێنێتەوە، بۆ ئەوەی دەر بکەوێ نهێنی ناو دەروونەکان ئەوانەی کە چاکن ئەوانەشی کە خراپو پیسن ﴿فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ﴾ بە هۆی ئەوەوە (بڕوای پێدەهێنن)و ئیمانیان زیاد دەکات، لە کاتی رەتکردنەوەی بەربەستو گومانەکاندا ﴿فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡ﴾ واتە: ملکەچی بێ، تەسلیمی حیکمەتەکانی ببێت، ئەمە لە هیدایەتی خوایە بۆیان ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ بە هۆی بڕوا هێنانیانەوە ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ راستی هەبووە بە راستیو کاری بە داخوازیەکانی کردوە، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە خوا ﷻ دامەزراویان دەکات بە وتەی بە رێو جێ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دونیاو دواڕۆژدا، ئەم جۆرە لە جێگیر کردنو دامەزراندنی خوایە بۆ بەندەکەی.

ئەم دەقانە روونکردنەوەیە کە بێگومان پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقو شوێنکەوتووی چاکە بوو لە پێغەمبەران، کاتێ کە لێیەوە روویدا لە کاتی خوێندنەوەیدا ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١﴾ واتە: جا کاتێ گەیشتە ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ١٩ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ٢٠﴾النجم، شەیتان گومانی خستە ناو خوێندنەکەیەوە (تلک

الغرانیــق العلــی، وإن شــفاعتهن لترجــی) جــا پێغەمبــەر ﷺ بــەوە خەمبــار بــوو، وە بــۆ خەڵکیــش بــوو بــە فیتنــە، وەک چــۆن خــوا باســی کــردوە، ئنجــا خــوا ﷻ ئــەم دەقانەی دابەزانــد:

(٥٥-٥٧): ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرْيَةٖ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً أَوۡ يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَقِيمٍ ٥٥ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٥٦ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٥٧ ﴾:

﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرْيَةٖ مِّنْهُ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی دۆخــی بێبــڕواکان، کــە بــەردەوام ئــەوان لــە گومانــدان دەربــارەی ئــەو قورئانــەی بــۆ تــۆ هاتوە ئــەی موحەممــەد ﷺ بــە هــۆی سەرکەشــیو پشــت تێکردنیانــەوە، بێگومــان ئــەوان بەردەوامــن لەســەر ئــەو حاڵــە ﴿ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً ﴾ واتــە: لــە نــاکاودا ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَقِيمٍ ﴾ واتــە: هیــچ خێرێکــی تیانیــە، ئەویــش ڕۆژیــی دواییــە، جــا ئەگــەر ڕۆژی دوایــی هــات، بێگومــان بێبڕوایــان دەزانــن ئــەوان درۆزن بوونــە، وە پەشــیمان دەبنــەوە کاتــێ کــە پەشــیمان بوونــەوە هیــچ کەڵکێکــی نیــە، وە بــێ ئومێــد دەبــن لــە هەمــوو خێرێــکو ئــاوات دەخــوازن کــە بڕوایــان بــە پێغەمبــەر بهێنایــەو لەگــەڵ ئــەودا ڕێگــای یەکتاپەرســتیان بگرتایەتــە بــەر، جــا لەمــەدا ئاگادارکردنەوەیــەک هەیــە بــۆ ئــەوان لەبــەردەوام بوونیــان لەســەر گومــانو دوودڵــی.

ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٥٦ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٞ
مُّهِينٞ ٥٧ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ
أَوْ مَاتُواْ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ
خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٥٨ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلٗا يَرْضَوْنَهُۥۚ
وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ٥٩ ۞ ذَٰلِكَۖ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ
مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ
لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٦٠ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي
ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ
بَصِيرٞ ٦١ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ
مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ٦٢
أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ
مُخْضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ٦٣ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ٦٤

﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٖ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی ﴿لِّلَّهِ﴾ تەنها بۆ خوای بەرزە نەک بۆ غەیری ئەو ﴿يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ بە حوکمێکی دادپەروەرانەو یەکلاکەرەوە ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە خواو پێغەمبەرەکانی وە ئەوەی کە بۆیان هاتوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ تا بە کردەوەکانیان بیسەلمێنن کە ئیمانداران ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ نیعەتی دڵو ڕووحو جەستە، بە جۆرێ کە وەسفکاران ناتوانن وەسفی بکەن، وە عەقڵیش دەرکی پێناکات ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە خواو پێغەمبەرەکانی ئایەتو نیشانەکانیان بە درۆدانا، کە ڕێنمایی کارە بۆ هەقو ڕاستی، جا پشتیان تێکردوە، یان عینادیان کردوە، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ سزایەکی زۆر توونەدو بە ئێش بۆ ئەوان کە دەگاتە دڵەکانیان، هەروەکو چۆن گاڵتەو سەرزەنشتی پێغەمبەرانو ئایەتەکانیان کردوە، بەو شێوەیە خوای بەرز سزایان دەدات.

(٥٨-٥٩): ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٥٨ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلٗا يَرْضَوْنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ٥٩﴾:

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ﴾ ئەمە مژدەیەکی گەورەیە، بۆ هەرکەسێ هیجرەت بکا لە ڕێگای خوادا،ماڵو منداڵو وڵاتی بەجێ بهێڵێ تەنها لە پێناوی خوادا، لە پێناوی دینی خوا ﷻو سەرخستنیدا، بێگومان ئەمە پاداشتی پێویست دەبێ لەسەر خوا، یەکسانە ئەگەر لە سەر جێگاکەی بمرێ، یان بکوژرێت لە ڕێگای خوادا ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنٗا﴾ لە ژیانی بەرزەخدا، وە لە ڕۆژی دواییدا بە چوونە ناو ئەو بەهەشتە گشتگیرەی کە ڕووحو

ڕەیحـانو جوانـیو چاکـی تێـدا کۆکراوەتـەوە، وە بەهەمـان شـێوە نازونیعمەتەکانـی دڵو جەسـتەش.
دەگونجـێ ماناکـەی ئـەوە بێـت: ئـەو کەسـەی کـۆچ دەکات لـە ڕێگـای خـوادا، ئـەوە گرەنتـی ڕزقو ڕۆزی پێـدراوە لـە دونیـادا، بـە ژیانێکـی بەرفـراوانو خـۆش، جـا یەکسـانە خـزا ﷻ زانیبێتـی کـە ئـەو لەسـەر جێگـا دەمـرێ، یـان دەکـوژرێو شـەهید دەبـێ، هەمـوو ئەوانـە ڕزقو ڕۆزی بـۆ دیـاری کـراوە.
بـا وا گومـان نەبـا ئەگـەر دەربچـێ لـە شـارو وڵاتـی ئـەوە تووشـی هـەژاریو نـەداری دەبـێ، ڕۆزیـدەری (کـە خوایـە) چاکتریـن ڕۆزیدەرانـە، بێگومـان وەک چـۆن هەواڵیـدا ڕوویـدا، ئـەو کۆچکەرانـەی پێشـوو لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ وازیـان لـە وڵاتو مـاڵو منداڵیـان هێنـا لـە پێنـاو سەرخسـتنی دینـی خـوادا ﷻ، نەمانـەوە بـە شـێوەیەکی کـەم نەبـێ، هەتـا خـوا سەریخسـتن بەسـەر دوژمنانـداو دەسـەڵاتی پێـدان لەنـاو بەندەکانـدا، ئەوەنـدە سـەروەتو سـامانیان دەسـتکەوت، تـا پێـی بـوون بـە دەڵەمەندتریـن خەڵـک، جـا لەسـەر ئـەم بۆچوونـە، وتـەی خـوا: ﴿ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥ ﴾ یـان ئەوەیـە خـوا ﷻ وڵاتەکانیـان لەسـەر دەسـت ئـازاد دەکات، بـە تایبـەت ئازادکردنـی شـاری مەککـە، بێگومـان ئـەوان چوونـە ناویـەوە لـە حاڵەتـی ڕزامەنـدیو دڵخۆشـیدا، یـان مەبەسـتی پێـی ڕزقو ڕۆزی دواڕۆژە ئەویـش چوونـە نـاو بەهەشـتە، جـا لێـرەدا دەقەکـە دوو ڕزقو ڕۆزی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، ڕزقو ڕۆزی دونیـا، وە ڕزقو ڕۆزی دواڕۆژ، دەقەکـەش بـۆ هەردووکیـان دەبێـتو هـەردوو واتاکـە تـەواوە، هیـچ ڕێگریـەک نیـە لـە کۆکردنەوەیانـدا.
﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ ﴾زانایـە بـە هەمـوو کاروبـارەکان، ئاشـکراو دیـارو سـەرەتاو دوایـان ﴿ حَلِيمٌ ﴾(لەسـەرخۆیە) بوونـەوەرەکان سـەرپێچی دەکـەن، بـە ئاشـکرا تاوانـی مـەزن ئەنجـام دەدەن، وە ئـەو سـزایان بـۆ پێـش ناخـات لەگـەڵ تـەواوی توانـاو دەسـەڵاتیدا، بەڵکـو بـە بـەردەوام ڕزقو ڕۆزیـان پێدەگەیەنـێ، وە فەزڵـی خۆیـان بەسـەردا دادەبارێنـێ.
(٦٠): ﴿ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٦٠ ﴾
﴿ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ﴾ هـەر

كەسێك تاوانێكی بەرانبەر ئەنجام بدریێو ستەمی لێبكرێ ئەوە دروستە بۆی بە وێنەی ئەو ستەمە تۆڵەی خۆی بكاتەوە، ئەگەر ئەوەی كرد، ئەوە گوناهی ناگاتو لۆمە ناكرێت، ئەگەر لە دوای ئەوە جارێكی تر دەستدرێژی بكرێتە سەر، ئەوە بێگومان خوا سەری دەخات، چونكە ستەم لێكراوە، دروست نیە دەستدرێژی بكرێتە سەر، چونكە ئەو هەقی خۆی كردۆتەوە، ئەوەی حەقیقەتو بنەماو راستیە هیچ كەس سزانادرێ ئەگەر ستەمی لێبكرێو تاوانی بەرانبەر ئەنجام بدرێ، سەركەوتن لە ئەوەوە نزیكە﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴾ واتە: لە سەرپێچی كاران دەبورێت، سزایان بۆ پێش ناخات، وە لە گوناهەكانیان خۆش دەبێو شوێنەوارەكەی دەسڕێتەوە لێیان. خوای مەزن ئەمە وەسفی جێگیرێتی بە بەردەوامی، وە مامەڵە كردنی لەگەڵ بەندەكانیدا لە هەموو كاتەكاندا بە لێبوردەییو لێخۆشبوون.

جا پێویستە لەسەرتان ئەی ئەو كەسانەی ستەملێكراون، لێبوردە بنو دڵەكانتان پاك بكەنەوەو لە بەرانبەرتان خۆش بین، تا خوا ﷻ مامەڵەتان لەگەڵ بكات وەك چۆن مامەڵە لەگەڵ بەندەكانیدا دەكەن﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الشورى، (واتە: جا هەر كەسێك ببورێو ئاشتی بكات، ئەوە پاداشتی ئەو لە لای خوایە، بە راستی خوا ﷻ ستەمكارانی خۆش ناوێ).

(٦١-٦٢): ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ ﴾:

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ ﴾ لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ ئەو یاساو حوكمە دادپەروەرانەی بۆ داناون، ئەویش جوان مامەڵە كردنە لە ئەندازە گرتن مامەڵە كردنیدا، كە ﴿ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ ﴾ واتە: شەو دەخاتە سەر رۆژو، رۆژیش دەخاتە سەر شەو، شەو لە دوای رۆژ دەهێنی، رۆژیش لە دوای شەو، یەكێكیان زیاد دەكات لەوی تریان كەم دەكات، پاشان بە پێچەوانەوە، جا بەو شێوە هەموو وەرزەكان رێكدەخرێن، وە بەرژەوەندی شەوو رۆژو مانگو خۆریش، كە گەورەترین نیعمەتن بەسەر بەندەكانەوەو لە گرنگترینیانن﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ ﴾ واتە: هەموو دەنگەكان دەبیستێ بە جیاوازی زمانەكانو هونەری داواكاریەكان﴿ بَصِيرٌ ﴾ مێرووڵەی

ڕەش دەبینێ، لە ژێر بەردێکی ڕەشی قەترینندا لە شەوە زەنگی تاریکیدا ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ ﴾الرعد (واتە: یەکسانە (بۆ خوا) ئەوەتان بە نهێنی قسە بکاتو ئەوەی کە لە شەودا خۆی دەشارێتەوەو ئەوەی کە لە ڕۆژدا دەردەکەوێ).

﴿ ذَٰلِكَ ﴾خاوەنی حوکمو ئەحکامە ﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾واتە: (بە ڕاستی هەر خوا هەقە)و جێگیرە، یەکەمینەو کەس پێشی نەکەوتووە، کۆتایە کەس لە دوای نایەت، تەواوە لە ناوسیفەتەکاندا، خاوەن پەیمانە، پەیمانی ڕاستە، وە بینینیشی ڕاستە، ئاینەکەیشی هەقە، تەنها بەندایەتی کردن بۆ ئەو هەقە، سوودبەخشە دەمێنێتەوە بە بەردەوام ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾لە بتەکان هاوشێوەکانی لە گیاندارانو بێگیانەکان ﴿ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾کە لە خودی خۆیدا بەتاڵەو بەندایەتی بۆ کردنیشی هەر بەتاڵە، چونکە پەیوەستە بە پەرشو بڵاونەماوە ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾ بەرزە لە زاتیدا، بەرزو بڵندە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکانەوە، وە لە قەدەریدا، هەموو سیفاتەکانی تەواون، وە لە زاڵبوونیدا بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکانەوە، گەورەیە لە زاتیدا وە لە هەموو ناوو سیفاتەکانیدا، کە لە مەزنی گەورەییدا ئەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی هەمووی لە ناو دەستی ئەودایە، ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوە بە دەستی ڕاستیەوە، وە لە گەورەیی ئەو کورسیەکەی خوا ﷻ هەموو ئاسمانەکانی گرتۆتەوە، وە لە مەزنیو گەورەیی ئەو ناوچەوانی بەندەکان بە دەستی ئەوە، هیچ هەڵسوکەوتێ ناکەن بە ویستی ئەو نەبێ، وە ناجوڵێنەوەو لە جوڵەناکەون بە ویستی ئەو نەبێ، وە حەقیقەتی گەورەییو توانای ئەو کەس نایزانێ تەنها خۆی نەبێ، نە فریشتەیەکی نزیکو نە پێغەمبەرێکی نێردراو، ئەویش بریتیە لە هەموو سیفاتێکی تەواوو گەورەو مەزن، ئەوە تایبەتە بە ئەوەوە، وە لە گەورەیی ئەو سەرجەم پەرستشەکان کە لە ئاسمانەکانو زەویدا ئەنجام دەدرێ هەمووی تایبەتە بە گەورەییو مەزنیو میهرەبانی ئەوەوە، لەبەر ئەوەیە تەکبیر (الله أكبر) کردن دروشمی سەرجەم بەندایەتیە گەورەکانە وەکو نوێژو جگە لەو.

(٦٣-٦٤): ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾ ﴾:

ئەمــە هاندانــە لــە لایەنــی خــوای پەروەردگــارەوە لــە تەماشــا کردنــی ئــەو نیشــانەو ئایەتانــە کــە بەڵگــەن لەســەر یەکتاپەرســتیو تــەواوی خــوا ﷻ، جــا فەرموویەتــی: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾ ئایــا بــە چــاوی ســەرو بــە چــاوی بیــرو هۆشــت نابینــی ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئەویــش بارانــە دادەبەزێتــە ســەر زەویەکــی وشــکو ڕەق کــە تەپوتــۆز دایگرتــووە، وە وشــکە لــە دارو درەخــتو ڕووەکــەکان، جــا بــە هــۆی ئــەو بارانــەوە زەوی ســەوز دەبــێ بــە ڕووەک، وە هەمــوو جــۆرە ڕوەکێکــی جوانــی تێــدا دەڕوێــت، بێگومــان ئــەوەی کــە زینــدووی کــردەوە پــاش ئــەوەی کــە مردبــوو تەنهــا ئــەو مــردوو زینــددوو دەکاتــەوە، پــاش ئــەوەی کــە بــوون بــە ئێســکو پروســکێکی پتــورکاو ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ وردبینــە بــەوەی لــە ناوەڕۆکــی هەمــوو شــتەکان دەزانــێ، ئــەوەی کــە خێــر دەگەیەنــێ بــە بەندەکــەیو شــەڕی لێــدوور دەخاتــەوە، بــە شــێوەیەکی زۆر وورد کــە بەنــدە هەرگیــز هەســتی پێنــاکات، وە لــە ووردبینــی ئــەو تــەواوی عیزەتــی خــۆی نیشــانی بەندەکــەی دەدات لــە تۆڵەکردنەوەیــدا، پاشــان ووردبینــی ئــەو دەردەکــەوێ کاتــێ کــە بەنــدە لەنــاو دەبــات، وە لــە ووردبینــی ئــەو ئاگــادارەو دەزانــێ بــە شــوێنو جێگــای هەمــوو تکــی بارانێــک، وە هەمــوو تۆوێــک لــە ناوەڕۆکــی زەویــدا، ئــەو ئــاوە دەگەیەنــێ بــەو تــۆوە کــە شــاراوەیە لــە زانســتی هەمــوو بەدیهێنراوەکانــدا، جــا جۆرەهــا ڕووەکــی لــێ دەردەهێنــێ، بــە ئاگایــە لــە هەمــوو نهێنیــەکان وە ئەوانەیشــی لەنــاو دڵەکانــدا شــاراوەن، وە ســەرجەم کاروبارەکانــی دیکــە ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ بــە بەدیهێنــراو و بەنــدەو بــە ویســتو حیکمەتــی تــەواوی دەســەڵاتیەوە مامەڵەیــان پێــوە دەکات، وە هیــچ کەســێک جگــە لــەو هیچــی لــەو کاروبــارەدا نیــە ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ﴾ بــە زاتــی خــۆی کــە خاوەنــی دەوڵەمەنــدی ڕەهایــە لــە هەمــوو ڕووەکانــەوە، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو پێویســتی بــە هیــچ یەکێــک لــە دروســتکراوەکانی نیــە، هەرگیــز زەلیــل نابــێ تــا پشــتیان پــێ بەســتێ، وە هەرگیــز کــەم نابــێ تــا بەوانــەوە زۆربــێ، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو نــە هاوڕێــی بــۆ خــۆی دانــاوە نــە منــداڵ، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو بێنیــازە لــە هەمــوو شــتێ نــە دەخــواتو نــە دەخواتــەوە، وە پێویســتی بــەوە نیــە کــە خەڵکــی پێویســتیان پێیەتــی لــە هەمــوو ڕوویــەک لــە ڕووەکانــەوە، ئــەو خــواردنو خواردنــەوە دەدات، بــەڵام خــواردنو خواردنــەوەی پێنــادرێ، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو هەمــوو خەڵکــی پێویســتیان

بــە ئــەو هەیــە لــە بــوونو ئامــادە کــردنو یارمەتیانــدا، وە لــە دونیــاو دوارۆژیانــدا، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو هەمــوو ئەوانــەی لــە نــاو ئاســمانەکانو زەویــدان کۆببنــەوە، زینــدوو مــردووەکان لــە یــەک شــوێنو جێگــادا هەریەکێکیــان داوای لێــکات هەتــا حــەزوو داواکانــی تــەواو دەبــێ، خــوا ﷻ پێیــان دەبەخشــێ زیاتــر لــەوەی کــە داوای دەکــەن، ئــەو کات لــە موڵــکو دەســەڵاتی خــوا ﷻ هیــچ کــەم نــاکات، وە لــە دەوڵەمەنــدی ئــەو دەســتەکانی پــڕن لــە خێــرو بەرەکــەت بــە درێژایــی شــەوو ڕۆژ، چاکــەی بەردەوامــە بــۆ هەمــوو خەڵکــی، وە لــە دەوڵەمەنــدیو بەخشــندەیی ئــەو ئەوەیــە کەلــە ماڵــی ڕێزیــدا دایناــوە لــەوەی کــە چــاو نەیبینیــوە، وە گــوێ نەیبیســتوە، وە بــە ختــورەش بەســەر دڵــی هیــچ مرۆڤێکــدا نەهاتــوە.

﴿ٱلۡحَمِيدُ﴾ واتــە: ســتایش کــراوە لــە زاتــی خۆیــدا، وە لــە ناوەکانیــدا، لەبــەر ئەوەی جوانــن، وە لــە ســیفاتەکانیدا، لەبــەر ئــەوەی هەمــووی تــەواوە، وە لــە کردەوەکانیــدا، چونکــە لــە چــوار چێــوەی دادپــەروەریو چاکــەو میهرەبانــیو حیکمەتدایــە، وە لــە شــەرعەکەیدا، لەبــەر ئــەوە فەرمــان نــاکات تەنهــا بــەوە نەبــێ کــە بەرژەوەندی تــەواوی تێدابــێ، وە قەدەغــە نــاکات تەنهــا لــەوە نەبــێ کــە زیانێکــی تــەواوی تێدابــێ، ئــەو خوایــە ســتایش کــراوە پــڕاو پــڕی ئاســمانەکانو زەوی، وە ئەویشــی لــە نێوانیاندایــە، وە ئەوەشــی بیــەوێ پــاش ئــەوە، هیــچ لــە بەنــدەکان ناتوانــن وەســفو پیاهەڵدانــی بژمێرن، بەڵکــو تەنهــا خــۆی دەتوانــی وەســفی نەفســی خــۆی بــکات، وە لەســەرووی ئــەوەی بەنــدەکان وەســفی دەکــەن، ئــەو ســتایش کــراوە لــەوەی بیــەوێ ســەرکەوتووی بــکات، ئــەو بێنیــازە لــە ســتایش کردنــدا.


أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَادَلُوكَ فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

(٦٥-٦٦): ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾﴾: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ واتە: ئایا بە چاوو دڵت نازو نیعمەتەكانی خوات نەبینیوە، وە ﴿أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ﴾ لە گیاندارەكانو ڕووەكەكانو بێگیانەكان، هەموو ئەوانەی لە ناو زەویدان ڕامكراون بۆ نەوەكانی ئادەم، ئاژەڵەكان بۆ سوار بوونو بارهەڵگرتنو كار پێكردنو خواردنو جۆرەها سوودی دیكە، وە دارو درەختو بەروبوومەكان، دەسەڵاتی مرۆڤی داوە لە ناشتنو بەدەستهێنانی، وە دەرهێنانی كانزاكانیو سوود لێوەرگرتنیان ﴿وَالْفُلْكَ﴾ واتە: كەشتی بۆ ڕامكردوون ﴿تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾ هەڵتاندەگرێ، لەگەڵ كەلو پەلی بازرگانیەكانتاندا، لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر دەتانگوازێتەوە، بە هەمان شێوە خشڵیش لە دەریا دەردەهێنن بۆ پۆشینو خۆڕازاندنەوە، وە لە ڕەحمەتەكانی بۆتان، بێگومان ئەو ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ﴾ ئەگەر میهرەبانیو توانای نەبێ، ئەوە ئاسمان دەكەوت بەسەر زەویدا، هەموو ئەوانەی دەپێچایەوە لەسەری دەژینو لە ناوی دەبردن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾﴾ فاطر، (واتە: بە ڕاستی خوا ﷻ ئاسمانەكانو زەوی ڕاگیر دەكات بۆ ئەوەی لە ڕێڕەوی خۆیان لانەدەن، بە ڕاستی ئەگەر لە ڕێڕەوی خۆیان لابدەن كێ هەیە جگە لە خوا ﷻ ڕایان بگرێت، بێگومان ئەو (خوا) لەسەر خۆو لێبوردەیە).

﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بە سۆزتر زیاتر لە باوكیانو زیاتر لە نەفسو دەروونی خۆیان، بۆیە خێری ئەوانی دەوێ، ئەوان شەڕو خراپەیان بۆ نەفسی خۆیان

دەوێ، وە لـە میهرەبانـی، ئەوەیـە کـە ڕامـی کـردوە بۆیـان وەک چـۆن ئـەو شـتانەی ڕامکـردوە ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ﴾ لـە نەبوونـەوە ئێـوەی هێناوەتـە بـوون ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾(دواتـر دەتانمرێنێـت) پـاش ئـەوەی زیندووی کردنـەوە ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾ (پاشـان زیندووتـان دەکاتـەوە) دوای مردنتان، بۆ ئەوەی پاداشـتی چاکەکار بـە چاکەکانی بداتـەوە، وە خراپەکاریـش بـە سـزاو تۆڵە ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾واتـە: ڕەگەزی مـرۆڤ، تەنها ئـەو کەسـە نەبێ خـوا پاراسـتبێتی ﴿لَكَفُورٞ﴾بەرانبەر بـە نیعمەتەکانی خـوا، بێبڕوایە بـە خـوا، دان بـە چاکەکانیـدا نانێت، بەڵکـو هەندێ جار کوفر بـە زیندوو بوونـەوەو توانای پەروەردگـاری دەکات.

(٦٧-٧٠): ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا هُمۡ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧٠﴾﴾

﴿لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا﴾ خـوا هـەواڵ دەدات بـۆ هەمـوو ئوممەتێک داینـاوە ﴿مَنسَكًا﴾ واتـە: پەرسـتگایەکو پەرستشـێک، هەنـدێ جـار جیاوازییان هەیە لـە هەنـدێ کاروباردا، لەگـەڵ ڕێککەوتنیان لەسـەر دادپـەروەریو حیکمەتی خوا، وەک خوای بـەرز فەرموویەتی: ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ ﴿٤٨﴾﴾المائدة، (واتـە: دامـان نـاوە بـۆ هـەر ئوممەتێک لـە ئێوە، شـەریعەتو ڕێگایەکـی ڕوون، وە ئەگـەر خـوا بیویسـتایە ئێوەی نـە ئەکرد بە یەک ئوممـەتو کۆمەڵ، بەڵکـو بـۆ ئەوەی تاقیتـان بکاتەوە لـەو شـەریعەتو یاسـایانەی کە پێی بەخشـیوون).

﴿هُمۡ نَاسِكُوهُۖ﴾ واتـە: کاریـان پێکـردوە بـە پێـی توانایـان، هیـچ ڕەخنەیـەک لـە شـەریعەتەکەیدا نیـە لـە نـاو شـەریعەتەکاندا، بـە تایبەت لـە نەخوێنـدەوارەکان لـە ئەهلی شـیرکو نەفامـی ڕوونو ئاشـکرا، بێگومـان ئەگـەر پەیامـی پێغەمبـەر ﷺ جێگیـر بوو بە بەڵگەکانـی، ئـەوە پێویسـتە لەسـەر هەمووان شـوێنی بکەون بـە وەرگرتنو ملکـەچ بوون، وە وازهێنـان لـە ڕەخنەگرتـن، لەبەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ﴾ واتە: نابـێ بـە درۆخـەرەوان کێشـەو ئـاژاوەت لەگەڵـدا دروسـت بکـەنو ڕەخنە بگرن لەسـەر هەنـدێ لەوانـەی کە هێناوتـە بە عەقڵە فاسـیدو بێ کەڵکەکانیـان، وە ناکۆکیـان لە حەڵاڵی مـردارەوە بـوو، بە پێـوەرە فاسـیدەکانیان، دەیانوت: (ئـەوە دەخۆن کە خۆتان کوشـتوتانن،

بـەڵام ئـەوە ناخۆن کە خـوا کوشـتویەتی)، وە هەروەکو وتیان: (إنمـا البیع مثل الربـا) (واتە: بێگومـان کڕینو فرۆشـتن وەکـو ڕیبا وایە)، وە هاوشـێوەی ئـەوە لـەو ناکۆکیەکانیان کە پێویسـت نـاکات وەڵامیان بدرێتـەوە، چونکە ئەوان ئینـکاری بنەمای پەیامەکـە دەکەن، وە هیـچ مشـتو مـڕو بیانوویـەک هەڵناگـرێ بە خودی خـۆی، بەڵکـو بۆ هەمـوو جێگایەک وەڵامێـک هەیە.

جـا خاوەنـی ئـەم ڕەخنەگرتـنو ناکۆکیە، کـە ئینـکاری پەیامـی پێغەمبەرەکـەی دەکات، ئەگـەر وابزانێـت ئـەو مشـتو مـڕ دەکات بـۆ ئـەوەی ڕێنمایـی بکرێـت، پێـی دەوترێ: قسـەکردن لەگەڵ تۆدا لە چەسـپاندنو نەچەسـپاندنی پەیامەکە دایە، ئەگەرنـا کورتهەڵهێنان لەسـەر ئەمانـە بەڵگەیـە کـە مەبەسـتی تەنهـا ئینـکاریو بێتواناییـە، لەبـەر ئەمـە خـوا ﷻ فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکەی کـردوە بانگـەواز بـۆ لای پەروەردگاری بکات بـە حیکمەتو لێبوردەیـی چـاکو بـەردەوام بێت لەسـەر ئـەوە، یەکسـانە ناکۆکیـکاران ڕەخنـە دەگرن یـان نایگـرن، بێگومـان هیچ پێویسـت نـاکات وەسـف بکرێت لەسـەر دەعـوەو بانگەواز چونکـە تـۆ لەسـەر ﴿ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴾ واتە: میانـڕەوو ڕاسـت دەیگەیەنێت بـە ئامانج، زانسـتی هـەقو کـردەوە پێکـردن لەخۆ دەگرێ، تـۆ متمانەت بـە کاروباری خـۆت هەیەو دڵنیـای لـە ئاینەکـەت، جا پێویسـتە لەسـەرت بەهێـزو خۆڕاگر بیـت لەوەی خـوا فەرمانی پێکـردووی، وە تـۆ لەسـەر کارێکـی گوماناوی نیت یان قسـەیەکی هەڵبەسـتراو، شـوێنی هـەواو ئـارەزوو بۆچونەکانـی خەڵکی بکەویـت، وە ڕەخنەگرتنی ئـەوان تۆ بوەسـتێنێت لە بڵاوکردنـەوەی پەیامەکـەت، وە هاوشـێوەی ئەمـە وتـەی خـوای بـەرزە ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ۝٧٩ ﴾النمل، (واتـە: کەوابوو پشـت تەنها بە خوا ببەسـتە، بەڕاسـتی تۆ لەسـەر ئاینێکـی ڕاسـتو ڕوونی).

لەگـەڵ ئـەوە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ۝٦٧ ﴾، ڕێنماییەکـە بـۆ وەڵامـی ڕەخنەگران لەسـەر وردەکاریەکانی شـەرع، بە عەقڵێکی تەواو، بەڕاسـتی هیدایەتو ڕێنمایـی وەسـفێکە بۆ هەمـوو ئەوانەی کـە پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتی، وە ڕێنمایـی هیدایەتی پـێ دەسـتەبەر نابـێ لـە بابەتـی بنەمـاو لقەکانـدا، ئەویش ئـەو بابەتانەیـە کە دەناسـرێتەوە چـاکو خـراپو دادپـەروەریو حیکمەتـی بـە عەقـڵو هۆشـیاریەکی پـاکو بێگـەرد، ئەمـەش دەناسـرێتەوە لـە وردەکاری فەرمـان پێکـراوەکانو قەدەغە لێکـراوەکان.

لەبـەر ئەمـە خـوا ﷻ فەرمانی پێکـرووە بە دادپـەروەری لە مشـتومڕەکانیاندا لـەم حاڵەتەدا،

جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِن جَـٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ زانایـە بـە مەبەسـتو نیەتەکانتـان، پاداشـتتان دەداتـەوە لەسـەری لـە ڕۆژی دواییدا، ئـەو ڕۆژەی کە خـوا دادوەری لـە نێوانتانـدا دەکات لەو شـتانەی کە ئێوە تیایدا جیاوازن، هەرکەسـێ لەسـەر ڕێگـای ڕاسـت بێـت، ئـەوە لە نـازو نیعمەتدایە، وە هەرکەسـێ لێـی لابدات ئـەوە لە ئەهلی دۆزەخـە، وە لـە تـەواوی دادوەریـدا ئەوەیـە کـە بـە زانسـت دادوەری دەکات، جـا لەبەر ئەوەیە باسـی زانسـتی گشـتگیری دەکات، وە دەوردانی کتێبەکەی، جـا فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ هیـچ شـتێکی لـێ شـاراوە نیـە، لـە ئاشـکراو پەنهانیەکانـدا، ئـەوەی دیـارەو ئـەوەی نادیارە، ئـەوەی ڕوویـداوەو ئـەوەی ڕوودەدات، ئەو زانسـتەی کـە دەوری ئاسـمانەکانو زەویداوە کە لـە کتێبەکەیدا جێگیری کـردوە، ئەویش (لـوح المحفـوظ) کاتـێ کـە خوا ﷻ قەڵەمی دروسـت کـرد، پێـی فەرموو: (أكْتُب، قَـالَ: مَا أكتب؟ قَـالَ: أكتب مَا هُوَ كَائِـنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)} (أخرجه الطبراني في «مسند الشـاميين» برقم: (١٥٧٢)). واتـە: بنووسـە، وتی: چی بنووسـم؟ وتی: بنووسـە ئـەوەی بوونی هەیـە تا ڕۆژی دوایی.

﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَـٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ ئەگەرچـی بـە لای ئێـوەوە خوا ﷻ دەوری هەمـوو شـتەکانی نـەداوە، بەڵام بە لای خواوە ئاسـانە دەوردانی هەموو شـتەکان بە زانسـتی، وە ئـەوەی کە نووسـراوە پڕاو پـڕی واقیعە.

(٧١-٧٢): ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا بَيِّنَـٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾ ﴾:

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ خـوا ﷻ باسـی حاڵـی هاوبەشـدانەران دەکات، بێگومـان بارودۆخیـان لـە خراپترینـی دۆخەکانـە، کە هیچ پاڵپشـتێکیان نیـە لەسـەر ئـەوەی ئەنجامیـان داوە، هیـچ زانسـتێکیان پێـی نیە، بەڵکـو ئەوە لاسـایی کردنەوەیـە لـە باوباپیرانیانـەوە وەریـان گرتووە.

هەنـدێ جـار مـرۆڤ هیچ زانسـتێکی نیـە دەربـارەی ئـەوەی کردوویەتی، بەڵام لـە هەمان کاتـدا بەڵگـەی هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە دەیزانـێ، جـا لێـرەدا هەواڵیـداوە، خوا لـەوەدا هیـچ بەڵگەیەکـی لەسـەری نەناردوەتـە خـوارەوە ئامـاژەی بـۆ بـکاتو ڕێگـەی پێبدات،

بەڵکو سەلماندنی یەکلاکەرەوەی دابەزاندوە لەسەر بەتاڵی و بێمانایی، پاشان هەڕەشەی لە ستەمکاران و کەللەڕەقان کردوە، فەرمووبەتی: ﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾ ڕزگاریان بکات لە سزای خوا کاتێ کە بۆیان دادەبەزێ و پێویست دەبێ، ئایا ئەوانەی -زانستیان نیە لەسەر ئەوەی لەسەری دەڕۆن- هیچ مەبەستێکیان هەیە لە شوێنکەوتنی نیشانەو ڕێنماییەکان کاتێ کە بۆیان دێت؟ یان ئەوان ڕازین بەوەی لەسەری دەڕۆن لە پووچ و بەتاڵی؟

لێرەدا باسی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا ﴾ کە لە نیشانە ڕوونە مەزنەکانە، کە هەق و ناهەق ڕوون دەکاتەوە، لایان لێ نەکردەوەو سەریان پێ بەرز نەکرد، بەڵکو ﴿ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ﴾ لە ڕق و کینەیاندا، دەبینی ڕووخساریان زۆر ناشرینەو ڕەزایان زۆر گرانە ﴿ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾ لە زۆری ڕق و کینەیاندا بەرانبەر بە هەق حەز دەکەن بیانکوژن و دارکاریان بکەن، ئەم حاڵەتە لە بیروایاندا خراپترین حاڵەتە، بەڵام لەوە خراپتریش هەیە، ئەویش ئەو حاڵەتەیانە کە سوێندی لەسەر دەخۆن، جا لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ جا ئەمە خراپترینیانە درێژ و پانە، سزاو ناڕەحەتی بەردەوام لە زیادبووندایە.


يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ
تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ
وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ
ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا
وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ
أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ
وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُوا۟ فِى
ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ
فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ
ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ
وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱعْتَصِمُوا۟ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

(٧٣-٧٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ﴾:

ئەمــە نموونەیەکــە خــوا ﷻ هێناویەتیــەوە لــە ناشــرینی عیبــادەت کردنی بتــەکان، وە ڕوونکردنــەوەی ناتــەواوی عەقڵــی ئەوانەی بەندایەتــی بــۆ دەکــەن، لەگــەڵ لاوازی هەموویانــدا، جــا فەرموویەتــی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾ ئــەم دواندنــە لەگــەڵ بــڕواداران‌و بێبڕوایانــە، بــڕواداران زانســت‌و ژیریان پێ زیــاد دەبــێ، بــێ بڕوایانیــش دەبێتــە بەڵگــە بەســەریانەوە ﴿ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ﴾ گوێتانــی بــۆ بگەنــەوەو تێبگــەن لــە ناوەڕۆکــی، بە دڵێکــی بێ ئاگــاوە گوێی بــۆ نەگرن، وە بە بیســتنێکی ناکۆکــەوە، بەڵکــو دڵو گوێتانی بۆ بگەنەوە، ئەویــش ئەمەیە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ هەمــوو ئەوانــە دەگرێتەوە جگە لە خــوا ﷻ هاواریان لێدەکەن ﴿ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا ﴾ کــە ئــەو مێشــە لاوازتریــن بەدیهێنراوەکانــەو بــێ نرخترینیانە، لــە توانایاندا نیــە ئــەم دروســتکراوە لاوازە بــە دیبهێنــن، ئــەوەی لەســەرووی ئەوەوەیە لە پێشــترە ﴿ وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ﴾ (واتــە: هەرچەند هەمووشــیان بۆ کۆببنــەوە) بەڵکو لەوەش لە پێشــتر، ئەگەر ﴿ يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ﴾ ئەمــە ئەوپــەڕی بــێ توانایيــە ﴿ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ ﴾ ئــەوەی کــە پەرســتراوە لــە غەیری خــوا ﴿ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴾ کــە ئەویش مێشــە، هــەر یــەک لە مــرۆڤ‌و مێشــیش لاوازن، وە لاوازتر لە ئەوان، ئەو کەســەیە پشــت ببەســتێت بــەم لاوازەو بیخاتــە ئاســتی پەروەردگــاری جیهانییــان، جا ئەوانە بەو شــێوەیە پێویســتە ﴿ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴾ (واتــە: خــوا بناســن نەیانناســیوە) بــە شــێوەیەک هــەژارو بێتوانا لــە هەمــوو ڕووەکانــەوە، یەکســانی کــردوە بــە دەوڵەمەنــدی بێنیاز لــە گشــت ڕووەکانەوە،

یەکسانی کردوە ئەوەی خاوەنی نەفسی خۆی نیەو هیچی بە دەست نیە، نە بۆ خۆیو نە بۆ جگە لە خۆی لە قازانجو زیانو مردنو ژیانو زیندووبوونەوە، بەوەی کە بە سوودەو پێدەرەو بەرگریکارە، خاوەنی هەموو موڵکەکانە، بە هەموو جۆرێ لە جۆرەکان بەڕێوەی دەبات ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ واتە: تەواوی تواناو تەواوی دەسەڵات، لە تەواوی تواناو هێزیدا، نێوچاوانی بەدیهێنراوەکان بە دەستیەتی، هیچ جووڵەکارێک ناجوڵێتو هیچ وەستاوێک ناوەستێ تەنها بە ئیرادەو ویستی ئەو نەبێ، جا ئەوەی ویستویەتی بووە، وە ئەوەی نەیویستووە نابێ، وە لە تەواوی توانای، ئاسمانەکانو زەوی ڕاگرتووە لە ڕێڕەوی خۆیان لانەدەن، وە لە تەواوی توانای ئەوەیە هەموو بەدیهێنراوەکان زیندوو دەکاتەوە، یەکەمو کۆتایان بە یەک شریقەی بەهێز (فووکردن بە صوردا). وە لە تەواوی توانای ئەوەیە بێگومان دەسەڵاتدارە سەرکەشەکانی لەناو برد لەگەڵ ئەو ئوممەتە خراپەکارانە بە شتێکی ئاسان لە ناوی بردن، وە بە قامچی سزا.

(٧٥-٧٦): ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ ﴾

کاتێ کە خوا ﷻ تەواوی هێزی خۆیو لاوازی بتەکانی ڕوونکردەوە، وە ئەو پەرستراوی ڕاستەقینەیە، حاڵی پێغەمبەرانی ڕوون کردەوە، لەگەڵ جیاوازیان لە بەدیهێنراوەکان، بەوەی جیاکراونەتەوە لە چاکەکان، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: لەناو فریشتەکاندا نێردراو هەڵدەبژێرێت، بەهەمان شێوە لەناو خەڵکیشدا، ئەوانە باشترینو باڵاترینی ناو خەڵکیو سەرجەم سیفاتە بەرزەکانیان کۆ کردوەتەوە، وە شایستەترینن بە هەڵبژاردن، پێغەمبەران چاکترینی ناو دروستکراوەکانن بە ڕەهایی، ئەوەی هەڵیبژاردوون نەفام نیە بە مافی شتەکان، یان شتێ بزانی جگە لە شتێکی دیکە، بێگومان ئەوەی هەڵیبژاردوون بیسەری بینایە، ئەو خوایەیە کە بە زانستیو بیستنیو بینایی دەوری هەموو شتەکانی داوە، جا هەڵبژاردنی بۆیان لە ئەوپەڕی زانستەوەیە کە ئەوان شایستەی ئەوەن، بێگومان وەحیو نیگا بۆ ئەوان دەگونجێ، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام، (واتە: خوا خۆی دەزانێ پەیامەکەی لە کوێدا دادەنێت) ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾ واتە: خوا ﷻ پێغەمبەران (علیهم السلام) ڕەوانە دەکات، ئەوانیش خەڵکی بانگ دەکەن بۆ لای ئاینی خوا، تیایاندایە وەڵامدەداتەوەو تیایاندایە بانگەوازەکانیان ڕەتدەکاتەوە، تیایاندایە کاری پێدەکاتو تیایاندا

هەیـە کاری پێنـاکات، ئەمە کارو پیشـەی پێغەمبەرانە، بەڵام پاداشـت لەسـەر ئـەو کردەوانە سـەرەنجامی دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خوا، هیـچ چاکەیەکی لـێ ون نابێت.

(٧٧-٧٨): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٧٧ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ۝٧٨﴾:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ﴾ خوا ﷻ فەرمـان بـە بـڕواداران دەکات نوێـژی بۆ بکـەن، وە ڕکوع‌و سـوژدەی تایبەت تیایـدا، لەبەر فـەزڵ‌و چاکەیـان، وە لەبـەر ئـەوەی ڕوکن‌و پایەی نـاو نوێـژن، بەهەمان شـێوە بەندایەتی بۆ کردنـی کە بیلبیلـەی چاوەکان‌و سـارێژکەرەوەی دڵـی مەحزونە، بێگومـان پەروەردگارێتی‌و چاکـی خـوا ﷻ بەسـەر بەندەکانیـەوە، وا دەخـوازێ بـە دڵسـۆزی عیبادەتی بۆ بکـەن، وە بە گشـتی فەرمانیـان پێدەکات بـە کاری چاکە.

﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ سـەردەکەون لـەوەی دەتانەوێ‌و حـەزی لێدەکـەن‌و ڕزگارتان دەبـێ لـەوەی حـەزی لێناکـەن، هیـچ ڕێگایەک نیە بـۆ ڕزگار بـوون جگە لە دڵسـۆزی نەبێ لـە عیبـادەت کردنـی بەدیهێنەرداو کۆشـش بـۆ سـودگەیاندن بـە بەندەکانی، هەرکەسـێک سـەرکەوتوو بـێ بـۆ ئـەو کارە، ئـەوە بەشـی گـەورەو بـەرزی بـۆ هەیـە لە خۆشـبەختی‌و سـەرکەوتن‌و ڕزگاربـوون ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾ جیهـاد: خـەرج کردنـی توانایـە بۆ بەدەسـتهێنانی مەبەسـتی پێویسـت، جیهادو تێکۆشـان کـردن لە پێناوی خـوادا بەو شـێوەی شـیاویەتی، بریتیـە لـە بەجێهێنانـی تـەواو بـە فەرمانـی خـوا ﷻ، وە بانـگ کردنی خەڵکـی بـۆ ڕێگاکەی بـە هەموو شـێوەیەک، لـە ئامۆژگـاری‌و فێرکردن‌و جەنـگ کردن‌و پـەروەردەو سەرزەنشـت کـردن‌و جگـە لەوانە.

﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ﴾ واتـە: خـوا ﷻ هەڵبـژاردوون -ئـەی مسـوڵمانان- لـە نێوانـی هەمـوو خەڵکیـدا، ئاینـی بۆ هەڵبـژاردون‌و پێـی ڕازی بووە بۆتـان، باشـترین کتێبی بـۆ هەڵبژاردون، وە چاکترینـی پێغەمبـەران، جـا بزانـن چـۆن مامەڵە بـەم خەڵاتە مەزنـەوە دەکەن، بـە بەجێ هێنانـی جیهاد بە شایسـتەترین شـێوە.

وە کـە خـوا دەفەرموێ: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾ ڕەنگە کەسـێک واگومان بیات

ئەمە ئەرکێکە لە توانای مرۆڤدا نیە، یان ئەرکێکی زۆر سەختە، بەڵام خوا خۆی وەڵامی داوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ واتە: قورس و گران، بەڵکو بەوپەڕی شێوەکار ئاسانی بۆ کردوە، جا یەکەم هەر فەرمانێکی کردبێ بە دڵنیاییەوە ئاسانە لەسەر نەفس و دەروون، قورسی نەکردوە، پاشان ئەگەر هەندێ هۆکار بێنە پێش پێویست بە ئاسانکاری بکات کار ئاسانی کردوە لەوەی کە فەرمانی پێکردوە، یان بە لابردنی، یان هەندێکی.

لەم دەقەدا یاسایەکی شەرعی وەردەگیرێ، ئەویش: (المشقة تجلب التيسير)، (واتە: نارەحەتی ئاسانکاری بەلای خۆیدا ڕادەکێشی) و (الضروريات تبيح المحضورات)، (واتە: ناچاریەکان قەدەغەکراوەکان دەکەن بە ڕەوا) ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ﴾ واتە: ئەم ئاینەی باسکراوە ئاینی باوکتان ئیبراهیمە، دەی بە جوانی دەستی پێوە بگرن و پابەندی بن، ﴿هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: لە کتێبە پێشینەکان، ئەوانەی کە باسکراون و بەناوبانگن ﴿وَفِي هَٰذَا﴾ واتە: لەم کتێبەدا، لەم شەرعەدا، بەردەوام ئەم ناوە بۆ ئێوەیە لە کۆن و ئێستادا ﴿لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ﴾ بە کردەوەکانتان خێر و شەڕی ﴿وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ﴾ چونکە باشترین ئوممەتن بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی، ئوممەتی ناوەندو دادوەرو هەڵبژێردراو، شایەتی دەدەن بۆ پێغەمبەران کە ئەوان پەیامەکەیان گەیاندوە بە گەلەکانیان، وە شایەتی لەسەر گەلەکان دەدەن پێغەمبەرەکانیان پەیامەکەیان پێگەیاندوون وەک چۆن لە کتێبەکەیدا باسی کردوە ﴿فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ بە پایەو مەرج و سنوورەکانیەوە، وە سەرجەم پێویستیەکانی ﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ ئەوەی کە فەرز کراوە بەو کەسانەی کە شایستەن، سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەوەی پێیداون ﴿هُوَ مَوْلَاكُمْ﴾ کە کاروبارەکانتان لە ئەستۆ دەگرێت، بە باشترین شێوە بەڕێوەی دەبات، لەسەر چاکترین ئەندازە ﴿وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ﴾ واتە: تەنها پشت بە ئەو ببەستن لەوەدا، خۆتان مەدەنە دەستی هەوڵ و توانای خۆتان ﴿فَنِعْمَ الْمَوْلَىٰ﴾ واتە: باشترین پشتیوانە بۆ ئەو کەسەی پشتی پێدەبەستێ، جا داواکاریەکەی بۆ بەدەست دێت ﴿وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ بۆ ئەو کەسەی داوای یارمەتی لێدەکات نارەحەتیەکەی لەسەر لادەبات.

تەفسیری سوورەتی (الحج) تەواو بوو

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ
﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ
فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ
أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ
ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ
لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ
يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ
ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن
سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾
ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا
ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا
ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ
لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ
خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾

## تەفسیری سووڕەتی (المؤمنون)

## مەککیە (١١٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾﴾:

ئەمە ناوهێنانە لە لایەن خواوە، بە باسکردنی بەندە بڕواداره کانی، وە باسکردنی سەرفرازیو خۆشبەختیان، وە بە چ شتێک گەیشتن بەو پلەوپایە بەرزە، لە نێو ئەوانەشدا هاندان لەسەر خۆ جوان کردن بە سیفاتەکانی ئەوان، دەی با بەندە خۆیو غەیری خۆی بپێوێ بەم دەقە پیرۆزانە، بەو دەقانە خۆیو غەیری خۆی دەناسێ تا چەند ئیمانیان هەیە لەڕووی زیادبوونو کەمبوونو زۆریو کەمیەوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ واتە: بە ڕاستی ڕزگارو خۆشبەختو سەرکەوتوو بوون، گەیشتن بە هەموو ئەوانەی کە ویستیان، ئەو بڕوادارانەی کە بڕوایان بە خوا ﷻ هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیوە، ئەو کەسانە یەکێک لە سیفاتە تەواوەکانیان ئەوەیە: ﴿فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ﴾ (واتە: لە نوێژەکانیاندا گەردن کەچن بۆ خوا) خشوع لە نوێژدا بریتیە لە ئامادە بوونی دڵ لە خزمەتی خوای مەزندا، وابزانێ پەروەردگاری لێیەوە نزیکە، بۆ ئەوەی دڵی جێگیربێو نەفسو دەروونی ئارام بێو جووڵەی نەمێنێ، وە چاو بەرزکردنەوەو لاکردنەوەی لە خزمەتی ئەودا نەمێنێ، بە ئەدەبەوە لە خزمەتی پەروەردگاریدا بێت، بزانێ لە نوێژەکەیدا چی دەڵێو چی دەکا، لە سەرەتای نوێژەکەی بۆ کۆتایی، بەو شێوەیە وەسوەسەو ختورەو فکری خراپ لە دەروونیدا ڕەت بکاتەوە، ئەمەیە ڕووحو ناوەڕۆکو مەبەستی ڕاستەقینە لە نوێژدا، ئەمە ئەو نوێژەیە کە بۆ بەندە دەنوسرێ.

لە ڕاستیدا نوێژێک ئەگەر گەردنکەچی تێدانەبوو بۆ خوا بە دڵیش ئامادە نەبوو، ئەگەرچی

دروستەو پاداشت دەدرێتەوە، بەڵام پاداشتەکان بە پێی ئەوەیە کە تا چەندە دڵ ئاگای لە نوێژەکەیە.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ ﴾ واتە: (ئەوانەی لە شتی بێهودە) ئەویش بریتیە لە قسەیەک هیچ خێروو سوودێکی تێدا نەبێت، ﴿ مُّعۡرِضُونَ ﴾ (خۆیان دوور دەگرن) وەکو حەزو ئارەزوویەکو پاککردنەوەی نەفسو دەروونیان، ئەگەر تێپەڕن بەلای قسەی بێ ماناو پڕووپووچدا بەڕێزەوە تێدەپەڕن، وە ئەگەر بەدووربن لە قسەی بێهودە ئەوە بێگومان دووربوونیان لە شتی قەدەغەکراو لە پێشترە.

ئادەمیزاد ئەگەر دەسەڵاتی بەسەر زمانیدا هەبێ، وە بەکارینەهێنێ تەنها بۆ چاکە نەبێ، ئەوە دەسەڵاتی بەسەر هەموو کاروبارەکانیدا هەیە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ کاتێ وەسیەتی کرد بۆ موعاذی کوڕی جەبەل فەرمووی: {ألاَ أُخْبِرُكَ بِمِلاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ}؟ ئایا هەواڵت پێبدەم بە پاراستنی هەموو ئەوانە؟ ووتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی برد بۆ زمانی خۆیو گرتی وە فەرمووی: {كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا} (أخرجه ابن ماجه برقم: (٣٩٧٣)، والترمذي (٢٦١٦)) واتە: ئەمە بگرە. بڕواداران یەکێ لە سیفاتە جوانەکانیان ئەوەیە زمانیان دەگرن لە قسەی پڕووپووچو قەدەغەکراوەکان.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾ واتە: زەکاتیماڵو سامانەکانیان دەردەکەن لە هەموو جۆرە ماڵەکانیان، دەروونیان پاک دەکەنەوە، لە ڕەوشتی ناشرینو کردەوەی خراپ، کە نەفسو دەروون بە وازهێنانو دوورکەوتنەوە لێیان پاک دەبێتەوە، بەندایەتی خوا ﷻ بە چاکی بەجێبهێنن، بە ملکەچبوون لە ناو نوێژەکاندا، وە بە چاک بوون لەگەڵ بەدیهێنراوەکان بە پێدانی زەکاتی ماڵەکانیان.

(٥-١١): ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ٧ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ٨ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ٩ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴾ (ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن) لە زیناکردن وە لە تەواوی خۆپاراستنیاندا دوورردەکەونەوە لە هەر شتێ ببێتە مایەی نزیک بوونەوە لە زینا کردن، وەک تەماشا کردنو دەست لێدانو هاوشێوەکانیان، داوێنیان دەپارێزن لە هەموو کەسێک ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ ﴾ (واتە: مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان) بۆ کەنیزەکێک

کە بوون بە خاوەنیان ﴿ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴾(واتە: بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن) بە نزیک بوونەوە لە خێزانو کەنیزەکەکانیان، چونکە خوای بەرز حەڵاڵیانی کردوە ﴿ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ ﴾واتە: (ئنجا هەر کەسێ) نیازی جگە لە خێزانو کەنیزەک بکات ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴾واتە: (ئەوانە دەست درێژیان کردۆتە سەر ئەو شتانەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوە، وە بوێریان کردو، بەسەر قەدەغەکراوەکانی خوادا.

بە گشتی ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر قەدەغەکردنی زەواجی کاتی یان سیغە (المتعة)، چونکە ئەوە خێزانی ڕاستەقینە نیە مەبەست پێی مانەوە بێ، وە کەنیزەکیش نیە، ئەو جۆرە نیکاحە لە بنچینەدا حەرامە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ ﴾ ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، بە مەرج گیراوە لە بۆ حەڵاڵ بوونی کەنیزەک، دەبێت لە موڵکی ئەو کەسەدا بێ، ئەگەر خاوەنی هەندی لەو کەنیزەکە بوو، نەک هەمووی، ئەوە بۆی حەڵاڵ نیە، لەبەر ئەوەی ئەوە موڵکی ئەو نیە، بەڵکو موڵکی ئەوو جگە لەویشە (واتە: ئەو کەنیزەکە موڵکی دووکەسە)، هەروەکو چۆن دروست نیە ژنێک لەلای دوو پیاو بێ، بەهەمان شێوە دروست نیە کەنیزەکێک لە لای دوو سەید بێت، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴾(واتە: ئەوانەی پارێزەری لە سپاردەو پەیمانەکانیان دەکەن) واتە: دەیانپارێزنو پابەندن پێیانەوەو سوورن لەسەر پێ هەستانو جێبەجێ کردنیان.

ئەم دەقە گشتگیرە لە هەموو ئەسپاردەکان کە مافی خوای گەورەن، ئەوانەشی کە مافی بەندەکانن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾الأحزاب، (واتە: بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ئاسمانەکانو زەویو چیاکاندا، بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون کە هەڵیگرنو ترسان لەو ئەمانەتە، کە چی ئادەمی ئەو سپاردەی هەڵگرت، بە ڕاستی زۆر ستەمکارو نەزانە).

هەموو ئەوانەی کە خوا پێویستی کردوە لەسەر ئادەمیزاد ئەمانەتن، پێویستە لەسەر بەندە بە چاکیو تەواوی بیانپارێزی، بە هەمان شێوە ئەسپاردەی ئادەمیزادەکان دەچنە نێویانەوە، وەکو ئەسپاردەیماڵو سامانو نهێنیەکانو وێنەی ئەوانە، پێویستە لەسەر بەندە ڕەچاوی ئەو دوو کارە بکاتو ئەو دوو ئەسپاردەیە بپارێزێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾النساء، (واتە: بە ڕاستی خوا فەرمانتان پێدەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان).

بەهەمان شێوە پەیمانیش، هەموو ئەو پەیمانانە دەگرێتەوە لە نێوان بەندەکانو پەروەردگاریاندایە، وە لە نێوان خۆیانو بەندەکانی دیکەدایە، ئەویش بریتیە لەو پابەند بوونو گرێبەستانەی کە

بەندە دەیبەستێ، پێویستە لەسەری لەبەرچاوی بگرێو وەفای هەبێ پێیان، وە قەدەغەی لێدەکرێ زێدەڕەوی تێیداو پشت گوێخستنی.

﴿ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾ واتە: (ئەوانەی) بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیانو پارێزگاری لێدەکەنو مەرجو پایەکانی جێبەجێ دەکەن، خوا ﷻ وەسفی کردوون بە گەردن کەچی لە نوێژەکانیاندا، وە پارێزگاری کردنیان لێی، چونکە کاروبارەکانیان تەواو نابێ بە نوێژو پارێزگاری کردن نەبێ لێی، جا هەر کەسێ بەردەوام بێ لەسەر نوێژ بەبێ گەردن کەچی یان بە گەردن کەچی بەبێ بەردەوام بوون لەسەری، ئەوە کەسێکی سەرزەنشت کراو ناتەواوە﴿ أُولَٰئِكَ ﴾ واتە: ئەوانەی وەسفکراون بەو سیفاتانە﴿ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ ﴾ واتە: (ئەوانە میراتگرو خاوەنی فیردەوسن) کە بەرزترین شوێنو ناوەندو چاکترین شوێنی بەهەشتە، چونکە لە سیفاتە چاکەکاندا گەیشتوون بە لووتکە، یان مەبەست لە فیردەوس هەموو بەهەشتە، بەو شێوەیە هەموو برواداران دەچنە ناویەوە بە پێی پلەوپایەو دەرەجەیان، هەرکەسەو بەپێی حاڵی خۆی﴿ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ (واتە: ئەوان بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە)، مردنو گواستنەوەی تێدانیە، وە حەزیش ناکەن جێگۆڕکێیان پێ بکرێ، چونکە تەواوی نازونیعمەتەکان لەبەر دەستیاندایە، بەبێ ناتەواویو کەمو کوری.

(١٢-١٦): ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ
﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا
الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ
لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ :

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ ﴾ (سوێند بە خوا بەڕاستی مرۆڤمان دروستکرد) خوا ﷻ لەم دەقانەدا باس لە قۆناغو گواستنەوەی نەوەکانی ئادەم دەکات، لەسەرەتای بەدیهێنانیەوە تا کۆتایی، سەرەتا باسی دروستکردنی باوکی مرۆڤایەتی کردوە کە ئادەمە ﷺ، وە ئەو دروستکراوە﴿ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴾ واتە: پاڵفتەکراوە، وە لە هەموو زەوی وەرگیراوە، لەبەر ئەمەیە نەوەکان بەپێی ئەندازەی زەوین: تیایاندایە چاکەو تیایاندایە خراپە، وە تیایاندایە لە نێوان ئەو دوانەدایە، وە ڕووح سووکو ڕەزا قورسیان تێدایە، وە تیایاندایە لە نێوانی ئەو دووانە﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ ﴾ واتە: ڕەگەزو نەوەکانی ئادەم﴿ نُطْفَةً ﴾ واتە: (نوتفەو ئاوێتەیەکی پێکهاتوو) کە دەردەچێ لە نێوانی پشتی پیاوو سنگی ئافرەتدا، ئنجا جێگیر دەبێ﴿ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾ ئەویش منداڵدانو پزدانی دایکە، پارێزراوە لە هەموو تێکچوونو با، وە جگە لەوانیش.

﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ ﴾(پاشان نوتفەکەمان دروست کرد) ئەو نوتفەی کە پێشتر لەناو پزدانی دایکدا جێگیر بوو بوو ﴿ عَلَقَةً ﴾ واتە: خوێنێکی سوور، دوای تێپەڕبوونی چل شەو بەسەر ئەوەی کە نوتفەیەک بووە.

﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ ﴾(واتە: ئنجا خوێنەکەمان) دوای چل ڕۆژ کردوە بە ﴿ مُضْغَةً ﴾ واتە: پارچە گۆشتێکی بچووک بە قەد یەک تیکەنان لە بچووکیدا ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ ﴾(واتە: ئنجا بەدیمان هێنا ئەو گۆشتە) نەرمە بە ﴿ عِظَٰمًا ﴾(ئێسکێکی) پتەوتر، تێکەڵ بووە لەگەڵ گۆشتەکەدا، بە پێی پێویستی جەستە بۆی ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ﴾ واتە: ئنجا بە گۆشت ئێسکەکەمان داپۆشیە، هەروەکو چۆن ئێسکمان کردوەتە کۆڵەکەیەک بۆ گۆشت، ئەویش لە چل ڕۆژی سێیەمدا ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾(واتە: پاشان ئەومان کرد بە دروستکراوێکی دیکە) ڕووحی کرد بە بەریدا، گواستیەوە لە بێ گیانەوە بۆ گیاندار.

﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: بەرزیو مەزنی بۆ خوا ﴿ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾ (واتە: کە چاکترینی بەدیهێنەرانە) ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾السجدة، (واتە: ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بە چاکی دروستکردوە، لە سەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروستکرد * پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادەو بێ نرخ بەدیهێناوە * پاشان ئادەمیزادی بەرێکو پێکی ڕێکخست لە ڕووحو گیانێک کە خۆی خاوەنیەتی فووی پێدا کرد، ئنجا دەزگای بیستنو بینینو لێکدانەوەی پێبەخشیوە، کەمتان سوپاسگوزارن).

بەدیهێنراوەکانی هەمووی چاکو جوانن، ئادەمیزادیش لە چاکترینی بەدیهێنراوەکانیەتی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾التين، (واتە: بە ڕاستی ئێمە مرۆڤەکانمان لە جوانترین شێوەدا دروستکردوە لە هەموو ڕووێکەوە) لەبەرئەمەیە مرۆڤەکان باشترینو تەواترینی بەدیهێنراوەکانن، ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾ (واتە: ئێوە لە دوای) دروستکردنو ڕووح کردنە بەردا ﴿ لَمَيِّتُونَ ﴾ (دەمرن)، لە قۆناغێ لە قۆناغەکانی تەمەنتان ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴾(واتە: لە پاشان بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دواییدا زیندووەکرێنەوە) پاداشت دەدرێنەوە بە پێی کردەوەکانتان چاک بێ یان خراپ، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾القيامة، (واتە: ئایا

مرۆڤ وا دادەنێ کە هەروا بەرەڵا دەکرێ * ئایا نوتفەیەک نەبوو لە تۆوەکە دەڕژێنرا * لە پاشان بوو بە خوێن پارەیەک ئنجا دروستی کردو ڕێکی خست * ئنجا لەو تۆوە دوو جۆری دروست کرد نێرو مێ * ئایا ئەو زاتە توانای نیە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە)؟!

(١٧-٢٠): ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾:

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی دروستکردنی ئادەمیزادی کرد، باسی شوێنی نیشتەجێبوونو فەراهەم کردنی نازونیعمەتەکانی کرد بەسەریەوە لە هەموو ڕوویەکەوە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ ﴾ سەقفێ بۆ شاروو وڵاتەکان وە بەرژەوەندیەک بۆ بەندەکان، ﴿ سَبْعَ طَرَآئِقَ ﴾ واتە: حەوت چین لە ئاسمانەکان، هەموو چینێک لەسەرووی چینێکی ترەوەیە، ئاسمانەکان جوانو ڕازاوە کراون بە ئەستێرەکانو مانگو خۆر، وە هەموو بەرژەوەندیەکانی مرۆڤی تێدا داناون، ﴿ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴾ (واتە: ئێمە لە دروستکراوەکان بێئاگانین) هەروەکو چۆن دروستکردنمان گشتگیرە بۆ هەموو بەدیهێنراوێک، هەروەها زانستیشمان دەوری ئەوەی داوە کە دروستمان کردوە، بێئاگا نابین لە هیچ بەدیهێنراوێو لەبیرمان ناچێ، دروستکراوێک دروست ناکەین ئنجا وازی لێبهێنین، بێئاگا نابین لە ئاسمان بکەوێتە سەر زەوی، بێئاگا نابین لە تۆوێک لە قەراغ دەریاکانو لە دەشتێکی وشکانی چۆڵدابێ، وە نە ئاژەڵێک مەگەر ڕزقو ڕۆزی خۆمانی بۆ دەنێرین، ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ﴿٦﴾ ﴾هود، (واتە: هیچ گیانلەبەرێک نیە لە زەویدا مەگەر ڕزقو ڕۆزیەکەی لەسەر خوایە وە خوا شوێنی مانەوەو شوێنی دەرچوونی دەزانێ).

خوا ﷻ لە قورئاندا بە زۆری دروستکردنو زانیاریی پێکەوە گرێدەدا، وەک فەرموویەتی: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾الملك، (واتە: مەگەر خوا نازانێت کێی دروستکردوەو چۆنی دروستکردوە لە کاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بە سۆزو بە ئاگایە، ﴿ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ ﴾یس، (واتە: بەڵێ دەتوانێو هەر ئەویش دروستکەری زانایە)، چونکە دروستکردنی بەدیهێنراوەکان لە گەورەترینی بەڵگە عەقڵیەکانە، لەسەر زانستو حیکمەتی بەدیهێنەرەکەی.

وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّـٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ
ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَـٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّـٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ
وَأَعْنَـٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً
تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْـَٔاكِلِينَ ﴿٢٠﴾
وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَـٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا
مَنَـٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ
﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَـٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَـٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَـٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ
﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ
ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ
فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ
ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَـٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ﴾ (واتــە: لــە ئاســمانەوە بارانمــان باراندووە بــە ئەندازەی پێویســت) بــۆ ئــەوەی ببێتــە ڕزقو ڕۆزی بــۆ خۆتــانو ئاژەڵەکانتــان، بــە ئەنــدازەی پێویســتیتان ئەوەنــدەی کــەم ناکاتــەوە کە بەشــی زەویو دارودرەختــەکان نــەکات، ئنجــا هیچ لــە مەبەســتەکە بە دەســت نەیە، ئەوەنــدەش بــارانو ئــاو زیــاد نــاکات تــا ژیانــی خەڵکــی بکەوێتــە مەترسیــەوەو شــوێنی نیشــتەجێبوونیان نەمێنــێ، بەڵکو لە کاتــی پێویســتدا بــاران دەبارێنــێ، پاشــان جێگۆرکێــی پێــدەکات لەبــەر ئــەوەی لــە بەردەوامیــدا زیــان نەگەیەنــێ.

﴿فَأَسْكَنَّـٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتــە: بارانمــان دابەزانــد بەســەریدا ئنجــا ئــەو ئــاوە لەنــاو زەویــدا مایــەوەو جێگیــر بــوو، وە دەردەچێ بە دەســەڵاتی ئەو کەســەی باراندوویەتی، بــۆ هەموو گژووگیــاو ڕووەکــەکان، هەروەها لەناو زەویــدا هێشــتویەتیەوە بــۆ ئــەوەی وەکــو خەزێنەیــەک بمێنێتــەوە، بــە جۆرێــک داینــاوە کەســێ کــە بیــەوێ دەریبهێنــێ ئەوەنــدە ڕۆنەچــێ بــە نــاو زەویدا هەتــا مانــدوو ئەبێ.

﴿وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَـٰدِرُونَ﴾ (واتــە: بێگومــان ئێمــە بەســەر لــە ناوبردنــی ئــەو ئــاوەدا بە توانایــن)، یــان ئەوەیــە بیبەینەخــوار بــە ناخــی زەویــدا کــەس نەتوانــێ دەریبێنــێ، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکــە بــۆ بەندەکان، سوپاســگوزاری خوا ﷻ بکەن لەســەر نازونیعمەتەکانی، وە ڕێــزی ئــەوە بگــرن ئەگــەر نەمێنــێ چــی زەرەروو زیانێک بەســەریان دێــت، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾﴾ الملك. (واتە: پێیــان بڵــێ: هەواڵــم بدەنــێ باشــە ئەگــەر ئاوەکەتان ڕۆچــوو کــێ دەتوانێ ئاوی ســازگارو ڕەوانتان بــۆ بەدەســت بهێنێ).

﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ﴾ واتــە: بــە هۆی ئەو ئــاوەوە (بەدیمان هێنــاوەو ڕواندوومانەتەوە بۆتان)، ﴿جَنَّـٰتٍ﴾ واتــە: بــاخو باخــات ﴿مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَـٰبٍ﴾ (لــە خورمــاو تــرێ) خــوا ﷻ

ئـەم دووجـۆرەی تایبـەت کـردوە بەسـەر هەمـوو دارەکانـی دیکەدا لەگـەڵ ئـەوەدا چەند دارێکـی تریـش لـە بەهەشـتدا هەیە، دیارە بە هـۆی فەزڵو سـوودی ئەو دوو دارەیە بەسـەر هەمـوو دارەکانـی تـردا، بۆیـە بـە شـێوەیەکی گشـتی بـاس دەکاتو دەفەرمـوێ: ﴿ لَكُمْ فِيهَا ﴾ واتـە: لـە ناو ئـەو بەهەشـتانەدا ﴿ فَوَٰكِهُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ واتـە: میوەیەکـی زۆر لە هەنجیـرو پرتەقـاڵو هەناروو سـێوو غەیـری ئەوانـەش ﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ ﴾ واتـە: (هەروەهـا رووانددوومانـە جـۆرە دارێکی زەیتـوون کە لە تـووری سـینا دەڕوێ) ئەو دارەش زەیتوونـە، بـە تایبـەت باسـکراوە، چونکـە لەسـەر زەویـدا شـوێنێکی تایبەتی هەیە لێـی دەڕوێ ئەویـش وڵاتـی شـامە، وە لەبـەر سـوودو بەرژەوەندیەکانی کـە هەندێکی لێ باسـکردوە، وەک فەرموویەتـی: ﴿ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴾ واتـە: ئـەو زەیتوونـە ڕۆنـی تێدایـە کە مـرۆڤ بەکاری دەهێنـێ بۆ ڕوونـاک کردنەوەو خـواردن، وە بۆ چەندین سـوودو بەرژەوەنـدی دیکە.

(٢١-٢٢): ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ﴾ یەکێکـی تـر لـە نیعمەتەکانـی خـوا ﷻ بەسـەرتانەوە ئەوەیە ئـاژەڵو ماڵاتـی بۆتـان ژێربار کردوە لە ڕەشـە وڵاخو حوشـترو مانگاو مەرو بـزن، پەندی تێدایـە بـۆ ئەوانەی پەنـد وەردەگرنو سوودیشـی تێدایە بۆیـان ﴿ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا ﴾ (واتـە: پێتـان دەنۆشـین ئـەوەی لـە ناو سـکیدایە) لە شـیر، لـە نێـوان پیسـیو خوێنەکەی دەردەچـێ پـاکو پاڵفتەیـە بـۆ ئەوانـەی دەیخۆنـەوە ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ ﴾ (واتە: ئەو ئاژەڵانـە سـوودو کەڵکێکـی زۆی تـری تیدایـە بۆتـان) لـە خـوری مـەرەکانو کورکـی حوشـترەکانو مـووی بزنـەکان، وە لـە پێسـتی ئاژەڵیـش دەوارو ڕەشـماڵی بـۆ فەراهـەم هێنـاون، هەڵـدەدرێو دەگوازرێتـەوە بـە ئاسـانی لە ڕۆژی کـۆچو بارکردنتانـداو لە ڕۆژی مانـەوەو نیشـتەجێ بوونتانـدا ﴿ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ (واتـە: لێشـیان دەخۆن) باشـترین خواردن لـە گۆشـتو بەزەکەیـان، واتـە: ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾ واتـە: کردوویەتـی بـە کەشـتی بۆتـان لە دەشـتدا، وە هەندێ لـەو ماڵاتانە بارەکانتـان هەڵدەگرنو دەیبـەن بۆ هەر شـارو جێگایـەک کە ئێـوە پێی نەدەگەیشـتن، مەگـەر زۆر بـە نارەحەتـی، هەروەکو چۆن کەشـتیەکانی لـە دەریـادا بۆ دانـاون بۆ ئەوەی بـاروو کـەلو پەلەکانتانی پـێ بگوازنەوە جا زۆربـێ، یـان کەم.

ئـەو خوایـەی ئـەم *نازونیعمەتانەی دابارانـدووە* بە چەندەها جـۆر چاکە، *تەنها ئەو شایسـتەی* ئەوەیـە شـوکرانەبژێری بـۆ بکرێو بە تەواوی وەسـف بکرێ، وە کۆشـش بکـرێ لە پێناو بەندایەتـی کردنیـدا، وە بە نازونیعمەتەکانی سـەرپێچیو گونـاه ئەنجام نەدرێ.

(٢٣-٣٠): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ
﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ
ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟
بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا
وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا
مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ
أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا
وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، ئەویش ئەوەیە کـە خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴾ خـوا ﷻ باسـی پەیامی بەنـدەو پێغەمبەرەکەی نـووح ﷺ دەکات، کـە بێگومان ئـەو یەکـەم پێغەمبەر بووە ناردوویەتی بۆ سـەر زەوی، نـاردی بۆ ناو گەلەکـەی لە کاتێکدا کـە ئـەوان بتیـان دەپەرسـت، فەرمانـی پێکـردن بـە بەندایەتی کردنـی خوا ﷻ بـە تاکو تەنهـا، فەرمـووی: ﴿ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ واتـە: ئـەی گەلەکـەم! بـە دڵسـۆزیەوە بەندایەتی بـۆ خـوا ﷻ بکـەن، چونکـە بەندایەتی کـردن تەواو نابـێ بە دڵسـۆزی نەبـێ ﴿ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾ (واتـە: ئێـوە جگە لـە خوا ﷻ پەرسـتراوێکی ترتان نیـە) ئەمـە بەتاڵکردنەوەی پەرسـتراوێتی غەیـری خـوای تێدایە، وە پەرسـتراوێتی تەنها بۆ خوا ﷻ دەچەسـپێنێ، چونکە خـوا ﷻ بەدیهێنـەری بژێـوی دەرە، خاوەنی هەموو تـەواوی کەماڵیەکە، جگـە لە خواش بە پێچەوانـەی ئەوەیـە ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (واتـە: دەی ئایا خۆتـان ناپارێزن) لـە بەندایەتی کردنی ئـەو بتانـەی کە بە دەسـتی خۆتان تاشـیوتانە لەسـەر وێنـەی پیاوچـاکان، وە لەگـەڵ خوادا دەیانپەرستن.

نـووح ﷺ بـەردەوام بوو لەسـەر دەعـوەو بانگـەوازی بە نهێنیو ئاشـکرا، بە شـەوو بەڕۆژ، بـە درێژایـی هەزار سـاڵ بێجگە لـە پەنجا سـاڵ، ئەوان هیچ سـودێکیان وەرنەدەگـرت تەنها یاخیبوونو ڕاکـردن نەبێ.

﴿ فَقَالَ ٱلۡمَلَؤُاْ ﴾ ئـەو پیـاو ماقوڵانـەی هـۆزو گەلەکـەی کە خەڵکـی شـوێنیان کەوتبوو، بەرهەڵسـتی پێغەمبەرەکەیـان کرد، وە خەڵکیـان ئاگادار کردەوە لە شـوێنکەوتنی (گوتیان): ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتـە: ئـەم نووحـە تەنها کەسـێکە وەک ئێـوە، مەبەسـتی لـە بانگـەوازی پێغەمبەرایەتـی ئەوەیـە دەیەوێـت خـۆی بکاتـە گـەورەو سەرمەشـقتان، بـۆ ئـەوەی شـوێنی بکـەون، ئەگەرنا چ شـتێکی لـە ئێـوە زیاترە تـا فەزڵو چاکـەی بدرێ بەسـەر ئێـوەدا، ئەویـش مرۆڤێکـە وەکو ئێـوە؟ ئەم بەرهەڵسـتیە بـەردەوام بوونـی هەبـووە لەوانـەی پێغەمبەرانیان بـە درۆ دادەناوە.

خـوا ﷻ وەڵامێکی ڕوونو شایسـتەی دایەوە لەسـەر زمانی پێغەمبەرانـی وەک فەرموویەتی: ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ واتە: بـە پێغەمبەرانیان وت: ﴿ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ ﴿١١﴾ ﴾، (واتـە: ئێوەش هـەر ئادەمیەکن وەک ئێمـە دەتانـەوێ ڕێگـری لـە ئێمـە بکـەنو لامـان بـدەن، لـە پەرسـتنی ئـەوەی کە باووباپیرانمان دەیانپەرسـت دەی نیشـانەو بەڵگەیەکـی ڕوونمان بۆ بێنـن * پێغەمبەرەکانیان پێیـان وتـن: ئێمـە هـەر ئادەمیەکین وەکـو ئێوە، بـەڵام خوا منەت دەنێ بەسـەر هـەرکام لە بەندەکانیـدا کە بیـەوێ)، پێغەمبـەران هەواڵیانـدا ئەمە فـەزڵو منەتی خوایە ئێـوەش ناتوانن ڕێگـری لـە خوا ﷻ بکەنو بەرهەڵسـتی بکـەن لە گەیاندنی فـەزڵو چاکەی بەسـەر ئێمەوە.

لێـرەدا وتیـان: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ ﴾ (واتە: ئەگەر خوا ﷻ بیویسـتایە پێغەمبەرێک بنێـرێ فریشـتەیەکی دەنـاردە خـوارەوە)، ئەمـەش بەهەمـان شـێوە بەرهەڵسـتیەکی بەتاڵـە بەرانبـەر بە ویسـتو مەشـیئەتی خـوا ﷻ بێگومـان خوا ئەگەرچی ویسـتی وایێ فریشـتەیە دابەزێنـێ ئـەو کاربەجـێو میهرەبانـە، کاربەجێـیو ڕەحمەتـی ئـەوە دەخـوازێ کـە ئـەو پێغەمبـەرە دەبـێ لـە ڕەگەزی ئادەمیـزاد بێ، چونکـە فریشـتەکان توانای دواندنـی مرۆڤیان نیـە، وە نابـێ ئـەوەش ڕوویـدا مەگەر بچنە سـەر وێنەی مـرۆڤ، ئنجا لە لایان تێکـەڵ دەبێ کێ فریشـتەیەو کـێ مرۆڤە.

ئـەوان کـە وتیـان: ﴿ مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا ﴾ واتـە: (ئێمـە شـتی لـەو جۆرەمـان نەبیسـتووە بە ناردنـی پێغەمبـەری) ﴿ فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ (واتـە: لەبـاوو باپیـرەی پێشـوەکانمان)!

ئایـا ئـەوان چ بەڵگەیەکیان پێیە لـەوەی کەلە باووباپیرانیانـەوە نەیانبیسـتووە پێغەمبەرێکیان بـەو شـێوەیە بـۆ هاتبـێ؟ چونکە ئـەوان زانیاریـان نیە بە پێشـینی خۆیـان، دەی بـا نەفامی

خۆیــان نەکــەن بەبەڵگــە بۆ ئــەو مەبەســتە. قســەکەیان بــەو مانایــە دێ بــاوکــو باپیرانیان پێغەمبەریــان بــۆ نەنێــردراوە، جــا یــان ئەوەیــە لەســەر هیدایــەت بــوون، ئــەو کات هیــچ پێویســت بــە ناردنــی پێغەمبــەر نــاکات، یــان لەســەر غەیــری هیدایــەت بــوون، دەی بــا شــوکرانەبژێری پەروەردگاریــان بکــەن کــە تایبەتــی کردونو بــە نیعمەتێــک باوباپیرانیانی تایبــەت نەکــردووەو هەســتیان پێنەکــردوە، بــا چاکە نەکــردن لەگــەڵ جگە لەوانــدا نەکەنە هــۆکارێ بــۆ بێبڕوابوونیان بۆ چاکە کــردن لەگەڵیانــدا، ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ بِهِۦ جِنَّةٌ ﴾ واتە: (ئــەم پیاوە) شــێتە ﴿ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ ﴾ واتە: چــاوەڕوان بکــەن ﴿ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ تا ماوەیەک، بەڵکو بــمرێ.

ئــەم گومانــەی کــە هێناویانــەوە پێچەوانــەی پێغەمبەرایەتــی نووحــە ﷺ، بەڵگەیــە لەســەر ڕۆچوونیــان لە کوفرو عینادیدا، وە لەســەر ئــەوەی ئەوان لەوپەڕی نەفامیو سەرلێشــواویدان، ئــەو پەیامــە پێغەمبەرایەتیــە شایســتەی بەرهەڵســتی نیــە بــە هیــچ جــۆرێ لــە جــۆرەکان، هەروەکــو باســمان کــرد، بەڵکو لــە خــودی خۆیــدا پێچەوانــەوەو دژبەیەکە.

جــا وتەکانیــان: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ ﴾ ئەوەیــان چەســپاند کــە نــووح ﷺ خــاوەن عەقڵێکە دەیەوێت ببێتە سەرمەشقیان، بۆیە پێویســتە ئاگــادار بکرێتەوە لەبــەر ئــەوەی لە خــۆی دەرنەچی.

ئــەی چــۆن دەگونجــێ لەگــەڵ وتەکەیــان: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ بِهِۦ جِنَّةٌ ﴾ واتــە: ئایــا ئــەم تۆمەتــکارە کەســێکی گومڕاو سەرلێشــێواو نیــە، کارەکەی بەســەردا پێچەوانە نــە بووەتەوە، مەبەســتی ئەوەیــە بــە هــەر ڕێگایــەک بــێ ئــەو پەیامــە ڕەتبکاتــەوە، نازانــێ بــەوەی چی دەڵێــت؟! خــوا ئەیــەوێ ڕیســوایی ئەوانــە دەربخــات کــە دژایەتــی ئــەوو پێغەمبەرەکــەی دەکەن.

کاتــێ نــووح ﷺ بینــی بانگــەواز کردنــی بۆیــان هیــچ ســوودێکی نیــە تەنهــا ئــەوە نەبێ هــەڵ ئەتیزێنــنو ڕا ئەکــەن ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴾ داوای ســەرکەوتنی لــە پەروەردگــاری کــرد، لە پێنــاوی خوادا تــووڕە بوو، کاتێ بینــی فەرمانەکەیــان بیر کردووەو پێغەمبەرەکەیــان بــە درۆ خســتوەتەوە، وتــی: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ ﴾نوح. (واتــە: پەروەردگــارا هیــچ کەســێک لــە بێبڕوایان لەســەر زەویدا مەهێڵــەرەوە * چونکە بە ڕاســتی تــۆ ئەگــەر وازیــان لــێ بهێنــی هەرچــی بەندەکانــی تۆیە گومــڕای دەکــەنو کەسیشــیان

لێنابێــت مەگــەر خراپــەکارو تاوانبــار نەبێ).
خــوا ﷻ فەرمــووی: ﴿ وَلَقَدۡ نَادَىٰنَا نُوحٞ فَلَنِعۡمَ ٱلۡمُجِيبُونَ ٧٥ ﴾الصافات، (واتــە: بێگومان نــووح ؈ هانــاو هــاواری بــۆ هێنایــن، ئێمەیــش چاکتریــن فریاد ڕەســێک بوویــن کە بە هانــاو هاواریــەوە چووین)، ﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ ﴾ واتــە: (ئنجا ئێمە نیگامان بــۆ کرد) کاتێ بــە دەم داواکاریەکەیــەوە هاتیــن، تــا ببێتە هــۆکارو کەرەســتەیەک بۆ ڕزگار بــوون، پێش ئــەوەی هۆکارەکانــی ڕوو بــدەن ﴿ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ ﴾ واتــە: کەشــتی ﴿ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا ﴾ واتــە: بــە فەرمــانو یارمەتــی ئێمە بۆت، تۆ لــە پارێزگــاری ئێمــەدای بە جــۆرێ دەتبینینو گوێمــان لێتە.
﴿ فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا ﴾ (واتــە: ئەگــەر فەرمانــی ئێمــە هــات) بــە ناردنــی لافــاوو کــە پێــی ســزادران ﴿ وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴾ واتــە: ئــاو لــە زەویــەوە هەڵقــوڵا هەمــووی بوو بــە کانیاوو تەقــی، تەنانــەت نــاو تەنووریــش، کــە بــە پێــی سروشــت ئــەو شــوێنە دوورە لــە ئــاوەوە ﴿ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾ واتــە: بیخــەرە نــاو کەشــتیەکەوە لــە هەمــوو ڕەگــەزی ئاژەڵــەکان، نێــرو مێ، بــۆ ئەوەی تــۆوی وەچەی هەمــوو گیانــدارەکان بمێننەوە، کــە حیکمەتــی خــوا دەخوازی ئــەو وەچانە بمێننــەوە لەســەر زەوی ﴿ وَأَهۡلَكَ ﴾ واتە: مــاڵو منداڵەکانیشــت بخــەرە نــاو کەشــتیەکە ﴿ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ ﴾ (واتــە: جگە لەوانــەی کــە بڕیــاری لــە ناوچوونیــان دراوە) وەک کوڕەکــەت ﴿ مِنۡهُمۡۖ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ ﴾ واتــە: داوام لــێ مەکــە ڕزگاریــان بکــەم، چونکــە قــەزاو قــەدەر حەتمیو یــەکلای کردوەتــەوە دەبــێ لەنــاو بچن

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي
نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ
خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا
مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَـٰهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
مَا هَـٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ
مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ
﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ
﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا
ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا
رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ
ٱنصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَـٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَـٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ
ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾

﴿ فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ ﴾ واتــە: ســەرکەوتن بەســەر کەشــتیەکەدا، ڕزگارتــان بــوو لــە تەوژمــی شــەپۆلەکانی دەریــا، ستایشــی خــوا بکــەن لەســەر ڕزگــار بــوونو ســەلامەتی ﴿ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (واتــە: بڵــێ: ســتایش بــۆ ئــەو خوایــەی ڕزگــاری کردیــن لــە گەلــی ســتەمکار)، ئەمــە فێرکــردنو ڕێنماییــە لــە لایــەن خــواوە بــۆ نــووحو بــۆ ئەوانەیشــی لەگەڵیــدا بــوون، ئەمــە بڵێــن وەک ســوپاسو ستایشــێ بــۆ خــوا لەســەر ڕزگــار بوونیان لــە گەلــی ســتەمکاران، وە لــە کــردەوەو ســزادانیان.

﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾ واتــە: نیعمەتێکــی تــر مــاوە بیبەخشــێ پێتــان، داوا لــە خــوا بکــەن لــە شــوێنێکی پیــرۆزو بەفــردا داتــان بەزێنــێ، خــوا داواکــەی لــێ وەرگــرت، فەرموویەتــی: ﴿ وَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِيِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾هود، (واتــە: کارەکــە (خنکانیــان) تــەواو کــراو کەشــتیەکە وەســتا بەســەر کــەژی جوودیــەوە، وە وتــرا: دووری لــە ڕەحمــی خــوا بــۆ گەلــی ســتەمکاران)، تــا ئەگاتــە ئــەو شــوێنەی کــە فەرموویەتــی: ﴿ قِيلَ يَـٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَـٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَـٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ ﴿٤٨﴾ ﴾هــود. (واتــە: وتــرا: ئــەی نــووح عليه السلام دابــەزە لــە کەشــتیەکە بــە هێمنــیو بێــوەی لەلایــەن ئێمــەوە، وە بــە پیــتو فــەڕی زۆر بەســەر خۆتــەوە، وە بەســەر گەلانێــک کــە پەیــدا ئەبــن لەوانــەی کــە لەگــەڵ تــۆ دان) ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾ واتــە: لــەم چیرۆکــەدا ﴿ لَـَٔايَـٰتٍ ﴾ واتــە: بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی خــوا پەرســتراوە بەتــاکو تەنهــا، وە پێغەمبەرەکــەی نــووح عليه السلام ڕاســتگۆیە، گەلەکەیشــی درۆزنــە، وە بەڵگەیــە لەســەر ڕەحمەتــی خــوا بــۆ بەندەکانــی، کاتــێ لــە پشــتی باوکیانــدا داینــان لــە نــاو کەشــتیەکەدا، دوای ئــەوەی ســەر زەوی خنــکانو نووقــم بــوون.

هەروەهــا کەشــتیەکەش یەکێکــە لــە نیشــانەکانی خــوا، وەک فەرموویەتــی: ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ ﴾القمر، (واتــە: بێگومــان ئــەو ڕووداوەمــان هێشــتەوە تــا ببێتــە پەندێــک، جــا ئایــا کەسێک هەیــە پەنــد وەربگــرێ)، لەبــەر ئەمــە لێــرەدا کــۆی کردوەتــەوە، چونکــە بەڵگەیــە لەســەر چەندیــن نیشــانەو داواکاری ﴿ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴾ (واتــە: بەراســتی ئێمــە تاقیکەرەوەیــن بــۆ هەمــوو خەڵکــی).

(٣١-٤١): ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾

دوای ئــەوەی باســی نــووحو گەلەکــەی کــرد، چــۆن لــە نــاوی بــردن، فەرمــووی: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾ (واتــە: پاشــان لــە دوای ئــەوان بەدیمــان هێنــا گــەلو نەوەیەکــی دیکــە) بەڕواڵــەت وا دەردەکــەوێ ئەوانــە (ثمــود)ن، گەلــی صاڵــح ، چونکــە ئــەم چیرۆکــە لــە چیرۆکــی ئــەوان دەچــێ.

﴿ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ ﴾ پێغەمبەرێــک کــە لــە خۆیانــەو بنەماڵــەو ڕەچەڵــەکو ڕاســتگۆیی دەزانــن، بــۆ ئــەوەی بــە زووتریــن کات گوێڕایەڵــی بکــەن، جــا ئەگــەر لــە خۆیــان بــوو، وە لێشــیان بێــزار نەبــوو، وەکــو هەمــوو پێغەمبــەران بانگــەوازی گەلەکــەی کــرد ﴿ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾ (واتــە: تەنهــا خــوا بپەرســتن جگــە لــەو خوایــە پەرســتراوێکی ترتــان نیــە) هەمــوو پێغەمبــەران لەســەر ئــەم بانگــەوازە یــەک دەنــگ بــوون، ئــەوە یەکــەم بانگــەوازە گەلەکــەی خۆیانــی پــێ بانــگ دەکــەن، ئەویــش فەرمانکردنــە بــە بەندایەتــی کردنــی خــوا، وە هەواڵــدان کــە تەنهــا ئــەو شایســتەی ئەوەیــە، وە قەدەغەکردنــی بەندایەتــی کــردن بــۆ غەیــری ئــەو، وە هەواڵــدان بــە بەتاڵــیو پووچــی ئــەوە، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ واتــە: ئایــا لــە پەروەردگارتــان ناترســن، بــۆ ئــەوەی دوور بکەونــەوە لــەو بتانــە ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن

قَوۡمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ واتــە: دەســـەڵاتدارانو پیاوماقــوڵان ئەوانــە كوفــرو نكووڵیــان پێكــەوە كــۆ كردبوویــەوە، نــازو نیعمەتــی زۆری دونیــا یاخــی كردبــوونو چاویــان ســووربوو بــوو، بەرهەڵســتی پێغەمبەرەكەیــان دەكــرد، بــە دۆریــان دادەنــاو خەڵكیــان لــی ئاگــادار دەكــردەوە، وتیــان: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ ﴾ واتــە: (ئەمــە هــەر مرۆڤێكــە) وەكــو ئێــوە ﴿ يَأۡكُلُ مِمَّا تَأۡكُلُونَ مِنۡهُ وَيَشۡرَبُ مِمَّا تَشۡرَبُونَ ﴾ (واتــە: دەخــوا لــەوەی ئێــوە دەیخــۆن، دەخواتــەوە لــەوەی ئێــوە دەیخۆنــەوە) چــی وایكــردوە فەزڵــی ئــەو بــدات بەســەر ئێــوەدا؟ خــۆ ئــەو فریشــتەیەك نیــە خــواردنو خواردنــەوە نەخــوات.

﴿ وَلَئِنۡ أَطَعۡتُم بَشَرٗا مِّثۡلَكُمۡ إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴾ واتــە: ئەگــەر شــوێنی بكــەونو بیكــەن بــە پێشــەوای خۆتــان، لــە كاتێكــدا وەكــو ئێــوە وایــە، ئێــوە بــێ عەقڵــنو پەشــیمان دەبنــەوە لەســەر ڕەفتارەكانتــان، ئەمــە جێگــای سەرســوڕمانە، بێگومــان خەســارەتو پەشــیمانی ڕاســتەقینە بــۆ ئــەو كەســەیە شــوێنی نەكەوتبــێو ملكەچــی نەبــوو بــێ، نەفامــیو گەمژەیــی مــەزن بــۆ كەســێكە تووشــی پەرســتنی دارو بــەرد بووبــێ، لــە بەرانبــەردا لــووت بــەرزی بنوێنــێ بــۆ ملكەچبوونــی لــە ئاســتی مرۆڤێكــدا خــوا بــە تایبــەت وەحــیو نیگــای بــۆ ناردبــێ، وە فەزڵــی پێدابــێ بــە پەیامەكــەی.

ئەمەش وێنــەی وتەكەیانــە: ﴿ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلۡقِيَ ٱلذِّكۡرُ عَلَيۡهِ مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ ﴿٢٥﴾ ﴾ القمر، (واتــە: وتیــان: چــۆن ئێمــە دوای تاكــە كەســێك بكەویــن لــە خۆمــان ئەگــەر دوای تــۆ بكەویــن، ئەوســا ئێمــە لــە گومڕاییــو شكســتی دایــن * ئایــا لەنــاو هەموویانــدا ســرووش هــەر بــۆ ئــەو كــراوە بــە تەنیــا؟ نەخێــر بەڵكــو ئــەو صاڵحــە پیاوێكــی زۆر درۆزنــی خۆپەســندو لــووت بــەرزە).

كاتــێ نكووڵــی پەیامەكەیــان كــردو ڕەتیــان كــردەوە، ئنجــا نكووڵیــان لــەو پەیامــە كرد كــە هێنــا بــووی، لــە زینــدوو كردنــەوە دوای مــردن، وە پاداشــتدانەوەی كــردەوەكان، جــا وتیــان: ﴿ أَيَعِدُكُمۡ أَنَّكُمۡ إِذَا مِتُّمۡ وَكُنتُمۡ تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخۡرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيۡهَاتَ هَيۡهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ واتــە: دووره دووره (لەڕاســتی) ئــەو بەڵێنــەی دەیــدا بــە ئێــوە دەربــارەی زیندووبوونــەوە، پــاش ئــەوەی لــەتو پــەت بــوونو بــوون بــە خــۆڵو ئێســك، تەماشــایان كــرد بــەڵام تەماشــا كردنێكــی كــورت بینانــە، لــە ڕوانگــەی خۆیانــەوە تەماشــای خوایــان كــرد، توانــای خوایــان بــە توانــای خۆیــان قیــاس كــرد، بــەرزی

بۆ خوا، نکوولّی قودرەتی خوایان کرد لەسەر زیندوو کردنەوەی مردوو، وە بەوپەڕی بێتوانایی خوایان وێنا کرد، بیریان چوو کە خۆیان یەکەم جار چۆن دروستکراون، ئەو خوایەی لە نەبوونەوە هێنانیە بوون، دروستکردنەوە دووبارە کارێکی زۆر ئاسانترە بەلایەوە، بێگومان هەردووکیان ئاسانن بە لای خواوە، ئەی بۆ چی ئەو بێ عەقلانە نکوولّی سەرەتای دروست کردنیان ناکەن، وە ڕووبەڕووی ئەوانە نابنەوە کە هەستی پێدەکرێو بڵێن: ئێمە بەردەوام بوونمان هەبووە، هەتا نکوولّی کردنی زیندوو کردنەوەیان ڕاست دەربچێت؟

لێرەدا بەڵگەیەکی تر بەدی دەکرێ، ئەو خوایەی زەوی زیندوو کردەوە پاش ئەوەی مردبوو، تەنها ئەو مردوو زیندوو دەکاتەوە، بەڕاستی ئەو بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

بەڵگەیەکی دیکەش بەدی دەکرێ، ئەویش وەڵامی نکوولّی کارانی زیندووبوونەوەی پێ دەدرێتەوە لە فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿ بَلْ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ ﴾ق، (واتە: بەڵام بێبڕوایان سەریان سووڕما لەوەی کە پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ هاتووە لە خۆیان جا بێبڕوایان دەیانووت ئەمە شتێکی سەیرە * ئایا کاتێ مردینو بووین بە خۆڵ ئەوە گەڕانەوەیەکی دوورەو نابێ)، لە وەڵامیاندا فەرمووی: ﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ﴿٤﴾ ﴾ق، (واتە: بێگومان ئێمە دەزانین زەوی چەندێ لە لاشەیان دەخوات)، ﴿ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴾ (واتە: پەڕاوێکیشمان لایە کە پارێزەری هەموو شتێکە).

﴿ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا ﴾ واتە: خەڵکێک دەمرێو خەڵکێکیش زیندوو دەبێتەوە، نەوە لە دوای نەوە ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴾ واتە: (وە ئێمە زیندوو ناکرێینەوە)، ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ ﴾ لەبەر ئەوەیە هێنای لەوەی پێی هێنای لە یەکتاپەرستی خواو چەسپاندنی زیندووبوونەوە ﴿ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ واتە: سزای کوشتنو جگە لەویشی لەسەر هەڵبگرن وەکو ڕێزێک بۆی، وە لەبەر ئەوەی شێتە قسەی لێناگیرێ، واتە: هیچیان بە دەستەوە نەما لە بۆچوونە بەتاڵەکانیان لە بەرانبەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە هێناویەتی، بێگومان ئەوان بە پووچو بەتاڵیان زانی، بەڵام تەنها ئەوە مابوو ئایا

لـە نـاوی بـەرن یـان نـا؟ جـا بـە گومانـی خۆیـانو بـە عەقڵـە لاوازەکەیـان پێیـان وا بـوو دەغڵـی نەکـەن، وە وازی لێبهێنـن هەرچەنـدە لـە ناوبردنـی پێویسـتە، ئایـا لەسـەری ئـەم عینـادیو بێبڕواییـەوە شـتێکی دیکـە هەیـە؟! لەبەرئەمەیـە کاتـێ کوفـرو بێبڕواییان توونـد بوویـەوە ئاگـادار کردنـەوەش هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆیـان، پێغەمبەرەکەیـان دوعـای لێکـردن، فەرمـووی: ﴿رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ واتـە: لـە ناویـان بـەرەو ڕیسـواو سەرشـۆڕیان بکـە لـە دونیـادا پێـش ڕۆژی دوایـی، ﴿قَالَ﴾ خـوا ﷻ لـە وەڵامـی داواکەیـدا فەرمـووی: ﴿عَمَّا قَلِيلٖ لَّيُصۡبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ۝٤٠ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ بِٱلۡحَقِّ﴾ واتـە: نـەک بـە سـتەمو زوڵـم کـردن، بەڵکـو بـە دادپـەروەری، بـە هـۆی سـتەمیانەوە شـریخەو دەنگێکـی زۆر بەهێـز دای بەسـەریاندا، هەموویانـی لـە ناوبـرد لەسـەرەتا بـۆ کۆتایـان ﴿فَجَعَلۡنَٰهُمۡ غُثَآءٗ﴾ واتـە: وەک پووشـێکی وشـکو کەفـی سـەر لافـاو کـە دەکەوێتـە تەنیشـتی دەریاکانـەوە، لـە دەقێکـی تـردا فەرموویەتـی: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ۝٣١﴾ القمر، (واتـە: بێگومـان ئێمـە دەنگێکـی گـەورەی ترسـناکمان بـۆ نـاردن هەمـوو بـوون بـە پووشـی ژێـر پێـی ئـاژەڵ).

﴿فَبُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتـە: لەگـەڵ سـزادانیاندا دوور بـوون لـە ڕەحمەتـی خـواو نەفریـنو سەرزەنشـتیان بـە دوادا هـات لەلایـەن جیهانییانـەوە، ﴿فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ۝٢٩﴾ الدخـان، (واتـە: جـا نـە ئاسـمانەکانو نـە زەوی نەگریـان بۆیـان وە مۆڵەتیشـیان پێنـەدرا).


مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا
تَتْرَا كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا
وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ
وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ
فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا
وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ
﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا
ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ
﴿٥٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّى بِمَا
تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ
فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ
فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم
بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ
﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم
بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾

(٤٢-٤٤): ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا
ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا
يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ
مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم
بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ
لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

واتــە: دواتر لە دوای ئەو گەلـە بەدرۆدانەرو نکوڵیکارانـە چەنـد گـەلو ئۆممەتێکـی دیکەمـان بەدیهێنـا هەمـوو ئۆممەتـێ لـە کاتو سـەردەمێکی دیاریکراودا، ئەوکاتو سـەردەمەی کـە بۆیـان دیاریکرابـوو بـۆ مـردن نـە پێـش دەکـەوتو نـەدوا دەکـەوت، لـە پاشـان پێغەمبەرانـی خۆمان یـەک لـەدوای یـەک نـارد، لەبـەر ئەوەی بڕوایـان پێبهێنـنو گوێڕایەڵیـان بکـەن.

بـەڵام بـە شـێوەیەکی بـەردەوام بێبڕوایـیو بەدرۆدانان پیشـەی ئـەو گەلە سـەرپێچیکارانە بـوو، هەرکاتـێ ئۆممەتـێ لـە خۆیـان پێغەمبەرێکیان بـۆ بهاتایە بـە درۆیان دادەنـا، لەگەڵ ئـەوەدا هەمـوو پێغەمبـەرێ لـە پێغەمبـەران بەڵگەو نیشـانەیەکی پێ بـووە کە ببێتـە مایەی ئـەوەی مـرۆڤ بـڕوای پێ بهێنـێ، بەڵکـو تەنها بانگەشـەی پێغەمبـەرانو شـەریعەتەکانیان بەڵگەیـە لەسـەر حەقیقەتو ڕاسـتی ئەو پەیامەی کـە هێناویانـە ﴿ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا ﴾ واتـە: (جـا ئێمەش ئـەم ئۆممەتـە بێبڕوایانە یـەک لە دوای یـەک) لەناومان بـردن، هیچیان لـێ نەمایەوە ماڵو کۆشـکەکانیان لـەدوای خۆیان خاپوور بـوون، ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ ﴾ واتـە: (باسـی ئەوانمـان کـردە بەسـەرهاتو ڕووداوێـک) خەڵکـی دوای ئـەوان لـە نێوان خۆیانـدا باسـیان بکەن، وە بـۆ ئەوەی ببن بـە پەندوو عیبرەت بـۆ خۆپارێزان، وە سـزایەک بـۆ بەدرۆدانەران، وە ڕیسـوایش بەدوایاندا بێ لەگەڵ سـزادانیان ﴿ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ (ئنجـا دووری لـە ڕەحمەتـی خـوا ﷻ بـۆ گەلـێ بڕواناهێنـن) ئـای کـە چەنـدە گومڕان؟ ڕیسـوایی بۆ ئەوان، بەڕاسـتی لـەو بازرگانیـەدا خەسـارەتمەند بوون.

(٤٥-٤٩): ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ
وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ
﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ
﴿٤٩﴾ ﴾

سـەردەمانێکی دووروو درێـژی بەسـەردا تێپـەڕ بوو لە وتەی هەنـدێ لە زانایان، ئێسـتا بیرم نەمـاوە نـاوی بێنـم، ئەویش ئەوەیـە دوای ناردنی مووسـاو دابەزینی تەوڕات خوا ﷻ سـزای لەسـەر ئۆممەتـەکان هەڵگـرت، واتە: سـزای لە بنـجو بنەوانە دەرهێنـانو لـە ناوبردنیان، لە بەرانبـەر ئـەوەدا جیهاد پێویسـت کرا لە بەرانبـەر بەدرۆدانـەرانو نکوڵیـکاران، نەمزانی ئەم مامۆسـتایە ئەمـەی لە کـوێ وەرگرتـووە، کاتێ بیرم لـەم ئایەتـە پیرۆزانە کـردەوە لەگەڵ ئـەو ئایەتانـەی لە سـووڕەتی (القصص)دا هاتـوون، بـۆم ڕوون بوویەوە، بەڵام ئـەم ئایەتانە، لەبـەر ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی ئـەو ئۆممەتانـە دەکات کە بـە دوای یەکـدا هاتـوونو لەناو چـوون، پاشـان هەواڵـی داوە کە مووسـا (عليه السلام)ی نـاردوە لە دوای ئـەوان، وە تەوڕاتیشـی بۆ دابەزانـدووە کـە هیدایـەتو ڕێنموویـی تێدابوو بـۆ خەڵکی، ئەمـە لەناو بردنـی فیرعەونو دارو دەسـتەکەی ڕەتناکاتـەوە، چونکـە ئـەوان پێـش دابەزینـی تـەوڕات لەناو بـران، بەڵام ئـەو ئایەتانـەی لـە سـووڕەتی (القصـص)دا هاتـوون، ئەوانـە زۆر ڕوونو ئاشـکران، خوای گـەورە دوای ئـەوەی باسـی لەناوبردنـی فیرعەونی کـرد فەرمـووی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ القصص، (واتە: سـوێند بە خوا ئێمە تەوڕاتمان بەخشـیوە بە مووسـا، دوای ئـەوەی کـە گەلـە پێشـووەکانمان لەنـاو برد (چونکـە یاخی بـوون) تـا ببێتە هـۆی بەرچاو ڕوونـیو هیدایـەتو ڕێنموویـیو ڕەحمـەتو میهرەبانـی بۆ خەڵکـی بۆ ئەوەی یـادەوەری وەربگـرنو تێفکـرن) ئەمـە دەقـە بـە ڕاشـکاوی ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکات، ئـەو کتێبی بۆ هاتـووە دوای لـە ناوبردنـی ئومەتە گومـڕاکان، وە هەواڵیشـی داوە بـۆ ئـەوە دایبەزاندوە تا ببێتـە مایەی هیدایـەتو ڕەحمـەتو میهرەبانی.

وە دەگونجـێ لەمـەدا خـوا باسـی کردبـێ لـە سـوورەتی (یونـس)دا وەک فەرموویەتـی:
﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ ﴾ واتـە: لـە دوای نـووح (عليه السلام) (ناردمان)، ﴿ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا
مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ یونس، (واتـە: پێغەمبەرانێـک بـۆ نـاو گەلەکانیـان

ئەوانیــش هاتــن بۆ لایــان بــە بەڵگــە ڕوونەکانــەوە کەچی ئــەوان بڕوایــان نەهێنــا، بەوەی کــە لــە ڕابــردوودا بڕوایــان پــێ نەهێنــا بــوو، بەو جــۆرە مــۆر دەنێین بەســەر دڵی دەســت درێژکارانــدا تــا تێبگــەن * جــا لــە دوای ئــەوان مووســاو هاڕوونمــان ڕەوانە کــرد)، خوا زاناترە.

جــا خــوا ﷻ دەفەرموێ:﴿ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ ﴾ (لە پاشــان مووســا)ی کــوڕی عیمرانمان نــارد کەلیمــی ڕەحمــان،﴿ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ ﴾ (واتــە: وە هاڕوونــی بــرای) کاتــێ داوای لــە پەروەردگــاری کرد هاڕوون بکاتە هاوبەشــی لــە کاروبارەکانیدا، خوایــش وەڵامی داواکەی دایــەوە﴿ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ (بــە ئایەتەکانمــان) کــە بەڵگــەن لەســەر ڕاســتگۆییانو ڕاســتی ئــەو پەیامــەی هێناویانــە﴿ وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴾ واتە: بــە بەڵگەی ڕوونو ئاشــکرا، ئەوەنــدە بەهێزە دەتوانــێ زاڵ بــێ بەســەر دڵەکانــدا، دڵــی بڕوادارانیش ملکەچی بــۆ بنوێنن، وە ببێتــە بەڵگەو حوججــەی دیــار لەســەر نکوولێــکاران، ئەمــەش وەک فەموودەی خــوا ﷻ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء (واتــە: ســوێند بــێ ناردومانــە بۆ مووســا نۆ ئایەتو نیشــانەی ڕوونو ئاشــکرا)، لەبــەر ئەمە گــەورەی نکوولێــکاران حەقی ناســیو عینادی کرد ﴿ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء (واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ دەی پرســیار لە نەوەی ئیســرائیل بکــە)، واتە: ســەبارەت بەو ئایەتــە ڕوونو ئاشــکرایانە﴿ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ ﴾ فیرعــەون بــە مووســای وت:﴿ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء (واتــە: بــە ڕاســتی ئــەی مووســا ﷺ مــن وا گومان دەبــەم کە تۆ جــادوو لێکراو بیــت) جا﴿ قَالَ ﴾ فەرمــووی: ﴿ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا ﴿١٠٢﴾ ﴾ الإسراء (واتــە: ســوێند بە خــوا بێگومان تۆ دەزانــی هیچ کەس ئــەم موعجیزانــەی نەناردووەتــە خــوارەوە جگــە لــە پەروەرگــاری ئاســمانەکانو زەوی کە ڕوون کــەرەوەن، وە بــە ڕاســتی مــن دڵنیــام ئــەی فیرعەون تۆ لەنــاو دەچیــت)، وە خوا ﷻ فەرموویەتــی:﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗا ﴿١٤﴾ ﴾ النمل (واتە: دانیان بەو موعجیزانــەدا نەدەنــا کــە لــە دڵــی خۆیانــدا بەڕاســتیان دەزانی لەبــەر ســتەمکاریو خۆبەزل زانین).

لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾ وەک هامــانو جگە لە ئەویش لە دەســەڵاتدارەکان﴿ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾ واتــە: لــووت بەرزیــان نوانــدا لــە ئاســتی بڕواهێنانــدا، وە خۆیــان بە گــەورە دادەنا بەســەر

پێغەمبەرەکانیانەوە ﴿ وَكَانُوا۟ قَوۡمًا عَالِینَ ﴾ واتە: خوا وەسفی کردوون بە بەرزیو دەسەڵاتداریو فەسادو خراپەکاری لەسەر زەویدا، تا لەبەر ئەمە لووت بەرزیان نواند، بەڵام ئەوە زۆری نەخایاند.

﴿ فَقَالُوٓا۟ ﴾ بە خۆبەزل زانیەوە، وە بە ترساندنی ئەوانەی کەم عەقڵنو شاردنەوەی ڕاستیەکان لێیان، وتیان: ﴿ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَیۡنِ مِثۡلِنَا ﴾ (واتە: ئایا ئێمە بە دوو کەسی وەکو خۆمان بڕوا بێنین) هەروەکو چۆن پێشینیان ئەوەیان وت، دڵیان لەیەک دەچوو لە بێبڕواییدا، ئینکاریان لە منەتی خوا کرد لەو پەیامەی بۆیان نێردراوە.

﴿ وَقَوۡمُهُمَا ﴾ واتە: نەوەکانی ئیسرائیل (گەلەکەی مووساو هاروون)، ﴿ لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾ واتە: بەندەو خزمەتکارو کرێکاری بەردەستی ئێمەن، هەر وەکو خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ نَجَّیۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ یَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ یُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَیَسۡتَحۡیُونَ نِسَآءَكُمۡ وَفِی ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِیمٌ ﴿٤٩﴾ ﴾البقرة، (واتە: بیری نیعمەتی ڕزگاربوونیشتان بکەنەوە کاتێک ڕزگارمان کردن لە دەست داروو دەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کوڕەکانتانیان سەر دەبڕینو ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوە، ئەوەش بۆ ئێوە تووش هاتو تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە)، چۆن ئێمە شوێنی ئەوان بکەوین لە کاتێدا ئەوان شوێنکەوتووی ئێمە بوون؟ وە چۆن دەبێ ئەوانە ببنە سەرۆکی ئێمە؟!

وە وێنە وەتەکانیان، قسەی گەلی نووح بوو: ﴿ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾الشعراء، (واتە: ئێمە چۆن لە بەرخاتری تۆ بڕوابێنین لە کاتێکدا کە کەسانی هەژارو داماو شوێنت کەوتوون)، وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِینَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِیَ ٱلرَّأۡیِ ﴿٢٧﴾ ﴾هود، (واتە: وە نابینین تۆ هیچ کەسێ شوێنت کەوتبێ جگە لەوانەی کە هەژاروو پەستەکانمانن، بێ ئاوەزاو ساویلکەن). لە ڕاستیدا ئەوەی زانراوە ئەمە ناکرێتە بەڵگە بۆ بەرپەرچدانەوەی حەق، بەڵکو ئەوە بەدرۆدانانو عینادی کردنە لە ئاستی هەقدا.

لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلۡمُهۡلَكِینَ ﴾ لە خنکان لەناو دەریادا، نەوەکانی ئیسرائیلیش بە چاوی خۆیان تەماشایان دەکرد، ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَیۡنَا مُوسَى ﴾ واتە: (بێگومان تەوراتمان بەخشی بە مووسا) پاش ئەوەی خوا ﷻ فیرعەونی لە ناوبردوو گەلی ئیسرائیلو مووسای ڕزگار کرد، ئەو کات مووسا ویستی فەرمانی خوا ﷻ لەناویاندا

جێبەجێ بکاو درووشمەکانی ئاشکرا بکات، خوای گەورە پەیمانی پێدا تەوراتی بۆ دابەزێنێ لە ماوەی چل شەودا، ئەویش ڕۆشت بۆ ئەو شوێنەی پەروەردگاری بۆی دیاری کردبوو، خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأعراف (واتە: لەو پارچە تەختانەدا بۆمان نووسی لە هەموو جۆرە باسێک پەندوو ئامۆژگاریو باسی هەموو شتێک بە ڕوونی).

بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی نەوەکانی ئیسرائیل ڕێنمایی وەربگرن) بە زانینیووردو درشتی فەرمان پێکراو قەدەغەکراوو پاداشتو سزا، وە پەروەردگاریان بناسن بە هۆی ناوەجوانەکانو سیفاتە بەرزەکانی.

(٥٠): ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً ﴾ واتە: منەتمان کرد بەسەر عیسای کوڕی مەریەمدا، وە خۆیو دایکیمان کرد بە بەڵگەیەک لە بەڵگە سەرسووڕهێنەرەکانی خوا ﷻ، کاتێ دایکی سکی پڕبوو بە عیسا، کە بەبێ باوک لە دایک بوو، وە لەناو لانکەدا هەر بە بچووکی قسەی کرد، وە خوا ﷻ لەسەر دەستی چەندین نیشانەو بەڵگەی دەرخست، ﴿ وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ﴾ واتە: (وە عیساو مەریەمی دایکیمان) لە شوێنێکی بڵندوو بەرزدا دانا، ئەمە -خوازاناترە- لە کاتی لە دایک بوونیدا ﴿ ذَاتِ قَرَارٍ ﴾ واتە: شوێنی حەسانەوەو جێگیر ﴿ وَمَعِينٍ ﴾ کانیاو، بەبەڵگەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ ﴾ واتە: لە خوار ئەو شوێنەی تۆ لەسەری دانیشتووی، چونکە لە شوێنێکی بەرز بووە ﴿ سَرِيًّا ﴾ واتە: ڕووبارێکی لەبەر ڕۆیشتوو ﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى عَيْنًا ﴿٢٦﴾ ﴾ مريم (واتە: قەدی ئەو دارخورمایەش بۆ لای خۆت ڕاوەشێنە خورمای تازە پێگەیووت بەسەردا دەبارێ * ئنجا لەو خورما بخۆو لەو ئاوەش بخۆرەوە چاوو دڵ ڕۆشن بە).

(٥١-٥٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ ئەمە فەرمانێکە لەلایەن خوا ﷻ بۆ سەرجەم پێغەمبەرانی بە خواردنی پاکو خاوێن، کە بریتیە لە ڕزقو

ڕۆزی حەڵاڵ، وە سوپاسگوزاری کردنی خوا ﷻ بە کردەوەی چاک، کە بە هۆی ئەوەوە دڵو جەستەو دونیاو دوارۆژ پارێزراو دەبن، وە هەواڵیان پێدەدا کە بە ڕاستی خوا ﷻ ئاگادارە بەوەی کە ئەنجامی دەدەن، هەر کردەوەیەکیان ئەنجام دابێو هەر شتێکیان بەدەستهێنابێ بێگومان خوا ﷻ پێی دەزانێ، وە لە داهاتویەکی نزیکدا پاداشتیان دەداتەوە بە تەواوترینو چاکترین پاداشت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەرجەم پێغەمبەران یەکدەنگ بوونە لەسەر ڕەوایەتیدان بە خواردنی پاکو خاوێن، وە قەدەغەکردنی شتە پیسەکان، هەروەها یەکدەنگن لەسەر هەموو کردەوەیەکی چاک، ئەگەرچی هەندێجار ڕەگەزەکانیان بگۆڕێو شەریعەتەکانیش جیاوازبن، هەموو ئەوانەی لە شەریعەتەکاندا باسکراون کردەوەی چاکن، بەڵام بە پێی کاتو سەردەم گۆڕانکاریان بەسەردا دێ.

لەبەر ئەمە کردەوە چاکەکان کە دەبنە مایەی چاکبوونی هەموو سەردەمەکان، پێغەمبەرانو شەریعەتەکان لەسەری یەکدەنگن، وەکو فەرمانکردن بە یەکتاناسی خوا ﷻ و بەندایەتی بۆ کردنی بە دڵسۆزی، وە خۆشویستنو ترسان لێیو ئومێدی باشبوون پێی، وە کاری چاکەو ڕاستگۆییو بەجێهێنانی پەیمانەکانو بەهێز کردنی پەیوەندی خزمایەتیو چاکە لەگەڵ دایکو باوکدا، وە چاکەکردن لەگەڵ لاوازو هەژارو هەتیوەکاندا، نەرمونیانیو چاکە کردن لەگەڵ هەموو بەدیهێنراوەکان بەگشتی، هەموو ئەمانەو هاوشێوەکانی لە کردەوە چاکەکانن، لەبەر ئەمە ئەوانەی خاوەن زانستنو شارەزان لە کتێبەکانی پێشوودا، وە خاوەن عەقڵی دامەزراو بوون، کاتێ خوا ﷻ پێغەمبەر موحەممەد ﷺی نارد بەڵگەیان بە پێغەمبەرایەتی ئەو دەهێنایەوە، بەو شتانەی فەرمانی پێدەکاو قەدەغەی دەکات، هەروەکو ئەوەی ڕوویدا لە هیرەقلو غەیری ئەویش، بێگومان ئەو ئەگەر فەرمان بکا بەوەی پێغەمبەران فەرمانیان پێکردوە، وە قەدەغە بکات لەوەی ئەوان قەدەغەیان کردوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو یەکێکە لە پێغەمبەران، بە پێچەوانەی کەسی درۆزنەوە، چونکە ئەوە فەرمان بە چاکە دەکاو ڕێگری لە خراپە دەکات، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ بە پێغەمبەرانی فەرمووە: ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً ﴾ واتە: ئەو کۆمەڵەتان ئەی پێغەمبەران کۆمەڵێکی ﴿ وَٰحِدَةً ﴾ یەکدەنگن لەسەر یەک ئاینو یەک پەروەردگار ﴿ فَٱتَّقُونِ ﴾ بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانو دوورکەوتنەوە لە خراپەکان.

خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە بڕواداران هەروەکو چۆن فەرمانی کردوە بە پێغەمبەران، چونکە پەیڕەوی ئەوان دەکەنو بە شوێنی ئەواندا دەڕۆن، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ

﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ البقرة، (واتە: ئـەی ئەو کەسـانەی کـە بڕواتـان هێناوە بخـۆن لـەو خواردەمەنیـە پاکانـەی کردوومانە بە ڕۆزیتـان، وە سوپاسـی خوا بکـەن ئەگەر ئێـوە ئەو دەپەرسـتن)، ﴿ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ﴾ واتـە: شـوێنکەوتووانیان ئاینـی پێغەمبەرەکانیـان لە نـاو خۆیاندا پارچـە پارچە کرد ﴿ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ واتـە: هـەر دەسـتەو کۆمەڵێکیـان بـەوەی کـە لەلایانـە لە زانیـاری‌و دینداریـی ﴿ فَرِحُونَ ﴾ (دڵخۆشـن)، پێیـان وایـە ئەوان لەسـەر حەقـن‌و جگە لە ئـەوان لەسـەر ناهەقـە، لەگـەڵ ئـەوەدا ئەوە لەسـەر حەقە شـوێنی پێغەمبـەران کەوتبـێ، لە خواردنـە پاکـەکان‌و کـردەوەی چاکەکانـدا، غەیری وان لەسـەر ناهـەق‌و باتڵن.

﴿ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ ﴾ واتـە: لـە ناوەنـدی نەفامیـان بـە حـەق‌و ڕاسـتی، وە ئەو بانگەشـە کردنیـان گوایە ئەوان لەسـەر حەق‌و ڕاسـتین ﴿ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ واتە: تا سـزایان بـۆ دادەبەزێ، بێگومـان ئـەوان ئامۆژگـاری‌و سـەرکۆنە کردن سـوودیان پێناگەیەنێ، چۆن سـوودی دەبێ لـە کاتێکـدا ئـەو خۆی بە هـەق بزانێت‌و تەماحـی هەبێت لـە بانگەوازی جگە لـە خۆی، بۆ لای ئـەو بەرنامەی خـۆی لەسـەریەتی؟ ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ واتـە: وا دەزانـن ئـەوەی ئێمە پێیان دەبەخشـین لـە ماڵ‌و منـداڵ، بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی ئـەوان ئەهلـی خێـرو خۆشـبەختین، خێـری دونیـاو دوارۆژ بۆ ئەوانـە، ئەمە پێشـخراوە بۆیـان؟ کارەکـە بـەو جـۆرە نیـە وا بیـری لێدەکەنـەوە﴿ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾ (واتە: نەخێـر وانیـە) بۆ ئێمـە مۆڵەتیان دەدەین‌و نـازو نیعمـەت دەڕێژین بەسـەریاندا، لەبەر ئەوەی تـاوان‌و گونـاە زیاتـر ئەنجـام بـدەن، تاکو سـزایان بۆ زۆر بـێ لـە دوارۆژدا، وە بـۆ ئەوەی دڵخۆشـبن بەوەی پێیـان دراوە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً ﴿٤٤﴾ ﴾ الأنعام، (واتە: تـا کاتـێ دڵخۆش بوون بـەوەی پێیـان درابوو، لە نـاکاو تۆڵەمان لێ سـەندن ئیتـر ئەوانیش نائومێدو سـەرگەردان بوون).

(٥٧-٦٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا۟ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَهُمْ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾:

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی ئەوانـەی کـرد کـە کۆیـان کردووەتـەوە لـە نێـوان گوناهـو ئاسایشـدا، ئەوانـەی پێیـان وایـە ئەوەی خـوا پێیانـی بەخشـیوە لە ژیانـی دونیـادا، بەڵگەیە

لەسـەر چاکێتـیو ڕێـزو حورمەتیـان، ئنجـا باسـی ئەوانـەی کـرد کـە کۆیـان کردۆتەوە لـە نێـوان چاکـەو ترسـدا، ئنجـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴾ واتـە: دڵیـان دەترسـێو دەلـەرزێ، هەمـو ئەوانـە لـە ترسـی پەروەردگاریانە، وە لە ترسـی ئەوەیـە دادپـەروەری ئەویان بەسـەردا نەچەسـپێ، سـەرەنجام هیـچ کردەوەیەکـی چاکەیان بـۆ نەمێنـێ، وە گومـان بردنـی خراپە بـە نەفـسو دەروونیان، کە بـە هەقو مافـی خوا ﷻ هەڵنەسـابن، وە دەترسـن لـەوەی ئیمانەکەیان لە دەسـت بـدەن، وە پەروەردگاریشـیان باش دەناسـن کەچـی شایسـتەی ئەوە لە بـە گەورەدانانو ڕێزگرتنی، ترسـانیان لە خـوا ﷻ وایان لێـدەکات کە دەسـت هەڵبگرن لـەو تاوانانەی کە قەدەغـە کراوە، یـان کەمتەرخەمی بکەن لـە ئەرکەکانـی سەرشـانیان ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتـە: کاتـێ ئایەتەکانی خوایـان بەسـەردا بخوێنـرێ ئیمانیـان زیـاد دەکا، هەروەهـا بیردەکەنـەوە لـە ئایەتەکانـی قورئـانو لـە خزمەتیـدا دەوەسـتنو ڕادەمێنـن، بۆیـان دەردەکـەوێ لـە واتاکانـی قورئانو گەورەیـیو نەبوونـی جیـاوازیو پێچەوانەی یەکتر، وە ئەوەیشـی کە بانگـی دەکات بۆ لای ناسـینی خواو ترسـان لێـیو ئومێدبـوون پێی، هەمـوو ئەوانە ئیمانێـک لە دڵـدا دەروێنێ کە زمان ناتوانـێ تەعبیـری لێبکات.

وە هەروەهـا بیـر لـە ئایـەتو نیشـانە گەردوونیـەکان دەکەنـەوە، هەروەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمـران، (واتـە: بـە ڕاسـتی لـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەویداو لە جیـاوازیو گۆڕانـی شـەوو ڕۆژدا چەندەهـا بەڵگـە هەیە بۆ خـاوەن ژیرەکان) تـا کۆتایی دەقەکان.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴾ واتـە: نـە هاوبەش دانانێکی ئاشـکرا وەکـو ئەوەی جگە لـە خـوا ﷻ بکرێ بە پەرسـتراو داوای لێـکاو لێی بپاڕێتـەوە، وە نە هاوبەش دانانی شـاراوە وەکـو ڕیـا کردنو هاوشـێوەی ئـەوە، بەڵکـو ئەوان بـە دڵسـۆزیەوە خوا ﷻ دەپەرسـتن لە وتەو کـردەوەکانو سـەرجەم بارودۆخیاندا.

وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ٦٠
أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ٦١ وَلَا نُكَلِّفُ
نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ
٦٢ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ
هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ٦٣ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ
يَجۡـَٔرُونَ ٦٤ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ٦٥ قَدۡ كَانَتۡ
ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ٦٦
مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ٦٧ أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ
جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٦٨ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ
فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٦٩ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ
وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ٧٠ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ
عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ٧١ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ
وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٧٢ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٧٣
وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ٧٤

﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ ﴾ واتە: لەنەفس ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوون جێبەجێی دەکەنو دەیبەخشن هەرچی لە توانایاندا بێ لە نوێژو زەکاتو حەجو خێرو چاکەو غەیری وانیش ﴿ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ ﴾ واتە: دڵەکانیان دەترسێ ﴿ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴾ واتە: دەترسن لەوەی کاتێ کردەوەکانیان دەخرێتە ڕوو، وە دەوەستێنرێن لە خزمەتی پەروەردگاردا، لەوەی کردەوەکانیان شایستەی ئەوە نەبێ لە سزای خوا ڕزگاریان بکات، چونکە پەروەردگاریان دەناسنو دەزانن چی شتێ شایستەی ئەوە لە پەرستشەکاندا ئەنجام بدرێ. ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾ واتە: ئەوانە لە مەیدانی پەلەکردندان بۆ کاری چاکە، هەموو خەمێکیان نزیک بوونەوەیە لە خوا ﷻ، وە تواناکانیان بەکارهێناوە بۆ ڕزگاربوون لە سزای ئەو، هەر خێرو چاکەیەکیان بیستبێ، یان هەلێکیان بۆ ڕێکەوتبێ، وەکو هەلێ تەماشای دەکەنو بە پەلە ئەنجامی دەدەن، تەماشای ئەولیاو دۆستانی خوا دەکەن لە پێشیانەوە بە ڕاستو چەپدا، پەلە دەکەن لە خێرو چاکەو کێبڕکێی پلەی بەرز دەکەن لە لای پەروەردگاریان، بۆیە ئەوانیش کێبڕکێیان دەکەن، وە کاتێ پێشبڕکێکار پێشبڕکێ دەکا هەندێ جار بە هۆی سووربوونیەوە سەردەکەوێ، وە هەندێ جاریش بە هۆی کەمتەرخەمیەوە سەرناکەوێ، خوا ﷻ هەواڵیداوە ئەمانە لە کۆمەڵو دەستەی سەرکەوتوانن، جا فەرموویەتی: ﴿ وَهُمۡ لَهَا ﴾ بۆ خێرو چاکەکان ﴿ سَٰبِقُونَ ﴾ گەیشتوونەتە چڵە پۆپە، ئەهلی چاکەو چاکەخوازین لەگەڵ پێشەنگی یەکەمدا، وە لەگەڵ ئەمەدا پێشکەوتووە بۆیان پێشکەوتنی خۆشبەختی، بێگومان ئەوان هەر لە پێشن.

دوای ئەوەی باسی پەلە کردنیانی کرد لە خێرو چاکەو پێشەنگ بوونیان بۆی، لەوەیە کەسێ وا خەیاڵ بکات، ئەوەی داواکراوە لێیانو لە جگە لە ئەوان، کارێکە لە توانادا نیە یان زۆر قورسە، خوا ﷻ هەواڵیدا کە بێگومان ئەو ئەرک ناخاتە سەر هیچ ﴿ نَفۡسًا إِلَّا

وُسْعَهَا ﴾ واتە: کەس بە قەدەر تواناى نەبێ، بە پێی هێزو تواناى خۆی کاری پێدەکات، ئەمیش وەک ڕەحمەتو حیکمەتێک بۆیان، بۆ ئەوەی بە ئاسانی پێی بگەن، وە بۆ ئەوەی بە بەردەوام ڕێگای شوێنکەوتووان لە هەموو کاتێکدا نوێ ببێتەوە، ﴿ وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ ﴾ ئەویش کتێبی یەکەمە کە هەموو شتێکی تێدایە، ئەو کتێبە دەگونجێ لەگەڵ هەموو واقعێکدا، لەبەر ئەوەیە حەقو ڕاستە ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ واتە: لە چاکەکانیان بۆ کەم ناکرێ، یان سزاو سەرپێچیان بۆ زیاد ناکرێ.

(٦٣-٦٨): ﴿ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِى غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدا کە بێگومان دڵی بە درۆدانەران لە ناوەڕۆکی نەزانیو بێئاگاییو ستەمو پشت تێکردن دایە، ڕێگریان لێدەکات بگەن بەم قورئانە هەرگیز هیدایەتی پێوەرناگرن هیچ شتێک لەو قورئانە ناگاتە دڵەکانیان، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الإسراء، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ کاتێ قورئان دەخوێنی بەسەریاندا نێوان تۆو ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە پەردەیەکی نادیار دادەنێین * وە دەیدەین بەسەر دڵیاندا چەند پەردەیەکی زۆر ئەستوور بۆ ئەوەی لە قورئان تێنەگەن، وە گوێیشیان کەڕ دەکەین تا نەبیستن *).

کاتێ دڵەکانیان لە بێئاگاییدا بوو لە قورئان، بەپێی ئەمە ڕەفتاریان کرد، لەو کردەوانەی کە کوفرو بێبڕواییەو پێچەوانەو دژی شەریعەتە، ئەوە دەبێتە مایەی پێویستبوونی سزا لەسەریان ﴿ وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ﴾ (واتە: وە ئەوان چەندین کردەوەی خراپیان هەیە دەبێتە مایەی جیاوازی لە کردەوەی بڕواداران)، بەڵام ئەم کردەوانە ﴿ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴾ (واتە: ئەوان هەمیشە ئەنجامدەریانن) سەرتان سوڕنەمێنی لەوەی خوا سزایان نادات، بێگومان خوا مۆڵەتیان پێدەدات، بۆ ئەوەی ئەو کردەوە خراپانە بکەن کە ماوەتەوە بۆیان، لەوانەی کە بۆیان نووسراوە، جا ئەگەر ئەنجامیاندا دەگوازرێنەوە بە خراپترین حاڵەت بۆ غەزەبو خەشمو قینو سزای خوا ﷻ.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم ﴾ واتە: گەورەو خۆشگوزرانەکانیان، ئەوانەی ڕاهاتوون لەسەر

خۆشی ڕەفاهیەتو نازو نیعمەت، هەرگیز ناخۆشیان بە خۆیانەوە نەدیوە، کاتێ کە ئەوانمان گرت ﴿بِٱلْعَذَابِ﴾ ئێش‌و ئازاری سزایان بینی ﴿إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ﴾ واتە: دەست دەکەن بە هات‌و هاوار، چونکە تووشی حاڵەتێک بوون پێچەوانەی ئەوەیە پێشتر لەسەری بوون.

داوای یارمەتی دەکەن، پێیان دەوترێ: ﴿لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ﴾ جا ئەگەر سەرکەوتنیان بۆ نەیەت لەلایەن خواوە، هەموو هاوکاریەکیان لێ دەبڕێ لایەن ئەوەوە، ئەوجا ناشتوانن تەنانەت نەفسی خۆیانیش ڕزگار بکەن، هیچ کەسێکیش نیە سەریان بخات.

وەک ئەوەی بوترێ: چ هۆکارێ ئەوانی گەیاند بەم حاڵە؟ خوا ﷻ فەرمووی: ﴿قَدْ كَانَتْ ءَايَـٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ (واتە: بێگومان پێشتر ئایەتەکانی من دەخوێنرایەوە بەسەرتاندا) بۆ ئەوەی بڕوای پێبهێنن‌و ڕووی تێبکەن، ئێوە ئەوەتان نەکرد، بەڵکو ﴿عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ تَنكِصُونَ﴾ واتە: پاشەو پاش دەگەڕانەوە بەرەو دوا، لەبەر ئەوەی بە شوێنکەوتنی قورئان پێش دەکەوتن، وە بە پشتێکردنی دوا دەکەوتن‌و دەخرانە نزمەترین شوێنی نزمەکانەوە (لە دۆزەخدا).

﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَـٰمِرًا تَهْجُرُونَ﴾ (واتە: لە بەرانبەر قورئاندا خۆتان بە گەورە دەزانی، شەوگارتان دەبردە سەر بە گاڵتەکردن‌و قسەی ناشرین وتن)، ڕاڤەزانانی قورئان دەڵێن: مانای ئەوەیە: ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ﴾ لێرەدا ڕاناوی ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی ئاسایی، یان ماڵی حەرام، واتە: خۆیان بە گەورە دادەنا بەسەر خەڵکەوە بە هۆی ئەو ماڵەوە، دەیانووت: ئێمە خاوەن ماڵی حەرامین، ئێمە چاکترین لە جگە لە خۆمان‌و بەرزترین ﴿سَـٰمِرًا﴾ واتە: بە کۆمەڵ‌و بە شەو لە دەورو بەری ماڵی حەرام قسەیان دەکرد ﴿تَهْجُرُونَ﴾ واتە: قسەی پڕو پووچ بێ مانایان دەکرد دەربارەی قورئان، بەدرۆدانەران ڕێبازیان پشتێکردن بوو لە قورئاندا، هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکی دیکەی دەکرد بەوە:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾﴾ فصلت، (واتە: وە بێبڕوایان بە یەکتریان دەوت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە، وە قسەی پڕووپووچی تێکەڵ بکەن بەڵکو سەربکەون بەسەریدا)، خوا ﷻ دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿أَفَمِنْ هَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَـٰمِدُونَ ﴿٦١﴾﴾ النجم، (واتە: جا ئایا لەم فەرمایشتە کە قورئانە سەرتان سووردەمێنێ؟! * وە پێدەکەنن‌و ناگریێن * وە ئێوە سەرگەرم‌و بێئاگان)، وە دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ﴿٣٣﴾﴾ الطور، (واتە: یان دەڵێن: قورئان موحەممەد ﷺ خۆی هەڵیبەستووە)؟!

کاتێ ئەم هەموو سیفاتە بەدو ناشرینانەیان لە خۆیاندا کۆکردەوە، بێگومان سزاو تۆڵەیان لەسەر پێویست بوو، کاتێ کەوتنە ناویەوە، هیچ سەرخەرێکیان نیە سەریان بخاتو رزگاریان بکاتو بچێت بەدەمیانەوە، ئەوکاتە لەسەر ئەو کردەوە ناشرینانە سەرزەنشت دەکرێن ﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ ﴾ واتە: ئایا بۆ بیر لە قورئان ناکەنەوەو تێنافکرێن، ئەوان ئەگەر بیریان بکردایەتەوە لێی، ئەوە بڕوایان دەهێناو بێبڕواییان نەدەکرد، بەڵام ئەو بەڵاو موسیبەتەی تووشیان بوو بە هۆی پشتێکردنیانەوە بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێ بیرلە قورئان بکاتەوەو ڕابمێنێ تیایدا دەبێتە مایەی هەموو خێرو چاکەیەک بۆی، وە دەیپارێزێ لە هەموو شەڕوو خراپەیەک، وە ئەوەی ڕێگری لێکردن لە بیرکردنەوەو ڕامان لە قورئاندا، ئەوە بوو کە دڵەکانیان کلیلی لێدرابوو ﴿ أَمْ جَاءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ ﴾ واتە: یان ڕێگری لێکردوون لە ئیمان، ئەوان پێغەمبەرو کتێبیان بۆ هات، وەکو چۆن بۆ باوو باپیرانی پێشینیان هات، ڕازی بوون بە گرتنەبەری ڕێگای باووباپیرە گومڕاکانیان، پێچەوانەی هەموو شتێک دەجوڵانەوە کە دژ بە ڕێبازی ئەوان بووایە، لەبەرئەمەیە ئەوانو هاوشێوەکانیان لە بێبڕوایان وتیان: کە خوا ﷻ دەربارەیان هەواڵی داوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الزخرف.(واتە: هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لە شارێکدا مەگەر خۆشگوزەرانەکان وتوویانە: بە ڕاستی ئێمە باووباپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێک دیوە، وە بێگومان ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین) خوا ﷻ وەڵامی دانەوە بە وتەی خۆی: ﴿ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ ﴾ (واتە: وتی: ئەگەر چی من ئاینی ڕاستیشم بۆ هێنابن لەوەی کە باووباپیرانتان دیوە لەسەری) ئایا ئێوە شوێنیان دەکەون ئەگەر مەبەستان حەقە، وەڵامیان دایەوە بە حەقیقەتی ئەوەی لە نێو دڵیاندا هەبوو: ﴿ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الزخرف (واتە: وتیان: بێگومان ئێمە بێبڕواین بەو ئاینەی بە ئێوەدا نێردراوە).

(٦٩): ﴿ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾:

واتە: یان ڕێگری لێکردن لە شوێنکەوتنی حەقو ڕاستی پێغەمبەرەکەیان موحەممەد پیاوێکە نەناسراوە لەلایان، بەو هۆیەوە ئەوان دان بە پێغەمبەرایەتیەکەیدا نانێن؟ دەیانووت: نایناسین، وە بە ڕاستگۆی نازانین، چاوەڕوانبن تا تەماشای حاڵی دەکەین، وە پرسیار دەکەین لە کەسێ شارەزایی هەبێ دەربارەی؟ نەخێر کارەکە بەو شێوەیە نیە، ئەوان بە چاکترین شێوە

پێغەمبەریان ﷺ دەناسی، بە گەورەو بچووکیانەوە، دەیانزانی ئەو خاوەن خوورەوشتی جوانە، وە خاوەن ڕاستگۆیی‌و دەستپاکو ئەمینە، هەتا پێش نێردراویّتی پێیان دەوت ئەمین، ئەی بۆچی بە ڕاستی دانانێن کاتێ حەقی مەزن‌و ڕاستی ڕوونکراوەی بۆ هێناون؟

(٧٠): ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ٧٠ ﴾:

﴿ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ ﴾ واتە: (یان دەڵێن: ئەو پێغەمبەرە) شێتە، لەبەرئەمەیە ئەوەی وتیان، شێت گوێی لێناگیرێ، وە هیچ پەندێ لە قسەکانیدا نیە، چونکە بە پووچ قسەدەکاو قسەکانی هیچ مانایەکی نیە.

خوا ﷻ لەم دواندنەیدا فەرموویەتی: ﴿ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ ﴾ واتە: بە فەرمانی جێگیر کە بریتیە لە ڕاستی‌و دادپەروەری، (ئەم قورئانە) هیچ جیاوازیی‌و دژیەکیەکی تێدانیە، ئیتر چۆن دەڵێن ئەو کەسەی هێناویەتی شێتەو جنۆکەی تێدایە؟ ئایا موحەممەد ﷺ لەوپەڕی پلەبەرزی تەواودا نیە لە زانست‌و عەقڵ‌و ڕەوشت بەرزیدا، هەروەها لەم گواستنەوەدا کە لە پێشەوە باسکرا، واتە: بەڵکو ئەو ڕاستیەی ڕێگری لێکردن لە بڕواهێنان ئەوە بوو کە ﴿ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴾ مەزنترین حەق‌و ڕاستی ئەوەیە کە بۆی هێناون بریتیە لە بەندایەتیکردن بە دڵسۆزی بۆ خوای تاک‌و تەنها، وە وازهێنان لە بەندایەتی کردنی غەیری خوا ﷻ، بێگومان زانراوە ئەوان حەزیان لەم کارە نیەو سەریان پێی سووڕدەمێنێ، جا پێغەمبەر حەق‌و ڕاستی هێناوە، ئەوانیش لە بنچینەدا حەزیان لە حەق‌و ڕاستی نیە، ئەمە وای پێویست کردوە لەسەریان کە حەق‌و ڕاستی بەدرۆ دابنێن، نەک بە هۆی گومان‌و بەدرۆدانانی پێغەمبەر ﷺ، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٣٣ ﴾الأنعام (واتە: بێگومان ئەو بێبڕوایانە تۆ بەدرۆ دانانێن بەڵکو ستەمکاران نکوڵی ئایەتەکانی خوا دەکەن). ئەگەر بوترێ: ئەی بۆچی حەق‌و ڕاستی لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەواندا نەدەگونجا، لەبەرئەوەی بڕوابێنن‌و پەلە بکەن لە ملکەچیدا؟

(٧١): ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ٧١ ﴾:

خوای بەرز وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ ﴾ ئەم دەقە ئەوە دەگەیەنێ هەواو ئارەزووەکانیان بەستراوەتەوە بە ستەم‌و کوفروو خراپەکاری لە ڕەوشت‌و کردەوەکانیاندا، ئەگەر حەق‌و ڕاستی شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوان بکەوتایە، ئەوە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێوان‌و تێکدەچوون

بەسەر یەکدا، بە هۆی خراپی مامەڵەکردنو بەڕێوەبردنیانەوە، کە بوونیاتنراوە لەسەر ستەمو نادادپەروەری، جا ئاسمانەکانو زەوی نەوەستاونو جێگیر نەبوون بەحەقو دادپەروەری نەبێ، ﴿ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ ﴾ واتە: (بەڵکو) ئەم قورئانەمان بۆ هێناون یادخەرەوەی هەموو خێرێکە بۆیان، کە بەو قورئانە فەخرو شانازیان دەست دەکەوێ، کاتێ پێی هەڵدەسن دەبن بە پێشەوای هەموو خەڵکی ﴿ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴾ (واتە: بەڵام ئەوان لە بیرخستنەوەو سەربەرزی خۆیان پشتێکەرن)، ﴿ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡ ﴾ التوبة، (واتە: خوایان بیرچوو خوای گەورەش ئەوانی لە بیر کرد)، ﴿ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر، (واتە: خوایان لە بیر خۆیان بردەوە جا خواش ئەوانی لەبیر خۆیان بردەوە).

قورئانو ئەوەیشی هێناویەتی لە مەزنترینی نیعمەتەکانە کە خوا ﷻ پێی بەخشیون، بەڵام ئەوان وەریان نەگرت ڕەتیان کردەوەو پشتیان تێکرد، ئایا لە دوای ئەم بێ بەشبوونە بێ بەشبوونێکی دیکە هەیە؟ ئایا لە دوای ئەوە جگە لە خەسارەتمەندی شتێکی دیکە هەیە؟

(٧٢): ﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾:

واتە: یان بەرهەڵستیان لێدەکات ئەی موحوممەد ﷺ بەوەی کە گوایە تۆ لە وەڵامدانەوەدا داوای پاداشتیان لێدەکەی، ﴿ فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الطور، (واتە: ئەوانیش لەبەر بژاردنی باریان گرانە)؟ شوێنت ناکەون بە هۆی ئەوەی تۆ داوای پارەو بەخششو ڕۆزی لەوان دەکەی، کارەکە بەوجۆرە نیە ﴿ فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، وە هەروەکو چۆن پێغەمبەران بە ئۆممەتەکانیان فەرمووە: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴿٢٩﴾ ﴾ هود ، (واتە: ئەی گەلەکەم! من داوای پارەو پاداشت لە ئێوە ناکەم)، ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ﴿٢٩﴾ ﴾هود، (واتە: بەڵکو پاداشتی من تەنها لە لای خوایە) واتە: پێغەمبەران بانگەوازی خەڵکیان نەئەکرد بۆ ئەو مەبەستەی کە تەماحیان پێیان هەبێ، بەوەی شتێکیان دەست بکەوێت لەماڵو سەروەتەکانیان، بەڵام بانگەوازیان دەکردن وەک ئامۆژگاریەک بۆیانو بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانیان، بەڵکو پێغەمبەران زیاتر ئامۆژگاریکارتر بوون بۆ خەڵکی لە نەفسی خۆیان، خوا ﷻ پاداشتیان بداتەوە لە ئۆممەتەکانیان بە چاکترین پاداشت، وە رزقو ڕۆزی ئێمە بدات بە پەیرەو کردنی ئەوان لە هەموو بارودۆخەکاندا.

(٧٣-٧٤): ﴿ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾:

خوا ﷻ لەم دەقە پیرۆزانەدا باسی هەموو هۆکارێکی پێویست بوونی ئیمانی کردوە، وە باسی

بەربەستەکانیشی کردوەو خراپیانی روون کردوەتەوە یەک بە یەک، باسی بەربەستەکانی کردوە بەم جۆرە: ئەوان دڵەکانیان لە بێئاگایی دایە، تێنافکرێن لە قورئانی پیرۆز، شوێنی باوباپیرانیان کەوتوونو پەیرەوی ئەوان دەکەن، وە ئەوان وتیان: پێغەمبەرەکەیان جنۆکەی تێدایە، وەک لە پێشتر ئاماژەی پێکرا.

وە باسی پێویست بوونی برواهێنانیانی کردوە: بیرکردنەوەو سەرنجدانی قورئان، وەرگرتنی نیعمەتەکانی خوا، زانینی حاڵی پێغەمبەر ﷺ، وە تەواوی راستگۆیی‌و ئەمانەتی، ئەو داوای پارەو خەرجیان لێناکات، بەڵکو هەموو هەوڵی بۆ بەرژەوەندی‌و سوودی ئەوانە، وە ئەوەی ئەو بانگیان دەکات بۆ لای بریتیە لە رێگای راست، ئاسانە بۆ هەموو خەڵکی، لەبەر ئەوەی بەردەوام بن لەسەری، لە نزیکەوە دەیانگەیەنێ بە مەبەست، ئاینێکی پاک‌و میهرەبانە، پاکە لە یەکتاپەرستیدا میهرەبانو بەخشندەیە لە کردەوەدا، بانگەوازی تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوان، بۆ رێگای راستە، هەرکەسێ شوێن هەق دەکەوێ پێویستە لەسەری شوێنت بکەوێ، چونکە عەقڵ سروشتی مرۆڤ بە چاکی دەزانێ، وە دەگونجێ لەگەڵ بەرژەوەندیەکاندا، جا ئەگەر شوێنی تۆ نەکەون بۆ کوێ دەرۆن؟ بێگومان ئەوان ئەوەندە زانستیان لەلا نیە بێ نیاز بن لە تۆو پێویست نەکات شوێنت بکەون، لەبەر ئەوەی ﴿عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ﴾ دوور کەوتوونەتەوەو لایان داوە لەو رێبازەی دەیانگەیەنێ بە خوا، وە بۆ ماڵی رێزداری، هیچ لە دەستیاندا نیە تەنها گومرایی‌و نەفامی نەبێ.

بەو شێوەیە هەر کەسێک پێچەوانەی هەق‌و راستی بێ، ئەوە هەردەبێ لادەرێ لە هەموو کاروبارەکاندا، ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۝٥٠﴾القصص، (واتە: ئنجا ئەگەر بە گوێیان نەکردی‌و وەڵامیان نەدایتەوە ئەوە بزانە کە تەنها شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون، وە کێ لەو کەسە گومراترە کە شوێنی ئارەزووی خۆی بکەوێ بێ رێنمایی لەلایەن خواوە).

وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَٰنِهِمْ
يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ
وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ
إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ
وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ
وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ
ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ
ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ
إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن
فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ
ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ
بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾

(٧٥-٧٧): ﴿ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾:

دەفەرمـــوێ: ﴿ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ ئەمــە ڕوونکردنەوەیەکــە لەلایــەن خــواوە لەســەر توونــدی یاخــی بــوونو عینــادی کردنــی بێبڕوایــان، بێگومـــان ئـــەوان ئەگـــەر تووشـــی ناڕەحەتیـــەک ببـــن داوا لـــە خـــوا ﷻ دەکـــەن لەســـەریان لای ببـــات، بـــۆ ئـــەوەی ئیمـــان بهێنـــن، یـــان تووشـــی بـەڵاو ناڕەحەتیـان دەکات تـا بگەڕێنـەوە بـۆ لای، بـەڵام خـوا ﷻ کاتـێ ناڕەحەتیـان لەســەر لادەبــاو هەڵیدەگــرێ، بیرناکەنــەوە، نــەک بیرناکەنــەوە بەڵکــو لەسەرکێشی خۆیانــدا ڕۆدەچــنو بەســەرگەردانی دەمێننــەوە. هــەروەک چــۆن خــوا ﷻ باســی بارودۆخیانــی کــردوە کاتــێ ســواری کەشــتی دەبــن، بــە دڵســۆزیەوە لــە خــوا ﷻ دەپاڕێنــەوە، وە ئــەوەی دەیکــەن بــە شــەریک لــە بیــری دەکــەن، بــەڵام کاتــێ خــوا ﷻ ڕزگاریــان دەکات دەســتبەجێ خراپــەکاری لەســەر زەویــدا دەکــەن بــە شــیرکو غەیری شـیرکیش، ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ ﴾ (واتــە: ســوێند بــە خــوا ئێمــە ئەوانمان تووشــی ســزا کــرد)، ڕاڤەکارانــی قورئــان وتوویانــە: مەبەســت لــەم ســزایە ئــەو برســێتیە بــوو کــە حــەوت ســاڵی خایانــد، خــوا ﷻ بــەوە تاقیکردنــەوە، بــۆ ئــەوەی بگەڕێنــەوە بــۆ لای بــە زەلیلــیو تەســلیم بوونــەوە، هیــچ ســوودێکی نەبــوو بۆیــان، وە هیــچ کەسێکیشــیان لــێ ڕزگــار نەبــوو.

﴿ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ ﴾ واتــە: (ملکــەچو زەلیــل نەبــوون بــۆ پەروەردگاریــان)، ﴿ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴾ واتــە: (نــە هانــاو نــزا بــۆ خــوا دەبــەن لــە کاتــی ناڕەحەتیــدا)، خۆشــیان

بــە کــەم نازانــن، بەڵکــو ناخۆشــی بەســەریاندا هاتــوو نەمــا، هەروەکــو ئــەوەی تــووش نەبوویێتــن، بــەردەوام بــوون لەســەر کوفــرو ســەرپێچیان، بــەڵام لــە دوایانــەوە ســزایەک هەیــە ڕەتکردنــەوەی بــۆ نیــە، وەک خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴾ واتــە: (بــەردەوام بــوون لەســەر حاڵــی خۆیــان تــا کاتــێ دەرگایەکمــان بــۆ کردنــەوە) وەکــو کوشــتن لــە ڕۆژی بــەدرداو غەیــری ئــەو ڕۆژەش، ﴿ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾ بــێ ئومێــد بــوون لــە هەمــوو خێــروو چاکەیــەک، بێگومــان شــەڕوو هۆکارەکانــی ئامــادە بــوو بۆیــان، دەی بــا بترســن پێــش ئــەوەی ســزای توونــدی خوایان بــۆ دابــەزێ کــە ڕەتکردنــەوەی بــۆ نیــە، بــە پێچەوانــەی ســزای ڕووت، چونکــە لەوانەیە لەســەریان لاببــرێ وەک ســزای دونیــای، کــە بــۆ پەروەردەکــردنو تەمبــێ کردنــی بەندەکانــە. خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الـروم (واتــە: خراپــە لــە وشــکانیو زەویو دەریــادا دەرکەوتــووە بــە هــۆی ئــەو خراپانــەی خەڵکــی کردوویانــە بــۆ ئــەوەی (خــوا) تۆڵــەی هەنــدێ لــەو خراپانــەی کردوویانــە پێیــان بچێــژێ تاکــو بگەڕێنــەوە لــە خراپەکاریــی).

(٧٨-٨٠): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هەواڵــدەدات بــە فــەزڵو منەتــی خــۆی بەســەر بەندەکانیدا، کــە بانگیــان دەکات بــۆ ئــەوەی سوپاســگوزاری بکــەنو مافەکانــی بەجــێ بهێنــن، فەرموویەتــی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ ﴾ واتــە: (خــوا ئــەو زاتەیــە گوێــێ بــۆ ئێوە دروســت کــردوە) بــۆ ئەوەی بیســتراوەکان ببیســتن، ســوود وەربگــرن لــە دیــنو دونیاتانــدا، ﴿ وَٱلْأَبْصَٰرَ ﴾ (چــاوی بــۆ دروســت کــردوون) بــۆ ئــەوەی بینــراوەکان ببینــنو ســوودیان لــێ وەربگــرن لــە بەرژەوەندیەکانتانــدا، ﴿ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ﴾ واتــە: ئــەو عەقڵانــەی کــە بــە هۆیانــەوە هەســت بــە شــتەکان دەکــەن، وە پێــی جیادەکرێنــەوە لــە ئاژەڵــەکان، جــا ئەگــەر بیســتنو بینیــنو عەقڵــەکان نەبــن بــەوەی ئێــوە کــەڕو لاڵو کوێــر بــن، ئــەو کات حاڵتــان چــۆن دەبــێ، وە چــی لــە دەســت دەدەن لــە پێویســتیەکانتانو تەواویەکانتــان؟ ئایــا سوپاســگوزاری ئــەو خوایــە ناکــەن کــە منەتــی کــردوە بەســەرتاندا بــەم نیعمەتانــە، بــۆ ئــەوەی هەســتن

بـە یەکتاپەرسـتیو گوێڕایەڵـی کردنـی؟! بـەڵام سوپاسـگوزاریتان زۆر کەمـە لـە ئاسـتی بـە دوای یەکداهاتنـی ئـەو نازونیعمەتانـە بەسـەرتانەوە.

﴿ وَهُوَ ﴾خـوا ﷻ ﴿ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾واتـە: (ئـەو زاتەیـە کـە) بـڵاوی کردونەتـەوە بـە وڵاتو شـوێنەکاندا، وە دەسـەڵاتی پێـداون بەرژەوەنـدیو سـوودەکانتان لەنـاو زەویـدا دەربهێنـن، وە زەوی کـردوە بـە شـوێنی بژێـویو نیشـتەجێبوونتان ﴿ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾)واتـە: هـەر لای ئەویـش کۆدەکرێنـەوە) دوای مردنتـان، پاداشـتان دەداتـەوە بـە پێـی کردەوەکانتـان لەسـەر زەویـدا، لـە خێـرو چاکـە، ئـەو زەویـەش دەگـۆڕێ کـە ئێـوە لەسـەری دەژیـن ﴿ وَهُوَ ﴾ئـەو خوایـە بـەرزو تـاکو تەنهایـە ﴿ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾واتـە: خـوا ﷻ ژیـانو مـردن هەڵدەسـوڕێنێ ﴿ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾واتـە: جیـاوازی شـەوو ڕۆژو ئاڵوگـۆڕو زیـادو کـەم کردنیـانو بەدوایەکـدا هاتنیـان هـەر بـۆ خوایـە نـەک بـۆ کەسـێکی تـر، ئەگـەر بیـەوێ ڕۆژ بـکات بـە هەمیشـەیی چ پەرسـتراوێکی دیکـە هەیـە جگـە لـە خـوا ﷻ شـەوتان بـۆ بێنـێ کـە تیایـدا بحەوێنـەوە؟ وە ئەگـەر خـوا ﷻ بیـەوێ شـەو بـکات بـە هەمیشـەیی چ پەرسـتراوێک هەیـە جگـە لـە خـوا ڕووناکیتـان بـۆ بێنـێ، ئایـا ئێـوە نابینـن؟ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾القصص، (واتـە: لـە بەزەیـی ئـەو خوایـە ئەوەیـە کـە شـەوو ڕۆژی بـۆ دروسـت کـردوون بـۆ ئـەوەی ئـارام بگـرن لـە شـەوداو بـۆ ئـەوەی بگەڕێـن بـە دوای ڕۆزیو بەهـرەی خـوادا لـە ڕۆژدا).

لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾واتـە: (دەی ئایـا ئێـوە بیرناکەنـەوە) ئـەو کەسـەی ئـەو نازونیعمەتانـەی پێبەخشـیون لـە بیسـتنو بینیـنو دڵو عەقـڵ، وە لەسـەر زەویـدا بـڵاوی کردوونەتـەوە بەتـاکو تەنهـا، ئـەو کەسـەی دەژێنـێو دەمرێنـێ بەتـاکو تەنهـا، وە ئـەو کەسـەی کاروبـارەکان هەڵدەسـوڕێنێ بـە شـەوو بـەڕۆژ بەتـاکو تەنهـا، ئەمـە ئـەوە پێویسـت دەکات لەسـەرتان بـە دڵسـۆزیەوە بیپەرسـتن بەتـاکو تەنهـاو هاوەڵـی بـۆ دانەنێـن، وە واز بێنـن لـە بەندایەتـی کردنـی ئـەوەی نـە سـوودی هەیـەو نـە زیـان، وە ناتوانـێ هیـچ شـتێ بەڕێـوە ببـات، بەڵکـو ئـەوە پەرسـتراوێکی بـێ توانایـە لـە هەمـوو ڕووێکـەوە، جـا ئەگـەر ئێـوە عەقڵتـان هەبـێ کاری لـەو جـۆرە ناکـەن.

(٨١-٨٣): ﴿ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾:

﴿ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴾ واتە: بەڵکو ئەوانیش هەمان ڕێگای بەدرۆدانەرانی پێشووی خۆیانیان گرتەبەر، ئەوانەی کە زیندوو کردنەوەیان بەدرۆ دەزانیو بەدوور تەماشایان دەکرد، دەیانوت:﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾ واتە: (باشە ئەگەر مردینو بووینە خۆڵو ئێسک ئایە ئێمە دووبارە زیندوو دەکرێینەوە؟) ئەمە ناگونجێو ناچێتە عەقڵەوە؟! بە بۆچوونی خۆیان ﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ ﴾ واتە: بە ڕاستی بەردەوام ئێمە بەڵێنی ئەوەمان پێدراوە کە زیندووکردنەوە بوونی هەیە، ئێمەو باوو باپیرانمان، بەلام شتی لەو جۆرەمان نەبینیوەو شتی واش نەهاتووە بۆمان﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ واتە: ئەمە داستانو قسەی پێشینەکانە، کە لەناو یەکتریدا کاتیان پێدەبردە سەر، ئەگەرنا زیندووکردنەوە هیچ حەقیقەتێکی نییە.

ئەوانە درۆیان کرد -خوارووییان ڕەش بکا- بێگومان خوا ﷻ نیشانی دان لە ئایەتەکانی خۆی گەورەتر لە زیندووکردنەوە، وە وێنەی ئەویش:﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ ﴿٥٧﴾ ﴾ غافر، (واتە: بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی لە دروستکردنی خەڵکی زۆر گەورەو ئاسانترە)، وە دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ ﴾ یس، (واتە: نموونەی لاوازیو بێدەسەلاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوەو دروستکردنی خۆی لەبیرچووە دەڵێ: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو پڕووکاون)؟! وە دەفەرموێ:﴿ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ﴿٥﴾ ﴾ الحج، (واتە: وە زەوی دەبینی لە زستاندا خامۆشو ووشکو بێ گیانە جا کاتێ بارانمان بەسەردا دابارانـد زەوی ڕووەکی لێدەڕوێو دەجوڵێ، زەوی هەڵدەداتو بەرز دەبێ).

(٨٤-٨٩):﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ واتە: ئەی موحەممەد بەو بەدرۆدانەرانە بڵێ: کە بڕوایان بە زیندوو

کردنـەوە نیـەو لـە پەرسـتنی خـوا لایانـداوە بـۆ لای جگـە لـە خـوا، ئـەوە بکـە بەڵگـە کـە چەسـپاندوویانەو دانیـان پێـدا نـاوە -لـە یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتـیو تـاکو تەنهایـی خـوا لـە دروسـتکردندا- لەسـەر ئـەوەی نکوولـی دەکـەن لـە یەکتاپەرسـتی پەرسـتراوێتیو عیبادەتـدا، وە بـەوەی لـە لایـان چەسـپاوە لە دروسـتکردنی دروسـتکراوە مەزنـەکان، لەسـەر ئـەوەی نکوولـی لـە دووبـارە دروسـتکردنەوەی مـردووەکان دەکـەن، کـە دووبـارە دروسـتکردنەوەیان ئاسـانترە لـە بەدیهێنـان لـە سـەرەتادا: ﴿لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ﴾ واتـە: کـێ بەدیهێنـەری زەویـە، وە ئەوەیشـی لەسـەری دەژی، لـە گیانـداروو ڕووەکو بـێ گیـانو دەریـاو ڕووبـارەکانو شـاخو کێـوەکان، کـێ خاوەنیانـەو بەڕێوەیـان دەبـات؟ تـۆ ئەگـەر پرسـیاریان لێبکـەی دەربـارەی ئـەوە بێگومـان لـە وەڵامـدا دەڵێـن بـۆ خـوای تـاکو تەنهـا، ئەگـەر دانیـان بەوەدانـا، پێیـان بڵـێ: ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ واتـە: ئایـا ناگەڕێنـەوە بـۆ لای ئـەوەی کـە خـوا ﷻ یـادی خسـتوونەتەوە، کـە شـتێکی زۆر زانـراوە لـە لاتـان، لـە سروشـتاندا جێگیـرە، هەندێجـار پشـت تێکـردن دەبێتـە مایـەی ئـەوە لێتانـی پەنهـان بـکات.

لـە حەقیقەتـدا ئێـوە ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ بیرکردنەوەتـان تەنهـا بەسـەرنجدانێک دەزانن خاوەنـی زەوی، وە ئەوەیشـی لەناویدایـە تەنهـا یـەک پەرسـتراوە، وە پەرسـتراوێتی هـەر بەدیهێنراوێـک بەتـاڵو پووچە.

پاشـان باسـەکە دەگوازێتـەوە بـۆ مەزنتـر لـەوەو فەرموویەتـی: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ﴾ واتـە: (ئـەی کـێ پەروەردگـاری حـەوت ئاسـمانەکانە)، وە ئەوەیشـی تێیدایـە لـە ڕووناکـیو ئەسـتێرەکانو ئەوانـەی دەجوولێـنو ئەوانەی جێگیـرن ﴿وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ (واتـە: پەروەردگـاری عەرشـی مەزنـە)، عـەرش مەزنتریـنو فراوانتریـنو بەرزترینـی بەدیهێنراوەکانـە، ئایـا کـێ ئـەوەی دروسـت کـردووەو ڕێکـی خسـتووە بـە جۆرەهـا ڕێکخسـتن؟ ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ واتـە: بێگومـان دان دەنێـن بـەوەی کـە خـوا پەروەردگـاری هەموانـە.

کاتـێ کـە دانیاننـا بەوانـەدا پێیـان بڵـێ: ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ (واتـە: ئایـا پارێـز ناکەن)، وە خۆتـان بپارێـزن لـە پەروەردگـاری مـەزن، کـە خاوەنـی هێـزی تـەواوو دەسـەلاتی مەزنـە؟ لەمـەدا نـەرمو نیانـی دوانـدن بـەدی دەکـرێ لـە فەرمـوودەی خـوا ﷻ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئامۆژگـاری کـردن بـە کەرەسـتەی خسـتنەڕوو

بەهێزتـرە بـۆ دڵـەکان.

پاشـان خـوا ﷻ گواسـتیەوە بـۆ لای دانپێدانانـی بێبڕوایـان بـەوەی کـە لـە دروسـتکردنەوەی مـردووەکان گشـتگیرترە، فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ واتـە: کـێ فەرمانڕەوایـیو موڵکـی هەمـوو شـتێکی بـە دەسـتە لـە جیهانـی سـەرەوەو جیهانـی خـوارەوە، ئـەوەی کـە دەیبینیـنو ئـەوەی نایبینیـن، وە (الملكـوت) صیغـەی موبالەغەیـە بـە واتـای موڵـک دێـت ﴿ وَهُوَ يُجِيرُ ﴾ (واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە پەنـای) هەمـوو بەنـدەکان دەدات لـە شـەڕو خراپـەو خراپەکاریەکانیـان لەسـەر لادەبـات، وە دەیانپارێـزێ لـەوەی زیانـی هەیـە بۆیـان ﴿ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ ﴾ واتـە: هیـچ کـەس ناتوانـێ لـە خـوا پەنـا بـدرێ، وە ناتوانـێ ئـەو شـەڕە لاببـات کـە خـوا ﷻ نوسـیویەتی، بەڵکـو هیـچ کـەس ناتوانـێ شـەفاعەت بـکا بـە مۆڵەتـی ئـەو نەبـێ، ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ﴾ واتـە: بێگومـان دانـی پێدادەنـێ خـوای گـەورە خاوەنـی هەمـوو شـتێکە، پەنـادەرەو کـەس لـەو پەنـا نادرێـت ﴿ قُلْ ﴾ پێیـان بڵـێ: کاتـێ دان بـەوەدا دەنێـن، پەیوەسـتیان بکـە: ﴿ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴾ واتـە: عەقڵتـان بـۆ کـوێ ڕۆیشـتووە، کاتـێ بەندایەتـی شـتانێکتان کـرد خۆتـان دەتانزانـی هیـچ موڵـکو دەسـەڵاتێکیان نیـە، وە ئـەوان بێتوانـان لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، وە وازتـان لـە دڵسـۆزی هێنـا بـۆ خاوەندارێکـی مـەزنو بـە توانـا کـە ڕێکخـەری هەمـوو کاروبارەکانـە، بـە ڕاسـتی ئـەو عەقڵانـەی ڕێنیشـاندەری ئێـوە بـوو جادوولێکـراوە، شـەیتان جـادووی لێکـردوە، بـەو شـێوەی بۆیانـی جوانکـردوەو ڕازاندوویەتیـەوە، حەقیقەتەکانـی لـە پێـش چاویـان هەڵگێڕاوەتـەوە، جادوویشـی لـە عەقڵەکانیـان کـردوە، هەروەکـو چـۆن جادووگـەران جـادوو لـە چـاوی خەڵکـی دەکـەن.

بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن
وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ
وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾
عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ
إِمَّا تُرِيَنِّى مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِى فِى ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى
هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ
أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن
يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ
ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّآ إِنَّهَا
كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾
فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ
﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ
خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ
خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

**(٩٠-٩٢):** ﴿ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾:

﴿ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ ﴾ خوا دەفەرموێ: بەڵکو ئێمە ڕاستیمان بۆ بە درۆدانەران هێناوە، کە هەموو هەواڵێکی ڕاست و دادپەروەری لە فەرمان و قەدەغەکراوەکان لە خۆدەگرێ، چی وای لێکردوون بڕوای پێ ناهێنن، لە کاتێکدا ئەو لە پێشترە بۆ شوێنکەوتن، وە هیچ شتێکیان لانیە قەرەبووی پەرستنی غەیری خوا بکەنەوە، تەنها درۆو ستەمکردن نەبێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ﴾ واتە: درۆی ئەوان دەناسرێ بە هەواڵی خواو هەواڵی پێغەمبەرەکەی بە عەقڵێکی ڕاست، لەبەرئەمەیە خوا ﷻ ئاگاداری کردۆتەوە بە بەڵگەی عەقڵی، لەسەر دروست نەبوونی دوو پەرستراو، جا فەرموویەتی: ﴿ إِذًا ﴾ واتە: ئەگەر پەرستراوێکی تری لەگەڵدا بووایە، هەروەکو چۆن هاوبەشدانەران دەڵێن: ﴿ لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ ﴾ ئەو کاتە هەر پەرستراوێک چی دروستکردوە بۆ خۆی دەیبردو سەربەخۆ دەبوو، وە یەکێکیان سووردەبوو لەسەر ڕێگری کردن و سەرکەوتن بەسەر ئەوی دیکەدا.

﴿ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ واتە: ئەوەی سەرکەوتووە تەنها ئەو پەرستراوە، ئەگەرنا لەگەڵ ڕێگری و بەربەست داناندا بوونی جیهان بەڕێوەنابرێ، وە وانابینرێ ئەم ڕێکخستنە سەرسووڕهێنەرە عەقڵەکانی پێ سەرسام دەبن، ئەویش ئیعتیبار دەکرێ بە خۆرو مانگ و ئەستێرەکان، بێگومان ئەوانە لەوەتەی دروستکراون لەسەر یەک یاساو ڕێساو ڕێکخستن دەڕۆن، هەموویان ژێربار خراون لە ژێر دەسەڵاتی خوای بەتوانادا بەڕێوەبراون بە

حیکمـەتو دانایـی بـۆ بەرژەوەنـدی هەمـوو بەدیهێنـراوەکان، کورتهەڵنەهێنراون لەسـەر بەرژەوەنـدی کەسـێ جگـە لـە کەسـێکی دیکـە، وە هەرگیـز ناتـەواویو کەمو کـوڕیو دژیەکیـان تێـدا نابینـی لە کەمتریـن بەڕێوەبردندا، ئایـا دەگونجێ ئا ئەمـە ئەندازەگیری دوو پەرسـتراوو دوو پەروەردگاربێ!؟

﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ بـە زمانـی حـاڵ هاتە قسـەکردن، وە بە جوانیو سـەرنج ڕاکێشـانی خـۆی خەڵکی تێگەیاند کە بەڕاسـتی تەنها یـەک بەڕێوەبەرو یەک پەرسـتراوی هەیـە، خاوەنـی تـەواوی نـاوەکانو سـیفاتەبەرزەکانە، هەموو بەدیهێنـراوەکان پێویسـتیان پێیەتـی لـە پەروەردگاریێتـیو لـە پەرسـتراوێتیدا، هەروەکو چـۆن بەدیهێنـراوەکان بوونیان نیـەو بـەردەوام نابـن، تەنهـا بـە پەروەردگارێتـی ئەو نەبـێ، بە هەمان شـێوە چـاک بوونو ڕاگـری بـۆ نیـە تەنها بـە بەندایەتـیو بەتـاک دانانـی نەبـێ لـە گوێڕایەڵیـدا، لەبەرئەمەیە بـە چەندیـن نموونـەی مەزنـی هاوشـێوەی ئەمـە بەندەکانـی کردۆتـەوە، ئەویش زانسـتی بەرفـراوانو دەوردەری خۆیەتـی: ﴿ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتـە: ئـەوەی لەبەر چاوو لە زانسـتی ئێمـەدا دیار نیە لـە واجباتەکانو مەحاڵەکانو مومکینـەکان ﴿ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ ئەوەیە دەیبینین لەوانـەدا ﴿ فَتَعَٰلَىٰ ﴾ واتە: بـەرزو مەزنە ﴿ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ واتە: (لەوەی بتپەرسـتان دەیکـەن بـە هاوبـەش) ئەوانـەی هیـچ زانیاریەکیـان لـە لا نیـە جگـە لەوەنەبـێ خـوا ﷻ فێری کردوون).

(٩٣-٩٥): ﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجۡعَلۡنِي فِي ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمۡ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾:

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ بەڵگـەی مەزنـی خۆی پێویسـت کـرد لەسـەر بەدرۆدانـەران، ئەوان لایـان لێنەکردەوەو گوێڕایەڵی نەبوون، بۆیە سـزایان لەسـەر پێویسـت بـوو، پەیمانیان پێدرا بـە دابەزاندنـی سـزا بـۆ سـەریان، خـوا ڕێنمایـی پێغەمبەرەکەی کـرد بڵـێ: ﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴾ واتـە: ئـەو کاتەی سـزای ئەوانت نیشـانمدا.

﴿ رَبِّ فَلَا تَجۡعَلۡنِي فِي ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتـە: بمپارێـزە لـەو بەڵایـەی تووشـت کـردوون لـەو تاوانانـەی کـە سـزایان لەسـەر پێویسـت دەکات، هەروەهـا بمپارێـزە لەو سـزایەی بەسـەر ئەوانـدا دادەبـەزێ، چونکە سـزای گشـتی لـە کاتـی دابەزینیـدا هەموان دەگرێتـەوە، سـەرپێچیکارانو جگـە لەوانیـش.

خـوا ﷻ دەربارەی نزیکی سـزاکەیان فەرمـووی: ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمۡ لَقَٰدِرُونَ ﴾

(واتــە: بەڕاســتی ئێمە بــە توانایین ئــەو هەڕەشــانەی لێمان کردوون پێشــی بهێنینو نیشــانت بدەیــن)، بــەڵام ئەگــەر دوامان خســت بــە هــۆی حیکمەتێکەوەیــە، ئەگەرنــا توانــای ئێمە گونجــاوو لەبــارە بۆ لەنــاو بردنیان.

(٩٦-٩٨): ﴿ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ٩٦ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ٩٧ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحۡضُرُونِ ٩٨ ﴾

ئەمــە لــە ڕەوشــتە بەرزەکانــە کــە خــوا ﷻ فەرمانــی کــردوە بــە پێغەمبەرەکــەی ﷺ پێــی هەســتێت، فەرموویەتــی: ﴿ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾ واتــە: ئەگــەر دوژمنانــت خراپەیــان لەگەڵــدا کــردی بــە گوفتــارو بە ڕەفتــار، تۆش بــە خراپــە وەڵامیان مــەدەرەوە، لەگــەڵ ئەوەدا دروســتە ســزادانی خراپــەکار بەپێــی خراپەکەی، بــەڵام تۆ خراپی ئــەوان بە چاکــە ڕەتبکــەرەوە، ئــەوە فــەزڵو چاکــەی تۆیــە لەســەر خراپەکار.

وە یەکێــک لــە بەرژەوەندیەکانــی لێبــوردنو بەرپەرچدانــەوە خراپە بە چاکــە، خراپەکاری بەرانبــەر ســووک دەبی، لە ئێســتاو لــە داهاتوودا، ئــەو ڕەفتــارە جوانــە وا دەکات خراپەکار پەشــیمان بێتــەوە بگەڕێتــەوە بۆ حــەقو ڕاســتی، تەوبە بکات لــەو گوناهــەی کردوویەتی.

وە بۆ ئەوەی کەســی لێبوردە ســیفاتی چاکەخوازی بدرێتە پاڵی، بەو هۆیەوە زاڵ ببێت بەســەر دوژمنەکــەی کــە شــەیتانە، وە بۆ ئەوەی پاداشــتی بۆ پێویســت بــێ لــەلای پەروەردگاری، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ ٤٠ ﴾الشوری، (واتــە: جــا هــەر کەســێک ببــورێو چاکــە بــکات ئــەوە پاداشــتی ئــەو لــەلای خوایــە)، ﴿ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ ٣٥ ﴾فصلت، (واتــە: بــە چاکتریــن شــێوە وەڵامــی خراپە بــدەرەوە ئەوســا کەســێ کەلەنێوان تــۆو ئەودا دوژمنایەتــی هەیــە وەک دۆســتێکی دڵســۆزو گیانی بەگیانــی لێدێت بەم ئاســتەنگە ناگات) ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ٣٥ ﴾فصلت. (واتــە: کەســانێ نەبــێ کە خۆڕاگــرنو ئارامــن، وە پێــی ناگــات مەگەر کەســێ خاوەنی بەشــی هــەرە گەورەبێت لە پاداشت).

کــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴾ واتــە: ئــەوەی دەیڵێــن لەو قســانەی کوفــرو بەدرۆدانانــی حــەقو ڕاســتی لەخــۆ دەگــرێ، زانســتی ئێمــە پــەی بــە هەمــوو ئەو کوفــرو بەدرۆدانانــە بردوە، بێگومــان پاراســتوومانەو دەرفەتمــان پێداونو ئارامــان گرتوە لەگەڵیانــدا، حەقیــش هــەر بــۆ ئێمەیــە، ئەوانیــش ئێمەیــان بەدرۆدانــاوە، کەواتە تــۆ -ئەی

موحەممەد ﷺ- پێویستە لەسەرت ئارام بگری لەوەی کە دەیڵێن، بە چاکە وەڵامیان بدەیتەوە، ئەوە پیشەی بەندەی خوایە لە بەرانبەر خراپەکاری ئادەمیزاددا.

بەڵام خراپەکار لە شەیتانەکان، ئەوە چاکە کردن سوودی نیە تیایاندا، ئەوان بانگی حیزب و کۆمەڵەکەیان ناکەن مەگەر بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵی دۆزەخ، جا پیشەی مسوڵمان لە بەرانبەر خراپەکاریەکانی شەیتانەکاندا، ئەوەیە شوێن ڕێنمایی خوا بکەوێ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ ﴾ واتە: پشت بە هێزو توانای تۆ دەبەستم، خۆم بەری دەکەم لە هێزو توانای خۆم ﴿ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴾ واتە: (ئەی خودایە) پەنا دەگرم بە تۆ لەو شەڕو خراپەی تووشم دەبێ بە هۆی خەتەرەو وەسوەسەو ئازاردانیان، وە لەو شەڕەی بە هۆی ئامادە بوونیان!

ئەمە پەنا گرتنە لە بنچینەی شەڕو خراپە، خوای گەورە ئەگەر بەندەکەی بپارێزێ لەم شەڕوو خراپەیەو دوعاو نزاکەی گیرا بکات، سەلامەت دەبێ لە هەموو شەڕوو خراپەیەکو سەرکەوتووش دەبێ بۆ هەموو خێرو چاکەیەک.

(٩٩- ١٠٠): ﴿ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّا ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا ۖ وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾:

﴿ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی کە مردنی دێتە پێش، لەو کەسانەی ڕۆچوون لە زوڵمو ستەمدا، بێگومان لەو کاتەدا کە سەرەنجامی خۆیان دەبینن و کردەوە ناشرینەکانیان دێتە بەرچاو پەشیمان دەبنەوە، ئنجا داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ ژیانی دونیا، نەک بۆ خۆشیو تێرکردنی حەزو ئارەزووەکانیان، بەڵکو لەبەرئەوە دەڵێ: ﴿ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ﴾ (واتە: بەڵکو) کردەوەی چاک بکەم لەوەی کە لە دونیادا لە دەستم داوە، ﴿ كَلَّا ﴾ واتە: نەخێر گەڕانەوەی بۆ نیە دەرفەتی نەماوە، بێگومان خوا ﷻ فەرمانی داوە کە هەرگیز گەڕانەوە بۆ ئەوان نیە ﴿ إِنَّهَا ﴾ واتە: قسەی ئەو کەسەی کە ئاوات دەخوازێ بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا، ﴿ كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا ﴾ واتە: تەنها قسەی زمانە، هیچ سوودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێ تەنها حەسرەتو پەشیمانی نەبێ، هەروەها ئەو کەسە ڕاست ناکا لە داواکردنی گەڕانەوەی بۆ ژیانی دونیا، چونکە بێگومان ئەگەر بگەڕێنرێتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تاوانەی قەدەغەی لێکرابوو، ﴿ وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾

واتــە: لــە پێشــیانەوە بەرزەخێــک هەیــە، ئەویــش بەربەســتێکە لــە نێــوان دوو شــتدا، لێرەدا بریتیــە لە بەربەســت لە نێــوان دونیــاو دوارۆژدا.

لــە ژیانــی بەرزەخــدا گوێڕایەڵان خۆشــیو چێژوو لــەززەت وەردەگرن، ســەرپێچیکارانیش ســزادەدرێن، لەوکاتــەی کــە دەمرن تــا ڕۆژی دوایی، دەی کەواتــە: با توێشــووی بۆ ئامادە بکــەنو کــوڵوو بارەکانیان پــڕ بکەن لە خێــرو چاکە.

(١٠١-١١٤): ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن
ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِي
تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ
﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ
كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ
سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمْ
هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ
فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی نارەحەتــی ڕۆژی دوایی وە ئــەوەی تێیدا دەگــوزەرێ لە دوودڵــیو خــەمو پــەژارە، جــا کاتێ فوو کــرا بە صــوردا، فــووی زیندوو کردنــەوە، هەموو خەڵکــی کۆدەکرێنەوە بە گشــتی لــە کاتو ڕۆژێکی زانــراودا، لــەو ڕۆژەدا نارەحەتیەکیان تــووش دەبــێ کــە خزمو کەســە نزیکەکانی خۆیــان لە بیر دەکــەن، کە ئەوانــە گەورەترین هــۆکارن بــە گەیاندنیــان بــە یەکتــری، هەرچی خــزمو کەســی یەکتر نیــن ئــەوە بێگومان لــە پێشــترن، وە لــەو ڕۆژەدا هیچ کەس پرســیار لە کەسێکی دیکــە ناکا دەربــارەی حاڵی، چونکــە ســەرقاڵە بــە خۆیەوە، نازانــێ ڕزگاری دەبــێ بــە ڕزگاربوونێ کە بەدبەختــی بەدوادا نایــەت؟ یــان تووشــی بەدبەختیەک دەبــێ کە هەرگیز خۆشــی بەدوایــا نایەت؟

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾عبس، (واتــە: ئــەو ڕۆژەی کە مــرۆڤ ڕادەکات لە برای * وە دایــکو باوکــی * وە ژنو کوڕانــی * هەمــوو یەکێک لە ئــەوان لــەو ڕۆژەدا کارێکی وای هەیــە کــە ناپەرژێتە ســەر کەســی دیکە).

لە ڕۆژی دواییدا چەندین شوێنو جێگە هەیە خەمو پەژارەو نارەحەتیەکانی زۆر مەزنە، وەک

تەرازوو کە کردەوەکانی بەندەی پێ جیادەکرێتەوەو بە دادپەروەری تەماشا دەکرێ، چی بۆ ئەو هەیەو چیش لەسەریەتی، تەنانەت مسقاڵە زەرەیەکیش لە خێرو چاکە دەخوێنێتەوە ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ بە جۆرێک چاکەکانی قورستر بێ بەسەر خراپەکانیدا ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ (ئەوانە ڕزگارو سەرکەوتوون)، چونکە ڕزگاریان بووە لە ئاگرو شایستەی بەهەشتن، وە سەرکەوتوون بە وەسف کردنی جوان، ﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ بە جۆرێ خراپەکانی قوورستربێ لە چاکەکانیو هەڵەو پەڵەکانی دەوری دابێ، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ (واتە: ئەوانە کەسانێکن زیانیان لە خۆیان داوە) هەموو زیانو زەرەرێک جگە لەم ژیانە ئێشو ئازارەکەی سووکە.

بەڵام ئەمە زیانێکی زۆر قوورسە، ئەوەی تووشی بووە چاک نابێتەوە، دەستی ناکەوێتەوە ئەوەی لەدەستی چووە، خەسارەتێکی هەمیشەیی‌و بەدبەختیەکی هەتاهەتاییە، بەڕاستی خۆی تووشی خەسارەتمەندی کرد، کە خۆشبەختی هەمیشەیی لە دەستدا، وە ئەو نازونیعمەتە بەردەوامەی لە دەستدا کە لە نزیکی پەروەردگاری بەخشندەیەتی ﴿ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴾ دەرناکرێن لە ناو ئەو دۆزەخە بۆ هەتا هەتایە، ئەم هەڕەشەیە هەروەکو ئەوەیە کە لە پێشەوە باسمان کرد، بۆ ئەو کەسەیە تاوانو خراپەکانی دەوری چاکەکانی دابێ، ئەوەش تەنها کەسی بێبڕوا دەگرێتەوە، لەسەر ئەمە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێ وەک لێپرسینەوە کردن لەگەڵ کەسێکدا چاکەو خراپەکانی تەرازوو بکرێ، چونکە ئەوان هیچ چاکەیەکیان نیە، بەڵکو کردەوەکانیان بۆ دەژمێردرێ لەسەری دەوەستێنرێن‌و دانی پێدا دەنێن، ئنجا ڕیسواو سەرشۆڕ دەکرێن، بەڵام ئەو کەسەی بنچینەی ئیمانو بڕوای لەگەڵدایە، بەڵکو تاوانو گوناهەکانی زۆرو مەزنن، گوناهەکانی زاڵ بووە بەسەر چاکەکانیدا، ئەگەرچی بخرێتە دۆزەخیشەوە بۆ هەتا هەتایی لە ناویدا نامێنێتەوە، هەروەکو چۆن دەقەکانی قورئانو سوننە ئاماژەی پێدەکەن، پاشان خوای گەورە باسی سەرەنجامی خراپی بێبڕوایان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾ واتە: ئاگری دۆزەخ لە هەموو لایەکەوە دایان دەپۆشێ، تەنانەت ئەندامە پیرۆزەکانی جەستەیشیان دەگرێتەوە، ئاگری دۆزەخ دەمو چاویان لەتو پەت دەکات ﴿ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ واتە: ئاگری دۆزەخ لێویانی هەڵقرچاندووەو ددانەکانیان دەرکەوتووە لە ناڕەحەتی ئەوەی تیایدان.


أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلِ الْعَادِّينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١١٨﴾

سورة النور

بە سەرزەنشت کردنەوە پێیان دەوترێ: ﴿ أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ (واتە: ئایەتەکانی من لە دونیادا بەسەرتاندا نەدەخوێنرایەوە) بانگ دەکران بۆ ئەوەی بڕوای پێ بێنن، وە دەخرایە ڕوو بۆ ئەوەی تەماشای بکەن، ﴿ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ (واتە: کەچی ئێوە بڕواتان پێ نەبوو بە درۆتان دەزانی)، بە هۆی ستەم کردنو عینادیتانەوە، ئەوانە ئایەتو نیشانەی ڕوونکراوە بوون، بەڵگە بوون لەسەر حەقو ناهەق، ڕوونکەرەوە بوون بۆ ئەو کەسانەی بە ڕاستی دەزانن‌و ئەوانەیشی بە پووچ تەماشای دەکەن، ئەوکاتە دان دەنێن بە ستەمەکانیاندا، لە کاتێکدا دانپێدانان هیچ سوودێکی نیە، ﴿ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا ﴾ واتە: بەدیو خراپی خۆمان زاڵ بوو بەسەرماندا، کە سەرچاوەی گرتبوو لە ستەمو پشت تێکردن لە حەقو ڕاستی، ڕووکردنە ئەو شتەی زیانی هەیەو وازهێنان لەوەی سوودو قازانجی هەیە ﴿ وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴾ (واتە: ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین) لە کاروکردەوەکانماندا، ئەگەر چی دان بەوەدا دەنێن کە ستەمکارن، واتە: ڕەفتاری ئێمە لە دونیادا وەک ڕەفتاری کەسێکی بێئاگای گومڕای گێلو گەمژە بوو، هەروەکو چۆن لە ئایەتێکی تردا دەڵێن: ﴿ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾ ﴾ الملك. (واتە: دەڵێن ئەگەر قسەی پێغەمبەرانمان ببیستایە یان تێبگەیشتینایە، ئیتر پێیان نا لە گوناهەکەیان کەوابوو دووری لە میهرەبانی خوا بۆ هاوەڵانی دۆزەخ).

﴿ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴾ ئەوان درۆیانکرد لەم پەیمانو بەڵێنەیاندا، بێگومان ئەوان هەروەکو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعام، خوا ﷻ هیچ بەڵگەیەکی لە دونیادا بۆ نەهێشتنەوە قسە

بکـەن، بەڵکـو هەمـوو بیانوویەکیانـی بـڕی، لـە دونیـادا تەمەنـی درێژکـردن بـۆ ئـەوەی بیربکەنـەوە وەک کەسـێکی بیرکـەرەوە کـە بیـر دەکاتـەوە، وە کەسـی سـتەمکاریش دادەچەڵەکـێ، خـوا ﷻ لـە وەڵامیانـدا فەرموویەتـی: ﴿ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾ (واتـە: بێدەنـگ بـن و دەمتـان داخـەن قسەیشـم لەگـەڵ مەکـەن) ئـەم قسـەیە -داوا دەکەیـن لـە خـوا بمانپارێـزێ- مەزنتریـن قسـەیە کـە موجریـم و تاوانبـارەکان دەیبیسـتن، لـە سەرزەنشـت و زەلیلـی و خەسـارەتمەندی، وە بـێ ئومێدبـوون لـە هەمـوو خێـر و چاکەیـەک و مـژدەدان بـە هەمـوو شـەڕو خراپەیـەک، ئـەم قسـەو خەشـم و قینانـە لەلایـەن پەروەردگـاری بـە بەزەییـەوە قورسـتر و نارەحەتـرە لـە سـزادانیان لـە نـاو دۆزەخـدا.

پاشـان باسـی هـۆکاری ئـەوە دەکات کـە گەیاندنـی بـەو سـزایەو بێبەشـی کـردن لـە ڕەحـم و بەزەیـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴾ (واتـە: ئـەی پەروەردگارمـان ئێمـە بڕوامـان هێنـاوە دەی لێمـان خۆشـبەو ڕەحممـان پێبکـە، چونکـە تـۆ چاکترینـی میهرەبانانـی) کۆیانکـردەوە لـە نێـوان: بڕواهێنانـێ کـە کـردەوەی چـاک بخـوازێ، وە داواکـردن لـە پەروەردگاریـان بـە لێخۆشـبوون و میهرەبانـی، وە تەوەسـول کـردن بـە پەروەردگارێتـی خـوا ﷻ وە منەتکردنـی بـە بڕواهێنـان و هەواڵـدان بـە بەرفراوانـی ڕەحمەتـی و گشـتگیری چاکەکانـی، وە لـە نێویانـدا بەڵگەیـە لەسـەر ملکەچـی و گـەردن کەچیـان و خۆشـکاندنەوەیان بەرانبـەر پەروەردگاریـان، وە هەبوونـی تـرس و ئومێدیـان پێـی.

ئـا ئەوانـە سەرمەشـقی خەڵکـی و بەڕێزترینیـان بـوون ﴿ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ ﴾ کەچـی ئێـوە ئـەی بێبڕوایـان ئـەو کاتـە هیـچ عەقـڵ و ژیریەکتـان نەبـوو ﴿ سِخْرِيًّا ﴾ گاڵتەتـان بـە بـڕواداران دەکـردو بـە کەمتـان دەزانیـن، هەتـا سـەرقاڵبوون بـەو گەمژەیـی و بـێ عەقڵـی خۆتانـەوە ﴿ حَتَّىٰ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴾ واتـە: ئـا ئەمـە بـوو بـە مایـەی ئـەوەی یـادی خوایـان لـە بیـر بچـێ، ئەویـش گاڵتەکردنیـان بـوو بـە بـڕواداران، هەروەکـو چـۆن لـە بیرکردنـی یـادی خوایـان هانیـدان لەسـەر گاڵتەپێکـردن و بـە کـەم زانیـن، جـا هەریـەک لـەم دوو کارە ئـەوی دیکـە بـە لای خۆیـدا ڕادەکێشـێ، ئایـا لـە سـەرووی ئـەم بوێریـەوە بوێریەکـی دیکـە هەیـە؟!

﴿ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا ﴾ (واتـە: بێگومـان ئەمـڕۆ پاداشـتم داونەتـەوە بـە هـۆی

خۆراگریانەوە) لەسەر گوێڕایەڵی منو لەسەر ئازاردانی ئێوە، هەتا گەیشتنە لام ﴿ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ (واتە: بەڕاستی ئەوان سەرکەوتوون) بە نازونیعمەتی بەردەوامو ڕزگاربوون لە دۆزەخ، وەک لە دەقێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾المطففين، (واتە: جا ئەمڕۆ ئەوانەی باوەڕدار بوون بە کافران پێدەکەنن)، ﴿ قَٰلَ ﴾ پێی فەرموون: بە شێوەی سەرزەنشت کردن، ئەوان گێلو گەمژەن کە لەم ماوە کەمەی دونیادا، هەموو شەڕوو خراپەیەکیان بۆخۆیان کۆکردەوە، تا گەیاندنی بە خەشمو قینو سزای خوا ﷻ، وەکو باوەڕداران خێرو چاکەیان تیایدا کۆنەکردەوە، تا بیانگەیەنێ بە خۆشبەختیەکی بەردەوامو ڕەزامەندی پەروەردگاریان: ﴿ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ﴾ (واتە: چەند ساڵ لەسەر زەویدا مانەوە * لە وەڵامدا دەڵێن ڕۆژێک یان کەمتر لە ڕۆژێک مایەنەوە) وتەکانیان بوونیاتنراوە لەسەر کورتی مانەوەیان لە ژیانی دونیادا، بەڵام باس لە ئەندازەی ناکاو دیاری ناکات، لەبەر ئەمەیە وتیان: ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴾ واتە: لەوانە بپرسن کە بە چاکی ژماردوویانە. بەڵام خۆیان لەسەرقاڵیو سزایەکی ئەوتۆدان، هیچ دەربارەی ژمارەی مانەوەیان لە دونیادا نازانن، جا پێی فەرموون: ﴿ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ یەکسانە ئەگەر ژمارەکەیتان بۆ دیاریکرابێ، یان دیاری نەکرابێ، ﴿ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: ئەگەر بەراستی ئێوە دەتانزانی).

(١١٥-١١٦): ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ ﴾ واتە: ئایا گومانتان وایە ئەی بەدیهێنراوەکان ﴿ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا ﴾ واتە: بێگومان ئێوەمان دروستکردوە بەبێ هوودەو هاوەنتە، دەخۆنو دەخۆنەوە، پشوو دەدەنو چێژ وەردەگرن لە خۆشیەکانی دونیا، وە وازمان لێهێناونو فەرمانتان پێناکەینو قەدەغەتان لێناکەین، وە پاداشتان نادەینەوەو سزایشتان نادەین؟ لەبەرئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ (بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە) با ئەمە نەیەت بە خەیاڵتاندا ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ﴾ واتە: مەزنیو بەرزی بۆ خوا ﷻ لەم گومانە پووچو بەتاڵە کە دەگەڕێتەوە بۆ تانەدان لە حیکمەتی خوا ﴿ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾ خوای پەروەردگار پاشای

هەمـــوو بەدیهێنراوەکانـــە، لـــە راســـتگۆیی‌و پەیمـــان‌و هەرەشـــەکردنیدا، پەرســـتراوەو خـاوەن تـەواوی‌و کەماڵـە ﴿ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾ (واتـە: پەروەردگـاری عەرشـی بەرێـزە)، ئەوەیشـی لـە خـوار عەرشـەوەیە ئـەوە لـە پێشـترە، وە ئێـوە بـە هاوەنتـەو بـێ هـــوودە دروســت نــاکات.

(١١٧-١١٨): ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾:

﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ﴾ واتـــە: هـــەر کەســێ لەگــەڵ خــوادا پەرســتراوێکی دیکــە بپەرســتێ بەبــێ هیــچ ڕوونکردنــەوەو بەڵگەیــەک، ئەمــە بەســتنەوەیەکی پێویســتە، جــا هــەر کەســێ غەیــری خــوا ﷻ بپەرســتێ ئــەوە بەڵگــەو ســەلماندنی نیــە لەســەر ئــەو پەرســتنە، بەڵکــو بەڵگــەکان ئامــاژەن لەســەر پووچــی‌و بەتاڵــی ئــەوەی لــە غەیــری خــوا ﷻ دەیپەرســتێ، پشــتی لــە پەرســتنی خــوا ﷻ کــردوە بــە هــۆی ســتەم‌و عینــادی کردنــەوە، ئــەم کەســە پێــش دەخــرێ بــۆ لای پەروەردگــاری ئەویــش پاداشــتی دەداتــەوە بــە پێــی کردەوەکانــی، هەرگیــز ســەرکەوتن‌و ســەرفرازی دەســتناکەوێ چونکــە بێبڕوایــە، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ بێبڕوایــان ڕێگــری ئەوەیــان لێکــردوون ســەرکەوتوو بــن، ﴿ وَقُل ﴾ وە بڵــێ: داوا بکــە لــە پەروەردگــارت بــە دڵســۆزیەوە ﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ ﴾ واتــە: خوایــە لێمــان خۆشــبە، هەتــا ڕزگارمــان دەکــەی لــە نارەحەتــی، وە بەزەیــت پێمانــا بێتــەوە بەڵکــو بــە ڕەحمەتــی خــۆت بمانگەیەنــی بــە هەمــوو خێــرو چاکەیــەک ﴿ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ هەمــوو بەزەیــی کارێ بــە بەنــدە خــوا لــەو بەبەزەییتــرە بــۆی، بــە بەزەیــی تــرە بــە بەندەکــەی لــە بــاوک‌و دایــک بــە منداڵەکــەی خۆیــان، تەنانــەت لــە نەفســی خۆیشــیان بــۆ خۆیــان بــە بەزەییتــرە.

تەفسیری سوورەتی (المؤمنون) تەواو بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سُورَةٌ أَنزَلۡنَٰهَا وَفَرَضۡنَٰهَا وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ
(١) ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم
بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ
عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢) ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ
وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
(٣) وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ
فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ (٤) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ
ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٥) وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ
شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ (٦) وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ
(٧) وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ (٨) وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
(٩) وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ (١٠)

## تەفسیری سووڕەتی (النور)
## مەدەنییە (٦٤) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ سُورَةٌ أَنزَلۡنَٰهَا وَفَرَضۡنَٰهَا وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ (١) ﴾:

﴿ سُورَةٌ ﴾ واتە: سووڕەتێکی مەزنە ﴿ أَنزَلۡنَٰهَا ﴾ واتە: (دامانبەزاندوە) وەکو ڕەحمەتێک لەلایەن ئێمەوە بۆ بەندەکان، وە پاراستوومانن لە هەموو شەیتانێکی مەزن ﴿ وَفَرَضۡنَٰهَا ﴾ واتە: ئەندازەمان کردوەو دامانبەزاندوە ئەوەی کە دامانبەزاندوە لە سنوورو شایەتیەکانو غەیری وانیش ﴿ وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴾ واتە: (لەو سووڕەتەدا هێناومانەتە خوارەوە) بڕیاری گەورە فەرمانو قەدەغەکراوەکانو حوکمی مەزن، ﴿ لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ واتە: (بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە) کاتێ بۆتانی ڕوونی دەکەینەوە، وە فێرتان دەکەین شتانێک پێشتر نەتانزانیوە، پاشان باسی ئەو حوکمو بڕیارانەی کردوە کە ئاماژەی پێکراوە، فەرموویەتی:

(٢): ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢) ﴾:

ئەمە حوکمو بڕیارە بۆ زیناکاری پیاوو زینا لەگەڵ کراوی ئافرەتە، سەد داری حەد دەدرێ لە هەریەک لەو دووانە، بەڵام ژنی شوکردو ئەوە دەقی فەرموودەی ڕاست هاتووە ئەندازەکەی ڕەجم کردنە، وە خوا ﷻ قەدەغەی لێکردووین بەزەییمان پێیاندا بێتەوە لە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوادا، جا ئەگەر بەزەییەکی سروشتی بێ یان بە هۆی خزمایەتی، یان بە هۆی هاوڕێیەتی، یان جگە لەوانە، بێگومان بڕواهێنان دەبێتە مایەی پێویست بوونی ڕەتکردنەوەی بەزەیی لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا، ڕەحمەتو بەزەیی حەقیقی لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادایە، ئێمە ئەگەر ڕەحمی لێبکەین لە جێبەجێ کردنی قەدەر بەسەریدا، ئەوە لەم ڕووەوە

ڕەحمی لێناکەین.

خوا ﷻ فەرمانی کردوە کۆمەڵێک لە بڕواداران ئامادەی بینینی ئەو سزایە بن، بۆ ئەوەی بڵاوبێتەوەو وە ترس و بیمیش لە دڵی خەڵکیدا دروست بێ بۆ ئەنجام نەدانی، وە لەبەرئەوەی حەدی شەرعی بەچاو ببینن، بێگومان بینینی بڕیارە شەرعیەکان زانست بەهێز دەکات و تێگەیشتنیش دەچەسپێنێ، وە دەبێتە نزیکترین شت بۆ پێکانی ڕاستی، وە نەلێی زیاد دەکرێ، وە نە لێی کەم دەکرێ خوا زاناترە.

(٣): ﴿ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٣ ﴾:

﴿ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ ﴾ ئەمە ڕوونکردنەوەیە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ڕیسواکردنی زینا، بێگومان زیناکەر ناموسی بەرانبەرەکەی دەڕوشێنێ، کە لە هیچ تاوانو گوناهێکی تردا بەو شێوەیە نیە، خوا هەواڵ دەدات پیاوی زیناکەر تەنها دەبێ ئافرەتی زیناکەر بخوازێ، چونکە بارودۆخی هەردووکیان پێکەوە دەگونجێ، یان ئافرەتێکی موشریک کە هاوەڵ بۆ خوا دابنێ و بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبێ، وە پەیوەستیش نەبێ بە فەرمانی خواوە.

بەهەمان شێوە ئافرەتی داوێن پیسیش تەنها دەبێت شوو بکات بە پیاوی موشریک ﴿ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ واتە: حەرامکراوە لەسەر بڕواداران شوبکەن لەگەڵ پیاوێکی زیناکەر، یان ئافرەتێکی زینا لەگەڵ کراو.

مانای دەقەکە هەر کەسێک وەسف کرابێ بە زینا لە پیاو یان لە ژن، وە تەوبەیشی نەکردبێ، ئەو کەسەی دەستپێشخەری دەکات لە زەواج کردن لەگەڵیدا، لەگەڵ ئەوەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوە، بەدەر نیە لە یەکێک لەمانە: یان ئەوەیە پەیوەست نیە بە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوەش کەسێکی موشریک و هاوەڵدانەرە، یان ئەوەیە پەیوەستە بە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەستپێشخەری دەکات لەمارەکردنیدا لەگەڵ ئەوەدا دەزانێ زیناکارە، جا ئەم مارەکردنە زینایە، ئەوەی کە مارەی بڕیوە زیناکەروو تاوانبارە، چونکە ئەگەر بڕوادارێکی ڕاستەقینە بێ زەواج لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا ناکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر قەدەغەکردنی مارەبڕینی ئافرەتی زیناکەر تا ئەو کاتەی تەوبە دەکات، بەهەمان شێوە زەواجکردن لەگەڵ پیاوێکی داوێن پیسدا تا تەوبە دەکات، چونکە بەراوردکردنی ژن بۆ پیاوەکەی و پیاو بۆ ژنەکەی لە گەورەترینی بەراوردەکانە.

بێگومان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الصافات، (ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە) واتە: لەگەڵ هاوڕێکانیان، خوا ﷻ ئەمەی حەرامکردوە چونکە شەڕووخراپەیەکی مەزنی تێدایە، وە دەبێتە مایەی کەم غیرەتی‌و خستنەوەی منداڵ کە لە پیاوەکەی نیە، چونکە زیناکەر سەلامەت نابێ بە هۆی سەرقاڵ بوونی بە جگە لە خێزانی، کە هەندێکیان بە-ـە بۆ قەدەغەکردن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کەسی زیناکەر بڕوادار نیە(لەکاتی زیناکردندا)، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لاَ يَزْنِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ} (أخرجه البخاري برقم: (٦٤٢٥))، واتە: کەسی زیناکەر لە کاتی زینا کردن بڕوادار نیە، ئەو ئەگەر چی هاوەڵیش بۆ خوا دانەنێ ئەوە ناوی پیاهەڵدانی بۆ دانانرێ کە ئیمانە بە ڕەهایی.

(٤-٥): ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾

دوای ئەوەی خوا ﷻ کاری زینای بە (تاوانێکی) مەزن دانا بە پێویست بوونی لێدانی دار، هەروەها ڕەجم کردن ئەگەر خێزاندار بوو، ئەو تاوانە نابێت بەراورد بکرێ لەگەڵ تاوانێکی دیکەدا، وە تێکەڵ بکرێ بە جۆرێ بەندە سەلامەت نەبێ لە شەڕو خراپە، خوا ﷻ مەزنی ئەو تۆمەتەی ڕوون کردوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ﴾واتە: (ئەوانەی بوختان) بۆ ئەو ئافرەتە داوێنپاکانە دەکەن، بەهەمان شێوە پیاوەکانیش، بەبێ جیاوازی لە نێوانیاندا، مەبەست لە تۆمەت، تۆمەتبار کردنە بە زیناکردن، بە بەڵگەی سیاقی دەقەکە، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ ﴾واتە: (پاشان نایهێنن) لەسەر ڕاستی بوختانەکەیان ﴿ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴾ واتە: (چوار لە) پیاوانی دادپەروەر، بە ڕوونی شایەتی لەسەر ئەوە بدەن ﴿ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً ﴾واتە: (هەشتا داریان لێبدەن) بە لێدانێکی ناوەند ئازاری پێ بگات، نابێت ڕۆبچێت لە لێدانیدا هەتا شوێنێکی لەناو بیات، چونکە مەبەست لەو لێدانە تەمبێ کردنە نەک لەناوبردن، لەمەدا سنووری جێبەجێ کردنیەتی، هەروەکو خوا فەرموویەتی: تۆمەتبار کەسێکی داوێن پاکی بڕوادار بێ، بەڵام تۆمەتبار کردنی کەسێک داوێن پاک نەبێ، ئەوە تەنها تەمبێ دەکرێ.

﴿ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًا ﴾واتە: سزایەکی دیکەشیان بۆ هەیە، ئەویش ئەوەیە شایەتیدانی تۆمەتکارو بوختانکەر وەرگیراو نیە، ئەگەر داری حەدیشی لێبدرێ، تا تەوبە دەکات، وەک چۆن لە داهاتوودا باس دەکرێ، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾واتە: ئەوانە دەرچوون لە گوێڕایەڵی خوا، ئەوانە شەڕو خراپەیان زۆر بووە، ئەویش بە هۆی شکاندنی سنووری خواو شکاندنی

شەرەف‌و ناموسی براکەی، وە زاڵ کردنی قسەی خەڵکی بەرانبەری‌و نەهێشتنی پەیوەندی ئیمانی کە خوا بەستوویەتی لە نێوان برواداراندا، وە حەز کردنی لەکەدار کردنی ناموسی بروادارن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بوختان کردن یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: تەوبە کردن لە بوختان لەم کاتەدا، ئەوەیە بوختانکەر خۆی بە درۆ دەخاتەوەو دانی پێدا دەنێ ئەو درۆزنە لەوەی کە وتوویەتی، پێویستە لەسەری خۆی بەدرۆ بخاتەوە، ئەگەر دڵنیاش بێ ئەو کارە ڕوویداوە، لە کاتێکدا ئەگەر چوار شایەتی نەبوو، ئەگەر بوختانکەر تەوبەی کردو کاری چاکی ئەنجامدا، خراپەکاریەکانی گۆڕی بە چاکە، ئەوە سیفاتی لە سنوور دەرچوونی لەسەر لادەچێ، هەروەها شایەتی لێوەردەگیرێ لەسەر بۆچوونی تەواو، بێگومان خوا میهرەبان‌و بە بەزەییە لە هەموو گوناهەکان خۆش دەبێ بۆ کەسێ تەوبەی کردبێ‌و گەڕابێتەوە.

بوختانکەر لە کاتێکدا داری حەدی لێدەدرێ، ئەگەر چوار شایەت نەهێنێ، بە مەرجی ئەو کەسەی تۆمەت دراوەتە پاڵی ژنی خۆی نەبێ، ئەگەر ژنی خۆی بوو، ئەوە خوا ﷻ باسی کردووەو فەرموویەتی:

(٦-١٠): ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٦ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٧ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٨ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٩ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ۝١٠ ﴾:

لەبەر ئەوە شایەتی دانی پیاو بۆ ژنەکەی خۆی حەددی شەرعی لەسەر پێویست نابێ، چونکە بە زۆری پیاو دەسپێشخەری ناکات لە تۆمەتبارکردنی ژنەکەی بۆ ئەوەی لەکەداری بکات، تەنها لە کاتێکدا نەبێ کە ڕاستەو حەقیقەتی هەیە، وە لەبەر ئەوەش مافی خۆیەتی‌و دەترسێ ژنەکەی منداڵێک بخاتەوە لەو نەبێ، جگە لەوەش چەندین حوکمی دیکەی تێدا شاراوەتەوە کە لە غەیری ئەودا نیە، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ﴾ (واتە: ئەو پیاوانەی بوختان بۆ ژنەکانیان دەکەن)، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە ئازادن جگە لە کەنیزەکەکان ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ﴾ لەسەر ئەو تۆمەتەی کردوویانە ﴿ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ ﴾ واتە: (بێجگە لە خۆیان کەس شایەتیان نەبێ لەو تۆمەتەی کە کردوویانە ﴿ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ ناوی ناوە شایەتی، چونکە لە جێگای شایەتیدان دادەنیشێ، بەوەی کە دەڵێ: شایەتی دەدەم بە خوا من ڕاستگۆم لەو تۆمەتەی داومەتە پاڵ خێزانەکەم.

﴿ وَٱلْخَـٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾ واتە: لە شایەتی پێنجەمدا ئەوە زیاد دەکات، بۆ جەخت کردنەوە لەسەر ئەو چوار جارەی پێشووە کە شایەتی دا، بەوەی نەفرینی خوا لە خۆی دەکات ئەگەر درۆ بکات، ئەگەر ئەو نەفرینەی تەواو کرد سزای حەددی لەسەر هەڵدەگیرێ.

ڕووکەشی دەقەکە ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی دیاری کرد لە سوێند خواردنەکەدا ئەو هیچ مافێکی بەسەریەوە نامێنێ، بەڵام ئایا حەددی شەرعی لەسەر ئافرەتەکە جێبەجێ دەکرێ تەنها بە نەفرین کردنی پیاوەکە، یان زیندانی دەکرێ؟ ئەوەی کە بەڵگەی لەسەرە ئەوەیە حەددی شەرعی لەسەر پێویست دەبێ، بە بەڵگەی وتەی خوا ﷻ: ﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ ﴾ تا کۆتایی، جا ئەگەر سزا بریتی نەبوایە -لە حەددی شەرعی- ئەوە بە نەفرینی پیاوەکەی پێویست دەبوو لەسەر ژنەکەی، نەفرینی ژنەکە نەدەبووە بەربەست لە بەردەم سزادانەکەدا.

﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ ﴾ وە ئەو ئافرەتەش کە تاوانبار کراوە لە لایەن مێردەکەیەوە، ئەگەر بە هەمان شێوەی مێردەکەی شایەتی بدات، ئەوە سزاکەی لەسەر هەڵدەگیرێ ﴿ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَـٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾ لە پێنجەمیشدا بڵێ: خەشمی خوام لەسەر بێ (ئەگەر مێردەکەم ڕاست بکات) ئەوە نەفرینەکە تەواو دەبێ لە نێوانیاندا، لە یەکتر جیا دەکرێنەوە بۆ هەمیشەیی، منداڵەکەش نادرێتە پاڵی باوکی.

ڕوواڵەتی دەقەکان بەڵگەیە لەسەر بە مەرج دانانی ئەم دەستەواژانە لە کاتی نەفرین کردندا بۆ ئافرەتەکەو پیاوەکەش، وە بە مەرج گیراوە بە دوای یەکتردا بێ‌و هیچی لێ کەم نەکرێتەوە، وە هیچیشی لێ نەگۆڕێ، نەفرین کردن تایبەتە بە پیاو ئەگەر خێزانەکەی تۆمەتبار کرد، نەک بە پێچەوانە، (واتە: ئەگەر ژن شتێکی لە پیاوەکەی بینی مافی نەفرین کردنی نیە) لە یەک چوونیش لە منداڵەکەدا لەگەڵ نەفرین کردندا هیچ پەندێکی لێوەرناگیرێ، بەڵکو لە کاتێکدا لە یەکچوون دەوری هەیە کە هیچ ڕێگا چارەیەک نەبێ جگە لە ئەوە ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴾ لەم دەقەدا وەڵامی (شرط) لابراوە، سیاقی دەقەکە دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوە، واتە: سزای خوا ﷻ دادەبەزی بۆ درۆزنترین یەکێک لەو دوو نەفرین کارە، ئەوەی کە دوعایان پێکردوە لەسەر خۆیان، وە لە ڕەحمەت‌و بەزەیی‌و فەزڵی خوادا جێگیر کردنی حوکم‌و بڕیاری تایبەتە بۆ یەکێک لەو دوو ژن‌و مێردە، لەبەر زۆر پێویستی پێی، وە لەبەر ڕوونکردنەوەی گەورەیی‌و ناشرینی کاری زینا کردن، وە ڕیسوا کردنی بووختان کردن، وە لەبەر ئەوەی خوای گەورە تەوبەی داناوە لەو گوناهە گەورانە.


إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ
هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ
كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ
وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ١٢ لَّوۡلَا
جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٣ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ
فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ١٤
إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ
وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ١٥ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ
قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ
١٦ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٧
وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ
فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩ وَلَوۡلَا
فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٢٠

(١١-٢٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ
مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ
لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي
تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ
إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ
خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا جَآءُو
عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ
فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا
فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ
لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذۡ
تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ
لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ
عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ
لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ
﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ
حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا
وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ
رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ
فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ
وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ
غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ
يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ
لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ
وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ ﴾:

(١١): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ تا كۆتایی

دەقەکان، ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ دوای ئەوەی لە پێشەوە باسی بە مەزن دانانی بوختان کردنی بە زینای کرد بە گشتی، ئەو باس کردنە وەکو پێشەکیەک وایە بۆ ئەم چیرۆکو بەسەرهاتەی کە ڕوویدا بەسەر بەرێزترینو بە حورمەتترین ئافرەتان، دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) ئەم دەقانە بە هۆی بەسەرهاتو ڕووداوی بوختانکردن دروست بوو، لە هەموو کتێبە صەحیحەکانو سونەنەکانو موسنەدەکاندا هاتووە.

بە پوختی، پێغەمبەر ﷺ لە یەکێک لە جەنگەکانیدا، عائیشەی ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆی لەگەڵدا بوو، ملوانکەکەی ون کرد، ئنجا گەڕا بە دوایدا، ئەوانیش حوشترو کەژاوەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد، هێزەکە کەوتە ڕێکردنو ڕۆیشتن، عائیشە گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، زانی ئەوان ئەگەر بزانن بەجێیان هێشتووە دەگەڕێنەوە بۆ لای، ئەوان بەردەوام بوون لە ڕێکردنی خۆیان، صەفوانی کوڕی موعەتەڵ لە بەرێزترینی هاوەڵان بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەو مایە وە لە کۆتایی خەڵکەکەوەو خەوی لێکەوتبوو، عائیشەی بینی ناسیەوە، چوارپێکەی بۆ یەخدا ئەویش سواری بوو بەبێ ئەوەی صەفوان قسەی لەگەڵ بکات، یان بەبێ ئەوەی عائیشە قسەی لەگەڵ بکات، پاشان گەیشتە ناو هێزەکە عائیشە بەسەریەوە بوو لە کاتی نیوەڕۆدا، هەندێ لە دوو ڕووەکان ئەمەیان بینی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوون، لەو گەشتەدا، بەو شێوە صەفوان هێناویەتیەوە، ئەوەی حەزیان لێ بوو بڵاویان کردەوەو، بڵاو بوویەوەو کەوتە دەمی خەڵکی، تەنانەت هەندێ لە هاوەڵانیش تووش بوون، ئەوانیش ئەو هەواڵەیان دەگواستەوە، بۆ ماوەیەکی زۆریش وەحی لە پێغەمبەر ﷺ دابڕا.

دوای ماوەیەک هەواڵ گەیشتە عائیشە، ئەویش زۆر بێتاقەت بوو، خوای گەورە بەرائەتو پاکی بەم دەقانە دابەزاندا، ئامۆژگاری بڕوادارانیشی کرد، لەوەش مەزنتر، ئامۆژگاری کردن بە ئامۆژگاری بە سوود، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو بِالْإِفْكِ﴾ واتە: (ئەو کەسانەی ئەو) درۆ ناشرینەیان بۆ دایکی ئیمانداران هەڵبەست ﴿عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾ واتە: کۆمەڵێک بوون درابوونە پاڵ ئێوە، ئەی بڕواداران، بڕواداری ڕاستگۆیان تیادا بوو بەڵام هەڵخەڵەتا بە جوان کردنی بڕواداران، وە دوو ڕوویانیش تێدا بوو.

﴿لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ (واتە: وا مەزانن ئەو بوختانە شەڕو خراپەی تێدایە بۆتان، بەڵکو خێرو چاکەی تێدایە بۆتان) ئەم دەقانە دوای ئەوەی پاکی دایکی ئیمانداران لەخۆ دەگرن، لەگەڵ ئەوەدا کۆی وەسفکردنەکە هەموو خێزانەکانی پێغبەر دەگرێتەوە، ئەم دەقانە ئەوە لەخۆ دەگرن کە بەندەکان زۆر پێویستیان پێیەتی، کە تا ڕۆژی دوایی کاری پێدەکرێ،

هەموو ئەوانە چاکەی مەزنی تێدایە، ئەگەر قسەی بوختانکەران نەبووایە ئەمەش ڕووی نەئەدا، خوا هەر کارێکی بویێ بیکات هۆکارێکی بۆ ڕێک دەخات، لەبەر ئەمەیە دواندنەکەی گشتگیر کردوە بۆ هەموو بڕواداران، هەواڵی داوە لەکەدار کردنی هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکە، وەکو لەکەدار کردنی نەفس‌و دەروونی خۆیان وایە، ئەوەشی تێدایە بڕواداران لە بەزەیی هاتنەوەیاندا بە یەکتری لە یەککگرتوویی‌و سۆزداریاندا وەکو یەک جەستە وان، هەندێکیان هەندێکی دیکە تەواو دەکەن، هەر وەکو چۆن کەسێک پێی ناخۆشە ناموسی لەکەدار بکرێ، بە هەمان شێوە دەبێ پێی ناخۆش بێ نامووسی کەسێکی دیکە لەکەدار بکرێ، ئەگەر بەندە نەگات بەم حاڵەتە، ئەوە ئیمانی لاوازەو ئامۆژگاری نەکراوە.

﴿ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ﴾ (واتە: هەر یەکێک لە ئەوان تاوانبار دەبن بەو ئەندازەی هەوڵیداوە لەو بوختانەدا) ئەمە هەڕەشەیەکە بۆ ئەوانەی بەو بوختانە هەستاون، بێگومان لەسەر ئەو ڕەفتارەیان تۆڵەیان لێدەکرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێکی لێ دیاری کردوون ﴿ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ ﴾ واتە: کۆی بوختانەکە سەرچاوەی گرتبوو لە دووڕووە پیسە کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول، نەفرینی خوای لێ بێت ﴿ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (واتە: سزایەکی مەزنی بۆ هەیە) ئەویش مانەوەیە هەتاهەتاییە لە خواری خوارەوەی ناو ئاگر.

(١٢): پاشان خوا ﷻ ڕێنمایی بەندەکانی دەکات لە کاتی بیستنی هاوشێوەی ئەم قسانە، فەرموویەتی: ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ﴾ واتە: دەبوو بڕواداران کاتێ ئەم بوختانەیان بیست هەندێکیان گومانی چاکیان بۆ هەندێکیان ببردایە، ئەویش خۆپاراستنە لەو تۆمەتانە، بێگومان ئەو بڕوایەی هەیانە، ڕێگریان لێ بکات لەو جۆرە بوختانە پووچانە ﴿ وَقَالُوا۟ ﴾ بە هۆی ئەو گومانەوە بیانوتایە: ﴿ سُبْحَٰنَكَ ﴾ واتە: پاکی‌و بێگەردی بۆ تۆ لە هەموو خراپەیەک، وە لەوەی کە تۆ دۆستانی خۆت تاقی بکەیتەوە بەو کارە ناشرینانە. ﴿ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: ئەمە درۆو بوختانێکە لە مەزنترین‌و ڕوونترینیانە، پێویستە لەسەر بڕوادار گومانی چاکی هەبێ، کاتێ شتێکی لەو جۆرە دەبیسێ بەرانبەر برا بڕوادارەکەی، پێویستە بە زمانی بەری‌و بێتاوانی بکات، قسەکەریش بەدرۆ بخاتەوە.

(١٣): ﴿ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴾ واتە: ئەی بۆچی ئەو بوختانکەرانە چوار شاهێدی دادپەروەریان نەهێنا، لەسەر ئەو تۆمەتەی داویانەتە پاڵ دایکی ئیمانداران، ﴿ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴾ ئەگەرچی لە ناخی خۆیاندا متمانەو یەقینیان وابوو، بەڵام ئەوانە لە لای خوای گەورە بە درۆزن لە قەڵەم دران، چونکە خوا ﷻ قەدەغەی

کردوە لەسەریان لەو بارەیەوە قسە بکەن بەبێ هێنانی چوار شاهێد، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾واتە: (کەواتە: هەر ئەوانەن لای خوا درۆزنن) نەیفەرمووە: (فأولئك هم الكاذبون) (واتە: ئەوانە درۆزنن). هەموو ئەمانە بۆ مەزن دانانی حورمەتی نامووسی مسوڵمانە، بە جۆرێ هیچ کەس مافی ئەوەی نەبێ بووختانو تۆمەت بداتە پاڵ هیچ کەسێک بەبێ شایەتی ڕاستەقینە، وەک باسکرا.

(١٤): ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾بە جۆرێ خوای گەورە چاکەکانی خۆی داباراندووە بەسەرتاندا لە کاروباری دینو دونیاتاندا ﴿ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ ﴾ واتە: دووچارتان دەبوو ﴿ فِيهِ ﴾لەو بووختانەدا ﴿ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾سزایەکی بە ئێش، لەبەر ئەوەی شایستەتانە بەرانبەر ئەو قسەی کە کردتان، بەڵام لە فەزڵو ڕەحمەتی خوا ﷻ بۆ ئێوە ئەوەیە کە تەوبەی بۆ داناون، وە سزایشی کردۆتە مایەی پاک بوونەوەی گوناهەکانتان.

(١٥): ﴿ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ ﴾واتە: کاتێ بووختانەکەتان لە یەکتریەوە وەردەگرتو باستان دەکرد بۆ یەک، لە کاتێکدا ئەو قسانە هەمووی ناهەق بوون، ﴿ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٌ ﴾واتە: (بە زمانتان شتێکتان دەگوت کە زانیاریتان دەربارەی نەبوو) ئەم دوو کارەش مەترسیدارە، قسەکردن بە ناهەق، وە قسەکردنی بێ زانیاری، ﴿ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنًا ﴾ (لاتان وابوو شتێکی سووکو ئاسانە) ئا لەبەر ئەمەیە هەندێ لە بڕواداران قسەیان لەو بارەیەوە کرد، پاشان تەوبەیان کردوو پاک بوونەوە دوای ئەوە ﴿ وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴾ ئەمە سەرزەنشت کردنێکی قووڵی تێدایە لە ئەنجامدانی هەندێ لە تاوان بە شێوەی سەرزەنشت کردن تیایاندا، بێگومان بەندە گومانەکانی هیچ سوودێکی پێناگەیەنن، وە لە سزایشیان کەم ناکرێتەوە، بەڵکو سزایان بۆ زیاد دەکات، وە ئاسان دەبێ بەلایەوە جارێکی تر دووبارەی بکاتەوە.

(١٦): ﴿ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ﴾واتە: ئەی بڕواداران! بۆچی کاتێ قسەی بوختانکەرانتان بیست ﴿ قُلۡتُم ﴾ نکووڵیان ئەوەتان نەکرد نەتانوت: ﴿ مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا ﴾ واتە: بۆ ئێمە شیاو نیە قسە لەو بوختانە گەورەدا بکەین، چونکە بڕوادار بڕواو ئیمانەکەی ڕێگری لێدەکات شتی خراپو قیزەون ئەنجام بدات، ﴿ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ ﴾واتە: ئەمە درۆیەکی ﴿ عَظِيمٌ ﴾(مەزنە).

(١٧): ﴿ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ ﴾ واتە: خوا ئامۆژگاریتان دەکات جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ تۆمەتبار کردنی بڕواداران بە خراپەکاری، بە ڕاستی ئەوە چاکترین ئامۆژگاریە لەلایەن پەروەردگارمانەوە، پێویستە لەسەرمان بەراوردی بکەین بە وەرگرتنو گوێڕایەڵی کردنو تەسلیم بوون بۆی، لەسەر ئەوەی کە بۆمان ڕوون بوەتەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم

بِهِۦٓ ﴿٥٨﴾ النساء، (واتە: خوا بە چاکترین شت ئامۆژگاریتان دەکات)، ﴿ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ واتە: (ئەگەر ئێوە بڕوادارن) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمانی ڕاستەقینە ڕێگری لە خاوەنەکەی دەکات لە ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکان.

(١٨): ﴿ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾ (واتە: خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە) کە ڕوونکردنەوەو بڕیارەکانو ئامۆژگاریو سەرزەنشت کردنو هاندانو ترساندنی لە خۆ گرتووە، بۆتان ڕوون دەکاتەوە ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرا ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: خاوەن زانستی تەواوو حیکمەتی گشتگیرە، جا لە عیلمو حیکمەتی، ئەوەیە فێری کردوون کە پێشتر نەتاندەزانی، هەموو ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ بەرژەوەندیەکانتان لە هەموو کاتێکدا.

(١٩): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ ﴾ واتە: (ئەوانەی حەز دەکەن) زیناو فاحیشەو داوێن پیسیو بەدڕەوشتی بڵاو ببێتەوە ﴿ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ واتە: (لەناو بڕواداراندا) سزایەکی بە ئێش ئامادە کراوە بۆ دڵو جەستەیان، ئەویش بە هۆی فێڵ کردنیان لە برا بڕوادارەکانیانو حەز کردنی شەڕو خراپە بۆیان، بوێریکردن لە لەکەدارکردنی ناموسیان، جا ئەگەر ئەم هەڕەشەیە تەنها بۆ حەز کردنی بڵاو بوونەوەی فاحیشە بێت لەناو بڕواداراندا، وە بە حەڵاڵ دانانی ئەوە بە دڵ، ئەی دەبێ چۆن بێت کەسێک ئاشکرای بکاتو بیگوازێتەوە؟! یەکسانە ئەگەر فاحیشەکە ڕوویدابێ یان ڕووی نەدابێ.

هەموو ئەمانە لە ڕەحمەتی خوایە بۆ بەندە بڕوادارەکانیو پاراستنی ناموسیان، هەروەک چۆن خوێنوماڵیانی پاراستووە، وە فەرمانی پێکردوون لە نێو یەکتردا پاک بنو یەکتریان خۆش بوێ هەروەک چۆن نەفسی خۆیانیان خۆش دەوێ، وە حەزیان لە خراپەی یەکتر نەبێ وەک چۆن حەزیان لە خراپەی خۆیان نیە ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ زانستی ئێوە بەو شێوەیەیە، خوای گەورە نەفامی خۆتانی بۆ ڕوون کردوونەتەوە.

(٢٠): ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾ (واتە: ئەگەر بەهرەی خوا ﷻ نەبووایە بەسەرتانەوە) کە دەوری داون لە هەموو لایەکەوە ﴿ وَرَحْمَتُهُۥ ﴾ وە بەزەیی خوا ﷻ بەسەرتانەوە ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ دوای ئەوەی ئەو حوکمو ئامۆژگاریو بڕیارە مەزنانەی ڕوونکردەوە بۆتان، وە مۆڵەتی ئەوانەی دا کە پێچەوانەی فەرمانی دەجوڵێنەوە، دیارە ئەوەش بە فەزڵو ڕەحمەتی خۆیەتی، ئەو وەسفە پەیوەستە بە ئەو، ئەوەندە خێری دنیاو دوارۆژی ڕژاندووە بەسەرتاندا کە هەرگیز ناتوانن بیژمێرن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعْ
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِۚ وَلَوْلَا
فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ
مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ
لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ
ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا
كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ
ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ
لِلْخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ
أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ
وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَاۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾

(٢١): دوای ئـەوەی خـوا ﷻ بوختانـی بـە تایبەتـی قەدەغـە کـرد، ئنجـا بـە گشـتی سـەرجەم گوناهەکانـی دیکەشـی قەدەغـە کـرد، جـا فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾ واتـە: دوای ڕێگـاو خەتـەرەو هەنگاوەکانـی شـەیتان مەکـەون، سـەرجەم ئـەو تاوانانـەی کـە پەیوەندیـان هەیـە بـە دڵو زمـانو جەسـتەوە دەچنـە نێویـەوە.

یەکێـک لـە حیکمەتەکانـی خـوا ﷻ ئەوەیـە کـە حوکـمو بڕیارەکانـی ڕوون کردۆتـەوە، ئەویـش قەدەغەکردنـی شـوێنکەوتنی هەنگاوەکانـی شـەیتانە، حیکمـەتو داناییـش لـەوەدا ڕوونکردنـەوەی ئەوەیـە کـە قەدەغەکـراو شـەڕو خراپـەی تێدایـە، کـە وا دەخـوازی وازی لێبهێنـرێ، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ ﴾ واتـە: شـەیتان ﴿ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ﴾ واتـە: فەرمـان بـە شـتانێک دەکات کـە عەقـڵو شـەریعەت بـە تاوانـی مەزنـی دادەنێـن، لەگـەڵ ئـەوەدا هەنـدێ لـە نەفـسو ئـارەزووەکان مەیلیـان بـۆ دەچێـت ﴿ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ ئەوەیـە کـە عەقـڵ نکوولـی لێـدەکاتو نایناسـێ، جـا هەمـوو سـەرپێچیەکان بریتیـن لـە هەنگاوەکانـی شـەیتانو لـەوە دەرناچـن، قەدەغەکردنـی خـوا ﷻ لـە بەندەکانـی نیعمەتێکـە لەلایـەن ئـەوەوە بۆیـان، بۆیـە پێویسـتە لەسـەریان شـوکرانە بژێـریو یـادی بکـەن، چونکـە ئـەوە پارێزەرێکـە بـۆ ئـەوان بـۆ ئـەوەی تووشـی پیسـیو شـتە ناشـرینەکان نەبـن.

یەکێکـی تـر لـە چاکەکانـی خـوا ﷻ بـۆ ئـەوان ئـەو تاوانانـەی لـێ قەدەغە کـردوون، هەروەکـو چـۆن قەدەغـەی کـردوە لەسـەریان چـۆن خواردنـی شـتە ژەهراویـە بکـوژەکانو هاوشـێوەی ئەوانیـش ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ﴾ (واتـە: ئەگـەر بەهـرەو میهرەبانـی خـوا ﷻ نەبووایـە بەسـەرتانەوە هەرگیـز

کەسێ لە ئێوە پوختو پاک نەدەبوو)، واتە: پاک نەدەبوو لە شوێنکەوتنی شەیتان چونکە شەیتان خۆیو سەربازەکانی هەوڵ دەدەنو شتە ناشرینەکان جوان دەکەن، نەفسو دەروونیش حەزیان دەجوڵێ بۆ لای کاری خراپە، ناتەواویش زاڵە بەسەر بەندەدا لە هەموو ڕوویەکەوە، ئیمانو بڕوایش بەهێز نیە، ئەگەر ئەم هۆکارانە بەردەست بن هیچ کەس پاک نابێ لە تاوانو خراپەکاری، وە کارو کردەوەی چاکیشی زیاد ناکات، بەلام فەزڵو ڕەحمەتی خوا ﷻ پێویستیان کردوە بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ خۆی پاک بکاتەوە.

یەکێک لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ: {اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا} (أخرجه أحمد برقم: (١٩٣٢٧)، وعبد بن حميد برقم: (٢٦٧)، ومسلم برقم: (٢٧٢٢)) واتە: (خوایە پارێزکاری بە دەروونم ببەخشە، وە پاکی بکەرەوە، تۆ باشترینی پاککەرەوەکانی، تۆ خاوەنو پشتیوانی نەفسو دەروونمانی)، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ﴾ کەسێک کە خوا ﷻ بزانێ پاک دەبێتەوە بە پاککردنەوە لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ واتە: (بەڕاستی خوا بیسەری زانایە).

(٢٢): ﴿ وَلَا يَأْتَلِ ﴾ واتە: با هیچ کەسێک لە ئێوە سوێند نەخوا ﴿ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ ﴾ واتە: (ئەوانەی کە خاوەن سامانو بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمانو هەژارانو کۆچەران لە پێناوی خوا نەدەن، دەبا لێبوردە بن، دەبا چاوپۆشی بکەن)، لە کۆی ئەوانەی کەوتبوونە نێو ڕوودانی ئەو بوختانەوە (مصطح بن أثاثة) ئەو پیاوە خزمێکی نزیکی ئەبو بەکری صدیق بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، مصطح پیاوێکی هەژار بوو لەوانە بوو لە پێناوی خوادا کۆچیان کردبوو، ئەبوبەکر سوێندی خوارد کە جارێکی تر خێرو چاکەی پێنەکات لەبەر ئەو قسەیەی کە وتی.

ئەم ئایەتە هاتە خوارو قەدەغەی لێکردن لە سوێند خواردن بۆ پێنەدانی خێرو چاکە بە مصطح، وە هانیدا لەسەر لێبووردنو چاوپۆشی وە پەیمانی پێدا بە لێخۆشبوونی خوا ﷻ ئەگەر لێی خۆش بێ، جا فەرمووی: ﴿ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: (ئایا پێتان خۆش نیە خوا لێتان خۆش بێ، وە

خـوا لێخۆشـبوو میهرەبانـە) ئەگـەر مامەڵـە لەگـەڵ بەندەکانیـدا بکـەن بـە لێبـووردنو چاوپۆشـی ئەویـش بـە هەمـان شـێوە مامەڵەتـان لەگەڵـدا دەکات، ئەبوبەکـر کاتـێ ئـەم ئایەتـەی بیسـت فەرمـووی: بەڵـێ، سـوێند بـە خـوا مـن حـەز دەکـەم خـوا ﷻ لێـم خـۆش بـێ، بۆیـە خێـرو چاکـەی گەڕانـدەوە بـۆ مصطـح.

ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر خێـرو چاکـە بـۆ کەسـی نزیـک، وە نابـێ واز لـە خێـرو چاکـە بهێنـێ بـۆ کەسـێک بـە هـۆی سـەرپێچی کردنیـەوە، وە بەڵگەیـە لەسـەر هاندان بـۆ لێبـوردنو چاوپۆشـی کـردن، ئەگـەر کەسـی تاوانبـار هەرتاوانێکـی کردبـێ.

(٢٣): پاشـان باسـی هەڕەشـەی توونـد دەکات لەسـەر بوختـان کردنـی بـۆ ئافرەتانـی داوێـن پـاک، فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ﴾ واتـە: داوێـن پاکـن لـە فاحیشـەو خراپـەکاری، ﴿ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی بـێ ئاگـان بـە خەتـەرەش بـە دڵیانـدا نەهاتـووە ﴿ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ واتـە: نەفریـن کـردن نابـێ بـۆ تاوانـی گـەورە نەبـێ.

نەفرینەکـەی تەئکیـد کردوەتـەوە بـەوەی بەردەوامـە لەسـەریان لـە هـەردوو دنیـادا ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ واتـە: ئەمـەش سـزایەکی زیاتـرە بەسـەر نەفرینەکـەوە، دووری خسـتوونەتەوە لـە میهرەبانـی خـۆی، وە سـزای توونديشـی بـۆ حـەڵاڵ کـردوون.

(٢٤): ئـەو سـزایەش بـۆ ڕۆژی دواییـە ﴿ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، (واتـە: ڕۆژێـک دێـت زمانیـانو دەسـتو قاچەکانیـان شـایەتی دەدەن لەسـەریان، بـە هـۆی ئـەو کردەوانـەی کردوویانـە)، هـەر ئەندامێکـی جەسـتە تاوانەکـەی پێکـراوە شـایەتی دەدات بـەوەی کردوویەتـی، ئـەو خوایـە دەیانهێنێتـە قسـەکردن کـە هەمـوو شـتێکی هێناوەتـە قسـەکردن، هیـچ بـواری نامێنـێ نکوڵـی بـکات، بـە ڕاسـتی خـوا دادپـەروەرە لەگـەڵ بەندەکانیـدا کـە بـە شـایەت لەسـەر خۆیانـی دانـاون.

(٢٥): ﴿ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ ﴾ واتـە: (لـەو ڕۆژەدا) پاداشـتی کردەوەکانیـان دەداتـەوە، پاداشـتێکی تـەواو دادپەروەریانـە، پاداشـتی کردەوەکانیـان دەبیننـەوە زۆر بـە چاکـی هیچـی لـێ کەمنەکـراوە ﴿ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ٤٩ ﴾ الكهف

(واتـە: ئـای هـاوار بـۆ ئێمـە، ئـەم نامـەو دەفتـەرە چیـە؟ هیـچ کردەوەیەکـی گـەورەو

بچووکی بەجێ نەهێشتووەو تۆماری کردوە، هەر کردەوەیەکیان کردبێ تیایدا ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات) لەو کاتە مەزنو نارەحەتەدا دەزانن کە هەر خوا حەقی ئاشکراو دیارەو حەقو ڕاستی تەنها لە لای ئەوە. هەموو وەسفە مەزنەکانی حەقەو کردەوەکانیشی حەقن، بەندایەتی بۆ کردنیش تەنها بۆ ئەو حەقە، گەیشتن بە دیداری حەقە، پەیمانو هەڕەشەو حوکمی ئاینیو پاداشتی حەقن، پێغەمبەرانی حەقن، هیچ حەقێک نیە تەنها لە لای خوا نەبێ.

(٢٦): ﴿ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ﴾ واتە: هەموو پیسو ناپاکەکان لە پیاوانو ئافرەتان، گوفتارو کردارەکان، هاوتاو گونجاوە هاوشێوەیە بۆ پیس، وە هەموو پاکەکان لە پیاوانو ئافرەتانو قسەو کردەوەکان هاوتاو گونجاوەو هاوشێوەیە بۆ پاک.

ئەمە دەستەواژەیەکی گشتیو کورت هەڵهێنراوە، هیچ شتێکی لێدەرناچێ، لە مەزنترین موفرەداتەکانی پێغەمبەران بە تایبەت، لە ناو ئەوانیدا خاوەن عەزمەکان بە تایبەت، لەناو ئەوانیشدا موحەممەد ﷺ کە بەڕێزترینی چاکە خوازانن لە دروستکراوەکان بە ڕەهایی، شایستە نیە بە ئەوان هەموو ئافرەتانێکی پاک نەبێ.

جا لەکەدار کردنی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بەم جۆرە لەکەدار کردنی پێغەمبەرە ﷺ، لەو بوختانەشدا تەنها ئەوە ئامانجی ڕاستەقینەی دوو ڕووەکان بوو، تەنها بوونی بە خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بەسە بۆ ئەوەی پاکە لەو کارە ناشرینەدا.

چۆن دەبێ عائیشە ڕاستگۆترینو بەرێزترینو زاناترینو چاکترینی ناو ئافرەتەکانە، خۆشەویستی پەیامبەری پەروەردگاری جیهانیانە، پەیامی بۆ دانەبەزیوە مەگەر لە پاڵ یەکێک لە خێزانەکانیدا بووە.

پاشان بە ڕوونی باسی ئەوەی کرد، قسەی ئەوانە بیرێ شوێنی پووچ کەوتوون، وە هیچ گومانو دوو دڵیەک نەهێڵێتەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ﴾ واتە: (ئەو پاکانە بەریکراون لەو تۆمەتانەی ناپاکان دەیڵێن) ئاماژەیە بۆ عائیشە وەکو بنەمایەک، وە بۆ سەرجەم ئافرەتانی بڕواداری داوێن پاک

﴿ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ ﴾ هەمــوو تاوانــەکان ﴿ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴾ واتــە: ڕزقو ڕۆزی چــاک لــە بەهەشــتدا لەلایــەن پەروەردگــاری بەخشــندەوە.

(٢٧-٢٩): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ٢٩ ﴾:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ ﴾ خــوا ﷻ ڕێنمایــی بەنــدە بڕوادارەکانــی دەکات کــە نەچنــە هیــچ ماڵێکــەوە جگــە لــە ماڵەکانــی خۆیــان بەبــێ مۆڵــەت وەرگرتــن، چونکــە لەمــەدا چەندیــن مەفســەدەو خراپــەکاری لەخــۆ دەگــرێ:

یەکــەم: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتــی: {إِنَّمَا جُعِلَ الإِسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ} (أخرجه أحمد برقم: (٢٢٨٥٤)، والبخاري برقم: (٥٨٨٧)، ومسلم برقم: (٢١٥٦)) واتــە: مۆڵــەت وەرگرتــن دانــراوە لــە پێنــاو بینینــدا)، بــە هــۆی مۆڵــەت وەرنەگرتنــەوە چــاو دەچێتــە ســەر عەورەتــەکان کــە لــە نــاو ماڵەکاندایــە، چونکــە مــاڵ بــۆ مــرۆڤ لــە داپۆشــینی عەورەتــدا وەکــو جــلو بــەرگ وایــە کــە چــۆن عــەورەت دادەپۆشــن.

دووەم: ئــەوە دەبێتــە مایــەی گومــانو دوودڵــی، وە تۆمەتبــار دەکــرێ بــە شــەڕو خراپــە دزی کــردن بــێ یــان جگــە لــەوە، چونکــە چوونــە نــاو مــاڵ بــە نهێنــی بەڵگەیــە لەســەر شــەڕو خراپــە، خــوا ﷻ قەدەغــەی کــردوە لــە بــڕواداران کــە بچنــە نێــو هەرماڵێکــەوە بەبــێ مۆڵــەت وەرگرتــن بێجگــە لــە ماڵی خۆیــان، لەبەرئــەوە (الاستئذان) بــە (استئناس) هاتــووە، چونکــە بــەو هۆیــەوە خۆشــیو هاودەمــی بەرهــەم دێ، وە بــە نەبوونــی نارەحەتــیو ناخۆشــی دەســتەبەر دەبــێ ﴿ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾ شــێوەی ئــەو ســڵاوکردنە لــە فەرمــوودەدا هاتــوە: {السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟} (أخرجه البخاري في «الأدب المفرد» برقم: (١٠٨١)) واتــە: ســڵاوی خواتــان لەســەربێ ئایــا بێمــە ژوورەوە؟

﴿ ذَٰلِكُمۡ ﴾ داواکردنــی ڕێگەپێــدان کــە لــە پێشــەوە باســکرا ﴿ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ چونکــە چەندیــن بەرژەوەنــدی دەگرێتــەوە، ئــەوە لــە ڕەوشــتە چــاکو پێویســتەکانە، ئەگــەر مۆڵەتیــدا ئــەوە مۆڵــەت پێــدراو دەچێتــە ژوورەوە


فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ
وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا
تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا
غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا
تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا
فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾
وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ
فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ
بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ
أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ
أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ
أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ
الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ
وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا
إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾

﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا﴾ واتە: (ئنجا ئەگەر کەستان نەدی تیایدا ئەوە مەچنە ژوورەوە بۆ ئەو ماڵە هەتا مۆڵەتتان پێدەدرێ، وە ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە ئەبێ بگەڕێنەوە)، واتە: ڕێگری مەکەن لە گەڕانەوەو تووڕە مەبن لێی، چونکە خاوەن ماڵ ڕێگری شتێکی لە ئێوە نەکردوە کە مافی خۆتان بێ، بەڵکو ئەو سەرپشکە، ئەگەر ویستی ڕێگە دەدات یان ڕێگە نادات، نابێ کەسێ لەئێوە لەم حاڵەتەدا خۆبەزلزانیو لووت بەرزی تووشی بێ ﴿هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ﴾ چاکترە بۆ پاکبوونەوەتان لە گوناهەکان، وە پاداشتانیش زیاد دەکات ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ پاداشتی هەموو کەسێ دەداتەوە بە پێی کردەوەکەی لە زۆریو کەمی، وە چاکەو نەبوون. ئەم حوکمو بریارە بۆ ئەو ماڵانەیە کە خەڵکی تێدایە جا یەکسانە ئەگەر کەلو پەلی خەڵکی تێدابێ یان تێدا نەبێ، وە ئەو ماڵانەش کە کەسی تێدا نیەو کەلو پەلیشی تێدا نیە. بەڵام ئەو ماڵانەی کە خاوەنەکەی تێدانیە، وە کەلو پەلی کەسێکی تێدایە کە پێویست بووە بیخاتە ئەو ماڵە، لە کاتێکدا ئەو ماڵە هیچ کەسێکیان تێدانیە داوای مۆڵەتیان لێبکات، ئەویش وەک ئەو ماڵانەی کڕینو فرۆشتنی تێدا دەکەنو جگە لە ئەویش، خوا ﷻ باسی کردووەو فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ واتە: هیچ گوناهو تاوانێکتان لەسەر نیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چوونە نێو ماڵ بەبێ ڕێگەپێدان لەو ماڵانەی کە خەڵکی تێدایە حەرامەو دروست نیە، ﴿أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ﴾(واتە: کە بچنە ئەو ماڵانەی کەسی تیا نیشتەجێ نیەو کەلو پەلی خۆتانی تێدابێ)، ئەمە لە خۆپاراستنە سەرسووڕهێنەرەکانی قورئانە، چونکە خوا ﷻ

دەفەرمـوێ: ﴿ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ ﴾ بێژەیەکـی گشـتیە بـۆ هەمـوو مـاڵێ موڵکـی خەڵکـی نەبـێ، خـوای گـەورە ئـەو ماڵـەی دەرهێنـاوە کـە موڵکـی نیـەو کـەلو پەلـی تێـدا دانـاوەو کەسیشـی تێـدا نیشـتەجێ نیـە، لەمـەدا تاوانـی هەڵگرتـووە بـۆ چوونـە ژورەوە، ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴾ واتـە: خـوا دەزانـێ بـە بارودۆخـی ئاشـکراو نهێنیتـان، وە دەزانـێ بـە بەرژەوەندیەکانتـان، ئـا لەبـەر ئەمەیـە یاسـای بـۆ دانـاون، ئـەوەی کـە پێویسـتان پێیەتـیو ناچـارن بـۆی لـە حوکـمو بڕیـارە شـەرعیەکان.

(٣٠): ﴿ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ٣٠ ﴾:

﴿ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ ڕێنمایـی بـڕواداران بکـەو پێیـان بڵـێ: ئەوانـەی بڕوایـان هەیـەو ئـەو بڕوایـە ڕێگریـان لێـدەکات لـەوەی پێچەوانـەی ئیمـان بجوڵێنـەوە ﴿ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ ﴾ واتـە: (چـاوی خۆیـان) لـە تەماشـا کردنـی عەورەتـەکان بپارێـزن، وە تەماشـا کردنـی ئافرەتانـی بێگانـە، وە لـەو منداڵـە دەم ڕووتانـەی کـە مەترسـی فیتنەیـان لێدەکـرێ، وە لـە زینـەتو جوانـی دونیـا کـە مـرۆڤ تووشـی فیتنـە دەکاو دەیخاتـە نێو مەترسـیەوە ﴿ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡ ﴾ (واتـە: عەورەتیـان) لـە داوێـن پیسـی بپارێـزن، لـە دواوە یـان لـە پێشـەوە یـان خـواری ئـەوەش، وە لـە خۆگرتـن لـە دەسـت لێدانـیو تەماشـا کردنـی ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو پاراسـتنەی چـاوو داوێنەمـان ﴿ أَزۡكَىٰ لَهُمۡ ﴾ پاکتـرو چاکتـرو بـە فەڕتـرە، بێگومـان هـەر کەسـێ داوێنـیو چـاوی بپارێـزێ، پـاک دەبێـت لـەو پیسـیەی کـە فاحیشـەکاران تووشـی بـوون، وە کردەوەکانیـش پـاک دەبـن، بـە هـۆی واز هێنـان لـە قەدەغەکـراو کـە نەفـسو دەروون حـەزی لێدەکـەنو بانگـی دەکـەن بـۆ لای، هەرکەسـێ لەبـەر خـوا واز لـە شـتێ بهێنـێ، خـوا بـۆی قەرەبـوو دەکاتـەوە بـە شـتێکی لـەوە چاکتـر، وە هـەر کەسـێ چـاوی بپۆشـێ لـە قەدەغەکـراو خـوا بینایـی ڕوونـاک دەکات، بێگومـان بەنـدە ئەگـەر داوێـنو چـاوی پاراسـت لـە قەدەغەکـراو سـەرەتاکانی، لەگـەڵ پاڵنـەری حـەزو ئـارەزوودا، ئـەوە پاراسـتنی بـۆ جگـە لـەو لـە پێشـترە، لەبـەر ئەمەیـە خـوا نـاوی نـاوە پاراسـتن، شـتی پارێـزراو ئەگـەر خاوەنەکـەی هەوڵـی پاراسـتنی نـەداتو هەمـوو هـۆکارەکان نەگرێتـە بـەر بـۆ پاراسـتنی، ئـەوە ناپارێـزێ، بـە هەمـان شـێوە چـاوو داوێنیـش، ئەگـەر خاوەنەکـەی

هـەوڵ نـەدات بـۆ پاراسـتنیان، تووشـیو بـەڵاو میحنەتـی دەکـەن.
﴿ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ ﴾ (واتـە: چـاوی خۆیـان لـە سـەیرکردنی نامەحـرەم بپارێـزن) ئەداتـی ﴿ مِنۡ ﴾ هێنـاوە، بەڵگەیـە لەسـەر هەندێـک، بێگومان دروسـتە تەماشـای هەندێ شـوێنی بکـرێ لـە هەنـدێ حاڵەتـدا لەبـەر پێویسـتیەک، وەک تەماشـا کردنی شـایەتو داواکـەر، وە هاوشـێوەی ئەوانـەش، پاشـان باسـی زانسـتی کـردوە بـە کردەوەکانیـان، لەبـەر ئـەوە هەوڵبـدەن نەفسو دەرونیـان بپارێـزن لـە قەدەغەکـراوەکان.

(٣١): ﴿ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١ ﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ فەرمانـی کـرد بـە بڕوادارانـی پیـاوان بـە پاراسـتنی چـاوەکانو پاراسـتنی داوێنـەکان، بەوشـێوەیە فەرمانـی کـرد بـە بڕوادارانـی ئافرەتـان، فەرمـووی: ﴿ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ ﴾ واتـە: (بڵـێ بـە ئافرەتانـی بـڕوادار) چاویـان دابخـەنو بپارێـزن لـە ئاسـتی عەورەتـەکانو پیـاوان، بـە حـەزو ئـارەوزوو هاوشـێوەی ئەوانـە لـە تەماشـا کردنـی قەدەغەکـراو، ﴿ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ (واتـە: داوێنیـان بپارێـزن) لـە جیمـاع، یـان دەسـت لێـدان، یـان تەماشـا کردنـی کەسـی نامەحـرەم بـۆی، ﴿ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ (واتـە: جوانـی خۆیـان دەرنەخـەن)، وەک جـلو بەرگـی جـوانو خۆڕازاندنـەوەو، هەمـوو جەسـتە زینـەتو جوانیـە.

دوای ئـەوەی جـلو بەرگـی ڕواڵـەت هـەر دەبـێ بپۆشـرێ، فەرمـووی: ﴿ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ ﴾ واتـە: جـلو بەرگـی ڕواڵـەت کـە دابـوو نەریـت خـوی پێـوە گرتـوە، بـە مەرجێـک لەبـەر کردنـی ئـەو جـلو بەرگـە نەبێتـە مایـەی فیتنـە بـۆی ﴿ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ ﴾ (واتـە: بـا سەرپۆشـەکانیان بـدەن بـە سـینگو بەرۆکیانـدا) ئەمـە بـۆ تـەواو کردنـی داپۆشـینە، ئـەوە دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەو زینەتـەی کـە قەدەغەیـە دەربخـرێ، هەمـوو جەسـتە دەچێتـە نێویـەوە، هـەر وەک باسـمان کـرد،

پاشـان قەدەغەکردنـی دووبـارە کردوەتـەوە لـە دەرخسـتنی جوانیەکانیـان، بـۆ ئـەوەی جیـای بکاتـەوە لێـی، فەرموویەتـی: ﴿إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ واتـە: مێردەکانیـان ﴿أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ بـاوکـو باپیـرە دەگرێتـەوە، ﴿أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ وە منداڵەکانـی خـۆیو منداڵـی پیاوەکـەی دەگرێتـەوە، هەتـا بـڕوا بـۆ خـوارەوە ﴿أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾ بـرای دایـکو باوکـی، یـان بـرای باوکـی، یـان بـرای دایکـی ﴿أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ﴾ واتـە: (یـان کـوڕی خوشـکەکانی) دروسـتە بـۆ ئافرەتـان هەندێکیـان سـەیری هەندێکـی دیکەیـان بکـەن بەرەهایـی، وە دەگونجـی دانەپـاڵ ڕەگەزیـان بخـوازی، واتـە: ئـەو ئافرەتانـەی مسـوڵمانن لـە ڕەگەزتانـن، ئەمـە دەبێتـە بەڵگـە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە وتوویەتـی: دروسـت نیـە ئافرەتـی مسـوڵمان ئافرەتێکـی بێبـڕوای زمـی تەماشـای بـکات ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ﴾ دروسـتە بـۆ کەنیـزەک ئەگـەر مێینـە بـوو تەماشـای ئـەو ئافرەتـە بـکات کـە گەورەیەتـی، مـادام لـە موڵکایەتـی ئـەو دایـە، ئەگـەر لـە موڵکایەتـی ئـەودا نەمـا بـە گشـتی، یـان هەندێکـی ئـەوە دروسـت نیـە تەماشـای بـکات.

﴿أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾ واتـە: یـان ئـەو شـوێنکەوتەو پیاوانـەی کـە بـێ نیـازن لـە ئافـرەتو ئارەزوویـان ناجوڵـێ، وەکـو گێـلو گەمـژە کـە نازانـێ عەورەتـی لـە کوێیـە، وە وەک ئەوانـەی ئالەتەکەیـان بڕاوەتـەوەو حـەزوو ئارەزوویـان ناجوڵـێ نـە لـە داوێـنو نەلـە دڵـدا، ئەمـە هیـچ مەترسـیەک نیـە لـە تەماشـاکردنیاندا.

﴿أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ﴾ واتـە: ئـەو منداڵانـەی نەگەیشـتوونەتە قۆناغـی جیاکردنـەوە، ئـەوە دروسـتە تەماشـای ئافرەتـی بێگانـە بکـەن، خـوا ﷻ هـۆکاری ئەمـەی باسـکردوە بـەوەی کـە ئـەوان ئاگایـان لـە لـەشو عەورەتـی ئافرەتـان نیـە، وە هیـچ ئارەزوویـان بـۆی ناجوڵـێ، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی منداڵـێ کـە شـت لەیەکتـر جیادەکاتـەوە ئافـرەت دەبـێ خـۆی لێـی بپۆشـێ، چونکـە ئاگـای هەیـە لـە عەورەتـی ئافرەتـان ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ واتـە: بـا ئافرەتـان لـە کاتـی ڕۆیشـتندا قاچیـان نـەدەن بـە زەویـدا، تـا دەنگـی خرخاڵەکانیـان بێـت، جوانـی دەردەکـەوێ بـەو هۆیـەوە، ئـەوە دەبێتـە هـۆکارو وەسـیلەیەک بـۆ فیتنـە، ئـا لـە مـەو هاوشـێوەکانی یاسـای ڕێگـری کـردن لـە هـۆکارەکان وەردەگیـرێ، کارێـک ئەگـەر موبـاحو دروسـت بـێ، بـەڵام بـەرەو لای

کاری قەدەغەکراو بیبیا یان مەترسی ئەوەی لێبکرێ بخزێتە ناوی ئەوە ڕێگری لێدەکرێ، جا لێدانی قاچ بە زەویدا لە بنەڕەتدا دروستو موباحە، بەڵام کاتێک دەبێتە هۆکارێک بۆ زینەتو جوانی ڕێگری لێدەکرێ.

دوای ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی کرد بەم فەرمانە چاکانە، وە بەم شێوە جوانە ئامۆژگاری کرد، بێگومان هەر دەبێ کەسی بڕوادار تووشی کەمتەرخەمی بێ تیایدا، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە تەوبەکردن، فەرموویەتی: ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ چونکە بڕوادار ئیمانو بڕواکەی بانگی دەکات بۆ تەوبەکردن، پاشان خوا ﷻ تەوبەکردنی گرێداوە بە سەرکەوتنەوە فەرموویەتی: ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ هیچ ڕێگایەک نیە بۆ سەرکەوتن تەنها بە تەوبە کردن نەبێ، ئەویش وازهێنانە لەوەی کە خوا ﷻ پێی ناخۆشە بە ئاشکراو نهێنی، وە ئەنجامدانی ئەوەی خوا ﷻ پێی خۆشە بە ئاشکراو بە نهێنی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو بڕوادارێک پێویستی بە تەوبە کردن هەیە، چونکە خوا ﷻ لەگەڵ هەموو بڕوادارانـدا دەدوێ، وە دەبێتە بەڵگە لەسەر هاندانی دڵسۆزی بە تەوبەکردن، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: (هەمووتان تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ) نەک بۆ مەبەستێکی دیکە، لەبەر سەلامەتی لە بەڵاو ناخۆشیەکانی دنیا، یان لەبەر ڕیاو ڕووپامایی سومعەت، یان هاوشێوەی ئەوانە لە مەبەستو نیەتە خراپەکان.

وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن
يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾
وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ
وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ
عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا۟
فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟
مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ
ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ
لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ
نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ
لِلنَّاسِ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ
وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ﴿٣٦﴾

(٣٢-٣٣): ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾

﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ ﴾ خوا ﷻ فەرمان دەکات بە خاوەنو گەورەکان بە بەشوودانی ئەوانەی لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندان لەوانەی کە ژنیان نیە لە پیاوانو ئافرەتانی بێوەژنو کچان، پێویستە لەسەر نزیکو خاوەنی هەتیوو، بیدات بەشوو ئەوەی پێویستی بە بەشوودان هەیە، لەو کەسانەی کە نەفەقەیان لەسەریەتی، جا ئەگەر فەرمان پێکراون بە دانەشووی ئەوانەی لە ژێر دەستیان دان، ئەوە فەرمانکردن بەوەی خۆیان بیخوازن لە پێشترە.

﴿ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ﴾ (واتە: هەروەها ئەوانەی ئیماندارو چاکن لە کۆیلەو کەنیزەکەکان) دەگونجێ مەبەست لە ﴿ وَٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ چاکی لە دینداریی بێت، چاکەخواز لە کۆیلەو کەنیزەکەکان، ئەو کەسەیە فاجرو خراپ زیناکار نەبێ، گەورەکەی فەرمانی پێکراوە، ژنی بۆ بهێنێ، ئافرەتەکەش بدات بەشوو، وەک پاداشتێک بۆ چاکە خوازیەکەیو هاندانێک بۆی، بێگومان کەسی زیناکار زەواج کردن لەگەڵیدا قەدەغەکراوە، ئەمەش دەبێتە پشت بەست بۆ دەقەکەی پێشوو لە سەرەتای سووڕەتەکەدا، زەواج کردنی زیناکەرو زینا لەگەڵ کراو قەدەغەیە هەتا تەوبە نەکات، مەرجی چاکە بە تایبەتە کۆیلەو کەنیزەکەوە جگە لەوانەی ئازادن، چونکە ئەوە لەناو کۆیلەکاندا زۆرە.

وە دەگونجێ مەبەست لەوانەی گەیشتوونەتە کاتی زەواج کردنو پێویستیان پێیەتی، لە

کۆیلەو کەنیزەکەکان، پشتیوانی ئەم مانایە دەکات: گەورە فەرمانی پێنەکراوە بە ژنهێنان بۆ کۆیلەکەی، پێش ئەوەی پێویستی بە زەواج هەبێ، وە ئەو دوو مانایە دوور نین. خوا زاناترە.
﴿ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ ﴾ واتە: ئەوانەی ژن دەگوازنەوەو شوو دەکەن (ئەگەر هەژارو کەم دەست بوون)، ﴿ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ با ئەو خەیاڵە ڕێگریتان لێنەکات، یەکێکتان وابزانێ، ئەگەر زەواج بکات هەژار دەبێت بە هۆی زۆری خێزانو هاوشێوەکانی، وە هاندانی تێدایە لەسەر زەواج کردن، وە پەیماندان بەوەی ژن دەهێنێ بە دەوڵەمەندیو بێنیازی دوای هەژاری.
﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ ﴾ خاوەن خێرو چاکەی زۆرو مەزنە ﴿ عَلِيمٌ ﴾ زانایە بەوەی کێ شایستەی فەزڵو چاکەی دینو دونیایە، یان یەکێکیان، لەوەی کە شایستە نیە، دەیبەخشێ بە هەموو کەسێ بە پێی زانستو حیکمەتی خۆی، ﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ (واتە: وە دەبێ ئەوانەی کە توانای ئەرکی ژنهێنانیان نیە بە پاکی خۆیان ڕابگرن، تا خوا بە بەهرەی خۆی بێنیازیان دەکات)، ئەمە حوکمی کەسێکە توانای زەواجی نەبێ، خوا فەرمانی پێکردوە خۆی بە پاکی ڕابگرێت، دەست هەڵبگرێ لە قەدەغەکراو، وە ئەو هۆکارانەش بەکاربێنێ کە دەبێتە مایەی پاراستنی، لە دوورخستنەوەی پاڵنەرەکانی دڵی بەو بیرکردنەوانەی کە مەترسی ئەوەی لـێ دەکرێ تووشی ببێت، هەروەها ئەوەش دەکات وەک پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: {يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ! مَنِ اسْتَطَاعَ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٠٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٣٨٤)، وَالتِرمِذِيُّ برقم: (١٠٨١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٢٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٨٤٥)، عَبْد اللَّه بْنُ مَسْعُود).
واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەرکامێک لە ئێوە توانی (توانای جەستەیيو توانای دارایی بوو) با هاوسەرگیری ئەنجام بدات، چونکە ئەوە بۆ چاوی باشترە، وە بۆ داوێن پاکیشی چاکترە، وە هەر کەسێک نەیتوانی با ڕۆژوو بگرێ، ئەوە دەبێتە مایەی ئارەزوو کەمبوونەوەی (و قەڵغان بۆی).
کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا ﴾ واتە: توانای ژن هێنانیان نیە، یان بە بۆنەی هەژاریانەوە، یان بە بۆنەی هەژاری خاوەنو گەورەکانیان، یان گەورەکانیان ڕێگریان لێدەکەن لە ژنهێنان، ئەوانیش هیچ توانایەکیان نیە لەسەر ئەوە، جا ئەم وادانانە چاکترە لە وادانانی ئەوەی وایداناوە (لا يجدون مهر نكاح) واتە: ناتوانن پارەی مارەیی دیاری بکەن. ئەوانە (مضاف اليه)یان لە جێگای (مضاف) داناوە، بە ڕاستی لەمەدا دوو مەترسی هەیە:

یەکەمیان: لابردن لە قسەکردندا، چاکتر وایە لابردن نەبێ. ﴿ حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ واتە:خوا پەیمانی داوە بەو کەسەی خۆی پاک ڕادەگرێ، لە داهاتوویەکی نزیکدا دەوڵەمەندی دەکات‌و کاری بۆ ئاسان دەکات، وە فەرمانی پێ کردوە چاوەڕوانی دەرووی خێر بێت، لەبەر ئەوەی لەسەری قورس نەبێ ئەو دۆخەی کە تێدایە.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴾ واتە: ئەو لە کۆیلە یان کەنیزەکەی داوای نوسراوی ئازاد بوونتان لێدەکات، بۆ ئەوەی خۆ بکڕێتەوە، بچنە دەم داواکاریەکەیەوەو نووسراوی بۆ بکەن ﴿ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ ﴾ واتە: لەوانەی داوای نووسراو دەکەن ﴿ خَيْرًا ﴾ واتە: توانای کارکردنی هەبوو، وە بەرژەوەندی ئاینەکەی، چونکە لە نووسراو کردندا بەدەستهێنانی ئەم دوو بەرژەوەندیەیە، بەرژەوەندی ڕزگار بوون‌و ئازاد بوون، وە بەرژەوەندی لە لە جیاتی کە بریتیە لەوەی کۆیلە دەیدات بە گەورەکەی بۆ ئازاد کردنی خۆی، هەندێ جار کۆشش دەکات لە ماوەیەکی دیاریکراودا پارەکەی بۆ دابین دەکات، لەم کاتەدا خاوەنەکەی زیانی پێناگات نووسراوی بۆ بکات، لەگەڵ ئەوەی بەرژەوەندی مەزنی تێدایە بۆ کۆیلە، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە نووسراو کردن بەم جۆرە فەرمانە کە بۆ وجووبە، واتە: ئەرکەو پێویستە، وەک ڕواڵەتی دەقەکە وادەخوازێ، یان فەرمانەکە بۆ پەسند کردنە لەسەر بۆچوونێکی دیکە، وە فەرمانی کردوە بە هاوکاریان لەسەر نووسراو کردن بۆیان، لەبەر ئەوەی پێویستیان بەوە هەیەو ماڵ‌و سامانیان نیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَـٰكُمْ ﴾ دەچێتە نێو ئەمەوە خوا فەرمانی کردوە بە گەورەکەی کە نووسراوی بۆ کردوە، شتێکی پێببەخشێ لە نووسراوەکەی، یان هەندێ شتی لەسەر لاببات، وە فەرمانی کردوە بە خەڵکیش یارمەتی بدەن بۆ ئازا دکردنی. لەبەر ئەمەیە خوا بەشێکی لە زەکات داناوە بۆ ئەوانەی نووسراویان بۆ کراوە، وە هانیداون لەسەر پێدانی، بە فەرمایشتی: ﴿ مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَـٰكُمْ ﴾ واتە: هەروەکو چۆن ماڵ ماڵی خوایە، ئەوەشی لە دەستی ئێوەدایە بەخشێشکە لە لایەن خواوە، دەی کەواتە چاکەکار بن بۆ بەندەکانی خوا، هەر وەک چۆن خوا چاکە بۆتان.

مەفهومی دەقە پیرۆزەکە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کۆیلە ئەگەر داوای نووسراوی نەکرد، گەورەکەی فەرمانی پێناکات دەستپێشخەری بکات لە نووسراودا، ئەگەر نەیزانی خێری تێدایە، بەوەی دەزانی شەڕی تێدایە بۆی، یان دەزانی کۆیلەکەی هیچ کارو کەسابەتێکی بۆ نابێ، بە هۆی ئەوەوە دەبێتە بار بەسەر خەڵکەوە، یان دەترسێ لەوەی ئەگەر ئازاد کرا تووشی

خراپە دەبێ، لەبەر ئەمە فەرمان ناکات بە نووسراو کردن بۆی، بەڵکو قەدەغەی لێدەکاتو نووسراوی بۆ ناکات، چونکە مەترسی تێدایە وەک باسکرا.
پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ﴾ واتە: کەنیزەکانتان (ناچار مەکەن) ﴿عَلَى ٱلْبِغَآءِ﴾ واتە: لەسەر زینا کردن ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ (واتە: ئەگەر ئەیانویست داوێن پاک بن)، چونکە زۆر کردن لێی بەرجەستە نابێ بەم حاڵە نەبێ، بەڵام ئەگەر نەیویست داوێن پاک بێت، ئەوە دەبێتە داوێن پیس، پێویستە لەسەر گەورەکەی ڕێگری لێبکات لەو کارە، ئەمە قەدەغەکردنێکە لەو کارە دزێوە کە لە سەردەمی نەفامیدا ئەنجامیان دەدا، گەورەکەی زۆری لە کەنیزەکەکە دەکرد لەسەر داوێن پیسی لەگەڵ خەڵکیدا، لە پێناو ئەوەی پارەی کرێی داوێن پیسی وەربگرێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ (واتە: تا ماڵو سامانی دونیاتان دەست بکەوێ) شایستە نیە بە ئێوە کەنیزەکانتان لە ئێوە باشتر بن، خۆپارێزتر بن لە زینا کردن، وە ئێوە کاری لەو جۆرەیان پێ بکەن، لە پێناو بەدەستهێنانی ماڵو سامانی دونیا، چێژو لەززەتێکی کەمە دەخرێتە ڕوو پاشان نامێنێ.
با کەسابەتتان بریتی بێ لە دەستپاکیو ڕەوشت بەرزی چاکترە -بە تەماشا کردنی پاداشتی دوارۆژو سزاکەی- لە بەدەستهێنانی شتێکی کاتی کەم لە دنیادا، کە تووشی ڕیسواییو سووکیتان دەکات، پاشان بانگی ئەوانە دەکەن کە زۆریان لە کەنیزەکانیان کردوە بۆ کاری داوێن پیسی بۆ تەوبە کردنو گەڕانەوە، وەک فەرمویەتی: ﴿وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ با تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ، ئەو تاوانەیشی ئەنجامی داوە لە خۆی دابڕنێ کە دەبێتە مایەی تووڕەیی خوا ﷻ، ئەگەر ئەوەی کرد خوا لێی خۆش دەبێو ڕەحمی پێ دەکات، هەروەک ڕەحمی بە نەفسو دەروونی خۆی کردوە بە ڕزگاربوونی لە سزا، وە هەروەکو ڕەحمی لە ئۆممەتەکەی کردوە بە زۆر نەکردنی لە شتێک کە زیانی هەیە بۆی.
(٣٤): ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾﴾:
ئەمە بە مەزن دانانو گەورە دانانی ئەم دەقانەیە کە خوێندیەوە بەسەر بەندەکانیدا، بۆ ئەوەی قەدرو ڕێزی بزانن‌و بە جێبەجێ کردنی مافەکان هەڵسن، فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ﴾ واتە: (سوێند بە خوا بە ڕاستی ناردوومانەتە خوارەوە بۆ ئێوە) چەند ئایەتێکی ڕوونو ئاشکرا کە بەڵگەن لەسەر هەموو ئەوانەی ئێوە پێویستیتان پێیەتی لە بنچینەو

لق‌و پۆپەکان، بە جۆرێ هیچ ئالۆزی‌و شەک‌و گومانێکی تێدانیە، ﴿ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ ﴾واتە: وە چەند نموونەو بەسەرهاتی ئەو گەلانەی پێشین چاکە خوازو خراپەکاریان تێدا بوو، وە سیفاتی کردارەکانیان، ئەوەی کردیان‌و ئەوەی بەسەریاندا هات دەبێتە نموونەو پەند بۆ ئەو کەسانەی هەمان ڕەفتاری ئەوان دووبارە بکەنەوە، بە هەمان شێوەی ئەوانیش پاداشت دەدرێنەوە، ﴿ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴾واتە: دامان بەزاندوە بۆ ئەوەی ببێتە ئامۆژگاری بۆ لە خواترسان، لە پەیمان‌و هەڕەشەکردن، وە هاندان‌و ترساندن، ئامۆژگاریکاران پەندی لێوەر بگرن، واز لەوە بهێنن کە خوا ﷻ ڕقی لێیەتی، وە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەوەی خوا خۆشی دەوێ.

(٣٥): ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ ﴾

﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾(واتە: خوا نوورو ڕووناکیەو ڕووناککەرەوەی ئاسمانەکان‌و زەویە) ڕووناکیەکی هەستەوەری (الحسي) وە (معنوي) بێگومان خوا خودی خۆی نوورو ڕووناکیە، وە هەروەها حیجابەکەیشی ڕووناکیە، بەو ڕووناکیە ڕووناک بوەتەوە عەرش‌و کورسی‌و خۆرو مانگ‌و ڕووناکی، وە بەو ڕووناکیە بەهەشت ڕووناک بوەتەوە، بە هەمان شێوە ڕووناکی (معنوی) دەگەڕێتەوە بۆ خوا ﷻ، کتێبەکەی ڕووناکیە، شەریعەتەکەیشی ڕووناکیە، بڕواهێنان‌و ناسین لە دڵی پێغەمبەران‌و بەندە بڕوادارەکاندا ڕووناکیە، جا ئەگەر ڕووناکی خوا ﷻ نەبووایە ئەوە تاریکایی دادەپۆشی، لەبەرئەمەیە هەرشوێنێ ڕووناکی خوا لە دەست بدا ئەوە لە تاریکی‌و تەنگەتاویدایە ﴿ مَثَلُ نُورِهِۦ ﴾(واتە: وێنەی ڕووناک کردنەوەی خوا) کە هیدایەتی پێدەدا، ئەویش ڕووناکی ئیمان‌و قورئانە لە دڵی بڕواداراندا ﴿ كَمِشْكَوٰةٍ ﴾ واتە: وەک تاقێک وایە ﴿ فِيهَا مِصْبَاحٌ ﴾ (چرایەکی تێدا بێت) لەبەرئەوە تاقەکە ڕووناکی چراکە کۆدەکاتەوە بە جۆرێ پەرتەوازە نەبێ، ئەو ﴿ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ٱلزُّجَاجَةُ ﴾(واتە: ئەو چرایەش لە ناو شوشەیەکدا بێت، ئەو شوشەیەش) لەپاکی‌و بێگەردیدا ﴿ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ ﴾ وەک ئەستێرەیەکی گەش‌و پرشنگدار بێت ﴿ يُوقَدُ ﴾ ئەو چرایە کە لە ناو ئەو شووشە دایە دائەگیرسێ ﴿ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ ﴾ واتە: دائەگیرسێ بە ڕوونی لە درەختی زەیتوون کە ئاگرەکەی لە ڕووناکترینیانە ﴿ لَّا شَرْقِيَّةٍ ﴾ نە ڕۆژهەڵاتیە بە تەنها، واتە، خۆری کۆتایی

ڕۆژ بەری ناکەوێ ﴿ وَلَا غَرْبِيَّةٍ ﴾ نە ڕۆژئاواییە بە تەنها، خۆری سەرەتای بەیانیان لێی نادات، ئەگەر ئەم دووانەی لێ ڕەت بکرێتەوە ئەوە ناوەندە لە زەویدا وەک زەیتوونی شام، خۆر لێی دەدا لە سەرەتاو کۆتای ڕۆژدا، بۆیە دەبێتە زەیتوونێکی باش‌و چاک، بۆیە زەیتەکەیشی زۆر پاک‌و جوانە ﴿ يَكَادُ زَيْتُهَا ﴾ نزیکە ڕۆنەکەی لە پاکیدا ﴿ يُضِيٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ﴾ واتە: (دابگیرسێ با ئاگریشی بەرنەکەوێ) جا ئەگەر ئاگری بەرکەوت ڕووناک دەبێتەوە بە ڕووناک بوونەوەیەکی سەرسووڕهێنەر، ﴿ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ﴾ واتە: ڕووناکی ئاگرو ڕووناکی زەیتەکە.

ڕووی ئەم نموونەیە کە خوای گەورە هێناویەتیەوە، وەجێبەجێی کردوە لەسەر حاڵەتی بڕوادارو نووری خوا ﷻ لە دڵیدا، بێگومان ئەو سروشتەی کە خوا ﷻ لەسەری دروستی کردوە وەکو ڕۆنێکی پاک‌و پاڵفتە وایە، فیترەتی ئەو مرۆڤە پاکە ئامادەکراوە بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی خواو کارکردن بە شەریعەتەکەی، جا ئەگەر زانست‌و ئیمان پێی گەیشت ئەو نوورە لە دڵیدا گردەگرێ، وەک گرگرتنی فتیلە لە ناو شووشەدا، ئەو دڵی پاکە لە هەموو مەبەستێکی خراپ‌و تێگەیشتنێکی خراپ لە خوای گەورە، جا ئەگەر ئیمانی پێگەیشت ڕووناک دەبێتەوە بە ڕووناک بوونەوەیەکی مەزن، چونکە هیچ خەڵتەیەکی پێوەنیە، ئەویش وەکو پاکی شووشەیەکی پرشنگدارە، نووری فیترەت‌و نووری ئیمان‌و نووری زانست کۆدەبێتەوەو دەبێت بە ڕووناکی لەسەر ڕووناکی.

کاتێ کە زانرا ئەمە ڕووناکی خوای گەورەیە، وە هەموو کەسێک شایستەی ئەو ڕووناکیە نیە، خوا فەرمووی: ﴿ يَهْدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾ لەوانەی کە خوا ﷻ دەزانێ پاک‌و خاوێنن لەگەڵ ئەو هیدایەتەدا پاک‌و خاوێنیان نەش‌و نما دەکات ﴿ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ﴾ واتە: (خوا ﷻ چەندین نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی) بۆ ئەوەی عاقڵ بن‌و لێی تێبگەن، ئەمەش بەزەیی‌و چاکەی خوایە بەرانبەریان، وە بۆ ئەوەی حەق‌و ڕاستی ڕوون بێتەوە لە ناهەق، بێگومان نموونەکان مانا عەقڵیەکان نزیک دەکەنەوە لە هەستەوەریەکان، بۆیە بەندەکان لێی تێدەگەن‌و دەیزانن بە شێوەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ زانستی خوا ﷻ دەوری هەموو شتێکی داوە، جا بزانن نموونە هێنانەوەی، بۆ ئەو کەسانەیە کە حەقیقەت‌و وردەکاری شتەکان دەزانن، وە ئەوانە بەرژەوەندی بەندەکانی تێدایە، باسەرقاڵ بوونیان بە بیرکردنەوە بێ نەک بە پشتێکردن‌و دژایەتیکردنی، چونکە بێگومان ئەوەی خوا دەیزانێ ئێوە نایزانن.

وە کاتێ ڕووناکی ئیمانو قورئان بە زۆری هۆکارەکانی لە مزگەوتەکاندا دەبینرێ، باسی کردوە وەک ئاگادار کردنەوەیەک ناوی هێناوە، جا فەرموویەتی:

(٣٦-٣٨): ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ ﴾:

بەندایەتی دەکرێ بۆ خوا ﷻ ﴿ فِي بُيُوتٍ ﴾ (لە مزگەوتانێکی) بەڕێزو مەزندا کە خۆشەویسترین شوێنن لە لای خوا، ﴿ أَذِنَ اللَّهُ ﴾ واتە: فەرمانو وەسیەتی کردوە ﴿ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ ﴾ (کە بە گەورەو پاک ڕابگیرێ زیکرو یادی خوای تێدا بکرێ)، ئەمە هەموو ئەحکامو بڕیاری مزگەوتەکان دەگرێتەخۆ، دەچێتە نێو بە گەورە دانانیەوە دروست کردنو پاک کردنەوەی لە پیسو پۆخڵی، وە پاراستنی لە شێتو منداڵ، ئەوانەی کە خۆیان ناپارێزن لە پیسیو پۆخڵی، وە لە کەسی بێبروا، وە دەبێ گاڵتەجاڕیو قسەی پڕوپووچی تێدا نەکرێو دەنگی تێدا بەرز نەکرێتەوە جگە لە یادی خوا ﷻ نەبێ ﴿ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ ﴾ (واتە: زیکرو یادی خوای تێدا بکرێ)، دەچێتە نێو ئەوەوە هەموو نوێژە فەرزو سونەتەکان، وە خوێندنەوەی قورئانو تەسبیحو تەهلیل کردن، جگە لەوانەش هەموو جۆرەکانی تری یادکردنەوە، وە فێربوونی زانستو فێرکردن، وە ئیعتیکاف کردن تیایدا، وە جگە لەو عیبادەتانەش کە لە مزگەوتەکاندا دەکرێن، بۆیە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت دوو جۆرە: ئاوەدانکردنەوەی بە بوونیاتنانو نۆژەنکردنەوەی، وە ئاوەدانکردنەوەی بە یادی خوا ﷻ لە نوێژو جگە لەوانیش، ئەمە بەڕێزترینی ئەو دوو بەشەیە.

لەبەر ئەمەیە پێنج نوێژەکەو نوێژی جومعە لە مزگەوتەکاندا دیاریکراوە وەک پێویستو ئەرک لەلای هەندێ لە زانایان، یان وەک سونەتو پەسند بە لای هەندێکی دیکەوە.

پاشان خوا ﷻ وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە بە عیبادەت ئاوەدانی دەکەنەوە فەرموویەتی: ﴿ يُسَبِّحُ لَهُ ﴾ تەسبیحاتی خوا دەکەن بە دڵسۆزیەوە، لەو مزگەوتانەدا ﴿ بِالْغُدُوِّ ﴾ سەرەتای ڕۆژ ﴿ وَالْآصَالِ ﴾ کۆتایی ڕۆژ ﴿ رِجَالٌ ﴾ (پیاوانێکن) بۆیە ئەم دوو کاتەی دیاریکردوە لەبەر شەرەفو ڕێزیان، وە لەبەر ئەوەی خەڵکی لەو کاتەدا، وە لەبەر ئاسان ڕۆیشتن لەو دوو کاتەدا بۆ لای خوا ﷻ.

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ
وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾
لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ
يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ
بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا
وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾
أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ
سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ
يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ
ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ
قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى
سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ
وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾

وە دەچێتــە نێویــەوە زیكــر كــردن لــە ناو نوێــژداو جگــە لــەوەش، ئــا لەبــەر ئەمەیە زیكــری بەیانیــانو ئێواران دانــراوە لەو دوو كاتــەدا، واتــە: پیاوانێــك یادی خــوای تێدا دەكەنەوە، جــا چ پیاوانێك، نــەك ئەوانەی لــەززەتو خۆشــی دونیــا دەدەن بەســەر یــادی پەروەردگــاردا، وە نــە بازرگانــیو كاروكەســابەت دەكات بێئاگایــان دەكات لە یــادی خــوا ﴿ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ ﴾ (واتە: كڕیــنو فرۆشــتن بێئاگایــان نــاكات) ئەمە هەمــوو كڕیــنو فرۆشــتنو كەســابەتێك دەگرێتــەوە مەبەســت پێــی لــە جیاتــی بێ، ئــەو كات وتــەی خــوا ﷻ ﴿ وَلَا بَيْعٌ ﴾ لە بەشــی عەتفــی تایبــەت بەســەر گشــتیەوە، لەبــەر زۆری ســەرقاڵبوون بە كڕینو فرۆشــتن بەســەر ئەوانــی ترەوە، ئــەو پیاوانە ئەگەرچی بازرگانــیو كڕیــنو فرۆشــتن بكــەن ئەوە هیــچ خراپەیەكی تێدانیــە، بەڵام لە هەمــان كاتدا بێئاگایــان نــاكات لــە یادی خوا، بــەوەی كە پێشــی بخەن بەســەر ﴿ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾ (واتــە: یــادی خواو نوێژ كــردنو زەكات دان) بەڵكــو گوێڕایەڵیو بەندایەتی كــردن بۆ خــوا گرنگترینو ئەوپەڕی مەبەســتەكانە، هەر شــتێك ببێتە بەربەســت لــە نێوانی ئــەوانو یــادی خــوادا ڕەتــی دەكەنــەوەو وازی لــێ دێنن.

كاتــێ وازهێنــان لــە دونیا قــورسو گرانە لەســەر دەروونــەكان، لــە بەرانبــەردا بازرگانی بە هەموو جۆرەكانیەوەو بەدەســتهێنانی ماڵو ســامان خۆشەویســتە لە لای، وە بە زۆری وازهێنان لێــی كارێكی قوورســە بەســەر دەروونەوە، هــەوڵ ئــەدات مافەكانی خوا پێش بخات بەســەر هەمــوو ئەوانــەدا، خوا ﷻ باســی هۆكاری ئــەوەی كردوە كــە بانگی دەكات بۆ پێشخســتنی یــادی خــوا بەســەر هەموو شــتێكی دیكــەدا وەك هانــدانو ترســاندنێك، جــا فەرموویەتی: ﴿ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ (واتــە: لــە ڕۆژێــك دەترســن دڵو چــاوەكان تێیــدا دەگۆڕێــن) لــە توندی ناخۆشــیو بێــزاری دڵو دەروونو جەســتەكان، ئا

لەبەرئـەوە لـەو ڕۆژە ترسـاون، کاری چاکیشـیان بـۆ ئاسـانکراوە، وە وازیان لە هەرشـتێک هێنـاوە سـەرقاڵیان بکات لـە یادی خـوا ﷻ، ﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾ مەبەسـت لە ﴿أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾ کـردەوە چاکەکانیانـە، چونکە ئەوە چاکترین شـتە کـە ئەنجامیانداوە لـە ژیانیانـدا، لەبەرئـەوەی ئـەوان کاری پەسـندو ڕێگەپێدراویان کـردوە، پاداشـتیش نابێ مەگـەر بۆ کـردەوەی چاک نەبـێ، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾الزمر، (واتـە: تا خـوا لێـان بسـڕێتەوە خراپتریـن کردەوەیـەک کـە کردوویانـە، وە پاداشـتیان بداتەوە بە چاکترین ئـەو کردەوانـەی کردوویانە).

﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ﴾ (واتـە: لـە بەهـرەی خـۆی) زیادەیەکـی زۆرو بـێ ئەندازەیـان دەداتـەوە زیاتـر لـە پاداشـتی بەرانبـەر بـۆ کردەوەکانیـان ﴿وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەوەنـدە پاداشـتی دەداتـەوە کـە کردەوەکانـی هەرگیز پێـی ناگـەن، بەڵکو لە حـەزوو ئاواتەکانـی بەدەرەو پێی ناگەن، وە ئەوەندە پاداشـتی پێدەبەخشـێ کـە نەدەژمێرێ‌و نـە پێوانـە دەکـرێ، ئەمـە کینایەیە لـە زۆری پاداشـتی.

(٣٩-٤٠): ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ ۗ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾:

ئەمـە دوو نموونەیـە خـوا ﷻ هێناویەتیەوە دەربـارەی پووچی‌و نەمانی کـردەوەی بێبڕوایان، وە ئـاخ هەڵکێشـانیان بۆ ئـەو کردەوانەی کـە کردوویانە.

نموونـەی یەکـەم: خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ (ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون) بـە پەروەردگاریـان‌و پێغەمبەرانیـان بـە درۆخسـتەوە ﴿أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ﴾ واتـە: (کردەوەکانیـان وەکـو سـەرابێک وایـە) لـە بیابانێکـدا، نـەداری تێدابـێ‌و نـە سـەوزایی ﴿يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً﴾ کەسـێکی زۆر تینـوو وا دەزانـێ ئـاوە، کـە جگـە لـەو کـەس ئـەو خەیاڵـە ناکات، چونکـە ئەو کەسـە زۆر تینوویەتی، بەڕاسـتی ئەمـە وازانینێکی پووچە، ئـەوە دەکات بـۆ ئـەوەی تینوێتـی بشـکێ، ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا﴾ (واتە: کاتێ دەگاتـە لای هیـچ بـەدی نـاکات) پەشـیمان دەبێتـەوە پەشـیمان بوونەوەیەکـی توووند، وە تینوێتیەکـەی زیـاد دەکات بـە هـۆی پچڕانـی ئومێدەکەی.

بـە هەمـان شـێوە کـردەوەی بێبڕوایـان هـەر وەکـو سـەرابە، کەسـی نەفـام کە ئاگـای لە کاروبـارەکان نیـە وادەبینـێ کردەوەیەکـی بەسـوودە، وێنـەی سەرسـامی دەکاتو خەیاڵی بـەلای خۆیـدا ڕادەکێشـی، هەروەها ئـەو وادەزانێ ئـەو کردەوەیە بەسـوودە بـە پێی هەواو ئـارەزووی، هەروەهـا ئـەو کەسـە وادەزانـێ پێویسـتی پێیەتی بەڵکـو ناچـارە، وەک ناچار بوونـی کەسـێکی تینوو بـۆ ئاو، تا کاتێ لـە ڕۆژی پاداشـتدانەوەدا کردەوەکانـی دەبینێتەوە، تەماشـا دەکات لە کیس چووە، هیچ نابینێتـەوە، بەڵکو ﴿ وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ﴾ (واتـە: لـە قیامەتـدا دەبینێ خـوا ئامادەیە لـە لایدا، ئنجـا خوا بە چاکـی پاداشـتی دەداتەوە) کردەوەکانـی سـووک نەکراوەتـەوە نە بە ئەنـدازەی توێکڵـی دەنکە خورمایـەک، وە نە بە ئەنـدازەی توێکڵـی سـپی ناوکـی خورمایەک، وە هیچـی لـێ لانابرێت کەم بێ یـان زۆر. ﴿ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ بـا نەفامـەکان ئـەو پەیمانە بـە دوور نەزانن، بێگومـان هەر دەبێ پێـی بگـەن، خـوا ﷻ نموونـەی کردەوەکانیانـی هێناوەتەوە بە سـەرابێک لـە بیابانێکدا هیچ دارو سـەوزایی تێـدا نەڕوابـێ، ئەمـە نموونەیـە بـۆ دڵەکانیان، هیـچ خێرو چاکەیەکـی تێدا نیـە، تـا کردەوەکانیـان نـەشو نمـا بـکات، ئەویـش بـە هـۆی هۆکاریکی بەربەسـت کە بریتیە لـە کوفر.

نموونەی دووەم: بۆ بەتاڵ بوونەوەی کردەوەی بێبڕوایانە ﴿ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ ﴾ (واتە: یا کردەوەی بێبڕوایان وەک چەند تاریکیەک وایە لەناو دەریایەکی) زۆر قووڵو درێژدا ﴿ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ ﴾ تاریکی ناو دەریا، پاشان تاریکی شەپۆل لەسەر شەپۆل، پاشان لە سەرووی ئەو شەپۆلەشەوە هەورێکی ڕەشی پڕ لە باران، پاشان لە سەرووی ئەوەشەوە تاریکیەکان نیشتبنە سەر یەکتری، تاریکاییەکە بە تەواوی چڕ دەبێ، بە جۆرێ مرۆڤ لەو کاتەدا ﴿ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ﴾ (واتە: ئەگەر دەستی دەربهێنێ دەستی خۆی نابینێ) لەگەڵ ئەوەی چەندە نزیکە لێیەوە، دەبێ جگە لە خۆی چۆن ببینێ، بە هەمان شێوە بێبڕوایانیش، تاریکی لەسەر تاریکی دڵی داپۆشیون، تاریکی ئەو سروشتەی کە هیچ خێرێکی تێدانیە، لەسەرووی ئەو تاریکیەشەوە تاریکی کوفر، لەسەرووی ئەوەشەوە تاریکی نەفامی، لە سەرووی ئەوەشەوە تاریکی ئەو کردەوانەی کە کردوویەتی دەربارەی ئەوەی باسکرا، لە تاریکیدا ماونەتەوە بە سەرسامیەوە، وە لە بێ ئاگاییو سەر لێشێواویشدان، وە لە ڕێگای ڕاست پشتیان هەڵکردووەو ڕوویان کردوەتە ڕێگاکانی گومڕایی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە خوا سووکو ڕیسوای کردوونو لە نوور ڕووناکی خۆی

بێبەشی کردوون ﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾ (واتە: جا هەر کەسێ خوا نووری ئیمانی پێنەبەخشی بێ، ئەوەی ڕووناکی بێت نیەتی)، چونکە نەفس و دەروونی ستەمکارو نەفامە، هیچ خێرو ڕووناکیەکی تێدانیە، جگە لەوە نەبێ خوا پێی بەخشیوەو خەلاتی کردوە.

دەگونجێ ئـەم دوو نموونەیـە بۆ کردەوەی هەمـوو بێبڕواکان بـێ جێبەجێ بێ بەسـەریاندا، وە ژماردوویەتـی بـە ژماردنـی وەسـفەکان، وە دەگونجـێ هـەر یـەک لـەو دوو نموونە بۆ دەسـتەو تاقمێک بێت:

نموونەی یەکەم: بۆ سەرکردەو دەسەلاتدارەکانە، ئەوانەی خەڵکی شوێنیان دەکەون.

نموونەی دووەم: بۆ ژێر دەستەو سەربازەکانن، ئەوانە شوێن کەوتوون. خوا زاناترە.

(٤١-٤٣): ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾ ﴾:

خـوای گـەورە بەندەکانی ئاگـادار دەکاتەوە لەسـەر مەزنیو تـەواوی دەسـەلاتی خۆی، وە لەسـەر ئەوەی هەموو بەدیهێنراوەکان پێویسـتیان بـەو هەیە لە پەروەردگارێتیو پەرستشـدا، جـا فەرموویەتـی: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ لـە گیانـدارو بێگیان ﴿ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ﴾ واتـە: باڵنـدەکان باڵیـان کردۆتـەوە لـە ناو ئاسـماندان، تەسـبیحاتو یـادی خوا دەکەن ﴿ كُلٌّ ﴾ هەریەک لـەم بەدیهێنراوانـە ﴿ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ﴾ واتە: نوێـژو دوعـای خۆیـان دەکـەن بەو جـۆرەی شایسـتەیە بـە خۆیان، خـوا ﷻ ئـەو نوێژوو زیکرانـەی بـە ئیلهام فێرکـردوون، یان لە ڕێگـەی نێردراوانەوە وەک جنۆکـەو مرۆڤەکانو فریشـتەکان، یـان بە ئیلهامێـک لەلایەن خوای بـەرزەوە، وەک سـەرجەم بەدیهێنـراوەکان، ئەمـە زیاتـر ڕێـی تێدەچـێ بـە بەڵگـەی ئـەم ئایەتـە: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾ واتـە: بە هەمـوو کـردەوەکان دەزانـێ، هیچ شـتێ لەو شـاراوە نیە، وە بەو شـێوە پاداشـتیان دەداتەوە، جـا بەم جـۆرە خوا کـۆی کردۆتەوە لـە نێوان زانسـتی بە کـردەوەی باڵنـدەکان ئەویش بە فێرکردنـی، وە لـە نێوان کـردەوەی مرۆڤـەکان کە پاداشـت لەخۆدەگرێت.

وە دەگونجـێ ڕاناوەکـە لـەم ئایەتـە ﴿ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ﴾ بگەڕێتـەوە بـۆ خـوا، بێگومـان خـوا ﷻ زانایـە بـە پەرستشـەکانیان ئەگەرچی نەشـزانن -ئەی بەنـدەکان- مەگەر

ئــەوە نەبــێ كــە خــۆی ئاگــاداری كردوونەتەوە، ئــەم دەقە وەك ئــەو ئایەتەیە كــە خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾الإسراء (واتــە: ستایشــی خــوا دەكــەن هەر حــەوت ئاســمانەكانو زەویو هەرچــی لەناویاندایــە، وە هیــچ شــتێك نیــە كــە ســوپاسو ستایشــی ئــەو نــەكات، بــەڵام ئێــوە تێناگــەن لــە تەســبیحاتەكەیان بەڕاســتی خوا هەمیشــە هێدیومەنــدی لێبوردەیە).

كاتــێ خــوا ﷻ بەندایەتیو پێویســت بوونی ئەوانــی ڕوون كردۆتەوە -لە رووی پەرســتشو یەكتاپەرســتی- ئنجــا پێویســتی هەژاریانــی ڕوون كــردەوە، لــە ڕووی موڵكو پــەروەردەو هەڵســوڕاندنەوە، جا دەفەرمــوێ: ﴿ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ﴾ بەدیهێنــەریو ڕۆزیدەری ئاســمانەكانو زەویــە، بەڕێوەبــەرو كار هەڵســوڕێنەریانە، لــە بڕیاری شــەرعیو قەدەریدا، وە لــەم دونیایــەدا، وە لە حوكمی پاداشــتی لە ژیانــی مانــەوەی هەتاهەتایی، بــە بەڵگەی ئەوەی كە خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ واتە: ســەرەنجامی هەمــوو بەدیهێنراوەكان، بــۆ ئــەوەی پاداشــتیان بداتەوە بە پێــی كردەوەكانیــان ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ ﴾ واتە: ئایــا بە چاوی خــۆت مەزنــیو توانــاو دەســەڵاتی خــوا نابینــی، كــە چــۆن ﴿ يُزۡجِي ﴾ (واتــە: دەبــات) ﴿ سَحَابًا ﴾ پەڵــە هــەورە جیاجیــاكان ﴿ ثُمَّ يُؤَلِّفُ ﴾ پاشــان ئــەو پەڵــە هەورانە پەیوەســت دەكاتو دواتــر دەیانخاتــە ســەر یەكتــری وەكــو كێــوەكان ﴿ فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ ﴾ واتــە: دڵۆپــەی بــاران لــە نێــو ئەو هەورانــەدا دێتە خــوارێ بــە دڵۆپەی جیــا جیا، بۆ ئەوەی ســوود دەســتەبەرێ بەبــێ زیــان، بەو شــێوەیە شــیوو دۆڵــەكان پڕبــنو ئاویان لــێ بێتــە دەر، ئنجا زەوی ســەوز ببــێ لە هەمــوو جووتێكــی جوان.

جارێك لە ئاسمانەوە تەرزە دەبارێ بدات بەسەر هەرچیدا زیانی پێدەگەیەنێ ﴿ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ ﴾ واتە: (ئنجا تووشی زیان دەبێ بەم تەرزەیە هەركەس خوا ﷻ بیەوێ وە لای دەدات لە هەر كەس كە خۆی بیەوێ) بەپێی ویستو حیكمەتو قەدەری خۆی، وە حیكمەتی خواش ستایش لەسەركراوە، ﴿ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ ﴾ واتە: خەریكە ڕۆشنایی شەوقی ئەو چەخماخەی لە نێو هەورەكانەوە دەردەچێ ﴿ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾ (واتە: بینای چاوەكان دەبات) ئایا ئەو خوایە خاوەنی تەواوی دەسەڵاتەو ڕەحمەتو بەزەیی بەرفراوانە، ئەو هەورەی دروست نەكردوەو نەیهێناوە بۆ بەندە هەژارەكانی، وە داینەبەزاندووە بە جۆرێ سوودی لێوەربگرنو زیانیان لێ دووربخاتەوە؟

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ٤٤
وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن
يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ٤٥ لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ
وَٱللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ٤٦ وَيَقُولُونَ
ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ
ذَٰلِكَ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ٤٧ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ٤٨ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ
يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ٤٩ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓاْ أَمْ يَخَافُونَ
أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٥٠ إِنَّمَا
كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن
يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٥١ وَمَن
يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ
٥٢ ۞ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ قُل
لَّا تُقْسِمُواْ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ٥٣

(٤٤): ﴿ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٤﴾ ﴾:

﴿ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾ (واتە: خوا شەوو ڕۆژ دەگۆڕێ) لە گەرماوە بۆ سەرما، وە لە سەرماوە بۆ گەرما، لە شەوەوە بۆ ڕۆژ، وە لە ڕۆژەوە بۆ شەو، ڕۆژەکان دەگۆڕێ لە نێوان بەندەکانیدا ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾ واتە: (بەڕاستی لەمەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە) بۆ ئەوانەی خاوەن ژیریو عەقڵی تەواون، جا خاوەن بینایی تەماشای ئەم بەدیهێنراوانە دەکات بە تەماشاکردنی پەندو بیرکردنەوە، بەڵام کەسی جاهیلو نەفام بەبێ ئاگاییەوە تەماشایان دەکات هەروەکو تەماشاکردنی ئاژەڵەکان.

(٤٥): ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ ﴾:

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ ﴾ خوا ﷻ بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کە دەیبینن، ئەو هەموو زیندەوەرانی بەدیهێناوە لەسەر زەویدا ﴿ مِّن مَّآءٍ ﴾ واتە: پێکهاتەی هەموو بەدیهێنراوەکان لە ئاوە، هەروەک فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء (واتە: فەراهەممان هێناوە لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو).

ئەو گیاندارانەی کە زاوزێ دەکەن پێکهاتەی هەموویان تکێ ئاوە، کاتێ کە نێر لەگەڵ مێدا دەیپیتێنێ، وە ئەو گیاندارانەش کە لە زەویدا دێنە دونیاوە، دروست نابن مەگەر لە شوێنێکی شێداری ئاویدا نەبێ، وەک جانەوەرو مێرووەکان، هیچ شتێک لەوانە بەدی نایەت بەبێ ئاو، پێکهاتەی هەموو گیانداران یەکە، بەڵام شێوەی دروست کردنیان لە یەکتر جیاوازە لە زۆر ڕووەوە، ﴿ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ ﴾ وەک مارو هاوشێوەکانی ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ ﴾، وەکو مرۆڤو زۆرێک لە باڵندەکان ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي

﴿ عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖ ﴾ وەکو ئاژەڵی ماڵاتو هاوشێوەکانی.

جا جیاوازیان لەگەڵ ئەوەدا یەک بنچینەیان هەیە بەڵگەیە لەسەر جێبەجێ کردنی ویستو مەشیئەتی خواو گشتگیری دەسەڵاتی، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ ﴾ واتە: هەرچی بوێ لە بەدیهێنراوەکان دروستی دەکات، لەسەر هەر سیفاتو شێوەیەک بێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ هەروەکو چۆن بارانی باراندوە بەسەر زەویدا، پێکهاتە یەکە وە دایکیش یەکە کە بریتیە لە زەوی، وە منداڵەکانیش رەگەزو شێوەیان جیاوازە، ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤ ﴾ الرعد (واتە: وە لە زەویدا چەند پارچەی لە پاڵ یەکتریدا هەن، هەروەها باخاتی تریو رەزوو کشتووکاڵو باخاتی دارخورمای دوو قەدی یەک بنج، وە یەک قەد هەموویان بە یەک ئاو، ئاو دەدرێن کەچی باوی هەندێکمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا لە خواردندا بەڕاستی لەوانەدا چەند نیشانەی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی تێدەگەنو بیردەکەنەوە).

(٤٦): ﴿ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٤٦ ﴾:

﴿ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ ﴾ واتە: بێگومان رەحممان بە بەندەکانمان کردووەو چەند ئایەتو نیشانەی ڕوونکەرەوەمان بۆ دابەزاندوون کە بەڵگەن لەسەر هەموو مەبەستە شەرعیەکانو ئادابە ستایشکراوەکان، بەو شێوەیە ڕێگاکان ڕوون بوەتەوە، وە چاکە لە خراپە جیابوەتەوەو هەروەها هیدایەت لە گومڕایی، کەمترین گومانو دوو دڵی نەماوە کە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەبێ، وە بەهەمان شێوە کەمترین ئاڵۆزی تێدانیە بۆ کەسێ بە دوای ڕاستیدا بگەڕێ، چونکە دابەزێنراوە لەلایەن کەسێکەوە زانستو ڕەحمەتو ڕوونکردنەوەی تەواوە، لە دوای ڕوونکردنەوەی ئەو هیچ ڕوونکردنەوەیەکی دیکە نیە ﴿ لِّيَهۡلِكَ ﴾ بۆ ئەوەی تیابچێ دوای ئەوە ﴿ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ ٤٢ ﴾ الأنفال، (واتە: ئەوەی تیاچووە لەسەر بەڵگەبێ، وە ئەوەیشی دەژی لەسەر بەڵگە بژی).

﴿ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾ لەوانەی پێشینەی چاکیان بۆ هەیە ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ واتە: بۆ ڕێگای ڕوونو کورت بگاتە لای پەروەردگارو شوێنی ڕێزداری کە بەهەشتە، ئەمەش زانستی ڕاستەقینەو کردەوە پێکردن لەخۆدەگرێ.

ڕوونکردنـەوەی تـەواوی داوە بـۆ هەموو بەدیهێنـراوەکان، وە هیدایەتی تایبـەت کردوە بەو کەسـەی کە خـۆی بیـەوێ، ئەمە فـەزڵو چاکەکانـی خوایە، فـەزڵو چاکەی بەخشـندەش شایسـتەی سـتایش کردنە، ئـەوەش دادپەروەری ئـەوەو بیانـووی ئەوانەی بڕیـوە کە داوای بەڵگـە دەکـەن، خوا خـۆی زاناترە کـە چاکەی خـۆی لە کوێـدا دادەنێ.

(٤٧-٥٠): ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓاْ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾خـوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی بارودۆخی سـتەمکاران، لەو کەسـەی لە دڵیدا نەخۆشـیو لاوازی ئیمـان هەیە، یـان دووڕووییو گومانو لاوازی زانسـت هەیـە، ئەوانە بە زمانیـان بڕوادەهێنـن وە پابەنـد دەبن بـە بڕوابوون بەخـواو گوێڕایەڵیەوە، پاشـان هەڵناسـن بـەوەی کـە وتوویانـە، وە کۆمەڵێکیان پشـت لـە گوێڕایەڵی دەکـەن بە پشـت تێکردنێکی مـەزنو گەورە، بـە بەڵگەی فەرمودەی خـوا ﷻ ﴿ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾آل عمران (ئەوان پشـتی تێدەکـەن)، بێگومان پشـت تێکـەر هەندێجار نیەتـی گەڕانەوەی هەیە لەوەی پشـتی تێکـردوە، بەڵام ئەم کەسـەی پشـتی تێکردوە بە هیچ شـێوەیەک لای لێناکاتەوەو تەماشـای نـاکات، ئـەم حاڵەتـە دەبینی لـە زۆرێـک لـەو کەسـانەی بانگـەوازی ئیمـانو گوێڕایەڵی کـردن دەکات، لـە کاتێکـدا ئیمانـی لاوازە، دەبینـی زۆرێک لـە عیبادەتەکان بـە جێناهێنێ بـە تایبەت ئەو پەرستشـانەی قـورسو گرانە لەسـەر زۆرێ لە نەفسـەکان، وەک زەکاتو ئـەو خەرجیانـەی پێویسـتو ڕێ پێـدراون، وە جیهادکـردن لـە پێناوی خواداو هاوشـێوەی ئەوانـە، ﴿ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ﴾واتـە: ئەگـەر لە نێوانی ئەوانو کەسـێکی تـردا شـتێک ڕوویداو بانگ بکرێن بـۆ لای حوکمی خـواو پێغەمبەرەکەی، ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾(واتـە: یەکسـەر کۆمەڵێک لەوانـە ڕوو وەردەگێڕن) حوکمو بڕیـاری نەفامیان دەوێ، وە یاسـاو ڕێسـاکانی دیکـە بـە چاکتـر دەزانـن لە یاسـا شـەرعیەکان، لـە کاتێکدا دەزانـن حەقو ڕاسـتی لەسـەریانە، وە شـەریعەتیش حوکمو بڕیـار بە پێی واقـع دەدات.

﴿ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾واتـە: (بـەڵام ئەگـەر حەقەکـە بـۆ ئـەوان بێـت، دێـن) بۆ لای حوکـمو بڕیـاری شـەرع ﴿ مُذْعِنِينَ ﴾(واتـە: بـە ئەوپـەڕی ملکـەچ بـوون)، لەبـەر

ئـەوە نیـە کـە ئـەوە حوکمێکـی شـەرعیە، بەڵکـو لەبـەر ئەوەیـە گونجـاوە لەگـەڵ هەواو ئارەزووەکانیانـدا، لـەم حاڵەتـەدا وەسـفکراو نیـن، ئەگەرچـی بـە ملکەچیـەوە بەدەمیـەوە بچـن، چونکـە بەنـدەی ڕاسـتەقینە شـوێنی هـەق دەکـەوێ لـەوەی پێی خۆشـەو لەوەشـی پێـی ناخۆشـە، لـەوەی دڵخۆشـی دەکات لەوەشـی خەمبـاری دەکات، بـەڵام ئەو کەسـەی شـوێنی شـەرع دەکەوێ کە لەگـەڵ هەواو ئـارەزووی دەگونجـێ، وە وازی لێدەهێنێ ئەگەر پێچەوانـەی بـوو، هەواو ئـارەزووی پێش شـەرع دەخـات، ئـەوە بەندەیەکی گوێڕایـەڵ نیە بە شـێوەیەکی ڕاسـتەقینە.

خـوا دەربـارەی لۆمەکردنیـان لەسـەر ڕوو وەرگێڕانیـان لـە بڕیـاری شـەرعی فەرموویەتی: ﴿ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ واتـە: (ئایـا لـە دڵەکانیانـدا) عیللـەتو نەخۆشـی هەیـە، ئایـا دڵ لـە ڕاسـتی دەرچووەو هەسـتەوەریەکانی لە دەسـتداوە، وەکو کەسێکی نەخۆشـی لێهاتووە پشت هەڵـدەکات لەوەی سـوودی هەیە بـۆی، وە ڕوو ئەکاتە ئەو شـتەی زیانـی هەیە بۆی، ﴿ أَمِ ٱرْتَابُوٓاْ ﴾ واتـە: یـان لـە گوماندا بـوون، دوودڵ بـوون لە بڕیـاری خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، تۆمەتباریان کردوە کە ئەو حوکم بەهەق ناکات.

﴿ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ﴾ واتـە: (یـان دەترسـن خـواو پێغەمبەرەکـەی) بڕیـاری سـتەمکارانە بدەن بەسـەریاندا، بەڵکو ئەمە وەسـفیانە ﴿ بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکـو ئەوانە هەر خۆیان سـتەمکارن)، بـەڵام بڕیاری خواو پێغەمبـەر ﷺ لە ئەوپەڕی دادپـەروەری دایـەو گونجاوە لەگەڵ حیکمـەتو دانایـیدا. ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝٥٠ ﴾ المائـدة، (واتـە: ئایـا کـێ حوکـمو بڕیاری لە هـی خوا جـوانو چاکترە).

ئـەم دەقانـە بەڵگەن لەسـەر ئـەوەی ئیمان بریتـی نیە تەنها لـە دانپێدانـان بە زمانـی ڕووت، بەڵکـو دەبێ کـردەوەی لەگەڵـدا هەبێت، لەبـەر ئەمەیە ئیمانـی ڕەتکردوەتەوە لەو کەسـەی پشـتی کردوە لـە گوێڕایەڵی.

پێویسـتە لـە هەمـوو حاڵەتێکـدا ملکەچـی بنوێنـێ بـۆ حوکمـی خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بـەڵام ئەگـەر ملکەچی نەبوو، بەڵگەیە لەسـەر ئـەوە دڵی نەخۆشـەو گومانی لـە ئیمانەکەیدا هەیـە، بێگومان گومـان بردنی بـە بڕیارەکانی شـەریعەت قەدەغە کـراوە، وە نابێت بەجۆرێ گومانـی پـێ ببـات پێچەوانـەی دادپـەروەریو حیکمەت بێـت. دوای ئەوەی باسـی حاڵەتی ئەوانـەی کـرد کە پشـتیان کردوە لـە بڕیـاری شـەریعەت، ئنجا باسـی حاڵەتـی بڕواداڕانی کـرد، دەفەرموێ:

(٥١-٥٢): ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾

﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (واتـە: قسـەی ئیمانداران تەنهـا ئەمەیە) بە حەقیقـەت، ئەوانەی بـە کردەوەکانیـان سـەلماندوویانە خـاوەن ئیمانێکـی ڕاسـتەقینەن، کاتێ بانـگ دەکرێن بۆ لای خـواو پێغەمبەرەکـەی بـۆ ئەوەی بڕیـار لـە نێوانیاندا بدات یەکسـانە بەلایانـەوە ئەگەر بڕیارەکـە لەگـەڵ هـەواو ئارەزوویانـدا بگونجـێ یـان پێچەوانـە بێتـەوە ﴿ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾ واتـە: بڕیـاری خـواو پێغەمبەرمـان بیسـتو بـە دەمـی بانگەوازەکەیـەوە هاتین، وە گوێڕایەڵیـن بـە گوێڕایەڵیەکـی تـەواو کـە هیچ لەکـەو پەڵەیەکـی تێدانیە ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ ڕزگاربوونـی کورتهەڵهێنـاوە تەنهـا لەوانـەدا، چونکە ڕزگاربـوون: بریتیە لـە سـەرکەوتن بەداواکـراوەکان، وە ڕزگـاری نابـێ تەنهـا کەسـێک نەبـێ فەرمانبەرداری بڕیـاری خـواو پێغەمبەرەکـەی بـێو گوێڕایەڵی ئـەوان بکات.

دوای ئـەوەی خوا ﷻ باسـی فەزڵو چاکەی گوێڕایەڵی کـردووە لە حوکمو بڕیاردا بە تایبەتی، ئنجـا بە گشـتی لە هەمـوو ڕووەکانەوە باسـی فەزڵو چاکـەی کـردوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ (واتـە: هەرکـەس گوێڕایەڵـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکات) هەواڵەکەیـان بەڕاسـت بزانـێو ملکەچـی فەرمانەکانیـان بـێ ﴿ وَيَخْشَ ٱللَّهَ ﴾ واتـە: لێـی بترسـێ، ترسـێک گـرێ درابێ بە زانسـتو زانیاریـەوە، واز لـەوە بێنێ قەدەغـەی لێکراوە، وە دەسـت هەڵبگـرێ لە هـەواو ئارەزووەکانی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ وَيَتَّقْهِ ﴾ لە خـوا ﷻ بترسـێ بـە وازهێنـان لـە قەدەغەکـراوەکان، چونکـە لە خواترسـان بـە ڕەهایی بە مانـای ئەنجامدانـی فەرمانـەکانو وازهێنـان لـە قەدەغەکـراوەکان دێ، وە کاتـێ کە گرێ دەدرێ بـە (البـر) یـان (الطاعـة) تەفسـیر دەکـرێ بـە خۆپاراسـتن لـە سـزای خـوا ﷻ بە وازهێنـان لـە سـەرپێچیەکان، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـە کۆیان کردۆتـەوە لە نێـوان گوێڕایەڵی خـواو گوێڕایەڵـی پێغەمبەرەکـەی، وە ترسـان لە خـواو خۆپارێـزی ﴿ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ بە ڕزگاربوونیـان لـە سـزا چونکـە وازیان لـە هۆکارەکانـی هێناوەو گەیشـتوون بە پاداشـت، چونکـە هـۆکاری سـەرکەوتنیان ئەنجامـداوە، بۆیـە سـەرکەوتن لەوانـدا کورتهەڵهێنـراوە، بـەڵام هەرکەسـێ وەسـف نەکـرێ بە وەسـفی ئەوان ئـەوە سـەرکەوتنی لە دەسـت دەچێ، بەپێـی کەمتەرخەمی لەم وەسـفە ستایشـکراوانەدا.

ئــەم دەقــە مافی هاوبەش لــە خۆدەگرێ لــە نێــوان خــواو پێغەمبەرەکەیدا ئەویــش بریتیە لە گوێڕایەڵــی پەیوەســت بــە ئیمان، وە مافــی تایبەت بە خــوا ﷻ ئەویش ترســانو خۆپارێزیە، مافــی ســێیەم ماوەتــەوە ئەویــش تایبەتــە بــە پێغەمبــەر ﷺ کــە بریتیە لــە بــە گەورەدانانو بەڕێــز تەماشــاکردنی، هەروەکــو چــۆن خــوای گــەورە هەرســێ مافەکــەی لــە ســوورەتی (الفتــح)دا کۆکردۆتــەوە: ﴿ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ ﴾الفتح، (واتــە: بۆ ئەوەی بــڕوا بە خــواو پێغەمبەرەکــەی بێنن، وە پشــتیوانی لێبکــەنو ڕێــزی لێبگــرن، وە تەســبیحاتی خــوا بکەن لــە بەیانیانو ئێــواران).

(٥٣-٥٤): ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ قُل لَّا تُقْسِمُوا طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾:

﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدا دەربــارەی حاڵەتــی ئــەو دووڕووانەی دواکەوتــن لــە پێغەمبــەر ﷺ لــە کاتــی جیهــاد کردنــدا، وە ئەوانەش لــە دڵیاندا نەخۆشــیو لاوازی ئیمــان هەبــوو، ئەوانــە ســوێند دەخــۆن بــە خــوا: ﴿ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ ﴾ (واتــە: ئەگــەر فەرمانیــان پــێ بدەیــت) لــەوەی ڕوو بــەڕووت دەبێتــەوە، یــان ئاگاداریان بکەیتــەوە کاتێ دەردەچــی ﴿ لَيَخْرُجُنَّ ﴾ (ئــەوان دەردەچــن)، مانــای یەکــەم لە پێشــترە.

خــوا ﷻ ڕەتــی داونەتــەوەو فەرموویەتــی: ﴿ قُل لَّا تُقْسِمُوا ﴾ واتــە: نــە پێویســتمان بــە ســوێند خواردنــی ئێــوە هەیــە، نــە بــە بیانووەکانتــان، بێگومــان خــوا هەواڵــی پێداویــن بە بارودۆختــان، ملکەچــی ئێوە زانراوەو شــاراوە نیە بەلامانــەوە، بێگومان ئێمــە کەمتەرخەمیو تەمبەڵــیو تەوەزلــی ئێوەمــان زانیــوە بەبــێ بیانوو، ســوێندو پاســاوتان هیــچ بنەمایەکی نیە، بەڵکــو کەســێک پێویســتی بە بیانــوو هێنانــەوە هەیە کاروبارەکــەی بگونجێ حاڵەتەکەشــی گومانــاوی بێــت، ئەمە لەوەیــە بیانوو ســوودی پێبگەیەنێو ڕزگــاری بێ، بەڵام ئێــوە نەخێر، بەڵکــو چاوەڕێی ئەوەتان لێدەکرێو مەترســی ئەوەتان لەســەرە ســزاو خەشــمو قینی خوا ﷻ حــەڵاڵ بێ بۆتــان، لەبەرئەمەیە هەڕەشــەی لێکــردوون وەک فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ پاداشــتان دەداتــەوە بــە باشــترین پاداشــت، لــە هەمــان کاتــدا ئەمــە حاڵی ئەوانــە. بــەڵام پێغەمبــەر ﷺ ئەرکــی ئەوەیــە فەرمانیــان پێبــکاو قەدەغەیــان لێبــکات، لەبەر ئەمەیــە فەرموویەتی:

قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ
وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ
إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ
لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ
بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾
وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ
تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ
وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ
ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ
ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ
وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾

﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن ﴾ واتە: (بڵێ: ئەگەر گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن ئنجا)، ئەگەر گوێڕایەڵ بوون ئەوە خۆشبەخت دەبن، وە ئەگەر ﴿ تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ ﴾ (واتە: پشتیان هەڵکرد ئەوە پێغەمبەر تەنها بەرپرسیارە لەوەی دراوە بەسەریدا) لە گەیاندنی پەیامەکە، وە بێگومان گەیاندی ﴿ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ﴾ (واتە: وە ئێوەش بەرپرسن لەوەی دراوە بەسەرتاندا) لە گوێڕایەڵی کردن، بێگومان بارودۆختان ئاشکرا بوو، وە گومڕاییو سەرشۆڕیتان دەرکەوتو شایستەی سزا بوون ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ﴾ (واتە: ئەگەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن ئەوە هیدایەت وەردەگرن)، بۆلای ڕێگای ڕاست بە گوفتارو بە کردار، هیچ ڕێگایەک نیە بۆ هیدایەت تەنها گوێڕایەڵی کردنی نەبێ، وە بەبێ ئەوە مومکین نیە بەڵکو مەحاڵە ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾ واتە: (پێغەمبەر ﷺ هیچی لەسەر نیە)، تەنها گەیاندنێکی ڕوونو ئاشکرانەبێ، بۆ ئەوەی بۆ هیچ کەس گومانو دوودڵی نەمێنێ، بەڵام ئەوەی لێپرسینەوەتان لێدەکاو پاداشتان دەداتەوە تەنها خوای بەرزە، پێغەمبەر ﷺ هیچی لە کاروباری لێپرسینەوەدا نیە، ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێهێناوە.

(٥٥): ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

ئەمە یەکێکە لە پەیمانە ڕاستگۆکانی خوا ﷻ کە بەچاو بینراوە، بێگومان وەعدو پەیمانی داوە هەرکەسێ هەستێ بە جێبەجێکردنی بڕواهێنانو کردەوەی چاک لەم ئۆممەتەدا، بێگومان دەیانکاتە جێنشینی خەڵکی لەسەر زەویدا، ئەوان دەبنە جێنشینی ڕاستەقینە، کاروبارەکانی

سەر زەوی هەڵدەسوڕێنن، خوای گەورە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ، ئەو ئاینەی کە پێی ڕازی بووە بۆیان ئەویش ئاینی ئیسلامی پیرۆزە کە پێش کەوتووە بەسەر هەموو ئاینەکاندا، خوا ﷻ ڕازی بووە بیبەخشێ بەم ئۆممەتە لەبەر فەزڵو ڕێزیان، وە نیعمەتی خۆی بەسەریانەوە، بە جۆرێ هەڵسن بە جێبەجێ کردنی شەریعەتەکەی بە ئاشکراو بە نهێنی، لە نەفسو دەروونی خۆیانو غەیری خۆیانیش، لەبەرئەوەی غەیری ئەوان لە شوێنکەوتووی ئاینەکانی دیکەن، وە جێبەجێی بکەن بەسەر سەرجەم ئەو بێبڕوایانەی زەلیلو ژێر دەستەن، خوای گەورە ترسو بیمیان بۆ دەگۆڕێ ئەو ترسەی کە یەکێک لەئەوان نەیدەتوانی ئاینەکەی ئاشکرا بکات، مەگەر بە جۆرێ نەبووایە بێبڕوایان ئازاریان بدایە، وە بوونی کۆمەڵی مسوڵمانان زۆر کەم بوو لە بەرانبەر بێبڕوایاندا، هەموو سەر زەوی تیر بارانی دەکردن لە یەک کەوانەدا، خوای گەورە لە کاتی دابەزینی ئەم دەقەدا پەیمانی پێدان بەو کاروبارانە، ئەو ئۆممەتە جێنشینیو چەسپاویان نەبینی لەسەر زەویدا، وە توانایان نەبوو بە بەجێهێنانی ئاینی ئیسلامو ئاسایشی تەواو، بە جۆرێ بەندایەتی خوایان دەکردو هاوبەشیان بۆ دانەدەنا، وە لە هیچ کەس نەدەترسان جگە لە خوا ﷻ نەبێ، بۆیە سەرەتای ئەم ئۆممەتە بەو ئاواتە گەیشتن، بە هۆی بڕواهێنانو کردەوەی چاکەوە، خوا ﷻ دەسەڵاتی پێدان بەسەر شارو وڵاتو بەندەکاندا، خۆرهەڵاتی زەویو خۆرنشینیان ڕزگار کرد، وە ئاسایشی تەواوو چەسپاوی تەواویان بەدەست هێنا، ئەمە یەکێکە لەو دەقە سەرسووڕهێنەرانە، کاروبارەکانیش بەو شێوەیەیە هەتا ڕۆژی دوایی، هەرکات هەستن بە بڕواهێنانو کردەوەی چاک، بێگومان پەیمانی خوا ﷻ دەبیننەوە، بەڵام لە هەندێ کاتدا بێبڕوایانو دووڕوانیان بەسەردا سەردەخات ئەویش بە هۆی ناتەواوی بڕواو کردەوەی چاکە لە ناو مسوڵمانان ﴿وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ (واتە: هەرکەس بێبڕوا بێ) دوای ئەو دەسەڵاتو هێزە تەواوەی کە پێتان دراوە ئەی مسوڵمانان ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ واتە: ئەوانە دەرچوون لە گوێڕایەڵی خواو فەسادو خراپەکاریان کردوە، کاری چاکیان ئەنجام نەداوە، ئەوانە کەسایەتی خێرو چاکەیان تێدانیە، چونکە ئەو کەسەی واز لە ئیمان دەهێنێ لە کاتی دەسەڵاتو سەربەرزیدا، بەبێ بوونی هیچ هۆکارو ڕێگریەک بەڵگەیە لەسەر پیسیو خراپی نیەتی، چونکە هیچ هۆکارێک نیە بۆ وازهێنان لە ئاین تەنها ئەوە نەبێ.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای گەورە پێش ئێمە خەڵکانێکی کردوەتە جێنشین لەسەر زەویدا، هەروەک مووسا ﷺ بە گەلەکەی دەڵێ: ﴿وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ

﴿فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ١٢٩﴾الأعراف، (واتە: وە ئێوە بكات بە جێنشین لەسەر زەوی جا تەماشا دەكات ئێوە چۆن كاردەكەن)، وە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ ٦﴾القصص، (واتە: وە ئێمە دەمانەوێ منەت بنێین بەسەر ئەوانەی كە لاوازو ژێر دەست كرابوون، وە بیانكەینە پێشەواو بیانكەینە میراتبەران، وە دەسەڵاتداریان بكەین لەم زەویەدا).

(٥٦-٥٧): ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ٥٦ لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ ٥٧﴾:

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ خوا فەرمان دەكات بە بەجێهێنانی نوێژ بە پایەو مەرجو ئادابەكانی، بە ئاشكراو بە نهێنی، وە بە زەكات دان لەو ماڵو سامانانەی كە خوا ﷻ بەندەكانی كردۆتە جێنشینو پێی بەخشیون، بەوەی بیدەن بە خەڵكی هەژارو جگە لەوانیش، لەوانەی خوا ﷻ باسی كردوون كە زەكاتیان پێدەشێ، نوێژو زەكات گەورەترینو مەزنترینی پەرستشەكانن، كۆكەرەوەی مافی خواو مافی دروستكراوەكانین، وە دڵسۆزی بۆ خواو چاكەخوازی بۆ بەندەكانی، پاشان عەتفی كردوە بەسەر نوێژو زەكاتدا، فەرمانێكی گشتگیر وەک فەرموویەتی: ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ ئەویش بە گوێڕایەڵی كردنی فەرمانەكانیو دووركەوتنەوە لە قەدەغەكراوەكانی ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ٨٠﴾النساء، (واتە: هەركەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر بكات ئەوە بەڕاستی گوێڕایەڵی خوا ﷻ بووە، ﴿لَعَلَّكُمْ﴾ بۆ ئەوەی كاتێ ئەوانە ئەنجام دەدەن ﴿تُرْحَمُونَ﴾ هەر كەسێ ڕەحمەتی دەوێ ئەمە ڕێگای ڕەحمەتی خوایە، وە هەر كەسێ داوای دەكات بەبێ بەجێهێنانی نوێژو دەركردنی زەكاتو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ ئەوە تەمەناكارێكی درۆزنە، بێگومان نەفسو ئارەزووی شوێنی منەتی درۆینە كەوتووە.

﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ﴾ سەرسام مەبە بەو ماڵو سامانەی كە دراوە بە كافران لە ژیانی دونیادا، بێگومان خوا ﷻ ئەگەرچی مۆڵەتی پێداون پشت گوێیان ناخات، ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ٢٤﴾لقمان، (واتە: كەمێ نازونیعمەتیان پێدەدەین لە دونیادا لە پاشان ناچاریان دەكەین كە برۆنە ناو سزای سەختەوە).
لەبەرئەمەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ واتە: خراپترین شوێنو جێگای بێبڕوایانە، جێگای شەڕو حەسرەتو پەشیمانیو سزای هەتا هەتاییە.

(٥٨): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ ﴾ خوا ﷻ فەرمان بە بڕواداران دەکات خزمەتکارەکانیان مۆڵەتیان لێوەربگرن، هەروەها منداڵەکانیان کە هێشتا بالغ نەبوونە، خوای گەورە حیکمەتی خۆی لەوەدا باسکردوە، ئەو مۆڵەت وەرگرتنە لە سێ کاتدایە ئەم سێ کاتە کاتی خۆدەرخستنە بۆتان، کاتێ کە شەو دەخەون دوای عیشا، وە کاتێ بە ئاگان پێش نوێژی بەیانی، چونکە ئەو کەسەی خەوتووە لە شەودا جلو بەرگێک بەکاردێنێ تایبەتە بە خەو، بەڵام خەوی ڕۆژ بە زۆری کاتی خەوەکە کەمە، هەندێجار بەندە دەخەوێ بەو جلەی کە لە بەریدایە، بۆیە خوا ﷻ بەستویەتیەوە ﴿ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ ﴾ واتە: بۆ سەرخەوشکێن لە ناوەڕاستی ڕۆژدا، لەم سێ حاڵەتەدا کۆیلەو منداڵە بچووکەکان وەکو خەڵکی دیکەن، مافی ئەوەیان نیە بچنە ژوورەوە تەنها بە مۆڵەت وەرگرتن نەبێ، بەڵام جگە لەم سێ حاڵەتە خوا فەرموویەتی: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ﴾ واتە: وەکو جگە لە خۆیانی، چونکە بەردەوام پێویستیان پێیانە قوورسو گرانە لە هەموو کاتێکدا داوای مۆڵەت بکەن، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ واتە: ئەوان زۆر بە دەورتاندا دێنو دەڕۆن بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیەکانتان، ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾ واتە: (ئا بەو جۆرە خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە ئایەتەکانی بۆ ئێوە) ڕوون کردنەوەیەک گرێدراوە بە کاربەجێی خۆی، بۆ ئەوەی جەختی لێبکاتەوەو خۆی پێ بەهێز بکاو لەو ڕێگایەوە بەزەیی‌و حیکمەتی خوا ﷻ بناسێ، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: خاوەن زانستێکە دەوری هەموو ئەرکەکانو ئەستەمەکانو مومکینەکانی داوە، ئەو حیکمەتەی هەموو شتێکی لە جێگەی خۆی داناوە، وە بەخشیویەتی بە هەموو بەدیهێنراوێک دروستکردنێک شایستە بە خۆی، وە هەموو حوکمێکی شەرعی داناوە شایستە بەو شوێنو جێگایەی خۆی، لەوانەش ئەم حوکمو بڕیارانەیە کە ڕوونی کردۆتەوەو لایەنی چاکو خراپی دیاریکردوە.

وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا
ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ
ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ
ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ
ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ
لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا
عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ
أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ
أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم
مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن
تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟
عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾

(٥٩): ﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ ﴾ واته: (كاتێ منداڵه‌كانتان بالغ بوو) به خه‌به‌ر بێ، یان له خه‌ودا ﴿ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واته: (با مۆڵه‌ت وه‌ربگرن له هه‌موو كاته‌كاندا، وه‌كو چۆن كه‌سانی پێش ئه‌مان مۆڵه‌ت وه‌رده‌گرن) ئه‌وانیش ئه‌وانه‌ن كه خوا ﷻ باسی كردوون له ده‌قێكدا، وه‌ك فه‌رموویه‌تی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ ﴾(واته: ئه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی بڕواتان هێناوه مه‌چنه ماڵانێكه‌وه جگه له ماڵی خۆتان هه‌تا مۆڵه‌ت وه‌رنه‌گرن)، ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ (واته: ئا به‌و جۆره خوا ئایه‌ته‌كانی بۆ ئێوه ڕوون ده‌كاته‌وه)، وه به وردو درشتیو دوورو درێژی ئه‌حكامه‌كانتان بۆ ڕوون ده‌كاته‌وه، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ (واته: خوا زانای دانایه).

## سووده وه‌ده‌ستهاتووه‌كانی ئه‌م دوو ئایه‌ته:

یه‌كه‌م: بێگومان گه‌وره‌و خاوه‌نی منداڵ فه‌رمانیان پێكراوه به فێركردنی خزمه‌تكاره‌كانیان، وه ئه‌وانه‌یشی له ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئه‌واندان له منداڵه‌كان، فێری زانستو ئادابی شه‌رعیان بكات، چونكه خوا ﷻ ڕووی كردۆته ئه‌وانو له‌گه‌ڵیان دواوه، وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ ﴿٥٨﴾ ﴾، ئه‌مه‌ش ڕوونادا ته‌نها به فێركردنو په‌روه‌رده‌كردن نه‌بێ، وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ﴾ واته: (دوای ئه‌م سێ كاته نه بۆ ئێوه‌و نه بۆ ئه‌وان هیچ گوناهێك نیه).

دووەم: فەرمـان کردن بە پاراسـتنی عەورەتـەکان، چاودێری ئەوە بکەن لـە هەموو کاتێکدا، وە ئـەو شـوێنەی کە جێگـای گومانە بـۆ بینینی عەورەتی مـرۆڤ ئـەوە قەدەغەکراوە خۆی تێدا بشـۆرێو سـەرئاوی تێدا ئەنجام بدرێ.

سـێیەم: دروسـتە عـەورەت دەربکـەوێ وەک پێویسـتیەک وەک کاتـی خـەو، کاتـی چوونەکـردنو هاوشـێوەی ئەوانـە.

چـوارەم: بـڕواداران لەگـەڵ ئـەوەدا ڕاهاتوون لـە ناوەڕاسـتی ڕۆژدا بخـەون هەروەکو چۆن شـەوان دەخـەون، چونکە خـوا ﷻ لەگەڵیـان دواوە بـە ڕوونکردنـەوەی ئـەو بارودۆخەیان کـە دیارە.

پێنجـەم: ئـەو منداڵـەی بالـغ نەبووە دروسـت نیـە عەورەتی کەسـێکی تری پێنیشـان بدرێ، وە دروسـت نیـە عەورەتی خۆیشـی پێنیشـان بـدرێ، چونکە خـوا ﷻ فەرمانی نەکـردوە بە مۆڵـەت پێدانیـان تەنهـا لەو کاتـەدا نەبێ کە دروسـتە.

شەشـەم: هەروەهـا کۆیلە دروسـت نیـە عەورەتی گەورەکـەی خۆی ببینـێ، هەروەکو چۆن دروسـت نیـە گەورەکـەی عەورەتی ئەو ببینـێ، وەک لە منداڵ باسـمانکرد.

حەوتـەم: پێویسـتە بۆ ئامۆژگاریکارو مامۆسـتاو هاوشـێوەی ئـەوان، ئەوانەی قسـە لە بابەتە شـەرعیەکاندا دەکـەن لەگـەڵ باسـکردنی حوکمەکـەدا هۆکارەکەیشـی ڕوون بکەنـەوە، چونکـە خـوا ﷻ کاتـێ حوکمەکـەی ڕوون کردۆتەوە هۆکارەکەیشـی باسـکردوە، وەک فەرموویەتـی: ﴿ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡ ﴾.

هەشـتەم: بچـووکو کۆیلە دوێنـراون هەروەکـو خاوەنەکانیان دوێنراوە، خـوا فەرموویەتی: ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّ ﴾.

نۆیـەم: لیکـی منـداڵ پاکـە، ئەگـەر لـە دوای پیسیشـەوە بێـت، وەک ڕشـانەوە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم ﴾، لەگـەڵ فەرمـوودەی پێغەمبـەر ﷺ کاتـێ پرسـیاری لێکـرا دەربارەی پشـیلە: {إِنَّهَـا لَيۡسَـتْ بِنَجَسٍ إِنَّهَـا مِنَ الطَّوَّافِـينَ عَلَيْكُـمْ وَالطَّوَّافَـاتِ} (أخرجه مالـك برقـم: (٤٢)، وأحمـد برقم: (٢٢٥٨١) تعليق شـعيب الأرنؤوط: حديث صحيح) واتە: پشـیلە پیـس نیـە، چونکـە زۆر بەدەورتاندا دێـنو دەڕۆن.

دەیـەم: دروسـتە مـرۆڤ ئـەو منداڵەی لـە ژێر دەسـتیدایە بـەکاری بێنـێ بە شـێوەیەک بە پێـی عـادەتو دابو نەریت، نابێـت ئەرکێکی قورس بخاتە سـەری، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم ﴾.

یـازدە: بەڕاسـتی حوکمی باسـکراوی درێـژە پێدراو، ئـەوە تەنها بۆ کەسـێکە لە خـوار باڵغ بوونەوەیـە، بـەڵام دوای باڵغ بوون، ئـەوە دەبێ مۆڵـەت وەربگرێ.

دوازدە: باڵـغ بـوون بـە دابەزینـی مەنی تـەواو دەبـێ، هەمـوو حوکمێکی شـەرعی دەدرێت بەسـەر باڵغـدا، بـە مەرجێک ئەو کەسـە مەنـی دابەزیبێ، ئەمـە زانایان یەکدەنگن لەسـەری، بـەڵام جیـاوازی لەوەدایـە، ئایـا باڵـغ بـوون بە تەمـەن بەردەسـت دەبـێ، یـان دەرچوونی تووک لـە دەوری عـەورەت، خـوا زاناترە.

(٦٠): ﴿ وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٦٠﴾ ﴾:

﴿ وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ واتـە: ئافرەتانـی پیرو، ئـەوەی کەوتوون لە لـە چێژ وەرگرتنو ئـارەزوو بـازی ﴿ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا ﴾ واتە: ئـەو ئافرەتانەی ئومێدی شـووکردنیان نەماوە، تەمـاح ناکرێـن، ئەویـش لەبـەر ئـەوەی پیـرنو ئارەزووناجوڵێنن، یـان ئەوانەی ناشـرینو ناقـۆڵان، نـە ئارەزوویان دەجوڵـێو نە ئـارەزوو دەجوڵێنـن، ﴿ فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ ﴾ واتـە: گوناهـو تاوانیان لەسـەر نیـە ﴿ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ ﴾ واتە: پۆشـاکی ئاشـکرا، وەک سـەرپۆشو وێنـەی ئەویـش، ئـەوەی کـە خـوا دەربـارەی فەرموویەتی بـە ئافرەتان: ﴿ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ ﴿٣١﴾ ﴾النـور، (واتـە: با سەرپۆشـەکانیان بدەن بە سـینگو بەرۆکیاندا).

ئەمانـە دروسـتە بۆیـان ڕوومەتیـان دەربخـەن، لەبـەر ئەوەی مەترسـی لەسـەر نیـە[٦]، دوای ئـەوەی نارەحەتـی لەسـەر لابردن بـە دانانی جـلو بەرگەکانیان، لـەوەی کەسـێ وا گومان ببـات بەکارهێنانی هەموو شـتێ دروسـتە، بەرپەرچی ئـەم گومانەی داوەتـەوەو فەرموویەتی: ﴿ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ ﴾ واتـە: زینەتو جوانیـان بۆ خەڵکی دەرنەخەن، بـە خۆڕازاندنەوە بـە جلوبەرگـی ڕووکـەش، وە ڕوخسـاری داپۆشـێ، وە بـا پێیەکانـی نـەدا بـە زەویدا بۆ ئـەوەی دەنکـی خڕخاڵەکانـی بـێ، چونکـە تەنهـا جوانـی لەلایـەن ئافرەتـەوە، ئەگەرچـی

٦- لـە ڕاسـتیدا بـەو جـۆرە نیـە کـە ئافرەتـان ئەگـەر پیـرو پەککەوتـە بـوون دەتوانـن ڕووخسـاریان دەربخـەن، بەڵکـو زۆربـەی زانایـان بۆچوونیـان وایـە ئافرەتانـی گەنجیـش دەتوانـن ڕووخسـارو هـەردوو دەسـتیان دەربخـەن، چونکـە عـەورەت نیـە، وەک ئیمام شـافعیو ئیمـام مالـکو ئیمـام ئەبـوو حەنیفـە، تەنانـەت ئیمـام ئەبـوو حەنیفـە دەفەرمـوێ: پێیەکانیـش عـەورەت نیـە. ئەگـەر هەرکەسـێ دەیەوێـت زانیـاری زیاتـری دەسـت بکـەوێ بـا تەماشـای کتێبـە فقهیـەکان بـکات لـە کـۆنو لـە ئێسـتادا. وەرگێـر.

خۆشـی داپۆشـی بـێ، وە ئەگەرچـی ئـارەزوو نەکـرێ، خەڵکـی تووشـی فیتنە دەبـێ پێی، بینـەر دەخاتـە نارەحەتیەوە.

﴿ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ﴾ (واتـە: خـۆ ئەگەر لاینەبەنو پۆشـتە بن، ئـەوە چاکترە بۆیـان)، (الإسـتعفاف): داواکردنـی پاکیـە بـە ئەنجامدانـی هۆکارەکانـی، کـە وازهێنـان دەخـوازێ لـە هەر شـتێک کـە دەبێتـە مایـەی فیتنە.

﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ ﴾ خـوا بیسـەری هەمـوو دەنگەکانـە، ﴿ عَلِيمٌ ﴾ زانایـە بە هەمـوو نیەتو مەبەسـتەکان، بـا ئاگاداربن لە هەموو قسـەو مەبەسـتێکی خـراپ، وە بزانن خوا لەسـەر ئەوە پاداشـتیان دەداتەوە.

(٦١): ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَـٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَـٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّـٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَـٰلَـٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَـٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾:

خـوا هـەواڵ دەدات دەربـارەی منەتـی خـۆی بەسـەر بەندەکانیـدا، ئـەو لـە ئاینـدا هیچ بار گرانیەکـی لەسـەریان دانەناوە، بەڵکو ئاسـانی کردوە بەوپەڕی ئاسـان کـردن، فەرموویەتی:

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ﴾ (واتـە: کوێـر گوناهـی لەسـەر نیـەو، شـەل گوناهـی لەسـەر نیـەو، نەخـۆش گوناهی لەسـەر نیـە)، واتە: ئەوانـە گوناهیـان ناگـات لـە وازهێنان لـەو ئەرکانـەی لەسـەریان پێویسـتە، کە وەسـتاوە لەسـەر یەکێـک لەوانـە، وەک جیهـاد کـردنو هاوشـێوەی، کە وەسـتاوە لەسـەر بینین، بۆ کوێـر، یـان لەش سـاغی بۆ شـەل، یـان تەندروسـتی بۆ نەخـۆش، لەبـەر ئەو مانا گشـتیەی کە باسـمان کـرد، قسـەکەی بە رەهایـی هێنـاوەو نەیبەسـتوەتەوە بە هیچـەوە، وەک چۆن دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴾ واتـە: (بـۆ ئێـوەش) گونـاح نیـە، ﴿ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ ﴾ واتـە: (لـە ماڵەکانتان بخـۆن) لە ماڵـی منداڵەکانتانیش، ئەمـە گونجاوەو پڕاو پـڕە لەگـەڵ ئـەو فەرموودە راسـتەدا: (أنت ومالـك لأبيك) واتـە: تۆو ماڵەکەت هـی باوکتن. وە فەرموودەیەکـی دیکـە: {إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ} (أخرجه

أحمد برقم: (٢٥٣٣٥)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث حسن لغيره)، واتە: چاکترینی ئەوەی دەیخۆن بەری ڕەنجو ماندووبوونی خۆتان بێ، وە منداڵەکانتان بەری ڕەنجو ماندوو بوونی خۆتانن.

مەبەست لە فەرمودەی خوا ﷻ ﴿ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ ﴾ ماڵی خودی کەسەکە نیە، چونکە ئەمە لە بابەتی ئەنجامی وەدەست هاتووە (تحصيل الحاصل)ە، کە کەلامی خوا ﷻ لەم بابەتە پاکو بێگەردە، وە لەبەرئەوە گوناهی ڕەت کردۆتەوە گومان دەکرێ خواردنی ئەو ماڵە تاوان بێ، لەوانەی کە باسکران، بەڵام ماڵی خودی مرۆڤ هیچ گومانێکی تێدانیە.

﴿ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ ﴾ (واتە: یان نان بخۆن لە ماڵی باوکتان یان ماڵی دایکانتان، یان ماڵی براکانتان، یان ماڵی خوشکەکانتان، یان ماڵی مامەکانتان، یان ماڵە پورەکانتان خوشکانی باوک، یان ماڵە خاڵەکانتان، یان ماڵە پورەکانتان خوشکانی دایک). ئەمانە ناسراون.

﴿ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ ﴾ واتە: ئەو ماڵانەی کلیلەکانیان بە ئێوەیە بە وەکیلی یان بە خاوەنداریتی، یان جگە لەوانە، بەڵام تەفسیر کردنی بە کۆیلە بۆچوونێکی بەهێز نیە لەبەر دوو هۆکار:

یەکەمیان: بێگومان کۆیلە پێی ناوترێ: (ملكت مفاتيحه) واتە: ئەو کۆیلەی کلیلەکەی لە لایە، بەڵکو دەوترێ: (ما ملكتمه) واتە: ئەو کۆیلەی کردووتانن بە موڵکی خۆتان، یان دەوترێ: (أو ماملكت أيمانكم)، (واتە: ئەو کەنیزەکانەی موڵکی خۆتانن)، چونکە ئەوان خاوەنی هەموویانن بە کۆ نەک تەنها خاوەنی کلیلی ماڵەکان.

دووەم: ماڵی کۆیلەکان لە دەرەوەی ماڵی خاوەنەکانیان نیە، چونکە کۆیلە خۆیو ماڵەکەی موڵکی گەورەکەیەتی، هیچ ڕوویەک نیە ببێتە مایەی گوناهبار بوونی ﴿ أَوۡ صَدِيقِكُمۡ ﴾ واتە: (یان ماڵی هاوڕێکانتان) گوناهبار نابن ئەمانە ئەگەر لەو ماڵانە بخۆن بەبێ مۆڵەت وەرگرتن، حیکمەتەکەیش تێیدا زانراوەو لە سیاقی دەقەکە دەردەکەوێ، چونکە ماڵی ئەوانەی ناویان هێنراوە عادەتو دابو نەریت چاوپۆشی کردوە لە خواردنیان، ئەویش بە هۆی خزمایەتیو نزیکیانەوە، یان بە هۆی مۆڵەت وەرگرتنی تەواو، یان هاوڕێیەتی، ئەگەر وادابنرێ لە یەکێک لەمانەدا ڕێگەی نەدا بە

خواردنـی ماڵەکـەی بـە هـۆی ڕەزیلیـەوە ئەوە دروسـت نیـە لێی بخـواو نارەحەتی لەسـەر لانابـرێ، ئەمیـش بە هـۆی حیکمـەتو واتـای دەقەکە.
خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا﴾ هەمـوو ئەوانـە دروسـتە ئەگـەر هەموویـان پێکـەوە نـان بخـۆن، یـان هـەر یـەک بەجیـا بـۆ خۆی نـان بخـوا، ئەمـە ڕەتکردنـەوەی نارەحەتیە نـەک ڕەتکردنـەوەی فـەزڵو چاکە، ئەگەرنـا چاکتـر وایە هەموویـان پێکەوە لەسـەر یەک خـواردن کۆببنـەوە ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا﴾ (واتـە: جـا کاتـێ چوونە هـەر ماڵێک لە ماڵان) ئەمە نەناسـراوە لە سـیاقی (الشرط) دا هاتـووە، ئەمـە ماڵـی مـرۆڤ خـۆی دەگرێتـەوە وە ماڵی جگە لە خۆیشـی، یەکسـانە لەو ماڵـەدا جێگیربـێ یـان نـا ئەگەر مـرۆڤ چـووە نێویـەوە ﴿فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: با هەندێکتـان سـڵاو لەوی تـر بکات، چونکە مسـوڵمانان وەکـو یەک وان لە خۆشەویسـتیو بەزەیـی هاتنەوەو سـۆزداریان بـۆ یەکتر.
سـڵاوکردن ڕێگەپێـدراوە بـە چوونە ناوەوەی سـەرجەم ماڵـەکان بەبێ جیاوازی لـە ماڵێک بـۆ ماڵێکی دیکـە، وە مۆڵەت وەرگرتن لە پێشـەوە ئامـاژەی پێکراوەو باسـکراوە بە دوورو درێژی.
پاشـان خـوا ﷻ وەسـفی ئـەم سـەلامەی کـردوەو فەرموویەتـی: ﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً﴾ واتـە: سـڵاوەکەی ئێـوە کـە دەڵێـن: (السـلام علیکـم ورحمـە الله وبرکاتـە)، یـان (السـلام علیکـم وعلـی عبادنـا الصالحیـن)، ئەگـەر بچنـە نێـو ماڵەکانەوە، ﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: سـڵاوکردنێکە لەلایـەن خواوە، کردوویەتی بە شـەریعەت بـۆ ئێـوە، ﴿مُبَٰرَكَةً﴾ واتـە: چونکـە سـەلامەتە لـە هەمـوو ناتەواویـەک، وە دەبێتە مایـەی بەدەسـتهێنانی ڕەحمـەتو فـەڕو بەرەکەتو نـەشو نماکـردن ﴿طَيِّبَةً﴾ لەبەر ئـەوەی لـە وتـە چاکو جـوانو خۆشەویسـتەکانە لە لای خـوا ﷻ، کە دەبێتـە مایەی پاکی نەفسـی زینـدوو، وە خۆشویسـتنو دروسـتبوونی پەیوەندی.
دوای ئەوەی خوا ﷻ باسـی ئەو حوکمە گەورانـەی کرد فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ واتـە: ئـا بـەو شـێوە خـوا ئایەتەکانـی بـۆ ئێـوە روون دەکاتەوە، ئەوانـەی بەڵگـەن لەسـەر حوکـمو بڕیـارە شـەرعیەکان، ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڵکو عەقڵتـان بخەنـە کارو بیـری لێبکەنـەوەو لێـی تێبگـەن، بـۆ ئەوەی ببنـە خاوەن ئـەو عەقڵە ژیـرو دڵە تەواوانە، بێگومان ناسـینی حوکمە شـەرعیەکان لەسـەر شـێوەی خـۆی عەقڵی پێ

زیـاد دەبێو گەشـە دەکات، چونکە ماناکانی گـەورەو پایەدارن، وە ئـاداب‌و پەروەردەکانی گەورەتریـن ئادابـن، وە لەبـەر ئەوەی پاداشـت بەپێـی کردەوەیـە، هەروەکو چـۆن عەقڵی بەکارهێنـاوە دەربـارەی تێگەیشـتن لە پەروەردگـاری‌و بیرکردنەوە لە ئایەت‌و نیشـانەکانی، خوا ﷻ عەقڵـی بەهێزتـرو زیاتر دەکات.

ئـەم دەقانـە دەبنە بەڵگە بۆ یاسـایەکی گشـتی ئەویش بریتیە لە (بەراسـتی عـورف‌و عادەت تایبـەت کـراوە بـە وتـەکان، وەک تایبەتکردنـی وتـە بـۆ وتـە)، بێگومـان لـە بنچینـەدا رێگـری کـراوە مرۆڤ خواردنی کەسـێکی دیکـە بخوات، لەگـەڵ ئەوەدا خـوا ﷻ رێگەی داوە خواردنـی ئـەو ماڵانەی باسـکرا بخـورێ، ئەمیش بە هـۆی داب‌و نەریتـەوە، جا هەموو مەسـەلەیەک دەوەسـتێت لەسـەر مۆڵـەت پێدانـی خاوەنـی شـتەکە، جـا ئەگـەر زانـرا ئەو مۆڵـەت دەدا بـە قسـەکردن بـێ، یان بـە نەریت ئەوە دروسـتە دەسـتی بـۆ ببرێ.

وە دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی باوک دروسـتە بـۆی ماڵی کوڕەکـەی ببات‌و بیـکات بە موڵکـی خـۆی بەبـێ ئەوەی زیانـی لێبـدات، چونکە خـوا ماڵی کوڕەکـەی ناو نـاوە بە ماڵ بـۆ باوکەکە.

وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی هەڵسـوکەوت بـە مـاڵ کەسـێکەوە دەکات، وە ژنەکـەی‌و خوشـکەکەی‌و وێنـەی ئـەوان، دروسـتە بۆیـان بخـۆن لێـی بـە شـێوەیەکی ئاسـایی، وە دەرخـواردی کەسـێکی بـدەن پێویسـتی پێـی بێـت.

وە بەڵگـەی تێدایـە لەسـەر بەشـداری کردن لـە خواردندا، یەکسـانە پێکەوە نـان بخۆن، یان جیـا جیا، ئەگەرچـی کەسـێکیان زیاتر بخوات لـەوی دیکە.

(٦٢-٦٤): ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾﴾:




﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ﴾ ئەمە ڕێنیشاندانە لە لایەن خواوە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، ئەوان ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا بوونایە لەسەر کارێکی گرنگ کە کۆیان دەکاتەوە، وەک جیهادو ڕاوێژ کردنو وێنەی ئەوانە، لەو کاروبارانەی بڕواداران تیادا بەشدارن، بەرژەوەندی وادەخوازێ هەموویان کۆدەنگ بنو دووبەرەکیان تێدانەبێ، ئەوەی بە حەقیقەت بڕوای بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هەیە، ناچێت بۆ کارێ لە کاروبارەکان، تا نەیگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەکەی، وە دەست نابات بۆ هیچ شتێ کە تاک لایەنە بێت، مەگەر بە مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ یان جێگرەوەکەی لە دوای خۆی، بۆیە ئیمانی بەوەوە پەیوەست کردوە، هیچ کارێ ئەنجام نەدات بە بێ مۆڵەت، وە وەسفی کردوە لەسەر ئەم ڕەفتارەو ئەدەبو ڕەوشتی جوانیان لەگەڵ پێغەمبەرو جێنشینەکانی لە فەرمان ڕەواکان لە خۆیان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (واتە: بێگومان ئەوانەی مۆڵەتت لێوەردەگرن ئەوانە کەسانێکن بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە) بەڵام ئایا مۆڵەتیان پێدەدا یان نا؟ بۆ مۆڵەت پێدانیان دوو مەرجی باسکردوە:

یەکەم: دەبێ بۆ کارێک بێ لە کاروباری مسوڵمانان، بەڵام ئەو کەسەی داوای مۆڵەت دەکات

بەبێ هیچ بیانوویەک ئەوە مۆڵەتی پێ نادرێ.

دووەم: دەبێ ئەو مۆڵەتە لە پێناو بەرژەوەندیەکدا بێ، بەبێ بوونی زیان لە مۆڵەت پێدانیدا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا ٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِبَعۡضِ شَأۡنِهِمۡ فَأۡذَن لِّمَن شِئۡتَ مِنۡهُمۡ ﴾ (واتە: جا هەر کاتێک ئەوانە داوای مۆڵەتیان لێکردیت بۆ هەندێ ئیش‌و کاری تایبەتی خۆیان، ئەوە هەرکامیان خۆت ویستت مۆڵەتی پێبدە)، جا ئەگەر بیانووی هەبوو و داوای مۆڵەتی کرد، ئەگەر لە دانشتنیدا یان ڕۆشتنیدا، بەرژەوەندیەک هەبوو لە بۆچوونەکانی، یان بە زیرەکی‌و بوێری، وە هاوشێوەی ئەوانە، ئەوە مۆڵەتی پێنادرێ.

لەگەڵ ئەمەدا ئەگەر داوای مۆڵەتی کرد، بەو دوو مەرجە مۆڵەتی پێدا، خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردوە داوای لێبوردنی بۆ بکات، لەوەیە لە داوای مۆڵەت وەرگرتنەکەیدا کەمتەرخەم بووبێ، لەبەر ئەمەیە فەموویەتی: ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمُ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (واتە: داوای لێبووردنیان بۆ بکە لەخوا، بەڕاستی خوا لێبووردەی میهرەبانە)، لە گوناهەکانیان خۆش دەبێ‌و ڕەحمیان پێ دەکات، لەبەر ئەوەی داواکردنی مۆڵەتی بۆی بە ڕەوای بینیوە لەگەڵ بیانوودا.

﴿ لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ ﴾ واتە: ئەی مسوڵمانان بانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ وەک بانگ کردنی خۆتان دامەنێن، یاخود بە ناوی خۆیەوە بانگی مەکەن، وەک ئەوەی چۆن یەکتر بانگ دەکەن، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن ڕاستەوخۆ بە دەمیەوە بچن، تەنانەت لەناو نوێژیشدا پێویستە وەڵام بدرێتەوە، بۆ هیچ کەسێک نیە قسەیەک بکات پێویست بێ لەسەر ئوممەت قسەکەی وەربگرێ‌و کاری پێبکات تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێ، چونکە ئەو پارێزراوەو مەعصومە، وە ئێمەش فەرمانمان پێکراوە شوێنی بکەوین، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفال، (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێ بانگتان دەکات بۆ بەرنامەو ڕێبازێک دەتان ژێنێتەوەو ژیان بەخشە).

وە بەهەمان شێوە کاتێ پێغەمبەری خوا بانگ دەکەن با وەک بانگ کردنی خۆتان نەبێ هەندێکتان بۆ هەندێکی دیکە، مەڵێن ئەی موحەممەد کاتێ کە بانگی دەکەن یان ئەی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا وەک چۆن هەندێکتان قسە لەگەڵ هەندێکی دیکەدا دەکەن، بەڵکو دەبێ بەڕێزو شەرەفەوە بانگ بکرێت، جیابکرێتەوە لە خەڵکی دیکە، بوترێ: ئەی نێردراوی خوا ﷺ ﴿ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ ﴾ واتە: کاتێ خوا ﷻ

وەسفی ئەو بڕوادارانەی کرد کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئەوانەی کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە کارێکی گرنگدا کۆیان دەکاتەوە نەدەڕۆیشتن هەتا مۆڵەتیان وەرنەگرتبایە، هەڕەشەی کردوە هەرکەس ئەمە نەکاو بەبێ مۆڵەت بڕوا ئەوە ئەگەرچی لە پێش چاوی ئێوە شاراوەیە، لە پەنای خەڵکیەوە دەرواو کەس پێی نازانێ، تەنها ئەوە مەبەستە لە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ﴾ واتە: لەوکاتەی دەردەچن پەنا دەبەنە بەر شتێک لەبەر چاوی خەڵکی بیانشارێتەوە، خوا پێیان دەزانێو پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەوە تەواوترین پاداشت، لەبەرئەمەیە هەڕەشەی لێکردوون، فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ ﴾ واتە: دەچن بۆ هەندێ کاروباریان دەربارەی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، جا چۆن کەسێک نەچێت بۆ کارێک لە کاروبارەکانی؟! بەڵکو وازی هێنابێ لە فەرمانێکی خوا ﷻ بەبێ هیچ سەرقاڵیەک؟! ﴿ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ ﴾ واتە: لە دونیادا تووشی شیرکو شەڕو خراپەکاری ببن، ﴿ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (واتە: یان سزایەکی سەختیان تووش ببێ لە ڕۆژی دواییدا).

﴿ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ (واتە: بێداربنەوە بەڕاستی ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە بۆ خوایە)، هەموویان موڵکو بەندەی ئەون، کاروباریان بەڕێوەدەبات بە حوکمی قەدەریو حوکمی شەرعی خۆی.

﴿ قَدْ يَعْلَمُ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ ﴾ واتە: زانیاریی (خوا) دەوری ئەوەی داوە کە ئێوە لەسەری دەڕۆن لە خێرو چاکە، وە زانایە بە هەموو کردەوەکانتانو هەمووی بۆتان دەژمێرێ، وە قەڵەمی پێدا هێناوە، وە فریشتە بەڕێزە پارێزەرەکان هەموویان لەسەرتان نووسیوە.

﴿ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ ﴾ لە ڕۆژی دواییدا (دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا)، ﴿ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ﴾ واتە: هەواڵیان دەداتی بە هەموو کردەوەکانیان، هەواڵێک پڕاو پڕی ئەوەیە کە کردوویانە، ئەندامەکانی جەستەشیان شایەتیان لەسەر دەدەن، هیچ چاکەو خراپەیەکی بۆ کەم ناکەنەوە، دوای ئەوەی زانستی پەیوەست کرد بە کردەوەکانیان، ئنجا باسی گشتگیری کرد دوای تایبەتمەندی، فەرمووی: ﴿ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (واتە: خوا بە هەموو شتێک زانایە).

تەفسیری سوورەتی (النور) تەواو بوو.


سُورَةُ الفُرقَانِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾

## تەفسیری سوورەتی (الفرقان)
## مەککیە (٧٧) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

ئەمــە ڕوونکردنەوەیەکــە لــە لایــەن خواوە بــۆ مەزنــی تــەواوی خــواو تەنهایــی لــە یەکتاناســیدا لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە، وە زۆری چاکەکانــی، فەرموویەتــی: ﴿ تَبَارَكَ ﴾ واتــە: گەورەیــیو مەزنــی بــۆ ئــەو خوایــە کــە خــاوەن ســیفاتو وەســفە تەواوەکانــە، وە خــاوەن زۆرتریــن خێــرو چاکەیــە، کە لــە مەزنتریــن خێــرو نیعمەتەکانی ئەوەیــە ئــەم قورئانــەی دابەزاندووە کە جیاکەرەوەیە لــە نێوان حەڵاڵو حەرامــداو هیدایەتو گومراییــدا، وە لــە نێــوان خاوەنی خۆشــبەختیو خاوەنــی بەدبەختیــدا، ﴿ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ ﴾ (بۆ ســەر بەنــدەی) موحەممــەد ﷺ کــە لە ســەرجەم پلــەو پایەکانــی بەندایەتیــدا تــەواوە، وە لە ســەرووی هەمــوو پێغەمبەرانەوەیــە ﴿ لِيَكُونَ ﴾ تا ئــەو دابەزینە بۆ جیاکەرەوە بێت لەســەر بەندەکــەی ﴿ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾ (واتــە: بۆ هەمــوو جیهانیانیش ترســێنەر بێت) بیانترسێنی بــە تووڕەیــیو ســزای خــوا، وە شــوێنی ڕەزامەندی خوایــان بۆ شــی بکاتەوە لــە تووڕەیی، تەنانــەت ئەگەر هــەر کەســێ ئاگادارکردنەوەکانی وەربگــرێو کاری پێ بــکات، ئەوە لەو کەســانەیە کــە ڕزگاریــان بــووە لــە دنیــاو دوارۆژدا، ئەوانــەی خۆشــبەختی هەتاهەتاییان بەدەســت هێنــاوە، ئایا لەســەرووی ئــەم نیعمەتو فەزڵــەوە شــتێکی دیکە هەیــە؟ مەزنی بۆ ئــەو خوایــەی کــە ئەمــە لــە هەندێــک لــە چاکــەکانو فــەڕزو بەرەکەتەکانیەتی.

﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتــە: بەڕێوەبردنــی ئاســمانەکانو زەوی تەنهــا

بـۆ خۆیەتـی، هەمـوو ئەوانـەی تیایدایـە موڵـکو بەنـدەی ئـەون، ملکەچـن بـۆ مەزنـی پەروەردگاریێتـی ئەو، هەژارن بۆ ڕەحمەتـی ﴿ وَلَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ ﴾ (واتـە: ئـەو زاتـەی کـەس هاوبەشـی نیـە لـە فەرمانڕەوایـیو موڵکداریدا).

چـۆن دەبـێ ئـەو زاتـە منـداڵ یـان هاوبەشـی بێت، ئـەو خـۆی خـاوەن موڵکە جگـە لەو زاتـە هەمـوو کۆیلـەی ئـەون، ئـەو زاڵـەو جگـە لـەو بەزیـوە، ئـەو دەوڵەمەنـدو بـێ نیازە لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، بەدیهێنـراوەکان پێویسـتیان بەوە، پێویسـتیەکی خـودی لە هەموو ڕووەکانەوە؟!!

چـۆن هاوبەشـی هەیە لـە موڵکداریدا، لـە کاتێکدا نێوچاوانـی هەموو بەندەکان بەدەسـیەتی، ناجوڵێنـەوە یـان لـە جوڵە ناکـەون، وە هیچ کارو بـارێ بەڕێوەنابـەن بە مۆڵەتی ئـەو نەبێ؟! بـەرزیو مەزنی بۆ ئـەو خوایە، ئەوانـەی ئەوەیان گـوت دەربارەی وەکو پێویسـت قەدریان نەگـرت، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ ﴾ هەمـوو جیهانـی سـەرەوەو جیهانـی خـوارەوە دەگرێتەوە، لـە گیاندارەکانـیو ڕووەکەکانـیو بێگیانەکانی.

﴿ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا ﴾ واتـە: هەمـوو بەدیهێنراوێک بە ئەندازەی خۆی پێبەخشـیوە کە شایسـتەیە پێـیو دەگونجـێ لەگەڵ دروسـتکرنیدا، بـە پێی حیکمـەتو دانایی خۆی، بە جـۆرێ هەموو بەدیهێنراوێـک، بـە بیـری هیـچ عەقڵێکـی ڕاسـتەقینەدا نایـەت، کە بـە پێچەوانەی شـێوەو وێنـەی خۆی دروسـت بکـرێ، بەڵکو هـەر بەشـێکی بەدیهێنراوێک ناگونجـێ تەنها لەگەڵ ئـەو شـوێنەی خۆیـدا نەبـێ، خـوا فەرموویەتـی: ﴿ سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ٣ ﴾ الأعـلى، (واتە: تەسـبیحاتو ستایشـی پەروەرگـاری بەرزو بڵندو پایـەدارت بکـە * ئەو زاتەی هەموو شـتێکی دروسـتکردوە بـە جوانیو ڕێکـو پێکی * ئەو زاتەی نەخشـەی کێشـاوە بۆ هەموو شـتێک).

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ٥٠ ﴾ طـه، (واتـە: مووسـا ﷺ وتـی: پەروەرگـاری ئێمـە ئـەو زاتەیـە دروسـتکردنێکی تایبەتـی بـە هەمـوو شـتێک بەخشـیوە، پاشـان ڕێنمایشـی کـردوە بـۆ کاری خـۆی). خـوا ﷻ دوای ئـەوەی تـەواویو مەزنـیو فـەزڵو چاکەکانـی ڕوون کـردەوە، کە پێویسـتە ئـەو بە تەنهـا بکرێت بە خۆشویسـتراوی پەرسـتراوی مـەزن، وە بـە تاکو تەنها بپەرسـترێو هاوەڵی بۆ دانەنرێ، پێویسـتە کە باسـی پووچـی بەندایەتـی کردنـی غەیـری خـۆی بکات.

وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ
وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا
وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا (٣) وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ
إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا
وَزُورٗا (٤) وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ
عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا (٥) قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا (٦)
وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي
ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا (٧)
أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ
ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا (٨) ٱنظُرۡ
كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ
سَبِيلٗا (٩) تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا (١٠) بَلۡ
كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا (١١)

**بۆیە فەرموویەتی:**

**(٣):** ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴿٣﴾ ﴾

﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾ **واتە: ئەمە لە سەرسوڕهێنەرترین سەرسوڕهێنراوەکانە، وە چاکترین بەڵگەیە لەسەر گێلیو گەمژەییو ناتەواویو کەمو کوڕی عەقڵیان، بەڵکو گەورەترین بەڵگەیە لەسەر بوێریو چاو قایمیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان، کە چەند پەرستراوێک بۆ خۆیان بڕیار بدەن بەم سیفەتە لە ئەوپەڕی ناتەواویدابن، ئەو پەرستراوانە توانای دروستکردنی هیچ شتێکیان نەبێت، بەڵکو خۆشیان دروستکراوبن، بەڵکو هەندێکیان بە دەستی خۆیان دروستیان کردوون.**

﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴾ **واتە: (دەسەڵاتیان نیە بۆ خۆیان) نەکەمو نەزۆر، چونکە نەناسراوە لە سیاقی نەفیدا هاتووە.**

﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴾ **واتە: (هەروەها مردنو ژیانو) زیندووبوونەوەی دوای مردنیان بە دەست نیە، مەزنترین ئەحکامەکانی عەقڵ پووچکردنەوەی پەرستراوێتی ئەوانەیە، وە خراپیانەو خراپی عەقڵی ئەو کەسانەیە کە کردوویانن بە پەرستراوو هاوبەش لەگەڵ خولقێنەری هەموو خولقێنراوەکان، بەبێ ئەوەی هاوبەشی هەبێ لە خولقاندنیاندا، ئەو زاتەی کە سوودو زیانو بەخشینو ڕەتکردنەوەو ژیانو مردنو زیندو کردنەوەی لەناو گۆڕەکاندا بەدەستە، ئەو زاتەی کۆیان دەکاتەوە لە ڕۆژی زیندووبونەوەدا، دووماڵی بۆ داناون، ماڵی بەدبەختیو ڕیسواییو سەرشۆڕی، بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە دەکەنە هاوبەش، وە ماڵی خۆشبەختیو ڕزگاربوونو نازو نیعمەتی بەردەوام، بۆ ئەو کەسانەیە خوا بەتاکو تەنها دەپەرستن.**

دوای ئـەوەی بـە بەڵگـەی یەکلاکـەرەوەی ڕوونو ئاشـکر ڕاسـتی یەکتاپەرسـتیو بەتـاڵ کردنـەوەی پێچەوانەکەی چەسـپاند، ئنجا ڕاسـتی پەیامـی پێغەمبەرانی جێگیر کردو قسـەی ئەوانـەی بەتـاڵ کـردەوە کـە پێچەوانـەی دەجوڵێنەوە، جـا فەرموویەتی:

(٤-٦): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٥﴾ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ﴾ ئـەو بێبڕوایانـەی کوفریـان لەسـەر پێویسـت بـووە دەربـارەی قورئـانو پێغەمبەر وتوویانـە: ئـەم قورئانـە درۆیەکـەو پێغەمبەر هەڵیبەسـتووە بە نـاوی خواوە، وە کەسـانی تر بـۆ ئـەو هەڵبەسـتنە هـاوکاری دەکەن.

خـوا ﷻ وەڵامـی داونەتـەوە کـە ئـەوە سـتەمو بوختانێکـی گەورەیـەو ناچێتـە عەقڵی هیچ کەسـێکەوە، ئـەوان لـە هەموو کـەس چاکتـر بارودۆخـی پێغەمبەریـان دەزانـی، دەیانزانی ئـەو کەسـێکی ڕاسـتگۆو ئەمانـەت پارێزو چاکەخـوازی تـەواوە، بێگومان نـە پێغەمبەر، وە نـە هیچ کەسـێ لـە بەدیهێنـراوەکان ناتوانن لـە خۆیانەوە ئـەو قورئانـە بهێنن، ئـەو قورئانە گەورەتریـن قسـەو بەرزترینیانە، بـە دڵنیاییەوە پێغەمبـەر ﷺ هیچ کەسـێکی کۆنەکردۆتەوە هـاوکاری بـکات لەسـەر هەڵبەسـتنی ئـەو قورئانـە، بـە ڕاسـتی ئەوانـە سـتەمو بوختانێکی گەورەیـان کـردوە، وە لـە کۆی قسـەکانیان ئـەوە بوو کە وتیـان ئەم قورئانـەی موحەممەد هێناویەتی: ﴿ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا ﴾ واتە: ئەمە بەسـەرهاتو داسـتانی پێشـینە دەمـاو دەم گواسـتراوەتەوە، موحەممەدیش لەبـەری گرتۆتەوە، ﴿ فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾ (واتـە: ئنجـا دەخوێنرێتەوە بەسـەریدا لـە بەیانیـانو ئێواراندا).

**ئەم قسەی ئەوانە چەند شتێکی مەزن لەخۆدەگرێ:**

یەکـەم: تۆمەتبارکردنـی پێغەمبـەر ﷺ کـە چاکتریـنو ڕاسـتگۆترینیانە بـە درۆزنو چـاو قایمـی مەزن.

دووەم: هەوڵدانیـان دەربـارەی ئـەم قورئانە- کە ڕاسـتگۆترین قسـەو مەزنترینیانـە- بەوەی درۆیەکی هەڵبەسـتراوە.

سـێیەم: لـە نێـو ئەوانـەدا پێیـان وابـووە مرۆڤـەکان دەتوانـن هاوشـێوەی قسـەی خـوا ﷻ شـتێک بهێنـن، دروسـتکراوێکی ناتـەواو لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە دەتوانێ لە قسـەکردندا ڕووبـەڕووی دروسـتکەری تـەواو بـێ لـە هەمـوو ڕوویەکەوە بـە یەکێک لە سـیفەتەکانی ئەویش قسـەکردنە.

چـوارەم: بێگومـان دۆخـی پێغەمبـەر ﷺ زانـراو بوو، ئـەوان بـاش دەیانزانی کە ئـەو نازانێ بنووسـێ، وە لەگـەڵ ئەوانـەدا کۆنابێتـەوە تـا بۆی بنووسـن، وە ئـەوان ئەوەیان پـێ وابوو.

لەبەرئـەوە خوا ﷻ بەرپەرچـی دانەوەو فەرمـووی: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: ئـەو زاتـەی دایبەزاندۆتە خـوارەوە زانیاریی دەوری هەموو ئاسـمانەکانو زەوی داوە لـە پەنهـانو ئاشـکراو دیـارو نادیـاردا، وەک فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ الشعراء (واتـە: بەڕاسـتی ئـەم قورئانە لەلایەن پەروەردگـاری جیهانەکانەوە ڕەوانەکـراوە * جوبرائیلی ئەمین دای بەزانـدووە * بـۆ سـەر دڵـی تۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ تا بچیتـە ڕیزی ئەو کەسـانەوە کە خەڵکـی بێـدار دەکەنـەوە، وە لە خەوی خەفڵـەت دایـان دەچڵەکێنن).

ڕووی بەڵگەهێنانـەوەو حوججـە کـردن لەسـەریان بێگومان ئـەو زاتەی قورئانـی دابەزاندوە بـە زانسـتی دەوری هەمـوو شـتێکی داوە، ئەسـتەمەو نابێـت بەدیهێنراوێـک شـتێک بڵێو بیداتـە پـاڵ قورئانـی پیـرۆز، وە بڵـێ: ئەمـە لەلایـەن خـواوە هاتووە، لـە کاتێکـدا لەلایەن خـواوە نەهاتـووە، وە خوێـنو ماڵـی ئەوانە حەڵاڵ بـکات کـە پێچەوانـەی دەجوڵێنەوە، وە پێـی وابـێ خـوا ﷻ هەمـوو ئەوانـەی پێ وتـووە، خوای گـەورەش زانایـە بە هەموو شـتێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا یارمەتـی دەداو سـەری دەخـات بەسـەر دوژمنەکانیدا، وە دەسـەڵاتی دەدا بەسـەر گـەردنو وڵاتیاندا، بۆ هیچ کەسـێک نیـە نکووڵی لـەم قورئانە بـکات، مەگەر پاش نکووڵـی کردنـی زانسـتی خـوا ﷻ، ئەم قسـەیە هیچ کەسـێک لە نەوەکانـی ئـادەم نایڵێت، جگـە لە کۆمەڵـێ نەبێ لـە فەلسـەفەگەراکان.

بێگومان باسـکردنی زانسـتی خـوا ﷻ گشـتگیرە، ئاگاداریـان دەکاتەوەو تایبەتیـان دەکات بـە بیرکردنـەوە لە قورئـان، بێگومان ئـەوان ئەگەر بیـری لێبکەنـەوە زانسـتو بڕیارەکانی خـوا ﷻ دەبینـن، کـە بەڵگەیەکـی یەکلاکەرەوەی تێدایە لەسـەر ئـەوەی ئـەم قورئانە تەنها لەلایـەن زانـای پەنهانو ئاشـکرا دابەزیـوە، وە لەگەڵ نکووڵـی کردنیان لە یەکتاپەرسـتیو پەیامـی پێغەمبەرایەتـی لە نەرمو نیانی خـوا ﷻ ئەوەیـە وازی لێنەهێناون بە سـتەمەکانیانەوە

بمێننــەوە، بەڵکــو بانگــی کــردوون بــۆ تەوبــەو گەڕانــەوە بــۆ لای، وە پەیمانی پێــداون بە لێخۆشــبوونو میهرەبانــی، ئەگــەر تەوبەیــان کــردوو گەڕانــەوە، جــا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا ﴾ واتــە: وەســفکراوە بــە لێبوردەییو لێخۆشــبوو بــۆ ئەو کەســانەی تاوانبارو گوناهــکارن، ئەگــەر هەســتان بە هۆکارەکانی لێخۆشــبوون ئەویــش بریتیە لــە گەڕانەوە لەو ســەرپێچیانەی کردوویانــەو تەوبەکردنیــان لێــی ﴿ رَّحِيمًا ﴾ واتە: بــە بەزەییە بۆیــان چونکە ســزای بۆ پێش نەخســتوون، لــە کاتێکدا ئەوان شایســتەی ئەوە بوون، تەوبــەی لێوەرگرتوون دوای ســەرپێچی، وە تاوانەکانی پێشوویانی ســڕیوەتەوەو چاکەکانیشی لێوەرگرتوون، وە ئەو کەســەی دەگەڕێتــەوە بۆ لای دوای سەرکێشــی کــردنو پشــت تێکردنی دەبێتە کەســێکی گوێڕایــەڵو ملکــەچ بۆ فەرمانەکانــی خوا ﷻ.

(٧-١٤): ﴿ وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴿١٠﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ﴿١٣﴾ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ ﴾ ئەمــە قســەو وتارەکانــی بەدرۆدانــەران بــوو کــە پێغەمبــەر ﷺو پەیامەکەیــان پــێ لەکــەدار دەکــرد، ئەویــش ئــەوە بــوو ئــەوان بەهانەیــان دەهێنایــەوە کــە ئایــا بۆچی فریشــتەیەک نەبــوو، یــان پاشــایەک، یــان فریشــتەیەک هــاوکاری بووایــە لــە گەیاندنی پەیامەکەیــدا، جــا وتیان: ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ ﴾ واتــە: ئەمە چۆن بانگــەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات؟ بــە گاڵتەجــاڕیو ســوکایەتیەوە ﴿ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ ﴾ (واتــە: خــواردن دەخــوا) ئەمــە لــە تایبەتمەندیەکانــی مرۆڤــە، ئەی بــۆ چی فریشــتە نەبوو خــواردن نەخوا، پێویســتی بــەوە نەبێ کــە مــرۆڤ پێویســتی پێیەتی؟!

﴿ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ ﴾ (واتــە: بــە بــازاڕدا دەڕوات) بە بۆچوونی ئەوان نابــێ پێغەمبەر ﷺ بێتــە ناو بازار بۆ کڕینو فرۆشــتن، خوا فەرمــووی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ ﴿٢٠﴾ ﴾الفرقــان، (واتــە: ئێمــە پێش تۆ

هـەرکام لـە پێغەمبەرانمـان ناردبێـت بێگومـان ئـەوان خواردنیـان خـواردوە وە بە بـازاڕدا ڕۆیشـتوون)، ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ ﴾ واتـە: بۆچی فریشـتە دانەبەزیوە لەگەڵیـدا یارمەتی بداتو پشـتیوانی لێبـکات ﴿ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴾ (واتـە: بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ترسـێنەر بێـت)، بـە بۆچوونی ئـەوان تەنهـا پێغەمبەر ﷺ بەس نیـە بۆ نێـردراوی، لە توانای ئـەودا نیە بەو کارە هەڵسـێت.

﴿ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ ﴾ واتـە: مـاڵو سـامانێکی زۆری (لـە ئاسـمانەوە بۆ فـڕێ بدرایە) بەبـێ مانـدوو بـوون ﴿ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَا ﴾ (واتە: یان باخێکـی ببووایە لێـی بخواردایـە) بـەو مـاڵو سـامانو بـاخو باخاتەی لەبـەر دەسـتیدایە بـێ نیـاز بووایە لە چوونـی بۆ بـازاڕ بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕزقو ڕۆزی.

﴿ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ زۆڵـمو سـتەمیان وای لێکـردن ئەو قسـەیە بکەن نـەک گومان بـردنو نەناسـینەوەیان: ﴿ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴾ (واتـە: ئێـوە تەنهـا شـوێنی پیاوێکـی جـادوو لێکـراو کەوتـوون)، بێگومـان ئـەوان بـاش دەیانزانـی عەقڵـی کامڵـەو قسـەکانی جـوانو ڕاسـتن،و، پارێـزراوە لـە هەمـوو تانەو تەشـەرێ.

دوای ئـەوەی دەرکـەوت ئـەم قسـانە زۆر سەرسـووڕهێنەرن، خوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ ﴾ (واتـە: سـەیرکە چـۆن نموونە بـۆ تۆ دێننـەوە) ئەویش: ئـەی بۆچی فریشـتە نەبـوو، تایبەتمەندیەکانـی لـێ دابڕێنرایە؟ یـان فریشـتەیەکی لەگەڵدا بووایـە، چونکـە خـۆی بـە تەنهـا توانـای نیـە لەسـەر ئـەوەی باسـی دەکات، یـان مـاڵو سـامانێکی زۆری بـۆ دابەزیایـە، یان بـاخو باخاتێکی بـۆ دابنرایـە بێنیازی کرایـە لەوەی بە پـێ بچێـت بۆ بـازاڕ، یـان ئەوەیـە جـادووی لێکراوە.

﴿ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴾ (واتـە: بـەو هۆیـەوە گومـڕا بـوون، ئیتـر ناتوانـن ڕێگـای حـەقو ڕاسـتی بدۆزنـەوە)، کۆمەڵـە قسـەیەکی دژیەکیـان دەکـرد، هەمـووی لە نەفامـیو گومڕایـیو گەمژەییـەوە سـەرچاوەی گرتبـوو، لـە هیـچ یەکێـک لەو قسـانەدا ڕووناکـی هیدایـەت بەدی نەدەکـرا، بەڵکو کەمترین گومانـی تێدا بەدی نەدەکـرا پەیامەکە لەکـەدار بـکات، تەنهـا بە تەماشـا کردنو سـەرنجدانی قسـەکانیان، کەسـی عاقـڵ دەزانی ئەوانە بەتاڵنو پێویسـت نـاکات بەرپەرچیان بدرێتـەوە، لەبەر ئەمەیە خـوای گەورە فەرمانی کـردوە بـە وردبوونـەوەو سـەرنجدانیو بیـر کردنـەوە لـە قسـەکانیان، ئایا تەماشـا کردن وەسـتان پێویسـت دەکات لـە یەکلابوونـەوە بـۆ پێغەمبـەر بە پەیامەکـەیو بەڕاسـتدانانی؟

لەبەر ئەمەیە خوا هەواڵی داوە دەتوانی لەوە چاکترت پێ ببەخشێ لە دنیادا، جا فەرموویەتی: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ ﴾ واتە: (گەورەیی بۆ ئەو زاتەی ئەگەر بیەوێ لە دنیادا) لەوە باشترت پێدەبەخشێ کە ئەوان دەیڵێن، پاشان تەفسیری کردوە دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴾ (واتە: باخاتێک کە رووبار بەژێریدا دەڕوات وە چەند کۆشکی) بەرزو ڕازاوەت بۆ فەراهەم دێنێ، توانا و دەسەڵاتی خوا لەوە کەمتر نیە، بەڵکو خوا ﷻ- کاتێ دونیا لەوپەڕی کەمیو بێ نرخیدایە- بەخشیویەتی بە دۆستو پێغەمبەرانی بە پێی حیکمەتو ویستی خۆی، وە پێشنیاری دوژمنەکانیان بەوەی ئایا بۆچی ڕزقو ڕۆزی زۆرو نازونیعمەتی نەڕشتوە بە سەریاندا هۆکارەکەی ستەمو بوێریانە بەرانبەر بە خوا ﷻ.

کاتێ ئەو قسانەی ئەوان کردیان بە ڕوونی دەرکەوتووە کە پووچو بە تاڵن، خوا ﷻ هەواڵیداوە ئەو قسانەی کە کردوویانە بۆ ئەوە نەبووە بگەڕێن بە دوای حەقداو شوێن بەڵگە بکەون، بەڵکو بە هۆی کەللەڕەقیو عینادیو زوڵمو بەدرۆدانانی حەقەوە دەرچووە، ئەوەی وتیان لە ناخی دڵیانەوە دەرچوو دەربارەی پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِ ﴾ (واتە: بەڵکو ئەوانە بڕوایان بە ڕۆژی دوای نیە) کەسی بە درۆدانەرو عیناد کە هیچ مەبەستێکی نیە بۆ شوێنکەوتنی حەقو ڕاستی ئەوە هیچ ڕێگایەک نیە بۆ هیدایەتدانیو هیچ چارەیەک نیە بۆ مشتومڕ کردن لەگەڵیاندا، بەڵکو تەنها یەک چارە هەیە ئەویش دابەزینی سزایە بۆیان، لەبەرئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾ واتە: (ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ کەسێک بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبێ) ئاگرێکی مەزن کە بە توندی هەڵگیرساوە زۆر تووڕەیە بەرانبەر بە خەڵکەکەی، وە بە توندی هەناسەی ساردی تێدا هەڵدەکێشن.

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾
وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا
﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾
قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ
لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ ۚ
كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا ﴿١٦﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا
يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي
هَٰؤُلَاءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ
يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ
وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا الذِّكْرَ وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا ﴿١٨﴾
فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا
وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾
وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ
الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ
لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾

﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ واتـە: (کاتێ ئـەم ئاگـرە) پێـش ئـەوەی بگـەن پێـیو پێیـان بگـات ﴿سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا﴾ (واتـە: نرکـەو ناڵـەو گـڕو بڵێسـەی دەبیسـتن) ﴿وَزَفِيرًا﴾ واتـە: دڵـەکان دەکەونـە دڵەڕاوکـێو ترسـەوە هەریەکێکیـان لـە ترسـدا خەریکـە دەمـرێ، دۆزەخ لێیـان تـووڕە بـووە بـە هـۆی تووڕەیـی دروستکەرەکەی، گـڕوو تینـی زیـادی کـردوە بـە هـۆی کوفـرو بێبڕواییانـەوە ﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ﴾، (واتـە: کاتـێ فـڕێ دەدرێنـە جێگایەکـی تەنـگ لـە دۆزەخـدا) سـزا دەدرێـن، ئـەوان لـە نـاو راستیدان، خـوا شـوێنی تەنـگو قەرەباڵغـی خەڵکـی پێکـەوە کۆکردوەتـەوە، لەگـەڵ بەسـتنەوەیانو کـۆتو زنجیرکردنیـان، کاتـێ دەگەنـە ئـەو شـوێنە ناخۆشـەو زیندانـی دەکرێـن لـە خراپتریـن زیندانـدا ﴿دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾ داوای تیاچـوونو ڕیسـواییو شـەرمەزاری بـۆ نەفسو دەروونیـان دەکـەن، دەزانـن کـە سـتەمکارو دەسـتدرێژی کـەرن، خـوا دادپـەروەرە لەگەڵیانـدا، بـە هـۆی کردەوەکانیانـەوە خسـتونیەتە ئـەو جێگایـە، ئـەو داواکـردنو پاڕانەوەیـە هیـچ سـوودێکی نیـە بۆیـانو بێنیازیـان نـاکات لـە سـزای خـوا، بەڵکـو پێیـان دەوتـرێ: ﴿لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾ (واتـە: ئەمـڕۆ داوای تیاچوونێـک مەکـەن، بەڵکـو داوای تیاچوونێکـی زۆر بکـەن)، واتـە: ئەگـەر ئـەوەی داوای دەکـەن چەندیـن قـات زیـاد بـکات، هیـچ سـوودێکتان پێناگەیەنـێ جگـە لـە خـەمو حەسـرەتو خەفـەت نەبـێ. دوای ئـەوەی پاداشـتی سـتەمکارانی ڕوون کـردەوە، گونجـاوە باسـی پاداشـتی لـە خـوا ترسـان بـکات، جـا فەرموویەتـی:

(١٥-١٦): ﴿قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا ﴿١٦﴾﴾:

﴿ قُلْ ﴾ واتـە: پێیـان بڵـێ: -بـۆ ئـەوەی خراپـی بۆچوونیـان ڕوون بکەیتـەوە، وە هەڵبژاردنـی خـراپ بەسـەر بەسـوودا-: ﴿ أَذَٰلِكَ ﴾ ئـەوەی وەسـفم کـرد بۆتـان لـە سـزا، ﴿ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (واتـە: چاکتـرە یـان ئـەو بەهەشـتە هەمیشـەیی کـە بەڵێـن دراوە بـە پارێـزکاران) کـە توێشـووی لـە خـوا ترسـانو خۆپارێزیـە، هەرکەسێک هەڵسـێ بـە خۆپارێـزی، ئـەوە خـوا پەیمانـی پێداوە، ﴿ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً ﴾، (واتـە: پاداشـت دەدرێنـەوە) لەسـەر خۆپارێزیـان ﴿ وَمَصِيرًا ﴾ سـەرەنجامیان ئەوەیـە دەگەڕێنـەوە بـۆی، لـەوێ ئـارام دەگـرنو بـۆ هەمیشـەیی دەمێننـەوە.

﴿ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ﴾ واتـە: ئـەوەی داوای دەکـەن، هەمـوو ئاواتو ویستەکانیان بـەدی دێـت، لـە خـواردنو خواردنـەوەی بـە لـەززەتو جـلو بەرگـی ڕازاوەو ئافرەتانی جـوانو سـەرنجڕاکێش، وە کۆشـکو تـەلاری بـەرزو بـاخو باخـاتو بێستانی دیمـەن ڕازاوەو چەندەهـا جـۆری میـوە کـە تەماشـاکەران تامـەزرۆی خواردنـی دەکـەن، لـە جوانـیو جـۆراو جـۆریو جیـاواز لـە یەکتـر، وە ئـەو ڕووبارانـەی تێدەپـەڕن بەنـاو بەهەشـتو بیسـتانەکانیدا بـە هـەر شـوێنێک خۆیـان بیانـەوێ، هەڵدەقوڵێـنو فـوارە دەکـەن، لـە ئـاوی سـازگارو تـامو بۆنـی نەگـۆڕاو، وە چەندەهـا ڕووبـار لـە شـیر کـە تامـی نەگـۆڕاوە، وە چەندەهـا ڕووبـار لـە شـەرابی نایـاب بەلـەززەتو خـۆش بـۆ ئەوانـەی دەینۆشـن، وە چەندەهـا ڕووباریشـی تێدایـە لـە هەنگوینـی پاڵفتـە، وە بۆنـی خـۆشو جێگـای ڕازاوەو دەنگـی زۆر خـۆش، لـە خۆشـیدا خەریکـە دڵـەکان دەبـات، وە میوانـداری یەکتـریو چێـژ وەرگرتـن بـە پێکگەیشـتنی خۆشەویسـتان.

لـە هەمـوو ئەوانـە بەرزتـرو بەڕێزتـر، لـەززەت وەرگرتـن بـە بینینـی ڕوخسـاری پەروەردگـاری بـە بەزەیـیو بیسـتنی قسـەکانیو پایەبـەرز بـوون بـە نزیکـی، وە خۆشـبەختی بـە ڕەزامەنـدیو ئاسـایش لـە تووڕەیـی، بـەردەوام بوونـی ئـەم نـازو نیعمەتـەو زیـاد بـوون بـە پێـی تێپەڕبوونـی کارەکان ﴿ كَانَ ﴾ چوونـە نـاوەوەو گەیشـتن بـەو بەهەشـتانە ﴿ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴾ ئـەو بەندانـەی خۆپارێـزن داوای ئـەو بەهەشـتە دەکـەن بـە زمانـی حاڵیـانو زمانـی قسـەکردنیان، ئایـا کام لـەم دوو دنیـا کـە باسـکرا چاکتـرو شایسـتەترە بـۆ هەوڵـدان؟ وە کام لـەو کرێکارانـە -کرێکارانـیماڵـی بەدبەختـی، یـان کرێکارانـی ماڵـی خۆشـبەختی- لـە پێشـترن بـە فـەزڵو عەقـڵو

شـانازی، ئـەی ئـەو کەسـانەی خـاوەن ژیریـن؟

بـە ڕاسـتی حـەقو ڕاسـتی ڕوون بوویـەوەو ڕێگـا ڕوونـاک کراوەتـەوە، هیـچ بیانوویـەک نەماوەتـەوە بـۆ خراپـەکار لـە واز هێنانـی بەڵگـە، داوات لێدەکەیـن ئـەی ئـەو کەسـەی بریـارت داوە بەسـەر خەڵکێکـدا بـە بەدبەختـی (بـە هـۆی خراپـی کردەوەکانیـان)، وە خەڵکێکـی تـر (بـە هـۆی چاکـی کردەوەکانیـان) بمانگێـری لەوانـەی بـە چاکـەکار نووسـیوتە، وە پەنـا دەگریـن بـە تـۆ ئـەی خودایـە! لـە حاڵـی بەدبەختـان، داوای لێبوردنـت لێدەکەیـن لـەو حاڵەتـە.

(١٧-٢٠): ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی دۆخـی بتپەرسـتەکانو ئەوانـەی پەرسـتونیانن لـە ڕۆژی دواییـدا، وە خۆبەریکردنیـان لێیـانو بەتاڵـیو پووچـی ماندووبوونیـان ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ ﴾ واتـە: (خـوا لـەو ڕۆژەدا بتپەرسـتە بەدرۆدانـەرەکان کۆدەکاتـەوە)، ﴿ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ﴾ (واتـە: لەگـەڵ ئـەو پەرسـتراوانەی کـە پەرسـتوویانن جگـە لـە خـوا ﷻ) ئنجـا خـوا ڕوودەکاتـە پەرسـتراوەکان بـە شـێوەی توانـج لێـدان لەوانـەی پەرسـتوونیانن دەفەرمـوێ: ﴿ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾ واتـە: ئایـا ئێـوە فەرمانتـان پێکـردن بتانپەرسـتنو هەمـوو ئەوانەتـان لا جوانکـردن، یـان خۆیـان ڕێگـای ڕاسـتیان ون کـرد؟ ﴿ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ ﴾ (پەرسـتراوەکان وتیـان: پاکـی بـۆ تـۆ) خوایـان بـە پـاک ڕاگـرت لـە هاوەڵدانـان، وە نەفسـی خۆیـان بـەری کـرد لـەوەی بکرێـن بـە پەرسـتراو ﴿ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ ﴾ واتـە: شایسـتە نیـە بـۆ ئێمـە کـە جگـە لـە تـۆ پەرسـتراوێک دابنێیـنو پشـتی پـێ ببەسـتینو هـاواری پێبکەیـن، جـا ئەگـەر ئێمـە پێویسـتمان بـە بەندایەتـی تـۆ هەیـەو خۆمـان بـەری کـردوە لـە بەندایەتـی غەیـری تـۆ، چـۆن فەرمـان بـە کەسـێک دەکەیـن

بەندایەتـی ئێمـە بـکات؟ ئەمـە نابـێ، یـان پاکـیو بێگـەردی بـۆ تـۆ لـەوەی ﴿ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ﴾ (واتـە: بێجگـە لـە تـۆ پرسـتراوێک بـۆ خۆمـان دابنێـن)، ئەمـەش وەک وتـەی مەسـیح عیسـای کـوڕی مەریەمـە: ﴿ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ ﴿١١٧﴾ ﴾المائـدة.

(واتـە: وە بیربکـەرەوە کاتـێ خـوا (لـە ڕۆژی دواییـدا) دەفەرمـوێ: ئـەی عیسـای کـوڕی مەریـەم! ئایـا تـۆ وتوتـە بـە خەڵکـی کـە مـنو دایکـم بـە دوو پەرسـتراو دابنێـنو (بمانپەرسـتن) لـە جیاتـی خـوا؟ (عیسـا) وتـی: پـاکو بێگـەردی بـۆ تـۆ ئـەی خوایـە نابـێو ناگونجـێ بـۆ مـن شـتێ بڵێـم کـە بـە هیـچ شـێوەیە مافـی مـن نیـە ئەگـەر مـن ئـەو قسـەیەم کردبـێ ئـەوە بەڕاسـتی تـۆ ئاگـات لێیـە، چونکـە تـۆ ئـەوەی لـە ناخمدایـە دەیزانـی، بـەڵام مـن نازانـمو بێئاگـام لـەوەی کـە لـە ناخـی تـۆ دایـە، بـە ڕاسـتی تەنهـا تـۆ زانـای تـەواوی بـە هەمـوو نهێنیـەک * هیچـم پـێ نەوتـوون بێجگـە لـەوە نەبـێ کـە تـۆ فەرمانـت پێـدام کـە بەندایەتـی خـوا بکـەن کـە پەروەردگـاری مـنو ئێوەیشـە).

وە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾سبأ. (واتـە: وە ڕۆژێ خـوا هەموویـان کۆدەکاتـەوە پاشـان بـە فریشـتەکان دەفەرمـوێ: ئایـا ئەوانـە (لـە دونیـا) ئێوەیـان دەپەرسـت * (فریشـتەکان) دەڵێـن: پـاکو بێگـەردی بـۆ تـۆ تەنیـا تـۆ گـەورەی ئێمەی نـەک ئـەوان بەڵکـو ئەوان جنۆکەیـان دەپەرسـت زۆربەیـان بڕوایـان بـەوان (جنۆکـە) هەبـوو)، وە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ ﴾الأحقـاف. (واتـە: کاتێکیـش خەڵـک کـۆ دەکرێنـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا، پەرسـتراوەکان دەبنـە دوژمنیـان، وە بـە پەرسـتنەکەیان بـڕوا ناکـەن).

دوای ئـەوەی خۆیـان بـەری کـرد لـەوەی ئەوەیـان داوای کردبـێ بیانپەرسـتن، یـان گومڕایـان کردبـن، ئنجـا باسـی هـۆکاری گومڕابوونـی هاوبەشـدانەرانیان کـرد، وتیـان: ﴿ وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ ﴾ (واتـە: بـەڵام نـازو نیعمەتـت دا بـەوانو باوباپیرانیـان)

لــە حــەزو لــەززەتو ئــارەزووی دونیــاو داواکاریەکانــی نەفــسو دەروون ﴿ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكۡرَ ﴾ (واتــە: تــا یــادی تۆیــان بیــر چــوو) بــە هــۆی ســەرگەرم بوونیــان بــە چێــژو خۆشــیەکانی دونیــا، وە کەوتــن بــە حەزەکانیــدا، هەمــوو خەمێکیــان ئــەوە بــوو دونیایــان بپارێــزن، وە ئاینەکەیــان لــە بیــر کــرد، ﴿ وَكَانُوا۟ قَوۡمَۢا بُورࣰا ﴾ واتــە: ئەوانــە کۆمەڵێکــی تیاچــووی بــێ خێــرو بێــرن، ناگونجێــن بــۆ هیــچ چاکەیــەک، شایســتە نیــن تەنهــا بــۆ لەنــاو چــوون نەبــێ، پەرســتراوان باســی هــۆکاری ڕێگــری کردنــی هــاوەڵ دانەرانیــان کــرد بــۆ شــوێنکەوتنی هیدایــەت، ئەویــش چێــژ وەرگرتــن بــوو لــە دونیــادا کــە ڕووی وەرگێــڕان لــە هیدایــەت، وە نەبوونــی ویســتو داواکاری بــۆ هێدایــەت، ئەویــش ئەوەیــە: ئــەوان خێریــان تێدانەبــوو، جــا ئەگــەر داواکاری پێویســت نەبــوو، ئــەوە بەربەســتەکەی دەبــێ، هیــچ خراپــەکاریو لەناوچوونێــک نابینــی، بێگومــان لەوانــدا دەیبینیتــەوە.

دوای ئــەوەی پەرســتراوەکان خۆیــان بــەری کــرد لــە هاوەڵدانــەران، خــوا بەســەر زەنشــتو ســەرکۆنەکردنەوە بــە هاوبەشــدانەرانی فەرمــوو: ﴿ فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ ﴾ (واتــە: بێگومــان پەرســتراوەکانتان ئێوەیــان بــە درۆ خســتەوە لــەو قســانەی کــە دەتانکــرد)، ئــەوان فەرمانیــان پێکــردن بــە پەرســتنیان، وە ڕازی بــوون بــە کارەکانتــان، وە ئــەوان تــکاکارن بۆتــان لــە لای پەروەردگارتــان، ئێوەیــان بــەدرۆ خســتەوە لــەو بۆچوونــەو بــوون بــە گەورەتریــن دوژمنتــان، بۆیــە ســزایان لەســەر پێویســت بــووە.

﴿ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفࣰا ﴾ واتــە: (ئنجــا نەدەتوانــن) ســزای خــوا ﷻ لــە خۆتــان دووربخەنــەوە بــە کــردەوەی خۆتــان، یــان بــە فیدیــە، یــان جگــە لەوانــە ﴿ وَلَا نَصۡرࣰا ﴾ واتــە: (نەدەتوانــن یارمەتــی خــوا ﷻ بــە دەســت بێنــن) ئەویــش بەهــۆی بێتواناییتــان، وە بەهــۆی ئــەوەی کەســێک نیــە ســەرتان بخــات. ئەمــە حوکمــی ئــەو گومــڕاو پەیــڕەوکارە نەفامانەیــە، وەک دەبینــن کــە خراپتریــن ســەرەنجامیان بــۆ هەیــە.

بــەڵام کەســی نکوڵیــکار لــەوان ئــەوەی حــەقو ڕاســتی دەناســێو پشــتی تێــدەکا خوا ﷻ دەربــارەی فەرموویەتــی: ﴿ وَمَن يَظۡلِم مِّنكُمۡ ﴾ (واتــە: هەرکەس لە ئێوە ســتەم بکات) بــە وازهێنــان لە حەقو ڕاســتی بەهــۆی ســتەمو نکووڵیکردنــەوە ﴿ نُذِقۡهُ عَذَابࣰا ﴾ (واتە: ســزایەکی گــەورەی پێدەچێژیــن) هیچ کــەس ناتوانێ ئەنــدازەی بکات.

پاشـان خـوای گـەورە لـە وەڵامـی بەدرۆدانەرانـدا کاتـێ کـە وتیـان: ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي ٱلْأَسْوَاقِ ۝٧ ﴾ فەرمـووی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي ٱلْأَسْوَاقِ ﴾ (واتـە: ئێمـە پێـش تـۆ هـەرکام لـە پێغەمبەرانمـان ناردبێـت بێگومـان ئـەوان خواردنیـان خـواردووە وە بـە بـازاڕدا ڕۆشـتوون) ئێمـە ئەوانمـان نەکـردوە بـە جەسـتەیەک کـە خـواردن نەخـۆن، وە نەمـان کـردوون بـە فریشـتە، ئـەوان بـۆ تـۆ پێشـەنگن.

بـەڵام دەوڵەمەنـدیو هـەژاری ئـەوە تاقیکردنەوەیـە حیکمەتێکـە لەلایـەن خـواوە، هـەروەک فەرموویەتـی: ﴿ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً ﴾ (واتـە: ئێمـە هەندێـک لـە ئێوەمـان کردە هـۆی تاقیکردنـەوەی هەندێکـی ترتـان) پێغەمبـەر ﷺ تاقیکردنەوەیە بۆ خەڵکـی، وە هەڵبژاردنـی گوێرایـەڵان لـە سـەرپێچیکاران، وە پێغەمبەرانمـان تاقیکردۆتەوە بـە بانگەوازکردنـی خەڵکـی، وە دەوڵەمەنـد تاقیکردنەوەیـە بـۆ هـەژار، هەژاریـش تاقیکردنەوەیـە بـۆ دەوڵەمەنـد، بـەو شـێوەیە هەمـوو دروسـتکراوەکان تاقیکردنـەوەن بـۆ یەکتـر لـەم دونیایـەدا کـە شـوێنی فیتنـەو بـەڵاو تاقیکردنەوەیـە.

مەبەسـتیش لـەو فیتنەیـەدا ﴿ أَتَصْبِرُونَ ﴾ (ئایـا ئـارام دەگـرن) بـە جێبەجێکردنـی ئەرکـی سەرشـانتان کـە پێویسـتە لەسـەرتان، خـوا ﷻ پاداشـتان دەداتـەوە، یـان ئـارام ناگـرن ئـەوە شایسـتەی سـزاو لێپێچینـەوەن؟ ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾ خـوا بـە حاڵتان دەزانـێ، وە هەرکەسـێ شایسـتەبێ بـۆ پەیامەکـەی هەڵیدەبژێـرێو تایبەتـی دەکات بـە زانسـتو زانیـاری خـۆی، وە بـە کردەوەکانتـان دەزانـێ پاداشـتان دەداتـەوە لەسـەری، ئەگـەر خێـر بـوو بـە خێـر، وە ئەگـەر شـەڕیش بـوو بـە شـەڕ.




(٢١-٢٣): ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا (٢١) يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا (٢٢) وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا (٢٣)﴾

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ واتە: ئەوانەی پێغەمبەریان بەدرۆ دادەنا، هەروەها پەیمانو هەڕەشەکانی خوایشیان بەدرۆ دادەنا، ئەوانە لە دڵیاندا هیچ ترسێکی ڕۆژی دوایی نیە، وە بە هیوای دیداری خوا ﷻ نین لە ڕۆژی دواییدا، دەڵێن: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾ واتە: ئەوە بۆ فریشتە نانێردرێتە خوارەوە شایەتیت بۆ بدات بە پێغەمبەرایەتیو پشتیوانیت لێبکات، یان بۆ پێغەمبەرانێ دانابەزن لە ئاسمانەوە یاخود بۆ پەروەردگارمان نابینین قسەمان لەگەڵ بکاتو پێمان بڵێ: ئەمە پێغەمبەری منە شوێنی بکەون؟ ئەمەش بەرپەرچدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ کە پێویست ناکات بەرپەرچ بدرێتەوە، بەڵکو لە ناخیاندا خۆیان بە گەورە دەزانی.

﴿لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ کاتێ کە پێشنیاری ئەمانەیان کرد، وە چاو قایمیو بوێریان کرد، ئێوە کێن ئەی هەژارەکان تا داوای بینینی خوا ﷻ بکەنو پێتان وابێ پەیامی پێغەمبەرایەتی پەکی کەوتووە لەسەر ئەو داوایەی ئێوە؟ چ لووت بەرزیەک لەمە گەورەترە؟ ﴿وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾ واتە: دڵیان ڕەق بوو سەرکێشی گەورەیان کرد لە ئاستی حەقدا، دڵەکانیان لەبەرد ڕەقترو لە ئاسن بەهێزتر بوو، نەرم نەدەبوویەوە بۆ حەق، گوێی نەدەگرت بۆ ئامۆژگاریکاران، بۆیە هیچ ئامۆژگاریو یادکردنەوەیەک سوودی نەبوو بۆیان، وە شوێنی هەق نەکەوتن کاتێ ترسێنەریان بۆهات، بەڵکو ڕووبەڕووی ڕاستگۆترینو ئامۆژگاریکەرترین کەس وەستانەوە، وە ئایەتە ڕوونەکانی خوایان پشت گوێ خستو بەدرۆیان داناو لەبەرانبەریدا ڕاوەستان، چی سەرکێشیەک لەمە گەورەترە؟! ئا لەبەرئەمەیە کردەوەکانیان بەتاڵو پەرشو بڵاو بوویەوە، وە

زەرەرمەند بوون بە ئەوپەڕی زەرەرمەندی.

﴿ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ﴾ (واتە: ئەو ڕۆژەی فریشتەکان دەبینن) ئەوانەی کە پێشنیاری دابەزینی پەروەردگاریان کردبوو ﴿ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾ (واتە: هیچ مژدەیەک لەو ڕۆژەدا بۆ تاوانباران نیە) بێگومان ئەوان لەگەڵ بەردەوام بوونیان لەسەر ستەمو عینادی کردنیان هیچ نابینن جگە لە سزا نەبێ، یەکەم قۆناغی سزا کاتی مردنیانە کاتێ فریشتەکان بۆسەریان دادەبەزن، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ الأنعام (واتە: خۆزگە ستەمکارانت دەبینی کاتێ ئەوان لە نارەحەتیو سەختی سەرەمەرەگداو فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن پێیان دەڵێن خۆتان دەربازکەن ئەمرۆ پاداشتی ڕسواکەر دەدرێنەوە بە هۆی ئەوەی کە قسەی ناڕاستان هەڵبەست بە ناوی خواوە، وە خۆتان بە گەورە دەزانی لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا).

پاشان لەناو گۆڕدا کاتێ مونکیرو نەکیر دێن بۆ لایان، پرسیاریان لێدەکەن دەربارەی پەروەردگارو پێغەمبەرو ئاینیان، وەڵامێک نادەنەوە ڕزگاریان بکات، بۆیە نارەحەتیان بۆ حەڵاڵ دەبێ، ڕەحمەتیان لەسەر لادەچێ، پاشان لە ڕۆژی دواییدا کاتێ فریشتەکان پەلکێشیان دەکەن بۆ دۆزەخ، پاشان دەیاندەنە دەستی سەرپەرشتیاری جەهەنەم، ئەوانەی سزایان دەدەن ڕاستەوخۆ، ئەمە ئەوەیە کە پێشنیاریان کردبوو، وە ئەمە ئەوەیە کە داوایان کردوە، ئەگەر بەردەوام بوون لەسەر تاوانکردنیان هەردەبێ ببینن‌و پێی بگەن، جا لەو کاتەدا پەنا دەبەن بۆ فریشتەکانو ڕادەکەن، بەڵام شوێنی ڕاکردن نیە ﴿ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾ واتە: (پەنامان بدەن پەنادانی پارێزراو) وە فەرموویەتی: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الرحمن، (واتە: ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمی ئەگەر توانیتان دەرچن لە بەشەکانی ئاسمانو زەوی ئەوە بڕۆن دەرچن ناشتوانن مەگەر بە دەسەڵاتێک).

﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ ﴾ واتە: ئەو کردەوانەی کە هیوای ئەوەیان بوو خێرو چاک بێ‌و لە پێناویدا ماندوو بوون، ﴿ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾ واتە: هەموویمان پەرش‌و بڵاو کردەوە، بە ڕاستی خەسارەتمەند بوون، وە بێبەشبوون لە پاداشتەکەی‌و سزادران لەسەری، ئەویش بە هۆی لە دەستدانی ئیمان، وە خواو پێغەمبەری بە درۆدەزانی، جا ئەو کردەوەی خوا ﷻ وەریدەگرێ دەبێ لە کەسێکی بڕواداری دڵسۆزەوەبێ، دەبێ پێغەمبەرەکەی بە ڕاست بزانێ‌و شوێنی کەوتبێ.

(٢٤): ﴿ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴿٢٤﴾ ﴾:

لەو ڕۆژە ناخۆش‌و پڕلە دڵەڕاوکێیەدا، ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ ﴾ بەهەشتیەکان ئەوانەی بڕوایان بە خوا ﷻ هێناوەو کردەوەی چاکیان ئەنجامداوەو لە خوا ﷻ ترساون ﴿ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا ﴾ (لە چاکترین جێگادان) لە دۆزەخیەکان ﴿ وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴾ وە لە باشترین شوێنی حەسانەوەدان، واتە: لە بەهەشتدا جێگیرن، وە ئەو بەهەشتە جێگای پشوودانی ئەوانە، چونکە سەرجەمی نازونیعمەتەکان لەخۆدەگرێ، هیچ ناخۆشیەکی تێدانیە، بە پێچەوانەی دۆزەخیەکان، بێگومان دۆزەخ بۆ ئەوان خراپترین جێگاو شوێنی حەسانەوەیە.

ئەمەش لەبەشی بەکارهێنانی (أفعل التفضيل) کە لەلایەنی دیکە نیە، چونکە هیچ خێرێک نیە لە مانەوەو حەسانەوەی دۆزەخیەکاندا، وەک فەرموویەتی: ﴿ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ ٥٩ ﴾النمل، (واتە: ئایا خوا باشترە یان ئەو بتانەی دەیکەنە هاوبەشی خوا).

(٢٥-٢٩): ﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ٢٥ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ٢٦ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی مەزنی ڕۆژی دوایی وە ئەوەیشی تیایدایە لە نارەحەتی‌و دڵتەنگی‌و ناخۆشیەکان فەرموویەتی: ﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ ﴾ ئەو هەورەش کە خوا ﷻ دایدەگرێ تیایدا، لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە دادەبەزێ، ئاسمانەکان بۆی لەت دەبن، هەموو فریشتەی ناو ئاسمان دەنێردرێنە خوارەوە کۆمەڵ بە کۆمەڵ، یان بە یەک ڕیز دەوری هەموو بەدیهێنراوەکانیان داوە، یان فریشتەی هەر ئاسمانێک بەڕیز دەوەستێ پاشان بە دوایدا ئاسمانێکی دیکە، ئیتر بەو شێوەیە.

مەبەست ئەوەیە فریشتەکان بە هەموو هێزیانەوە دادەبەزن‌و دەوری بەدیهێنراوەکان دەدەن، ملکەچی فەرمانی خوان هیچ یەکێک لەوان قسە ناکات بە مۆڵەتی خوا ﷻ نەبێ، دەی گومانت چۆنە بەرانبەر مرۆڤەکان، بە تایبەت ئەوانەی بە ئاشکرا بەرانبەر پەروەردگاریان وەستاونەتەوەو دەستپێشخەریان کردوە لەسەر ئەو تاوانانەی کە دەبنە مایەی تووڕەیی ئەو، پاشان داوای لێخۆشبوونیان نەکردوە لەو گوناهانە، خوای گەورەش حوکم‌و بڕیار دەدا بەسەریاندا بە حەق‌و ڕاستی، بەو حوکم‌و بڕیارەی کە بە قەد تۆسقاڵی گەردیلەیەک ستەمی تێدانیە، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴾ (واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەختە لەسەر بێبڕوایان) لەبەر نارەحەتی‌و قورسی‌و گرانی کاروبارەکانی، بە پێچەوانەی بڕوادار بێگومان بەلای

ئەوەوە ئاسانو سووکە، ﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾مريم، (واتە: باسی ئەو ڕۆژە بکە کە پارێزکاران کۆدەکرێنەوە بە کۆمەڵی ڕێزدار بۆ لای خوای میهرەبان (و پاداشتی) * تاوانبارانیش دەدەینە بەر بۆ دۆزەخ بە تینوویەتی (بە وێنەی گەلە ئاژەڵ).

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ﴾ واتە: (فەرمانڕەوایەتی لە ڕۆژی دواییدا) ﴿ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ﴾ (واتە: تەنها بۆ خوای میهرەبانە) بەدیهێنراوەکان هیچ دەسەڵاتێکیان نامێنێ، وە وێنەی دەسەڵاتیش هەروەکو لە دونیا هەیانبوو، بەڵکو دەسەڵاتدارو ژێ ردەستەکانو ئازادو کۆیلەکان، خانەدانو بەشەرەفەکان، هەموویان وەک یەک وان، ئەوەی دڵ پێی ئارام دەبێو نەفسو دەروون پێی دڵنیا دەبن، وە سنگی بۆ دەکرێتەوە ئەوەیە خوا ﷻ موڵکو دەسەڵاتی لە ڕۆژی دواییدا داوەتە پاڵ ناوی، ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾ کە میهرەبانی دەوری هەموو شتێکی داوە، وە هەموو زیندەوەرێکی گشتاندوە، وە هەموو زیندەوەرەکانی پڕکردوە، وە بەو میهرەبانیە دونیاو دوارۆژی ئاوەدان کردۆتەوە، وە هەموو ناتەواویەکی پێ تەواوکردوە، بەڵکو ناتەواویەکانی نەهێڵاوە، وە زاڵە بەسەر هەموو ئەو ناوانەی کە ئاماژەن بۆی، ئەو ناوانەی کە ئاماژەن بۆ تووڕەییو خەشمو قینی، ڕەحمەتی پێشکەوتوەو زاڵە بەسەر غەزەبیدا.

ئەم ئادەمیزادە لاوازەی دروستکردوەو ڕێزی لێناوەو قەدری گرتووە بۆ ئەوەی نازونیعمەتەکانی بۆ تەواو بکات، وە بۆ ئەوەی بە ڕەحمەتی خۆی دایبپۆشێ.

هەموویان بە زەلیلیو گەردن کەچیەوە لە بەردەمیدا دەوەستن، چاوەڕوانی ئەوە دەکەن بڕیاریان لەسەر بداتو چیان بەسەر دێ، خوا ﷻ بەبەزەیی ترە لە خۆیان بۆ خۆیان، وە لە دایکو باوکیشیان، دەی گومان دەکەی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، کەس لەناو ناچێ مەگەر کەسێکی لەناوچوو نەبێ، وە کەس لە میهرەبانی خوا ﷻ دەرناچێ مەگەر کەسێکی خراپەکاریو بەدبەختی زاڵ بووبێ بەسەر چاکەکانیداو سزای لەسەر پێویست بووبێ.

﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ ﴾ (واتە: وە ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکات) بە هۆی هاوبەشدانانو بێبڕواییو بە درۆدانانی پێغەمبەران ﴿ عَلَىٰ يَدَيْهِ ﴾ (بە هەردوو دەستی خۆیدا) بە هۆی داخو حەسرەتو خەمو پەژارەوە، ﴿ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴾ واتە: (دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا) ڕێگای ئیمانم بگرتایەتە بەر، وە بەڕاستم بزانیبایەو شوێنی کەوتبام، ﴿ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا ﴾ (واتە: خۆزگە فلان کەسم نەکردایە) ئەویش شەیتانی مرۆڤ یان جنۆکەیە ﴿ خَلِيلًا ﴾ واتە: خۆشەویستێکی ڕاستەقینە، ئامۆژگاری چاکترینو دڵسۆزترین کەسم بەلاوە نا،

دۆستایەتیم کرد لەگەڵ خراپترین دوژمنی خۆم، کە دۆستایەتیو پشتیوانی ئەو هیچ سوودێکیان بە من نەگەیاند، جگە لە بەدبەختیو خەسارەتمەندیو ڕیسوایی نەبێ، ﴿ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ ﴾ کاتێ کە هەموو شتە خراپەکانی لا ڕازاندەوە بە فێڵو تەڵەکەی خۆی ﴿ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ﴾ پووچی لەبەرچاو جوان دەکاو حەقی لا ناشرین دەکات، وە هیوای پێدەبەخشێ، پاشان دەستی لێ هەڵدەگرێو خۆی لێی بەری دەکات، هەروەکو چۆن بە هەموو شوێنکەوتووانی دەڵێ کاتێ هەموو کاروبارەکان تەواو دەبن، وە خوا ﷻ لێ دەبێتەوە لە لێپرسینەوەی خەڵکی: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٢﴾ ﴾إبراهيم، (واتە: جا شەیتان دەڵێ: کاتێ کە کار تەواو دەبێ بێگومان خوا بەڵێنی پێدان بە بەڵێنێکی هەقو ڕاستو، منیش بەڵێنم پێدان بەڵام درۆم کرد لە گەڵتان وە من نەم بوو بەسەرتاندا هیچ زۆرو دەسەڵاتێک تەنها ئەوە نەبێ کە بانگم کردن (بۆ گومرایی) ئێتر ئێوەش بە دەنگمەوە هاتن (و بە گوێتان کردم) کەواتە: لۆمەی من مەکەن، بەڵکو لۆمەی خۆتان بکەن بەڕاستی من ناتوانم بێم بە هاواری ئێوەوە، وە ئێوەش ناتوانن بێن بە هاواری منەوە بە ڕاستی من بڕوام نەبوو بەوەی کە پێشتر (لە دونیادا) منتان کردبوو بە هاوبەش بۆ خوا بەڕاستی ستەمکاران سزای سەختیان دەبێت)، پێویستە بەندە تەماشای نەفسو دەروونی خۆی بکات بە پێی توانای خۆی، وە با دەرک بەوە بکا کە ڕوودەدات پێش ئەوەی کە ڕوویدا، وە با دۆستایەتی کەسێ بکات خۆشبەختی تێدا دەست بکەوێ، وە دژایەتی ئەوە بکات کە زیانی هەیە بۆی، هاوڕێیەتی دەبێتە مایەی زەرەرو ناخۆشسی، خوا ﷻ سەرخەرە.

(٣٠-٣١): ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ ﴾

﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ ﴾ (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی‌و:) بانگی پەروەردگاری کردو سکاڵای بردە لای لە پشت تێکردنی گەلەکەی لە بەرانبەر ئەو پەیامەی کە هێناویەتی، بەداخەوە بۆ ئەوە لە گەلەکەی: ﴿ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ﴾ ئەوانەی کە منت ناردوە بۆ ناویان، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرنو بە دەم بانگەوازەکەمەوە بێن ﴿ ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴾ واتە: پشتیان تێکردووەو وازیان لێهێناوەو گوێی پێنادەن، پێویست بوو لەسەریان ملکەچی بڕیارەکانی بنو ڕوو بکەنە حوکمەکانی، وە بە شوێنیدا بڕۆن.

خوا ﷻ دڵی پێغەمبەرەکەی دایەوە، وە هەواڵیدا ئەو بەدیهێنراوانە وەکو پێشینی خۆیان ڕەفتاریان کردوە، فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە بۆ خێرو چاکە ناگونجێنو خۆیان پاک ناکەنەوە، ڕووبەڕووی پێغەمبەرانیان دەوەستنەوەو مشتومڕی بێ بنەمایان لەگەڵدا دەکەن.

هەندێ لەو سوودو وەدەستهاتووانە ئەوەیە هەق سەربکەوێ بەسەر پووچدا، وە هەق ڕوون ببێتەو بە ڕوونکردنەوەیەکی مەزن، چونکە ڕووبەڕووبونەوەی پووچ بە هەق ئەوە هەق زیاتر ڕوون دەکاتەوەو بەڵگەکانیشی زیاتر دەردەخات، وە بۆ ئەوەی ڕوون ببێتەوە خوا ﷻ چ ڕێزو حورمەتێکی داناوە بۆ شوێنکەتوانی حەق، وە چ سزاو سەرشۆڕیەکی داناوە بۆ شوێنکەوتوانی پووچو بەتاڵ، کەواتە خەمیان بۆ مەخۆو خۆت تووشی حەسرەت مەکە بۆیان ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا ﴾ (واتە: بەسە پەروەردگارت) ڕێنمایی کارت بێ، ئەوەی دەتەوێ بەدەستی بهێنی لە بەرژەوەندی دینو دونیات ﴿ وَنَصِيرًا ﴾ سەرت بخات بەسەر دوژمنەکانتدا، بەرگریت لێبکات لە هەموو نارەحەتیەک، لە کاروباری دینو دونیا، تەنها خوات بەسە، پشت هەر بەو ببەستە.

(٣٢-٣٣): ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾:

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ ئەمە لە کۆی ئەو پێشنیارانەیە بێبروایان دەیانکرد کە نەفسو دەروونیان سروشو نیگای بۆ دەکردن، دەیانوت: ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ﴾ واتە: (بۆچی هەموو قورئانی بە یەکجار بۆ دانەبەزێنراوە) هەروەکو کتێبەکانی پێشوو، جا چ مەترسیەک لە دابەزینیدا هەیە بەمجۆرە؟ بەڵکو دابەزینی بەم جۆرە تەواوترو چاکترە، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ بەو جۆرە جیا جیا دامانبەزاندووە ﴿ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ﴾ واتە: (بۆ ئەوەی دڵی تۆ بەو قورئانە دامەزراو بکەین) چونکە هەرکاتێ شتێکی لە قورئان بۆ دابەزیایە دڵنیایيو دامەزراوەیی زیاتر دەبوو، بە تایبەت کاتی هاتنی هۆکارەکانی دوو دڵی، بێگومان دابەزاندنی قورئان لەو کاتانەدا پێگەیەکی مەزنو دامەزراوەییەکی زۆر بوو بۆی، بەهێزتر بوو لەوەی کە پێشتر بۆی دابەزیایە، پاشان یادی بخستبایەتەوە کاتی ڕوودانی هۆکارەکەی ﴿ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ﴾ واتە: مۆڵەتمان پێدا کەم کەم بۆمان دابەزاندی، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر گرنگی دانی خوا ﷻ بۆ کتێبەکەی قورئان، وە بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بە جۆرێ دابەزاندنی کتێبەکەی لەسەر بارودۆخی پێغەمبەرو بەرژەوەندی ئەو داناوە، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی:

وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا
﴿٣٣﴾ الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ
شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ
وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا اذْهَبَا
إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾
وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْنَاهُمْ وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ
آيَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا
وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُونًا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا
ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى
الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا
بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ
إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ
لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلَا أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا وَسَوْفَ
يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَأَيْتَ
مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾

﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ ﴾ (واتە: هەر نموونەو مەسەلەیەکت بۆ بێنن) کە دژایەتی حەقو ڕاستی پێبکەنو ڕێگری لە پەیامەکەت بکەن ﴿ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴾ واتە: قورئانێکمان بۆ تۆ دابەزاندووە، گشتگیرە بۆ حەقو ڕاستی لەماناکانیدا، وە ڕوونکردنەوەی تەواو لە بێژەکانیدا هەیە، جا ماناکانی هەمووی حەقو ڕاستە، بەتاڵو پووچی تێدانیە بە هیچ جۆرێ، بێژەو سنوورەکانی بۆ شتەکان ڕوونترە، وە بە چاکترین شێوە تەفسیر کراوە، ماناکانیشی شیکراوەتەوە بە شێوەیەکی تەواو. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی قسە لە زانستدا دەکات لە فەرموودەناسو مامۆستاو ئامۆژگاریکار پەیرەوی پەروەردگاری بکات، وە پێغەمبەرەکەیشی، بەهەمان شێوە ئەو زانایەی کە کاروباری خەڵکی بەڕێوەدەبات هەرکاتێ ڕووداوێ بێتە پێش پێویستە بەپێی ئەو ڕووداوە دەقەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرو ئەو ئامۆژگاریەی گونجاوە لەگەڵیاندا بخاتە پێش چاو.

ئەمە بەڵگەیە بۆ ڕەتدانەوەی جەهمیەکانو هاوشێوەکانیان، ئەوانەی پێیان وایە زۆرێک لە دەقەکانی قورئان مانایەکی شاراوە هەڵدەگرن جگە لە مانای ڕواڵەتی، ئەو مانایانە بە ئاسانی کەس لێی تێناگات، جا بەپێی قسەکانی ئەوان بێ، قورئان نابێتە چاکترین تەفسیر لە جگە لە خۆی، بەڵکو تەفسیری چاکو تەواو بە بۆچوونی ئەوان ئەو تەفسیرەیە کە بەپێی ئارەزووی خۆیان بۆ ماناکانی قورئان کردوویانە.

(٣٤): ﴿ الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ ﴾:

﴿ الَّذِينَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی بارودۆخی هاوبەشدانەران ئەوانەی پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ دانا، وە خراپی سەرەنجامیان، بێگومان ئەوان ﴿ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ﴾ (واتە: ئەوانەی بەسەر ڕوومەتیاندا دەبرێن) بە ناشرینترین بینینو بە خراپترین شێوە فریشتەکانی سزا

بەسەر روودا رایان دەکێشن، ﴿ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ﴾ (بۆ ئەو دۆزەخەی) کە کۆکەرەوەی هەموو سزاو تۆڵەیەکە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی کە حاڵیان بەم شێوەیەیە ﴿ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾ (واتە: خراپترین جێگایان بۆ هەیە) بە پێچەوانەی ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوەو پێغەمبەرەکەیان بەڕاست داناوە ﴿ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ (واتە: ڕێگایان ون کردوە).

ئەمە لە بابەتی بەکارهێنانی (أفعل التفضيل) کە لە دەستەکەی دیکەدا شتێکی لەو جۆرە نیە، چونکە بێگومان بڕواداران جێگاو شوێنی نیشتەجێبوونیان چاکە، لە دونیادا هیدایەت دراون بۆ ڕێگای ڕاست، لە دوارۆژیشدا بۆ گەیشتن بە بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکان.

(٣٥-٤٠): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾

خوا ﷻ ئاماژە دەکات بەم چیرۆکانە لە دەقەکانی تردا بە تێرو تەسەلی باسی کردوە، ئەمەش بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوانەیە لەگەڵیاندا دەدوێ، لە بەردەوامبوونیان لەسەر بەدرۆدانانی پێغەمبەرەکەیان ﷺ تووشیان بێ هەروەکو چۆن ئۆممەتو گەلەکانی پێش ئەوان سزای سەختیان تووش بوو، وە چیرۆکی ئەوانیان دەزانی، بەوەی کە بڵاو بوویەوەو ناوبانگی دەرکرد. جا تێیاندایە پاشماوەو شوێنەوارەکانیان بە چاو دەبینن وەک گەلی صالح لە حیجر، وە وەکو ئەو شارەی کە بارانی شەڕی بەسەردا بارێنرابوو، وە بە بەردێک لە قوڕی سوور کراوە، تێدەپەڕن بەلایاندا بە بەیانیاندا، وە بە شەوانیشدا گەشتیان بەناودا دەکەن، بێگومان ئەو ئۆممەتو گەلانە لەوان خراپتر نەبوون، وە پێغەمبەرەکانیشیان لە پێغەمبەری ئەمان چاکتر نەبوون ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ ﴾القمر، (واتە: ئایا کافرەکانی ئێوە (ئەی خەڵکی مەککە) باشترن لەم گەلانەی (کە باسکران) یان ئێوە هەمان نامەتان هەیە لە کتێبە ئاسمانیەکاندا (کە سزانادرێن).

بەڵام ئەوەی ڕێگری کرد لە وەی ئەوان بڕوابهێنن- لەگەڵ ئەوەدا بە چاوی خۆیان نیشانەکانیان بینی- بە هۆی ئەوەوە بوو ئەوان بڕوایان بە زیندووکردنەوە نەبوو، هیوای گەیشتنیان نەبوو بە پەروەردگاریان لە ڕۆژی دوایدا، وە نەدەترسان لە خەشمو قینی، بۆیە بەردەوام بوون لە عینادیو

کەللەڕەقیان، ئەگەرنا بێگومان چەندین ئایەتو نیشانەیان بۆ هات کە هیچ گومانو دوودڵیو ئاڵۆزیەکی نەهێشتەوە.

(٤١-٤٤): ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾ واتە: کاتێ تۆیان دەبینی ئەی موحەممەد ﷺ ئەوانەی بەدرۆیان دادەنایتو عینادی ئایەتو نیشانەکانی خوایان دەکرد، خۆیان بە گەورە دەزانی لەسەر زەویدا گاڵتەیان پێدەکردیتو بە کەم تەماشایان دەکردی، بە شێوەی بە کەم دانانو کەم تەماشا کردنەوە دەیانوت: ﴿ أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴾ واتە: (ئا ئەمەیە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر؟) ئەمە شایستەو گونجاو نیە، خوا ﷻ کەسێکی وابنێرێ، ئەمەش بە هۆی توندی ستەمو کەللەڕەقی هەڵگێڕانەوەی حەقیقەتەکانەوە بوو، بە ڕاستی ئەم قسانەیان مانای ئەوەبوو کە پێغەمبەر- دووربێ لەو- لەئەوپەڕی کەمیدایە، ئەوان پێیان وابوو ئەگەر پێغەمبەرایەتی بۆ کەسێکی جگە لە پێغەمبەر بووایە ئەوە شایستەتر بوو، ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾الزخرف، (واتە: وە وتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ پیاوێکی گەورەی (ناودارو دارا) لەم دوو شارە (مەککە و طائف).

ئەم قسانە دەرناچێ لە کەسێکی نەفامو گومڕاوە نەبێ، یان کەسێکی زۆر عینادو کەللەڕەق، ئەو کەسە خۆی گێل دەکات، مەبەستی ئەوەیە ئەو بەتاڵو پووچەی لەلایەتی بە لەکەدار کردنی حەقو ئەو کەسەی پەیامەکەی هێناوە ناشرین بکات، ئەگەرنا هەرکەسێ وردبیێتەوە لە بارودۆخی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا دەبینێ کەسێکی زاناو بوێرو لە پێشترینیانە لە عەقڵو زانستو ژیریدا، وە لە خوڕەوشت بەرزیو ڕەوشتی جوانو دەست پاکیو زیرەکیو بەخشندەییو هەموو ڕەوشتێکی چاکدا، وە ئەو کەسەیشی بە کەمی دەزانێ بە ڕاستی هەموو سیفاتەکانی گەمژەییو نەفامیو گومڕاییو ستەمو دژایەتی لە خۆ گرتووە، کە هیچ کەسێکی تر هەموو ئەو سیفاتانەی پێکەوە تێدا کۆنەبوەتەوە، ئەوەندە بەسە نەفامیو گومڕایی تانە لەم پێغەمبەرە مەزنەو چوستو چالاکە بەخشندەیە بدات.

﴿ إِن كَادَ ﴾ (نزیک بوو) ئەم پیاوە، ﴿ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا ﴾ (واتە: لە پەرستراوەکانمان لامان بدات) بە جۆرێ هەموو پەرستراوەکان بکات بە یەک پەرستراو، ﴿ لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا

عَلَيۡهَا ﴾ (واتە: ئەگەر لەسەر پەرستنیان خۆگر نەبووینایە) گومرای دەکردین، شەرمەزار بن، پێیان وابوو گومرایی لە یەکتاپەرستی دایە، هیدایەتو ڕێنمایی لە هاوبەش داناندایە، ئا لەبەر ئەمە ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد بە ئارامگرتن لەسەری، ﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ﴿٦﴾ ﴾ص، (واتە: وە گەورەکانی (قورەیش لەگەڵ پێغەمبەر قسەیان کردو هەڵسان) بە پەلە دەرچوون (بە خەڵکیان ووت) بڕۆنو خۆڕاگربن لەسەر پەرستنی خواکانتان بە ڕاستی ئەمە (ی موحەممەد ﷺ دەیڵێ) شتێکە لە ئێوە داواکراوە (تا ببێتە گەورەی هەموو عەرەب).

لێرەداوتیان: ﴿ لَوۡلَآ أَن صَبَرۡنَا عَلَيۡهَا ﴾ (واتە: ئەگەر لەسەر پەرستنیان خۆڕاگر نەبووینایە)، ئارامگرتن لە هەموو شوێنەکاندا ستایشکراوە، جگە لەم شوێنە نەبێ، چونکە ئارامگرتنێکە لەسەر هۆکارەکانی غەزەبو تووڕەبوون، وە لەسەر زۆر کردنی سوتەمەنی دۆزەخ، بەڵام بڕواداران، وەک خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾ ﴾العصر، (واتە: وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئاینی ڕاست، وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامگرتن).

دوای ئەوەی ئەوان حوکمی ئەوەیاندا کە گوایە ئەوان هیدایەتدراونو پێغەمبەر گومرایە، ئیتر روون بوویەوە ئەوانە هیچ چارەیەک نیە لەگەڵیاندا، هەڕەشەی لێکردن بە سزادان، وە هەواڵیدا ئەوان لەوکاتەدا ﴿ حِينَ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ ﴾ (واتە: کاتێ سزا دەبینن) بە حەقیقەت بۆیان دەردەکەوێ ﴿ مَنۡ ﴾ کێیە ئەو کەسەی ﴿ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ (واتە: گومراترەو ڕێگای وێڵ کردوە) ﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ ﴾الفرقان، (واتە: ئەو ڕۆژەی کە ستەمکار هەردوو دەستی دەگەزێو دەڵێ خۆزگا شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەوتمایە).

ئایا لە سەرووی ئەو گومراییەوە شتێکی دیکە هەیە کەسێک هەواو ئارەزوی بکاتە پەرستراو، چی وای لێکرد ئەوە بکات، جا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ أَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ (واتە: ئایا بینیوتە ئەو کەسە هەواو ئارەزووی خۆی دەکاتە پەرستراوی) ئایا سەرت سوڕنامێنی بە حاڵی ئەو کەسە، وە تەماشای ئەوە ناکەی لە چ گومراییەکدایە، خۆی بڕیار بۆ خۆی دەدات بە پلەو پایەی بەرز؟ ﴿ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيۡهِ وَكِيلًا ﴾ (واتە: ئایا تۆ دەبیتە پارێزەر بۆ ئەو)، تۆ هیچ دەسەڵاتێکت بەدەست نیە، بەڵکو تۆ وریاکەرەوەی، بێگومان هەستایت بە ئەرکی سەرشانی خۆتو لێپرسینەوەت لە لای خوایە.

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا
كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ
الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا
﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ
الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ
السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ
مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ
لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا
لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ
بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا
عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا
وَحِجْرًا مَحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ
نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ
مَا لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾

پاشان خوا ﷻ گومڕاییانی تۆمار کردوە، بەوەی عەقڵو بیستنی لێ وەرگرتوونەتەوە، وە بە هۆی گومڕاییانەوە شوبهاندوونی بە ئاژەڵو ماڵات کە هیچ نابیستن تەنها هاتو هاوار نەبێ، ئەوانە کەڕن لاڵن کوێرن، هەرگیز عاقڵ نابن، بەڵکو گومڕاتربوون لە ئاژەڵەکان، چونکە ئاژەڵەکان شوانەکەیان ڕێیان پێنیشان دەدا، وە دەزانێ بە ڕێگای لەناوچوونی بۆیە خۆی بە دوور دەگرێ، هەروەها ئاژەڵەکان دەرنجامیان چاکترە لەوانە، بەو جۆرە ڕوون بوویەوە ئەو کەسەی پێغەمبەر ﷺ تۆمەتبار دەکات بە گومڕایی، لە پێشترە بەم وەسفە، بێگومان هەموو ئاژەڵێکی ماڵات لە ئەو چاکتر هیدایەت وەردەگرێ.

(٤٥-٤٦): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ﴾ واتە: ئایا بە چاوەکانت بە عەقڵت تەواوی دەسەڵاتو قودرەتو فراوانی بەزەیی خوا نابینی، چۆن سێبەر درێژ دەکاتەوە لەسەر بەندەکان، ئەویش پێش دەرچوونی خۆرە ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ ﴾ واتە: (پاشان خۆرمان لەسەر) ئەو سێبەرە کردە ﴿ دَلِيلًا ﴾ (بەڵگە) ئەگەر بوونی خۆر نەبێ، سێبەر نەدەناسرا، بێگومان دژ بە دژەکەی دەناسرێ.

﴿ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴾ هەرکاتێ خۆر بەرز بێتەوە، سێبەریش کەمە کەمە بچووک دەبێتەوە، هەتا بە تەواوەتی نامێنی، جا بەدواداهاتنی سێبەرو خۆر لەسەر بەدیهێنراوەکان کە بە چاوی خۆیان دەیبینن، وە ئەوەیشی لەسەر ئەوە ڕێکدەخرێ لە گۆڕانی شەوو ڕۆژو بە دوای یەکداهاتنیان، وە بەدوای یەکدا هاتنی وەرزەکانو بەدەستهاتنی ئەو هەموو بەرژەوەندیە زۆرانە، بە هۆی ئەوەوەیە، لە بەهێزترین بەڵگەکانە

لەسـەر تەواوی دەسـەڵاتو توانـاو مەزنی خـوا، وە تـەواوی میهرەبانێتیو گرنگـی دانی بە بەنـدەکان، تەنها خوا پەرسـتراوی سـتایش کراوی مەزنە، خـاوەن گەورەییو بەخشـندەییە.

(٤٧-٥٠): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ ﴾: واتـە: لـە سـۆزو میهرەبانی خـوا بۆ ئێوە، شـەوی بۆ کـردوون بە پۆشـاک داتان دەپۆشـێ، تـا جێگیـر دەبـن تیایـداو دەحەسـێنەوە بـە خەوتـن، وە خەوتنـی بـۆ کـردوون بـە هۆی مـت بـوون، واتـە: لـە کاتی خـەودا هەمـوو شـتێک دەبڕێتـەوە، جا ئەگـەر شـەو نەبووایە بەنـدەکان نەدەحەسـانەوە، وە نەیان دەتوانی بـەردەوام بن لەسـەر کاروبارەکانیان، زەرەرێکی پێدەگەیانـدن ئەوپـەڕی زەرەر، هەروەهـا ئەگـەر تاریکـی بـەردەوام بووایـە ئـەوە ژیـانو بەرژەوەندیـەکان دەوەسـتان، بـەڵام خـوا ڕۆژی کـردوە بۆ هەسـتانو بڵاو بوونەوە بەسـەر زەویـدا، بـۆ بازرگانیەکانیـانو گەشـتو کارەکانیـان، جـا بـەو شـێوەیە بەرژەوەندیەکان بەدەسـت دێن.

(٤٨-٥٠): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْۦِىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ ئـەو زاتەیـە کـە بەزەیـی بـە بەندەکانیـدا هاتۆتـەوەو ڕزقو ڕۆزی بەسـەریاندا ڕژانـدوە، بـەوەی بایەکانـی نـاردوە بـە مژدەدەر لـە پێـش باراندا، پاڵـی هـەورەکان دەنێو دروسـت دەبێ ئنجـا پارچە پارچـە دەبێ، ئنجـا دەیپێتێنـێو بە ئیزنـی هەڵسـوڕێنەرەکەی دەیکاتە مژدە بـۆ بەندەکانیو بـاران دەبارێنێتـە خـوارەوە، وە لەبـەر ئـەوەی خۆیـان ئامـادە بکـەن بـۆ ئـەو بارانـە پێش ئـەوەی لـە نـاکاودا بیانگرێتـەوە، ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴾ واتـە: لـە ئاسـمانەوە پاکتـان دەکاتـەوە لە بێ دەسـتنوێژیو لەشـگرانیو پیسـی، وە پاکتان دەکاتـەوە لە غەشو بۆگەنـی، وە فـەڕوو بەرەکەتـی تێدایـە لـە بەرەکەتەکانـی، خوا ﷻ بـۆ ئـەوە دایبەزاندووە تـا زەوی مـردووی پـێ دەبوژێنێتـەوە، هەربۆیـە جۆرەهـا ڕووەکو دارودرەختـی جیـاواز سـەوز دەکات بۆ ئـەوەی مـرۆڤو ئاژەڵەکان بیخـۆن ﴿ وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا ﴾ واتـە: ئـاوی هەمووتـان دەدەیـن ئێـوەو ئاژەڵەکانتـان، ئایـا ئـەو زاتـەی بـا مژدەدەرەکانـی نـاردووەو کردوویەتـی بـە چەندیـن جـۆرو لە ئاسـمانەوە ئـاوی پاکی بۆ دابەزانـدوون، ڕزقو ڕۆزی تێدایـە بۆ بەنـدەکانو ئاژەڵەکانیان، تەنها ئەو کەسـە شایسـتەیە

بەتـاکو تەنهایـی بپەرسـترێو هاوبەشـی بـۆ دانەنرێ؟
دوای ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی ئـەو ئایەتانـەی کـردوە کـە بـە چـاو دەبینرێـن، وە ڕێکـی خسـتووە بـۆ بەنـدەکان بۆ ئەوەی بیناسـنو سوپاسـگوزاری بکـەنو یادی بکەنـەوە، لەگەڵ ئـەوەدا زۆرینـەی خەڵکـی بێبڕوایـی دەکـەن، ئەویش بـە هۆی سروشـتو ڕەوشـتی بەدو خراپیانەوەیە.
(٥١-٥٢): ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾:
﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربارەی جێبەجێکردنی ویسـتو مەشـیئەتی خۆی، بێگومـان ئەو ئەگەر بیویسـتایە ترسـێنەرێکی دەنـارد بۆ هەموو شـاروو شـارۆچکەیەک، واتـە: پێغەمبەرێکـی دەنـارد بـۆ ئـەوەی بیانترسـێنێو ئاگاداریان بکاتـەوە، بێگومـان توانـای خـوا ﷻ لـەوەدا کـورت نەکراوەتـەوە، بـەڵام حیکمـەتو ڕەحمەتـی خـۆی بـە تـۆو بە بەنـدەکان ئـەی موحەممـەد ﷺ ئەوەیە کـە تۆی نـاردووە بۆ لای هەموویان، سـپی پێسـتو ڕەش پێسـتیان، عـەرەبو عەجەمیان، ئادەمیـزادو جنۆکەیان ﴿ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ ﴾ (واتـە: گوێڕایەڵـی بێبڕوایـان مەکـە) لـە وازهێنان لە شـتێ کـە فەرمانـت پێکـراوە، بەڵکـو هەمـوو تواناکانـت بخـەرە کار لـە بانگـەواز کردنـی ئەو پەیامـەی بـۆت هاتـووە ﴿ وَجَاهِدْهُم ﴾ بە قورئانـی پیـرۆز ﴿ جِهَادًا كَبِيرًا ﴾ واتە: هەمـوو تواناکانـت بخـەرەکار بۆ سـەرکەوتنی حـەقو کپکردنـەوەی بەتاڵ، ئەگـەر بینیت کەسـانێک لـە ئـەوان بـە درۆت دادەنێـنو چاوقایمـی دەکـەن، ئـەوە تـۆ توانـای خـۆت بخـەرەکارو بـێ ئومێـد مەبـە لـە هیدایـەت دانیـان، وە وازیـان لـێ مەهێنـە لە نـاو هەواو ئـارەزووی خۆیانـدا بگوزێنـەوە بەڵکـو بانگەوازیـان بکە.
(٥٣): ﴿ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ ﴾:
﴿ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ بەتـاکو تەنهایـی خـۆی دوو دەریـای ئـاوی بـەرەڵا کـردوە لـە پـاڵ یەکـدا، دەریایەکی شـرینو سـازگار، ئەویـش بریتیـە لـەو ڕووبارانـەی لەسـەر زەویـدان، وە دەریای سـوێرو تـاڵ وە سـوودی هەریـەک لەوانەی دانـاوە بۆ بەرژەوەنـدی بەنـدەکان ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا ﴾ واتە: بەربەسـتێک ببێتـە مایـەی ئەوەی یەکێکیـان تێکەڵی ئـەوی دیکەبێ، ئەو سـوودو قازانجەی

مەبەستە نەمێنێ ﴿ وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾ واتە: بەرگریەکی ئەستورو بەهێز (بۆ ئەوەی ئەو دوو ئاوە تێکەڵ یەکدی نەبن).

(٥٤): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ مِنَ ٱلۡمَآءِ بَشَرٗا فَجَعَلَهُۥ نَسَبٗا وَصِهۡرٗاۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرٗا ٥٤ ﴾:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ مِنَ ٱلۡمَآءِ بَشَرٗا فَجَعَلَهُۥ نَسَبٗا وَصِهۡرٗا ﴾ واتە: خوا ﷻ ئەو زاتەیە تاکو تەنهایە هیچ هاوەڵێکی نیە، ئەو زاتە مرۆڤی بەدیهێناوە لە ئاوێکی سەرزەنشتکراو، پاشان وەچەو رەچەڵەکێکی زۆری لێ بڵاوکردۆتەوە، وە کردوونی بە پشتو خزمی یەکتری، وە هەموو پێکهاتەکانیان لەو ئاوە سەرزەنشت کراوەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی قودرەتو دەسەڵاتی خوا ﷻ، ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرٗا ﴾ (واتە: پەروەردگارت هەمیشە بەدەسەڵاتە).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەندایەتی خوا حەقو ڕاستیە، وە بەندایەتی جگە لەو بەتاڵو پووچە.

(٥٥): ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡۗ وَكَانَ ٱلۡكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرٗا ٥٥ ﴾:

﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡ ﴾ واتە: کۆمەڵە بتو کەسانێکی مردوو دەپەرستن کە نەسوودی هەیە بۆیان نە زیان، وە دەیانکەن بە پەرستراو لە بری خوای دەسەڵاتدار کە سوودو زیانی بە دەستە، بەخشەرەو ڕێگریکارە، لەگەڵ ئەوەدا پێویست بوو لەسەریان شوێنی ڕێنماییەکانی پەروەردگاریان بکەون، خەڵتەو خراپەکاریان لەسەر ئاینەکەی لاببردایە، بەڵام ئەوان پێچەوانە جوڵانەوە ﴿ وَكَانَ ٱلۡكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرٗا ﴾ جا بەتاڵو پووچ کە بریتیە لە بتو پەرستراوەکان ئەوان دوژمنی خوان، کەسی بێبڕوا پشتیوانیان دەکات بەسەر پەروەردگاریدا، بۆیە دەبێتە دوژمنی ئەو لە دژایەتیو جەنگ کردندا.

خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە دروستی کردوەو ڕزقو ڕۆزی پێداوە، وە نازونیعمەتە ئاشکراو نهێنیەکانی داباراندوە بەسەریدا، ئەو هەرگیز ناتوانێ لە موڵکو دەسەڵاتو هێزی خوا ﷻ دەربچێ، خوا ﷻ چاکەکانی خۆی لێنەگرتۆتەوە، بەڵام ئەو بە نەفامی خۆی بەردەوامە لەسەر دژایەتیکردنو ڕکابەری.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٥٦ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ٥٧ وَتَوَكَّلۡ
عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ
بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ٥٨ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ٱلرَّحۡمَٰنُ
فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ٥٩ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ
وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا۩ ٦٠ تَبَارَكَ
ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا
مُّنِيرٗا ٦١ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ
أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ٦٢ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ
عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا
٦٣ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ٦٤ وَٱلَّذِينَ
يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ
غَرَامًا ٦٥ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ٦٦ وَٱلَّذِينَ إِذَآ
أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ٦٧

(٥٦-٦٠): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٥٦﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ﴿٦٠﴾ ﴾:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدا: ئـەو پێغەمبەرە کـەی ﷺ نەنـاردوە بـۆ ئـەوەی ببێ بە دەسـەڵاتدار بەسـەر زەویدا، وە نەیکـردوە بە پاشـای گەنجینـەی هەموو شـتەکان، بەڵکـو ناردوویەتی ﴿ مُبَشِّرٗا ﴾ مژدە بداتـە ئەو کەسـەی گوێڕایەڵی خوا دەکات بـە پاداشـتێک لە ئێسـتاو لـە داهاتـوودا، ﴿ وَنَذِيرٗا ﴾ وە ئەوانە بترسـێنی کە سـەرپێچی خوا دەکـەن بـە سـزایەک لە ئێسـتاو لـە داهاتـوودا، ئـەو نێردراوێتیە پەیوەسـتکراوە بـە ڕوون کردنـەوەی ئـەوەی دەبێتـە مایـەی مـژدەدان، وە ئەوەشـی ترسـاندن دەسـتەبەر دەکات، لە فەرمانـەکانو قەدەغەکـراوەکان، وە تـۆ ئەی موحەممـەد ﷺ داوای هیچ کرێو پاداشـتێک مەکـە لەسـەر بڵاوکردنـەوەی قورئـانو ڕێنمایـی، نـەوەک ئـەوە ڕێگریـان لێـکات لـە شـوێنکەوتنی تـۆ، وە ئـەو کرێـە بەلایانـەوە گـران بـێ، ﴿ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴾ واتـە: مەگەر کەسـێ بە ویسـتی خۆی خێـرو چاکەیەک بکات لەبـەر ڕەزامەندی پەروەرگـاری، ئەمـە ئەگـەر چـی هانمـداون لەسـەری، قـەت ناچاریشـتان ناکـەم، بەڵکـو ئـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ بەرژەوەندیەکانتـان، وە گرتنەبەری ئـەو ڕێگایـەی دەتانگەیەنێت بە پەروەردگارتان.

پاشـان فەرمانـی پێکـردوە پشـتی پێببەسـتێو داوای کۆمەکی لێبـکات، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ﴾ (واتـە: پشـت ببەسـتە بەو خوایـەی کە زیندوە) کـە خاوەنی ژیانی

تــەواو ڕەهایــە ﴿ٱلَّذِی لَا یَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦ﴾ (واتــە: ئــەو زاتــەی هەرگیــز نامــرێ، تەسـبیحات بکە بە ستایشـی ئەو)، واتە: بیپەرستە پشتی پێببەسـتە لەو کاروبارانەدا پەیوەندیان هەیــە بە خۆتــەوە، وە ئەوانەشــی پەیوەندیــان هەیە بــە بەدیهێنراوەکانــەوە، ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِیرًا﴾ (واتــە: بەســە بــۆ تۆ کە خــوا) زانایــە بــە کردەوەکانیان، پاداشــتیان دەداتــەوە لەســەری، تۆ لــە ڕێنمایــی‌و هیدایەتدانی ئەواندا هیچت لەســەر نیە، مافی ئەوەشــت نیــە کردەوەکانیــان بپارێــزی، بەڵکو هەمــوو ئەوانە بە دەســتی خوایە.

﴿ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَیۡنَهُمَا فِی سِتَّةِ أَیَّامٍ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ﴾ (واتــە: ئــەو زاتــەی ئاســمانەکان‌و زەوی دروســتکردوە، وە ئەوەش لە نێوانیاندایە لە ماوەی شــەش ڕۆژدا، پاشــان بــەرز بوویەوە) دوای دروســتکردنی ئاســمان‌و زەوی ﴿عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ (بۆ ســەر عەرش) کە ســەقفی هەموو بەدیهێنــراوەکان، وە بەرزترین‌و بەرفراوانتریــن‌و جوانترینیانە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ (ئــەو خــوا میهرەبانــە) بــەرز بوویەوە بۆ ســەر عەرشــی کــە دەوری هەمــوو ئاســمانەکان‌و زەوی داوە، ئــەو زاتــە بەزەیی هەموو شــتێکی داپۆشــیوە، بەرز بووەتەوە بۆ ســەر فراوانترینی دروســتکراوەکان، بە فراوانترین ســیفاتەکان.

بــەم دەقــە پیــرۆزە دروســتکردنی بەدیهێنراوەکانــی چەســپاندوە، وە بە ئاگابوونــی لە هەموو کــردەوەکان بــە ئاشــکراو نهێنیــان، وە بــەرز بوونــەوەی بــۆ ســەر عــەرش، وە ڕوونــی کردوەتــەوە بۆیان.

﴿فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِیرًا﴾ مانــای ئەوەیــە پرســیار لەو خوایــە بکە (کە بە هەموو شــت زانایە) تەنهــا ئــەو زاتە وەســف‌و مەزنــی گەورەییەکانــی دەزانــێ، بێگومــان هەواڵی پێــداون بەوە، مەزنــی خــۆی بۆتــان ڕوون کردوەتــەوە، بــۆ ئەوەی بە ناســینی خۆشــبەخت بن، خواناســان ئەویــان ناســی‌و گەردن کــەچ بوون بــۆ گەورەیی.

بێبڕوایــان لــووت بەرزیــان کرد بەرانبەر پەرستشــی، وە لەســەر ئــەوە مانەوە، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿وَإِذَا قِیلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُوا۟ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾ (واتــە: کاتــێ پێیــان بوتــرێ ســوژدە ببــەن) بــۆ خــوای میهرەبانی تــاک‌و تەنها، ئەو زاتەی ســەرجەم نــازو نیعمەتەکانی ڕشــتووە بەســەرتاندا، وە ســەرجەم ناڕەحەتیەکانــی لــێ دوور خســتونەتەوە ﴿قَالُوا۟﴾ بــە ئینکاریەوە کوفــر کردنــەوە دەڵێــن: ﴿وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ (خــوای بــە ڕەحــم کێیە) بــە بۆچوونــی خراپیان گوایــە ئــەوان ڕەحمــان نانا‌ســن، لە کــۆی ئەو شــتە ناشــرینانەی داویانــە پــاڵ پێغەمبەر ﷺ ئــەوە بوو وتیــان: ڕێگــری لێکردووین لەگەڵ خوا چەند پەرســتراوێ بپەرســتین، لە کاتێکدا

خـۆی لەگـەڵ خـوادا شـتێکی دیکـە دەپەرسـتێ‌و دەڵێ: (یـا رحمـان) وە وێنـەی ئەوەش، هـەروەک خـوا فەرموویەتـی: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء (واتـە: بلـێ: نـزاو هـاوار لـە خـوا بکـەن یـان هـاوار لـە ڕەحمان بکـەن (یەکسـانە) بـە هەرکامیان نـزاو هاواری بکـەن، چونکە هـەر بۆ خوایە هەمـوو ناوە جوانـەکان)، ﴿ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا ﴾ نـاوە بەرزەکانـی خوا زۆرن، چونکە وەسـفەکانی زۆرن، هەریەکێ لەو سـیفاتانە بەڵگەیە لەسـەر سـیفەتێکی تەواو، ﴿ وَزَادَهُمْ ﴾ بەم داوای سـوجدە بردنـە بـۆ ڕەحمـان ﴿ نُفُورًا ﴾ زیاتـر دوور دەکەونـەوە لە هەق بـۆ لای ناهـەق، وە زیاتر تووشـی کوفرو گومڕایـی دەبن.

(٦١-٦٢): ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ لەم سووڕەتە پیرۆزەدا وشەی ﴿ تَبَارَكَ ﴾ سێ جار دووبارە کردۆتەوە، چونکە ماناکەی وەک باسکرا لە پێشەوە، دەبێتە بەڵگە لەسەر مەزنی خواو زۆری وەسفەکانی‌و زۆری خێرو چاکەکانی، ئەم سووڕەتە بەڵگەی تێدایە لەسەر مەزنی خواو بەرفراوانی تواناو دەسەلاتی‌و جێبەجێکردنی ویست‌و مەشیئەتی، وە بەرفراوانی زانست‌و توانای‌و دەوردانی موڵکی لە هەموو بڕیارە فەرمانیەکان‌و بڕیارە پاداشتیەکان، وە تەواوی حیکمەت‌و دانایی، هەروەها بەڵگەی تێدایە لەسەر بەرفراوانی ڕەحمەت‌و بەخشندەیی خواو زۆری خێرو چاکەکانی ئاینی‌و دنیایی، کە دەبێتە مایەی دووبارە بوونەوەی ئەم وەسفە جوانە، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا ﴾ (ئەو زاتەی لە ئاسماندا چەندەها خولگەو بورجی داناوە) ئەوانیش ئەستێرەکانن بە گشتی، یان جێگاکانی خۆرو مانگ، کە دایناوە پلە بە پلە، چۆن قەڵای چاودێری بۆ پاراستنی شارەکانە، بە هەمان شێوە ئەستێرەکان وەکو بورجەکان وان کە دانراون بۆ پاسەوانی، ئەوانە ڕەجم‌و تیرباران کردنی شەیتانەکانیشن.

﴿ وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا ﴾ (چرایەکـی پرشـنگدارە) ئەویـش خـۆرە، ڕووناکی‌و گەرمایشـی تێدایـە ﴿ وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾ ئەویـش مانگـە، ڕووناکـی تێدایـە نـەک گەرمایـی، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر مەزنـی‌و زۆری چاکەکانـی خوا، بێگومـان ئـەوەی تێدایە لـە بەدیهێنراوی جـوان‌و سـەرنجڕاکێش‌و بەڕێوەبردنی ڕێکخراو، بەڵگەیە لەسـەر مەزنی دروسـتکەرەکەی لە هەموو وەسـفەکاندا، وە ئەوەشـی تێدایـە لە بەرژەوەندی‌و سـوودی خەڵکی، بەڵگەیە لەسـەر زۆری خێـرو چاکەکانی.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةً ﴾ واتـە: ڕۆژ دەڕواو شـەو بەدوایـدا دێـت، وە بـە پێچەوانـەش بۆ هەمیشـەیی، پێکەوە کۆنابنـەوەو پێکەوەش لاناچـن ﴿ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ﴾ (واتـە: لـە دروسـتکراوەکانی خـوا، یـان بیـەوێ شـوکرانە بژێری خوا بـکات)، واتـە: بۆ کەسـێکە پەنـدو وانەیان لـێ وەربگرێ، وە بیـکات بە بەڵگە بـۆ زۆرێ لە داواکاریەکانـی پەرسـتراوێتیو سوپاسـگوزاری خـوا بکات لەسـەر ئەوانە، بۆ ئەو کەسـەی بیـەوێ بیـر بکاتـەوەو یـادی خـوا بـکات، لـە شـەوو ڕۆژدا، هەرکەسـێ ویـردو زیکری شـەوو ڕۆژ لەدەسـت بـدات، یـان یەکێکیان، لـەوی دیکـەدا دەیبینێتەوە، هەروەهـا دڵەکان هەڵدەگەڕێنـەوەو دەگوازرێنـەوە لە سـاتەکانی شـەوو ڕۆژدا، تووشـی چالاکـیو تەمبەڵیو یادکردنـەوەو بێئاگایـیو بێتاقـەت بـوونو کرانـەوەو ڕووتێکـردنو پشـتێکردن دەبـێ، خـوا ﷻ شـەوو ڕۆژی دانـاوە بـەدوای یەکتـردا بێـنو دووبـارە بینـەوە بـۆ بەنـدەکان، بۆ ئـەوەی چوسـتو چـالاک بنو یادی خـوای تێـدا بکەنەوەو شـوکرانەبژێری بـن، وە لەبەر ئـەوە ویـردو زیکـری پەرستشـەکان دووبـارە دەبنـەوە، بـە دووبارەبوونەوەی شـەوو ڕۆژ، هەرکاتـێ کاتـەکان دووبـارە بوونـەوە، هیمەتـی بەنـدە زیـاد دەکات، ئەگـەر لەکاتەکەی پێشـوودا کەمتەرخەمیەکـی نواندبـێ، لـە کاتێکـی دیکـەدا زیاتـر زیکری خـوا ﷻ دەکاو سوپاسـگوزاری دەکات، پیشـەو کاری گوێڕایەڵیو پەرستشـەکان وەک ئاودانی ئیمان وایە، جـا ئەگـەر ئەوانـە نەبن ئـەوە داری ئیمان ووشـک دەبێتەوە، سـوپاسو ستایشـی تـەواو بۆ خـوای بەرزو مـەزن لەسـەر ئەوە.

(٦٣-٧٠): ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ
سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا
عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ
إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ
إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا
﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ
عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٧٠﴾ ﴾:

پاشـان خوا ﷻ باسـی کردوە لە کـۆی زۆری خێـرو چاکەکانیو منەتی بەسـەر بەندەکانیدا، وە سـەرکەوتنیان بـۆ کـردەوە چاکـەکان کە بـەو هۆیانەوە پلەو شـوێنو جێگـای بەرزیان بەدەسـتهێناوە لە بەهەشـتەکاندا، جا فەرموویەتـی: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ ﴾ تا کۆتایی

سـووڕەتەکە، پەرسـتش بۆ خوا ﷻ دووجۆرە:

یەکـەم: بەندایەتـی بـۆ پەروەردگارێتـی: ئەمـە هەموو خەڵکـی تێیدا بەشـدارە، مسـوڵمانو بێبـڕوا، چاکەخـوازو خراپەکاریان، هەموویان بەندەی خـوان، پەروەردەکراوو کاربەڕێخراون ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴾﴿٩٣﴾ مریـم. (واتـە: هەمـوو ئەوانـەی لـە ئاسـمانەکانو زەویـدان بەبەندەیی دێنـەلای خـوای میهرەبان).

دووەم: بەندایەتـی پەرسـتراوێتی: بەندایەتیکردن بۆ پەرسـتراوێتی خـوا ﷻ، وە عیبادەتکردنی ئەویـش بەندایەتـی پێغەمبـەرانو دۆسـتەکانێتی، مەبەسـت لێـرەدا ئەمەیـە، بۆیـە بەندایەتی داوەتـە پـاڵ نـاوی (الرحمـن) ئاماژەیـە بۆئـەوەی کـە ئـەوان گەیشـتوون بـەم حـاڵو باروودۆخـە بەهـۆی بەزەیـی خواوەیـە، ئنجـا باسـی کـردوە سـیفاتەکانیان تەواوتریـنو چاکترینـی سـیفاتەکانە، وەسـفی کـردوون بـەوەی ﴿ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾ واتـە: بـە لەسـەرخۆیی‌و خۆبەکـەم زانینـەوە بـۆ خـواو بەندەکانـی بەسـەر زەویـدا دەڕۆن (بێ لووت بـەرزی‌و فیـز کردن) ئەمە وەسـفە بۆ ئـەوان ﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴾ واتـە: کاتێ نـەزانو نەفامـەکان لەگەڵیانـدا بدوێـن، بەبەڵگـەی دانەپاڵـی فیعلو ئیسـناد کردنـی بۆ ئەم وەسـفە ﴿ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴾ واتـە: لەگەڵیـان دەدوێـن بـە وشـەیەک کـە تاوانـی تێـدا نەبێ، وە سـڵاو دەکـەن لـە بەرانبـەر نەفامی‌و نەزانـی ئـەوان، ئەمەش وەسـفو سـەنایە بۆیان بە لەسـەرخۆیی‌و وەڵامدانـەوەی خراپـە بـە چاکەو لێبـوردن لە کەسـی نەفام، سـەنگینی عەقڵ گەیاندوونـی بـەم حاڵە.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴾ واتـە: کەسـانێکن لـە شـەودا زۆر یـادی پەروەردگاریـان دەکـەن بـە دڵسـۆزی‌و زەلیلیـەوە، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السـجدة، (واتـە: تەنیشـتیان دوور ئەکەوێتـەوە لـە جێگـای خەوتنیان هاوارو نـزا لـە پەروەردگاریان دەکەن بـە تـرس‌و هیـواوەو لەو ماڵەی سـامانەی پێیـان دراوە دەبەخشـن * ئنجا هیچ کـەس نازانێ چـی شـاراوەتەوە بۆیـان لە گـەش بوونی چـاوەکان ئەم پاداشـتە بە هـۆی ئـەو کردەوانەیە کـە کردوویانە).

﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ﴾ واتـە: سـزای دۆزەخمـان لـێ بـە دوور بگـرە، بـە پاراسـتن لـە هۆکارەکانـی، وە لێمان خۆشـبە لـەو کردەوانـەی کردومانە

کـە شایسـتەی سـزادانە، ﴿ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴾ واتـە: (بە ڕاسـتی سـزای دۆزەخ پەیوەسـتە بـە خاوەنەکەیـەوە وەکـو قەرزار بـۆ خـاوەن قەرز).

﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی دۆزەخ جێگـەو شـوێن مانەوەیەکی زۆر خراپـە)، ئـەم قسـەیەی ئەوان دەیکەن لـە ڕووی گـەردن کەچیانە بـۆ پەروەردگاریان، ئـەوە دەرخسـتنی ئەوپـەڕی پێویسـتیانە پێـی، ئـەوان لـە توانایاندا نیـە بەرگەی ئەم سـزایە بگـرن، وە لەبـەر ئەوەی یـادی فەزڵو منەتـی خوا ﷻ بکەنەوە لەسـەریان، چونکـە لابردنی نارەحەتـی بە پێـی توونديو ناشـرینی ڕووداوەکەی گـەورە دەبێو دڵخۆشـبوون بە لابردنی توونـد دەبێ.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ ﴾ (واتـە: وە کەسـانێکن کاتـێ مـاڵو سـامان خـەرج دەکـەن) خەرجکردنـی ئەو بژێویانـەی کە پێویسـتو پەسـندن ﴿ لَمْ يُسْرِفُواْ ﴾ زێدەڕۆیی ناکەنو لـە سـنوور دەرناچـن، تـا بچنـە نێـو کۆمەڵـی زێدەڕۆیانـەوە، وە پشـت گوێخسـتنی ئـەو مافانـەی کـە پێویسـتن ﴿ وَلَمْ يَقْتُرُواْ ﴾ (دەسـت نوقـاو نیـن لـە ماڵو سـاماندا) تـا بچنە نێـو ڕەزیلیو چروکیـەوە، ﴿ وَكَانَ ﴾ بەخشـینەکانیان ﴿ بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾ مامناوەندە لە نێـوان زێدەڕۆیـیو دەسـت نوقاویـەوە، ﴿ قَوَامًا ﴾ ماڵو سـامانیان خەرج دەکـەن لەوانەی پێویسـتن لـە زەکاتو کەفارەتو ئـەو نەفەقانەی کـە واجبن، وە بەو جۆرە دەیبەخشـن کە شایسـتەی بەخشـینە بەبێ ئـەوەی زیانیان پێ بگاو زیـان بگەیەنن، ئەمەش لـە دادپەروەريو شـارەزاییانە لـە ئابووریدا.


وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾

سورة الشعراء

﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴾ بەڵكـو عیبادەتـی خـوا دەكـەن بـە دڵسـۆزیو پـاكو بێگەردیـەوە، ڕووی تێدە كـەنو پشـتدە كەن لـە غەیـری ئـەو، ﴿ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ ﴾ ئەویش نەفسـی مسـوڵمانە، وە كافرێک كە پەیمـان پێـدراوە، ﴿ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ وەكـو كوشـتنی نەفـس بـە نەفـس، وە كوشـتنی زینـاكاری خێزانـدار، وە ئـەو بێبڕوایـەی كـە حەڵاڵـە كوشـتنی ﴿ وَلَا يَزْنُونَ ﴾ (زینـا ناكـەن)، بەڵكـو داوێنیـان دەپارێزن ﴿ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ ﴿٦﴾ ﴾ المؤمنون (واتـە: مەگەر بـۆ خێزانی خۆیـان، یان بـۆ كەنیـزەک كـە بووبن بە خاوەنیـان).

﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: هاوبەشـدانان بۆ خوا، یان كوشـتنی نەفسـێک كە خـوا حەرامی كـردوە بـە ناحـەق، یان زینا، ئـەوە ﴿ يَلْقَ أَثَامًا ﴾ (واتە: تووشـی سـزاو ئازارو ڕیسـوایی دەبێت).

پاشـان ئـەوەی شـیكردوەتەوە دەفەرمـوێ: ﴿ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ ﴾ (واتـە: سـزای بۆ چەند بـارە دەكرێتەوە لـە ڕۆژی دواییـداو بێبڕانەوە) لـە دۆزەخدا دەمێنێتـەوە ﴿ مُهَانًا ﴾ (بـە سەرزەنشـت كـراوی) هەرەشـە بـە مانـەوەی هەمیشـەیی بۆ كەسـێكە هەمـووی ئەنجامدابـێ، بـە هەمـان شـێوە بـۆ ئـەوەی هاوەڵی بـۆ خـوا دادەنێ، بە هەمان شـێوە سـزای سـەخت بـۆ هەریەک لـەم سـیانەیە، لەبەر ئـەوەی یان هاوبـەش دانانە ئەمـەش لـە گەورەترینـی تاوانـە گەورەكانە.

بـەڵام مانـەوەی بكـوژ زینـاكار بۆ هەمیشـەیی لـە دۆزەخـدا، بێگومـان هەمیشـەیی تیایدا نامێننـەوە، چونكـە بێگومان دەقەكانی قورئانو سـوننەت بەڵگەن لەسـەر ئـەوەی كە هەموو بـڕواداران لـە ئاگـر دەردەكرێـن، بـڕوادار بـۆ هەمیشـەیی تیایـدا نامێنێتـەوە، ئەگەرچـی

تاوانیشــی زۆر بێــت، خــوای گــەورە جەختی لەســەر ئــەم ســێدانەیە کردوەتــەوە چونکە لە گەورەترینــی تاوانەکانــن، هاوبەشــدانان بــۆ خــوا دەبێتــە مایــەی تێکچوونی ئاینــەکان، وە کوشــتنیش دەبێتــە مایــەی لەناو بردنــی جەســتەکان، زیناو داوێن پیســیش هەتــک کردنی ناموســی تێدایە.

(٧١-٧٧): ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ٧١ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ٧٢ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ٧٣ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ٧٤ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ٧٥ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ٧٦ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا ٧٧ ﴾:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ ﴾ (واتــە: جگــە لــەو کەســەی تەوبــە دەکات) لــەم ســەرپێچیانەو جگــە لەمانــەش، بەوەی ڕاســتەوخۆ لــە خۆی دابڕنێ‌و پەشــیمان ببێتەوە لەوەی پێشــتر کردوویەتی، وە ســوور بێــت لەســەر ئــەوەی جارێکــی دیکــە نەگەڕێتــەوە بــۆ ســەر ئــەو گوناهانــە ﴿ وَءَامَنَ ﴾ (بــڕوای هێنابــێ) بــە خــوا بڕوایەکــی ڕاســتەقینە، ببێتــە مایەی ئــەوەی واز لــە ســەرپێچی بهێنــێ‌و کردەوەی چــاک ئەنجــام بــدات ﴿ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴾ (واتە: کــردەوەی چــاک ئەنجــام بــدات) لــەوەی فەرمانــی پێکــراوە لــە لایــەن خوای گــەورەوە، دەبــێ مەبەســتی تەنهــا ڕەزامەندی خــوا بــێ، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ﴾ واتــە: ڕەفتــارو گوفتارەکانیــان دەگــۆڕێ کــە ئامادەیــە بــۆ کارە خراپــەکان، دەگــۆڕی بۆ چاکــەکان، هاوبــەش دانانیــان دەگــۆڕێ بــۆ ئیمــان، ســەرپێچی کــردن بــۆ گوێڕایەڵی، وە خــودی گوناهەکانیــان کــە کردوویانــە دەگۆڕی، پاشــان بۆ هەمــوو گوناهێــک تەوبەیەک دەکــەن‌و لە بریــدا گوێڕایەڵی مەلکــەچ دەبن، بۆیــان دەگۆڕدرێت بە چاکــە، وەک ڕواڵەتی دەقەکــە (فەرموویەتی).

لەوبــارەوە فەرموودەیــەک هاتــوە دەربارەی کەســێک خــوا لێپرســینەوەی لەگــەڵ دەکات هەنــدێ لــە گوناهەکانی بــۆ دەژمێرێت، پاشــان لــە جێگای هــەر خراپەیەک دەیگــۆڕێ بە چاکەیــەک، ئەویــش دەڵێ: {رَبِّ قَدْ عَمِلْتُ أَشْيَاءَ لاَ أَرَاهَا هَا هُنَا} (رواه مسلم: ٤٨٧)، واتە: ئــەی پەروەردگــارم من گوناهــی دیکەم هەیــە لێــرەدا نایبینم. خــوا زاناترە.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا ﴾ بــۆ ئەو کەســەی تەوبــەی کردوە، لــە تاوانە مەزنەکانی خــۆش دەبێ،

﴿ رَحِيمًا ﴾ بـە بەزەیيـە بـۆ بەندەکانـی، کاتـێ بانگی کـردوون بـۆ تەوبـە دوای ئەوەی ئـەوان ڕووبـەڕووی بوونەتـەوە بـە گوناهە مەزنەکان، پاشـان سـەرکەوتووی کـردوون بۆ ئـەوە، پاشـان لێـی وەرگرتـوون، ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾ (واتـە: وە هـەر کـەس تەوبـەی کـردووەو کـردەوەی چاکـی ئەنجامـداوە، ئـەوە بەڕاسـتی دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خوا بـە گەڕانەوەیەکی تەواو)، واتـە: با بزانێ داوای لێخۆشـبوونەکەی لەوپـەڕی تـەواوی دایـە، چونکـە گەڕانەوەیە بۆ ڕێگایـەک دەیگەیەنێتە لای خـوا، کە ئەوە خودی خۆشـبەختیو سـەرفرازیە، با دڵسـۆز بێـت تیایـدا، وە تەوبەکەی بپاڵێـوێ لە خەڵتەی مەبەسـتە فاسیدەکان.

مەبەسـت لەمـەدا، هاندانـە لەسـەر تـەواو کردنـی داوای لێخۆشـبوون، وە ئەنجامدانـی بـە چاکتریـن شـێوەو گەورەترینیـان، بـۆ ئەوەی پێشـی بخات لەسـەر ئەو کەسـەی لێی خۆش بـووە، پاداشـتی بداتەوە بـە پێـی تـەواوی ئەنجامدانی.

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴾ واتـە: ئامـادەی شـایەتی درۆ نابـن، کە بریتیە لە قسـەو کـردەوەی حـەرام، دوور دەکەونـەوە لـە هەمـوو ئـەو کـۆڕوو کۆبوونەوانـەی کە قسـەی قەدەغەکـراو، یـان کـرداره خراپەکانی تێـدا ئەنجـام دەدرێ، وەک ڕۆچوون لـە ئایەتەکانی خـواو مشـتو مڕکردنی پووچو بێ مانـاو غەیبەتو نەمیمـەو تانەو تەشـەرو بوختانکردنو گاڵتەپێکـردنو گۆرانـی قەدەغەکـراو و خواردنـەوەی کهـولو دانیشـتن لەسـەر فەرشـی حەریـرو وێنـەکان، وە هاوشـێوەی ئەوانـە، جـا ئەگەر ئـەوان شـایەتی درۆ نـەدەن ئەوە لە پێشـترن کە قسـەو کـردەوەی درۆ ئەنجـام نادەن.

شـایەتیدان بـە درۆ دەچێتـە نێـو قسـەکردن بـە درۆ، هەردووکیـان دەچنـە نێو ئـەم دەقەو لـە پێشـترن ﴿ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ ﴾ ئەویـش قسـەیەکە کە هیـچ خێرێکی تێدانیە، وە سـوودی دونیـاو دواڕۆژیشـی تێدانیە، وەک قسـەی گەمژەو هـەرزەکانو هاوشـێوەی ئەوان ﴿ مَرُّواْ كِرَامًا ﴾ واتـە: نەفـسو دەروونـی خۆیان پاک ڕادەگـرنو ڕێزی لێدەگـرن لە ڕۆچوون تیایـدا، وە پێیـان وایـە ڕۆچـوون لـە قسـەی پـڕو پووچـدا ئەگەرچـی تاوانیشـی تێدانەبێ بێگومـان ئـەوە گەمژەیـیو ناتـەواوی مرۆڤایەتیو پیاوەتیـە، بۆیە نەفـسو دەروونی خۆیان لێی پاراسـتووە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ ﴾ ئاماژەیـە بۆ ئەوەی کە بـڕواداران مەبەسـتیان ئەوە نیە ئامـادەی ببـنو گوێـی لێبگرن، بـەڵام کاتێ تـووش دەبن بەبێ هیچ مەبەسـتێک ئـەوە ڕێز

لە نەفسو دەروونی خۆیـان دەگرن.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ ﴾ (واتـە: وە کەسـانێکن کاتێ ئامۆژگاری بکرێن بە ئایەتەکانـی پەروەردگاریـان) کە فەرمانی پێکـردوون بە گوێگرتنو هیدایـەت وەرگرتنیان لێـی، ﴿ لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴾ واتـە: ڕووبـەڕووی نابنـەوە بە جـۆرێ خۆیان لێی بپارێـزن، وە کـەڕ بـن بەرانبەر بە بیسـتنی، وە چاوو دڵیـان لێی لابـدەن، هەروەکو چۆن ئەو کەسـەی بـڕوای پێـی نیەو بەڕاسـتی نازانێ، ئـەو ڕەفتـارە دەکات، بەڵکو حاڵیان لـە بەرانبەر ئایەتـەکانو لـە کاتی بیسـتنیاندا، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ ﴾السـجدة، (واتـە: تەنها کەسـانێک بڕوا بـە ئایەتەکانـی ئێمە دێنن هەرکاتـێ بەو ئایەتانـە ئامۆژگاری بکرێـن ئەکـەون بەڕوودا بە سـوژدە بردنـەوەو بە پاکی ستایشـی پەروەردگاریـان دەکەنو خۆیـان بە گـەورە دانانێـن)، ڕووبەڕووی دەبنـەوە بە وەرگرتـنو بە پێویسـت بونیان پێیو ملکەچبوونیـان بـۆی، وە دەبینـی لـەلای ئـەوان بیسـتنێکی تـەواو بـەدی دەکـرێو دڵێکی زینـدوو ئیمـانو بڕوایـان پێـی زیـاد دەکاتو دڵنیاییـان پێـی تـەواو دەبـێ، وە چوسـتو چـالاک دەبـنو دڵیان پێـی خۆش دەبـێو خۆزگـەی پێدەخوازن.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا ﴾ واتـە: هاوشـانەکانمان لـە هـاوڕێو خێزانـەکان ﴿ وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴾ واتـە: چاوەکانمـان پێـی ئۆقـرە بگـرێ، ئەگەر تەماشـای حاڵیـان بکەیـن دەبینیـن لـە هـەوڵو هیمـەتو بـەرزی پلەوپایەکانیـان ئـەوان دڵەکانیـان ئۆقـرە ناگـرێ هەتـا بـە چـاوی خۆیـان نەیانبینـن گوێڕایەڵـی پەروەردگـارن، زانـانو کار بـە زانستەکەیان دەکـەن، ئەمـە هـەروەک ئـەوەی دوعـاو نزایە بـۆ خێزانو منداڵەکانیـان بـۆ چـاک بـوون، لە هەمـان کاتـدا دوعایە بۆ خۆشـیان، چونکە سـوودەکەی دەگەڕێتـەوە بۆیـان، لەبەرئەمەیـە ئەوەیان بە بەخشـین دانـاوە بۆ خۆیـان، وتوویانە: ﴿ هَبْ لَنَا ﴾ بەڵکـو نزاکەیـان دەگەڕێتەوە بۆ سـوودی گشـتی مسـوڵمانان، چونکە بە چاکسـازی ئەوانـەی باسـکراون دەبێتـە هۆکارێک بۆ چاکبوونـی زۆرێ لەو کەسـانەی پەیوەندیان پێوە دەکەن، وە سـوودیان لێوەردەگـرن ﴿ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ واتە: ئـەی پەروەردگار بمانگەیەنـە بەم پلە بـەرزە، پلەی ڕاسـتگۆیانو ئەوانەی تەواون لە بەنـدە چاکەکانی خوا ﷻ، ئەویـش پلـەی پێشـەوایەتیە لـە ئاینـدا، وە بـۆ ئـەوەی ببـن بـە پێشـەواو سەرمەشـقی لـە خواترسـان لە گوفتـارو کرداریاندا، پەیـڕەوی کردەوەکانیان بکرێو بە قسـەکانیان دڵنیایی

وەربگیــرێ، خەڵکــی چاک بە شــوێنی ئەوانــدا بڕوا، هــەم خۆیان هیدایــەت وەربگرنو هەم خەڵکیــش هیدایــەت بدەن.

بێگومــان ئــەوەی زانــراوە داواکردن بە گەیشــتن بــە شــتێ داواکردنە بەوەی کە تــەواو نابێ تەنهــا بەوە نەبــێ، ئەم پلەیەش پلەی پێشــەوایەتیە لە ئاینــدا، تەواو نابێ تەنها بــە ئارامگرتنو دڵنیایــی نەبێ: هەروەک خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾السجدة، (واتــە: وە لــە ناو ئەواندا پێشــەوایانێکمان دانــا ڕێنمایــی (خەڵک)یــان دەکرد بــە فەرمانی ئێمــە کاتێ خۆیــان گرتو بــە ئایەتەکانی ئێمــە دڵنیابــوون (بــڕوای پتەویــان هێنا) جا داواکردنی پێشــەوایەتی خواناســان پێویســتی بە کــردەوەو ئارامگرتنــە لەســەر گوێڕایەڵی خوا ﷻ، وە لەســەرپێچیەکانی، وە لــە قەزاو قەدەرە بــە ئێشــەکان، وە لە زانســتی تــەواو کە خاوەنەکــەی دەگەیەنێ بــە پلەی دڵنیایــی، خێرێکی زۆرو بەخشــینێکی بــێ پایــان، وە دەبــێ ئــەوان لەبەرزترینــی پلــەی بەدیهێنراوەکانــدا بن دوای پێغەمبەران.

ئــا لــە بەرئەمــە- کاتــێ هیمــەتو داواکاریەکانیــان بەرزبــوو- ئەوە پاداشــت لــە ڕەگەزی کردەوەیــە، خــوا ﷻ پاداشــتی دانەوە بە شــوێنو جێگا بــەرزەکان ﴿ أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا ﴾ واتــە: (پاداشــت دەدرێنــەوە) بــە کۆشــکو تەلاری بــەرزو جێگای خــۆش، هەمــوو ئەوانــەی تێدایــە کــە نەفــسو دەروون حــەزی پێــدەکاو چــاو لەززەتــی لێدەبینــێ، دیــارە ئەویــش بــە هــۆی ئارامگرتنیانەوەیە، بــە دەســتیان هێنا ئەوەی بەدەســتیان هێنــا، هەروەکو خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾الرعد، (واتــە: فریشــتەکانیش دەچنــە ژوورەوە بــۆ لایــان لــە هەمــوو دەرگایەکەوە * (پێیــان دەڵێن:) ســەلامتان لێ بێ، چونکــە ئارامتان گرت (لــە دونیــادا) جا چەنــد ســەرەنجامێکی چاکتان بــوو)، وە لەبەرئەمەیــە لێــرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴾ (واتــە: وە لەو شــوێنەدا ســڵاویان لێدەکــرێ) لەلایەن پەروەردگاریانــەوە، وە لەلایەن فریشــتە بەڕێزەکانەوە، وە هەندێکیان بــۆ هەندێکی دیکەیان، وە پارێــزراو دەبــن لە هەمــوو ناخۆشــیو نارەحەتیەکان.

بــە پوختــی: خــوا ﷻ وەســفی کردوون بــە ویقــارو دڵ ئارامــیو خۆبەکــەم زانین بــۆ خوا، وە بــۆ بەندەکانــی، وە خوڕەوشــتی جــوانو لەســەرخۆییو ســنگ فراوانــیو لێبووردەیی لە نەفامــەکانو ئەوانــەی پشــتیان تێدەکــەن، وە لە بەرانبــەر خراپەکاندا چاکەکارن، شــەو نوێژ

دەکەنو دڵسۆزنو دەترسن لە ئاگری دۆزەخ، وە گەردنکەچن بەرانبەر پەروەردگاریان بۆ ئەوەی رزگاریان بکا لێی، وە لە ماڵو دارایییەکانیاندا ئەوەی ئەرکو پێویستو پەسندە دەریدەهێنن، وە دەست بەو بەخشینەوە دەگرن، جا ئەگەر ئەوان دەست بەماڵو سامانەکانیانەوە بگرن لە بەخشینداو بەپێی پێویست ببەخشن، زێدەرۆیی تێدانەکەنو خۆیان لە رەزیلی بەدوور بگرن، جا دەستگرتنەوەو ناوەندیان لە غەیری ئەوەدا لە پێشترە.

وە پارێزراون لە گوناهە گەورەکانو وەسف کراون بە دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ لە بەندایەتیکردنیاندا، دەستیان پاکە لە خوێن رشتنو پشت تێکردنیاندا، وە کاتێ گوناهێ ئەنجام دەدەن داوای لێخۆشبوون دەکەن، وە ئەوان لەکۆڕو کۆمەڵی خراپەکاراندا ئامادە نابن، وە خۆیشیان ئەنجامی نادەن، وە ئەوان خۆیان دەپارێزن لە قسەی پڕوو پووچو رەفتاری ناپەسند کە هیچ خێرێکی تێدانییە، ئەویش پیاوەتیو مرۆڤایەتیو تەواویان دەگەیەنێ، وە بەرزی نەفسو دەروونیان لە هەموو قسەو کردارێکی پیسو بێ مانا، ئەوان پێشوازی لە ئایەتەکانی خوا ﷻ دەکەن بە وەرگرتنو تێگەیشتن لە ماناکانیو کردەوە پێکردنی، وە هەوڵو کۆشش کردن لە حوکمەکانیدا، ئەوان داوا لە خوای بەرز دەکەن بە تەواوترین داواکردن لەو پارانەوانەی سوودی لێوەردەگرن، وە ئەوانەیشی پەیوەستە پێیانەوە سەرجەم مسوڵمانان بەهرەمەند دەبن لێی، لە چاکی خێزانو وەچەکانیان، لە چوارچێوەی ئەوەشدا هەوڵدانیان بۆ فێرکردنو ئامۆژگاریکردنیان، چونکە هەرکەسێ سووربێ لەسەر شتێو داوا لەخوا بکا پێی بێگومان ئەوە دەبێتە هۆکاری ئەو شتە، ئەوان داوایان کردوە لە خوا ﷻ بەرزترین پلەیان پێ ببەخشێ، ئەویش پلەی پێشەوایەتیو راستگۆییە.

بەرزی بۆ ئەو خوایە، چەندە بەرزن ئەم سیفاتانە، چەندە گەورەن ئەم هیممەتو داواکاریانە، چەندە چاکن ئەم نەفسو دەروونانە، چەندە شایەنی پێشەوایەتین! مەزنی بۆ ئەو خوایە فەزڵو نیعمەتو بەزەیی خۆی دابارانەوە بەسەریاندا تا گەیاندوونی بەم پلانە.

مەزنی بۆ ئەو خوایە کە منەتی کردوە بەسەر بەندەکانیدا بە جۆرێ وەسفو شێوەیانی بۆ روون کردونەتەوە لەگەڵ هیممەتو ورەیاندا، وە پاداشتی بۆ دیاری کردوون، بۆ ئەوەی تامەزرۆ بن بەو وەسفانەی کە کراونو هەموو هەوڵو کۆششەکانیان بخەنە

کار بـۆ بەدەسـت هێنانیـان، وە داوابکەن لـەو زاتەی کە منەتـی کردوە بەسـەریانداو ڕێزی لێگرتـوون، کـە فـەزڵو چاکـەی لە هەمـوو شـوێنو کاتێکدا هەیـە، وە هیدایەتـی داونو پەروەردەی کـردوون بـە پەروەردەکردنێکـی تایبەت.
ئـەی پەروەردگـارا سـتایش بـۆ تۆیـە، سـکاڵا تەنهـا دەبرێتـە لای تـۆ، تەنها پشـت بە تۆ دەبەسـترێو داوا لـە تـۆ دەکـرێ، هیـچ هێـزو توانایـەک نیـە جگە لە تـۆ، ئێمـە هیچمان بەدەسـت نیە نە سـوودو نە زیان، بەڵکو دەسـەڵاتمان نیە بەسـەر مسـقاڵە زەرەیەک لەخێردا ئەگـەر تـۆ بۆمانی ئاسـان نەکـەی، ئێمـە لاوازو بێتوانایـن لە هەمـوو ڕوویەکەوە، شـایەتی دەدەیـن ئەگـەر بماندەیتە دەسـتی خۆمان بە قـەد چاوترووکانێ ئـەوە ئێمەت داوەتە دەسـت بێتوانایـیو لاوازیو هەڵـە، ئـەی پەروەردگـارا متمانە بە هیـچ ناکەین جگە لـە ڕەحمی تۆ، کە بـەو ڕەحمەتەت دروسـتت کردوویـنو ڕزقو ڕۆزیـت پێداوین، نازو نیعمەتت ڕشـتوە بەسـەرماندا لـەو نازونیعمەتانەی کە ئاشـکراو نهێنیـن، نارەحەتیو ناخۆشـیەکانت لە کۆڵمان کردۆتـەوە، دەی ڕەحمـان لێبکـە بـە ڕەحمەتێـک بـێ نیازمـان بکا لـە ڕەحمەتـی غەیری خـۆت، بـێ ئومێـدو بێبـەش نابێ کەسـێ داوا لـە تۆ بـکاو هیـواو ئومێدی تەنهـا تۆ بێ.
دوای ئـەوەی خـوا ﷻ ئـەو بەندانەی داوە پـاڵ ڕەحمەتی خۆیو تایبەتی کـردن بە بەندایەتی کردنـی، ئەویـش بـە هۆی شـەرەفو فەزڵیانـەوە، لەوەیـە کەسـێ وا گومان ببـات ئەو، وە غەیـری ویـش ئایا بۆ ناچنـە نێـو بەندایەتیەوە؟
خـوا ﷻ هەواڵیـداوە کـە ئەو گـوێ نادا بـە غەیری ئەوانـە، بێگومـان ئەگەر دوعـاو نزاتان نەبـێ دوعـای پەرسـتنو دوعـای داواکـردن، نـە گوێی پێتـان دەداو نەخۆشـی دەویسـتن ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴾ واتە: سزایەک بەختەتـان دەگـرێ، وەکـو چـۆن قـەرزدەر یەخـەی قەرزارەکـەی دەگـرێ، بێگومـان لـە داهاتوویەکـی نزیکـدا خـوا ﷻ بڕیـار دەدات لەنێوان ئێـوەو بەنـدە بڕوادارەکانیدا.

تەفسیری سووڕەتی (الفرقان) تەواو بوو

# ناوەڕۆک